# تەفسیری قورئانی

# بەرز و بەپێز

عەلی باپیر

بەرگی دەیەم

تەفسیری سووڕەتی ( هود )

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نـووســەر : عەلـی باپـیـر.

نەخشەسازیی ناوەوە : عزالدین محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٣٩ ک- ٢٠١٨ز .

تـــیـراژ : ١٠٠٠ دانە .

لە بەڕێوەبەرایەتی گشـتی کتێبـخانەکان ژمارەی سـپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾آل عمران، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾النساء، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ: فإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلامُ الله وَخَيْرَ الهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد ، پێش هەر قسەیەکی گرنگ ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتد، وە ئەم وتارە ، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین‌و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ‌و ، خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی‌و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم‌و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردووم‌و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەم‌و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان‌و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی‌و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب‌و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم‌و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان‌و چۆنیەتی جێبەجێکردن‌و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك‌و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم‌و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەرەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم‌و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرِّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم ، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون‌و ، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان : هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار ، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو ، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەکانیو کتێبەکانی سوننەتدا خەریکمو ، دەیان کتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانیەوە ، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی : (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك درەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێمو هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووورداربوونی تواناو برستم ، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشم ویستوە کە زۆر بەملاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگاتو، بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە ؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، ڕەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیرە

---

١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو ، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانو، سەرجەم هەشت بەرگو دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەمو، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.
شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا ، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

کێشـاوە، خـوا بە باشـترین شـێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر صـاڵحو سـاغو سـەلامەتو سـەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕانو کچان، لەنێو گەلەکەماندا، زۆر بکات .

شایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیـرەماندا باسـی بـەش (جـزء)ەکـانی قورئـانو دابەشکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکـەین، چونکە هـەر سـوورەتێك بۆخـۆی شـتێکی سـەربەخۆیـەو، سـەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەستنو، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەسـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسـیرەشدا، دیسان حیسـاب بـۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکـەینو، بە گوێرەی سووڕەتەکان، بەرگـەکانی دیـاریی دەکـەین.

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کـە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسڵدا بەشێوەی دەرسو وتـار پێشکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومــەوەو، بـەپێی پێویسـت دەستکارییم کردوە، دیارە هـەموو دەرسێکیش بـەناوی خـواو ستایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکردوە، بەڵام ئێمە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە ، ئەوانـەمان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبـة الحاجـة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشـەکەییەوە هاتوە، لـەجیاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو بـرا دڵسۆزە ئێسـتاش پاش سـوورەتی (یـوسـف)، سـەرگەرمی سوورەتی (الرعـد)ەو عەزمیشـی جـەزم کـردوە ، کە ئەگەر تەمەنمـان بەردەوام بێ ، هەتـا کۆتـایی ئەم تەفسیـرە سـەرگەرمی کـارەکەی بێ .

# پێشەکی ئەم بەرگە

بسْم الله الرَّحمن الرَّحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم اللقاء.

خوێنەری بەڕێز !

ستایشی شایستە بۆ خوای بەرزی مەزنی بەخشندەی بەخشەر کە یارمەتی داین و تەمەنی ئەمانەتیی بۆ درێژکردین، کە ئەم سوورەتە بەپێزەی قورئانی بەڕێزیش تەفسیر بکەین.

شایانی باسیشە لەم سوورەتەدا لە (١٢٣)ئایەت (٧٥) ئایەت بۆ باسکردنی حەوت پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا تەرخان کراون و، ئێمەش لە دوو توێی تەفسیرکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتەدا، توێژینەوەی تێرو تەسەلمان لەبارەی بەسەرهاتی چوار لەو حەوت پێغەمبەرانەوە کردوە، کە بریتین لە:

نووح و هوودو لووط و شوعەیب عليهم الصلاة والسلام .

خوای بە بەزەیی هاوکارمان بێ کە هەرچی زیاتر لە کتێبی بەهێز پێزی خوا شارەزا بین و بەهۆیە تێبگەین و پێبگەین .

٢١ / ٤ / ١٤٣٩ ك

٨ / ١ / ٢٠١٨ ز

# دەستپێک

بەڕێزان !

ئـەمڕۆ کـە (٢٥)ی مـانگی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٣٧)ی کۆچـیی، بەرانبـەر (٣٠)ی حـوزەیرانی (٢٠١٦)ی زایـینی یـە، خـوا ﷻ پشـتیوان بـێ، دەسـت دەکـەین بـە ڕوونکردنـەوەی ماناو مەبەستەکانی ئایەتە موبارەکەکـانی سـوورەتی (هـود)، صەڵاتو سـەلامی خـوا لەسەر هوود بـێ.

ئنجـا وەك عـادەتی خۆمـان: سـەرەتا پێناسـەیەکی سـوورەتی (هـود)، دەکـەینو ئامـاژەیەك بە نێوەڕۆکـەکەی دەکـەین، لە هەشـت خـاڵـدا:

# پێناسەی سوورەتی (هود) و نێوەڕۆکەکەی لە هەشت خاڵدا

**یەکـەم /** ئەم سـوورەتە سـوورەتێکی مەککەییەو، لـە ڕیزبەندیـی (مصحف)دا، ژمـارە (١١)یەو، لە ڕیزبەندیـی دابەزیـن (ترتیب النزول)دا، ژمـارە (٥٢)یە.

ژمـارەی ئایەتەکانی لـەلای زۆربەری زانایـان (١٢٣) ئایەتـە، هـەندێکیش دەڵـێن: (١٢١)ەو، هەندێکی دیکەش دەڵێن: (١٢٢)ە.

**دووەم /** ئەم سوورەتە پاش سوورەتی (یـونس) هـاتۆتە خوار، هەنـدێکیش گوتوویانـە: پێش سوورەتی (یونس) هاتۆتـە خـوار، هەرچۆن بـێ لـە دەوری سـاڵی (١٠ و ١١)ی پێغـەمبـەرایەتییـدا هاتۆتـــە خـوار، بـە پێـی بۆچـوونی زۆربـەی زانایـانو، بـە سـەرنجدانی نێـوەڕۆکی ئایەتەکـانو، ئـەو مەبەسـتانەی کـە لەبارەیـانەوە دەدوێـن، ئـەوە هەڵدەهێنجـین.

**سێیەم** / وەك لە پێناسەی سوورەتی (یونس)یشدا باسمان کرد، ئەم دوو سوورەتە (یونس‌و هود) (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، وەك هەردوو سوورەتەکانی (الأنعام، الأعراف) وان، لەو ڕووەوە کە: سوورەتی (الأنعام) باسی بابەتەکانی ئیمان‌و عەقیدە، بە تایبەت خوا بەیەکگرتن‌و، پێغەمبەرایەتیی‌و وەحی‌و، ڕۆژی دوایی دەکات، بە شێوەیەکی تیۆریی، سوورەتی (الأعراف)یش لە میانی بەسەرهاتی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ئەو ئیمان‌و عەقیدەیە، بە بەرجەستەکراویی دەگێڕێتەوە.

سوورەتەکانی: (هود) و (یونس)یش بە هەمان شێوە، لە سوورەتی (یونس)یشدا پانتاییەکی کەم بۆ بەسەرهاتی هەر کام لە: (نووح‌و مووساو هاڕوون) لەگەڵ (یونس) (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، دیاریی کراوە، ئەگەرنا (١٠٩) ئایەتەکە، زۆربەی هەرە زۆری بۆ باسکردنی خوا بە یەکگرتن‌و، پووچەڵ کردنەوەی هاوبەش بۆ خوا دانان‌و، باسی ڕۆژی دوایی، بەهەشت‌و دۆزەخ‌و، سزاو پاداشتی ئەهلی کوفرو ئەهلی ئیمان، پاشان باسی قورئان‌و باسی پێغەمبەرایەتیی، باسی وەحی بە شێوەیەکی تیۆریی‌و فیکریی کراوە، ئنجا لەم سوورەتی (هود)یشدا، بە شێوەی بەرجەستە کردن باسی بەسەرهاتی ژمارەیەك لە پێغەمبەران کراوەو، زۆربەی پانتایی ئایەتەکانی سوورەتەکە، بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، کە بە تەئکید: ئیمان‌و عەقیدەیان، لە هەڵوێستەکانیان‌و لە ژیانی خۆیاندا، بەرجەستە کردوە، تەرخان کراوە، واتە: (یونس)و (هود) وەك (الأنعام)و (الأعراف)ن، لەو ڕووەوە.

**چوارەم** / لە کۆی (١٢٣) ئایەت لە سوورەتی (هود)، جگە لە (٢٤) ئایەت لە سەرەتاوە، کە وەك پێشەکییەك وان‌و، (٢٤) ئایەتیش لە کۆتایی دا، کە وەك ئەنجامگیریی وان، کە هەمووی دەکاتە (٤٨) ئایەت، ئەوی دیکە، کە (٧٥) ئایەتە، بۆ بەسەرهاتی حەوت (٧) لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لەگەڵ گەلەکانیاندا، تەرخان کراون، ئەو پێغەمبەرانەش بریتین لە: (نووح، هوود، صالح، ئیبراهیم، لووط، شوعەیب، مووسا)، صەڵات‌و سەلامی خوایان لەسەر بێ.

پێـنجـەم / شایانی باسە کە لەم سوورەتەشدا، وەك (الأعراف)، بەسەرهاتەکانی هەرکام لەم شەش پێغەمبەرە (نـووحو هـوودو صالحولووطو شوعەیبو مووسـا)، (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هـاتوون، هـەروەها لـەم سـوورەتی (هـود)دا، گۆشـەیەکیش لـە بەسەرهاتی ئیبـراهیم ﷺ باسکراوە، کە دەبن بە حەوت، بەڵام لە (الأعـراف)یشدا، لـە بەرانبـەردا بەسـەرهاتی ئادەمو حـەوواش هەیـە (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هەروەهـا لە سوورەتی (الأعراف)دا بەسـەرهاتی مووسـاو هارووون، زۆر بـە درێـژیی هاتوەو، زۆرترین پانتایی لـە سـوورەتێکدا بـۆ بەسـەرهاتی مووسـاو هاروونی بـرای، لەگەڵ گەلەکـەیانو، لـە بەرانبـەر فیـرعەونو دارو دەسـتەو دایەرەکەیـدا، تـەرخان کرابێ، لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا هەیـە، بۆیـەش ئێمـە لـە تەفسیری لـە سـوورەتی (الأعراف)دا لێکۆڵینەوەیەکی باشمان لە بارەی زۆربـەی قۆناغـەکانی ژیـانی مووسـاو هـاروونو گەلەکـەیانەوە کرد، ئەوەی کە پەیوەست بوو بە نێوەرۆکی ئەو ئایەتانەی کە لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوون، دەربارەی قۆناغەکانی ژیانی مووسـا ﷺ کە ئێمە لەوێ ژیانەکـەیمان دابەش کردوە بۆ سـێزدە (١٣) قۆنـاغ.

شـەشـەم/ دە (١٠) خـاڵی هاوبەش لە نێـوان سـوورەتی (یونس) و (هـود)دا:

واتـە: لـە ڕووی ئـەو مەبەسـتانەوە کـە لـە بارەیانـەوە دەدوێـنو، لـە ڕووی نێوەرۆکـیانەوە، ئەو دە(١٠) خاڵەش ئەمانەن:

یــەك : هەرچـەندە ژمـارەی ئایەتەکـانیان چـواردە (١٤) ئایـەتی جیاوازە (١٠٩)و (١٢٣)، بەڵام قەبارەیـان لە یەك نیزیکـە.

دوو : هـەردووکیان بـە ﴿الٓر﴾و، بـە باسی حیکمـەتی قورئـان، یـان بـە باسـی (حکیـم) بوونی قورئـان، دەسـت پـێ دەکـەن.

سـێ : لە هەردووکیاندا تۆمەتی بە جـادووگەرو بە جادوو دانانی پێغـەمبـەر ﷺ و قورئان، لە لایەن کـافرەکانەوە باسـکراوەو، بەرپەرچ دراوەتـەوە.

چـوار : لە هەردووکیـان دا باسی ئامـانجی نێردرانـی قورئـان کـراوە، کـە بەندایـەتیی کردنە بۆ خـوا ﷻ، تەنیا پەرستنی خوایـەو، هاوبەش بۆ دانەنـانیەتی.

**پێنج :** لە هەردووکیاندا باسی دروست کرانی ئاسمانەکان‌و زەوی، لە شەش کاتاندا، بە شەش قۆناغ‌و، چوونە سەر عەرشی خوای پەروەردگار، کراوە.

**شەش :** لە هەردووکیاندا باسی سپڵەیی مرۆڤ و، لە خۆبایی بونی بە هۆی خۆشیی‌و نیعمەتەکانەوە کراوەو، لە کاتی تێکیران‌و نارەحەتیی نائومێد بوونی دا، باسی کەوتنە زاڵ‌و ناڵەی، کراوە.

**حەوت :** لە هەردووکیاندا باسی تەحەددا کردنی قورئان کراوە، واتە: قورئان فەرمایشتی خوا، داوای بەرانبەرەکانی دەکات، بۆی بێنە مەیدان، لە (یونس)دا بە سوورەتێك، واتە: سوورەتێکی وەك قورئان بێنن، کە هەرچی بە دەستیشتانەوە دێ، لەوانەی کە شایەدییان بۆ دەدەن، لەوانەی کە هاوکارییان دەکەن، کۆیان بکەنەوە.

لە سوورەتی (هود)یش دا بە دە (١٠) سوورەت، هەر بۆیەش هەندێك لە زانایان گوتوویانە: سوورەتی (هود) پێش (یونس) هاتۆتە خوارێ، چونکە مەعقوول نیە پێشێ خوا بفەرموێ: سوورەتێکی وەك قورئان بێنن، دوایی بفەرموێ : دە (١٠) سوورەتان بێنن! یانی: دێتە عەقڵەوەو وا لە مەنتیق‌و لۆژیکەوە نیزیکە، کە پێشێ بفەرموێ : وەك هەموو قورئان بێنن، دوایی بۆیان بێتە خوار، بفەرموێ: باشە ئەگەر نەتانتوانی وەك هەموو قورئان بێنن، وەك دە (١٠) سوورەت بێنن، دوایی بێتە خوارترو بفەرموێ: ئەگەر نەتانتوانی وەك دە (١٠) سوورەتانیش بێنن، ئەوە سوورەتێك وەك سوورەتەکانی قورئان بێنن، هەڵبەتە ئەوەش رایەکی زانایانە، کە دوایی قسەی لێ دەکەین.

**هەشت :** لە هەردووکیاندا باسی سەرەنجامی چاکەکارانی بڕوادارو، خراپەکارانی بێبڕوا، کراوەو، باش تیشکی خراوەتە سەر، کە ئەوانەی ئەهلی ئیمان بن‌و، چاکەکار بن، وە ڕازاوە بن بە سیفەتە بەرزو پەسەندەکان، کە بەر لە هەموویان بریتیە لە خوا بە یەکگرتن، تەنیا خوا پەرستن، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن‌و، دووربن‌و بژار کراوبن‌و پاك بن، لە سیفەتە خراپەکان، لە پێش هەموویانەوە هاوبەش بۆ خوا دانان، ئەوانە جێگایان بەهەشتەو، خوا لێیان ڕازی دەبێ‌و، بە باشترین شێوە پاداشتیان دەداتەوە.

بە پێچەوانەشەوە، ئەوانەی کە پێچەوانەی ئەوە بن، واتە: لە سیفەتە باشەکان دووربن، کە پێش هەموویان ئیمانو خوا بە یەکگرتنەو، خۆیان پیسو پۆخەڵ کردبێ، بە سیفەتە خراپەکان، لە پێش هەموویانەوە هاوبەش بۆ خوا دانانو کوفر، ئەوە جێگایان دۆزەخەو، خوا لێیان تووڕە دەبێو سزایان دەدات.

نۆ : لە هەردووکیاندا باسی بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ) کراوە، بەڵام لە سوورەتی (یونس)دا تەنیا باسی: نووحو مووساو هاروونو یونس، کراوە، کە ئەویش بەسەرهاتی (نوح) بە سێ ئایەت باسکراوەو، هی (یونس)یش لە یەك ئایەتدا ئاماژەی پێکراوە، ئەویش زیاتر باسی گەلەکەی، کراوە، بەڵام چەند ئایەتێك تەرخان کراون، بۆ بەسەرهاتی مووساو هاروونی برای، بەڵام لە سوورەتی (هود)دا - وەك باسمان کرد - حەفتاو پێنج (٧٥) ئایەت تەرخان کراون :

١- تەنیا بۆ بەسەرهاتی (نوح) بیستو پێنج (٢٥) ئایەت تەرخان کراون، کە زۆرترین پانتایی گرتووە، زیاتر لە هەموو ئەو شوێنانەی دیکە کە بەسەرهاتی نووحیان تێدا گێرراوەتەوە.

٢- هەروەها یازدە (١١) ئایەت تەنیا بۆ بەسەرهاتی (هود) (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ) تەرخان کراون، کە زۆرترین پانتاییەو لە هەموو ئەو بەسەرهاتانەی دیکە زیاترە، کە لەبارەی (هود)ەوە لە سوورەتەکانی دیکەدا هاتوون، بەڵام جیا بە جیا، نەك هەموویان بەسەر یەکەوە.

[illegible] : ئنجا کۆتایی پێهێنانی هەردوو سوورەتەکە، زۆر پێك دەچن، لە سوورەتی (یونس)دا لە ئایەتی ژمارە (١٠٨)دا دەفەرموێ : ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴿١٠٨﴾ ﴾ و، لە ئایەتی (١٠٩)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (هود)دا

لــــە ئایـــەتی (١٢٠)دا دەفــەرموێ: ﴿وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ۝١٢٠﴾ و، لـە ئایـەتی (١٢٣)شـدا دەفـەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ۝١٢٣﴾، کە ئەگەر تەماشـا بکەین: ئایەتی (١٢٠)ی هـوود، دەشـوبهێتـە ئایەتی (١٠٨)ی سوورەتی (یونس)و، ئایەتی (١٢٣)ی سوورەتی (هود)یش کە کۆتـا ئایـەتە، دەشوبهێتـە ئایـەتی (١٠٩)ی سـوورەتی (یـونس)، کـە ئـەویش ئایـەتی کۆتایی یە.

__حـەوتـەم__ / ئـەم سـوورەتە بـە نـاوی (هـود)ەوەیە، کە یەکێکە لە پێغـەمبـەرانی پایە بەرزی خـواو، بۆ گـەلی عـاد ڕەوانە کراوە لەم سوورەتەدا پێنج جاران ناوی هوود ﷺ هاتوەو، لـە (١١) ئایەتـدا بەسەرهاتەکـەی گێڕدراوەتـەوە، کـە – وەك گوتمان - پانتاییەکەی لـە هـی هـەموو سـوورەتەکانی دیکـە زیـاترە، دیـارە تـاك تـاك، نـەك هـەموویان بەسـەریەکەوە.

__هـەشـتـەم__ / بە چـەند ڕیوایەتێك لە پێغـەمبـەری خواوە ﷺ هاتوە کە لێیان پرسیوە، ئـەی پێغـەمبـەری خـوا! کەوتیـە تەمەنـەوەو مووەکانـت سـپی بـوون؟ ئـەویش فەرموویـەتی: سـوورەتی (هـود)و، هاوێنـەکانی منیـان پیـر کـرد، کـە ئێمـە ئـەم ڕیوایەتـەمان لە نێـودا هەڵبژاردن، کە لە ڕووی سـەنەدەوە پێدەچـێ لە هـەموویان بەهێزتـر بـێ: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما : قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللهِ! قَدْ شِبْتَ؟ قَالَ: شَيَّبَتْنِي هُودٌ، وَالوَاقِعَةُ، وَالمُرْسَلاتُ، وَعَمَّ يَتَسَاءَلُون، وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ} {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٠٢٦٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم (٣٢٩٧)، وَالحَاكِمُ برقم : (٣٧٧٧) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِيّ وَوَافَقَهُ الذَّهبي، وَالبَزَّار برقم : (٩٢) وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الترمذي) ج(٣) ص (١١٣)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خـوای لـێ ڕازی بـێ، دەڵـێ: ئـەبو بەکـر خـوا لـێی ڕازی بـێ، گوتی: ئەی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ! پیـر بـووی، (واتـە: مووەکـانـت سپی بوون)؟ ئـەویش فـەرمووی : سـوورەتەکانی : (هـودو، الواقعەو، المرسـلاتو،

عَمَّ يتساءلونو، إذا الشمس كُوِّرَتْ) سەرو ڕیشیان سپی کردم، یاخود، منیان پیرکرد.

ئەویش لەبەرئەوەیە کە لە سوورەتی (هود)دا، خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ ﴾، واتە: وەك فەرمانت پێکراوە، ڕێك بوەستە، یانی: نە تێپەڕێنە، نە کورتی بێنە، نە بەملادا نە بەولادا، کە ئەوەش زۆر قورس و زەحمەتە.

یان لەبەر ئەوەیە کە باسی ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت و لەبەینبردنی گەلانی پێشووی تێدایە.

سوورەتەکانی دیکەش کە ناویان هێنراوە، هەموویان باسی ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەتیان تێدا هەیەو ئەوە خاڵی هاوبەشیانە، کە دیارە ڕۆژی قیامەت، بەڵکو: ئاخیر زەمان (ساعة)و هەڵسانەوە (قيامة)، واتە: ڕۆژی دوایی بەگشتی، گەورەترین کارەساتێکە لە (بوون)دا بە پێی ئەوە کە ئێمە دەیزانین: ڕۆژی دوایی گەورەترین گۆڕانکاریی و کارەساتێکە بەسەر بووندا دێ، لە قورئاندا هاتوە: ﴿ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ﴾ المزمل، واتە: ڕۆژێکە کە منداڵی گچکە سەری تێدا سپی دەبێ، هێندە بە سام و پڕ مەترسییە.

ئێمە بەم ئەندازەیە ئیکتیفا دەکەین، لە پێناسەی سوورەتی (هود)داو، ئاماژە کردن بە نێوەڕۆکەکەی، چونکە وەك باسمان کرد: زۆربەی پانتاییەکەی کە حەفتاو پێنج (٧٥) ئایەتە، بۆ بەسەرهاتی حەوت (٧) لە پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، کە (نووح و هوودو صالح و ئیبراهیم و لووط و شوعەیب و مووسا)ن، تەرخان کراوە، کە لە کاتی توێژینەوەی بەسەرهاتەکانیاندا، قسە لەسەر نێوەڕۆکی ئەو ئایەتە موبارەکانەو، ئەو ئامانج و مەبەستانەی کە گرتوویانننە خۆیان، دەکەین.

## دەرسەکانی ئەم سوورەتە

ئەم سوورەتە موبارەکە، دابەش دەکەین بۆ دوازدە (١٢) دەرس، وەك چۆن سوورەتی (یونس)مان، بۆ دوازدە (١٢) دەرس دابەش کرد، بەم شێوەیەی خوارەوە:

دەرسی یەکەم: لە ئایەتەکانی: (١ هەتا ١١)، واتە: (١١) ئایەت.

دەرسی دووەم: لە ئایەتەکانی: (١٢ هەتا ٢٤)، واتە: (١٣) ئایەت.

دەرسی سێیەم: لە ئایەتەکانی: (٢٥ هەتا ٤٩)، واتە: (٢٥) ئایەت، کە بەسەرهاتی نووح ﷺ، و گەلەکەی دەگرێتە خۆی.

دەرسی چوارەم: لە ئایەتەکانی: (٥٠ هەتا ٦٠)، واتە: (١١) ئایەت، کە بەسەرهاتی هوود ﷺ و گەلەکەی (عاد) دەگرێتە خۆی.

دەرسی پێنجەم: لە ئایەتەکانی: (٦١ هەتا ٦٨)، واتە: (٨) ئایەت، کە بەسەرهاتی صالّح (عَلَيْهِ السَّلَام)و، گەلەکەی ثەموود دەگرێتە خۆی.

دەرسی شەشەم: لە ئایەتەکانی: (٦٩ هەتا ٧٦)، واتە: (٩) ئایەت، کە گۆشەیەك لە بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ دەگرێتە خۆی.

دەرسی حەوتەم: لە ئایەتەکانی: (٧٧ هەتا ٨٣)، واتە: (٧) ئایەت، کە گۆشەیەك لە بەسەرهاتی لووط ﷺ دەگرێتە خۆی.

دەرسی هەشتەم: لە ئایەتەکانی: (٨٤ هەتا ٩٥)، واتە: (١٢) ئایەت، کە بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ لەگەڵ گەلەکەی مەدیەن دەگرێتە خۆی.

دەرسی نۆیەم: لە ئایەتەکانی: (٩٦ هەتا ٩٩)، واتە: (٤) ئایەت، کە ئاماژەیەکی کورتە بە بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەیدا.

دەرسی دەیەم: لە ئایەتەکانی: (١٠٠ هەتا ١٠٨)، واتە: (٩) ئایەت، کە وەك ئەنجام گیرییەك لە بەسەرهاتەکانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، کە بریتیە

لە بەینبـردنی ئەو ئاوەدانییانەی كە پێغـەمبـەرانیان بۆ چوونو، ئـەوانیش وەڵامـی بانگـەوازی پێغـەمبـەرانیان نەداوەتـەوە، (ئەوەی گرتۆتـە خـۆی).

دەرسـی یازدەیــەم: لە ئـایەتەكـانی: (١٠٩ هـەتا ١١١)، واتـە: (٣) ئایــەت، كـە ئـەویش ڕووكردنـە پێغـەمبـەرە ﷺ بەوە كە هیچ لە دوو دڵییـدا نەبـێ لە سـۆنگەی ئەوەوە كـە بیُبـڕوایەكان، دەیكـەن، كـە بەرنامـەو ڕێچكەكانیان پووچـەڵنو هـەروەك هـی پێشـووەكانی خۆیـان وانو، چـەند ڕێنماییەكی دیكەش بۆ پێغـەمبـەر ﷺ هـاتوون، كـە لەوێـدا ئـەوە هـاتوە: ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ... ﴿١١٢﴾ ﴾، هـەروەك فەرمــانت پێكراوە، ڕێك وەسـتاو بە.

دەرســی دوازدەیـەم: لە ئایەتەكانی: (١١٦هەتا ١٢٣)، واتە: (٨) ئایەت، كە خوای بەرزی مــەزن، دوا پـەیامی خــۆی لـە ڕێــی پێغـەمبــەرەوە ﷺ ئاڕاسـتەی مرۆڤـایەتیی دەكـات.

ئەمـە جوگرافیـای دابەشـكردنی ئایەتەكـانە، بۆ ئەم دوازدە دەرسـە.

# دەرسی یەکەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان یازدە (١١) ئایەتە، ئایەتەکانی: (١ – ١١)، لەو ( ١١) ئایەتـەدا، سـەرەتا خـوا ﷻ پێناسـەی قورئـان دەکات، بـەوەی کـە ئایەتـەکانی لـە لایـەن خـوای کارزانو شـارەزاوە، تۆکمـەو بەهێـزو پێـزو، روونو ڕۆشـن کراون.

ئنجـا دوایی خـوا ﷻ ئامانجی نێردرانـی، (واتە: نێردرانی قورئان) و نێومڕۆکەکەی کـە بۆ چـی هـاتووەو مەبەسـت پێـی چییـە؟ لە پێنـج خاڵاندا دەخـاتەڕوو:

١/ قورئـان بۆیـە هـاتوە کـە بەشـەر فێر بکـات، تەنیا بەندایەتیی بۆ خـوا بکەنو تەنیا خـوا بپەرسـتن.

٢/ فێریـان بکـات کـە داوای لـێبوردن لـە خـوا بکـەنو، دان بـە هـەڵەو کـەمو کورپییەکـانیان دابێـنن، ئەگـەر شیـرکو کـوفرن، ئەگـەر گوناهـو تـاوانو لادانـن، هەرچی هەنو، داوای لێبوردنی لـێ بکەن، واتە: هەڵسـن بـە پاکسـازیی خۆیـانو خۆ بژارکردنیـان لە سیفەتە نزمو پەسـتە خراپەکانو خۆ پـاك کردنەومیـان.

٣/ قورئـان هـاتوە کـە داوا لە خەڵك بکات: بۆ لای خـوا بگـەڕێنەوە، یـانی: دوای ئـەوەی کە پێشتـر خۆیـان بـژار کـردو خۆیان پاکسـازیی کـرد، ئنجا خۆیـان چاکسـازیی بکەنو خۆیان بڕازێننەوە بە سـیفەتە بەرزو پەسـەندەکان، کە سـەرەنجـام بە هۆی ئەوەوە ژیانێکی باشـیان چـنگ دەکەوێ، (واتە: ژیانێکی باشی دنیـایی)و، بێگومـان پاداشتی خـواو ڕەزامەندیـی خواش لە بەهەشـتدا، لەگـەڵ ژیـانی چـاکی دنیـادا، هـەر بەراورد ناکـرێ.

٤/ قورئان هاتوە كە بە خەڵك ڕابگەیەنێ: ئەگەر پشت هەڵبكەن، پشت بكەنە قورئان، پشت بكەنە پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ ئەوە مەترسیی سزای ڕۆژێكی گەورەیان لێ دەكرێ.

٥/ قورئان هاتوە كە لە مرۆڤایەتیی بگەیەنێ: گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای خوایە، بۆ لای كەسی دیكە ناگەڕێنەوە، تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگار خاوەنیانەو، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە، هەر ئەو زیندوویان دەكاتەوە، هەر ئەویش لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەكات‌و، سزاو پاداشتی پڕ بە پێستیان دەداتەوە.

پاشان خوا ﷻ لەو (١١) ئایەتەدا، باسی هەڵوێستی خراپ‌و نەرێنییانەی كافرەكان دەكات، كە هەوڵی خۆ حەشاردان‌و پەنهانكارییان داوە، لە بەرانبەر قورئان‌و پێغەمبەردا ﷺ.

دوایی خوا باسی ئەو ڕاستییە دەكات، كە بژێوو ڕۆزیی هەموو ژیاندارو پێڕۆیەكی سەر زەوی هەر لەسەر خوایەو، بە هەموو حاڵ‌و باڵیشیان ئاگادارە، چ حاڵی تێدا نیشتەجێ بوونیان، چ حاڵی هاتن‌و چوون‌و ئەو شوێنانەی كە بە شێوەیەكی كاتیی تێیاندا دەمێننەوە.

دوایی خوای كاربەجێ باسی دروستكردنی ئاسمانەكان‌و زەوی‌و بارەگا لەسەر ئاو بوونی خۆی، پاشان حیكمەتی دروستكردنی بوون (وجود) دەكات، كە بریتیە لە تاقی كردنەوەی مرۆڤ، كەچی كافرەكان ئەو قسانە بە جادوو دادەنێن.

دوایی خوا باسی پەلە كردنی بێبڕوایەكان دەكات، بە هاتنی سزای خواو، باسی ئەوە كە بە چاكەو نیعمەت، لەخۆبایی دەبن‌و لە كەوڵی خۆیان دەردەچن‌و، بە لاچوونی نیعمەت‌و هاتنی بەڵاو ناخۆشییش، نائومێدو ناسوپاس دەبن.

بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بڕوادارانی خۆ ڕاگری كردار باش، لەو حوكمە هەڵدا‌وێرێ، كە ئەگەر مرۆڤەكان هەموویان بە مستە ئاوێك دەكەونە مەلەو، بە نیعمەتێك لەخۆبایی دەبن‌و، بە تۆزە گرفتارییەك‌و ناڕەحەتییەك زۆر بێزار دەبن‌و، بە هەڵپە دەكەون، ئەوە ئیمانداران بە پێچەوانەوە: نە لە كاتی هاتدا، لەخۆبایی دەبن، وە نە لە كاتی نەهاتدا، لە خۆیان نائومێد دەبن، بەڵكو لە هەردوو حاڵاندا دامەزراون، چونكە دەزانن: هات‌و نەهات خۆشیی‌و ناخۆشیی، تاقی كردنەوەی خوای پەروەردگارن بۆیان، بۆیە لە هەردوو حاڵاندا خۆ ڕاگرو دامەزراون.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ الٓر كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا
ٱللَّهَ ۚ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴿٢﴾ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا
حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ
عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴿٣﴾ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ
صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ
إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٥﴾ ۞ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ
مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ
أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ
مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ۗ أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ وَحَاقَ
بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا
مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ
لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾

# مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{بە ناوی خـوای بە بەزەیـی بەخشندە. ئەلیف، لام، ڕا، (ئەمە) کتێبێکە ئایەتەکانی تۆکمەو قـایم کـراون، دوایـی ڕوونکراونـەوە لەلایـەن (خـوای) کـارزانی شـارەزاوە ﴿١﴾ (ئامانجی بنــەڕەتیی ئەوەیـە) کـە خــەڵك، جگـە لە خـوا نەپەرســتن، بە دڵنـیـایی مــن (واتــە: موحەممــەد) لـە لایـەن ئـەو (خــوا)وەوە ترسـێنەرو مـوژدە دەرم ﴿٢﴾ هــەروەها (قورئــان ئامانجـی ئەوەیە کـە پێتـان بڵــێ:) کـە داوای لێبـوردن لـە پەروەردگـارتان بکەن، ئنجـا بگـەڕێنەوە بۆ لای، بە گــوزەرانێکی بـاش دەتـانژیەنــێ، تاکـو کاتێکی ناوبراو (دیارییکـراوو)، پاداشـتـی چاکە دەدات بـە هــەر خـاوەن چاکـەیەك‌و، (قورئـان هاتوە پێتان ڕابگەیەنێ)، ئەگـەر پشت بکەنە خـواو پەیامەکەی، ئـەوە مـن مەترسیی سزای ڕۆژێکی گـەورەم لێتــان هــەیە ﴿٣﴾ گــەڕانەوەتان بـەس بـۆ لای خـوایــەو، ئـەو لەسـەر هـەموو شتێك بە توانــایـە ﴿٤﴾ ئەها (وریا بن!) ئەوان (بێبـڕوایەکـان) سـەرو سینەکانیان دەنـووشـتێننەوە، تاکـو خۆیـانی لـێ بشـارنەوە، ئەها (ئاگـادار بن !)، کاتێك بە پۆشـاکەکانیان خۆیان دادەپۆشـن، (خـوا) دەزانــێ چی پەنهـان دەکـەن‌و چی ئاشـکرا دەکـەن، بە دڵنیــایی ئەو بە نهێنــیی سینەکان زانــایە ﴿٥﴾ هیچ پێـڕۆ (ژیـاندار)ێك لە زەویدا نیـە، مەگـەر بژێوی لەســەر خــوایەو، جێـی نیشتەجـێ بـوون‌و دەرچوونیــان دەزانــێ، (ئـەوە) هــەمووی لـە نـووســراوێکی ڕوونکـەرەوە دایـە ﴿٦﴾ ئـەو (خـوا) ئـەو کەسـەیە کە ئاسمانەکان‌و زەوی لە شـەش ڕۆژانــدا (بە شـەش قۆنـاغ) هێنــاونەدی‌و، تەخــت (عرش)ەکەی لەســەر ئـاوێ بـوو، تاکـو تاقییتــان بکـاتەوە کـامەتان کـردەوەی باشــتــرە ! ئەگــەر بڵــێی: ئێـوە لــە دوای مــردن بــڵاو دەکــرێنەوە، (دەژێنـرێنــەوە)، ئەوانەی بێبـڕوان، بـە جەخــت کردنــەوە دەڵێن: ئەمـە تـەنیا جـادوویەکی ڕوون‌و بـێ چەندو چوونە ﴿٧﴾ ئەگـەر بۆ مــاوەی (کۆمەڵــە) کاتێکـی ژمێــردراو ســزاو ئــازاریان لــێ دوا بخــەین، دەڵــێن: چ شتێك ڕێی لـێ دەگرێ (بــێ)؟ ئەهــا (ئاگـادار بـن!)، ئـەو

ڕۆژەی بۆیان دێ (واتە: سزا) لێیان ناگێڕرێتەوەو، ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد، (هەر هێندەیان زانی) دەوری گرتنو (ئابڵووقەی دان) ﴿٨﴾ بە دڵنیایی ئەگەر بەزەییو چاکەیەك لە لایەن خۆمانەوە بە مرۆڤ (ی بێبڕوا) بچێژین، دوایی لێی دابڕنین (و لێی وەربگرینەوە)، زۆر نائومێدو سپڵە دەبێ ﴿٩﴾ هەروەها مسۆگەر هەرکات خۆشییەکی پێ بچێژین (واتە: بە مرۆڤی بێبڕوا)، دوایی ناخۆشییەك کە تووشی بووە، بە جەخت کردنەوە دەڵێ: خراپەو ناخۆشییەکانم لێ لاچوون، بێگومان ئەو زۆر دڵخۆشو شانازییکەرە ﴿١٠﴾ جگە لەوانەی خۆڕاگر بوونو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، (ئەوانە نە بە هات، نە بە نەهات ناشڵەژێن)و، ئەوانە لێبوردنو پاداشتێکی گەورەیان هەیە (لە ڕۆژی دواییدا) ﴿١١﴾ }.

## شیكردنـەوەی هـەندێـك لە وشـەكان

(أُحۡكِمَتۡ) : (أُتْقِنَتْ، الـمُحْكَمُ الـمُتْقَنُ، المُوَثَّق)، واتـە: ئایەتـەكانی بـە هێـزو قـایم كراون، تۆكمـەو تونـدو تۆڵن.

(فُصِّلَتۡ ) : (بُيِّنَت، فُرِّقَتْ، عِقْدٌ مُفَصَّل، جُعِلَ بَيْنَ كُلّ لُؤْلُؤَتَيْنِ خَرَزَةٌ)، (فُصِّلَت) واتە: ڕوونكراوەتــەوەو ڕۆشــنكراوەتەوە، یــاخود لێـك جیاكراونــەوە، دەگــوترێ: (عِقْدٌ مُفَصَّل) گەردنبەندێكـی موفەصــصەڵ، ئـەویش ئەوەیـە كـە هـەردوو گەوهـەر مرووییەكی دیكـەیان بكـەوێتە نێوانو لێكیان جیا بكاتەوە.

(خَبِيرٍ ) : دەگـوترێ : (خَبَـرَ الأَمْـرَ: عَلِمَـهُ، خَبَـرَهُ: بَلاَهُ وَاخْتَبَرهُ، وَجَدْتُ النَّاسَ أُخْبُرْ تَقْلَـهُ)، (خَبَـرَ الأَمْرَ) واتـە: شارەزای كارەكـە بـوو، زانـی، دەگوترێ: (خَبَـرَهُ) واتـە: جەربانـدیو تاقیكـردەوە، عـەرەب دەڵێـن : (وَجَدْتُ النَّـاسَ أُخْبُر تَقْلَـهُ) خەڵكـم وابینــی: تاقییــان بكــەوە، ڕەقزیــان دەكــەی، یــانی: زۆربەیــان لـە تاقیكردنــەوە دەرناچـن.

(يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا ) : واتە: بە ماوەیەكی كـەمی گوزەرانــی ژیـانی دنیـا، ژیانتـان پـێ دەگـوزەرێنـێ، (الـمَتَاعُ: السِّلْعَة، الـمنْفَعَة) وشـەی (متـاع) بە كەلـوپـەلو، بـە هـەر شـتێك دەگـوترێ، كـە مرۆڤـ لێـی بەهرەمەنـد ببـێو، (متـاع) واتـە: بەهرە وەرگرتنێكی كـەم لە ژیانی دنیادا، دیارە خۆشیی ژیانی دنیاش هـەر كەمو كورتە.

(ذِي فَضۡلٍ ): (الفَضْلُ: الزِّيَادَةُ عَنِ الإِقْتِصَادِ، وَكُلّ عَطِيَةٍ لا تَلْزَمُ مَنْ يُعْطِي) وشـەی (فضل) بریتیـە لـە زێـدە لـە حاڵـەتی میانجیی، شـتێك كـە بەشـت بكـات، ئاستی نێوەڕاست، ئنجـا لـەوە زیـاتر پێـی دەگـوترێ : (فضل) و هـەر بەخششـێك كـە بابـای بەخشـەر مولزەم نەبـێ بیبەخشـێ، پێی دەگوترێ: (فضـل).

(يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ): (يَلْوونَ وَيَعْطِفُونَ) واتە: سینگی خۆیان دەنوشتێننەوە، مەبەست ئەوەیە سەرو سینگی خۆیان دێننەوە یەك، بۆ ئەوەی دیار نەبن.

(يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ): واتە: بە پۆشاكەكانیان خۆ دادەپۆشن، دەگوترێ: (غَشِيَهُ يَعْنِي سَتَرَهُ، الغِشَاوَةُ: مَا يُغَطِّي الشَّيءَ)، (غَشِيَهُ) واتە: دایپۆشی، وشەی (غِشَاوَة) هەر شتێكە كە شتێك شتێك دابپۆشێ، بۆیە خوا لە سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ: ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ ٧﴾، واتە: چاوەكانیان پەردەی لەسەرە.

(بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ): واتە: خاوەنی سینەكان، كە (ذَات) (مُؤَنَّث)ی (ذُو)یەو، بە (ذَوَات) كۆدەكرێتەوە، (ذَاتِ الصُّدُور) واتە: ئەو نهێنییانەی بوونە خاوەنیان سینەكان، هێندە لە سینەكاندا چەسپاون، بوون بە خاوەنیو مەنزلگایان لە نێو سینەی مرۆڤدا گرتوە، ئەو شتانەی كە پەنهانن‌و كەس نایانزانێ جگە لە خوا.

( دَآبَّةٍ ): (كُلُّ حَيَوَانٍ سِوى الإنسَانِ)، هەر زیندارێكە جگە لە مرۆڤ، بەڵكو هەندێك دەڵێن: مرۆڤیش دەگرێتەوە، هەر پێرۆیەك كە بە زەوی دا دەڕوات، پێی دەگوترێ: (دَابَّة)، (الدَّب وَالدَّبِيبُ : مَشِيٌ خَفِيف) وشەی (دب) و (دبيب) بە ڕۆیشتنێكی ئارام‌و سووك دەگوترێ.

(مُسۡتَقَرَّهَا): (قَرَّ يَقِرُّ قَرَاراً: إذَا ثَبَتَ ثُبُوتاً جَامِداً وَأَصْلُهُ مِنَ القُرِّ وَهُو البَرْد) دەگوترێ : (قَرَّ يَقِرُّ قَرَاراً) واتە: لە شوێنی خۆی وەستا، لە ڕیشەدا لە (قُرّ)ەوە هاتوە، (قُرّ) واتە: سەرما، چونكە لە حاڵەتی سەرمادا، شت دەیبەستێ، یاخود زیندارەكان كەمتر دەجووڵێن.

(وَمُسۡتَوۡدَعَهَا): (الـمُسْتَودَع: مَكَانُ الوَدِيعَة) ئەو شوێنەی كە ئەمانەتێكی تێدا دادەنرێ، لێرەدا واتە: ئەو شوێنەی كە بە شێوەیەكی كاتیی تێیدا دەمێننەوە.

(كِتَٰبٌ مُّبِينٌ ) : نووسراوێکی ڕۆشنکەرەوە، لێرەدا (مبین) لە (أَبَانَ يُبِينُ)ی (متعدِّي) ەوە هاتوە، (فَهو مُبِين) واتە: ڕوونی کردەوە ڕوونی دەکاتەوە، ئەو ڕوونکەرەوەیە.

(عَرْشُهُۥ) : (العَرْشُ فِي الأَصْلِ شَيءُ مُسَقَّفٌ، جَمْعُهُ عُرُوش) وشەی (عرش) لە ڕیشەدا بە هەر شتێك دەگوترێ کە سەربانێکی هەبێ‌و، بە (عروش) کۆدەکرێتەوە، لێرەدا مەبەست پێی تەختی حوکمڕانییە.

(مَّبْعُوثُونَ ) : واتە: زیندوو دەکرێنەوە، هەڵدەسێنرێنەوە، (أَصْلُ البَعْثِ: إِثَارَةُ الشيءِ وَتَوْجِيهِهِ) وشەی (بعث) ئەوەیە کە شتێك لە شوێنی خۆی هەڵستێنیو، ئاڕاستەی بکەی.

(أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ ) : (أُمَّة) واتە: کۆمەڵە شتێك، (مَعْدُودَة) واتە: ژمێردراو، یانی: (حين مَعْدُود) واتە: کاتی ژمێردراو، کاتێکی کەم، چونکە شتی کەم، دەژمێردرێ، بەڵام شتی زۆر ناژمێردرێ.

(مَا يَحْبِسُهُۥٓ ) : (مَا يَمْنَعُهُ) واتە: چ شتێك ڕێی لێ دەگرێ، چونکە (الحَبْسُ: ضِدَّ التخْلِية) وشەی (حبس) ئەوەیە کە شتێك ڕابگری، پێچەوانەی (تخلية)یە واتە: شتێك ئازاد بکەیو لێی بگەڕێی.

(مَصْرُوفًا عَنْهُمْ ) : واتە: لێیان لادەدرێ، (الصَّرْفُ: رَدُّ الشيءِ مِنْ حَالَةٍ إِلى حَالَة وإِبْدَالُهُ بغَيْرِهِ) وشەی (صَرْف) بریتییە لەوەی شتێك لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك بگۆڕیو لایبدەی، (مَصْرُوف) واتە: شتی لادراو.

(وَحَاقَ بِهِم ) : (نَزَل عليهم) دابەزیە سەریان، (حاق) واتە: دەوری دان.

(نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ ) : (نَزَعَ الشيء مِنْ مَكَانِهِ: خَلَعَهُ) شتێك لە شوێنی خۆی هەڵقەنی، واتە: لێمان دارنیو لێمان سەندەوە.

(لَيَئُوسٌ ) : (یؤس) صیغەی موبالەغەی (یائس)ە، واتە: نائومێد، (یؤوس) واتە: زۆر نائومێد، (یئس یَیئس : الیأس: القُنوط وَهو انْتِفَاءُ الطَّمَعِ)، (یئس) بریتیە لە نائومێدیی‌و ئومێد بڕان، ئەوە کە هیچ ئومێدێکت نەمابێ بە هیچ شتێك.

(كَفُورٌ ) : صیغەی موبالەغەی (کافر)ە، واتە: کەسێك کە سپڵەیە بەرانبەر چاکەو نیعمەت، ئنجا (کفور)، واتە: زۆر سپڵە.

(نَعْمَآءَ ) : واتە: خۆشیی‌و چاکە، پێچەوانەی (ضَرآء)ە، واتە: ناخۆشیی‌و گرفتاریی.

(لَفَرِحٌ ) : (الفَرَحُ: إنْشِرَاح الصَّدْرِ بِلَـذَّةٍ عَاجِلَـة، السُّرور الشَّدِيد)، کەواتـە: (فـرِح) واتـە: زۆر زۆر دڵخۆش، کـە خـوای پەروەردگـار زۆر دڵخۆش بـوونی، بـە شـتێکی خراپ دانـاوە بۆ مرۆڤ، مەگەر بە بەخششی خـواو بە بەزمیی خـوا.

(فَخُورٌ) : (الفَخْرُ : المُبَاهَاةُ فِي الأَشْيَاء الخَارِجَة عَنِ الإِنْسَان كَالمَالِ وَالجَاهِ، رَجُلٌ فَاخِر وَفَخُور وَفَاخِير عَلَى التَّكْثِير) وشەی (فخر) بریتیە لە خۆهەڵکێشـان بـەو شـتانەوە کـە ئینسان لە دەرەوەی خۆینی، وەك: سـەروەت‌و سـامان، خـزم‌و کـەس‌و، عەشـیـرەت‌و جاهـو ئەوانە، دەگـوترێ: (رَجُلٌ فَاخِـر وَفَخُور وَفَاخِير) ئەگەر بتەوێ کەسـێك بـەوە وەسـف بکـەی کـە زۆر شـانازیی بـە خـۆیەوە دەکـات‌و خـۆی هەڵدەکێشـێ، بەو سـێ وشـەیە، بـاس دەکـرێ.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەكـان

وەك پێشتـر ئاماژەمان پێدا، خـوا ﷻ ئـەم سـوورەتەی (هـود)ی لە قۆناغێك لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دابەزاندوە، كە قۆناغێكی زۆر سەختو دژوار بووە، زۆر ناسكو هـەستیار بـووە، كـە بـە مەزنـدە لـە سـاڵانی: (١٠و ١١و ١٢)ەو ئـەو دەوروبـەرەدا، ئـەم سوورەتی (هـود)ەی دابەزاندوە، ئەو كاتەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە حاڵەتێكی زۆر سەغڵەتیی‌و تەنگانەدا بووە، ژمارەیەك لە هاوەڵانی كۆچیان كردوە بـۆ حەبەشە، بـۆ جاری دووەم، هـاوەڵانی بەڕێـزی لـە ژێـر ئەشكـەنجەو ئازاری كافرەكـانی قوڕەیشـدا بوون، بۆ خۆشی چەندان هەوڵی داون، بۆ ئەوەی كە ئـەو بانگـەوازە ئیسلامییە، ئـەو كارو پڕۆژە ئیسلامییە، كە بە دەستییەوە بووە، لە چوار چێوەی مەككـە، لـە بازنـەی تەسكی مەككـە، بیباتـە دەر، بیباتـە شوێنێكی گونجاوتر: چووە بۆ طائیف، بـەڵام بـە نائومێدیی گەڕاوەتەوە، چووە بۆ لای زۆر لە عەشـیـرەتو هۆزەكان، بـەڵام وەڵامێكی چـاكو ئەرێنیی وەرنەگرتۆتـەوە.

هـەروەها لە ساڵی دەیەمی پێغەمبـەرایەتییدا، واتە: پێش دابەزینی ئەم سـوورەتی (هـود)و، سـوورەتی (یونس)یش پێشتری، هـەر كـام لە پشـتیوانە دەرەكییەكـەی مـامی (أبو طالب) كۆچی دوایی دەكـات، كە قوڕیشـییەكان لەبـەر (أبو طالب) زۆر دەسـتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەپاراست.

پاشـان پشـتیوانە نێوخۆییەكـەشی، واتـە: پشـتیوانە نێوخۆییـە ڕواڵـەتو بەرهەستییەكـەی، ئەگـەرنا ئـەو هـەر پشـتی بـە خـوا قایم بـووە، وەك پشتیوانێكی مەعنـەویی، بەڵام دیارە هۆكارەكان پێویستە بگیـرێنەبەر، خەدیجـەش خـوا لێـی ڕازی بێ، هاوسـەری بـەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبـەر ﷺ ئافرەتی‌و بلیمـەتو كارامـەو شارەزا، ئەویش دیسـان هـەر لـەو سـاڵەدا (سـاڵی دەیـەمی پێغـەمبـەرایەتیی)دا، كۆچی دوایی دەكـاتو لـە دەسـتی دەدات، بۆیـە دوایـی مێژوونـووسـان ناویـان لـەو سـاڵە نـاوە (عام الحُزن)، ساڵی ماتەمینی، ساڵی خەمباریی، چونكە دەڵێن: پێغەمبـەریان ﷺ دەبینـی

دوای ئـەوە کـە خەدیجەی لە دەست داو، مامیشی وەفاتی کرد، خەمبارو پەژارەدار بـوو، هـەندێك جار لەبەر خۆیەوە دەیفـەرموو: {مَا نَالَتْ مِنِّي قُرَيْشٌ شَيْئاً أَكْرَهُهُ حَتَّى مَاتَ أَبُو طَالِبٍ} {أَخْرَجَهُ الدَّيْلَمِيُّ برقم: (٦٣٠٧)، سيرة إبن هشام ج١، ص(٤١٧)}.

واتـە: هـەتا (أبـو طالـب) نـەمرد بـوو، هـۆزی قـورەیش منیـان هێنـدە ئەزیـەت نەدەداو، هێندە دەسـت درێژییان نەدەکـردو هێندە ناڕەحـەتییان نەدەکـردم.

ئنجا لە بارودۆخێکی ئاوادا، ئەم سووڕەتە موبارەکە دابەزیوە خوا ﷻ دەفـەرموێ:

(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان، بـە نـاوی خـوای بە بەزەیی بەخشندە، وەك زۆر جاری دیکەش باسـمان کـردوە: کـە دەگـوترێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) واتـە:

١/ من ئەم کـارە دەسـت پێدەکـەم، بە ناوی خـوا دەسـتی پێدەکـەم.

٢/ بۆ خـوا ئـەم کـارە ئەنجـام دەدەم.

٣/ پشتیشم بە خـوا قـایمـەو هیممەتو هێـزو توانا لـە خـوای بالادەست چـاوەڕێ دەکـەم، بۆ ئەوەی یارمەتیـم بدات ئەم کـارە تەواو بکـەم.

ئنجا دەفـەرموێ: ﴿الٓر﴾، دیـارە پێشـتـر باسی ئەو پیتە پچڕ پچـڕانـەمان کـرد، بە تایبەتی لە سـەرەتای سـووڕەتی (یونس)دا، بە تەفصـیلێ لەوبارەیەوە دواینو گوتمـان: ئـەو سـووڕەتانەی بـە پیتـە پچـڕ پچـڕەکان (الحُرُوف الـمُقَطَّعَة)، دەسـت پێدەکـەن، بیستو نۆ (٢٩)ن، بۆیەش ئەو پیتـانە وایان پـێ دەگـوترێ: چونکـە بەسـەر یەکـەوە ناخوێنرێنـەوە، ئێسـتا ئەمـە: ﴿الٓر﴾، ناگونجـێ بڵـێی: ئەلـەر، یـان: ﴿الٓمٓ﴾، ناگونجـێ بڵێی: ئەلـەم، بەڵکو دەبـێ بە جیـا جیـا، بخـوێندرێنەوە: ئـەلیف، لام، ڕا، ئاوا بخوێنرێتەوە، دیارە لـەوێ باسـمان کردوە، لێرە دووبارەی ناکـەینەوە، بەڵام ئـەوەی کە زۆربەی توێژەروانـی قورئان لەسـەری ڕێککـەوتوون، دەربارەی حیکمەتی دانانی ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، کـە تەنیا لـە سـەرەتای سـووڕەتەکانەوە هـەنە، کـە ئـەوانیش (٢٩) سـووڕەتن لـە (١١٤) سووڕەتەکـەی قورئـان، زۆربـەی زانایـان دەڵـێن: مەبەست پێـی

ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیەوێ بەو خەڵکە بفەرموێ: قورئـــان هـەر لەو پیتانەو لەو دەنگانە پێکهاتوە، کە ئێوە پێیان دەنووسن‌و، وتووێژو قسەیان پێ دەکەن، ئنجا ئەو کەرەســـتەیە لەبەردەستی ئێوەشدا هەیە، بۆیە ئەگەر بڕوا ناهێنن کە قورئـــان فەرمایشتی خوایەو، هیچ پەیوەندیی بە موحەممەد ﷺەوە نیە جگە لە گەیاندنی، ئەگەرنا ئەویش دەستی تێدا نیە، ئەگەر ئەو قەناعەت‌و بڕوایەتان نیە، فەرموون: ئێوەش ئەو کەرەســـتەیە لەبەردەستتان دا هەیەو لەو پیت‌و دەنگـــانە، ئێوەش کتێبێکی وەك قورئان بێنن، یان وەك وێنەی دە (١٠) سووڕەتی بێنن، یان وەك وێنەی سووڕەتێکی بێنـن.

﴿كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ﴾، زۆربەی شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: لێرەدا وشەی (کتاب)، (خبر)ە، بۆ (مبتدأ)یەکی فرتێنراو(محذوف) کە دەزانرێ، یانی: (هذا کتاب)، ئەمە کتێبێکە ﴿أُحۡكِمَتۡ﴾، ئایەتەکانی مەحکەم کراون، بە کوردیش دەڵێین: (مەحکەم) واتە: قاییم توندو تۆڵ، تۆکمە، بە هێزو پێز، دەگوترێ: (قَلْعَة مُحْكَمَة)، قەڵایەکی مەحکەم، کە مەجالی تێدا نەبێ‌و درزو کەلێنی تێدا نەبێ، دوژمــن لەوێوە زەفەر بە خەڵکی قەڵایەکە بەرێ، قورئـــانیش وا تۆکمەو توندو تـۆڵ‌و، بەهێزو پێز کراوە، کە هیچ کەلێن‌و درزی تێدا نیە، کەسێك بتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێ، ئایەتەکانی بەو شێوەیە مەحکەم‌و قایم‌و توند کراون.

﴿ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾، دوایـیـش ئایەتەکـــانی ڕوونکراونـــەوە، دوای ئەوەی کە مەحکەم‌و توندو تۆڵ کراون، ئنجا ڕوونیش کراونەوە مانـاو مەبەستەکانی ڕۆشـــنن، لە لایەن کـارزانی شــارەزاوە، خــوا ﷻ کـــارزان‌و کـاربەجێیە، کـارەکانی بەجێن‌و، خـاوەنی ئەوپەڕی حیکمەتە، هەروەها شارەزایە، زانایە، ئاگادارە، بە هەموو هەست‌و نەستێك، بە هەموو وردو درشتی دروستکراوەکان بە گشتی‌و، مرۆڤەکان‌و جنـد بە تایبـەت.

ئنجـا ئەو قورئـانە کە ئـــاوا موحکـەمەو موفەصصەڵە، ئاوا تۆکمـەیەو، ڕوونـە، لەلایەن خوای کارزان‌و شـارەزاوە بەو شێوەیەی لێکـراوە، ئایا بۆچی نێردراوەو ئامانج لێی چییـە؟ دەفـەرموێ : ﴿أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، کە جگە لە خوا کەس نەپەرستن،

واتە: ئەوە ئامانجی بنەڕەتیی هاتن‌و دابەزینی قورئانە، ﴿ إِنَّنِي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴾، دیارە لێرەدا خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: بێگومان من لەوەوە (واتە: لە خواوە) بۆ ئێوە ترسێنەرو موژدەدەرم، (الإنذار: إعلامٌ مَعَ تَخْويف)، (إنذار) ئاگاداركردنەوەیە لەگەڵ ترساندندا، من هاتووم بتانترسێنم، هۆشیارتان بكەمەوە، بێدارتان بكەمەوە ﴿ وَبَشِيرٌ ﴾ موژدەشتان پێ بدەم، بتانترسێنم‌و هۆشیارتان بكەمەوە، كە ئەگەر ڕێی خوا نەگرن، سەرەنجامێكی شووم‌و خراپ چاوەڕێتانە‌و، دڵخۆشتان بكەم‌و موژدەشتان پێ بدەم، كە ئەگەر ڕێی خوا بگرن، سەرفرازیی‌و بەختەوەریی دنیاو دواڕۆژتان بە نسیب دەبێ.

﴿ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ﴾، هەروەها ئەم قورئانە دابەزێنراوە كە بە خەڵك بڵێ: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن، واتە: دان بە هەڵەكانتان دابنێن، عەیب‌و كەم‌و كوڕییەكانی خۆتان ببینن‌و، خۆتانیان لێبژارد بكەن‌و، داوای لێبوردن لە خوا بكەن، كە ئەو كەم‌و كوڕییانەتان هەبوون، بە تایبەتی هاوبەش بۆ خوا دانان، دوور لە خوایی ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ﴾، ئنجا دوای ئەوە ئنجا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، واتە: پێشێ خۆتان بژارد بكەن لە سیفەتە خراپەكان، دانیان پێدا بێنن‌و خۆتانیان لێ پاك بكەنەوە، ئنجا خۆتان چاك بكەن‌و، خۆتان برازێننەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەكان، لە پێش هەموویانەوە: خوا بە یەكگرتن‌و تەنیا خوا پەرستن.

ئنجا ئەگەر ئێوە واتانكرد: ﴿ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا ﴾، بە شێوەیەكی باش‌و بە ژیان‌و گوزەرانێكی باش دەتانژیەنێ، یانی: لەم ژیانە دنیاییە كەمەدا، ژیانێكی باشتان بە قسمەت دەكات، ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، تاكو كاتێكی دیاریكراو، كە ئەگەر مەبەست كۆی مرۆڤەكان بێ، مەبەست ئەو كاتەیە كە لاپەڕەی ئەم ژیانی دنیایە دەپێچرێتەوەو، ژیانی دنیا كۆتایی پێ دێ‌و، ئەگەر مەبەست تاك تاكی مرۆڤەكان بێ، ئەوە هەر كامێكیان مەرگی لەگەڵدا ڕووبەڕوو دەبێتەوەو كاتی مردنی دێ،

بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ ﴾، خوا بە هەر خاوەن چاکەیەك، پاداشتی خۆی، بەخششی خۆی پێ دەبەخشێ، ﴿ وَإِن تَوَلَّوْا فَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴾، ئەگەر پشتیش هەڵکەن، ئەمە لە ئەسڵدا (وَإِنْ تَتَـوَلَّوا)ە، واتە: ئەگەر پشت بکەنە قورئانو پێغەمبەر ﷺ، ﴿ فَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴾، ئەوە من مەترسیی سزایی ڕۆژێکی گەورەتان لێدەکەم، کە ڕۆژی دوایی یە، ﴿ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ﴾، گەڕانەوەتان تەنیا بۆ لای خوایە، (مرجع)، چاوگی (میمی)یە بە مانای (رجوع)، واتە: گەڕانەوەو گێڕدرانەوەی ئێوە، تەنیا بۆ لای خوایە.

(جار و مجرور) کە پێش دەکەوێ، وەك زۆر جار گوتوومانە: دەلالەت لەسەر کورت هەڵهێنان دەکات، واتە: گێڕدرانەوەی ئێوە تەنیا بۆلای خوایە، تەنیا ئەو لێتان دەپرسێتەوە چیتان کردو چۆنتان کرد ؟ ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، دڵیش لە دڵ مەدەن، کە بڵێن: دەبێ خوا بتوانێ زیندوومان بکاتەوەو بمانگێڕێتەوە؟! چونکە ئەو لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە.

ئنجا دێتە باسی هەڵوێستی نەرێنییو خراپی بێبڕوایەکان، دوای ئەوەی کە نێوەڕۆکی ئەو پەیامەی کە قورئان هێناویەتیو، پێغەمبەری خاتەم ﷺ بە مرۆڤایەتیی دەگەیەنێو، باسی هەڵوێستی نەرێنیی کافرەکان، دەکات، دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ﴾، وەك پێشتریش گوتوومانە: ﴿ أَلَآ ﴾، (أداة التنبيه)، ﴿ أَلَآ ﴾، ئامرازی ئاگادار کردنەوەیە، لە زمانی کوردییدا ئێمە ئەگەر بمانەوێ کەسێك ئاگادار بکەینەوە، دەڵێین: ئەها، مانای وریابەو ئاگادار بە:

ئەها ئاگاداربن! ئەوان (واتە: بێبڕوایەکان)، ﴿ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ ﴾، سینەکانیان دەنووشتێننەوە، سینە چۆن دەنووشتێتەوە؟ ئەوە کە ئینسان خۆی کوڕ بکات

(یحنون: یعطفون، یلوون)، سەرو سینەیان دەنوشتێننەوە بۆچی؟ ﴿لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُۚ﴾، تاکو خۆیانی لێ پەنهان بکەن، خۆیان لە کێ پەنهان بکەن؟ دیارە لە پێغەمبەر ﷺ، ئنجا یان لەبەر ئەوە بووە کە چاویان بەرینایی نەداوە بیبینن، کەسێك کە زۆر ڕقی لە کەسێك بوو، ناتوانێ تەماشای بکات، لەبەر بێزاریی‌و نارەحەتیی، یان بۆ ئەوەی خۆیان دەرباز بکەن‌و گوێیان لەو پەیامەی پێغەمبەر ﷺ نەبێ‌و، خۆیانی لێ پەنهان بکەن، ﴿أَلَآ﴾، ئاگاداربن، ئەها ﴿حِينَ يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ﴾، کاتێك کە بە پۆشاکەکانیان خۆیان دادەپۆشن، دەم‌و چاویان دادەپۆشن، ﴿يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ﴾، خوا دەزانێ چی پەنهان دەکەن‌و چیش ئاشکرا دەکەن، ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، بێگومان ئەو (خوا) زانایە بە خاوەنی سینەکان، خاوەنی سینەکان، مانای ئەو نهێنییانەی کە هێندە لە دڵ‌و سینەکانیاندا جێگیر بوون، بوون بە خاوەنی ئەو سینانە، واتە: خوا بە نهێنییەکانیان ئاگادارە، هیچ گومان لەوەدا نیە.

ئنجا خوا عزّوجلّ دێتە سەر باسی ڕاستییەکی دیکەو، باسی سیفەتەکانی خۆی دەکات، تاکو بزانن: خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە ئەو قورئانەی ناردوەو ئەو پێغەمبەرەی ﷺ بە نوێنەرایەتیی ناردوە، ئنجا کە داوایان لێ دەکات تەنیا بەندایەتیی بۆ وی بکەن، ئەوە هەندێك لە سیفەتەکانی، دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا﴾، هیچ پێرۆیەك، ﴿دَآبَّةٖ﴾، واتە: هیچ ژیانداریك، پێرۆیەك، لەسەر زەوی نیە، مەگەر بژێوی لەسەر خوایە، (رزق)، واتە: خواردن‌و خۆراك‌و ئەوەی کە پێی دەژی، ﴿وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ﴾، شوێنی تێدا نیشتەجێبوونی‌و، شوێنی بە شێوەی کاتیی تێدا مانەوەشی (یان شوێنی تێدا هەڵگێرانی) دەزانێ، چونکە (ودیعة)، سپاردەیەکە تۆ بە کەسێکی دەسپێری بە شێوەی کاتیی لەلای دەبێ، کەواتە: (مُسْتَقَرّ) شوێنێکە کە ئەو ژیاندارانە تێیدا

نیشتەجێ دەبن‌و، (مستودَعْ)، ئەو شوێنەیە کە بە شێوەیەکی کاتیی تێیدا دەبن، خوا هەمووی دەزانێ، ﴿ كُلٌّ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴾، واتە: هەر کام لەو شوێنی نیشتەجێبوون‌و، شوێنی بە کاتیی تێدا مانەوەیان، لە نووسراوێکی ڕوونکەرەوەدا تۆمار کراوە، کە مەبەست پێی زانیاری بێ‌سنووری خوایە، یاخود مەبەست پێی (اللّوح المحفوظ)ە، ئەو تەختە گەورەیە، کە خوا هەموو زانیارییەکانی تێدا تۆمار کردوون، لەسەر ڕای هەندێك لە زانایان.

بەڵام گرنگ ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: کە هەرچی زانیاریی هەیە، هەرچی وردەکاریی هەیە، دەربارەی دروستکراوەکان، لەلای خوای پەروەردگار، وەك چۆن یەکێك لە ئێوە شتێك بنووسێ، لەبەر چاویەتی، نە کەم دەکات‌و نە زیاد دەکات، خواش هەمووی تۆمار کردوە، زانیاریی دەربارەی گشت دروستکراوەکان، هەمووی لەلای خوا تۆمار کراوە ئنجا چ لە جسمێکدا تۆمار کرابێ بە ناوی (اللّوح المحفوظ)، یان (کتاب مبین) یان (إمام مبین)، چ مەبەست پێی زانیاریی بێ‌سنووری خوا بێ، چونکە یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا، بەڵام خوا بۆ ئێمە بەو شێوەیە تەعبیری دەکات، کە ئەگەر ئێمە شتێك بنووسین، دوایی ئەو زانیارییە هەمیشە لەبەردەستمان دەبێ‌و، دەگەڕێینەوە بۆی‌و، کەم‌و زیاد ناکات، زانیاریی خوای زاناش بە دروستکراوەکانی بەو شێوەیە.

ئنجا خوا ﷻ زیاتر خۆی دەناسێنێ، دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا ﴾، واتە: ئەو (خوا) ئەو زاتەیە، کە ئاسمانەکان‌و زەوی لە شەش ڕۆژاندا هێناونە دی.

شەش ڕۆژ، دیارە ئەو کاتە پێش ئەوەی ئاسمان‌و زەوی ببن، کۆمەڵەی خۆر ببێ‌و زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا بخولێتەوە، شەوو ڕۆژی (٢٤) سەعاتیی نەبوو ون، ئەدی مەبەست چییە؟

(أیام)، کۆی (یوم)ە، (یوم) لە زمانی عەرەبیدا واتە: بەشێك لە کات، قۆناغێك خوای پەروەردگار لە قورئاندا باسی (یوم)ی کردوە، کە هەزار ساڵە : ﴿ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ ﴾الحج، واتە: ڕۆژێك لەلای پەروەردگارت بە قەدەر هەزار ساڵی ئێوەیە کە دەیژمێرن، بەڵکو لە سووڕەتی (المعارج)دا دەفەرموێ : ﴿ تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ ﴾المعارج، واتە: فریشتەکان و ڕووح (جبریل)، بەرەو خوا بەرز دەبنەوە، لە ڕۆژێکدا کە پەنجا هەزار ساڵە.

کەواتە : ﴿ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾، بە تەئکید مەبەست پێی شەوو ڕۆژو (٢٤) سەعاتیی نیە، بەڵکو یانی: شەش قۆناغ، خوا ئاسمانەکان و زەوی بە شەش قۆناغ هێناونە دی ! ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ ﴾، ئەو کاتەش تەختی (حوکمڕانیی خوا) لەسەر ئاو بوو، (عەرش)، واتە: تەختی حوکمڕانیی.

ئنجا ئایا تەختی حوکمڕانی خوای پەروەردگار چی یەو چۆنە؟ هەر خوا دەزانێ، گرنگ ئەوەیە ئەویش دروستکراوێکی خوایە، کەواتە: خوا پێش ئەوەی ئەم ئاسمان و زەوییە دروست بکات، عەرشیش بووەو ئاویش بووە، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو مەسەلەیە.

ئنجا ئایا بۆچی خوای کارزان ئەم ئاسمانانەو زەوی هێناونە دی؟ ﴿ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾، تاکو تاقییتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باش دەکەن، کەواتە: ئەو بوونە هەمووی بە سەرو خوارییەوە ((الأرض)، خوارێیە (سماء)، سەرێیە)، بوون (وجود) بە سەروو خوارییەوە بۆیە دروست کراوە، کە مرۆڤی تێدا تاقی بکرێتەوە! ﴿ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِن بَعْدِ الْمَوْتِ ﴾، وە ئەگەر تۆ بڵێی: ئێوە لە دوای مردن زیندوو دەکرێنەوە، هەڵدەستێنرێنەوە، بڵاودەکرێنەوە، ﴿ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾، ئەوانەی بێبڕوان بە جەخت کردنەوە دەڵێن: ﴿ إِنْ هَٰذَا

إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، ئەمە جگە لە جادوویەكی ڕوون و ئاشكرا هیچی دیكە نیە، هەڵبەتە ئەمە خوێنراویشەتەوە: (إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سَاحِرٌ مُّبِينٌ )، كە ئەگەر بڵێی: ﴿سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، واتە: قورئان جادوویەكی ئاشكرایەو، ئەگەر بڵێی: (سَاحِرٌ مُّبِينٌ )، واتە، موحەممەد ﷺ جادووگەرێكی ئاشكرایە، ﴿ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ﴾، ئەگەر سزایان بۆ دوابخەین بۆ كاتێكی ژمێردراو، ﴿ أُمَّةٍ ﴾، واتە: كۆمەڵ (جماعة)، كە شارەزایانی زمان دەڵێن: (أُمة)، هەر كۆمەڵە شتێكە كە وەك یەك بن، ئنجا لێرەدا مەبەست پێی كۆمەڵە ساڵێكە، وەك لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ : ﴿ ...وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: دوای كۆمەڵە ساڵێك، وەبیری هاتەوە، بەڵام كە لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: كۆمەڵێك لە خەڵكی لەسەر وێ (لەسەر ئاوەكە) بینی، یانی: كۆمەڵە شوانێك، لەبەر ئەوەی هەموویان لە پیشەی شوانێتییدا یەك بوون، كەواتە: لێرەشدا، (أُمة) یانی: كۆمەڵە كاتێك، بەڵام چەند كاتێكی كەم، لەبەر ئەوەی ژمێردراون، واتە: ئەگەر ماوەی چەند ساڵێك، یان ماوەی چەند كاتێك، سزایان لێ دوا بخەین، ﴿ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ﴾، زۆر بە جەختكردنەوە دەڵێن: چ شتێك ڕێی لێ دەگرێ بێ، ئەو سزاو ئازارە بۆچی نایەت؟! ﴿ أَلَا ﴾، ئاگاداربن! ئەها، ﴿ يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ ﴾، كاتێك ئەو ئازارو سزایەیان بۆ دێ، لێیان لانادرێ، لێیان لادراو نابێ، ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، ئەوەی كە گاڵتەیان پێ دەكرد، دەوریان دەداو، ئابڵووقەیان دەداو، بە هیچ ڕێیاندا ڕێی هەڵاتنیان نابێ و قوتار نابن.

دوایی خوا ﷻ باسی هەندێك سیفەتی نەرێنیی و خراپی ئینسان دەكات بە گشتی، بەڵام بە ئایەتەكەی كۆتایی، ئایەتی ژمارە (١١)، بۆمان دەردەكەوێ كە

مەبەستی بەس ئینسانی بێبڕوایە، چونکە لەوێ دا، ئەوانەی کە خۆڕاگرن‌و ئەهلی ئیمانن‌و کردەوە چاکن، جیایان دەکاتەوە لەو حوکمە، ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الْإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ﴾، ئنجا بە جەخت کردنەوە ئەگەر ئێمە بەزەییەکی خۆمان بە مرۆڤ چێشت، واتە: چاکەو نیعمەتێکمان پێدا، پێمان چێشت، ﴿ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ﴾، دوایی لێمانستاندەوە، لێمان داڕنی، لێمان وەرگرتەوە، ﴿إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ﴾، بێگومان ئەو زۆر نائومێدو زۆریش سپڵە دەبێ، بە هات زۆر دڵخۆش‌و لەخۆبایی دەبێ، بە نەهاتیش زۆر نائومێد دەبێ‌و، دەست دەکات بە سپڵەیی‌و ناسوپاسیی بەرانبەر بە خوا.

﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاءَ بَعْدَ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي﴾، ئەوە ئەگەر ڕەحمەت‌و بەزەیی لەگەڵ بنوێنین، چاکەی پێ بدەین، دوایی لێی وەربگرینەوە، تووشی نائومێدیی‌و سپڵەیی دێ، ئەگەر چاکەی پێ بچێژین، دوای ئەوەی کە ناخۆشیی تووش بووە، ﴿لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي﴾، زۆر بە جەخت کردنەوە دەڵێ: تەواو ناخۆشییەکان، خراپەکان، لە من ڕۆیشتن، تازە باریان کردو، جارێکی دیکە تووشی ناڕەحەتیی نابمەوە، ﴿إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾، بێگومان ئەو جۆرە مرۆڤە زۆر دڵخۆشە، بەو تۆزە نیعمەت‌و خۆشییە، (فَخُورٌ)، زۆر شانازییکەرە بە خۆی دەنازێ، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (بە بستە ئاوێکی دەکەوێتە مەلە)، هەم لە هاتدا لەخۆبایی دەبێ‌و، هەم لە نە هاتدا نائومێد دەبێ، بەڵام ئایا هەموویان وان؟ دەفەرموێ : ﴿إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا﴾، هەموو مرۆڤەکان وان، جگە لەوانەی کە خۆڕاگرن‌و، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن.

لێرەدا باسی ئیمانی نەکردوە، چونکە هەر دیارە ئینسان بە هۆی ئیمانەوە خۆڕاگر دەبێ لە بەرانبەر دنیادا، کە بە خۆشییەکەی زۆر دڵخۆش نەبێ‌و، لەخۆبایی نەبێ‌و، یبە ناخۆشییەکەشی، بە ناڕەحەتییە تاڵییەکانیشی نا ئومێد

نەبێ‌و، دەست نەکات بە سپڵەیی‌و ناشکوریی بەرانبەر بە خوا، ئەوە خۆڕاگرییە، ئەوە بەرهەمی ئیمانە، واتە: لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: جگە لەوانەی خۆڕاگرن، واتە: خۆڕاگرن بە هۆی ئەوەوە کە ئیمانیان هەیە، ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، کردەوە باشەکانیش ئەنجام دەدەن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾، ئەوانە لێبوردنێکی تایبەت‌و، پاداشتێکی گەورەیان هەیە لەسەر ئەو خۆڕاگرییەو، لەسەر ئەو کردەوە باشانە کە ئەنجامیان دەدەن.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم** : كە دەفەرمویٌ: ﴿ الٓر كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ١ ﴾، پێشتر باسمان كرد، ئەو پیتە پچڕ پچڕانە خوای پەروەردگار بۆیە لە سەرەتای (٢٩) لە سوورەتەكانی قورئاندا داینـاون، كە هەیە یەك پیتەو، هەیانە دوو پیتە، هەیانە سێیەو، هەتا پێنجیش دەڕوات، دەیەوێ بە خەڵك بفەرموێ: ئەو قورئانە كە ئێوە لە بەرامبەریدا دەستەوساون‌و دەستە پاچەن، هەر لەو پیت‌و دەنگانە پێك دێ، كە ئێوە قسەیان پێ دەكەن‌و پێیان دەنووسن، ئنجا ئەگەر ڕاست دەكەن، خوا بۆ موحەممەدی ﷺ نەناردوەو فەرمایشتی خوا نیە، فەرموون: ئەوە عەرزو ئەوە گەز، مەیدان مشك نەیان كێڵاوە، ئێوەش وێنەیەكی قورئان بێنن، نەخێر وێنەی دە (١٠) سوورەت، نەخێر وەك یەك سوورەت بێنن، ئنجا كە نەتانتوانی، كەواتە: دڵنیا بن كە سەرچاوەی لێوە هاتنی ئەو قورئانە، خوای پەروەردگارەو بەشەر نیە، موحەممەدو غەیری موحەممەد نیەو، ئەو كەسەی كە لەو كەرەسەیەی كە لەبەردەستی ئێوەش دا هەیە، قورئانێكی ناردوە، كە هەمووتان لە بەرانبەری دا دەستە پاچەو دەستەوسانن، هەر خوایە ﷻ كە سنوورێك بۆ دەسەڵاتی، سنوورێك بۆ حیكمەت، سنوورێك بۆ زانیاریی نیە، بۆیە كتێبێكی ناردوەو شتێكی فەرمووە، كە ئێوە نەك كەسێكتان، بەڵكو هەموو خەڵكی سەر زەویش كۆبكەنەوە، ناتوانن شێوەی ئەوە بڵێن.

كە دەفەرموێ : ﴿ كِتَٰبٌ ﴾، پێشتر باسمان كرد: یانی: (هذا كتاب)، ئەمە كتێبێكە، دیارە قورئان هەم بە قورئان ناوبراوە، هەم بە (كتاب) ناونراوە، قورئان واتە: خوێندراوە، قورئان چونكە دەخوێندرێتەوە، (كتاب) واتە: نووسراو، چونكە دەنووسرێتەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ﴾، ئایەتەکانی موحکەم کراون، یانی: مەحکەمو قایمو توندو پتەو کراون ﴿ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴾، دواییش ڕوون کراونەوە، لەلایەن کارزانی شارەزاوە، دەڵێ: {الإحْكَامُ : إتْقَان الصنْع ، مُشْتق مِنَ الحِكْمَةِ، وَهِيَ إتْقَان الأَشْيَاء بحَيْثُ تَكونُ سالِمَةً مِنَ الأَخْلالِ الَّتِي تَعْرِضُ لِنوعِها، أَي جُعِلَتْ آيَاتُهُ كَامِلَةً فِي نوعِ الكَلَامِ، بحَيْث سَلِمَتْ مِنْ مخالفة الوَاقِعِ وَمِن أَخلال المَعْنَى وَاللَّفْظ}[1].

واتە: (إحْكَام) بریتیە لە شتێك كە باشو بە کارامەیی دروست کرابێ، لە (حكمة)وە هاتوە، (حكمة)یش بریتیە لەوە کە شتەکان زۆر بە ڕێکیی دابنرێن، بە شێوەیەك کە ئەو کەمو کوڕییانەی کە لە جۆری ئەوان بەسەریان دێ، لەو کەمو کوڕییانە پارێزراو بێ، واتە: ئایەتەکانی تێرو تەواون لە جۆری قسە، بە شێوەیەك کە هیچی لەگەڵ واقیعدا تێك ناگیرێو، هیچی نە لە ڕووی واتاوە، نە لە ڕووی بێژەوە، هیچ کەمو کوڕییەکیان تێدا نیە.

کە دەفەرموێ : ﴿ فُصِّلَتْ ﴾، {التفصيلُ: التَّوْضِيحُ وَالبَيَانُ: وَهو مُشتقٌ مِنَ الفَصْلِ بمَعْنَى التَّفْرِيق بَيْنَ الشيء وَغَيْرِهِ بمَا يُمَيِّزُهُ، فَصَارَ كِنَايَةً مَشْهورَةً عَنِ البَيَانِ لِمَا فِيهِ مِنْ فَصْلِ المَعَانِي}[2].

واتە: (تَفْصِيل) واتە: ڕوونکردنەوەو ئاشکرا کردن، ئەویش لە (فَصْل)ەوە وەرگیراوە، واتە: لێك جیاکردنەوە لە نێوان شتێكو جگە لە خۆی دا بە شێوەیەك کە جیای بکاتەوە.

ئنجا وشەی (فَصْل) کراوە بە کنارە (كِنَايَة)یەکی ناودار بۆ ڕوونکردنەوە، چونکە ڕوونکردنەوە دەبێتە هۆی ئەوەی ماناو مەبەستەکان لێك جیا بکرێنەوەو، بۆ خەڵك زیاتر ئاشکرا بنو خەڵك باشتر لێیان تێبگات.

---

١) التحرير والتنوير، ج ١٢، ص ١٦٤ .

٢) التحرير والتنوير، ج ١٢، ص ١٦٤.

کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ﴾، دەڵێ : (ثُمَّ للتَّرَاخِي فِي الرُّتْبَةِ)، (ثُمَّ) بۆ بە دوادا هاتنە لە ڕووی پلەوە.

یانی: ئایەتەکان پێشێ مەحکەمو تۆکمەو توندو تۆڵ کراون، دوایش ڕوونکراونەوە، واتە: لە یەك کاتدا ئەو ئایەتانە، هەم مەحکەمیشن، هەم موفصەڵیشن، هەم تۆکمەو توندو تۆڵو بەهێزن، بێ کەلێنو کونن، هەمیش ڕوونو ئاشکران، لە لایەن کێیەوە؟ لە لایەن خوایەکەوە کە کارزانی شارەزایە، واتە: خوا ﷻ کە حەکیمە بە حیکمەتی خۆی ئایەتەکانی مەحکەم کردوون، تۆکمەو توندو تۆڵی کردوون، بێ کەلێنو بێ کەمو کووڕیی کردوون، ئنجا کە شارەزاشە، بە شارەزایی خۆی، لێکی جیا کردوونەوەو ماناکانی ڕۆشن کردوون، (أَحْكَمَهُ بِحِكْمَتِهِ وَفَصَّلَهُ بِخِبْرَتِهِ).

کە دەفەرموێ: ﴿ خَبِيرٍ ﴾، (الخَبِيرُ: العَالِمُ بِخَفَايَا الأَشْيَاء)، (خبیر) کەسێکە بە نهێنی شتەکان ئاگادارەو شارەزایە.

**مەسەلەی دووەم** : کە ئایەتەکانی : (٢و ٣و ٤)ن :﴿ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۚ إِنَّنِي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ ۝٢ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٖ فَضْلَهُۥۖ وَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٖ كَبِيرٍ ۝٣ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٌ ۝٤ ﴾، لەم سێ ئایەتەدا خوا ﷻ دە (١٠) ڕاستیی گرنگ دەخاتە ڕوو، دەربارەی نێوەڕۆكو مەبەستو ئامانجی ئەو قورئانە، کە وەك دوا پەیامی خۆی بە پێغەمبەری کۆتاییدا کە موحەممەدە ﷺ ناردوویەتی، ئنجا ئێمە ئەو دە(١٠) مەبەستو ئامانجەو، ئەو دە (١٠) ڕاستییە، بە ڕیزبەندیی برگەکانی ئەو سێ ئایەتە موبارەکە، دەخەینە ڕوو، لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا :

## پێناسەی دوا پەیامی خواو پێغەمبەری كۆتایی ﷺ،و ئامانجیانو، سەرەنجامی ئەو پەیامە

یەكەم: كە دەفەرموێ: ﴿ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، واتە: ئەم پەیامە، ئەم قورئانە هاتوە پێتان بڵێ، پێتان ڕابگەیەنێ، فێرتان بكات كە: جگە لە خوا هیچ كەسو شتێك نەپەرستن، چونكە بەڕاستیی تەنیا بەس خوا پەرستن، مرۆڤ ئازا دەكاتو ئازادی دەكات، سەربەستی دەكات، كاتێك مرۆڤ تەنیا بەندەی خواو خاوەنو بەدیهێنەرو پەروەردگارو ژیێنەرو مرێنەری خۆی دەبێ، لە تەڵەوداوی فیرعەونو طاغووتەكان دەربازی دەبێ، ئەو كۆتو زنجیرانەی ئەوان دەیخەنە ملو گەردنو دەستو پێی، دەیانپسێنێو ئازاد دەبێ، هەر بۆیە خوا ﷻ لە ئایەتی (١٥٧)ی سووڕەتی (الأعراف)دا ئاوا پێناسەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەكات، كە دەفەرموێ: ﴿ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ﴿١٥٧﴾ ﴾، واتە: پێغەمبەری خاتەم هاتوە، ئەو بارە قورسەی لەسەر شانیانە، لای بەرێ، ئەو كلتورو فەرهەنگی ڕزیوو عادەتو نەریتی كە باری شانی قورس كردوون، لەسەر شانیان لابەرێو، ئەو زنجیرو كۆتو پێوەندانەی كە دەستو پێو گەردنیان، بەستوون، بپسێنێ.

دووەم: كە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴾، (دیارە ئەوە لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموێ)، واتە: بێگومان من (موحەممەد) لە لایەن ئەوەوە (لە لایەن خواوە ﷻ) ترسێنەرو دڵخۆشكەرم.

ئەمە ئەركی پێغەمبەر ﷺ دەخاتە ڕوو، ئەركی سەرەكیی قورئان ئەوەیە كە خەڵك بكاتە بەندەی خواو، لە كۆیلایەتیی بۆ غەیری خوا دەربازو قوتاریان بكاتو، لە تەڵەوداوی طاغووتو فیرعەونەكان بیانپارێزێ، سەربەرزو سەرفرازیان بكات، بەڵام ئەركی پێغەمبەر ﷺ بریتیە لەوەی كە بیانترسێنێو دڵ خۆشیان بكات، وریایان بكاتەوەو هۆشدارییان بداتێ كە خۆیان تووشی

عەیبداریی‌و گوناهباریی لای خواو خەڵك نەكەن، بە هۆی لادان لە ئیسلامەوە، دڵ خۆشیشیان بكات بەوەی كە: ئەگەر بێ‌و رێی خوا بگرن، لە دنیادا سەربەرزو سەرفراز دەبن، لە دوا ڕۆژیشدا بە بەهەشتی خواو ڕەزامەندیی خوا شاد دەبن.

سێیەم: دەفەرموێ: ﴿وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ﴾، هەروەها قورئان هاتوە فێرتان بكات، پێتان ڕابگەیەنێ كە: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن.

داوای لێبوردن لە پەروەردگار، واتە: دان بە هەڵەو كەم‌و كورپیەكانی خۆتان دابێنن‌و، كەم‌و كوڕیی‌و عەیب‌و عارەكانی خۆتان ببینن، لە پێش هەموویانەوە هاوبەش بۆ خوادانان‌و بێبڕوایی، ئنجا گوناهو تاوانەكانی دی، ئنجا كە دانتان پێدا هێنان، خۆتانیان لێ خەلاس بكەن، خۆتانیان لێ دەرباز بكەن، ئەوە قۆناغی پاكسازیی، بە زاراوی ئەهلی تەصەووف: قۆناغی (التخلیة من الرذائل)، خۆ بێزار كردن لە سیفەتە نزم‌و پەستەكان.

چوارەم: دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾، دوایش بۆ لای بگەڕێنەوە، ئەمەش واتە: قۆناغی چاكسازیی، چونكە كە تۆ بۆ لای خوا گەڕایەوە، پابەند دەبی بە شەریعەتی خواوەو ئەو كاتەش دەرازێیەوە بە سیفەتی بەرزو جوان، بۆیە قۆناغی (التحلیة بالفضائل) دەست پێدەكات، ڕازانەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەكان، لە پێش هەموویانەوە: خوا بە یەكگرتن (توحید الله) بۆ ئینسان مەیسەر دەبێ.

پێنجەم: دەفەرموێ: ﴿يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا﴾، یانی: ئەگەر ئێوە داوای لێبوردن لە خوا بكەن‌و، تەنیا بەندەی خوا بن‌و، پاشان بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، خوای پەروەردگار بە گوزەرانێكی باش دەتانژیێنێ، واتە: گوزەرانێكی باشتان بۆ دەڕەخسێنێ، لە سایەی ئیسلام‌و ئیمانەوە، لە سایەی بەندایەتیی بۆ خواوە، (متاع) دەڵێ: (مَا يُتَمَتَّعُ بِهِ أَي يَنْتَفِعُ، مَنَافِعُ الدُّنيَا)، (متاع) هەر شتێكە كە ئینسان لێی بەهرەمەند بێ‌و، سوودی لێ ببینێ، بەڵام بە شێوەیەكی كاتیی‌و، یانی: بەرژەوەندییەكانی دنیا.

﴿ حَسَنًا ﴾، (تَقِييدُ لِنوعِ المَتَاعِ أي خَالِصاً مِنَ المُكَدِّرَاتِ، طَوْيلاً بقاؤه)، (حسن) واتە: گوزەرانێکی باش، بەهرەمەندییەکی باشتان بۆ دەرەخسێنێ، ئەمە بەنددار کردنی گوزەرانەکەیە، واتە: جۆرە گوزەرانێکە دوور دەبێ لەو شتەی کە ڕوونییەکەی لێل بکەنو تێکیدەنو، ماوەیەکی باشیش دەمێنێتەوە.

شەشەم: کە دەفەرموێ : ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، تاکو کاتێکی ناوبراو، یانی: کاتی دیاریکراو، کە مەبەست پێی ژیانی کۆتایی دنیایی هەر کام لە مرۆڤەکانە، وەك گوتراوە: {مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ} واتە: هەر کەسێك مرد، قیامەتی وی ئاخیر زەمانی (ساعة)ی وی دێ، یاخود ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، ئەگەر تەنیا مەبەست پێی خەڵکی زەوی بێ، دیارە کاتی دیاریی کراو هەیە، بۆ ئەم ژیانە دنیاییە کە تێیدا کۆتایی دێ، کە دوایی (ساعة) دێ، واتە: ئاخیر زەمان دێ، پاش (ساعة)ش (قیامة)و هەڵسانەوەو زیندوو بوونەوە دێ.

حەوتەم: دەفەرموێ : ﴿ وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ﴾، یانی: ئەگەر ئێوە تەنیا خوا بپەرستنو، بە دەم بانگەوازی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ بچن، کە هاتوە بتانترسێنێو، دڵخۆشتان بکاتو، داوای لێبوردن لە خوا بکەنو، بۆ لای خوا بگەڕێنەوە: وێڕای ئەوەی کە بە ژیانێکی خۆش دەتانژیێنێ، تاکو کاتی دیاریکراو، لە بەخششی خۆیشی، پاداشتی هەر کەسێك دەداتەوە کە خاوەن چاکە بووبێ، ﴿ وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ﴾، (الفَضْلُ: إعْطَاءُ الخَيْر)، (فَضْل) بریتیە لە بەخشینی چاکە، واتە: پاداشتی هەر خاوەن چاکەیەك، لە بەخششو چاکەی خۆی دەداتەوە.

ڕیشەی وشەی (فَضْل): (سُمِّي فضلاً لأن الغالب أن فاعل الخير يفعله بما هو فاضل عن حاجته، ثم تنوسي ذلك، فصار الفضل بمعنى إعطاء الخير)، بۆیە (فَضْل)، واتە: بەخشینی چاکە، (چاکە کردن) ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە بە زۆریی وایە کەسێك کە چاکەیەك دەکات، لەوەی لە پێویستی خۆی زیادە،

دەبەخشێ، دوایی ئەوە لە بیر براوەتەوەو، وشەی (فَضْل) بۆ هەر جۆرە چاکە کردنێك بۆ هەر جۆرە بەخشینێك بەکارهێنراوە.

مەبەست لە: ﴿وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُۥ﴾، وشەی (فضْل) مەبەست پێی کردەوەی چاکە، واتە: کەسێك سیفەتی باش‌و کردەوەو نیەتی باش، قسەی باش‌و هەڵس‌و کەوتی باشی هەبێ، بەڵام مەبەست لە وشەی : ﴿فَضْلَهُۥ﴾، یانی: بەخششی خۆی، بەخششی خوا ﷻ، کە زۆربەی توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە، یانی: (ثواب الآخرة)، پاداشتی دوا ڕۆژ، بەڵام من پێم وایە چەمکی (فضل) بەخششی خوا، نەبەستراوەتەوەو کورت هەڵنەهاتوە لە پاداشتی دوارۆژدا، بەڵکو پێم وایە دنیاش دەگرێتەوە، واتە: خوا چاکە لەگەڵ هەر خاوەن چاکەیەکدا دەکات، هەم لە دنیادا هەم لە دوا ڕۆژدا.

وەك لە سوورەتی (النحل)دا زۆر جوان ئەمە ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾﴾، واتە: هەر کەسێك کردەوەی باش بکات لە نێر، یان مێ، بڕواداریش بێ، بێگومان بە ژیانێکی خۆش‌و پاك‌و چاك دەیژێنین، (واتە: لە دنیادا)، بە دڵنیایی پاداشتیشیان دەدەینەوە بە پێی باشترین کردەوەکانیان، (واتە: لە دوا ڕۆژدا)، کەواتە: لە ڕاستییدا (فضل)ی خوا تەنیا تایبەت نیە بە دوا ڕۆژەوە، بەڵکو هەر کەسێك خاوەن چاکە بێ‌و، سیفەتی باش لە خۆی پەیدا بکات، خوای بەخشندەو پەروەردگار هەم لە دنیادا چاکەی بۆ دێنێتە پێش‌و، کاری بۆ ئاسان دەکات‌و ناوبانگی باش دەکات‌و، دڵی ئاسوودەو موڕتاح دەکات‌و، خەڵك خۆشی دەوێ‌و، لە عەیبداریی پارێزراو دەبێ‌و سەربەرز دەبێ لە دنیادا، هەم لە دوا ڕۆژیشدا ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی خوای پەروەردگار چاوەڕێی دەکات.

هەشتەم: کە دەفەرموێ : ﴿وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ﴾، ئنجا هەڕەشە دەکات لە کاتی پشت تێکردندا: ئەگەر ئێوە پشت بکەنە من،

(واتە: پێغەمبەر ﷺ یاخود قورئان)، ﴿ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴾، ئەوە بە دڵنیاییەوە من مەترسیی سزاو ئازاری ڕۆژێکی گەورەتان لێدەکەم.

وشەی ﴿ تَوَلَّوْا ﴾، لە ئەسڵدا (تتولّوا)ە، بەڵام (ت)ێکیان لابراوە بۆ ئەوەی سووك بێتە سەر زمان، واتە: ئێوە ئەگەر پشت هەڵبکەن، پشت بکەنە قورئان، یان پشت بکەنە ئایینو بەرنامەی خوا، یان پشت بکەنە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە مەترسیی سزاو ئازارێکی ڕۆژێکی گەورەتان لێ دەکەم، یانی: چاوەڕێتانە، کە دیارە ﴿ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴾، دەشگونجێ مەبەست پێی ژیانی دنیا بێ، واتە: بەڵاتان بەسەر دێ، شکستتان بەسەر دێ، تووشی گرفتو نارەحەتیی دەبن لە دنیادا، لە دوارۆژیشدا ئەوە دیارە کە سزای خوا لە دوارۆژدا چاوەڕێی هەموو ئەوانەیە کە لە دنیادا پشت دەکەنە بەرنامەکەیو کتێبەکەیو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

<u>نۆیەم:</u> کە دەفەرموێ : ﴿ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ﴾، گێڕدرانەوەتان، یان گەڕانەوەتان تەنیا بۆ لای خوایە ﴿ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، لە زمانی عەرەبییدا هەر کات (الجار المجرور) پێش دەخرێ، پێش (فعل و فاعل) دەخرێ، ئەوە دەلالەت لەسەر کورت هەڵهێنان دەکات، واتە: گێڕدرانەوەی ئێوە تەنیا بۆلای خوایە.

وشەی (مَرْجِع) دەڵێ : (مَصْدَر مِيمي، أي: الرجوع)، چاوگێکی (میمي)یە بە مانای گەڕانەوە، گەڕانەوەی ئێوە تەنیا بۆ لای خوایە، کەواتە: خۆتان ئامادە بکەن، بە چ چاوو ڕوویەکەوە دەچنەوە بۆ لای خوا، بە چ کۆڵو تێلەگەیەکەوە[1] دەچنەوە بۆ لای خوا، هەگبەکەتان چی تێدا دەبێ، بزانن دەستتان چی تێدا دەبێ، کاتێ دەچنەوە خزمەت خوای دادگەر، کاتێك سەفەری ژیانی دنیا تەواو دەکەنو دەچنەوە خزمەت خوا، لە مەنزڵگای دوارۆژدا، باش خۆتانی بۆ ئامادە بکەن.

---

١) تێلەگە: هەگبە، هەر شتێکە کە مرۆڤ ، شتێکی تێبکاتو بە کۆڵی دا بدات.

دەیەم و کۆتایی : کە دەفەرموێ : ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، خوا هیچی لێ عاسێ نابێ، لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، بۆ ئەوەی کەس پێی وانەبێ: چونکە دەمرێ و دەبێتەوە خاك و خۆڵ و ئێسقانی پرواو، پێی وابێ کە خوا بۆی زەحمەتە یاخود لێی عاسێ دەبێ و، ناتوانێ زیندووی بکاتەوە! نەخێر خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، بە تەئکید ئێوەش زیندوو دەکاتەوەو، دەتانژێنێتەوەو، لێتان دەپرسێتەوەو، سزاو پاداشتی پڕ بە پێستتان بۆ دێنێتە پێش.

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٥ ﴾، ئەمە باسی هەڵوێستی بێبڕوایانە لە بەرانبەری قورئان و پێغەمبەردا ﷺ:

سەرەتا خوا عزّ وجلّ دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ ﴾،

وەك پێشتر گوتوومانە: ﴿ أَلَآ ﴾، (أَدَاةُ التَّنْبِيه)، (أَلا) ئامرازی ئاگادار کردنەوەو وریا کردنەوەیە، کە دیارە بە زۆریی کاتێك ئەم وشەیە بەکاردێ، کە بویستری بەرانبەر هۆشیار بێ و، زیاتر بایەخ بدات و، زیاتر گوێ هەڵبخاو، ئاگادار بێ لەوەی کە بۆی باس دەکرێ، کە لە کوردیی دا لە جیاتی ئەمە دەگوترێ : (ئەها) ! ئاگادار بە! ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ ﴾، ئاگاداربە! ئەوان (واتە: بێبڕوایەکان) سینەیان دەنووشتێننەوە تاکو خۆیانی لێ پەنهان بکەن، خۆیانی لێ بشارنەوە، سینەیان دەنووشتێننەوە، دەڵێ: (الثَّـنْيُ: الطيُّ وَأَصْلُ اشتقَاقه مِن اسْم الإِثْنَيْنِ، يُقَالُ ثَنَاه بالتخْفِيف، إذَا جَعَلَهُ ثَانِياً، فالَّذِي يطوي الشيءَ يَجْعَلُ أَحَد طاقيه ثَانِياً للَّذي قَبْلَهُ، فَثَنْيُ الصُّدُورِ: إِمَالَتُها وَحَنِيُها تَشْبِيهاً بالطي، وَمَعْنَى ذَلِكَ الطَّأْطأَة).

وشــەی (ثَـنِي)، بریتیـە لـە نـووشــتاندنەوە، وەرگێـرانەکـەی لـە نـاوی (إثـنين)ە، واتـە: دووان، دەگـوترێ: (ثَـنَـاهُ)، کـە بە سـووکـیـی بگـوترێ بەبـێ شــەددە، واتــە: کـردی بە دوو، ئنجـا کـەســێك کـە شـتێك دەپێچـێتەوەو دوو قــەدی دەکــاتەوە، واتـە: قەدێکـی دەخاتە سـەر قەدەکـەی پێشـێ، (وەك پـەڕێك ئەگـەر بێـتو بتـەوێ بینـووشـتێنیەوە، دەیکەی بە دوو قـەد)، ئنجـا سینە نـووشتناندنەوە، واتـە: خـوار کردنەوە، وەك چۆن شـتێك دوو قـەد دەکرێتـەوە، ئـاوای لــێ بکـەی، واتـە: سـەری خۆیـان نـزم دەکــەنەوە، کـەسـێك کــە بیـەوێ دیـار نەبــێ، دیـارە سـەرو سـینەی دەنـووشـتێنێتەوە.

بۆچی وا دەکەن؟ ﴿ لِيَسْتَخْفُواْ مِنْهُ ﴾، تاکو خۆیانی لـێ پـێ پەنهـان بکـەن، لە کـێ؟ وا پێدەچـێ مەبەست پێغـەمبـەر ﷺ بێ، لە کاتێکدا کـە قورئـانی بـۆ دەخوێنـدنـەوە.

یاخود لە کاتێکـدا کە گوێبیسـتی قورئـان دەبن، سەرو سینەیان دەنـوشـتێننەوە، بە حیساب بۆ ئەوەی کە گوێیـان لـێ نەبـێ، ئنجـا ئەمە دەگونجـێ مەبەست پێـی مانـا ڕواڵـەتییەکـەی بـێ، واتــە: ســەرو ســینەتان دەنـووشــتێننەوە، دەشگونجــێ مەبەســت پێـی ئـەوە بــێ کــە ئەوانـە لـە دەروونـی خۆیــاندا کارێـك دەکـەن، کـە گرنگــیی نــەدەن بــە قورئــان، یـاخود گرنگـی نــەدەن بـە پێغـەمبــەری خــوا ﷺ، هـەندێکیش لە زانـایان گوتوویانە: لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە دڵو سینەی خۆیـان دەنـووشـتێننەوە، لەسـەر ئـەو کینـەو بـوغزو غــەرەزەی کـە لـە دڵو دەروونیــاندا هـەیە، بەرانبــەر بە پێغـەمبـەر ﷺ، بەرانبەر بە قورئــان.

بــەڵام وا پێدەچـــێو مــن وای تێدەگـــەم، کــە زیــاتر مەبەســـت پێـی مانـــا ڕواڵــەتییەکەی بــێ.

کە دەفـەرموێ: ﴿ لِيَسْتَخْفُواْ مِنْهُ ﴾، (الإِسْتِخْفَاء: الإِخْتِفَاء فالسّين والتـاء للتأكِيد، مثـل استجاب واستـأخر)، وشـەی (إستخفاء)، واتـە: زۆر هـەوڵـدەدەن خۆیـان بشــارنەوەو خۆیــان پەنهــان بکـەن، چونکــە: وشـەی (إستخفاء)، یــانی (إختفـاء)، بـەڵام (س و ت)ی خراونــە ســەر بـۆ زیـاتر جـەخت کردنـەوە لەجیـاتی

بڵێی: (أجاب، أخّر)، دەڵێی: (استجاب، استأخر)، یان لە جیاتی بڵێی: (تأخّر)، دەڵێی: (استأخر).

کە دەفەرموێ: ﴿أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾، ئەها، ئاگاداربن! کاتێك کە بە پۆشاکەکانی خۆیان دادەپۆشن، (خوا) دەزانێ ئەوەی کە پەنهانی دەکەن و ئەوەی کە ئاشکرای دەکەن.

(الإسْتِغْشَاء: التغَشّي بمَا يُغشي أي يَسْتُر، فالسِّين والتاء للتأكيد)، (إسْتِغْشَاء)، بە مانای (تَغَشّي) دێ، واتە: ئەو شتەی کە دادەپۆشێ و پەنهان دەکات، ئەوە بەکاربێنێ.

دەفەرموێ : ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، واتە: بێگومان ئەو زانایە، بە خاوەنی سینەکان، خاوەنی سینەکان وەك جاری دیکەش گووتومانە، یانی: (الأَشْيَاءُ الّتِي هي صَاحِبَةُ الصُّدُورِ)، ئەو شتانەی کە بوونە خاوەنی سینەکانیان، هێندە لەوێ دا نیشتەجێ بوون و سەقامگیربوون، کە بریتین لە نهێنییەکان، کەواتە : ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، واتە: خوا زانایە بە نهێنییەکانیان (أَي: إِنَّهُ عَلِيمٌ بالأَسْرَارِ)، بەڵام چونکە ئەو نهێنییانە هێندە لە دڵ و سینەکاندا جێگیر بوون، وەك بووبنە خاوەنی ئەو سینانە، چونکە (ذات)، مێینەی (ذو)یە، (ذو)، بۆ ئەوەیە ئاماژە بکەی بە خاوەندارێتی نێرینەیەك بۆ شتێك، (ذات)ش، یانی: (صاحبة) بۆ مێیینەیە، دەڵێی: (هَذِهِ المرأة ذَاتُ جَمَالٍ) ئەم ئافرەتە خاوەن جوانییە، یان (ذاتُ بَعْلٍ) خاوەن مێردە، بەڵام ئەگەر نێرینە بێ، دەڵێی: (ذو)، دەڵێی: (هذا الرجل ذو مالٍ) ئەم پیاوە خاوەن سامانە، (الصُّدُور: النُّفُوسُ وَالقُلُوب)، دیارە مەبەست لە (صدُور)، یانی: سینەکان، بەڵام دیارە لێرەدا مەبەست پێی دەروونەکان و دڵەکان و دیوی پەنهانی مرۆڤە، (الأَشْيَاءُ المُسْتَقِرّة في النفوس فأُضيفت إِلَيْهَا)، واتە: ئەو شتانەی کە لە سینەکاندا نیشتەجێ بوون و جێگیر بوون، بۆیە پاڵ دراونە لای ئەو سینانە.

لەوبارەوە ئەم دەقە گێڕدراوەتەوە:

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ، كَثِيرَةٌ شَحْمُ بُطُونِهِمْ، قَلِيلَةٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتُرَوْنَ أَنَّ اللهَ يَسْمَعُ مَا نَقُولُ؟ قَالَ الآخَرُ: يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا، وَلاَ يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا، وَقَالَ الآخَرُ: إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا، فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ : ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾﴾ فصلت} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٣٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٢٠٥)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لە لای بەیت (واتە: لە لای ماڵی خوا، لای کەعبە) دوو پیاوی قوڕەیشی لەگەڵ یەکێکی (ثقفي)، لە هۆزی (ثقيف)، کە چەوریی ورگیان زۆر بووو، تێگەیشتنی دڵیان کەم بوو، (واتە: قەڵەو بوون)، کۆبوونەوە، یەکێکیان گوتی: ئایا پێتان وایە ئەوەی دەیڵێین خوا دەیبیستێ؟ ئەوەی دیکەیان گوتی، ئەگەر دەنگ هەڵهێنین خوا دەیبیستێ، بەڵام ئەگەر بە پەنهانیی قسە بکەین نایبیستێ، هی سێیەمیان گوتی، ئەگەر کاتێك کە دەنگ هەڵدێنین خوا بیبیستێ، مانای وایە کاتێك کە دەنگیش نزم دەکەین، هەر دەیبیستێ، خوا ﷻ لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە دەفەرموێ : ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾﴾، واتە: ئێوە خۆتان پەنهان نەدەکرد، کە دوایی بیستنتان و دیتنتان و پێستتان شایەدیتان لەسەر بدەن، بەڵکو پێتان وابوو کە خوا زۆرێك لەوەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن، نایزانێ و لێی پەنهان دەبێ و دەشاردرێتەوەو، ئەو گومانەش بوو کە ئاوا فەوتاندنی.

ئەوەی کە لەم ئایەتە وەردەگیرێ ئەوەیە، کە ئەو کافرانە بۆیە بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردوە، چونکە ویستوویانە خۆیان پەنهان

بکەن‌و، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرفەتی نەبێ قسەیان بۆ بکات‌و ئایەتیان بەسەردا بخوێنێتەوە.

یان مەبەست ئەوەیە کە هێندە بێزار بوون، تاقەتیان نەبووە گوێ بدەنە قورئان‌و تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، هەردووکیان دەگونجێن، ئنجا ئەوە کە مرۆڤ خوا ﷻ‌و سیفەتەکانی خوا ﷻ قیاس بکاتە سەر خۆی، ئەمە وەك زانایان دەڵێن: بەردی بناغەی گومڕایی‌و سەرلێشواویی ئینسانە، کە تۆ خوای بێ وێنە قیاس بکەیتە سەر خۆت‌و، سیفەتەکانی خوا وەك هی خۆت تەماشا بکەی، لێرەوەیە کە شیرك‌و هاوبەش بۆ خوا دانان‌و، ڕێزی خوا نەگرتن‌و، خوا نەناسیی، پەیدا بێ، ئەگەرنا ئەگەر بێت‌و ئینسان بزانێ خوا ﷻ ئاوا خۆی وەسف کردوە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴿١١﴾﴾الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی خوا نیەو، سیفەتەکانی خوا، جیان لە سیفەتی بەشەر، کاروباری خوا، شێوەو مامەڵەو هەڵسوکەوتی خوا، وەك هی بەشەر نیە، بۆ وێنە: خوا تووڕە بێ‌و، ئنجا یەکسەر دوای تووڕەییەکەی شتێك بکات، یان لە کەسێك ڕازی بێ‌و، هەست‌و سۆز بەسەریدا زاڵ بێ، یان ئارەزووی هەبێ!! ئەوانە سیفەتی بەشەرن، خوا ﷻ لە سەرووی ئەو حاڵەتانەوەیە، بۆیە بەشەر نابێ، لە هەمبانەی خۆیدا گوێز بژمێرێ‌و، نابێ خوا قیاس بکاتە سەر خۆی‌و، سیفەتەکانی خوا وەك سیفەتەکانی خۆی دابنێ، چونکە:

یەکەم : ئەوە هێنانە خواری خوای پەروەردگارە لەو مەقامی بەرزی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾و، یەکسان کردنی خوایە لەگەڵ دروستکراوەکاندا.

دووەم : ئەمە دەرگاش دەکاتەوە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانان.

بۆیە لە سووڕەتی (الشعراء)دا، ئەوانەی دۆزەخیین، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، دەڵێن: ﴿تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾﴾، واتە: سوێند بە خوا، ئێمە لە گومڕاییەکی ڕوون‌و ئاشکرا دابووین، کە ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا.

بەڵێ بنکی شیرکو بناغەی شیرکو هاوبەش بۆ خوا دانانو، لادان لە جادەی خوا بە یەکگرتنو ئیمان، بریتیە لەوەی کە خوا یەکسان بکەی لەگەڵ دروستکراوەکانی دا، یاخود دروستکراوەکان یەکسان بکەی لەگەڵ خوادا، یانی: خوای بێ وێنە لەو مەقامە بەرزەی خۆی، بە وەهمی خۆت بێنیە خوار بۆ ئاستی نزمی دروستکراوەکان، یاخود هەندێك لە دروستکراوەکان بە وەهمی خۆت، بەرزبکەیەوە بۆ ئاستی بەرزی خوای پەروەردگارو، ئەو سیفەتانەی هی خوان، بۆ ئەویان بەکاربێنی، شیرك لێرەوە دێ، چ ئەو شیرکەی کە لە نێو بت پەرستو، مانگو خۆر پەرستو، دارو بەرد پەرستەکاندا بووە، چ ئەو شیرکەی دێتە نێو مسوڵمانانەوە، کە دێنن هەندێك لە پیاو چاکان، لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، یان لە فریشتەکان، بەرز دەکەنەوە بۆ ئاستی خوا، بە وەهمی خۆیان، لەو مەقامەی بەندایەتیی کە تێیدان، دەیانبەنە سەرتر، بەرەو ئەو مەقامو پێگەیەی کە تەنیا هی خوا بەرزی مەزنە.

__مەسەلەی چوارەم__: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٦﴾، هیچ پێرۆیەك، لەسەر زەوی نیە مەگەر بژیوی لەسەر خوایەو، ئەو شوێنەی تێیدا نیشتەجێ دەبێو، ئەو شوێنەی تێیدا دێتو دەچێ، یان ئەو شوێنەی بە شێوەی کاتیی تێیدا دەمێنێتەوە، هەمووی دەزانێ، ﴿كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾، هەر کامێك لەوانە لە نووسراوێکی روونو ئاشکرادا، (کە مەبەست پێی زانیاریی خوای زانایە، زانیاریی گشتگیرو هەمەلایەنەی خوا) هەمووی تۆمار کراوە.

١- کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، وشەی (دَآبَّةٖ) دەڵێ: (إسْمٌ لِمَا يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ غَيْرُ الإِنْسَان)، ناوە بۆ هەر شتێك کە لەسەر زەوی بڕوات، جگە لە مرۆڤ، هەمووی پێی دەگوترێ: ﴿دَآبَّةٖ﴾، ورد بێ، یان درشت بێ.

٢ـ کە دەفەرمویٚ : ﴿إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا﴾، مەگەر بژێوی لەسەر خوایە، دەڵێ: (الرِّزقُ: مَا يُنْتَفَعُ بِهِ، والرِّزْق: العَطَاءُ)، ڕزق هەر شتێکە سوودی لێوەربگیریٚو، (رزق) بە مانای بەخششو بە مانای خواردن دیٚ، یانی: بەمانای هەر شتێك دیٚ، کە ئەو ژیاندارە پێی بژی: تیشکی خۆرە، هەوایە، ئاوە، لەوەڕە، یاخود بە نسبەت زیندەوەرە وردەکانەوە شتی دیکەیە، هەرچی هەیە، هەمووی وشەی (رزق)ی بۆ بەکاردیٚ، یانی: ئەو شتەی کە ئەو ژیاندارە پێی دەژی.

٣ـ کە دەفەرمویٚ : ﴿وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا﴾، (مُسْتَقَرَّهَا يَعْنِي محل استقرارها)، شوێنی تێدا نیشتەجیٚ بوون، سەقامگیر بوونی، شوێنی تێدا مانەوەی، ﴿وَمُسْتَوْدَعَهَا﴾، دەڵێ: (المستودع: مكان الإيداع)، شوێنێکە کە ئەمانەتی تێدا هەڵبگیریٚ، (والإيداع: الوضع والدَّخْرُ)، شتێك لە شوێنێك دابنێیو لە شوێنێك پاشەکەوت بکەی، پێی دەگوتریٚ: (إيداع)، (مستودع)یش، واتە: شوێنی شت تێدا دانانو شت تێدا هەڵگرتن، بەڵام لێرەدا مادام (مستودع)، لەگەڵ (مستقر)دا هاتوە (مستقر) شوێنی نیشتەجیٚ بوونو تێدا مانەوەیەو، (مستودع)، یانی: شوێنی تێدا حەوانەوەی کاتیی، یان: شوێنی هاتوچوون.

٤ـ کە دەفەرمویٚ : ﴿كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾، ئەم ( كُلٌّ )ە، تەنوینی سەر (كُلٌّ )، ئەوە (عوض عن المضاف إليه أي: كل منها: رزقها ومستقرها ومستودعها في كتاب مبين)، زمانی عەرەبی وردەکارییەکەی لێرە دایە، جاری وایە تەنوین (یانی: دوو سەر: دوو فەتحە، یاخود دوو ژێر: دوو کەسرە، یاخود دوو ضمە: دوو بۆر) لە جیاتی وشەیەکە، بەڵکو جاری وایە لە جیاتی ڕستەیە، لێرەش دا: تەنوین ( ـٌ ) قەرەبووی پاڵ وەلادراوە (عوض عن المضاف إليه)، واتە: ﴿كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾، (كل منها)، یانی: (رزقها،

مستقرها، مستودعها)، لە جیاتی هەموو ئەو وشانە ئەم تەنوینەی بەکارهێناوە، کە ئەوە قەرەبوویان دەکاتەوە. هەموو کاروباری ئەوانە، واتە: بژیویان، بژیوی هەر کام لەم ژیاندارانەو، شوێنی نیشتەجێ بوونیانو، شوێنی هاتنوچوونیان، یاخود شوێن بە کاتیی تێدا مانەوەیان، هەمووی لە نووسراوێکی ئاشکرا دایە، وشەی (کتاب)، بە مانای (کتابة) دێ واتە: نووسین، بە مانای شتێك دێ کە شتی تێدا نووسرابێ (مکتوب فیه)، کە لێرەدا مەبەست پێی زانیاریی خوای پەروەردگارە، واتە: هەمووی تۆمار کراوە لە زانیاریی خواداو هەمووی هەیە بە وردیی، هەندێکیش دەڵێن: ﴿كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾، هەروەها ﴿لَوۡحٍ مَّحۡفُوظٍ ٢٢﴾ البروج، واتە: تەختێك کە زانیارییەکانی تێدا دەپارێزرێن، بەلام من وای تێدەگەم، ئەوە هەمووی خوا ﷻ دەیەوێ ئێمە تێبگەیەنێ، چونکە ئێمەی مرۆڤ، وەختێك کە زانیارییەکمان هەبێو، بمانەوێ لە بیرمان نەچێ، دەبێ بینووسین، وەك گوتراوە: (قَيِّدوا العلم بالكتابة)، زانیاریی بەهۆی نووسینەوە، ببەستینەوە، ئێمەی مرۆڤ ئەگەر شتێکمان نووسی، دوایی هەر کاتێك پێویستمان بوو، بۆی دەگەڕێینەوە، خوای کاربەجێ دەیەوێ ئێمە تێبگەیەنێ کە زانیاریی خوا بە دروستکراوەکان، وەك نووسینی ئێمە وایە، کە کەمو زیاد ناکات، بێگومان کە تۆ نووسینێکت نووسی، لە بیرت ناچێ، خوای زاناو تواناش هیچ شتێك فەرامۆش ناکاتو، هیچیشی لە بیر ناچێ.

وشەی (مُّبِينٍ )یش (إسم فَاعِل مِنْ أَبَانَ بمَعْنَى أَظْهَرَ)، لێرەدا ﴿كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾، واتە: کتێبێکی ڕوونکەرەوە، بۆچی؟ چونکە هەرچەندە دەگونجێ لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە بڵێی: (مُّبِينٍ )، لە (أبان)ی (لازم)ەوەیە، (أَبَانَ الشيءُ أي ظَهَر)، شتەکە دەرکەوت، بەلام چونکە (مُّبِينٍ )، (إسم فاعل)ە، کەیەتی، هەر دەبێ لە (أبانَ)وە، هاتبێ، دیارە (فعل)ی (أبان)ش، دوو حاڵەتی هەن :

١/ جاری وایە بە (لازم) دێ، واتە: پێویستیی بە (مفعول) ناكات، دەگوترێ: (أَبَانَ الكِتَابُ)، كتێبەكە دەكەوت، ئاشكرا بوو.

٢/ جاری واشە بە (مُتَعَدّي) دێ: وەك (أَبَانَ الكِتَابَ)، كتابەكەی دەرخست، یان (أَبَانَ القَمَرَ)، مانگەكەی دەرخست.

لێرەش دەبێ ﴿مُّبِينٍ﴾، هەر لە (أبان)ەوە هاتبێ، ئنجا ئەگەر (أبان)ی (لازم) بێ، واتە: كتێبێكی ئاشكراو ڕوون، ئنجا زانایان دەڵێن: لێرە ناگونجێ بڵێین: زانیاریی خوا یان: (اللّوح المحفوظ) كتێبێكی ئاشكراو ڕوونە، چونكە بۆ ئێمە چ ئاشكراو ڕوون نیە، بەلام ئەگەر بڵێی: كتێبێكی ڕوونكەرەوەو ئاشكراكەر، ئەوە خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ئەو لیستە، ئەو شوێنە كە ئەو شتانەی تێدا تۆمار كردوە، هەموو زانیارییەكان ڕوون دەكاتەوەو دەریاندەخات.

بە هەر حاڵ من پێم وایە كە ئەگەر لە (أبان)ی (لازم)یشەوە بێ، هەر دەگونجێ، واتە: ڕوونو ئاشكرایە بۆ خوا ﷻ، یاخود ڕوونكەرەوەو ئاشكراكەرە بۆ دروستكراوەكان.

# وروووژێنرانی سێ پرسیار لە زەینی مرۆڤدا بەهۆی ئەم ئایەتەوە

پرسیاری یەکەم : خوا چۆن بژیوی ئەو ژیاندارانە دەدات ؟

وەڵامەکەی : ئەوەیە کە خوا ﷻ لە ڕێی ئەو سیستەمو یاسایانەوە کە لە بوونەوەردا دایناون، بژیوی ئەو دروستکراوانە دەدات.

ئنجا من بۆ تیشکێکی کەم خستنە سەر ئەو بابەتە، ئاماژە بە دوو یاسایان دەکەم، بە دوو شێواز لە چۆنیەتی بژیودانی خوای پەروەردگار بۆ دروستکراوەکانی خۆی:

١) پەیوەندیی نێوان ژیانداران و ڕووەك (الرابطة بين الحيوان والنبات)، زانایان دەڵێن: خەڵکی سەر زەوی لە ماوەی ساڵێکدا (٦٦٤,٧٣٦,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، (شەش سەدو شەستو چوار تریلۆنو حەوت سەدو سیو شەش ملیار) لیتر، ئۆکسجین هەڵدەمژن.

هەروەها (٥٥٩,٦٤٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، (پێنج سەدو پەنجاو نۆ تریلۆنو شەش سەدو چل ملیار) لیتر ترشی کاربۆنیك لەگەڵ هەناسەدانەوەدا دەدەنەوە بە سروشت، ئنجا دیارە بەشێك لەو دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەی کە لە ڕێی هەناسەدانەوە دێتە دەر، بەهۆی هەڵمی ئاوی نێو هەواوە، دەگۆڕێ بۆ ترشی کاربۆنیك، دیارە بەهۆی هاوکاریی نێوان ژیانداران و ڕووەکیش، نە ئۆکسجین دەبڕێو، نە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، دنیا پڕ دەکاتو دەیکاتە زبڵخانە، چونکە دووەمی ئۆکسیدی کاربۆن وەك ڕژوو و زبڵ وایە، بۆچی؟ چونکە ڕووەك لە ڕووی تیشکە پێکهاتنەوە، ئۆکسجین بەرهەم دێنێ، ئەو ڕووەکو

شیناوردو دارو دەرختــە، هەمووی ئۆکسجین بەرهەم دێنــێ، واتە: ئـەوەی کـە ئێمـە لەگەڵ هەناسـەدانەوەدا، دەیدەینەوە، دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، بـەڵام بـە پێچـەوانەوە: ڕووەك ئۆکسـجین دەداتەوە، ئنجا ئەو دووەم ئۆکسیدی کاربۆنـەی کـە مرۆڤـو ژیانـداران لـە ڕێگای هەناسـەدانەوە، فڕێی دەدەن، ئـەوە هـەمووی دەبێتـە خۆراك بۆ ڕووەكو شـیناورد.

کەواتە: ئەوەی کە خۆراکە بۆ مرۆڤ، ڕووەكو شیناورد بەرهـەمی دێنـێو، ئـەوەی خۆراکـە بـۆ ڕووەكو شـیناورد، مرۆڤـ و ئـاژەڵو ژیانـداران بەرهـەمی دێنـنو، هەر کامێکیان ئەوەی کە ئەوەی دیکە، وەك پاشەڕۆ فـڕێی دەدات، وەك خۆراك دەیخـوات.

٢) لە سروشـتدا هـەموو شـتێك دەشخـواو دەشخورێ، چۆن؟ دیـارە ڕووەكو شـیناورد (نباتـات) بژێـویان لـە تیشـکی خـۆرو، ئـاوو گـڵ دابـین دەکـەن، ژیانـدارانیش زۆربەیان لەسـەر ورگی ڕووەك دەژینو، بەرماوەکەیان و پاشەڕۆکیشیان خۆراکی زینـدەوەرانن، واتـە: بـەرماوەی ڕووەكو پاشـەڕۆکی ڕووەکـەکانیشو ژیانـداران، دەبێتە خۆراکی زیندەوەرەکان، یانی: لە لایەکەوە ڕووەكو شیناورد، بژێویـان لـە تیشکی خـۆرو ئـاوو گڵ، بەرهـەم دێ، ئنجا دواییـش ئـەو ڕووەكو شـیناوردەش دەبنەوە بە خـۆراك بۆ ژیانـدارنو بـۆ ئـاژەڵو دڕنـدەو پەلـەوەرو ئەوانـە، ئنجـا دواییش جارێکی دی: ئەو ژیاندارو ئاژەڵانە خۆشیانو پاشـەڕۆکیشـیان دەبنــەوە بە خـۆراك بۆ زینــدەوەران (حشـرات)، هەروەهـا لاشــەی مـردووی ژیانـدارانو توێکـڵو گەڵاو میـوەی ڕزیوی شیناوردو ...هتد، دەبـن بە ڕزقو ڕۆزی بۆ کـرمی زەویو هـەتـا دوایی.

ئنجا دوایـی بەکتـریاو کـەڕووەکانیش بـژێوی خۆیـان لـە پاشـەڕۆكو لاشـەی زیندەوەرە وردەکانی بن زەوی، دابیـن دەکـەن[١].

کـەواتە: خـوا ﷻ سیسـتمێکی وا وردی دانـاوە، هـەموو شـتێك دەشـخورێو دەشـخوات، لەسـەر زەوی.

---

١) بڕوانـە: مەوسـووعەی (ئیمـانو عەقیـدەی ئیسـلامیی....) بەرگی دوو (٢)، لاپەڕە : ٤٥٣ – ٤٥٥ .

پرسیاری دووەم: ئایا خوا لەسەری پێویستە بژیو بدات؟

چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا﴾، ئایا لەسەر خوا پێویستە بژیو بدات بە هەموو ژیانداران؟

وەڵامەکەی:

دەڵێین: بەڵێ، بەڵام بەو واتایە نا، کە جگە لە خوا، شتێك لەسەر خوا پێویست بکات، بەڵکو بەو واتایە کە: خوا بۆخۆی ئەوەی لەسەر خۆی پێویست کردوە، وەك یەکێك لە کارەکانی خۆی، کاتی خۆی ئەشعەرییەکانو ماتۆریدییەکان لەسەر ئەم پرسە بۆتە کێشەو مشتومڕیان لەگەڵ موعتەزیلەدا.

بەڵام دووبارەی دەکەینەوە: بەو واتایە نا کە سوڵتانێك، دەسەڵاتێك، شتێك لەسەر خوا پێویست بکات! ئەوەیان هەرگیز لەگەڵ مەقامی بەرزی خوایەتیی دا ناگونجێ، چونکە خوا بۆخۆی فەرموویەتی : ﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ٢٣﴾ الأنبیاء، خوا پرسیاری لێ ناکرێ لەوەی کە دەیکات، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێ.

بەڵێ هیچ کەسێك نیەو هیچ شتێك نیە، دروستکراوی خوا نەبێ، هەر کەسێك هەبێو هەر شتێك هەبێ هەمووی دروستکراوی خوایە، کەواتە: کێ هەیە شتێك لەسەر خوا پێویست بکات؟ بەڵام خوا ئەگەر بۆ خۆی شتێکی لەسەر خۆی پێویست کرد، بۆ وێنە: بژیو گەیاندن بە دروستکراوەکان، یان سەرخستنی ئیمانداران، وەك دەفەرموێ : ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيۡنَا نَصۡرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٧﴾ الروم .

ئەو (خوا)، بۆخۆی ئەو شتەی لەسەر خۆی پێویست کردوە، نەك غەیری خوا لەسەر خوای پێویست کردبێ، تاکو ببێتە مایەی داشکاندن لە پێگەو مەقامی بێ وێنەو بەرزی خوای باڵادەست.

**پرسیاری سێیەم: بۆچی زۆرێك لە ژیانداران لە برسان دەمرن؟!**

وەڵامەکەی: ئەوەیە کە خوا ﷻ بۆمان باسی حاڵەتی گشتی گەیاندنی بژیوو ڕۆزی دەکات بە ژیانداران، بە پێی ئەو سیستەمەی کە خوا داینا و لەسەر زەوی، لە ژیانی ژیاندارانیدا، بەڵام مەبەست ئەوە نیە کە خوا ﷻ نەهێڵێ کەس برسی بێ، لە درندان، لە زیندەوەران، لە پەڕەوران، لە ئاژەڵان، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا بە گشتی بژیوی ژیانداران دەدات، بەڵام دیارە ئەوانیش لەسەریان پێویستە کە بۆ خۆیان هەوڵبدەن، هەشیانە کە لە برسان دەمرێ‌و ڕزق‌و بژیوی خوای نایگاتێ، بەڵام دیسان ئەوەی کە دەمرێ، دەبێتەوە خۆراك بۆ هەندێك لە دروستکراوەکانی دیکەی خوای کارزان، گرنگ ئەوەیە هیچ لەم بوونەوەرە زیاد نیە، هەمووی پێویستی بە یەکدی هەیەو، هەمووی یەکدی تەواو دەکات.

**مەسەلەی پێنجەم :** کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان‌و زەوی لە شەش ڕۆژاندا (بە شەش قۆناغ) هێناونە دی‌و، تەختی خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقییتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشتر دەکەن‌و، ئەگەر پێیان بڵێی: بە دڵنیایی ئێوە دوای مردن هەڵدەستێنرێنەوە، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: ئەمە تەنیا جادوویەکی ڕوونە.

## سەرنجدانێکی ئەم ئایەتە لە شەش بڕگان دا

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا شەش بڕگان دەخەینەڕوو:

**بڕگەی یەکەم :** شایانی باسە ئێمە لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیان)دا ئەم ئایەتەمان کردوە بە سەرچاوەی

بوونناسیی ئیسلامیی، (علم الوجود Ontology)[١]، وە لە دە (١٠) لاپەڕەدا ئەم بابەتەمان توێژیوەتەوەو، وەڵامی ئەم شەش پرسیارەمان داوەتەوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا:

پرسیاری یەكەم : ئەم (بوون)ە، چییە ؟

پرسیاری دووەم : كێ هێناویەتە دی؟

پرسیاری سێیەم : چۆن هاتۆتە دی؟

پرسیاری چوارەم : كەی دەستی پێ كردوەو كەی كۆتایی دێ؟

پرسیاری پێنجەم : بۆچی ئەم بوونە هێنراوەتە دی؟

پرسیاری شەشەم : سەرەنجامی چی دەبێ‌و چۆن دەبێ؟

بڕگەی دووەم : ئێمە لە سەرەتای سووڕەتی (یونس)دا، باسێكمان كرد بە ناوونیشانی: (كورتە باسێك لە بارەی بوونەوەرو حیكمەتی خواوە، لە دروستكردنیدا)، بۆیە لەوێ كە بە تەفصیلێ قسەمان كردوە، لێرە دووبارەی ناكەینەوە هەروەها لە سووڕەتی (الأعراف)یشدا، لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (٥٤)دا، باسی چەمك‌و واتای چوونە سەر عەرشی خوای پەروەردگارمان كردوە.

بڕگەی سێیەم : بەڵام ئەوەی كە لێرەدا دەمەوێ هەڵوەستەی لەبەردەمدا بكەم، ئەو ڕستەیە كە دەفەرموێ : ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴾، ئەو كاتە عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، ئەمە دوو شتمان دەگەیەنێ:

یەكەم: بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، كە بەرلەوەی ئەم بوون (وجود)ە هەبێ، خوا عزّ وجلّ بارەگاو تەخت (عرش)ی هەبووە.

دووەم: جگە لە عەرش كە دوایی زیاتر باسی دەكەم، ئاویش هەبووە، یانی: دروستكراوێكی دیكەش بووە، كە ئاو بووە، هەڵبەتە لە سووڕەتی (فصلت)دا

---

١) بڕوانە: چاپی سێیەم، لاپەڕە : ٣٣ – ٤٢.

باسـی دووکـەڵ (دخـان)یش کـراوە، وەك دەفـەرموێ : ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ﴿١١﴾ ﴾، دوایی خـوا ویسـتی ئاسـمان دروست بکات، کـە ئـەو کـاتە دووکـەڵ بـوو، کـە لـەو باسـەدا کـە ئامـاژەم پێـدا، لـە سـەرەتای سـوورەتی (یونس)دا، باسـی ئەوەشـم کـردوە.

شایانی باسە من نیزیکەی سی (٣٠) تەفسیـرم لە لان، تەماشام کردن لەبـارەی وشـەی ئاو (مـاء)هوە لـێرەدا :

أ/ هـەندێکیان هەر خۆیـان لـێ نەداوە، هـەر دەڵـێن: خـوای پـەروەردگار هـەر بۆخـۆی دەزانـێ مەبەسـت لە (مـاء) چییـە؟

ب/ هـەندێکیشـیان هـەندێك قسەیان لـێ کـردوە، کە عەقڵم نایـانبـڕێ.

ج/ پێم وایە، ناتوانین بە جەزمی بڵێیـن: مەبەست فلان شـتە، بـەلام دەتـوانین بڵـێین: مەبەسـت لـە ئـاو (مـاء)، وەك گریمانەیـەك، ئەوەیـە کـە پێکهـاتەی سەرەکیی ئاو هـایدرۆجینـە، چونکە هـەر مۆڵـکـۆل (جزيء)ێکی ئـاو، لـە دوو گەردیلـەی هـایدرۆجینو گەردیلەیەکـی ئۆکسـجین پێکـدێ، کـە ڕەمـزە کیمیاییەکەی ($H_2O$)یە، واتـە: دووگەردیلـەی هـایدرۆجینو، گەردیلـەیەکـی ئۆکسجیـن، ئەوە لە لایـەك.

ئنجا لە سـەرەتای دروسـتبوونی بوونـەوەرەوە، یەکـەمین توخم کە دروست بوو، وەك پێشـتـر باسمـان کـرد، لـەو باسـەدا کـە ئاماژەمـان پێـدا، بریـتـی بـوو لـە هـایدرۆجین، هـایدرۆجین کە سـادەترین توخمی ماددەیـەو، گەردیلـەکانی لە یەك پرۆتۆنو، یەك نیوترۆن لە نێوکداو، یەك ئەلیکتـرۆن لـە سورگـەدا پێکهـاتوون، کەواتـە: دەگونجـێ مەبەست لە ئاو (ماء) هـایدرۆجین بێ، کە سـادەترین تـوخمی ماددەیـەو، زۆربەی ماددەی بوونـەوەر هـایدرۆجینـە، ئێستاش داگیـرسـانی خـۆرو هـەموو ئەستێرەکـان، هـەر بەهـۆی سـووتانی هـایدرۆجینو گـۆڕانیەوەیەتی بـۆ هیلیۆم، وەك زانـایانی گەردووناس دەڵێن.

كەواتە كە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴾، واتە: ئەو كاتە بارەگای خوا بەسەر ئەو غازەوە بوو، كە ئەوە هەم لەگەڵ ئایەتەكەی سووڕەتی (فصلت)دا دەگونجێ ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ﴿١١﴾ ﴾، هەم لەگەڵ ئەوەی ئێرە: ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴿٧﴾ ﴾، چونكە پێكهاتەی سەرەكیی ئاو هایدرۆجینە، هایدرۆجینیش ئەو توخمەیە كە زۆرترین قەبارەی هەیە لە بوونەوەردا، بە پێی زانیاریی ئێمە.

**بڕگەی چوارەم** : بە نسبەت وشەی (عرش)ەوە، هەڵبەتە ئێمە كاتی خۆی لە سووڕەتی (الأعراف)دا قسەمان لێكردوە، لە تەفسیری ئایەتی (٥٤)دا، بەڵام لێرەش دەمەوێ هەڵوەستەیەكی كورت بكەم، كە هەرچەندە زۆرێك لە زانایان، لە نێویاندا (محمد رشيد رضا) هەروەها (محمد الطاهر بن عاشور) كە هەردووكیان زانای موعتەبەرن‌و، مەشرەب سەلەفیشن، گوتوویانە: دەگونجێ مەبەست لە عەرشی خوا (مُلْكُ الله وَحُكْمُهُ، تَمْثِيلاً بعرش السلطان)[1]، واتە: مەبەست لە (عرش الله) دەسەڵاتی خواو حوكمی خوا بێ، ئنجا خوا ﷻ ئەمەی (تشبيه) كردوە، بەو تەختەی حوكمڕانێك لەسەری دادەنیشێ‌و، لەسەر ئەو تەختەوە حوكمڕانیی وڵاتەكەی دەكات.

بەڵام من پێم وایە: مادام خوا لە سووڕەتی (غافر)دا دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴿٧﴾ ﴾ غافر، واتە: ئەوانەی كە عەرشیان هەڵگرتوەو، ئەوانەش كە بە دەوریەوەن (كە مەبەست پێی فریشتەكانە)، پەروەردگاریان بە پاك دەگرن‌و ستایشی دەكەن‌و، بڕواشی پێ دێنن، هەروەها لە سووڕەتی (الحاقة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی دوایی دا)، عەرشی پەروەردگارت هەشت هەڵی دەگرن .

---

١) (التحرير و التنوير) ج١٢ص٧، و (تفسير القرآن الحكيم) ج١٢ص١٥.

١- هەشت لە فریشتان. ٢- یان هەشت کۆمەڵە فریشتە.

٣- یان هەشت دروستکراوی دیکەی خوا.

گرنگ ئەوەیە هەم ئێستا کە ئێمە لە ژیانی دنیا داین، عەرشی خوا هەڵگیراوەو، هەم لە دوا ڕۆژیشدا عەرشی خوا هەڵدەگیرێ، بێگومان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە عەرش دروستکراوێکی مەزنی خوایە، هەڵدەگیرێو هەڵگیراوە، لە لایەن هەندێك لە دروستکراوانی خواوە، کە واپێدەچێ مەبەست پێی فریشتەکان بێ.

کەواتە: هەرچەندە لە زمانی عەرەبیدا، دەگونجێ وشەی (عرش) مەبەست پێی تەختی حوکمڕانیی بێ، کە بەو واتایەش هاتوە وەك لە سووڕەتی (النمل)دا هاتوە، کاتێك کە باسی شاژنی (سبأ) دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: تەختێکی مەزنی هەیە، تەختی حوکمڕانیی، کە دیارە دەبێ لە تەختی پێغەمبەر سولەیمان عليه السلام گەورەتر بووبێ، بۆیە پەپوو سولەیمانە (هُدْ هُدْ)، دەڵێ: تەختێکی مەزنی هەیە.

لە زمانی عەرەبیشدا بۆ حوکمڕانیی بەکاردێ، بۆ وێنە: دەگوترێ: (ثُلَّ عَرْشُهُ)، ئەو حوکمڕانە عەرشەکەی، تەختەکەی تێکچوو، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (تەختو تاجی تێکچوو)، کەواتە: لە زمانی عەرەبیدا ڕێ دەدرێ بەوە کە (عرش) مەبەست پێی ڕەمزو هێمای حوکمڕانییو دەستەڵات بێ، بەڵام کە تەماشای ئایەتەکانی دیکەی قورئان دەکەین، بە بۆچوونی من ئەو ڕێیەمان لێدەگرێ، کە بەو شێوەیە مانا بکرێ، بەڵکو عەرش دروستکراوێکی خوایە، بەڵام چوونە سەر عەرشی خوا (إستواء الله على العرش)، چونکە خوا ﷻ بە تەئکید پێویستیی بە جگە لە خۆی نیەو، عەرشو ئاسمانەکانو زەوی، هەموویان بە دەسەڵاتی خوا ڕاوەستاونو، خوای بەرزی مەزن پێویستیی بە یەکێك لە دروستکراوەکانی نیە ڕایبگرێ، ئەوە بە هیچ جۆرێك نابێ لە مێشکمان دابێ، بۆیە زانایان گوتوویانە: (الإِسْتِوَاء مَعْلُومٌ وَالكَيْفِيَّة مَجْهولَة) (إستواء)، ماناکەی دیارە، یانی: چووە سەرێ، ڕاوەستا، دانیشت، ئەوە

چەمکەکەی ئاوایە، بەڵام بۆ خوای پەروەردگار چۆنییەتەکەی نەزانراوە، چونکە بە تەئکید وەك ئێمە لەسەر تەختو عەرش دادەنیشین، خوای پەروەردگار بەو شێوەیە نیە، وەك دروستکراوێك لەسەر شتێك دەبێ، کە ئەگەر شتەکەی لە بن دەربێنی، دەکەوێ، بە تەئکید خوای بێ وێنە وا نیە، بەڵکو کاتێك خوا بووە، نە عەرش هەبووە، نە هیچ شتێك هەبووەو، عەرش‌و هەرچی دروستکراوەکانیشن بەهۆی خوای پەروەردگارەوە ڕاوەستاون، خوا پێویستی بە غەیری خۆی نیە، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤١﴾ فاطر، واتە: خوا ئاسمانەکان‌و زەوی دەگرێ کە بکەونە خوارو، ئەگەر بکەونە خوار، جگە لە خوا هیچ کەس ناتوانێ بیانگرێتەوەو نەهێڵێ برووخێن‌و بکەون.

<u>**برگەی پێنجەم**</u> : کە خوا دەفەرموێ : ﴿لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا﴾، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردوەی باشترە، ئەم ڕستەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم بوونە بە عەرشەوەو بە هەر حەوت ئاسمانەکانەوەو بە زەوییەوەو، بە هەرچی دیکەوە، کە ئێمە نازانین، هەمووی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤ و، بە تاقیکردنەوەی مرۆڤەوە، بەڵام ئایا تەنیا بەوەوە پەیوەستە؟ وەك لەو باسەی تەفسیری سوورەتی (یونس)یشدا باسم کرد: ناتوانین بڵێین تەنیا هەر ئەوەیە، بەڵام بە تەئکید هەمووی بە ژیانی مرۆڤەوە پەیوەستە، چونکە ئەوەتا خوا ﷻ باسی دروستکرانی ئاسمان‌و زەوی دەکات لە شەش ڕۆژدا، بە شەش قۆناغ‌و، باسی ئەوە کە عەرشی خوا لەو کاتەدا لەسەر ئاو بوو، ئنجا ئایا بۆچی خوا ئەوەی هێنایە دی؟! دەفەرموێ: تاکو تاقیتان بکاتەوە، کەواتە: بوون (وجود) هەمووی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤ و تاقیکرانەوەی مرۆڤو، جێنشینایەتیی مرۆڤەوە لەسەر زەوی، بۆ خوای پەروەردگار، بەڵام ئایا هەر بەوەوە پەیوەستە؟ لە ڕاستییدا ناتوانین وا بڵێین، ڕەنگە زۆر شتی دیکە لەم

(بوون)ەدا هەبێ و، خوا زۆر دروستكراوی دیكەی هەبن، كە ئێمە نەزانین، بەڵام (بوون) هەمووی بە ژیانی مرۆڤەوە پەیوەستە، بەس مەرج نیە تەنیا بەوەوە پەیوەست بێ و، هیچی دیكە لە ئارادا نەبێ.

**بڕگەی شەشەم** : كە دەفەرمووێ : ﴿ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾، ئەگەر تۆ بڵێی دوای مردن هەڵدەستێنرێنەوە، زیندوو دەكرێنەوە، بڵاو دەكرێنەوە، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: ئەمە جادوویەكی ئاشكرایە.

هەڵبەتە خوێنراویشەتەوە : (إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سَاحِرٌ مُّبِينٌ )، واتە: ئەمە جادووگەرێكی ئاشكرایە، دیارە ﴿ مُّبِينٌ ﴾، لێرەدا (اسم فاعل)ە لە (أبان)ەوە، كە لێرەدا بە مانای (بان)ە دێ، (بان)ە واتە: دەركەوت، ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، واتە: ئەمە جادووێكی ئاشكرایە، یان جادووگەرێكی ئاشكراو ڕوون، واتە: ئەو قسانە جادوون، یاخود ئەو شەخسە، كە مەبەستیان پێغەمبەری خوایە ﷺ جادووگەرە، قسەكانی ڕاست نین، كە ئێمە دوای مردن زیندوو بكرێینەوەو هەڵبستێنرێینەوە.

**مەسەلەی شەشەم** : كە دەفەرمووێ : ﴿ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ئازارو سزایان بۆ كاتێكی ژمێردراو (كاتێكی كەم) لێ دوا بخەین، بە جەخت كردنەوە، دەڵێن : ﴿ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ﴾، چ شتێك ڕێی لێ دەگرێ، با ئەو ئازارو سزایەمان بۆ بێنێ.

١) وشەی (أُمَّةٍ )، دەڵێ: (الأمَّةُ: الجمَاعَةُ الكَثِيرَةُ مِنَ النَّاس الَّذِينَ أمْرُهُمْ وَاحِد، وتُطلقُ على المدة كأنهم راعَوا أنها الأمد الذي يَظهرُ فيه جيلٌ فأُطلقت على

مطلق المدة)، (أُمَّة)، لە ئەسڵی زمانـدا، بە مانـای کۆمەڵـێکی زۆر لـە خەڵـك دێ، کە لەسەر شـتێك کـۆببنەوەو، بـە مانـای کـات بـەکـاردێ، یـانی: ئـەومیـان ڕەچاو کـردوە، کە ئەو کـاتەی جیلـێك، خـەڵـکـێکی لـە یـەك ڕۆژگـاردا پێکـەوە تێیدا دەبـن، پەیدادەبـن، جـا دوایی بە گشتی، بە مانای مـاوە بەکـارهـاتوە، وەك لـە سـوورەتی (یوسـف)دا دەفـەرموێ : ﴿وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ ﴿٤٥﴾﴾، ئـەو کـەسـە (یەکـێك لـە دوو هـاوەڵەکـەی یوسـف (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)،) دوای ماوەیەك (دوای کۆمـەڵە کـاتێك، دوای چەند ساڵێك) وە بیری هاتەوە (ئـەوەی کـە یوسـف ﷺ ڕای سـپاردبوو بـە پادشـایەکـەی بڵـێ)، کـەواتە: لـێرە کـە دەفـەرموێ: ﴿أُمَّةٍ مَّعۡدُودَةٍ﴾، (أي مُدَّةٍ قَلِيلَةَ لأَنَّ القليل هو المعدود)، واتە: ئەگـەر بـۆ ماوەیەکی کـەم دوابخرێن، ئنجا بۆ چـەند سـاڵێکە، یان بۆ چـەند مانگـێکە، یانی: بـۆ مـاوەیەکـی کـەم، چونکـە ﴿مَّعۡدُودَةٍ﴾، یـانی ژمێـرراوو، شـتی کـەم دەژمێردرێ، بەڵام شتی زۆر نـاژمێردرێ، یـانی: ئەگـەر بۆ ماوەیەکی ژمێـردراو، بۆ ماوەیەکی کەم، ئـەو ئازارو سـزایەیان لـێ دوا بخەین.

٢) ﴿لَّيَقُولُنَّ﴾ دەڵـێن: ﴿مَا يَحۡبِسُهُۥٓ﴾، چ شتێك ڕێـی لـێ دەگـرێ، یـانی (مَـا یَمْنَعُـهُ)، دەڵـێ : (الحَبْسُ: إلْزَامُ الشـيء مكانـاً لا يتجـاوزه، وهنـا بمَعْنَـى المَنْع)، (حَبْس) ئەوەیە کە تۆ شـتێك ناچار بکـەی لە یـەك شوێن بمێنێتـەوەو، لـێی نەچێتـە دەرێ، لێـرەدا مەبەسـت لـە: ﴿يَحۡبِسُهُۥٓ﴾، (أَي: يَمْنَعُـهُ)، چ شتێك ڕێی لـێ دەگـرێ؟!

٣) خـوا ﷻ وەڵام دەداتـەوە، دەفـەرموێ : ﴿أَلَا يَوۡمَ يَأۡتِيهِمۡ لَيۡسَ مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ﴾، ئاگـادار بن! ئەها! ئەو ڕۆژەی کە ئـەو ئازارو سـزایەیان بۆ دێ، لێیان لا نادرێ، واتە: هیچ هێـزێك ناتوانـێ دوایی بەرپەرچی ئەو بـەڵاو ئـازارو سزایە بداتـەوە، ئنجـا چ مەبەسـت پـێ ئـازارو سزای دنیایی بـێ، وەك ئەوەی لە جەنگی

بەدردا بەسەر کافرەکان هات، ج مەبەست لە هەر بەڵاو سزایەك بێ، کە لە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەهلی ئیمانی ساغ، لەگەڵ ئەهلی کوفردا، بەسەر ئەهلی کوفر دێ، ج مەبەست ئەو بەڵاو دەردەسەرییانە بن کە بەسەریان دێن، وەك گرانیی‌و قات‌و قڕیی‌و وشکەساڵیی‌و ناخۆشیی‌و ناڕەحەتیی‌و گرفتاریی‌و شەڕو شۆڕو کوشتار، یاخود مەبەست پێی سزاو ئازاری ڕۆژی دوایی بێ، هەرچۆن بێ، ئەو ڕۆژە کە سزاو ئازارەکەیان بۆ دێ، خوا ئەو بەڵایەیان بۆ دەنێرێ، ﴿ لَيۡسَ مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ ﴾، لێیان لادراو نابێ، ﴿ مَصۡرُوفًا ﴾، واتە: لادراو، دیارە وەك پێشتریش گوتوومانە: ﴿ أَلَا ﴾، ئامرازی ئاگادار کردنەوەیە، بۆ ئەوەی ئەو هەواڵە کە دوای ئەو دێ، ئینسان چاك گوێی بۆ هەڵخاو، بە گرنگیی پێدانەوە، وەری بگرێ، (صرف)یش بە مانای پاڵ پێوە نان‌و دوورخستنەوەو لادان دێ.

٤) کە دەفەرموێ : ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾، ئەوەی کە گاڵتەیان پێ دەکرد، دەورەی دان، دەڵێ: (الحَوْق: الإحاطة)، (حوق)، واتە: ئابڵووقەدان، ئنجا ئەگەر شتێك دەورەی شتێك بدات، ئەو شتەی کە دەورەی دراوە، ئابڵووقە دراوە، ڕێی هەڵاتنی نیە، ڕێی دەربازبوونی نیە، واتە: کۆتایی پێ دێ.

<u>مەسەلەی حەوتەم</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ ثُمَّ نَزَعۡنَٰهَا مِنۡهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٞ كَفُورٞ ۝٩ ﴾، ئەگەر ئێمە هەندێك بەزەیی خۆمان بە مرۆڤ بچێژین، نیعمەتێك، کە لە ڕەحمەت‌و بە بەزەیی ئێمەوە دێ، لە بەخشش‌و کەرەمی ئێمەوە دێ، پێی بچێژین، دوایی لێی وەربگرینەوەو لێی دابڕنین ﴿ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٞ كَفُورٞ ﴾، بێگومان ئەو زۆر نا ئومێدو زۆر سپڵەو ناسوپاس دەبێ.

لێرەدا خوا ﷻ پێناسەی مرۆڤمان بۆ دەکات، بەو سیفەتە خراپەیەی کە بە خۆشییان زۆر دڵخۆش دەبێ‌و، بە ناخۆشییانیش زۆر نائومێد دەبێ، زۆر بە هەڵپە

دەکەوێ، هەڵبەتە لێرەدا وشەی ﴿ ٱلْإِنسَٰنَ ﴾، (ال)ی سەر ﴿ ٱلْإِنسَٰنَ ﴾، (تعریف للجنس مراد به الإستغراق)، ئەو (ال)ە، بۆ جینسی مرۆڤەو، مەبەست پێی ئەوەیە کە هەموو تاکەکانی مرۆڤ هەر بەو شێوەیەن، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی خوا ﷻ ئەوانەی کە ئەهلی ئیمانن و چاکەکارن و، خۆڕاگرن، ئەوانە هەڵداوێرێ، کەواتە: هەر مرۆڤێك ئیمانی نەبێ، هەر مرۆڤێك بە خواوە پەیوەست نەبێ، ئەوە عادەتیەتی و، ئەوە سیفەتیەتی.

## شیکردنەوەی ئایەتی (١١) لە حەوت بڕگەدا

**بڕگەی یەکەم** : کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ﴾، دیارە (الإذاقة)، یانی: پێچێژتن، شتێك ئینسان بیچێژێ و تامی بکات، لێرەدا دەڵێ: (الإِذَاقَةُ: مُسْتَعْمَلَةَ فِي إِيصَال الإِدْرَاك عَلَى وَجْهِ المَجَاز)، لێرەدا وشەی (إذاقة)، بەکارهێنراوە بۆ گەیاندنی هەست پێ کردن، بە شێوەی (مَجَاز)، واتە: هەر کاتێك ئێمە کە چاکەیەکمان لەگەڵ مرۆڤدا کرد، بەڵام خوای پەروەردگار وشەی چێژتنی بۆ بەکارهێناوە، بە شێوەی (مَجَاز)، ئەم وشەیە بەکارهاتوە، ئەگەرنا چاکە مەرج نیە هەمووی هەر بۆ خواردن بێ، خوا لەشی ساغ دەکات و، ماڵ و منداڵی دەداتێ، سەروەت و سامانی دەداتێ، دەسەڵاتی دەداتێ، سومعە و ئیعتیباری دەداتێ، کە مەرج نیە هەمووی تام بکرێ، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا ئەو وشەیە بۆ گەیاندنی چاکە و نیعمەت بە کەسێك بەکاردێ، هەروەك جاری وایە بۆ گەیاندنی سزاو ئازاریش بەکاردێ، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ السجدة، واتە: ئازارو سزای نیزیکترو کەمتریان پێ دەچێژین، پێش ئازارو سزای گەورە، بەڵکو بگەڕێنەوە.

**بڕگەی دووەم** : وشەی (رَحْمَةً)، کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی زۆر شت بێ، دەگونجێ مەبەست پێی

تەندروستیی بێ، بێبەلایی بێ، بژیوو ڕزقو ڕۆزیی بێ، هێمنییو ئاسایش بێ، سەروەتو سامان بێ، هەموو ئەوانە ئەو بوارانەن، كە بەزەییو میهرەبانییو بەخششی خوا تێیاندا بەرجەستە دەبێ.

**بڕگەی سێیەم** : كە دەفەرموێ : ﴿ثُمَّ نَزَعْنَـٰهَا مِنْهُ﴾، واتە: پاشان لێمان دارنیو لێمان وەرگرتەوە، دەڵێ : (النَّزْعُ: خَلْعُ الثَّوْبِ عَنِ الجَسَدِ، وَهُنَا سَلْبُ النِّعْمَةِ)، لە ڕیشەدا وشەی (نَزْع)، ئەوەیە كە ئینسان پۆشاك لەبەر خۆی بكاتەوە، پۆشاك دابڕنێ لە جەستەی، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی لابردنو وەرگرتنەوەی ئەو نیعمەتو چاكەیە.

**بڕگەی چوارەم** : كە دەفەرموێ : ﴿إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ﴾، دیارە (یَئُوس)، (صیغة المبالغة)ی (آیس، یائس)ە، (كفور)یش (صیغة المبالغة)ی (كافر النعمة)یە، واتە: زۆر نائومێد دەبێو، زۆریش سپڵەو ناسوپاس دەبێ، لە كاتێكدا كە ئێمە ئەو چاكەیەی لێ وەردەگرین، پێشێ خوا چاكەی لەگەڵدا كردوە، بزانێ ئایا سوپاسی خوا دەكات، شوكرانەی دەكات، ئەو نیعمەتو چاكەیە لە خوا دەزانێ، یان نا؟! دوایی لێی وەردەگرێتەوە، تاكو دەربكەوێ: ئایا كە نەیتوانێ ئەهلی شوكر بێ، داخۆ ئەهلی صەبر دەبێ؟! بەڵام لە هەردوو حاڵەتان دا هەر دەدۆڕێ، ئینسانی كافر لە كاتی هاتیدا، شوكرانەبژێر نابێو، لە كاتی نەهاتیشی دا، خۆڕاگر نابێ، بە پێچەوانەی ئینسانی ئیماندارەوەیە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی حاڵی ئینسانی بڕوادار دەفەرموێ : {عَجَباً لأَمْرِ المُؤمِنِ، إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ خَيرٌ لَهُ، وَلَيسَ ذَلِكَ لأَحَدٍ إلاّ لِلْمُؤمِنِ، إنْ أصَابَتهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيراً لَهُ، وَإنْ أصَابَتهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ، فَكَانَ خَيراً لَهُ} {رَوَاهُ أحْمَد برقم : (١٨٨٣٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٤٢٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٨٩٦)، عَنْ صُهَيْبٍ رضي الله عنه} . واتە: ئیشی ئینسانی ئیماندارو حاڵی ئینسانی بڕوادار سەیرە! حاڵو ئیشی كاری ئەو، هەمووی هەر خێرو چاكەیە، ئەوەش بۆ هیچ كەسێك نیە جگە لە ئیماندار، ئەگەر خۆشیی تووش هات سوپاسگوزاریی لەسەر دەكاتو پاداشتی بۆ هەیەو، ئەگەر ناڕەحەتییو ناخۆشیی تووش هات، خۆی لە بەرانبەردا ڕادەگرێو پاداشتی هەیە.

ڕاستە ژیانی ئینسان یان خۆشییە، یان ناخۆشییە، ئەگەر خۆشیی بوو، بە سوپاسگوزاریی (شکر) لەگەڵی ڕووبەڕوو ببەوەو، ئەگەر ناخۆشیی بوو بە صەبر، بۆیە خوا ﷻ لە قورئاندا لە چەند شوێندا باسی (صبر)و (شکر) بەیەکەوە دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ۝٥﴾ إبراهيم، واتە: بێگومان لەوەدا نیشانەی زۆر هەن، بۆ هەرکەسێکی زۆر خۆڕاگری زۆر سوپاسگوزار.

**<u>برگەی پێنجەم</u>**: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاءَ بَعْدَ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ﴾، مرۆڤی بێبڕوا لە کاتێکدا کە خوا ڕەحمەتی خۆی پێ بچێژێ‌و، دوایی لێی وەربگرێتەوە، ئەوە پیشەیەتی کە باسمان کرد، دەفەرموێ: ئەگەر پاش ناخۆشیی، خۆشیی بێنێتە ڕێی؟: ئەگەر ئێمە چاکەو خۆشیی پێ بچێژین، دوای ناخۆشیی‌و ناڕەحەتییەك کە تووشی بووە.

(نعماء)، بە مانای (نعمة)ە، واتە: چاکەو خۆشیی، (مس)یش بە مانای تووش بوونە، ﴿لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي﴾، زۆر بە جەخت کردنەوە دەڵێ: هەرچی خراپەو ناڕەحەتییە لە من لاچوە.

دەڵێ: (السيئات: ما تسوء الإنسان)، (سیئات) هەر شتێکە کە ئینسان پێی ناخۆش بێ‌و بۆ ئینسان خراپ بێ‌و، حاڵی ئینسان خراپ بکات، کەواتە: ئەگەر چاکەو نیعمەتی خۆمانی پێ بچێژین، دوای ناخۆشییەك کە بە ئاستەم تووشی بووە، دیسان لە کەوڵی خۆی دەردەچێ، وەك چۆن کە ڕەحمەتمان پێ دەچێژت، دوایی لێمان وەردەگرتەوە، نا ئومێد دەبوو، سپڵەو ناسوپاس دەبوو، ئەمجارەش دوای ئەوەی کە ناڕەحەتیی‌و ناخۆشیی تووش بووە، چاکەی بۆ بێنینە پێشێ‌و چاکەی پێ بچێژین، یەکسەر لە خۆی بایی دەبێ، لە کەوڵی خۆی دەردەچێ، دەڵێ: هەرچی ناڕەحەتییە لە من دانەما!

ئینسان لەو جۆرە کەسانە زۆر دەبینێ، کە وەك گوتراوە: بە مستە ئاوێك دەکەوێتە مەلە، لە کاتی ناخۆشییدا، دڵی وەك کونە مێروو، شارە مێروو وایە،

بە دڵۆپە ئاوێك وێران دەبیٚ و لە كاتی ناخۆشیی دا، سەری دنیای لیٚ دێتەوە یەك، زۆر نائومێد دەبیٚ، پێی وایە دەستی لە هەموو پچكان بڕاوەو لە بن درەختێكە هیچ گەڵای پێوە نەماون! لە كاتی هاتو هەبوون و، خۆشییشدا، دیسان لە خۆی بایی دەبیٚ و بە مستە ئاوێكی دەكەوێتە مەلە، دەكەوێتە هەلەكە سەماو، پێی وایە تازە نارەحەتیی باریان كردو نەمان و، جارێكی دیكە ناخۆشیی نابینێتەوە.

بۆیە خوا دەفەرموێ : ﴿إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾، بێگومان ئەو مرۆڤە زۆر شادمان و دڵخۆشەو، زۆر شانازییكەرە دەڵیٚ: (الفَرَحُ: شدة السرور وتجاوز الحد فيه)، (فَرَح)، بریتیە لە زۆر دڵ خۆش بوون و، ئەوە كە لە سنوور تێپەڕێنیٚ، بۆیەش زۆر دڵخۆش بوون لە قورئاندا، زەم كراوە، مەگەر ئینسان بە ڕەحمەتی خواو بەخشییشی خوا زۆر دڵخۆش بیٚ، وەك دەفەرموێ: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ ﴿٥٨﴾﴾یونس، بڵیٚ: با تەنیا بە بەخششی خواو بە بەزەیی خوا، تەنیا بەوە با زۆر دڵخۆش بن، ئەگەرنا بە هیچی دیكە زۆر دڵخۆش نەبن .

دیارە ئینسان چاكەی پیٚ خۆشەو خراپەی پێناخۆشە، خۆشیی پیٚ خۆشە، ناخۆشییشی پیٚ ناخۆشە، بەڵام زۆر دڵخۆش بوونت، دەبیٚ تەنیا بەو شتانە بیٚ، كە بەختەوەریی تۆیان پێوە پەیوەستە، بەو شتانەی كە خوا ﷻ دایناون كە ئینسان پێیان دڵخۆش بیٚ و، پێیان دڵ ئارام بیٚ.

<u>بڕگەی شەشەم</u> : وشەی ﴿فَخُورٌ﴾، دەڵیٚ : (الفَخْرُ: تَبَاهِي المَرْءِ عَلَى غَيْرِهِ بِمَا لَهُ من الأشياء المحبوبة للنَّاس)، (فَخر) بریتیە لە خۆ هەڵكێشانی مرۆڤ بەسەر غەیری خۆیدا، بەهۆی ئەو شتانەوە كە لەلای خەڵك خۆشەویستن، ئەگەر سەروەت و سامانێكی بیٚ، دەسەڵاتێكی بیٚ، خزم و قەومێكی بیٚ، حیزبێكی بیٚ، ئەگەر جوانییەكی بیٚ، ئەگەر عەقڵ و شارەزاییەكی بیٚ، هەر شتێك ئینسان خۆی پیٚ بەسەر خەڵكدا هەڵكێشیٚ، ئەوە بە تەئكید هەر شتێكی خراپە، (فخور)یش (صيغة المبالغة)ی (فاخر)ە، یانی: زۆر خۆهەڵكێش.

خوا ﷻ لە سوورەتی (فصلت) ئایەتی (٥٠)دا باسی ئەو مەسەلەیە دەکاتو دەفەرمووێ : ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ ﴾.

واتە: ئێمە ئەگەر ئەو مرۆڤە (واتە: مرۆڤی بێبڕوا، مرۆڤی بە خواو ناپەیوەست)، لە بەزەیی خۆمان پێی بچێژین، دوای ناخۆشییەك كە تووشی بووە، بە تەئیكدو جەخت كردنەوەوە دەڵێ: ئەوە هەر هی منە، من شایستەی ئەوەم، پێشم وانیە ئاخیر زەمان (ساعة) بێ، ئەگەر گریمان ئاخیر زەمان هەشبێو بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگاریشم، لەلای ویش هەر شتی هەرە چاكم هەیەو شتی هەرە چاكم بۆ هەڵگیراوە! خوا دەفەرمووێ: ئەوانەی بێبڕوان، هەواڵیان پێ دەدەمین، بەوەی كە دەیانكردو، لە سزاو ئازارێكی زبرو پتەوو گەورەیان پێ دەچێژین.

هەروەها لە سوورەتی (الشورى) ئایەتی (٤٨)دا دیسان باسی ئەو بابەتە دەكاتو خوا ﷻ دەفەرمووێ : ﴿ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئەگەر ئەندازەیەك لە بەزەیی خۆمان بە مرۆڤ بچێژین، زۆر پێی دڵخۆش دەبێو، ئەگەر بەهۆی كردەی دەستی خۆیانەوە، خراپەیەكیان بێتە سەرێ، ئەوە مرۆڤ زۆر سپڵەو ناسوپاس دەبێ.

خوا ﷻ ئاوا باسی مرۆڤان دەكات، ئەو مرۆڤانەی دەستی هیدایەتی خوایان پێ نەگەیشتوە، ئەو مرۆڤانەی كە عەقڵو دڵیان بە نووری ئیمان ڕۆشن نەبۆتەوە، ئەگەرنا دڵێك ئیمانی تێدا بێ، نە بەهات هێندە لە خۆیی بایی دەبێو شادمان دەبێ، نە بە نەهاتیش، ئاوا ئەژنۆی دەشكێو دەست لە كراسی دەردێنێو نائومێد دەبێ.

**بڕگەی حەوتەم** : بۆیە دەفەرموێ : ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ١١﴾، جگە لەوانەی خۆیان ڕاگرتووەو پشوو درێژ بوونو، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، ئا ئەوانە لێبوردنێکی تایبەتو پاداشتێکی گەورەیان لە لای پەروەردگاریان هەیە.

تێبینی ئەوەیە، کە خوا ﷻ لێرەدا نەیفەرمووە: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ٣﴾ العصر، کە ئەمە زۆر هاتوە لە قورئاندا، هەمیشە ئیمانو کردەوەی چاك پێکەوە دێن، چونکە ئەو کەسەی کە ئیمانی بێ، ئیمانەکەی وەك داینەمۆیەك بەرەو چاکە دەیجووڵێنێ، هەروەك چۆن کوفر ئینسان بەرەو خراپە دەجووڵێنێ، ئیمانیش ئینسان بەرەو چاکە دەجووڵێنێ، بۆیە لە قورئاندا لە دەیان شوێندا، ئیمان لەگەڵ کردەوەی باشدا هاتوە، بەڵام لێرەدا خوا فەرموویەتی: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ...١١﴾، چونکە بە دڵنیایی بەهۆی خۆڕاگرییەوە، ئینسان ڕادێ لەسەر ئەوە کە بە دوای ئارەزووی خۆی نەکەوێو، لەسەر ئەوە کە ئینسان خۆڕاگر بێ، لە بەرامبەر هاتدا، ئەگەر هاتو خۆشیی بوو، پێی لەخۆبایی نەبێو، لە کەولی خۆی دەرنەچێو زۆر دڵخۆش نەبێ، بزانێ کە شتێکی کاتییەو بەسەر دەچێ، یان دوایی ڕەنگە ناخۆشیی بە دوا دابێ، لە دوای نشێوان هەورازە، لە دوای هەورازان نشێو، ئەگەر نەهاتیشی بوو، دیسان نائومێد نەبێ، پێی وانەبێ دەستی لە هەموو پچکان بڕاوە!

بەهۆی خۆڕاگرییەوە ئینسان ئەو سیفەتە بەرزانەی تێدا پەیدا دەبن، پێچەوانەی ئەو سیفەتە خراپانەی کە لە ئەهلی کوفردا هەن، بێگومان بەهۆی خۆڕاگرییشەوە، ئینسان دەتوانێ کە فەرمانبەریی (طاعة)، بۆ خوا ئەنجام بدات.

کەواتە: خوا ﷻ بۆیە لێرەدا ئەهلی ئیمانی بە خۆڕاگریی وەسف کردوە، چونکە ئەو سیفەتە لێرەدا زۆر ڕۆڵیان بۆ دەبینێ، کە بیانپارێزێ لەوەی ئەو

سـیفەتە خراپـانەی ئەهلـی كـوفریان تێـدا بێنـە دی، ئەگـەرنا بـە تەئكـید خۆڕاگریـیو پشـوو درێـژییو شـوكرانە بژێرییو...هتـد، هـەموویان بەرهـەمی ئیمانن، ئەوانە هەموویان چەند میوەیەكن لە درەختی ئیمان پەیدادەبن.

دیـارە لێرەدا خـوای كـارزان دەفـەرموێ : ﴿وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ﴾، لە شـوێنی دیكە دەفـەرموێ : ﴿أَجۡرٌ عَظِيمٌ ١٧٢﴾ آل عمران، یان دەفەرموێ : ﴿أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ٦﴾ التـین، پاداشتی گەورە، پاداشتی مەزن، پاداشتێكی نەبڕاوە، خـوای پەروەردگار ئاوا ئـەو بەهەشـتەی كـە دەیكـاتە خـەڵاتو دیـارییو دەیكـاتە پاداشـتو كـرێ بـۆ بڕوادارانێـك، كە لە ژیانی دنیادا بەو شێوەیە مامەڵەیان كـردوە، كە خـوا لە خۆیـان ڕازی بكەن، بەو وەسـفانە پێناسەی دەكـات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان سێزدە (١٣) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی : (١٢ – ٢٤)و، ئەم دەرسەمان حەوت بابەتی سەرەکیی تێدا خراونە ڕوو:

١ـ ئامۆژگاریی کردنی پێغەمبەر ﷺ کە نابێ بەهۆی داواکارییە بێجێیەکانی کافرەکانەوە، وەك ئەوە کە : خەزێنەی بۆ دابەزێ، فریشتەی لەگەڵ بێ، نابێ بەهۆی ئەو داواکارییە بێجێیانەی کافرەکانەوە، دڵتەنگ بێ، چونکە ئەو تەنیا گەیاندنی پەیامی خوای لەسەرە، بەڵام ئەوەی کە سەرپەرشتیاری بەندەکانەو، ئاگادارییانەو چاودێرییانەو، پارێزەریانەو، هەمەکارەیانە، تەنیا خوای پەروەردگارە.

٢ـ بەرپەرچدانەوەی تۆمەتی کافرەکان، کە گوایە قورئان هەڵبەستراوە، ئەویش بەوە بەرپەرچیان دەدرێتەوە کە ئەوانیش ئەگەر ڕاست دەکەن: قورئان هەڵبەستراوە، با ئەوانیش دە (١٠) سوورەتی هەڵبەستراو بێنن، وەك سوورەتەکانی قورئان.

٣ـ باسی بێبڕوایانی دنیا ویست دەکات، کە سەرەنجامیان مایەی پووچیی و زیانبارییە، کردەوە باشەکانیشیان کە لە دنیادا کردوویانن، هەڵدەوەشێنەوە، لەبەر ئەوەی پەیوەستیان نەکردون بە خواوەو، پەیوەستیان نەکردوون بە خوا بە یەکگرتن و ئیخلاصەوە، ئنجا هەر کردەوەیەك کە ئیخلاصی تێدا نەبێ، خوا پێ مەبەست بوونی تێدا نەبێ، لە ڕاستییدا وەك شیرێك کە هەوێنی تێنەکرێ، دەترشێ و هەڵدەبزڕکێ و دەبێ فڕێ بدرێ، کردەوەیەکیش کە ئیخلاصی تێدا نەبێ و، پەیوەست نەکرابێ بە خواوەو بۆ خوا ئەنجام نەدرابێ، نابێ چاوەڕێی کرێ و پاداشتەکەی لە خوا بکەی، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : {إِنَّمَا الأَعْمَالُ

بِالنِّيَّاتِ، وإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوى} {أَخْرَجَهُ مَالِك برقم : (٩٨٣)، وَأَحْمَد برقم : (١٦٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم : (١)، وَمُسْلِمٌ برقم : (١٩٠٧) وَغَيْرهُم}.

واتە: بێگومان کردەوەکان بە گوترەی نیەتەکانن، هەڵبەتە کردەوە باشەکان، ئەگەرنا کردەوەی خراپ، نیەتیشت باش بێ، هەر خراپە، بەڵام کردەوەی باش، ئەگەر پەیوەستی نەکەی بە خواوە، نابێ چاوەڕێی پاداشتەکەی لە خوا بکەی، تۆ شتێکت بۆ خوا نەکردبێ، چۆن چاوەڕێی پاداشتەکەی لەو دەکەی؟!

٤ـ بەراوردکردنێکی نێوان بڕوادارانێکی بەرچاو ڕوونو، بێبڕوایانی کەللە وشکی دەمارگیر.

٥ـ باسی ئەوە کە هیچ کەس لە درۆ هەڵبەستەران بە ناوی خواوە، ستەمکارتر نیەو، پێناسەی ئەو جۆرە کەسانە، بە کۆمەڵێك سیفەتیان، کە سەرجەم نۆ سیفەتنو، خستنە ڕووی سەرەنجامی شوومیان، کە دیسان سزاو سەرەنجامە شوومەکەیان، کە لە نۆ شتدا بەرجەستە دەبێ، وەك دوایی باسیان دەکەین.

٦ـ پێناسەی بڕوادارانی کردەوەی باش، کە بۆ پەروەردگاریان ملکەچو نەرمو هێدییو مەندن، لە خزمەتی پەروەردگاریان دا.

٧ـ بەراوردی نێوان کۆمەڵی بێبڕوایانو کۆمەڵی بڕوادارانو، خستنە ڕووی سیفەتە پێچەوانەکانیانو، یەکسان نەبوونیان، کە بێبڕوایان بە کەڕو کوێرو، بڕواداران بە بینەرو بیسەر، پێناسە کراون.

﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعْضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدْرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ
عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٢﴾ أَمْ
يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُۖ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُواْ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن
دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن
لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ
إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا
ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ
مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةًۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ
بِهِۦۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن
رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ
كَذِبًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ
أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم
بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَمْ يَكُونُواْ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن
دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلْعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُواْ
يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾
لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
وَأَخْبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾ مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ
كَٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْأَصَمِّ وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

# مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{(ئـەی موحەممـــەد!) ئایـا نیزیکـە بەهــۆی ئـەوەوە کـە (بێبـڕوایەکـان) دەڵـێن: دەبووایـە خەزنەیـەکی دابەزێنرابایـە سـەر، یـان فریشـتەیەکی لەگـەڵ هاتبایـە، واز لـە (ڕاگەیاندنـــی) هەنـدێك لـەو (پەیـــام)ە بێنـــی، کـە بـۆت سـروش کـراوە، سـینەت بەهـۆیەوە تەنگـو سـەغڵەت بـێ! بێگومـان تـۆ تـەنیا ترسـێنەرو وریـاکـەرەوەی‌و، خـوا بەسـەر هـەموو شتێکەوە چاودێرو پارێزەرە ﴿١٢﴾ یان ئایا دەڵێـن: (موحەممـەد) خـۆی هەڵیبەسـتوە! بڵـێ: ئێوەش دە (١٠) سووڕەتی هەڵبەسـتـراوی وەك وی بێنن، ئەگەر ڕاسـت دەکـەن‌و، هــەر کـەس کـە دەتوانــن، لـە خـوار خــواوە بانگـیان بکـەن، (بـا هاوکــارتان بن) ﴿١٣﴾، ئنجا ئەگـەر هاوکارەکانتـان وەڵامیـان نەدانـەوە، ئـەوە بـزانن کـە (قورئــان) بە زانیــاریی خوا دابەزێنــراوە، (بزانــن) کە جگە لە خوا هیچ پەرسـتـراوێك نیـە، ئنجـا ئایـا ئێوە بۆ خوا ملکـەچ دەبـن! ﴿١٤﴾ هەر کـەس ژیانی دنیاو جوانییەکەی بوێ، بێنەوەی لێیان کـەم بکرێتـەوە، لـە دنیـادا بەرهـەمی کردەوەکانیـان بـە تەواویــی پێدەدەیـن ﴿١٥﴾ ئا ئەوانە کەسانێکن لە دواڕۆژدا بـەس ئاگریــان هەیـەو، هەرچــی لـە دنیــادا بە کــارامەیی کردوویانـە، هەڵوەشاوەتەوەو، هەرچــی ئەنجامیــان داوە، پــووچ‌و بۆشە ﴿١٦﴾ ئایا کەسێك لە لایەن پەروەردگـاریەوە لەســەر بەڵگەیەکــی ڕۆشــن بـــێ‌و، شــایەدێکیشــی لـە (خـوا)وەوە بـە دوادا بـــێ‌و، پێشــتــریش کتێبەکــەی مووســای کـە پێشـەواو بەزەیـی بوو (لە خواوە) بە دەستەوە بـێ، (وەك کەسێك وایە کە دەسـتـی لە مانە خـاڵییـە)، ئا ئەوانە بڕوای پـێ دێنن‌و، هەر کـەس لە کۆمەڵـە (لاڕێییـەکان) پێـی بێبـڕوابــێ، ئـەوە ئـاگر - ی دۆزەخ – بەڵێنگـەیەتی، دەجـا تـۆ هـیچ دوو دڵ مەبـە، بـە دڵنیایی ئەو (قورئان)ە، هەقە لە پەروەردگـارتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی بـڕوا ناهێنــن ﴿١٧﴾ ئنجا ئایا کـێ لەو کەسە سـتەمکارترە، کە درۆ لە دژی خوا هـەڵدەبەسـتـێ! ئەوانە (کە لە ڕۆژی دوایی دا) لەسـەر پەروەردگــارت ڕادەنـوێنرێن‌و، شـایەدەکان دەڵـێن: ئا

ئەوانە بوون کە درۆیان لە دژی پەروەردگاریان کرد، ئەها (ئاگاداربن!) نەفرینی خوا لەسەر ستەمکارانە ﴿١٨﴾ ئەوانەی (خەڵك) لە ڕێی خوا لادەدەنو لاڕێییان بۆی دەوێ، (دەیانەوێ بەرنامەی خوا خوارو خێچ بکەن)و ئەوانە بە دڵنیایی بە ڕۆژی دوایی بێبڕوان ﴿١٩﴾ ئەوانە لە زەمیندا دەستەوسانکەرانی خوا نابنو، لە خوار خواوە هیچ دۆستیان نیە، ئازارو سزایان بۆ دوو بەرانبەر دەکرێ، (چونکە) نەیاندەتوانی ببیستنو، نەیاندەبینی ﴿٢٠﴾ ئەوانە کەسانێکن، خۆیان دۆڕاندوەو، ئەوەی هەڵیاندەبەست لێیان ون بوو ﴿٢١﴾ بە دڵنیایی هەر ئەوانەن لە دواڕۆژدا، هەرە زیانبارن ﴿٢٢﴾ مسۆگەر ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە چاکەکانیان کردوونو، بۆ پەروەردگاریان نەرمو ملکەچن، ئەوانە هاوەڵی بەهەشتنو، تێیدا هەمیشەیی دەبن ﴿٢٣﴾ وێنەی دوو کۆمەڵەکە (بڕوا دارانو بێبڕوایان) وەك بابای کوێرو کەڕو، بابای بینەرو بیسەرە، ئایا حاڵیان یەکسانە؟ ئایا بیر ناکەنەوە ﴿٢٤﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( فَلَعَلَّكَ ) : (لَعَلَّ: طَمَعٌ وَإِشْفَاق، أَي: يَظُنُّ بِكَ النَّاسُ ذَلِكَ)، وشەی (لعل) بۆ ئومێد هەبوونو لێترسانە، پەرۆشیی دەربڕینو ئومێدەوار بوونە، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ ﴾، واتە: خەڵکی بێبڕوا بەو جۆرە گومانت پێ دەبات، کە ئەگەر زیاتر فشارت بۆ بێنن، ئەوە لە هەندێک لەوەی کە ئێمە تۆمان پێ ڕەوانە کردوە، واز دێنیو پێیان ڕاناگەیەنی.

(تَارِكُۢ) : (تَرَكَهُ : طَرَحَهُ وَخَلاَّهُ، وَتَرَكَهُ يَفْعَلُ كَذَا: جَعَلَهُ يَفْعَلُهُ وترك كُلاًّ خَلْفَهُ)، (ترکه) واتە: وازی لێهێناو، بەجێی هێشت، وە دەگوترێ: (تَرَكَهُ يَفْعَلُ كَذَا) واتە: لێیگەڕا، وازی لێهێنا.

(وَضَآئِقُۢ بِهِۦ) : (ضَاقَ ضَيْقًا وَضِيقًا: انْضَمَّ بَعْضُهُ إِلى بَعْض، فَلَمْ يَتَّسِعْ لِمَا فِيهِ وَقَصُرَ عَنْهُ)، وَضَاقَ صَدْرُهُ بِهِ: تَأَلَّمَ أَوْ ضَجِرَ أَوْ شَقَّ عَلَيْهِ)، (ضَاقَ ضَيْقاً وَضِيْقاً) بریتیە لەوەی شتێک هەندێکی بێتەوە یەکو، ئەو شتەی کە تێیدایە جێی نەبێتەوەو کورت بێنێ، دەگوترێ: (وَضَاقَ صَدْرُهُ بِهِ) واتە: هەستی بە ئازار کرد، ناڕەحەت بوو، بێزار بوو، یاخود ئەو شتەی لەسەر قورس بوو.

( كَنزٌ ) : (الكَنْزُ: جَعْلُ المَالِ بَعْضهُ عَلَى بَعْضٍ وَحِفْظُهُ، مَالٌ عظيم)، (كَنْز) بریتیە لەوە کە سەروەتو سامان بخرێتە سەر یەکو پەزمەندە بکرێو بپارێزی، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ماڵو سامانێکی زۆرە.

(نُوَفِّ): (الوَافِي: الَّذِي بَلَغَ التَّمَام، تَوْفِيَةُ الشيءِ: بَذْلُهُ وَافِياً)، (وَافي) هەر شتێکە کە گەیشتبێتە ڕێژەی تەواوی خۆیو، (تَوْفِيَةُ الشيءِ) ئەوەیە کە بە تەواویی

ببەخشرێ، بە تەواویی بدرێ، کەواتە: (نُوَفِّ إِلَيْهِم) واتە: بە تەواویی پێیان دەدرێ.

(لَا يُبْخَسُونَ) : واتە: لێیان کەم ناکرێتەوە، (البَخْسُ: نَقْصُ الشيءِ عَلَى سَبيلِ الظُّلْمِ)، (بخس) ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ستەمکارانە شتێك کەم بکرێتەوەو، لێی لابدرێ.

(وَحَبِطَ) : (وَأَصْلُ الحَبْطِ مِنَ الحَبَطِ، وَهُو أَن تُكثِرَ الدَابَّةُ أَكلاً حَتَّى يَنتفخَ بطنها)، وشەی: (حَبِطَت) لە ڕیشەوە لە (حَبَط)ەوە هاتوە، ئەویش ئەوەیە کە ئاژەڵێك لەوەڕێك زۆر بخوات تاکو ورگی دەئاوسێ.

(صَنَعُواْ) : (الصُّنْعُ: إِجَادَةُ الفِعْلِ، فَكُلّ فِعْل صُنْعٌ، وَلَيْسَ كُلّ صُنْعٍ فِعْلاً)، (صنع) ئەوەیە کە بە کارامەییو لێزانیی کارێك ئەنجام بدرێ، بۆیە هەموو (فعل)ێك (صنع)ە، بەڵام هەموو (صنع)ێك (فعل) نیە، یانی: هەر شتێك کە دەکرێ، وشەی (فعل)ی بۆ بەکاردێ، بەڵام هەر شتێك کە بە وردەکاریی دەکرێ، وشەی (صنع)ی بۆ بەکاردێ.

(بَيِّنَةٍ) : (الدَّلَالَةُ الوَاضِحَة) واتە: بەڵگەیەك، شتێك زۆر چاك ڕوونبکاتەوە بۆ بەرانبەر، کە نەتوانێ لامو جیمی تێدا بکات.

(وَيَتْلُوهُ) : هەم بە مانای دەیخوێنێتەوە (يَقْرَأُهُ) و هەم بە مانای بە دوایدا دێ (يَتْبَعُهُ) دێ، بەڵام لێرەدا دەڵێ: (تَلاهُ: تَبِعَهُ مُتَابَعَةً لَيْسَ بَيْنَهُمْ مَا لَيْسَ منها، قَرَأَهُ)، لێرەدا بە مانای شوێنکەوتن دێ، واتە: بە شێوەیەك شوێنی کەوت، یەکسەر بە دوای بکەوێو هیچ شتێکی دیکە نەکەوێتە نێوانیان.

(يُعْرَضُونَ) : ڕادەنوێنرێن، (عَرَضْتُ: الشيءَ عَلَى البَيْعِ، وَعَرَضَ لَهُ كَذَا: ظَهَرَ)، (معرض) واتە: پێشانگا، ئەو شوێنەی کە شتی لێ دادەنرێ بۆ ئەوەی خەڵك بیبینێو بیکڕێ، دەگوترێ: (عَرَضْتُ: الشيءَ عَلَى البَيْعِ) واتە: ئەو شتەم بۆ

فرۆشتن (عرض) كردوە، واتە: خستوومەتە بەرچاوو، دەگوترێ: (عَرَضَ لَهُ كَذَا) ئەو شتەی بۆ دەركەوت، یاخود (عَرَضْتُهُ) واتە: ئەو شتەم دەرخست، پێشانمدا.

( ٱلْأَشْهَٰدُ ) : گوێ (شاهد)ە، یان گوێ (شَهِيد)ە، واتە: شایەدەكان، یاخود ئامادەبووەكان، (المُشَاهَدَة: المعَايَنَة، شَهِدَهُ: حَضَرَهُ)، (مشاهدة) واتە: لەگەڵی بوو، بینی، لەلای ئامادە بوو.

( لَعْنَةُ ٱللَّهِ ) : واتە: نەفرینی خوا، (اللّعْنُ: الطّرْدُ وَالإبْعَادُ عَلَى سَبيلِ السُّخْطِ)، (لعن) بریتیە لە دەركردنو دوورخستنەوە، بە شێوەی لێ توورە بوون.

( يَصُدُّونَ ) : (الصُّدُودُ وَالصَدّ: الإنْصرَافُ وَالإمتِنَاعُ وَالصَّرْفُ وَالمَنْعُ)، (صدود) و (صد) كە هەردووكیان چاوگن، ئەوەیە كە ئینسان خۆی واز لە شتێك بێنێو شوێنی نەكەوێو ڕووی تێنەكات، یاخود خەڵكی لێ بگێڕێتەوەو لێی دووربخاتەوە.

( وَيَبْغُونَهَا ) : (أي يَطْلُبُونَ لَهَا) واتە: بۆی داوا دەكەن، بۆی دەخوازن.

( عِوَجًا ) : واتە: خوارو خێچیی، (العَوَجُ: العَطْفُ عَلَى الحَالِ، الإنْتِصَابِ)، شتێك كە ڕێك بوەستێنرێ پێی دەگوترێ: (إنْتَصَبَ)ە، ئەگەر شتێك بنوشتێنرێتەوە پێی دەگوترێ: (عوج)، بۆ شتی بەرهەستە (العَوَجُ: يُقَالُ فِيمَا يُدْرَكُ بالبَصَرِ، وَالعِوَجُ: يُقَالُ فِيمَا يُدْرَكُ بالفِكْرِ والبَصِيرَةِ)، (عَوَج) بە شتێك دەگوترێ كە بە چاو ببینرێ، ئەگەر درەختێك شكابێتەوە، پێی دەگوترێ: (عَوَج)، شتێك كە بە عەقڵو بە فكر بزانرێ شكاوەتەوەو خوارو خێچە، پێی دەگوترێ: (عِوَج).

( يُضَٰعَفُ ) : (ضَعَّفْتُ الشيءَ وَأَضْعَفْتُهُ وَضَاعَفْتُهُ: ضَمَمْتُ إلَيْهِ مِثْلَهُ)، هەر سێ وشەی (ضَعَّفْتُ) و (أَضْعَفْتُهُ) و (ضَاعَفْتُهُ) واتە: شتێك وێنەی خۆیم لەگەڵی دانا، یانی: دوو بەرانبەرم كردوە.

( لَا جَرَمَ ) : (أَصْلُ الجُرْمِ قَطْعُ الثَمَرَةِ عَنِ الشَّجَرِ، لاَ جَرَم: لاَ بُدَّ، لاَ مَحَالَة، ثم تحولت إلى مَعْنَى القَسَم)، وشەی (جرم) لە ڕیشەدا بریتیە لەوە کە میوە لە درەخت بچنرێ، کەواتە: (لا جرم) واتە: بە تەئکید ئەو شتە دەبێ وابێ، دوایی گۆڕدراوەو وەك مانای سوێندی لێهاتوە، کە دەگوترێ: (لا جرم) واتە: (حقًا) واتە: ئەو شتە دەبێ وابێ، یان ئەو شتە نابێ وابێ.

( وَأَخْبَتُوٓاْ ) : (الخَبْتُ: المُطْمَئِنُّ مِنَ الأَرْضِ، وَأَخْبَتَ: قَصَدَ الخَبْتَ، الإِخْبَاتُ: اللّين وَالتَّوَاضعُ) وشەی (أخبت) واتە: بۆ خوا نەرمو ملکەچ بوون، تەسلیم بوون، وشەی (خبت) بریتیە لە زەوییەکی نزم، دەگوترێ: (أَخْبَتَ)، واتە: (قصد الخَبْتَ)، یانی: ئەو کەسە ویستی بچێ بۆ شوێنێکی نزم، وەك دەگوترێ: (أَسْهَل) واتە: ویستی بچێ بۆ دەشت، (سهل) واتە: دەشت، (أَنْجَد) ویستی بچێ بۆ شوێنێکی بەرزایی، چونکە (نَجْد) واتە: شوێنی تەپۆلکەو بەرز.

( مَثَلًا ) : (المَثَلُ: المِثْلُ نَحو شِبْه وَشَبَه، المُشَابَهَةُ لِلْغَيْرِ، الوَصْفُ، مَثَلُ الشيءِ: صِفَتُهُ)، (مَثَل) وەك (مِثْل) وایە، وەك: (شِبه) و (شَبَه) کە دەگوترێ: (المُشَابَهَةُ لِلْغَيْرِ) ئەم شتە وەك ئەو شتە دەچێ، وە هەروەها وشەی (مَثَلْ) بە مانای وەسف دێ، دەگوترێ: (مَثَلُ الشيءِ)، واتە: سیفەتو حاڵو شێوەی ئەو شتە ئاوایە.

( تَذَكَّرُونَ ) : لە ڕیشەدا (تَتَذَكَّرُون) بووە، واتە: ئایا نایەتەوە بیرتان، بیرناکەنەوە، پەند وەرناگرن ؟!

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

دیـارە خوا ﷻ لە درێـژەی باسو خواس دەربـارەی قورئـانو، دەربـارەی پێغـەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺو، هەڵوێـستی خـراپو نەرێنییـانەی نەیارەکـانی خـوا، ئەهلـی کـوفر لـە بەرانبەریانـدا، کـە ڕەفزیـان دەکـەنو، قورئـان بـە هەڵبەسـتـراو دادەنێـن، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە جادووگـەر دادەنـێن، یـان قورئـان بـە جـادوو دادەنـێنو، پێغەمبـەر ﷺ بـە هەڵبەسـتەری قورئـان دادەنێـن، وە لـە درێـژەی ئـەو بـاسو خواسانەدا، سەبارەت بە ئینسانی بێبـڕوا، کە لـە کاتی هەبوونـدا زوو لـە کـەوڵی خـۆی دەردەچـێو، لـە خـۆی بـایی دەبـێو، لـە کـاتی نـەبوونیو نەهاتییـدا، زوو وە هەڵـپە دەکـەوێو، دەکەوێتـە پەلەقـاژە، لـە درێـژەی ئـەو بابەتانـەدا، خـوا ﷻ ڕوو دەکاتـە پێغـەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ ﴾، واتـە: لـە ئەنجامی هەڵوێستی نەرێنییانەی ئەوانو، لـە ئەنجـامی خراپـەی ئەوانـدا، لە ئەنجـامی داواکاریی بێجێیی ئەواندا، نیزیکەو ڕەنگە تۆ واز لـێهـێنەری هەندێـك لەوە بی کە بۆت نێـردراوە، بۆت سـروش کـراوەو، سـینەت پـێ تەنگو سەغـڵەت بێ، لەبەر ئەوەی دەڵـێن: دەبووایـە سـەروەتو سـامانێکی زۆرو خەزێنەیـەکی دابەزێنرابایـە سـەر، یـان فریشتەیەکی لەگەڵ هاتبایە، لە ئەنجامی ئەو داواکارییە بێجێیەی ئەوانـدا، تـۆ ئەوەنـدە دڵ تەنـگو سینەت تەنگو سەغڵەت دەبـێ، نارەحـەتو ئیحـڕاج دەبـی، نزیکـە واز لێهێنەری هەندێك لەوە بی، کە بـۆت نێـردراوە، ئنجا ئایا خـوا ﷻ چۆن پێغـەمبـەری خـۆی ﷺ ئـاوا دەدوێنـێ؟! هەڵبەتـە لێـرەدا لێکـۆڵەرەوانی قورئـان، ڕوونکـەرەوانی مانـاکانی قورئـان، زۆر شـتیان گوتوە.

بەڵام ئەوەی من دەچێتـە زەینمـەوەو دەچێتـە دڵمـەوە، ئەوەیە کە لێرەدا خـوا ﷻ بە پێغـەمبـەری خـاتـەم ﷺ دەفـەرموێ: کە ئەوانـە ئەوەنـدە ئیلحاح لە تـۆ دەکـەن، بە داواکـارییە بێجێیەکانیانەوە، وەك تۆ خەزنـەت بـۆ دابـەزێ لـە ئاسـمانەوە، یـاخود

فریشتەت لەگەڵ دابێ، وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا، کافرەکان کۆمەڵێ، شتیان ڕیز کردوون: دەبێ بچی بۆ ئاسمانێ، نامەمان بۆ بێنی، کانیو سەرچاوەمان بۆ هەڵقوڵێنی، خانووی زێڕت هەبێ، کۆشكو تەلارت هەبێ، ... تا کۆتایی.

ئەوانە هێندە ئیلحاح دەکەنو هێندە سوورن، واتە: لێرەدا مەبەست ئەوەیە، کە ئیلحاحو زیاتر زێدەڕۆیی ئەوان، لە داواکاری بێجێیەکانیاندا، بخرێتە ڕوو، ئەگەرنا بە تەئکید خوا ﷻ دەزانێ کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هیچ لەوەی کە خوا بۆی سروش کردوە، وەك پەیام بۆی ناردوە، وازی لێناهێنێ، ئەوە مانایەکی.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا ﴿ فَلَعَلَّكَ ﴾، یانی: (أ فَلَعَلَّكَ)، یانی: پرسیارکردنە، ئایا نزیکە تۆ واز لێهێنەری هەندێك لەوە بی کە بۆت سروش کراوە، لە ژێر فشارو گوشاری داواکاریە بێجێیەکانی ئەواندا؟!

یاخود مەبەست پێی ئەوەیە، کە لە بۆچوونی ئەواندا، بە وەهمو خەیاڵی ئەوان، ئەهلی کوفر پێیان وایە کە تۆ وازلێهێنەری هەندێك لەوە دەبی، کە بۆت سروش کراوەو، سینەت پێی سەغڵەت دەبێ، لە ژێر فشارو گوشارو داواکارییە بێجێیەکانی ئەواندا، واتە: خەڵکێك ئەو گومانەت پێدەبات، بۆیەش هێندە ئیلحاح دەکەنو چەند بارەی دەکەنەوە، کە لەو جۆرە موعجیزانەیان بۆ بێنی، یان خەزنەت بۆ دابەزێ لە ئاسمان، وەك لێرە دەفەرموێ: فریشتەت لەگەڵ دابێو، لە سوورەتی (الفرقان)دا، هەمان مەبەست دووبارە بۆتەوە.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌ ﴾، بێگومان تۆ تەنیا ترسێنەری، تۆ تەنیا ئاگادارکەرەوەیەکی لەگەڵ ترساندندا ﴿ نَذِيرٌ ﴾، (إنذار)، دەڵێ: (إِعْلامٌ مَعَ تَخْوِيف)، ئاگادارکردنەوەیە لەگەڵ ترساندنو ترس وەبەرناندا، تۆ تەنیا وریاکردنەوەو ترساندنی ئەوانەت لە سزای خوا، لە سەرە، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴾، بەڵام خوا بەسەر هەموو شتێك ڕادەگات، (وكيل)، دەڵێ: (فَعيل)ی بە مانای (مفعول)ە، یانی: (المُوَكَّلُ إِلَيْهِ)، (مُوَكَّل)، ئەو کەسەی کە کاری پێسپێردراوە، چونکە (وَكِيل) ئەوەیە کە لە جیاتی کەسێك کارێك، یان سەرپەرشتی

کارێك بکات، ئنجا خوا هەر بۆخۆی ﷻ بەسەر هەموو شتێك ڕادەگاو، خۆی سەرپەرشتی هەموو شتێك دەکاو، ئەگەر حیکمەتی خوا بخوازێ، خەزنەشت بۆ دادەبەزێ، فریشتەشت لەگەڵ دەنێرێو، داواکارییەکەشیان جێبەجێ دەکات، بەڵام دیارە خوای کارزان ئەوەی بە بەرژەوەندیی نەزانیوە بۆ تۆ.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾، یان ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە واتە: بە درۆ قورئانی هەڵبەستوە، ﴿قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ﴾، بڵێ: دەی باشە ئێوەش دە (١٠) سوورەت لە وێنەی قورئان بێنن، با هەڵبەستراویش بێ، ئەگەر لە وەهمو خەیاڵی ئێوەدا قورئان هەڵبەستراوە، فەرموون، ئێوەش دە (١٠) سوورەتی هەڵبەستراو بێنن، ئەوە پێی دەگوترێ: (إِرْخَاءُ العِنَانِ لِلْمُجَادِلِ)، جڵەو شلکردن بۆ مشتو مڕکەر، یانی: گریمان قسەی تۆ بوو، دەفەرموو تۆش وا بکە، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتەو، هەڵوەستەیەکی باشی لەبەردەمدا دەکەین.

﴿وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾، هەرچی لە تواناشتان دایە بانگیان بکەن جگە لە خوا، بانگیان بکەن ئەگەر لە ڕاستانن، هەر کەسێك بە دەنگتانەوە دێ لە خوار خواوە، جگە لە خوا، کێ بە دەنگتانەوە دێ، بۆ هاوکارییتان، دەتوانن کێ کۆ بکەنەوە، هەمووان کۆبکەنەوە، ئەگەر ڕاست دەکەن، ئەگەر لە ڕاستانن، لە ڕاستگۆیانن، کە قورئان خوا بۆ موحەممەدی ﷺ دانەبەزاندوە، فەرموون ئێوەش ئەو کەرەستەیەی کە قورئانی لێ پێکهاتوە ئەو پیتو دەنگانە، لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن، فەرموون ئێوەش وێنەی دە (١٠) سوورەتی قورئان بێنن، ئێوەش هەڵیانبەستن، ئەگەر لە گومانو وەهمی ئێوەدا، قورئان هەڵبەستراوە.

﴿فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا أُنزِلَ بِعِلْمِ اللَّهِ﴾، ڕووی دوان لە پێغەمبەر ﷺو لە بڕوادارانیشە:

واتە: ئەگەر بێبڕوایەکان وەڵامیان نەدانەوە، ئەوە بزانن کە ئەم قورئانە بە زانیاریی خوا دابەزێنراوە، ئەوە واتای یەکەمی.

واتایەکی دیکەی هەیە کە من ئەویانم پێ بەهێزترە، ئەویش ئەوەیە کە: ئەی بێبڕوایەکان! ئەگەر ئەوانەی کە لە خوار خواوە، جگە لە خوا داوایان لێ دەکەن، هاوکارییتان بکەن، بۆ هێنانی دە (١٠) سووڕەتی هەڵبەستراوی وێنەی قورئان، ئەگەر ئەو داوا لێکراوانە بۆ هاوکاریی، وەڵامیان نەدانەوە، بزانن و دڵنیا بن کە قورئان بە زانیاریی خوا دابەزێنراوە، زانیاریی خواش بێسنوورە بەڵام زانیاریی دروستکراوەکانی خوا، ئەگەر هەمووشیان کۆببنەوە، لە بەرانبەر زانیاریی خوادا، هەر هیچە، بۆیە ناتوانن شتێکی وا بکەن، ئنجا ئەگەر بە دەمتانەوە نەهاتن و، وەڵامیان نەدانەوە، بزانن کە هۆکارەکەی ئەوەیە، ﴿ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، بشزانن کە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، ﴿ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾، ئنجا ئایا ئێوە ملکەچ دەبن بۆ خوا، دوای ئەوەی دەستە پاچە بوون و، دوای ئەوەی دەستەوسان بوون، لە بەرانبەر داوای مەیدانداریی کردن و، داوای هاتنە مەیدانی قورئاندا، دەستە پاچە بوون، ئایا ئەوجار ملکەچ دەبن، لە حاڵێکدا کە قسەتان بەدەستەوە نامێنێ؟!

ئەگەر بە پێی مانای یەکەمیشیان بێ، واتە: ئەی مسوڵمانان! ئەوجار ئایا ئێوە بە تەواویی ملکەچن؟ یانی: خوای پەروەردگار داوایان لێدەکات کە زیاتر ملکەچ بن بۆ خوا.

بەڵام ئەو مانایەمان هەڵبژارد، کە پێمان بەهێزترەو ڕووی دواندن تێیدا لە کافرو بێبڕوایەکانە، ئەوانەی کە دەیانگوت: قورئان خوا بۆ موحەممەدی ﷺ نەناردوە، خوا دەفەرموێ: فەرموون: هەرچی خەڵکەو دەتوانن کۆیان بکەنەوەو، ئێوەش وێنەی دە (١٠) سووڕەتی قورئان بێنن، کە بە خەیاڵ و وەهمی ئێوە، هەڵبەستراون، فەرموون: ئێوەش هەڵیانبەستن، ئەگەر نەشتان توانی و بە دەنگتانەوە نەهاتن، بزانن لەبەر ئەوە بە دەنگتانەوە نایەن، کە قورئان بە زانیاریی بێسنووری خوا دابەزیوەو، بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، ئەوەی کە (معبود)و (إلـه)ی ڕاستەقینە پێی دەگرێ بە تەئکید، دروستکراوەکان پێیان ناگرێ.

ئنجا ئەگەر وابوو، ئایا ئێوە ملکەچن؟

دوایی خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێکی دیکە لەم دوو ئایەتەدا واتە: هەردوو ئایەتی (١٥ و ١٦)و بۆمان باسی جۆرە ئینسانێك دەکات، جۆرە مرۆڤێك کە تەنیا دنیا دەبینێ، واتە: دنیا ویستە، دنیا پەرستە، دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ ﴾، هەر کەسێك ژیانی دنیاو جوانیی ژیانی دنیای بوێ، ئەوە کردەوەکانیان بە تەواویی پێ دەدەین، واتە: بەرهەمی کردەوەکانیان بە تەواویی پێ دەدەین، لە دنیادا، ﴿ وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴾، لە دنیاش دا هیچ لێیان کەم ناکرێتەوە لە کردەی دەستیان، لە بەرهەمی دەستیان، لە کارو کۆششیان، بەرهەمی خۆیان بە تەواویی دەدرێتە دەست.

یانی: یاسای خوا وایە، لە ژیانی بەشەردا کە هەر کەسێك هەوڵبدات بە هەر لایەکدا، لە هەوڵەکەی خۆی بەهرەمەند دەبێ، لە سووڕەتی (النجم)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾النجم، واتە: بۆ مرۆڤ نیە، مەگەر هەوڵبدات، کە هەوڵی داو تێکۆشا، خۆی ماندوو کرد، بەری ڕەنجی خۆی دەخوات.

ئەوە بە نسبەت ژیانی دنیاوە وایە، بەڵام بە نسبەت دوا ڕۆژەوە، سەرەنجامیان چۆنە ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ﴾، ئەوانە کەسانێکن لە دوارۆژدا بەتەنیا ئاگریان هەیە، تەنیا ئاگری دۆزەخیان هەیە، واتە: ئەگەر ببنە خاوەنی شتێك، ئەوە تەنیا خاوەنداریێتیی ئاگری دۆزەخ دەکەن، ﴿ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا ﴾، ئەوەش کە بە کارامەیی‌و لێزانیی ئەنجامیان دەدا، لە کاروباری دنیاداریی هەمووی هەڵدەوەشێتەوە، ﴿ وَبَـٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئەو کردەوە باشانەی ئەنجامیشیان دەدان، چونکە پەیوەستیان نەکرد بوو بە خواوە، ئەویش هەمووی پووچەڵ دەبێ، وەك شیری بێ هەوێن هەڵدەبزرکێ‌و، بە کەڵکی هیچ نایەت.

پاشان خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (١٧)دا، دێتە سەر خستنەڕووی بابەتێکی دیکە، کە بریتیە لە بەراوردی نێوان ئینسانی ئیمانداری ڕێی ڕاست گرتووو، بابای بێئیمانی ڕێگا لێ تێکچووو، ون بوو لە ڕێبازی هەق، دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴿١٧﴾ ﴾، دیارە هەمزە (أ) بۆ پرسیار کردنی نکوڵیی لێکەرانەیە، (همزة الإستفهام الإنكاري).

﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، ئایا کەسێك کە لە لایەن پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشن بێ، ﴿ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ ﴾، بە دوای ئەو بەڵگە ڕۆشنەشدا، شایەدێکیش لە خواوە بێ، شایەدێکیشی بە دوادا بێ، ﴿ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ ﴾، لە پێش ئەو شایەدەشەوە، کتێبی مووسا هەبووە، ﴿ إِمَامًا وَرَحْمَةً ﴾، پێشەواو بەزەیی خوا بوو، کەسێك کە ئاوایە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن کە ئیمانی پێ دێنن (بە قورئان)، هەڵبەتە بەراوردکردنەکە دیارە، چونکە عەقڵو سیاق دەلالەتی لەسەر دەکات، واتە: ئایا کەسێك کە ئاوایە، وەك کەسێك وایە کە گومڕایەو سەرگەردانەو، دەست خاڵییە؟ بە تەئکید نەخێر.

ئنجا ئایا مەبەست لەو ﴿ بَيِّنَةٍ ﴾یە چییە؟ توێژەرەوانی قورئان زۆر قسەیان لەسەر کردوە، بەڵام زیاتر ئەوە دەچێتە زەینو دڵەوە، کە مەبەست لە: ﴿ بَيِّنَةٍ ﴾، ئەو عەقڵی سەلیمو فیطرەتی ساغو سروشتەیە، کە خوا ئینسانی لەسەر خوڵقاندوە، ئینسان بە عەقڵی سەلیم بەو فیطرەتو خوا ڕسكو سروشتە، کە خوا لەسەری سروشتاندوە، خاوەنو خوای خۆی دەناسێ، بەڵێ ﴿ بَيِّنَةٍ ﴾، کە بە مانای بەڵگەی ڕۆشنە، مەبەست پێی ئەو حاڵەتە خوا ڕسکیە، کە ئینسان خوای خۆیو

خاوەنی خۆی دەناسێ، چونکە دەشفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، واتە: ئایا کەسێك کە لەلایەن خاوەن و پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشنە؟ ئاشکراشە کەسێك کە مرۆڤ پەروەردە دەکات و، بەخێوی دەکاو، سەرپەرشتیی دەکاو خاوەنیەتی، عەقڵ و فیطرەتێکی وای داوەتێ کە ئەو خاوەن و پەروەردگارەی خۆی پێ بناسێ.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ ﴾، ئنجا بە دوای ئەو بەڵگە ڕۆشنە زاتیەدا، شایەدێکیش لە خواوە دێ، کە ئەویش قورئانە، قورئانیش دەبێتە شایەدێك، بۆ ئەوەی کە لەو فیطرەت و لەو عەقڵە سەلیمەو لەو ناخەی مرۆڤدا دانراوە، کە بریتیە لە تەنیا بەندایەتیی کردن بۆ خوا.

ئنجا تەنیا قورئان نا، ﴿ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ﴾، لە پێش قورئانیشدا، لە پێش ئەو شایەدەشدا کە لە خواوە هاتوە کە قورئانە، کتێبی موساش هەبووە، کە پێشەواو بەزەیی بووە بۆ خەڵك.

کەواتە: پێغەمبەرﷺ و هەر کەسێك شوێنی وی بکەوێ، هەم بەڵگەی ڕوون (بینة)ی، بە دەستەوەیەو، هەم شاهیدێك لە خواوەو، هەم ئەو کتێبەی مووساش ﷺ کە لە زۆر شوێندا خوای پەروەردگار باسی مووسا دەکات، لەبەر ئەوەی وەك لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا باسمان کرد، کتێبەکەی مووسا یەکەمین کتێبێك بوو، کە شەریعەت و بەرنامەیەکی تێدابوو، بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایەك لە ڕووی ئابووریی، سیاسیی، کۆمەڵایەتی، ئەمنیی، درووشمەکان، لە هەموو ڕووەکانەوەو، ناوو ناوبانگی مووساو کتێبەکەشی کە تەوراتە بڵاوبووە بە دنیادا، ئەو کاتیش: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، ئا ئەوانە کە ئاوان، ئیمان بە قورئان دێنن، چونکە:

١ـ هەم ﴿ بَيِّنَةٍ ﴾ە یەکیان بە دەستە، لە زاتی خۆیاندا.

٢ـ هەم ئەم قورئانە کە دێ، شایەدێکە لە خواوە.

٣ـ هەم کتێبی مووساش، ﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ﴾، و هەر کەسێکیش لە پێڕو و تاقمەکان {(أحزاب)، کۆی (حزب)ە، (حزب)یش هەر

کۆمەڵە خەڵکێکن، بۆ مەبەستێك کۆ ببنەوەو، تۆکمەو توندو تۆڵ بنو، دەمارگیر بن بۆ شتەکەی خۆیان}، هەر کەس لەو کۆمەڵو تاقمانەش کە بە قورئان بێبڕوان ﴿فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥ﴾، ئەوە جێگای، ژوانگەی بریتیە لە ئاگری دۆزەخ، ﴿فَلَا تَكُ فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُ﴾، کەواتە: تۆ هیچ لەبارەی قورئانەوە دوو دڵ مەبە، هەڵبەتە لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ بەڵام مەبەست پێی شوێنکەوتووانیەتی، یان مەبەست پێی لەبەر ڕاهاویشتنو بە کنارە قسە کردنە لەگەڵ بێبڕوایەکاندا، واتە: دوو دڵ مەبن لەبارەی قورئانەوە، ﴿إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾، بێگومان ئەم قورئانە هەقە، چەسپاوە، ڕاستە، لە پەروەردگارتەوە، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن، واتە: زۆربەی خەڵکی هەر نایانەوێ بڕوا بێنن، نەك کەمو کوڕیی لە قورئاندا هەبێ، یاخود جێی تۆمەتو دوو دڵیی لە قورئاندا هەبێ.

ئنجا خوا ﷻ لە ئایەتەکانی: (١٩و ٢٠و ٢١و ٢٢)دا، واتە: لەم چوار ئایەتەدا باسی ئەوانە دەکات، کە دژو نەیاری قورئانو پێغەمبەری خوان ﷺ، ئنجا وەك لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، خوا ﷻ بە نۆ (٩) سیفەت باسیان دەکاتو پێناسەیان دەکات، نۆ لە سیفەتو هەڵوێستە خراپەکانیانو، لە بەرانبەر ئەو نۆ سیفەتو هەڵوێستە خراپەشدا، نۆ (٩) جۆرە سزاش باس دەکات، کە ئەوەیان خۆم هەڵمهێنجاوەو، لە تەفسیرەکاندا نەمبینی، ئاوا ئاماژە بەو دوو نۆ (٩) جۆرە سیفەتە خراپ و سزایە کرا بێ.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾، ئنجا کێ ستەمکارترە لە کەسێك، کە درۆ لەسەر خوا هەڵدەبەستێ، کە ئەوە دوو واتای هەن:

١) واتە: ئەوانەی کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، ئەوە درۆ لەسەر خوا هەڵدەبەستن، کە دەڵێن: خوا هاوبەشی هەیە.

٢) یاخود ئەگەر هەر کەسێك بە ناوی خواوە فەرموودەیەك هەڵبەستێ‌و، پاڵی بداتە لای خوا، ئەوە ستەمکارترین کەسە، هیچ کەس لەو ستەمکارتر نیە.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُعۡرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾، ئەوانەی درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، لەسەر خوا هەڵدەبەستن، کە هاوبەشی بۆ دادەنێن، یان بە ناوی خواوە قسەیەك دێنن‌و دەڵێن: خوا فەرموویەتی، ئا ئەوانە ڕادەنوێنرێن لەسەر پەروەردگاریان، واتە: لە ڕۆژی دواییدا (عَرْض) دەکرێن، ﴿ يُعۡرَضُونَ ﴾، دەڵێ: (عُرِضَ لِلْبَيْعِ)، یانی: بۆ فرۆشتران پێشاندرا، (معرض) ئەو شوێنەیە کە شتی تێدا پێشانی خەڵك دەدرێ، کە شتی لێ پێشاندەدرێ‌و، شتی لێ دەخرێتە بەرچاوی خەڵك، ئەوانەش دەخرێنە بەر دیتنی پەروەردگاریان لە ڕۆژی دواییدا، ﴿ وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ ﴾، شایەدەکانیش دەڵێن: ئا ئەوانە بوون کە درۆیان لەسەر پەروەردگاریان دەکرد، ﴿ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئاگاداربن! ئەها! نەفرینی خوا لەسەر ستەمکاران چەسپاوە، ئەوە دوو سیفەتیان.

ئنجا باسی سێ سیفەتی دیکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾، ئەوانەی کە خۆشیان‌و خەڵکیش لە ڕێی خوادا لادەدەن، چونکە (صَدّ)، (صَدّ، يَصُدُّ، صُدوداً، وصداً)، هەم بە (إِنْصِراف) دەگوترێ، هەم بە (صَرْف) دەگوترێ، هەم بە (إمتِناع) دەگوترێ، کەواتە: هەم بە (مَنْع) دەگوترێ، (صَدَّ عَنْ سَبيل الله)، واتە: هەم خۆی لایدا لە ڕێی خوا، یاخود غەیری خۆی لادا لە ڕێی خوا، هەردووکیان دەگرێتەوە، ئەوانەی خۆشیان‌و خەڵکیش لە ڕێی خوا لادەدەن، ﴿ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا ﴾، خوارو خێچیی‌و لاریی، بۆ بەرنامەو ئایینی خوا داوا دەکەن، کەواتە: دەیانەوێ ئایینی خوا خوارو لار بخەنە بەرچاو بیبێزرێنن، ﴿ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾، ئەوان بە دوا ڕۆژیش بێبڕوان.

ئنجا هەر لەسەر باسکردنی سیفەتەکانیان بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، ئەوانە لە زەویدا دەستەوسانکەر نەبوون، واتە: دەستەوسانکەری خوا نەبوونو لە چنگی قوتار نابن، لە سزاو دادگایی خوا، ﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ﴾، لە خوار خواوەش جگە لە خوا، هیچ دۆستو پشتیوانو مشوورخۆریان نین، ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾، ئازارو سزایان بۆ دووقات دەکرێتەوە، ﴿مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ ٱلسَّمۡعَ وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ﴾، نەیاندەتوانی ببیستنو، نەشیان دەبینی، واتە: هەستەوەرەکانی خۆیان، ئەو ئامرازانەی کە دەبووایە هەقیان پێ بدۆزنەوە، پەکیان خستوون، لە کاریان خستوون، ئەوەش چوار سیفەتی دیکەیان لەگەڵ پێنجەکەی پێشێ دەبنە نۆ (٩) (٥ + ٤ = ٩).

ئنجا دێتە سەر باسی سزایەکەیان: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن خۆیانیان لە دەست داوە، خۆیان دۆڕاندوە، جا کەسێك خۆی لە دەست بداتو خۆی لە کیس بچێ، مانای وایە شتەکانی دیکەی کە هەینی، پێشترو چاکتری لە کیس دەچن، ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾، ئەوەش کە هەڵیان دەبەست، لێیان ون بوو، لە قیامەتدا بزر دەبێ، چونکە بوونی نیە، ئەوە کە شەفاعەتیان بۆ بکەن، ئەوە کە هاوبەش بن بۆ خوا، چونکە لە ڕاستییدا لەسەر ئەرزی واقیع بوونیان نیە، بۆیە ون دەبن، کە هەر لە ئەسڵدا بەو سیفەتەیان کە لە وەهمی واندا هەبووە، نەبوون، بەڵێ دارو بەردێك هەبووە، مانگو خۆرێك هەبووە، طاغووتو فیرعەونێك هەبووە، کەسانێك هەبوون کە پیرۆز (تقدیس)و مەزن (تعظیم) کراون، بەڵام تەنیا وەك خۆیان، وەك دروستکراوێك هەبوون، ئەگەرنا هاوبەشی خواو شەفاعەتکاری لای خوا نەبوون، بۆیە ون دەبن، ﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي

ﭐلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ﴾، ﴿لَا جَرَمَ﴾، واتە: (حَقّاً) هیچ گومانی تێدا نیە، بە دڵنیاییەوە، ئەوان لە دوا ڕۆژدا زیانبارترینن، یانی هەرە زیانبارنو زیانبارترین هەر ئەوانن.

ئنجا دوای ئەوەی کە خوای کاربەجێ نۆ سیفەتی لەو نەیارو ناحەزانەی قورئانو پێغەمبەر ﷺ خستنە ڕووو، نۆ جۆرە سزاشی بۆ خستە ڕوو، ئنجا باسی ئیمانداران دەکات بە سەرەکیترین سیفەتیان پێناسەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە (بە هەموو ئەو شتانەی، کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ)، ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، چاکەکانیشیان ئەنجام داون، هەرچی لە توانایاندا هەبووە لە چاکە، ﴿وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ﴾، بۆ پەروەردگاریشیان ملکەچو نەرمن، {(أَخبَتَ)، لە ئەسڵدا لە(خَبْت)ەوە هاتوە (أخْبَتَ أي: قَصَدَ الخَبْتَ، الخَبْتُ: المُطْمَئِنُّ مِنَ الأَرْضِ)، زەوییەکی نزم، زەوییەك کە نزم بێو، لەباربێ، پێی دەگوترێ: (خَبْت)، (أَخبَت) واتە: ئەو کەسە بەرەو ئەو زەوییە نزمە چوو}، جا لێرەدا ﴿وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ﴾، واتە: وەك چۆن زەوییەك نەرمو ناسك دەبێو وادەبێ کە دەستەمۆ دەبێ، مرۆڤ دەتوانێ بە کەیفی خۆی تەصەڕڕوفی تێدا بکات، ئەوانیش بەو شێوەیە بۆ خوا نەرمو نارامو هێمن دەبن، هەروەها بۆ خوا ملکەچ دەبن، ئنجا کەسانێك ئەو سێ سیفەتەیان تێدان: ئیمانو، کردەوەی باشو، ملکەچ بوونو نەرم بوون بۆ خوا بۆ پەروەردگاریان، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾، ئەوانە هاوەڵی، یاخود خاوەنی بەهەشتن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، دوایی خوا ﷻ بەراوردێکی نێوان ئەو دوو کۆمەڵە دەکات، دەفەرموێ : ﴿مَثَلُ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِ﴾، وێنەی ئەو دوو کۆمەڵە، واتە: کۆمەڵی بێبڕوایانی نەیارو نەسەلمێنی کەللە ڕەق، بەرانبەر بە قورئانو پێغەمبەر ﷺ و، کۆمەڵی ئیماندارانی کردەوەی باشی بۆ خوا ملکەچ، وێنەی ئەو دوو کۆمەڵە،

﴿كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِ﴾، وەك كوێرو كەڕ، هەروەها بینەرو بیسەر وان، كافرەكان لە بەرانبەر هەقدا كوێرن‌و، كەڕیشن، نە دەبینن‌و، نە دەبیستن، واتە: بینین‌و بیستنێك كە بەهرەی لێ وەربگرن‌و، بە هەقیان بگەیەنێ‌و، بە ئامانجیان بگەیەنێ.

بڕوادارانیش هەم بیسەرن، هەم بینەرن، بینەرن هەق دەبینن‌و، بیسەریشن، كەسانێك كە قسەی خێریان بۆ دەكەن، لێیان دەبیستن، واتە: هەم بەڵگەی عەقڵیی، هەم بەڵگەی نەقڵیی بەكاردێنن، لێیان بەهرەمەند دەبن، ئەوانی دیكەش هەم لە بەرانبەر بەڵگەی عەقڵیی دا، هەم لە بەرانبەر بەڵگەی نەقڵیی دا، پەكی خۆیانیان خستوە، ﴿هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًا﴾، ئایا سیفەتیان وەك یەك وایە؟ وەسفیان وەك یەك وایە؟ ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾، ئایا بیر ناكەنەوە؟ ئایهێننەوە بیر خۆتان، كە ناگونجێ ئەم دووانە سیفەت‌و حاڵیان وەك یەك بێ، نە لە دنیاداو، نە سەرەنجامیشیان لە دوا ڕۆژدا یەكسان بێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ ... ﴿١٢﴾ ﴾، وەك پێشتریش لە مانا گشتییەکەی دا ئاماژەمان پێدا: بە پێی سیاق دیارە کە لێرەدا ئەمە پرسیار کردنێکی نکوولیی لێکەرانەیە، مەبەست پێی ڕێ لێگرتنی پێغەمبەرە ﷺ، یاخود لێ لابردنی ئەو سیفەتەیە لە پێغەمبەر ﷺ، وەك تۆ دەزانی قوتابییەك دەرسەکەی خۆی باش لەبەر کردوە، پێی دەڵێی: ئایا دەرسەکەی خۆت لەبەر نەکردوە؟ یانی: من دڵنیام کە تۆ لەبەرت کردوە، ئامادەت کردوە.

ئەم ڕستەیەش وەك پێشتر باسمان کرد:

١ـ دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ: تۆ بە تەئکید وانی کە واز لێهێنەری بەشێك لەوە بی کە بۆت سروش کراوەو، وانی کە سینەت پێی سەغڵەت بێ.

٢ـ یاخود لە وەهمو گومانو خەیاڵی بێ بڕوایاندا، ئایا تۆ وازلێهێنەری هەندێك لەوە دەبی کە خوا بۆی سروش کردووی‌و، سینەت سەغڵەتو تەنگ بێ، لە ژێر فشارو گوشاری داواکارییە بێ جێیەکانیاندا؟ ئەگەرنا بە تەئکید مانا ڕواڵەتییەکەی: لەوانەیە، نزیکە تۆ واز لێهێنەری بەشێك لەوە بی، کە بۆت سروش کراوەو، سینەت پێی سەغڵەتو تەنگ بێ، ئەو مانایەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، ناگونجێ بەڵام دیارە لە زمانی عەرەبیداو، لە زمانەکانی دنیاشدا، شێوازی دەربڕین جۆراو جۆرە، ئەم جۆرە تەعبیرەش جۆرێکە لە هاندانی پێغەمبەر ﷺ، کە هەرگیز خەتەرەیەکی وای بە دڵدا نەیەت، بۆ ڕازی کردنی خەڵك، کە هەندێك لەو پەیامەی خوا بۆی ناردوە، وازی لێ بێنێ‌و، جارێ لێی گەڕێ‌و باسی نەکات، بۆ ئەوەی ئەوان ڕازی بکات.

## شیکردنەوەی ئایەتی (١٢) لە شەش بڕگان دا

**بڕگەی یەکەم**: وشەی (تارك)و وشەی (ضائق)، هەردووکیان (اسم فاعل)ن، یەکیان لە (تَرَكَ)و ئەوی دیکەشیان لە (ضاقَ)ە، (تارك)، و (ضائق)، واتە: واز لێهێنەرو، سینە تەنگو سەغڵەت.

ئنجا ئایا بۆچی وشەی (ضَيِّق)، بەکارنەهاتوە؟ چونکە (ضَيِّق)،(صفة مُشَبَّهة بالفعل)ەو دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەو وەسفە لە وەسف کراوەکەدا زۆر ڕۆچوویە، بەڵام ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ (تارك، ضائق)، واتە: شتێکی کاتییەو، ڕەنگە جار جار سینەت پێی سەغڵەتو تەنگ بێ، ئنجا (ضيق) و (ضائق)، لە چییەوە هاتوون؟

دەڵێ: (الضِّيق: مُسْتَعْمَلٌ مَجَازاً فِي الغَمِّ والأَسَف كَمَا اسْتُعْمِل ضِدّه وَهو الإِنْشِرَاح فِي الفَرَحَ وَالمَسَرَّة)، واتە: وشەی (ضِيق)، بەکارهێنراوە بە (مجاز) لە جیاتی خەمو خەفەتو دڵتەنگیی، وەك چۆن وشەی (إنشراح)، واتە: سینە گوشاد بوون، بۆ دڵخۆشیی‌و شادمانیی بەکارهێنراوە.

**بڕگەی دووەم**: ئایا ئەوانە چ داوایەکی بێجێیان کردوە، کە ببێتە مایەی سینە تەنگ بوونی پێغەمبەر ﷺ و، لە وەهمی ئەوانەدا ڕێی تێبچێ‌و، لەوانە بێ کە بەشێك لە پەیامی خوا واز لێبێنێ، بۆ دڵ ڕاگرتنی ئەوان؟ ﴿أَن يَقُولُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌ﴾، لەبەر ئەوەی کە دەڵێن: دەبووایە خەزنەیەکی بۆ سەر دابەزێنرابایە، یاخود فریشتەیەکی لەگەڵ هاتبایە.

دیارە وشەی: ﴿لَوْلَآ﴾، لێرەدا (للتحضيض)، بۆ هاندانە، ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ﴾، واتە: دەبووایە دابەزێنرا بایە سەری.

**بڕگـــەی سێـــیەم**: وشـەی: ﴿كَنزٌ﴾یـش، دەڵــێ: (الكنـز: المـال المكنـوز والمخبـؤ)، بێگومـان ﴿كَنزٌ﴾، کە بـە کـوردیی دەڵـێین: خەزنــە، بریتیــە لـە مــاڵو سـامانێك، کـە بـن خـاك کرابـێو شاردرابێتـەوە. بـەڵام لێرەدا مەبەسـت پێـی سـەروەتو سـامانێکی زۆرە، واتــە: دەبووایــە، مــاڵو ســامانێکی زۆری بــۆ دابەزێنـرابایە.

**بڕگـەی چوارەم**: مەبەسـت لـە وشـەی: ﴿أُنزِلَ﴾یش، ئەوەیە کـە لـە شـوێنێکـی بەرزەوە بۆی بهێنـرێ، لە ئاسـمانەوە، لـە لای خـوای پەروەردگــارەوە، یـان لەبـەر ئـەوەی کـە هەمیشـە ئامـاژە دەکـرێ بـە شـوێنی بـەرز بـۆ خـواو، عەرشـی خـوا لـە ئاســمانەو، خـوای پەروەردگــاریش لـە سـەرووی ئاســمانەکانەوەو لـە سـەرووی دروستـکراوەکانەوەیە، بەو شـێوەیە کـە بۆ خوا شـایسـتەیە.

**بڕگـەی پێـنـجـەم**: کـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌ﴾، بێگـومان تـۆ تەنیـا وریاکـەرەوەو ترسـێنەری.

**بڕگـــەی شـەشـــەم**: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ﴾، خـواش بەسـەر هـەموو شـتێکەوە چـاودێرو ئاگـادارو مشـوورخۆرە، کە ئەو شـتانە بێنــێ، یـان نەهێنــێ؟ ئایا ئەوان بـڕوا دێنن، یاخـود بـڕوا نـاهێنن؟ خوای کاربەجێ ئـەو کارانـەی عایـدی خۆی کردوون، تـۆ ئـەی موحەممـەد! تـەنیا ئـەوەت لەسـەرە ئاگـاداریان بکـەیەوەو بیـانتـرسـێنی، کەواتە: هیچ شتێك لەو پەیامەی خوای زاناو توانا بۆ تـۆی نـاردوە، تۆ وازی لــێ مەهێنــەو، سینەت پێی سـەغڵەت نەبــێ، بەهــۆی قسەی ئەوانـەوە، چونکە تۆ وریاکەرەوەو ترسێنەری، نەك کـارپێسـپێردراوو چـاودێـر.

هەڵــبەتە لێــرەدا دەشــگونجێ مەبەســت ئــەوە بــێ، کــە شــوێنکەوتووانی پێغـەمبــەریش ﷺ، دەبــێ ئەوانیــش وریـــا بــن، لــە ژێــر زەخــتو گوشـاری نەیـارەکانیان دا، دەستبەرداری هیچ بەشـێك لە ئایینو بەرنــامەی خــوا نەبــن، بەڵــێ ئــایینو بەرنـــامەی خــوا، لــە ئاســتی هـــەرە بــەرزی خۆیــدایەو، هـەر یاسـایەکیو هەر شتەی لە شــوێنو هەلو مـەرجی ڕەخسـاوی خۆیـدا جێبەجـێ

دەبێ، بەڵام نابێ دەستبەرداری هیچی ببی، بۆ خاتری خاتران، بۆ دڵڕاگتنی خەڵك، بەڵكو دەبێ بڵێی: ئەوە ئایینو بەرنامەی خوایە، بەڵام ئەگەر ئێستا ئەوەمان پێ جێبەجێ ناكرێ، چونكە هەلو مەرجی ڕەخساو نیە، یان توانامان نیە، ئەوە شتێكی دیكەیە، بەڵام ئەوەش بەشێكە لە ئایینی خوا، كە بەرنامەیەكی تێرو تەواو گشتگیرەو، بۆیە هاتوە كە ڕێكخەری ژیانی بەشەر بێ، لەسەر ئاستی تاكو خێزانو كۆمەڵو دەوڵەت، ئایینو بەرنامەی خوا، وێڕای ئەوەی كە بوونناسییو جیهان بینییە، ئیمانو عەقیدەیەكی ڕاستو دروستیشەو، عیبادەتو خواپەرستییشەو، ڕەوشتو ئاكاری بەرزو جوانیشەو، ڕێكخستنی خێزانیشەو، ئەدەبو ڕەوشتە بەرزەكانی كۆمەڵگاشە، هەروەها ژیانی ئابووریی خەڵكی ڕێكدەخاتو، ژیانی سیاسییشیان ڕێك دەخاتو، لە كاتی پێویستدا جەنگیش دەكاتو داوای فیداكارییش لە مسوڵمانان دەكات، لە پێناوی پاراستنی دینو ژینی خەڵك دا.

**مەسەلەی دووەم**: كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٣ فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٤﴾: هەر لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا، كە باسی هەڵوێستی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دەكەن، لە بەرانبەر پێغەمبەری خاتەم موحەممەددا ﷺ و، لە بەرانبەر ئەو فەرمایشتەی خوای بەرزو بێ وێنەدا كە بۆی ناردوە، كە قورئانە، خوا دەفەرموێ: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُ﴾، یان ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە، واتە: قورئان، موحەممەد ﷺ بە ناوی خواوە هەڵیبەستوە؟ ﴿قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ﴾، بڵێ: ئێوەش دە (١٠) سوورەتی وەك وی، واتە: دە (١٠) سوورەتی وەك سوورەتەكانی قورئان، بە هەڵبەستراویی بێنن، ئەم وشەی (أَمۡ)ە،

کە لە سەرەتای ئایەتەکەدا هەیە، (أَمْ)، دەڵێ: (مُنقَطِعَةٌ بِمَعنى بَل، لِلإضْرَابِ لِلإنْتِقَالِ مِنْ غَرَضٍ إلى آخَر، إلاَّ أنَّ أم مُختَصَّةٌ بالإستِفهَامِ فَتُقَدَّرُ بَعْدَهَا هَمْزَةُ الإسْتِفهَام)، ئەمە وەك بنچینەیەکی زمانی عەرەبیی وشەی (أَمْ)، بە مانای (بَل) بەکاردێ، ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُ﴾، یانی: ئاوای لێدێتەوە، (بَلْ أيَقُولُونَ افتَرَهُ)، بەڵکو ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە، جا دیارە وشەی (أَمْ)، بەکاردەهێنرێ بۆ گواستنەوە لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دی، بەڵام ئەوەندە هەیە وشەی (أَمْ)، لەگەڵ (بَل)، جیاوازیی ئەوەیە، کە تایبەتە بە پرسیار کردنەوەو، لە دواشیەوە دەبێ هەمزەیەك دابنرێ، واتە: (بَلْ أيَقُولُونَ)، بەڵکو ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە فەرموون: ئێوەش دە (١٠) سوورەتی هەڵبەستراو بێنن.

وشەی: ﴿ إفتراء ﴾، لە کوردییدا دەبێتەوە بە (هەڵبەستن)، (كَذِبْ)، یانی: درۆ، بەڵام (إفتراء)، واتە: هەڵبەستن، ئنجا ئایا جیاوازیی چیە لەگەڵ درۆ؟ جیاوازییەکەی ئەوەیە کە درۆ جاری وایە خاوەنەکەی شوبهەیەکی هەیە کە درۆ دەکات، بەڵام (إفتراء) ئەوەیە هەر لەو گۆڕە درۆیەك هەڵبەستێ‌و هیچ شوبهەیەکی نەبێ‌و، هیچ بیانوویەکی نەبێ، دەڵێ: (الإفْتِرَاءُ: الكَذِبُ الَّذي لا شُبْهَةَ لِصَاحِبِهِ، فَهو الكَذِبُ عَن عَمْدٍ)، (إفتراء) ئەوەیە کەسێك بە ئانقەست درۆ بکات‌و هەڵیبەستێ، یان دەتوانین بڵێین: (إفْتِرَاء) جۆرە درۆیەکی تایبەتە، درۆ ئەوەیە قسەیەك بکرێ پێچەوانەی واقیع بێ، بەڵام (إفْتِرَاء) جۆرێکە لە درۆی تایبەت کە خاوەنەکەی بە ئانقەست هەڵیدەبەستێ، جاری وا هەیە کەسێك لە بابەتێکدا بە هەڵەدا دەچێت‌و تووشی درۆ دەبێ، بەڵام (إفْتِرَاء) ئەوەیە بە ئانقەست بیکات.

کە دەفەرموێ: ﴿بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ﴾، دە (١٠) سوورەتی وەك ئەو هەڵبەستراو بێنن، ئەمە لە زمانی عەرەبی دا پێی دەگوترێ: (إرْخَاءُ العِنَانِ وَالتَّسْلِيمُ الجَدَلِيُّ)، واتە: جڵەو شل کردنە بۆ بەرانبەر، وەك گریمانەیەك بۆ وتوێژو موناقەشە، یانی: باشە گریمان ئەوە ئەم قورئانە هەڵبەستراو بوو،

ئێوەش فەرموون دە (١٠) سوورەتی وەك سوورەتەكانی قورئان هەڵببەستن‌و بیانهێنن، ئەمە لە هەموو زمانەكاندا ئەو جۆرە عورفە هەیە، تۆ ئەگەر بەرانبەرەكەتت بۆ ئیقناع نەبوو، دەڵێی: باشە ئەوە دامنا قسەكەی تۆ ڕاستە، فەرموو تۆش ئاوا بكە.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، هەروەها هەر كەسێك جگە لە خوا دەتوانن بانگیان بكەن، ئەگەر ڕاست دەكەن، ئەگەر لە ڕاستانن، كە موحەممەد ﷺ قورئانی لەلایەن خواوە بۆ نەهاتوەو خۆی هەڵیبەستوە، ئێوەش نەك هەر خۆتان، بەڵكو هەر كەسێكیش بە دەنگتانەوە دێ، بە دەمتانەوە دێ، بانگیان بكەن‌و، دە (١٠) سوورەتی وەك هی قورئان بێنن، كە بە گومانی ئێوە هەڵبەستراوە، فەرموو ئێوەش هەڵببەستن.

## كورتە باسێك لەبارەی پووچەڵكردنەوەی تۆمەتەكانی نەیارانی قورئانەوە:

هەرچەندە پێشتریش باسی ئەم مەسەلەیەمان كردوە، بەلام چونكە خوا ﷻ بە لای كەمەوە، وەك ئێستا لە یادمە: لە چوار پێنج شوێن لە قورئاندا، باسی ئەو بابەتە دەكات، واتە: باسی ئەوە كە قورئان دەفەرموێ: ئەی نەیارانی قورئان، نەیارانی پێغەمبەر ﷺ ! ئەگەر ئێوە ئیددیعای ئەوە دەكەن، موحەممەد خۆی قورئانی داناوەو، لەلایەن خواوە بۆی نەهاتۆتە خوار، فەرموون: ئێوەش ئەوە مەیدان، ئەوە عەرزو ئەوە گەز، كتێبێكی وەك قورئان بێنن.

ئەگەر بە پێی ڕیزبەندیی دابەزینی سوورەتەكانیش نەبێ، بەلام بە پێی ڕیزبەندییەكی لۆژیكیی‌و مەنتیقیی، وام دێتە بەرچاو، ڕێزبەندیی بەرپەرچدانەوەكانی قورئان بەم جۆرە بێ:

قۆناغی یەكەم:

١/ ئایەتی (٨٨) لە سوورەتی (الإسراء)دا كە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ

بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾﴾، (خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:) تۆ بڵێ: ئەگەر ئینسو جن[1]،(یانی: هەرچی مرۆڤە وە هەرچی جیننە) هەموویان کۆببنەوە، بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن، بێگومان ناتوانن وێنەی قورئان بێنن، هەرچەند هەندێکیشیان پشتیوانی هەندێکیان بنو هەندێکیان پشتی هەندێکیان بگرن.

٢/ لە سوورەتی (الطور)دا دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾﴾، واتە: یان ئایا دەڵێن: (موحەممەد ﷺ قورئان)ی لەلایەن خۆیەوە گوتوە (تَقَوَّلَهُۥ[2]: واتە: زۆری لە خۆی کردوە قورئان بڵێ، یان: خۆی قورئانی هەڵبەستوە) بەڵکو بڕوا ناهێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن (کە موحەممەد ﷺ قورئانی لەلایەن خۆیەوە گوتوەو خۆی هەڵیبەستوە بە ناوی خواوە) با ئەوانیش فەرموودەیەکی وێنەی قورئان بێنن.

دیارە چ ئەو کاتەی کە ئایەتی (٨٨)ی سوورەتی (الإسراء) هاتۆتە خوارێو، چ ئەو کاتەی کە هەردوو ئایەتی (٣٣ و ٣٤)ی سوورەتی (الطور)، یان سوورەتی (الطور) هەمووی هاتۆتە خوارێ، قۆناغی مەککە بووە، کەواتە: ئەو کاتە خوا ﷻ کە فەرموویەتی: ﴿فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾﴾، یاخود فەرموویەتی: ﴿أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ﴾، واتە: ئەوەندە

---

١) (إنس) ناوی کۆیە بۆ ئینسان، واتە: ئەگەر هەموو مرۆڤەکان، (جن)یش ناوی کۆیە بۆ (جني)و (جنية)، کە بە کوردی جاری وایە بۆ (جن)، دەگوترێ: جند، یان دەگوترێ: پەری، گرنگ ئەوەیە ئەو جۆرە دروستکراوەی کە لە ئیبلیسەوە هاتوونو، لە ئاگر دروستکراونو، ئێمە نایانبینینو ئەوان ئێمە دەبینن).

٢) (تقول)، لەگەڵ (افتراء)، مانایان لێك نزیکە، بەڵام (افتراء)، ئەوەیە کە تۆ بە دەمی کەسێکی دیکەوە شتێك بڵێی، (تقول)، ئەوەیە کە زۆر لە خۆت بکەی بیڵێی، بەڵام (تقوّل) بە مانای (إفتراء)ش دێ.

قورئـانەی کە ئەو کـاتە دابـەزیوە، نەك ئەم قورئـانەی کە ئێسـتا لە دوو تـوێی موصـحەفێکدا لەبەر دەستی ئێمـە دایـە، بـە هـەموو سـوورەتە مەککـەییەکـان‌و مەدینەییەکـانەوە، بەڵکو بەس ئەوەندە قورئانەی کە ئـەو کـاتە دابـەزیوە، ئنجـا ئایا (٢٠) سـوورەت بووە، (٣٠) سـوورەت بووە، کەمـتر بووە، یان زیاتر بووە، خوای پەروەردگـار تەنیا داوای ئەوەندەی لێکـردوون، کە بیهـێنن.

کەواتــە: هــەم لــە ئایەتەکــەی ســوورەتی (الإسـراء)دا، وە هــەم لــە دوو ئایەتەکـەی سـوورەتی (الطور)دا، خـوا داوای ئـەوە لـە کـافرەکـان دەکـات، کـە ئەگـەر سـوورن لەسەر ئەوەی موحەممـەد ﷺ قورئـانی هەڵبەستوەو، قورئـانی لـەلای خۆیـەوە گوتـوە، فـەرموون: ئێـوەش بـە ئەنـدازەی ئـەو قورئانـەی کـە دابەزیـوە، بە ئەندازەی ئەوە بێـنن.

<u>قۆنـاغی دووەم</u> : بـە پێـی تێگەیشـتنی مـن ئـەم ئایەتـەی سـوورەتی (هـود)ە، کـە دەفـــەرموێ : ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾﴾، واتــە: یــان ئایا دەڵێــن: (موحەممـەد ﷺ) هەڵـیبەسـتوە، بڵـێ: ئێـوەش دە (١٠) سـوورەتی هەڵبەسـتـراوی وەك وی بێـنن‌و، هەر کەسـێك کە دەتوانن جگـە لە خوا بانگـیان بکـەن (بۆ هـاوکـارییـتان) ئەگـەر لە ڕاسـتانن.

واتـە: لـەو ئەنــدازە قورئــانەی کە تـا ئـەو کـاتە دابـەزیوە، بـا هێنـدەی دە (١٠) سـوورەتی بێـنن، ئنجـا ئەو دە (١٠) سـوورەتە کورت بـن، درێـژ بـن، تێکەڵ بن، هـەر چـۆن بـن.

<u>قۆنـاغی سـێیـەم</u>: قۆنـاغێکی دیکە لـە سـوورەتی (یـونس)دا، خـوا دەفـەرموێ :

﴿قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾﴾، واتـە: بڵـێ: وێنـەی سـوورەتێکی قورئـان بێـنن‌و، هـەر کەسـێکیش لـە تواناتاندا هەیە لە خوار خواوە، (جگە لە خوا) بانگیان بکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن.

واتە: بۆیان دابەزیو هاتە سەر سوورەتێك، دیارە ئەمە لە مەککە، چونکە سوورەتی (یونس) سوورەتێکی مەککەییە، بەڵام لە مەدینەش، ئەمە دیسان دووبارە دەبێتەوە، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾

واتە: ئەگەر لە گومان دان لە بارەی ئەوەوە کە دامانبەزاندوە بۆ سەر بەندەی خۆمان (موحەممەد ﷺ) وێنەی سوورەتێکی بێننو، هەموو ئەوانەی کە شایەدیتان بۆ دەدەن جگە لە خوا، (واتە: هاوکارتان دەبن، شایەدیتان بۆ دەدەن، کە ئێوە ڕاست دەکەن، کەسێکیش شایەدیی بۆ کەسێك بدات، مانای وایە هاوکاریەتیو پشتگیریەتی) هەموویان بانگ بکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن، ئنجا ئەگەر نەتانکردو، هەرگیزیش نایکەن ﴿ وَلَن تَفْعَلُوا ﴾، لە زمانی عەرەبییدا (لَن)، بۆ (تأكيد و تأبيد)ە، واتە: بێگومان ناتوانن‌و، هەرگیزیش ناتوانن، ﴿ فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ﴾، ئەوە خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی خەڵك‌و بەردە، بۆ بێبڕوایان ئامادە کراوە.

ئنجا ئایەتێکی دیکەشمان هەیە ئەویش هەر شێوەی ئەو ئایەتانەیە، ئەویش ئایەتی ژمارە (٦)ی، سوورەتی (سبأ)، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی زانیارییان پێدراوە دەزانن کە ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ دابەزێنراوە، هەر ئەوە هەقەو، ڕێنمایی (خەڵك) دەکات بەرەو ڕاستە شەقامی خوای زاڵی ستایشکراو، وەك کوردەواریی خۆمان

دەڵێن: (قەدری زێڕ لە لای زێڕینگەرە)، ئەوانەی زانان و شارەزان، هەقانیەتی قورئـان بـاش دەزانـن و، دەزانـن کـە هەقـی موتڵـەقی تێدایـەو لەلایـەن پەروەردگـارتەوە دابـەزێنـراوە.

# وەلامی پرسیارێکی گەورەو گرنگ

لێرەدا پرسیارێك دەکـرێ: بۆچـی بێبـڕوایەکان و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکـان، هـەم ئەوانی پێشـو، هـەم هـەتـا ئێسـتاشی لەگەڵ دابێ، کە جۆراوجۆرن و، زۆرن لە ڕۆژهـەڵاتەوە بۆ ڕۆژئـاوای دنیـا، لە سەرووی بۆ خوارووی، دنیا پڕە لە کـافرو لە ناحەز بەرانبـەر بە قورئـان و ئیسلام و، بەرانبەر بە موحەممەد ﷺ، بـەڵام بۆچـی نەیانتـوانی وەڵامـی ئـەو تەحەددایـە بدەنــەوەو بێنـە ئـەو مەیدانـەوە، کە خـوای پەروەردگــار داوایـان لێدەکـات بێنــە مەیـدان بـۆ قورئـان و، خوا عزّوجلّ زۆر بـە جەخت کـردنەوە ڕایدەگەیەنێ، بە تایبەت لە سووڕەتی (البقرة)دا کە دەفـەرموێ :

﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ ﴾، ئەگـەر نەتـانکردو، بـە تەئکـیدیش نایکـەن و بۆتـان ناکرێ و هـەرگیـز لە تواناتاندا نیـە؟!

١) وەڵام : لـە سـووڕەتی (هـود)دا، ئاماژەیـەکی پێدەکـات کـە بۆچـی نـاتوانن، دەفـەرموێ : ﴿ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَاعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجـا ئەگەر وەڵامیان نەدانەوە، (واتە: ئەوانەی کە لـە جیاتی خـوا داوای هـاوکـارییان لێدەکەن، پشتیوانتان بن بۆ هێنانی دە (١٠) سـووڕەتی وەك هـی قورئـان، کە بـە گومانی ئێوە هـەڵبەسـتـراون، ئەگەر ئەوانـە وەڵامیـان نەدانـەوە) بـزانن کە بـە زانیـاریی خـوا دابـەزێـنراوە.

یاخود ئەی مسولمانینە! ئەگەر ئەوانەی تۆمەت ئاراستەی قورئان دەکەن‌و دەڵێن: موحەممەد ﷺ هەڵیبەستووە ئەگەر وەلامیان نەدانەوە، دە (١٠) سوورەتی وەك هی قورئان بێنن، ئەوە بزانن کە بە زانیاریی خوا دابەزێنراوە.

٢) وەلام: لە ئایەتی (٣٩)ی سوورەتی (یونس)یش دا، هەر ئاماژە بەوە دەکات، کە بۆچی ناتوانن؟

دەفەرموێ: ﴿بَلۡ كَذَّبُواْ بِمَا لَمۡ يُحِيطُواْ بِعِلۡمِهِۦ وَلَمَّا يَأۡتِهِمۡ تَأۡوِيلُهُۥ﴾، بەڵکو ئەوانە بە شتێك بێبڕوا بوون کە دەوری زانیارییەکەیان نەداوەو، جاری سەرەنجامەکەشیان بۆ نەهاتوە، واتە: لەبەر ئەوەی پێی ئاشناو شارەزا نین‌و، ئەو هەوالانەش کە قورئان داونی، جاری سەرەنجامەکەیان، نەهاتوە، بۆیە پێی بێبڕوان، واتە: لە ڕووی نەزانییانەوەیە.

٣) وەلام: لە سوورەتی (الفرقان)یشدا، هەر ئاماژە بەوە دەکات، کە خوا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ٦﴾، واتە: بلێ: ئەو کەسە قورئانی دابەزاندوە، کە نهێنیی ئاسمانەکان‌و زەوی دەزانێ.

کەواتە: کەسێکیش دەتوانێ وەك قورئان بێنێ، ئنجا سوورەتێك بێ، دە (١٠) سوورەت بن، یان هەموو قورئان بێ، کە بە قەدەر خوا ﷻ زانیاریی هەبێ، بە نهێنییەکانی ئاسمان‌و زەوی، دیارە بێجگە لە خواش ﷻ هیچ کەس ئەو زانیارییەو ئەو توانایەی نییە.

ئنجا جێی سەرنجە کە لەو چوار سوورەتەدا یەك جۆرە تەعبیر بەکارهاتوە:

١/ لە سوورەتی (الطور)، دەفەرموێ: ﴿إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ﴾.

٢/ لە (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾.

٣/ لە (هود)یش دا، دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾.

٤/ لە (البقرة)ش دا، دەفەرموێ ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾.

واتە: تەنیا لە سوورەتی (الطور)دا، بە شێوەی نادیار دەیهێنێ، دەفەرموێ: ئەگەر ئەوان ڕاست دەکەن، ئەگەر لە ڕاستانن، بەڵام لە (یونس) و (هود) و (البقرة)دا، چونکە ڕووی دواندن لەوانەیە کە تۆمەتیان ئاراستەی قورئان دەکرد، دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، کەواتە: ئەگەر وەڵامی ئەو تەحەددایەتان نەدایەوە مانای وایە ئێوە ڕاست ناکەنو، بە هەڵە داچوونو، درۆ دەکەن، کە دەڵێن: موحەممەد ﷺ بۆخۆی قورئانی هەڵبەستوە.

لە ئایەتی (١٣)ی سوورەتی (هود)دا، خوا ئاوای فەرمووە: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٣﴾، ئنجا لە ئایەتی (١٤)دا دەفەرموێ: ﴿فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٤﴾:

کە دەفەرموێ: ﴿فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ﴾، ئەمە دوو واتایان هەڵدەگرێ:

١ - دوێندراوەکان (مخاطبین) کافرو موشریکەکانن، کە خوا پێی فەرموون: هاوکارەکانتان ئەوانەی کە بە دەمتانەوە دێن، ئەوانەی بە هاوکاریتانەوە دێن، بۆ ئەوەی دە (١٠) سوورەتی وەك هی قورئان بێنن، ئەگەر ئەو هاوکارانە وەڵامیان نەدانەوەو هاوکارتان نەبوونو دەستباریان بۆ نەگرتنو نەیانتوانی، ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ﴾، ئەو کاتە بزانن و دڵنیابن، کە ئەم قورئانە بە زانیاریی خوا دابەزێنراوە، بۆیە هیچ کەس ناتوانێ وێنەی قورئان بێنێ، نە وێنەی هەموو قورئان، نە وێنەی دە (١٠) سوورەتی، نە وێنەی سوورەتێکی، ﴿وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، هەروەها بزانن کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾، ئایا ئێوە ملکەچ نابن، دوای ئەوەی کە بۆتان دەرکەوت قورئان فەرموودەی خوایە، بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دابەزێنراوە، ئایا هەر بۆ خوا ملکەچ نابن؟!.

٢ـ واتایەکی دیکەی: ﴿ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ ﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ! و ئەی مسوڵمانینە! ئەو کافرانەی کە تۆمەت ئاراستەی قورئان دەکەن‌و، دەڵێن: موحەممەد بۆخۆی هەڵیبەستوە، ئێوەش پێیان بڵێن: دە (١٠) سوورەتی هەڵبەستراو بێنن، ئنجا ئەگەر وەڵامیان نەدانەوە، ئەوە ئێوە کە بڕواتان هەر هەیە، زیاتریش دڵنیابن، یا زیاتریش زانیارییەکەتان بەوە قووڵ بێتەوە، کە ئەم قورئانە بە زانیاریی خوا دابەزێنراوەو، بێجگە لە خواش ﷻ هیچ پەرستراوێك نیە، ئنجا ئایا ئێوە ملکەچ نین؟! واتە: زیاتر ملکەچ بن بۆ خواو، بۆ فەرمایشتی خواو، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

**<u>مەسەلەی سێیەم</u>:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەر لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا کە باسی بێبڕوایان‌و، هەڵوێستی نەرێنییان دەکات لە بەرانبەر قورئان‌و پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ، ئاماژە بەوە دەکات کە ئەوانەی هەڵوێستیان سەلبیی‌و خراپە لە بەرانبەر قورئان‌و پێغەمبەر ﷺ‌و ئیسلامدا، زیاتر بەهۆی ژیانی دنیاوەیە، بەهۆی بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیانەوەیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ﴾، هەر کەسێك ژیانی دنیاو جوانیی ژیانی دنیای بوێ، ﴿ نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا ﴾، بەرهەمی کردەوەکانیان لە دنیادا بە تەواویی پێ دەدەین، ﴿ وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴾، ئنجا لە بەرهەمی ژیانی دنیایاندا، هیچ کەم‌و کورتییان بەسەر نایەت‌و خوا هیچیان لێ کەم ناکاتەوە، لە بەرهەمی کردەوەکانیان کە بۆ ژیانی ئەنجامیان دەدەن.

هەڵبەتە ئەم حەقیقەتە لە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا بەیان کراوە، ئنجا ئەم حەقیقەتە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ﴾، واتە: هەر کەسێك کە ئامانجی ژیانی دنیاو جوانییەکەی بێ، یانی: هەموو گرنگیی پێدانی خۆیو بایەخ پێدانی خۆی چڕ کردۆتەوە، لە ژیانی دنیاو لە جوانیی ژیانی دنیادا، هەر کەسێك ئەوەی بوێ، ﴿ نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا ﴾، (التَّوْفِيَةُ: إِعْطَاءُ الشيءِ وَافِياً كَامِلاً)، (تَوفِيَة)، بریتییە لەوە کە شتێك بە تەواویی بدرێ، بەبێ کەمو کورتیی.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا ﴾، کردەوەکانیان لە دنیادا بە تەواویی پێ دەدەین، یانی: (نوفِّ إليهِم جَزَاءَ أعْمَالِهِم، أو ثَوَابَ أعْمَالِهِم، أو نَتَائِجَ أعْمَالِهِم)، یانی: بەرهەمی کردەوەکانیان، پاداشتی کردەوەکانیان، ئەنجامەکانی کردەوەکانیان لە ژیانی دنیادا، بە تەواویی پێدەدەین.

ئەمە وەك ئایەتی (١٨)ی، سووڕەتی (الإسراء)وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ﴾، واتە: هەر کەسێك ژیانی بە پەلەی دنیای بوێ، ئێمە هەر لە دنیادا ئەو ئەندازەیەی کە بمانەوێ بۆ هەر کەسێك، پێی دەدەین، واتە: بەقەدەر کردو هەوڵو کۆششی خۆی بەرهەمی دەبێ.

هەروەها ئەمە وەك ئایەتی (٢٠)ی سووڕەتی (الشورى) وایە، کە دەفەرموێ:
﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْءَاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك بەرهەمی دواڕۆژی بوێ، بۆی زیاد دەکەین، لە بەرهەمەکەیو، هەر کەسێك بەرهەمی ژیانی دنیای بوێ، {﴿ حَرْثَ ﴾، خۆی بە مانای کێڵگەو کێڵانو کۆششو هەوڵدان دێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێ بەرهەمەکەیەتی}، هەر کەسێك

بەرهەمی ژیانی دنیای بوێ، ﴿ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ﴾، بە ئەندازەیەك لە بەرهەمی ژیانی دنیای پێدەدەین، ﴿ وَمَا لَهُۥ فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾، بەلاّم لە دوارۆژدا هیچ پشكو بەشی نیە.

ئەم سێ ئایەتە موبارەكە ئایەتەكەی سوورەتی (هود)و، ئایەتەكەی سوورەتی (الإسراء)و، ئایەتەكەی سوورەتی (الشورى)، ئەومیان لێوەردەگیرێ كە :

خوا ﷻ وەك بۆخۆی شایستەیە، زۆر دادگەرانە لەگەڵ بەندەكانیدا رەفتار دەكات، ئەوەی كە دوارۆژی بوێ، بەرهەمی دەبێ، ئەوەی دنیاشی بوێ بەرهەمی دەبێو، هی هیچیشیان كەم ناكاتەوە، بەلاّم هەر كەسێك هی دوارۆژی بوێ، خوای بەخشەر بۆی زیاد دەكات، ﴿ نَزِدْ لَهُۥ فِي حَرْثِهِۦ ﴾، بەلاّم ئەوەی ژیانی دنیای بوێ، هەر لەبەر ئەوەی كە ژیانی دنیای دەوێ، خوا لێی كەم ناكاتەوەو، پەرچی ناهێنێتە پێش، بەڵكو مادام بە پێی ئەو یاسایانەی كە خوا دایناون لە ژیانی مرۆڤدا، بە پێی ئەو یاسایانە بەرێوە بچێ، دەستی لە بەرهەمی خۆی گیر دەبێ، بۆچی؟ چونكە خوا ئەم دنیایەی داناوە خەڵكی تێدا تاقی بكاتەوە، ئنجا ئەگەر هەر كەسێك دوارۆژی نەویستبایە، خوا پەرچی خستبایە ئیشەكەی، یان بەرهەمەكەی دەست نەكەوتبایە، یان سەركەوتوو نەبووایە لە كارەكەیدا، ئەوكاتە بۆی هەبوو بڵێ: خوایە! تۆ رێت لێ گرتمو رێگای منت نەدا بە كەیفی خۆم وەلاّمی پرسیارەكان بدەمەوەو، تاقیكردنەوەكانی خۆم بە ئازادانە بكەم!

كە دەفەرموێ : ﴿ وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴾، (بَخْس)، یانی: (نَقْص)، یانی: (لاَ يُنْقَصون)، واتە: لێیان كەم ناكرێتەوە، (أي: لا يُجازون عَلَى كُفْرِهِمْ بجَزَاءِ سَلْبِ بَعْضِ النِّعَمِ عَنهُم، بَلْ يُتْرَكُونَ وشأنهم)، توێژەرەوان ئاوایان مانا كردوە، واتە: لە ژیانی دنیادا لێیان كەم ناكرێتەوە بە هۆی ئەوەوە كوفریان هەڵگرتوە، هەندێك لە نیعمەتو چاكەكانیان لێ كەم ناكرێتەوە، بەهۆی كوفرەكەیانەوە بەڵكو وازیان لێدەهێنرێ، وەك لە سوورەتی (النجم)دا خوا ﷻ دەفەرموێ :

﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ٣٩ ﴾، واتە: بۆ مرۆڤ نیە مەگەر بە ئەندازەی

ئەوە ﷻ هەوڵ دەداو کۆشش دەکات، کەواتـە: هـەر کەسێك: کـافر، یـان مسـوڵمـان، چـاك، یان خراپ، کۆششێك بکات بە ئەندازەی کۆششەکەی‌و ڕەنجدانەکەی خۆی، بەرهەمی دەستگیـر دەبێ، چ بۆ دنیا، ﷺ بۆ دواڕۆژ، چ بە ڕێی ڕاسـت دا، چ بـە ڕێـی چەوت دا، چونکە گوتـراوە : (البَخْسُ: نَقْصُ الحَقِّ عَلَى طَرِيقِ الظُّلْمِ)، (بَخْس)، بریتیە لە کـەم کـردنەوەی مـاف بـە شـێوەی سـتەمکارانە، کە دیـارە ئـەوەش لـە خـوای دادگـەر ناوەشـێتەوە.

دوایـی دەفـەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٦ ﴾، ئـا ئەوانـە لـە دواڕۆژدا تەنیـا ئاگـریان هـەیە، واتـە: ئەگــەر شـوێنێکـیان هـەبێ، ئەگــەر بەرهەمێکـیان هـەبێ، بریتیـە لە ئاگـری دۆزەخ، بۆچی؟ چونکـە ئەوانـە هـەموو هەوڵـی خۆیـان لەسـەر دنیـا چڕکـردۆتەوەو، تەنیـا ئامانجیان دنیا بووەو، تەنیـا دنیـایان بینـیوە، ئنجا لـە دنیاشـدا تەواوی بەرهـەمی کردەوەکانی خۆیـانیان پێدراوە، بە پێی ئەو یاسـایانەی کـە خـوا لـە ژیـانی بەشـەردا دایـنـاون، دەسـتیان گەیشتۆتە تـەواوی بەرهـەمی کردەوەکانی خۆیان، بەڵام دواڕۆژیان نەبینیوەو بۆ دواڕۆژ کاریان نەکـردوەو بڕوایـان پێ نـەبووە، بۆیـە لە دواڕۆژدا ئاگـری دۆزەخ چـاوەڕێیـانە.

کە دەفـەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ ﴾، (أي لَيْسَ لَهُمْ مِمَّا يُعْطَاهُ النَّاسِ إلاَّ النَّار)، لەوەی کە بـە خـەڵـك دەدرێ، لە دواڕۆژدا، ئـەوان بەس ئـاگریـان پـێ دەدرێ، ئاگری دۆزەخ، ﴿ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا ﴾، ئنجا ئەوە بە نـسـبەت کردەوە خراپەکـانیانەوە کە بە کارامەیی‌و لێزانیی کردوویانن، دەرەنجام‌و بەرهەمەکەیان، بریتیە لە ئاگری دۆزەخ، ئەدی کردەوە باشـەکانیان کە کـردوویـانن، چییـان لـێدێ؟ ﴿ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئـەو کـردەوە باشـانەشـیان کـە ئەنجـامیان داون لە دنیادا، ئەوانەشیان لە دەست دەچێ‌و هەڵدەوەشـێنـەوە.

(حَبِطَ ) لە (حَبَطْ)ەوە هـاتوە، (حَبَطْ)یش: بریتیـە لـەوەی ئاژەڵـێك لـەوەڕێکی زۆر بخــوا دوایـی سـکی پێـی بچـێ‌و بـاری تەندروسـتیی بەهــۆیەوە تێکبچـێ،

كەسێكیش كە كـردەوان دەكات، بەڵام هـەوێنی ئیخـلاصـیان تێدا نیـە، هەوێنـی بـە پێـی شـەرعی خـوا بـوونو خـوا پـێ مەبەست بوونیـان تێـدا نیـەو، كردەوەكانی پەیوەست ناكاتەوە بـە ڕەزامەنـدیی خـواو بـە پاداشتی خـواوەو، بـە دوارۆژەوە، وەك شـیـرێك كە هەوێنی تـێ ناكـرێ، هەڵدەبزركـێو لـە جیاتی ئـەوەی ببێتـە ماست، دەترشێو دەبێ فڕێ بدرێ، ئەویش كـردەوەكـانی فـڕێ دەدرێـنو بـە كەڵـك نایـەن، چـونكـە هـەوێنی بە پێی شـەرع بوونو ئیخلاصیان تێدا نیە، هەروەك (إبن عطاء الله الأسـكندري)، زۆرجـار ئەو قسـەیەم هێنـاوەتەوە كـە دەڵـێ :

الأَعْمَـالُ أَشْـبَاحٌ أَرْوَاحُـهَا          وُجُـودُ سِرِّ الإِخْـلاَصِ فِيْهَـا

واتـە: كردەوەكـان وەك كەلەشـێك وان، ڕووحەكـانیان بریتیـن لـە هـەبوونی نهـێنی ئیخـلاص.

هـەر كـردەوەیەك خوا پـێ مەبەسـت بـوونی تێدا بـێ، ئـەوە زینـدووەو ڕووحـی هەیـە، بـەڵام هــەر كـــردەوەیەك خـوا پــێ مەبەســت بـوونی تێـدا نەبــێ، وەك كەلەشـێكی بـێ ڕووح وایـە.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئەو كردەوانەی كە دەیانكـردن، پووچ بـوون، زایـە بوون، (باطِـل: الشيءُ الَّذِي يَذهَـبُ ضِيَاعاً وَ خُسْرَانًا)، (بَاطِـل)، هەر كردەوەیەكە، هەر شتێكە كە دەڕواو زایە دەبێو بێ دەرەنجـامو بـێ سـەرەنجـام دەبێ.

ئەمـە وەڵامـی پرسیارێكـە كـە خـوا دەفـەرموێ : ﴿ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا ﴾، جـارێ وشـەی (صَنَعُواْ)، بریتیـە لـە كـردەوەیەك بـە كـارامەییو لـێزانیـیو وردەكـاریـی بكـرێ، ئایـا (صُنْـع)و (عَمَـل)و (فِعْـل)، جیـاوازییان چیـە؟

١/ (عَـمَل) بریتـیە لە كـردەوەیـەك كە ئیـرادەو ویسـتێكی لە پشـتەوە بێ.

٢/ (فِعْـل)، بریتـیـە لە هـەر كردەوەیـەك بـە گشـتی، بـا ئیـرادەو ویسـتێكـی لـە پشـتەوە نەبـێ.

٣/ (صُنع)، بریتیە لە کردەوەیەك بە وردەکاریی و لێزانیی و کارامەیی بکرێ.

ئنجا کە لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا ﴾، ئەو کردەوانەی کە زۆر بە وردەکاریی و بە لێزانی و بە کارامەیی کردوویانن، لێیان هەڵدەوەشێنەوە.

ڕەنگە یەکێك بڵێ: بۆچی خوا کردەوەکانی لێ هەڵوەشاندوونەوە؟! بۆیە بە ڕستەی: ﴿ وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوەو دەفەرموێ: بۆیە هەڵوەشێنرانەوە، چونکە نێوەڕۆك بۆش و بێ ڕووح بوون، کەلەشێکی بێ گیان بوون، بۆیە لە بەین چوون و خاوەنەکانیان هیچیان لێ دەستگیر نەبوون و، دەستیان لە بنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەرچوو.

ئنجا لە کۆتایی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەدا، خوا ﷻ ئەم دوو ڕاستییە مەزنە دەخاتە ڕوو:

<u>یەکەم</u>: هەر کەسێك کار بۆ دنیاش بکات بەرهەمی کردەوە دنیاییەکانی دەپارێزرێ، بە پێی یاساکانی خوا، کە لە ژیانی بەشەردا دایناون و، هەر لەبەر ئەوە کە ئەو کەسە ئەهلی کوفرە، یان ئەهلی شیرکە، یان ئەهلی نیفاقە، ڕەنجی دنیایی بە زایە ناچێ، بەڵکو بۆ دنیاو لە چوارچێوەی دنیادا، بە ئاکامی خۆی دەگات و، لە کردو کۆش و هەوڵدانی خۆی بەهرەمەند دەبێ.

<u>دووەم</u>: بەڵام لە قیامەت و دواڕۆژدا، ئەو جۆرە کەسانە ڕەنج بە خەسارن، بۆچی؟

چونکە مەبەستیان پێ خوا نەبووەو بۆ دواڕۆژ کاریان نەکردوەو بڕوایان پێی نەبووە، کە بە دڵنیایی ئەوەش ئەوپەڕی دادگەریی و کارزانیی و کاربەجێی خوای پەروەردگاری تێدا دەدرەوشێتەوە.

<u>مەسەلەی چوارەم</u>: ئایەتی ژمارە (١٧)یەو ئەم ئایەتە موبارەکە لە نێو ڕوونکەرەوانی ماناو مەبەستەکانی قورئاندا، مشتومڕو کێشەی زۆری لەسەر کراوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ

ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾﴾، سەرەتا دەبێ بزانین: کە خوا ﷻ هەر لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا کە تێیان دا باسی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەکاتو، باسی قورئان دەکاتو، باسی هەڵوێستی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانو کافرەکان دەکات، کە نەیاری پێغەمبەر ﷺ بوونو، نکووڵییان دەکرد لەوەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوا بێو، نکووڵییشیان دەکرد لەوە کە قورئان فەرمایشتی خوا بێو، بۆ پێغەمبەری خاتەم دابەزێنرابێ، لە سیاقی ئەوەدا، خوا ﷻ دێنێ بەراوردێك دەکات لە نێوان پێغەمبەری خاتەم ﷺو نەیارەکانی دا بێ ئەوەی کە باسی نەیارەکانی بکات بە ڕوونو ڕاشکاویی، بەڵام باسی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، هەڵبەتە نەك بە ناوهێنان، بەڵکو باسی سیفەتەکانی دەکاتو دەفەرموێ:

١) ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، واتە: ئایا کەسێك کە لەلایەن پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرا بێ.

٢) ﴿وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ﴾، شایەدێکیشی لەلایەن خواوە بە دوادابێ، واتە: ئەو بەڵگە ڕوونەی کە ئەو کەسە لەسەریەتی، کە مەبەست پێی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، یاخود هەر کەسێکی دیکە کە لە ڕێی پێغەمبەری خاتەمەوە دەڕوات، ئایا کەسێك کە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرایە لە پەروەردگاریەوە، پاشان شایەدێکیش، بەڵگەیەکیش لەلایەن پەروەردگاریەوە، بە دوای ئەو بەڵگە ڕوونو ئاشکرایەدا بێ.

٣) ﴿وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً﴾، ئنجا لە پێش ئەو شایەدەشدا (کە قورئانە) کتێبی مووسا هەبوو، کە هەم پێشەوا بوو، هەم مایەی ڕەحمەتو بەزەیی خوا بوو، واتە: ئایا موحەممەد ﷺ کە پێغەمبەرێکی خوایە:

یەکەم: ﴿عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرایە لەلایەن پەروەردگاریەوە، کە مەبەست پێی ئەو فیترەتەیە کە خوا هەموو

مرۆڤەکانی لەسەر خوڵقاندوون، بە تایبەت پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە خاوەنی ساغترین فیترەتو، چاکترین مەعدەنی خوا پەرستیی‌و خوا ناسیی بوون، بۆیەش فەرموویەتی: لەلایەن پەروەردگاریەوە، چونکە ئەو فیترەتو خوارسکە، ئەو سروشتی خواناسییە، خوا پێی داوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾.

**دووەم**: ﴿ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ ﴾، شایەدێکیش لە خواوە بە دوای دا دێ، ئەو شایەدەش بریتیە لەم قورئانە، چونکە قورئانیش شایەدیی دەدا بۆ ئەو ڕاستییانەی کە لە فیترەتو خوارسك‌و سروشتی مرۆڤدا دانراون، کەواتە: شایەدەکەش بریتیە لە قورئان کە لە خواوە دێ‌و شایەدیی دەدات بۆ ئەو ڕاستییانەی کە لەو فیترەتو سروشتەی مرۆڤدا دانراون، کە بریتین لە ناسینی خوا ﷻ، بە گەورە گرتنی خوا، بە بەرزگرتنی خوا، بەندایەتیی بۆ خوا، تا کۆتایی هەموو ئەو ڕاستییانەی ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی دەیانگرێتە خۆیان.

**سێیەم**: ﴿ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ﴾، لە پێش ئەم شایەدەشدا (کە قورئانە)و، بە دوای بەڵگەی فیترەتدا دێ، لە پێش ئەمەشدا کتێبەکەی مووسا بوو، ﴿ إِمَامًا وَرَحْمَةً ﴾، کە پێشەوا بووو، مایەی ڕەحمەت‌و بەزەیی خوا بوو، ﴿ إِمَامًا ﴾، پێشەوا بوو بۆ خەڵکی سەردەمی خۆی، بۆ گەلی بەنی ئیسرائیل، گەلی مووسا، پێشەوایان بوو، پێشیان دەکەوت: حەڵاڵ چییە؟ حەرام چییە؟ چاکە چییە؟ خراپە چییە؟ دۆست کێیە؟ دوژمن کێیە؟ چی بکەن؟ چۆن بکەن؟ لەوبارەوە پێشەوایان بوو، ﴿ وَرَحْمَةً ﴾، بۆ دنیا پێشەواو سەرمەشقیان بووەو، بۆ دوارۆژیش مایەی ڕەحمەت‌و بەزەیی خوای پەروەردگار بووە بۆیان.

جا لێرە خوا ﷻ ئەم بەراوردکردنە کە دەیکات، بەرانبەرەکەی باس نەکردوە، ئنجا ئایا بەرانبەرەکەی کێیە؟ ئەوە بەپێی سیاق دەزانرێ، واتە: ئایا کەسێك

کە ئاوایە، وەك کەسێك وایە کە لە گومڕایی‌و سەرگەردانیی دایە؟ بە تەئکید نەخێر، ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ بەرانبەرەکەی باس نەکردووە؟ چونکە بە عەقڵ‌و سەلیقەو سیاق دیارە، چونکە وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە: گرنگترین ڕووی ڕەوانبێژیی لە هەر فەرموودەیەکدا بریتییە لە کورتیی، واتە: وشەکانی کەم‌و مانای زۆر بێ، ئنجا هەر شتێك کە بە پێی عەقڵ‌و سەلیقەو سیاق دیار، بێ خوای پەروەردگار لە قورئاندا باسی ناکات، لێرەش دا: ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، دیارە مەبەست ئەوەیە: کە ئایا کەسێك کە ئاوایە، وەك کەسێك وایە کە پێچەوانەی ئەوەیە؟ کەسێك کە لەلایەن پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوون‌و ئاشکرا بێ‌و، شایەدێکیش بە دوای ئەو بەڵگەیەدا بێ کە قورئانە، کەواتە: پێچەوانەی ئەوە کێیە! پێچەوانەی ئەوە کەسێکە کە بە نسبەت پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگە نیە، پەروەردگاری ناناسێ، پاشان ئیمانیشی بەو شایەدە نیە کە شایەدو بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی ئەوەی کە لەو فیترەت‌و سروشتەی دا هەیە، کەواتە: کەسێکە لە گومڕایی‌و سەرگەردانیی دایە، هەم لە ڕووی ناخی خۆیەوە، پەی بە هەق نابات، هەم لە دەرەوەی خۆشی دا، واتە: نە ئەهلی نەقڵە، نە ئەهلی عەقڵە، نە ئەهلی فیترەتێکی ڕاست‌و دروست‌و سروشتێکی ساغە، نە ئەهلی شەریعەتێکیشە کە لە دەرەوەی خۆی، لە وەحی خوای زاناو توانادا بەرجەستەیە.

ئەمەش ئەو مانایەیە کە لە نێو هەموو تەفسیرەکاندا کەوتۆتە بەر دڵم، بەڵام مەرج نیە بەو شێوەیەی کە من هێنام، لە تەفسیرەکاندا بەو وشەو تەعبیرانە بێ، بەڵام نێوەڕۆکی ئاوایە.

هەڵبەتە هەندێکی دیکە: ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، ﴿بَيِّنَةٍ﴾یان بە قورئان مانا کردووەو، ﴿وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ﴾یان، بە فیترەت‌و عەقڵی سەلیم لێکداوەتەوە.

بەڵام من پێم وایە : ﴿بَيِّنَةٍ﴾، ئەو فیترەتە ساغ‌و پاکەیە کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ لەسەری بووەو، هەر کەسێکیش کە شوێنی ئەو بکەوێ،

خاوەنی سروشتێکی پاكو چاك دەبێو، سروشتەکەی لە خشپو خاڵو لەو شتانەی کە پێچەوانەی عەقڵی سەلیمو پێچەوانەی مەعدەنو سروشتی ساغ پاکن، دوور دەبێ.﴿وَيَتۡلُوهُ شَاهِدٞ مِّنۡهُ﴾، شایەدێکی لەوەوە، (واتە: لە پەروەردگارەوە) بە دوای دا دێ، ئەو شایەدەش کە بە دوای فیترەتدا دێ، دیارە کە قورئانە.

بەلاّم هەندێکیان : ﴿وَيَتۡلُوهُ﴾یان بە (يَتَّبِعُ) بە (بە دوای دا دێ) لێکنەداوەتەوە، چونکە (تَلا)، یانی (تَبِعَ)، مانایەکی دیکەشی هەیە، واتە: (قَرَأَ)، (يَتْلُوهُ)، ئەوان گوتوویانە: (يَقرَؤُهُ)، سەرەنجام گوتوویانە: ﴿وَيَتۡلُوهُ شَاهِدٞ مِّنۡهُ﴾، وە شایەدێك لە خواوە دەیخوێنێتەوە. یانی: ئەو بەڵگەیە، ئەدی بۆچی ڕاناوەکەی (مُذَكَّر)ە؟! گوتوویانە ئەو کاتە مانای (بَيان)ی لێ‌دەگیرێ، (وَيَتْلُو البَيانَ شَاهِدٌ مِنْهُ)، ئنجا شایەدێك لە خواوە، گوتوویانە: مەبەست پێی جبریلەو، هەندێك لە شیعەکان گوتوویانە: مەبەست پێی (علي)یە، خوا لێی ڕازی بێ، کە لە ڕاستیی دا ئەو قسانە هیچ بەڵگەیان لەسەر نیە.

ئنجا (يَتلُوهُ)، بە مانای (يَتبَعُهُ)، بەدوای دەکەوێ، دێ، نەك بە مانای (يَقرَؤُهُ)، دەیخوێنێتەوە، کە دەفەرموێ : ﴿وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامٗا وَرَحۡمَةً﴾، (وَمِن قَبۡلِهِۦ)، واتە: (مِنْ قَبلِ القُرآنِ)، یانی: لە پێش ئەویشدا کتێبەکەی مووسا هەبوو، کە تەوراتە، تەوراتیش هەر بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە قورئان ڕاستە بۆ پێغەمبەری خاتەم هاتوە ﷺ، وەك چۆن خوا تەوراتی بۆ مووسا ناردوەو، ئینجیلی بۆ عیسا ناردوەو، (صُحُف)ی بۆ ئیبراهیم ناردوەو، زەبووری بۆ داوود ناردوەو، کتێبەکانی دیکەی بۆ باقی پێغەمبەران ناردوون، موحەممەد ﷺیش هەر بە هەمان شێوە کتێبی لە خواوە بۆ هاتوە.

کە دەفەرموێ : ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾، وەك دەبینین: سەرەتا خوا بە تاك (فرد) دەیهێنێ : ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، بەلاّم دوایی خوای شارەزا بە

کۆ (جمع) باسی دەکات، هۆیەکەشی ئەوەیە کە وشەی (مَن)، (صَالِحٌ للمُفْرَدِ والجَمْعِ)، (مَنْ) بۆ تاکیش‌و بۆ کۆش دەبێ، بۆیە کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، یانی: ئایا کەسانێك ئاوابن، وەك کەسانێك وان، کە لە گومڕایی دابن.

کە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، مانای کۆی لێگرتوە، پێشێ مانای تاکی لێ گرتبوو، وشەی (مَنْ)یش بۆ هەردووکیان دەبێ، دەفەرموێ: ئا ئەوانە، واتە: هەم موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خاتەم‌و، هەم ئەوانەی وەك ئەو دەکەن‌و بە ڕێی وی دا دەڕۆن، ئنجا دەبن بە کۆ، ئا ئەوانە بڕوای پێ دێنن، ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، یانی: بڕوا بە قورئان دێنن، بڕوا بەو فەرمایشتەی خوای پەروەردگار دێنن، کە شایەدە بۆ سروشتی ساغ، شایەدە بۆ ئەو حەقیقەتانەی کە لە سروشتی ساغی مرۆڤەکاندا هەن.

کە لە پێشیشیەوە کتێبەکانی دیکەی خوا بوون، بە تایبەتی تەوڕاتی مووسا ؈ کە هەم پێشەوا بووە بۆ خەڵکەکەو ڕێی پێشانداون‌و، هەم مایەی ڕەحمەت‌و بەزەیی خوا بووە بۆیان.

﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ﴾، هەر کەسێکیش کوفر بکات بە قورئان لە حیزبەکان لەو پێڕو تاقمانەی لە دژی قورئان کۆدەبنەوە، ﴿ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ﴾، ژوانگەی ئاگرە، (مَوعِد)، (ظَرف)ە، بۆ تێدا جێبەجێ کردنی بەڵێنێك، یانی: بەڵێنگە، ئنجا هەم بە ناوی شوێن دێ، هەم بە ناوی کات دێ، واتە: ئەو بەڵێنگەیەی کە چاوڕێیان دەکات، بریتیە لە ئاگر، ئاگری دۆزەخ چاوڕێی ئەوانە، واتە: ئەو سەرەنجامەی کە چاوڕێی ئەوان دەکات، دەڵێ: (أُطلِقَ هُنَا عَلَى المَصيرِ السائِرِ إِلَيْه)، ئەو سەرەنجامەی کە بۆی دەڕۆن، بریتیە لە ئاگر، خوا پەنامان بدا.

وشـەی: ﴿ٱلۡأَحۡزَابِ﴾، لە قورئـان دا بەکارهـاتوە بۆ ئەو پێرو دەستەو تاقمانەی کە لە دژی پێغەمبەران کۆ دەبنەوە، بۆ وێنە لە سوورەتی (ص)دا دەفـەرموێ: ﴿كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ ذُو ٱلۡأَوۡتَادِ ١٢ وَثَمُودُ وَقَوۡمُ لُوطٖ وَأَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَحۡزَابُ ١٣﴾، (دیـاره باسـی کـافرەکانی سەردەمی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات)، دەفەرموێ: لە پێش وانیشدا گەلی نووحو، گەلی عادو، فیرعەونی خاوەن قەڵای بەرز بەرز، (یاخود فیرعەونی کە خاوەن سینگو گوڵمیخ بوو و خەڵکی چوار مێخە دەکێشا)، (ئەوانەش بێبڕوا بوون)و، گەلی ثەموودو، گەلی لووط و، خاوەنانی باخو درەختە چڕو پڕەکە (ئەوانەش هەموو بێبڕوا بوون)، ئا ئەوانە ئەو حیزبو تاقمو دەستانەن کە لە دژی پێغەمبەران کۆبوونەتەوە، وەك خاوەنی (مُختار الصِّحَاح)[1] دەڵێ: (الأَحْزَابُ: الطوائفُ الَّتِي تَجتَمِعُ عَلَى مُحَارَبَةِ الأَنْبِيَاءِ)، (أحزاب)، بریتین لەو پێرو تاقمانەی کە بۆ دژایەتیی پێغەمبەران کۆدەبنەوە.

لـە کـۆتایی دا دەفـەرموێ: ﴿فَلَا تَكُ فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُۚ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ١٧﴾، واتە: لە بارەی قورئـانەوە لە دوو دڵـیی دا مەبە، بە دڵنیایی ڕاستە لە پەروەردگارتەوەیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن.

دەشگونجێ ڕاناوی (مِنْه)، بگەڕێتەوە بۆ (موعد)، واتە: لە دیدارو ژوانگەی خـوادا دوو دڵ مەبە چونکـە بـە مسۆگـەریی لەلایـەن پەروەردگـارتەوە دێو چەسپاوو ڕاسـتە، بەڵام زۆربەی خەڵکـی هەر نایانەوێ بڕوای پێبێنن، یـانی: زۆربەی خەڵکی حەز لـە بڕوا هێنـان بە قورئان، یـان ڕۆژی دوایی ناکەن، ئەگەر نا یەکیان لەسەر بەڵگە نەکەوتوە.

لە کۆتـایی ئەم دەرسەدا ماوەتەوە بڵێم: کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، ئایا کەسێك کە لەلایەن پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگەیەکی

---

١) ص ١٣٣.

ڕوون و ئاشکرا بووە، وەك کەسێك وایە کە سەرگەردانە؟! لێرەدا وشەی ﴿ بَيِّنَةٍ ﴾، وەك گوتمان، مەبەست پێی ئەو فیتـرەت و سروشتەیە کە خوا وای دروستکـردوە: خـاوەنی خۆی کە خوای پەروەردگارە، بیناسێ و بیپەرستێ و، بەهـۆی پەیوەنـدیی لەگـەڵ خـواوە، ئۆخـژنی بۆ بێ.

هەندێکیش گوتوویانە : ﴿ بَيِّنَةٍ ﴾، مەبەست پێی قورئـانە.

بـەڵام ئێمـە مانای یەکەممـان هـەڵبـژارد.

شـایانی باسیشــە زانایـانی ئیسـلام دەڵـێن: شـەش جۆرە بەڵگـە ﴿ بَيِّنَةٍ ﴾، هـەن، هـەڵبەتە ئەو کاتە وایـانگوتوە، بەڵام ڕەنگـە ئێسـتا بگونجێ پۆلێن بکرێن بـۆ زیـاتریش، دەڵێن: (البَيِّنَـةُ: هِيَ البُرْهَـانُ فِـي العَقلِيَات، وَالنَّصُ فِـي النَّقْلِيَـات، وَالخـارِقَةُ فِي النُّبُوَاتِ وَالغَيبيـات، وَالتَجْرِبَةُ فِي الحِسِّيات، والشَّهَادةُ فِي القَضائياة، وَالإِسْتقراءُ فِي الكُلِيَّات).

بەڵگەیـان پۆلـێن کـردوە بۆ شـەش جـۆر :

یەکـەم : لە ڕووی عـەقڵییەوە دەبێ بەڵگەت هەبێ، (بۆ نموونـە : (٢ + ٢ = ٤)، ئـەو مەسـەلەیە، هـەر لـێی وردبـەوە، عـەقـڵ تۆ دەگـەیەنێتـە ئەو ئەنجـامە).

دووەم : ئەگـەر شـتێکی نەقڵـییت هێنـا، دەبـێ دەق بێنـی، (کـە گوتـت خـوا وای فـەرمووە، پێغـەمبـەر ﷺ وای فـەرمووە، لـێت دەپرسـرێ: کـام ئایـەت؟ لـە کـام سـوورەت؟ کـام فەرمایشـتی پێغـەمبـەر ﷺ؟ سـەنەدەکـەی چـۆنە؟).

سـێیـەم : ئنجـا کە باسی پەنهان و پێغـەمبـەرایەتییت کـرد دەبـێ موعجیـزە بێنی، (دەبـێ موعجـیزە هـەبێ لەسـەر ئـەوە کـە ئـەو کەسـەی داوای پێغـەمبەرایەتیـی دەکات، ڕاسـت دەکـات).

چـوارەم : شـتێك کـە بەرهەسـت بێ، دەبـێ بە تـاقی کردنەوە بسـەلمێنرێ، (بـۆ وێنـە: تۆ دەڵـێی: ئاو لە پلـەی سـەد (١٠٠) دەکوڵـێ، فـەرموو ئـەزموونی بکـە، یاخـود لە پلـەی چـواری ژێر سفر (- ٤ ٪) دەیبەستێ، فەرموو ئـەزموونی بکــە، دەبـێ بە تاقی کـردنەوە دیـار بـێ).

پێنجەم: لە بواری کێشمە کێشو دادگایی دا، دەبێ شایەدیی هەبێ.

شەشەم: لە شتە گشتییەکاندا، دەبێ (إستقراءُ)، واتە: تێوەڕامانی چەند حاڵەتێکی جوزئی بۆ دەرهێنانی بنچینەیەکی گشتی، هەبێ.

زانایان ئاوا بەو شێوەیە بەڵگەکانیان پۆلێن کردوون، کە وەك گوتم ئێستا دوای ئەوەی تەکنۆلۆجیا زۆر بەرەو پێشەوە چووە، لەوانەیە بگونجێ کە جۆرە بەڵگەی دیکەش بێنن، کاتی خۆی کەی زانیویانە کە دەنگو وێنە تۆمار دەکرێ؟ کەی زانیویانە کە فەحصی (dna)ی هەیە؟ کەی زانیویانە کە پەنجەمۆر هەیە؟ یانی: ئێستا لە ئەنجامی بەرەو پێشچوونی زانستدا، بە تەئکید بەڵگەکان زۆر زیاتر بوون بۆ ئیسپاتو سەلماندنی ڕاستییەکانو، بۆ جۆراو جۆرتر بوونی بەڵگەکان.

مەسەلەی پێنجەم: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أُولَٰئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ الْأَشْهَادُ هَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿١٨﴾ الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ ﴿١٩﴾ أُولَٰئِكَ لَمْ يَكُونُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ۘ يُضَاعَفُ لَهُمُ الْعَذَابُ ۚ مَا كَانُوا يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ وَمَا كَانُوا يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الْآخِرَةِ هُمُ الْأَخْسَرُونَ ﴿٢٢﴾﴾، خوا ﷻ لەو پێنج ئایەتە موبارەکەدا، پێناسەی هاوبەش بۆ خوا دانەران دەکات، بە نۆ لە هەڵوێستو سیفەتو ڕەفتارە خراپەکانیان، پاشان نۆ جۆرە سزاشیان بۆ بڕیار دەدات، ئێمە بڕگە بڕگە بە شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی ئەم پێنج ئایەتەدا دەچینە خوار، وە لە چواردە بڕگەدا دەیانخەینە ڕوو:

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتەکانی (١٨ – ٢٢) لە چواردە برگاندا

**برگەی یەکەم**: - ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾، کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە درۆ لەسەر خوا دەکات، دەڵێ: (الإفْتِرَاءُ: هو الكَذِبُ عَمْداً مُتَقَصِّدَاً)، (إفْتِرَاء) بریتیە لەوە کە کەسێك درۆ بکاتو، بشزانێ درۆ دەکات بە ئانقەست، جاری وایە کەسێك درۆ دەکات، بەڵام لە شتێکدا بەهەڵەدا چووە، بەڵام (إفْتِرَاء) ئەوەیە کە درۆ بکاتو بشزانێ کە درۆ دەکات، واتە: بە ئانقەست درۆیەکە بکات، بە کوردیی دەڵێن: (درۆ هەڵبەستن)، درۆی بۆ هەڵبەست.

ئنجا لێرەدا خوا دەفەرموێ: کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە درۆ لەسەر خوا هەڵدەبەستێ، ئەمە دوو سیفەت :

١ـ کێ ستەمکارترە لە کەسێك.

٢ـ کە درۆ لەسەر خوا هەڵدەبەستێ،

کەواتە: خوا پێناسەی کردوون بە: ستەمکارترین، پێناسەشی کردوون بە: درۆ هەڵبەستن.

**برگەی دووەم**: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ﴾، واتە: ئا ئەوانەی کە ئاوا ستەمکارانە درۆ لەسەر خوا هەڵدەبەستن، کە مەبەست لە درۆ لەسەر خوا هەڵبەستن، ئەوەیە کە هاوبەشی بۆ دادەنێن، دەڵێن: خوا هاوبەشی هەن، کە ئەوە درۆ هەڵبەستنە لەسەر خوا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ﴾، ئا ئەوانە ڕادەنوێنرێن لەسەر پەروەردگاریان، دەڵێ: {العَرْضُ: الظُّهورُ، عَرَضَهُ: أَظْهَرَه، وإذا عُدّيَ بحرف (على) أفاد معنى الإحضار بالإرادة}، (عَرْض)، یانی: ئاشکرا کردن، ئاشکرا بوونو دەرکەوتن، دەگوترێ: (عَرَضَهُ)، واتە: ئاشکرای کرد، ڕاینواند، پێشانیدا، ئنجا ئەگەر وشەی (عَرَض)، بە پیتی (على)

تەعــەددا بكـات بـۆ (مفعـول)، ئـەو كاتـە مانــای ئامادەكــردن دەگـەیەنــێ بــە ویسـتنەوە، (مَعْرَض) پێشـانگا، بۆیە وای پێی دەگوتـرێ، چونكـە ئـەو شـوێنەیە كە خـەڵـك ئامــادەی دەبــێو شـتی لـێ ڕادەنـوێنــرێ بـۆ خەڵـك، كـە تەماشــای بكـەن، ئنجـا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ : ئا ئەوانـەی بەم شـێوەیــەن : درۆ لەسەر خـوا هەڵدەبەســتن، ئــەو سـتەمكــارانە لــە ڕۆژی دواییــدا، لەســەر پەروەردگــاریان ڕادەنـوێنـرێنو دەهێنرێنە پێشێ.

ئەوەش ســزای یەكەمیـان.

<u>**بـڕگـەی سـێـیـەم**</u> : ﴿ وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَـٰدُ هَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾،

شـایەدەكـان دەڵێــن: ئا ئەوانـە بوون كە درۆیـان لەسەر خوا دەكـرد، كەواتـە : كە شـایەدەكــان دەهێـنــرێن، شـایەدەكــان كـێن؟ فریشـتەكــانن بــە پلــەی یەكــەمو، پێغـەمبــەرانن (علـیهم الصـلاة والسـلام)و، هــەر كەسـێكی دی كـە شـایسـتەی ئەوەبێ شـایەدیی بە هەق بدات لـە ڕۆژی دواییـدا، بەسـەر ئـەو هـاوبەش بـۆ خـوا دانەرانو ئەو كـەسـانەوە كە درۆ لەسەر خوا هـەڵدەبەستن، شـایەدەكـان دەڵـێن: ئا ئەوانە بوون كە درۆیـان لەسـەر پەروەردگاریان هەڵدەبەسـت، واتـە: درۆیەكیـان دەكرد، هەڵیانبەسـتبوو، كە گوایـە: خــوا هاوبەشـی هــەن. (أَشْهَاد جَمْع شَـاهِد بِمَعْنَى حَاضِـر، أَو جَمْعُ شَهِيد بالـمُخْبِر بِمَا عَلَيْهِمٍ مِنَ الحَقّ وَهـو الـمَلاَئِكَة)، (أَشْـهَاد) یـان كـۆی (شـاهد)ە، واتــە: ئامــادەبوو، یـان كـۆی (شَـهید)ە، بـە مانـای هەواڵدەر، واتە: كەسێك كە شایەدیی دەدات، واتـە: ئەوانـەی كـە ئامـادە بـوون لـەو مەیـدانو لـەو گۆڕەپانـەدا، ئەوانـە ڕادەنــوێنرێن، لەسـەر پەروەردگـاریان، یاخــود ئەوانــەی كە هــەواڵ دەدەنو شایەدیی دەدەن كـە مەبەسـت پێـی فریشـتەكانن بـە پلەی یەكـەم، ئنجا دەڵێن: ﴿ هَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾، ئـا ئەوانـە بوون كە درۆیان لەسەر پەروەردگاریان دەكــرد.

ئەوەش ســیفەتی خــراپی ســێیەمیان، درۆ لەســەر خـوا كردنەكەشــیان ئـەوە بوو: كە گـوتوویـانە: خـوا هاوبەشی هەنو، ئـەوان، تكـا كـارانێكـن، تكـامــان بـۆ دەكـەن لـەلای خــوا.

هەڵبەتە شایەدیی لە سەردانی شایەدەکانییش، سزادانی دووەمی خوای دادگەرە بۆیان کە لەو ڕۆژە هەستیارو قەرەباڵغەدا، ئاوا ناویان دەزڕێنرێ!

**برگەی چوارەم** : ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، وشەی ﴿أَلَا﴾ ئامرازی ئاگادار کردنەوەو وریاکردنەوەیە، خوا دەفەرموێ: ئەها! نەفرینی خوا لەسەر ستەمکاران بێ، لێرەدا باسی سزای سێیەم دەکات، کە بەسەریان دا دەچەسپێ، کە بریتیە لە نەفرین لێکرانیانو، باسی سیفەتی خراپی چوارەمیشیان دەکات کە ئەوانە ستەمکارنو، لە ستەمکارییدا ڕۆچوون، هی پێشێ فەرمووی : کێ لەوانە ستەمکارترە؟ بەڵام لێرەدا دەفەرموێ : لە ستەمکارییدا ڕۆچوون، یانی: پێناسەی تەواوی ستەمکارییان بەسەردا چەسپیوە، ئەوانە نەفرینی خوایان لێبێ.

نەفرین (اللعنة)، دەڵێ: (اللَّعْنُ: الطَّرْدُ وَالإِبْعَادُ عَلَى سَبِيلِ التَّحْقِير)، (لَعْن) بریتیە لە دورخستنەوەو دەرکردن، بە شێوەی بێڕێزیو سووکایەتیی پێکردنو زەبوون کردن.

**برگەی پێنجەم** : ﴿ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، ئەوانەی کە خۆیان لادەدەنو، خەڵکیش لادەدەن لە ڕێی خوادا، ئەمەش سیفەتی خراپی پێنجەمیانە، دەڵێ: (صَدَّ) بە مانای (انْصَرَفَ) و بە مانای (صَرَفَ)ش، دێ، یانی: بە مانای (امْتَنَعَ) و (مَنَعَ)دێ، (صَدَّ عَن سبيل الله)، واتە: خۆی لە ڕێی خوا لایداو ئامادە نەبوو، ڕێی خوا بگرێتە بەر، یاخود غەیری خۆی لە ڕێی خوا لاداو لە ڕێی خوای پەروەردگاری دوور خستەوە، دیارە ئەوانەش هەردوو سیفەتەکەیان تێدا هەن.

**برگەی شەشەم** : ﴿وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًا﴾، واتە: دەیانەوێ کە ڕێبازی خوا لارو خوارو خێچو بێزراو بخەنە بەرچاو، ئەمەش سیفەتی خراپی شەشەمیانە.

(يَبْغُونَهَا) دەڵێ: (بَغَى: ضَالَّتَهُ يَبْغِيهَا بُغَاءً: طَلَبَهَا، وَبَغَى لَهُ وَأَبْغَاهُ الشيءَ: طَلَبَهُ لَهُ)[١] (بغى ضَالَّتَهُ) واتە: کەسێك شتێکی لێ ون بووبێو

---

١) مختار الصحاح، ص ٥٩.

بە دوایدا بگەڕێ بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە، (وَبَغَى لَهُ وَأَبْغَاهُ الشيءَ)، واتە: ئەو شتەی بۆ داوا کرد، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ﴾، یانی: لاریی (عِوَج)، بۆ ئایینو بەرنامەی ڕاستو دروستی خوا، داوا دەکەن.

وشەی: (عِوَج)، وەك پێشتریش باسمانکردوە: بە مانای لاریی دێ لە شتی مەعنەویی دا، وەك (عَوَج) لاریی‌و خواریی دەگەیەنێ لە شتی بەرهەستو ماددیی دا، یانی: (يَطْلُبُونَ العِوَجَ وَالإِنْحِرَافَ لِدِينِكُمْ) واتە: دەیانەوێ دینەکەتان نارێكو لارو خوار بخەنە بەرچاو. (يَبْغُونَ أَنْ تَصِيرَ سَبِيلُ اللهِ عَوْجَاءَ فَعُلِمَ أنها مستقيمة، لأنهم يريدون أن يتَّبِعَ النبيُّ دينَهم).

واتە: دەیانەوێ ئایینو بەرنامەی خوا لاروخوارو خێچ بکەن، کەواتە: ئایینەکە لە خودی خۆیدا ڕێكو ڕاستە، بەڵام ئەوان دەیانەوێ لارو خواری بکەن، لەبەرچاوی خەڵك.

ئەویش بەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە دوای ڕێبازە لارەکەی ئەوان بکەوێ‌و، لە ئەنجامی ئەوەدا، ئەو ڕێبازو ئایینو پەیامەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی کە لە خودی خۆیدا ڕاستو دروستە، لارو خوار دەکەوێتە بەرچاو.

هەڵبەتە ئەمە ئەوە دەردەخات کە دوژمنانی ئیسلامو، ناحەزانی قورئانو ئیسلام، هەمیشە دەیانەوێ، ئایینو پەیامی خوای پەروەردگار، ڕووە ڕاستەقینەکەی خۆی کە ڕێكو ڕاستەو هاوسەنگە، لەگەڵ عەقڵی سەلیم، لەگەڵ فیطرەتی ساغدا دەگونجێ، دەیانەوێ ئەو حاڵەتە سروشتیی‌و ئاساییەی نەهێڵن‌و، بە شێوەیەك پێشانی بدەن کە لە پێش چاوی خەڵك ببێزرێ، وەك ئێستا لەم ڕۆژگارەدا، کە دوژمنانی ئیسلام لە پەنای هێرش کردنە سەر کەسانی توندڕەوو لادەرو تێپەڕێنەر لە ئیسلامو لە قورئانو لە سوننەت، کە هەڵسوکەوتو کردارەکانیان هەمووی پێچەوانەی ڕووحی شەریعەتو، پێچەوانەی دەقەکانی قورئانو سوننەتە، لە پەنای ئەوانداو، بە بیانووی سەرو گوێلاك کوتانی ئەوان، دێن ئایینو شەریعەتی خوای پەروەردگار بەوە تۆمەتبار دەکەن، کە لەگەڵ ترساندنو تۆقاندنو زەبرو زەنگو خوێن ڕشتنی بە ناهەق دایە.

**بڕگـــەی حـەوتــەم :** ﴿ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾، ئـەوە دیـارە سیفەتی خراپـی حەوتەمیـانە، واتە: ئەوانـە بە دواڕۆژیش بێبـڕوان، واتە: بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیـە.

**بڕگـەی هــەشتـــەم :** ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەمـەش ســزای چــوارەمی خـوای بــاڵا دەســتە بۆیــان، یــاخود شــێوەی مامەڵـەکردنی دادگـەرانەی خوایە لەگـەڵیاندا، دەفەرموێ: ئـا ئەوانـە لـە زەویـدا دەستەوەسـانکەر نەبـوون، واتە: نەیـاندەتوانی لە دەســتەڵاتی خوا دەربــاز بـن و قوتــاربن، کــاتێـك کـە خــوا بیــەوێ ســزایان بــدات، (المُعْـجِزُ: مَـنْ يُفْلِـتُ مِمَّـنْ يـروم إضـراره)، (مُعْجِـز) کەسێکە کـە بتوانــێ لـە دەسـتی ئـەو کەسـە ڕا بکـات، کـە بیـەوێ زیـانی پێبگەیـەنێ و سـزای بـدات و بیگـرێ، ئنجـا کـە بتوانــێ ڕا بکـات، مانــای وایـە بەرانبـەرەکەی خۆی دەســتەوەســتان کــردوە.

**بڕگـــەی نـۆیـــەم :** ﴿ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ﴾، ئەمـە سـزای پێنجەمیانە دەفـەرموێ: لە خوار خواوە (جگە لـە خـوا) هـیـچ سـەرپەرشــتیارو هیـچ دۆسـت و نیزیك و خەمخۆریان نەبوون، کـە دەفـەرموێ : ﴿ مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: جگـە لە خـوا، کە دەفـەرموێ : ﴿ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ﴾، ئەو ﴿ مِّن ﴾ە، کە چووەتـە سـەر ﴿ أَوۡلِيَآءَ ﴾، بـۆ جەختکــردنەوە زیـاد کـراوە، یـانی: هـیـچ جـۆرە دۆســت و مشـوورخۆرێکــیان دەســت ناکــەوێ، (أَي مَـا كَـانَ لَهُـمْ فَـرْدٌ مِـنْ أَفْـرَاد جـنس الأولياء) واتە: هیـچ تاکێك لە تاکەکان دۆسـت و پشـتیوان و مشوورخۆریـان نیـە، جگـە لــە خــوا، ئنجــا خواشــیان لــە خۆیــان تــووڕە کــردوە، بۆیــە خــوا سـەرپەرشتییـان ناکات و، مشـووریان لـێ ناخـوات و بە بەزەیی نابـێ لەگـەڵـیـان.

**بڕگـــەی دەیـــەم :** ﴿ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُ ﴾، ئـا ئەوانـە سـزایان بـۆ دووقـات دەکرێتـەوە، ئەمە سـزای شەشــەمە، ســزاو ئـازاریــان بـۆ دوو قـات دەکرێتـەوە، دەڵێ: (الضِّعف: أن يضمّ إلـى الشـيء مثلـه)، (ضِعْف) بریتیـە لـەوە کـە شتێك

وێنــەی خــۆی بدرێتــە پــاڵ، وێنــەی خــۆی ڕەگــەڵ بخــرێ، واتــە: دوو قــات بکرێتــەوە.

**بـڕگـــەی یـازدەیـــەم** : ﴿مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ﴾، ئەوانـە نەیانـدەتوانی ببیسـتن، ئەمـە سیفەتی هەشتەمی خراپیانـە، ﴿مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ﴾، دوو واتــای هــەن :

أ/ واتە: نەیاندەتـوانی گـوێی بۆ بگـرن، هێندە ڕقیـان لەو قورئانـە بـوو، هێنـدە لـێی بێــزار بــوون.

ب/ یاخــود مەبەســت ئەوەیــە کــە نەیانــدەتوانی بــە گوێــی دڵ بیبیســتن و وەریبگـرن و، ئەو هەقـە بناســن.

**بـڕگـەی دوازدەیـــەم** : ﴿وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ﴾، ئەمـەش سیفەتی نۆیـەمی خراپیــانە، واتــە: هــەروەهــا نەشیاندەبینــی، بینینێـك كـە هـەق ببیـنن، نـەك بیـنینـێکی بـە چــاو، کـە مرۆڤـو ئــاژەڵ تێیدا یەکسـانن، دەڵــێ: (أَي الإِبْصَارَ الــمُوصِلِ إِلــى الوَحْدَانِيــة) بینینێــکی گەیــەنەر بــە تاکێتیــی، تەنیــا پەرسـتــراوێتیی خـوا ﷻ، ئەمە وەك ئەو دوو ئایەتـەی سـووڕەتی (الجاثیـة)یە، کە دەفەرموێ : ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٨﴾﴾، واتــە: ســزای ســەخت بـۆ هــەر زۆر درۆکەرێکــی گوناهبــار، کــە ئایەتــەکانی خــوا دەبیســتــێ بەســەریدا دەخوێنـرێنـەوە، دوایی خۆ بەزلـگرانــە لەسـەر خۆ بـەزلـگـریی خۆی بـەردەوام دەبــێ، وەك هەر نەیبیستبن، موژدەی پــێ بـدە بە ئـازارێکی بە ئـێـش.

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ﴾ هەڵبەتــە کــە ڕانــاوی عاقــڵانی بــۆ بــت و صەنەمەکــانیان و پەرســتــراوەکــانیان، بەکــارهێنــاوە، مەبەســت ئەوەیە کە بە پێـی عەقــڵ و وەهمــی بــت پەرستەکان،

کە بتو صەنەمەکانی خۆیان بە خاوەن عەقڵو هەست دەزانی، خوای پەروەردگار بە پێی وەهمی ئەوان، بەپێی عەقڵی پووچی ئەوان ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە.

دەشگونجێ مەبەست لەو پەستراوانە، بتو صەنەمو شتە بێ گیانەکان نەبن، بەڵکو مەبەست پێیان طاغووتو فیرعەونەکان بێ، ئەوانە کە تەقدیس دەکرێنو لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، چ لە بەرگی دیندا، چ لە بەرگی سیاسەتدا، لە هەر بەرگێك دابێ، کەواتە: مەرج نیە پەرستراوەکان تەنیا دارو بەردو ماددەی بێ ژیان بن.

**برگەی سێزدەیەم**: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن کە خۆیانیان لە دەست داوە، خۆیانیان لە کیس چووە، خۆیانیان دۆڕاندوە.

ئەوەش سزای حەوتەمیان، ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴾، ئەوەی هەڵیان دەبەست، لێیان ون بوو.

ئەمەش سزای هەشتەمیان.

ئەوەش کە هەڵیان دەبەست، بریتی بوو لەوە کە ئەوانە هاوبەشی خوانو، پەرستراونو لە خوامان نیزیك دەکەنەوەو، شەفاعەتمان بۆ دەکەن، بەڵام لە قیامەت هەموویان ون دەبنو بێ سەرو شوێن دەبن، بۆچی؟ چونکە ئەوانە هەر لە خەیاڵی هاوبەشدانەرەکان دا، پەرستراو بوون، ئەگەرنا ئەوانە لە واقیعدا، جگە لە دروستکراوێکی بێدەسەڵاتی خوای بەرزو مەزن، هیچی دیکە نەبوون.

کە دەفەرموێ: ﴿ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾، سوودیان نەبینی لەوەدا کە ڕێی ڕاست بگرن، خۆیانیان لەدەست چوو، ئنجا کەسێك کە بازرگانیی دەکات، ئەگەر دەست مایەکەی لە دەست بچێ، ئەوە مانای وایە، هیچ کات ناتوانێ قازانج بکات، چونکە بەهۆی دەست مایەوە قازانج بە دەست دێنێ، بۆیە ئەگەر ئینسان دەستمایەکەی لە دەست بدات، ئەو قازانجەی کە دەبوو بیکات،

بێگومان پێشتر ئەوی لە دەست داوە، (وَضَلَّ عَنْهُم: ضَاعَ عَنْهُمْ، والضَّلاَلُ: خَطَأ الطَّرِيق المَقْصُود)، (ضَلَّ) هەم بە مانای ون بوون دێ، هەم بە مانای بە هەڵەداچوون دێ، (ضَلَّ عَنِ الطَّرِيق)، واتە ئەو لە ڕێیە کە ون بوو، (ضَلَّ الطَّرِيق) واتە: ڕێیەکەی ون کرد، واتە: بە ڕێیەکەی نەزانی.

**بڕگەی چواردەیەم**: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە هیچ گومانی تێدا نیە، کە ئەوانە لە دوا ڕۆژدا، هەر ئەوانەن زۆر زیانباران، ئەوپەڕی زیانبارانو زیان لێکەوتووان ئەو جۆرە کەسانەن.

ئەمەش سزای نۆیەمو کۆتاییانە.

وشەی ﴿جَرَمَ﴾، ئاوە بە مانای (محالة) (أي: لا محالة)، یان بە مانای (بُدّ) (أي: لا بُدّ)، واتە: بێگومان، بە دڵنیایەوە ئەو شتە ئاوایە.

ئنجا لێرە لە سووڕەتی (هود)دا، دەفەرموێ: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ٢٢﴾، واتە: هیچ گومانی تێدانیە بە دڵنیاییەوە، ئا ئەوانە لە دواڕۆژدا ئەوانە زیانبارترینن، بەڵام لە سووڕەتی (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ١٠٩﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە ئەوانە لە دواڕۆژدا زیانبارن.

بۆچی لێرە دەفەرموێ: (الأخسرون)؟ لەوێ دەفەرموێ (الخاسرون)؟

(الإسكافِي) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی: (درة التنزيل وغرة التأويل)[1]، ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێ: لەبەر ئەوەی لێرەدا {لە سووڕەتی (هود)دا} پێشی دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ١٩ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَمْ يَكُونُوا۟ مُعْجِزِينَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ

---

١) ص ١٥٧ و ١٥٨.

ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلْعَذَابُ مَا كَانُوا۟ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُوا۟ يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ئەوانە زیانبارترینن، کەواتە: ئەوانە خەڵکیان لە ڕێی خوا لاداوەو، خۆشیان لە ڕێ لایانداوەو، پاشان سزایان بۆ دووچەند کراوەتەوە، خەڵکیان گومڕا کردوەو، خۆشیان گومڕا بوون، بۆیە شایستەی ئەوە بوون کە زیانبارترین بن.

بەڵام ئایەتەکەی سووڕەتی (النحل) ئەوەی لە پێشیەوە هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾، واتە: ئا ئەوانە بە هۆی ئەوەوە کە ژیانی دنیایان هەڵبژاردو خۆشتریان ویست بەسەر دواڕۆژدا، خواش ڕێنمایی کەسانی بێبڕوا ناکات، واتە: لە سووڕەتی (النحل)دا، تاوانێکی وایان نەدراوەتە پاڵ، کە پاساوی ئەوەبێ، سزایان بۆ چەند قات بکرێتەوەو، سەرەنجامیش بە زیانبارترین پێناسە بکرێن، بەڵکو شتێك باسکراوە کە مایەی ئەوەیە پێی سزا بدرێن، بۆیەش تەنیا بە زیانبار پێناسە کراون، نەك بە زیانبارترین.

دیارە کتێبی خوا هیچ وشەیەکی کەمو زیادی تێدانیە، لە (هود)دا کە فەرموویەتی: (الأخسرين)، هۆیەکەی ئەوە بووە کە گوناهو تاوانەکانیان بایی ئەوەندە بوون کە زیانبارترین بن، بەڵام لە (النحل)دا کە دەفەرموێ: (خاسرين)، گوناهو تاوانەکانیان هەر بایی ئەوە بوون، بەوە وەسف بکرێن، کە تەنیا زیانبارن.

مەسەلەی شەشەم: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخْبَتُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾، بێگومان ئەوانە بڕوایان هێناوە، (واتە: بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، بە خوا ﷻ، بە فریشتەکانی، بە پێغەمبەرانی، بە کتێبەکانی، بە ڕۆژی دوایی)و، کردەوە باشەکانیشیان ئەنجام داون، واتە: هەموو ئەو خەسڵەتو

كـردەوانەی كە باشـن، بە پێی توانـا ئەنجامیـان داون، ﴿وَأَخْبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ﴾، بەرەو پەروەردگاریشـیان نەرمو هێمنو ملكەچ بوون، ئا ئەوانە هـاوەڵی بەهەشـتنو، بە هەمیشـەیی تێیدا دەمێننەوە، لێرەدا دەبینین كە خوا ﷻ، مسـوڵمانانی بە سـێ سیفەتی بنچینەیی پێناسـە كردوون:

١) ﴿ءَامَنُواْ﴾: واتـە: بڕوایـان هێنـاوە بە هـەموو ئەو شـتانەی كـە پێویستە بڕوایـان پـێ بهێنـرێ.

٢) ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾: ئەوانەی كـردەوە باشـەكانیان ئەنجامـداون.

٣) ﴿وَأَخْبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ﴾: بـۆ پەروەردگـاریان ملكـەچو نـەرمو ئـارامو هێمـن بوون.

وشـەی (إِخبـات) لـە (خَبْت)ەوە هـاتوە، (الخَبْتُ: الـمُطْمَئِنُّ مِنَ الأَرْضِ، وَأَخْبَتَ: قَصَدَ الخَبْتَ، الإِخْبَاتُ: اللِّينِ وَالتَّوَاضُعُ) وشـەی (أخبتوا لله) واتە: بۆ خـوا نـەرمو ملكـەچ بـوون، تەسلیم بـوون، (خَبْت) بریتیـە لـە زەوییـەكی نـزم، دەگوتـرێ: (أَخْبَتَ)، واتـە: (قصـد الخَبْتَ)، یـانی: ئـەو كەسـە ویستی بچێ بـۆ شـوێنێكـی نـزم، وەك دەگوتـرێ: (أَسْـهَل) واتـە: ویسـتی بچـێ بـۆ دەشت، (سـهل)، دەگوتـرێ: (أَنْجَـد)، یـانی: ویستی بچێ بۆ شوێنێكی بەرزایی، چونكـە (نَجْـد) واتە: شـوێنی تەپۆڵـكـەو بـەرز.

هـەروەها (أخبتوا إلـى ربهـم)، واتـە: فەرمانبـەریی پەروەردگـاریان كـردوەو بۆی ملكـەچ بـوونو، لاوو جیمییـان لـە بەرانبـەری دا نـەبووە، لـە زمـانی عەرەبییـدا دەگـوترێ: (أَخْبَتَ لَهُ، وَأَخْبَت إِلَيْهِ)، هەردووكـیان بەكـاردێن، واتـە: بـڕواداران لـە جیـاتی خۆ بە زلگریـیو خـۆ بەرزكردنـەوەو خۆ پـێ زۆریـی، لە بەرانبـەر خـوادا خۆیـان پـێ كـەمو بچووكەو، نەرمو ئـارامو هـێمنـن، لە خزمـەت خـوادا ﷻ.

<u>مەسـەلـەی حـەوتەمو كۆتـایی</u>: خـوا ﷻ بـەراوردێك دەكـات لـە نێـوان كۆمەڵـی مسوڵمـانانو كۆمـەڵی بێبـڕواياندا، دەفـەرموێ: ﴿مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ كَٱلْأَعْمَىٰ

وَٱلْأَصَمِّ وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾﴾، واتـــــــە: وێنـەی ئەو دوو کۆمەڵە (واتە: وێنـەی مسـوڵمانانی بـڕواداری کـردەوە باشـی بـۆ خـوا ملکـەچو، بێبـڕوایانی درۆ هـەڵبەسـتەری خۆ بەزلگـرو تاوانبـار)، وەك کـوێـرو کەڕو، بینـەرو بیسـەر وایـە، واتـە: بێبـڕوایان کـوێریشـن کـەڕیشـن، بـڕوادارانیش بینەریشـن بیسـەریشن، دوایـی دەفـەرموێ: ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا﴾، ئـایا حاڵو سیفەتیان وەك یەکـە؟ (مَثَلْ)، بـە مانـای سیفەتو حـاڵ دێ، ئایـا حـاڵو سیفەتیـان یەکسانە؟ ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾، ئایا بیـرناکەنەوە، پەنـد وەرناگـرن، ئـەم دوو کـۆمەڵـە ناگونجـێ نە لە دنیـادا وەك یـەك بن‌و، نە لە دوارۆژیشـدا، مـامەڵەی وەك یەکیـان لەگـەڵدا بکـرێ.

ئنجـا ئایـا بۆچی خوا بێبـڕوایان بـە کـوێر وەسـف دەکات؟ لەبـەر ئـەوەی ئـەو بەڵگـانەی کە دەیانگـەیەنن بـە خواناسـیی‌و خـوا بـە یەکگـرتن، کـە نیشـانەکانی خـوان لە بوونەوەرو لە دەوروبەردا، نایانبینن، واتـە: وەك نیشانەی خـوا نایـانبینن، ئەگـەرنا مـانگ دەبیـنن، خـۆر دەبیـنن، بـاران دەبیـنن، ئـەو نیعمەتانـە هـەموویان دەبیـنن، بەڵام تەنیـا وەك دیاردەی سروشـتیی، کە هـیچ ئیـرادەیەکیان لـە پشتەوە نیـە، میهرەبانیی‌و سـۆزی خوایان لـە پشتەوە نیـە، دەیانبینن، کـە ئـەوەش جیایـە لـەوەی وەك نیشـانەی خوا بیـانبیـنن.

ئنجـا لـەو ڕووەوە بـە کـەڕ دانـراون، کـە وەك کـەڕ دەچـن‌و سـوود نـابینن لـە ئامۆژگارییە بەسوودەکـان، کـە لـە ڕێـی بیستنەوە وەدەست دێـن، واتـە: ئەوانـە نـە خۆیـان بە ڕێ دەزانن، نە ئـامادەن گـوێ بۆ کەسانێك بگـرن، کـە بە ڕێیـە دەزانن، بە واتایەکی دیکە: نە لە بەڵگە عەقڵییەکان بەهرەمەند بوون، نە لە بەڵگە نەقڵییەکان، کـە بەڵـگەی عـەقڵیی بـە چـاو وەردەگیـرێ، لـە ڕێـی ئـەزموون‌و تاقیکردنـەوەی خودییەوەو، بەڵگە نەقڵییەکان لە ڕێی گوێ هەڵخستن‌و گوێگرتنـەوە، ئەوانـە لـە هـیچ کامێکـیان بەهرەمەنـد نـەبوون، وەك خـوای پەروەردگـار لـە سـوورەتی (الـملك)دا دەفـەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ

(١٠) ﴾، واتە: (کافرە دۆزەخییەکان) گوتیان: ئەگەر ئێمە بیستبامان (لە رێی نەقڵو وەحییەوە رێی هیدایەتمان بۆ خۆمان دۆزیبایەوە)، ﴿ أَوْ نَعْقِلُ ﴾، یان خۆمان بیرمان کردبایەوە، ئێستا لە نێو هاوەڵانی دۆزەخدا نەدەبووین.

بەڵام بڕواداران بە پێچەوانەوە: حاڵیان وەك حاڵی کەسێکە کە هەم بە چاو دیمەنە سروشتییەکان دەبینێ، بەڵام وەك نیشانەکانی خوا، وەك نیعمەتو چاکەکانی خوا، کە سیفەتەکانی خوایان تێدا دەدرەوشێنەوە، ئاوا دەیانبینێ، هەم دەشبیستن، واتە: وەحی خواو، ئەوەی کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە خواوە، دەیهێنن، ئەو پەیامانەی کە بۆیان دێنن، ئەوەش دەبیستنو، لە ئەنجامی هەردووکیشیاندا واتە: دیتنی بە چاوی عەقڵو دڵو، بیستنی بە گوێی عەقڵو دڵ، لە ئەنجامی هەردووکیاندا، رێی راستیان دۆزیوەتەوە.

جێی سەرنجە کە خوا عزّوجلّ لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٨)دا دەفەرموێ: ﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾، هەروەها لە ئایەتی (١٧١)ی دا دەفەرموێ: ﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾، واتە: کەڕن، لاڵن، کوێرن، ناگەڕێنەوە، یان کەڕن، لاڵن، کوێرن، نافامن، بەو شێوە وەسفی کردوون، واتە: (و)ی بادانەوە (عطف)ی بۆ بەکارنەهێناون، ئنجا لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە لە یەك کاتدا هەم سیفەتی کەڕێتیی، هەم لاڵێتیی، هەم کوێرییان لە خۆیاندا کۆکردۆتەوە، ئەوەش بۆتە هۆی ئەوە، کە نەگەڕێنەوە، کەسێك کە هەستەوەرەکانی خۆی لە دەست دابێ: کەڕبێو، لاڵبێو، کوێربێ، تازە بە رێیە نازانێو هەق نابینێو نابیستێ، چۆن بگەڕێتەوە؟

هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾، ئەوانە کەڕن، لاڵن، کوێرن، بۆیە نافامن، بۆیە وایفەرمووە، چونکە عەقڵ لە رێی هەستەوەرەکانەوە، دەتوانێ زانیاریی کۆبکاتەوەو بفامێو دەرکی شتەکان بکات، بەڵام بێبڕوایان دوای ئەوەی کە هەستەوەرەکانی خۆیانیان یەك خستووە لەدەست داوە، ئەو هەموو نەخۆشییو کەمو کوڕییانەیان ﷻ خۆیان کۆکردۆتەوەو،

خۆیــان بەو دەردە بردوە کە دەبیـنین، کـەواتە لـە ســوورەتی (البقـرة)دا مەبەســتی ئەوە بووە کە ئەوانە ئەو سێ سیفەتە خراپـەیان لە خۆیان کۆکـردۆتەوەو، مەبەست کۆکردنەوەی سێ سیفەتەکان بـووە، بـەڵام لێـرە لـە ســوورەتی (هـود)دا، مەبەسـت ئەوەیــە کە هەم سوود نابینن لە نیشانەکانی خوا لە بوونەوەرو دەوروبـەرداو، هـەم قسەی پێغـەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) نابیستن، کە خـوای پەروەردگـار پێیـدا نـاردوون، واتـە: نە ئەو ڕێیـەیـان هـەیە، نە ئەو ڕێیەشـیان هەیـەو، هیچ ڕێیەکـیان بۆ خۆیـان نەهێشـتۆتەوە کە پێـی بگـەنـە ئـامـانج.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

٧

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە بیستو پێنج (٢٥) ئایەت پێکدێ، ئایەتەکانی: (٢٥- ٤٩)و، ئەم (٢٥) ئایەتە تەرخان کراون بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی نووح ﷺ و گەلەکەی، لە چواردە (١٤) بڕگەدا:

١ - ڕەوانەکردنی نووحو گەیاندنی پەیامی خوا، لە هەردووك ئایەتی (٢٥ و ٢٦)دا خراوەتە ڕوو.

٢ - بەرپەرچدانەوەی قسە ڕۆیشتووانو زلە زلانی گەلی نووح بۆ نووح ﷺ و، تۆمەتبار کردنیان بۆخۆیو بۆ شوێنکەوتووەکانیشی، کە ئێوە بە درۆ دەزانینو، ئێوە کەسانێکی هەرچیو پەرچیو سادەن، لە ئایەتی (٢٧)دا.

٣ - وەڵامدانەوەی نووح ﷺ بۆ تۆمەتەکانی قسە ڕۆیشتووانی گەلەکەیو، زیاتر تیشك خستنە سەر پەیامو بەرنامەکەیو، ڕەواندنەوەی کۆی ئەو تۆمەتانەی کە ئاڕاستەی خۆیو شوێنکەوتووانی دەکرێن ، لە ئایەتەکانی : (٢٨ و ٢٩ و ٣٠ و ٣١)دا.

٤ - ڕەخنە گرتنی زلە زلانی گەلەکەی کە نووح ﷺ زۆر شەڕە قسەو دەمە دەمیان لەگەڵدا دەکاتو، داواکردنیان لە نووح کە نیشانەیەکیان بۆ بێنێ، واتە: نیشانەیەك کە بیسەلمێنێ نووح پێغەمبەری خوایە، کە بە تەئکید ویستوویانە بڕوا نەهێننو، مەبەستیان بڕوا نەهێنان بووە، ئەگەرنا هیچ

پێغەمبەرێك نەبووە كە نیشانەو موعجیزەیەكی پێنەبێ، ئیسپاتی دەعوای پێغەمبەرایەتیی خۆی پێبكات، لە ئایەتی: (٣٢)دا.

٥ ـ وەڵامدانەوەی نووح ﷺ كە موعجیزە هێنانو بەڵگەو نیشانە هێنان، كاری خوایە، ئەگەر خواش سەرگەردانیان بكات، دڵسۆزیی وی بۆ وان، سوودی نابێ، لە هەردووك ئایەتی : (٣٣ و ٣٤)دا.

٦ ـ خوا ﷻ ڕوودەكاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺو دەفەرموێ: بڵێ: ئەگەر من قورئانم هەڵبەستبێ، ئەوە تاوانباریی خۆم لەسەر خۆمەو، ئێوەش بە تەئكید گوناهو تاوانو خراپەی خۆتان لە ئەستۆی خۆتان دایە، پاشان ئاگاداركردنەوەی خوا ﷻ بۆ نووح ﷺ كە گەلەكەی بڕوا ناهێنن، جگە لەوانەی كە بڕوایان هێناوە، كەسی دیكە بڕوا ناهێنێ، بۆیە با كەشتی دروست بكات، بۆ دەربازبوونی خۆیو ئەوانەی كە لەگەڵیدان بە ئیمانەوە، لە ئایەتەكانی: (٣٥ و ٣٦ و ٣٧)دا.

٧ ـ دوایی هەڵسانی نووح ﷺ بە دروستكردنی كەشتیی، لە تەختی گەورە گەورەو، بزماری ئاسنی گەورە گەورەو، زلەزلانو كاتێكیش قسە ڕۆیشتووانی گەلەكەی بە لایدا ڕەت دەبوون، گاڵتەیان پێ دەكرد، لە هەردووك ئایەتی: (٣٨و ٣٩)دا.

٨ ـ پاشان فەرمان پێكرانی نووح لەلایەن خواوە كە خۆیو بنەماڵەكەیو، ئەوانەی كە لەگەڵیدان بە ئیمانەوە، سواری كەشتییەكە ببنو، سواركردنی جووتێك لە هەر ژیاندارێك، لە هەموو ئەو ژیاندارانەی سەر زەوی، كە ئەگەر لافاویان بۆ بێ، دەخنكین، لە هەموو ئەوانە جووتێك، واتە: نێرو مێیەك سوار بكات، لە ئایەتی: (٤٠)دا.

٩ ـ فەرمانكردنی نووح بە ماڵەوەیان (خێزانو كوڕو بووكەكانی)و، بڕوادارانێك كە لەگەڵیدان، بە سواربوونی كەشتییەكە بۆ ئەوەی وردە وردە بكەوێتە ڕێ، دوایی دەستپێكردنی بارانی بە ڕێژنەو بە خوڕ لە ئاسمانەوەو، لە زەوییەوە دەرقوڵینی ئاوی بە خوڕزەم، لە ئایەتی: (٤١)دا.

١٠ـ بانگکردنی نووح بۆ کوڕەکەی کە سواری کەشتییەکە بێ‌و، لەگەڵ بێ بڕوایاندا نەبێ‌و، سوار نەبوونی کوڕەکەی لە کەشتییەکەدا (زانایان دەڵێن: ناوی کەنعان بووە)و، خنکانی لە نێو شەپۆلە گەورەکانی ئەو تۆفانەدا، کە خوا ﷻ لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ﴾، لە نێو شەپۆلانی وەك چیایاندا، لە هەردووك ئایەتی : (٤٢ و ٤٣)دا.

١١ـ فەرمانی خوا ﷻ بە وەستانی تۆفان‌و نیشتنەوەی کەشتیی لەسەر چیای جوودیی، لە ئایەتی: (٤٤)دا.

١٢ـ پاڕانەوەی نووح بۆ دەربازکردنی کوڕەکەی‌و، ڕەخنە لێگیرانی لەلایەن خواوەو، دان بە هەڵەی خۆ داهێنانی نووح ﷺ، لە ئایەتەکانی: (٤٥ و ٤٦ و ٤٧)دا.

١٣ـ فەرمانکردنی خوا بە نووح، کە خۆی‌و ئەوانەی کە لەگەڵیدان، دابەزن لە کەشتییەکەو بگەڕێنەوە سەر زەوی، بۆ حاڵەتی ئاسایی، لە ئایەتی: (٤٨)دا.

١٤ـ دوا بڕگە: ڕاگەیاندنی خوا ﷻ بۆ ئەو ڕاستییە کە ئەو هەواڵانە، هەواڵی نادیارن‌و، بێجگە لە خوا ﷻ کەس نەیزانیون‌و تەنیا لە هەگبەی غەیبی ویدان‌و، ئەو هەواڵانە کە خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ یان ڕادەگەیەنێ، نە خۆی‌و نە گەلەکەی نەیانزانیون‌و، زانیارییان لەبارەیانەوە نەبووە.

ڕەنگە شتیکی گشتییان بیستبێ، بەڵام بەو شێوەیە کە ئەو بەسەرهاتەی نووح ﷺ لەگەڵ گەلەکەی دا، لە قورئان دا گێڕراوەتەوە، بەو وردەکارییە، بە تەئکید نەیانزانیوە، ئەوەش لە ئایەتی: (٤٩)دا باسکراوە.

﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا
ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ ﴿٢٦﴾ فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ
مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ
ٱلرَّأۡيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ
إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا
وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ
وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ
﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ
عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ
أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًاۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡۖ إِنِّيٓ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾
قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدۡ جَٰدَلۡتَنَا فَأَكۡثَرۡتَ جِدَٰلَنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ
ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأۡتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمۡ
نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغۡوِيَكُمۡۚ هُوَ رَبُّكُمۡ وَإِلَيۡهِ
تُرۡجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ
مِّمَّا تُجۡرِمُونَ ﴿٣٥﴾ وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ
فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي
فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٣٧﴾ وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن

قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾
فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا
جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن
سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ ۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا
بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٤١﴾ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ
كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ
أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ
يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى
ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ
أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ
إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ
ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ
لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ
وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾ تِلْكَ
مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ
ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{بە دڵنیاییەوە ئێمە نووحمان ناردە لای گەلەکەی (گوتی : ) من بۆ ئێوە وریاکەرەوەو ترسێنەرێکی ڕوونم، کە جگە لە خوا مەپەرستن، بێگومان من مەترسیی سزای ڕۆژێکی مەزنتان لێدەکەم ﴿٢٥﴾ ئەو قسە ڕۆیشتووانەی کە بێبڕوا بوون لە گەلەکەی گوتیان: ئێمە تەنیا بە مرۆڤێکی وەك خۆمانت دەزانین‌و، جگە لەوانەمان کە بێ بایەخ‌و عەقڵ سووکن، نابینین کەس شوێنت کەوتبێ‌و، هیچ پلەو زیادییەکی ئێوە بەسەر خۆمانەوە نابینین، بگرە بە درۆزنتان دەزانین ﴿٢٧﴾ (نووح: ) گوتی: ئەی گەلەکەم! هەواڵم پێبدەن: ئایا ئەگەر من لەلایەن پەروەردگارمەوە بەرچاو ڕوون‌و دڵنیابم‌و، بەزەیی‌و چاکەیەکی مەزنی خۆیشی پێبەخشیبم، بەڵام لە ئێوە پەنهان کرابێ، ئایا هەرچەندە پێشتان ناخۆشبێ، هەر لە ملتان بپێچین؟! ﴿٢٨﴾ ئەی گەلەکەم! (لە بەرانبەر گەیاندنی پەیامەکەمدا)، هیچ سامانێکتان لێ داوا ناکەم، پاداشتم تەنیا لەسەر خوایەو، من دەرکەرو دوورخەرەوەی ئەوانە نابم کە بڕوایان هێناوە، ئەوان بە دیداری پەروەردگاریان دەگەن، بەڵام من بە کۆمەڵێکی نەفامتان دەبینم، کە ئەو جۆرە داوایانەم لێ دەکەن ﴿٢٩﴾ ئەی گەلەکەم! ئەگەر من دەریان بکەم، کێ لە بەرانبەر خوادا ئەگەر لەسەر ئەوە سزام بدات، سەرم دەخات، ئایا بیرناکەنەوە؟! ﴿٣٠﴾ هەروەها پێتان ناڵێم: خەزێنەکانی خوام لەلان‌و، پەنهان نازانم‌و، ناڵێم: من فریشتەم‌و، ناشڵێم: ئەوانەی ئێوە بە سووکیان تەماشا دەکەن، خوا هیچ چاکەیەکیان ناداتێ، خوا بەوەی لە دەروونیاندایە زاناترە، ئەگەر وا بکەم، کەواتە من لە ستەمکارانم ﴿٣١﴾ گوتیان: ئەی نووح! شەڕە قسەت لەگەڵ کردین‌و زۆریشت شەڕە قسە لەگەڵ کردین، ئنجا ئەگەر لە ڕاستانی، ئەوەی بەڵێنمان پێدەدەی (هەڕەشەی پێ لێمان دەکەی) بۆمان بێنە ﴿٣٢﴾ (نووح) گوتی: تەنیا خوا ئەگەر بیەوێ، بۆتان دێنێ‌و ئێوەش

دەستەو سانکەری خوا نابن‌و لە چنگی قوتار نابن ﴿٣٣﴾ ئەگەر خوا بیەوێ سەرگەردان‌و بێ مورادتان بکات، دڵسۆزیی من ئەگەر بمەوێ دڵسۆزییتان بۆ بنوێنم، هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ، هەر ئەو پەروەردگارتانەو، تەنیا بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە ﴿٣٤﴾ یان ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە! (ئەی موحەممەد ﷺ!)، بڵێ: ئەگەر بە درۆ هەڵمبەستبێ، (واتە: قورئان) ئەوە تاوانکردنی خۆم لەسەر منەو، منیش دوورم لەو تاوانبارییەی ئێوە ﴿٣٥﴾ ئنجا سروش بۆ لای نووح کرا، پێی ڕاگەیەنرا: کە مسۆگەر بە، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوە، هیچ کەسی دیکە لە گەلەکەت بڕوا ناهێنێ، (بۆیە بە ئومێدی بڕواهێنانیان چیدی بانگیان مەکەو خۆت ماندوو مەکە)، بۆیە بەوەی دەیکەن، دڵتەنگ‌و پەژارەدار مەبە ﴿٣٦﴾ لە ژێر چاودێریی ئێمەداو بە پێی سروش‌و ڕێنمایی ئێمە، کەشتیی دروست بکە، دەربارەی ئەوانەش کە ستەمیان کردوە، مەمدوێنە، بە دڵنیایی ئەوان دەخنکێن ﴿٣٧﴾ ئنجا (دەتبینی نووح)، کەشتییەکە دروست دەکات، هەر کات قسە ڕۆیشتووانێك لە گەلەکەی بەلایدا ڕەت دەبوون، گاڵتەیان پێدەکرد، (نووح)یش، گوتی: ئەگەر ئێستا گاڵتەمان پێبکەن، کاتێك دێ ئێمەش وەك گاڵتە پێکردنەکەتان، گاڵتەتان پێدەکەین ﴿٣٨﴾ لەمەودوا دەزانن کێ ئازارێکی بۆ دێ ڕیسوای دەکات، ئازارێکی بەردەوامی بەسەردا دەچەسپێ ﴿٣٩﴾ (ئیدی ئەو حاڵە درێژەی کێشا) هەتا کاتێك فەرمانمان هات بە هەڵسانی تۆفان‌و، تەندوور فوڵپیدا (هەڵقوڵی) گوتمان: ئەی نووح! لە هەر ژیاندارێك جووتێك، دووانی سوار بکە، (لە هەر ژیاندارێك نێرو مێیەك) هەروەها ژن‌و منداڵەکانیشت، جگە لەوەی پێشتر قسەی لەبارەوە کراوە (کە نابێ دەربازی بێ)، هەروەها هەر کەسێك کە بڕوای هێناوە، جگە لە کەمێکیش بڕوایان لەگەڵی نەهێنا ﴿٤٠﴾ نووح گوتی: تێیدا سواربن، بە ناوی خوایە ڕۆیشتنی‌و لەنگەرگرتنی (ئەو کەشتییە)، مسۆگەر پەروەردگارم زۆر لێبوردەی میهرەبانە ﴿٤١﴾ ئەو (کەشتییەکە) بە نێو شەپۆلانێکی وەك چیایان دا دەی بردن‌و، نووح بانگی کوڕەکەی کرد، کە لە پەنایەك بوو: ئەی کوڕە شیرینەکەم! لەگەڵ ئێمەدا سواربەو ڕەگەڵ کافران مەکەوە ﴿٤٢﴾ کوڕەکەی گوتی: پەنا بۆ لووتکەی

چیایەك دەبەم، لە ئاو دەمپارێزێ، نووح گوتی: ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێك نیە لە فەرمانی خوا، لەو بەڵایەی کە بە فەرمانی خوا هاتوە (کە تۆفانە)، مەگەر کەسێك کە ئەو بەزەیی پێیدا بێ‌و بیپارێزێ (بە هۆی سواربوونی کەشتییەوە) ئەدی شەپۆل کەوتە نێوانیان‌و (کوڕەکەی) لە خنکاوان بوو ﴿٤٣﴾ گوتراش: ئەی زەوی! ئاوەکەت قووت بدە، هەڵیلووشەو، ئەی ئاسمان! واز بێنە (لە باراندن)و، ئاوەکە ڕۆچوێندراو، کارەکە کرا (کافرەکان خنکێنران)و کەشتییەکە لەسەر چیای جودیی وەستاو لەنگەری گرت، گوتراش: دووریی بۆ کۆمەڵی ستەمکاران (لە بەزەیی خوا) ﴿٤٤﴾ ئنجا نووح بانگی پەروەردگاری کرد گوتی: پەروەردگارم! بێگومان کوڕەکەم لە نیزیکان‌و کەس‌و کاری منەو، بەڵێنی تۆش هەقەو، تۆش دەست ڕۆیشتووترینی حوکمڕانانی ﴿٤٥﴾ خوا فەرمووی: ئەی نووح! ئەو کوڕەت لە نیزیکانت نیە، ئەو کردەوەی چاك نیە، شتێکم لێ داوا مەکە کە زانیارییت پێی نیە، من ئامۆژگارییت دەکەم: نەکەی لە نەفامان بی ﴿٤٦﴾ نووح گوتی: پەروەردگارم! من پەنات دێنمە بەر، کە شتێکت لێ داوا بکەم، زانیاریم پێی نەبێ‌و، ئەگەر لێم نەبووری‌و بەزەییت پێمدا نەیەت، لە زیانباران دەبم ﴿٤٧﴾ گوترا: ئەی نووح! دابەزە خۆت‌و سواربووانی کەشتییەکە، بە ئاشتیی‌و پیت‌و پێزی زۆرەوە لە ئێمەوە بۆ سەر خۆت‌و بۆ سەر کۆمەڵانێك لەوانەی کە لەگەڵتن، (واتە: لە وەچەی تۆ کۆمەڵانێکی زۆر پەیدا دەبن) کۆمەڵانێکیش ژیانی دنیایان پێ دەگوزەرێنین‌و، بەهرەمەندیان دەکەین، دوایی لە ئێمەوە ئازارێکی بە ئێشیان تووش دەبێ ﴿٤٨﴾ ئا ئەوانە (ئەو بەسەرهاتانە) لە هەواڵە نادیارەکانن، بۆتیان سروش دەکەین، کە پێش ئەم قورئانە، نە خۆت‌و نە گەلەکەت، نەتاندەزانیین، دەجا خۆڕاگر بە، بە دڵنیایی سەرەنجامی چاك بۆ پارێزکارانە ﴿٤٩﴾ }.

# شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( ٱلْمَلَأُ ) : (الملأ: سادة القوم)، (الملأ) واتە: قسە ڕۆیشتووانو سەرانو زلە زلانی هەر کۆمەڵگایەك، کە خەڵکەکە بە قسەیان دەکات، ئنجا بە ڕێی هەقدا، یان بەڕێی ناهەقدا، کە لە قورئاندا، بە زۆریی بۆ دەستو پێوەندی طاغووتو حوکمڕانە زۆردارەکان بەکارهێنراوە.

(أَرَاذِلُنَا ): (الرذل والرذال: المحتَقَر المرغوب عنه لِرَدائته، والأراذل جمع أرذل، المجعول إسما غير صفة، أوجمع رَذيل على خلاف القياس)، وشەی (رَذْل و رُذَال) بە شتێك دەگوترێ کە خەڵك نەیەوێ لەبەر خراپییانیو، (أراذِل) کۆی (أرذل)ە، کە کراوە بە ناو، هەر چەندە لە ئەسڵدا سیفەتە، یاخود (أراذِل) کۆی (رذیل)ە، بەو شێوە کۆکراوەتەوە، بە پێچەوانەی قیاسەوە، واتە: خەڵکی بێبایەخو سووكو بێ کێش.

(بَادِىَ ٱلرَّأْيِ ): (أي: ظَاهِرَ الرأي، أو مُشتقٌ مِنَ البدَائي : أوّل الشيء)، ﴿ بَادِىَ ﴾، واتە: (ظاهر)، ﴿ بَادِىَ ٱلرَّأْيِ ﴾، واتە: ڕایەکەیان ڕواڵەتییو ڕووکەشە، عەقڵێکی سادەیان هەیە، هەر تەماشای ڕواڵەتی شتان دەکەن،

وە خوێنراویشتەوە: (باديء الرأي)، واتە: سەرەتای عەقڵ، واتە: ئەو کەسەی کە لەگەڵ شتێك دەبینێ، یەکسەر بڕوای پێ بکات، واتە: ئەوانەی کە بە دوای تۆ کەوتوون، خەڵکێکی سادەلەوحو ڕواڵەت بینن، یاخود: کەسانێکن بەبێ تێفکرین، یەکسەر بە دوای شت دەکەون.

( فَضْلٍ ): (الفَضْلُ: الزيادة في الشرف والكمال، والمرادُ آثَارَهُ)، (فَضْل)، کە دارودەستەی فیرعەون دەڵێن: ﴿ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ ﴾، واتە: ئێمە

هیچ فەزڵێك بۆ ئێوە نابینین بەسەر ئێمەوە، واتە، هیچ زیدەییەك لە شەرەفو پلەو پایەو تەواویەتیی ئێوە، بەسەر خۆمانەوە نابینین، کە مەبەست پێی شوێنەواریەکانیەتی، چونکە ئەگەر کەسێك پێگەی بەرزتر بێ لە کەسێك، سامانی زیاترە (بە حیساب) دەسەڵاتی زیاترە، فەرمبالغیی زیاتری بە دەورەوەیەو، هەروەها.

(فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ): یانی: (جُعِلَتْ أَعْمَى)، واتە: کوێر کراوە لەسەرتان، یان بە مانای نامۆ کراوە، یاخود شێردراوەتەوە لێتان، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (فَعَمِيَت عَلَيْكُمْ)، یانی: (إِشتَبَه حَتَّى صَارَ كَالأَعْمَى)، یانی: کوێر بووە لە بەرانبەرتاندا، بەڵام ئەگەر بڵێین: (فَعُمِّيَتْ): واتە کوێر کراوە، یاخود سڕاوەتەوە، یاخود نادیدە کراوە، لەبەرچاوتانو نایبینن.

(وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ): واتە: من دەرکەر نیم، (الطَّرْدُ: الإِزْعَاجُ وَالإِبْعَادُ عَلَى سَبيل الإِستخْفَافِ)، (طَرْد) بریتیە لە ڕەتاندنو دوور خستنەوە بە شێوەی بە کەم تەماشا کردن.

(خَزَآئِنُ): (الخزنُ: حِفْظُ الشي فِي الخِزَانَةِ، وَالخِزَانَةُ هِي بَيْتٌ أَوْ مشْكَاة كَبيرَة تُحفَظُ فِيهَا الأَشياء)، دیارە ﴿خَزَآئِنُ﴾ کۆی (خِزَانَة)یە، (خِزَانَة)ش لە (خَزْنَ)ەوە هاتوە، (خَزن)یش بریتیە لە پاراستنی شتێك لە عەمبارێکدا، لە خیزانەدا، خیزانەش، یان ماڵێکە، یان تاقێکی گەورەیە، کە شتی تێدا دەپارێزرێ، کاتی خۆی وابووە، ئەگەرنا ئێستا، خەڵك پارە لە قاسەدا دادەنێ، لە شتی دیکەی وەك سندوقدا دایدەنێ، لە شوێنی قایم دایدەنێ، ئەگەر لە بانك دا دایبنەنێ، کە وشەی (خَزَآئِنُ)، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە.

(تَزْدَرِيٓ أَعْيُنُكُمْ): واتە: چاوتان بە کەمی دەبینێ، (الإِزْدِرَاء مِنَ الزَري، وَهو الإِحْتِقَارُ وَإِلْصَاق العَيْبِ، أَصلُهُ: إِزْتِرَاء)، (إِزْدِرَاء) لە (زَرِيَ)ەوە هاتوە، (زَرِيَ بِهِ)،

واتە: بە کەمی تەماشا کرد، بە کەمی بینی، کە بریتیە لە یەکەم بینین‌و عەیب بە دوا خستن، لە ئەسڵدا (إزدراء) لە (إزتراء)ەوە هاتوە.

(نُصْحِيٓ ): (النُّصْحُ: قولٌ أو عَمَلٌ يريد صَاحِبه صلاحَ المعمول لأَجْلِه)، (نُصْح) بریتیە لە هەر قسەیەك‌و هەر کردەوەیەك کە خاوەنەکەی، ئەو کەسەی کە قسەی بۆ دەکات، یان ئەو کردەوەیەی بۆ دەکات، بەرژەوەندیی ئەوی بوێ.

بەڵام ئەمە ڕای ڕاغیبی ئەصفهانییە، ئەگەرنا باشتر لەوە، ئەوەیە کە گوتراوە: (النُّصْحُ: إرادةُ الخَيْر للمنصُوح)، (نُصْح)، بریتیە لە چاکە خوازیی‌و خێرخوازیی بۆ ئەو کەسەی کە نوصحەکەی ئاڕاستە دەکرێ، واتە: دڵسۆزیی نواندن‌و بە تەنگەوە بوون.

(يُغْوِيَكُمْ): واتە: بێ مرادتان بکات، (الإغْوَاءُ: جَعْلُ الشيءِ ذَا غِوَايةٍ، وَهِيَ عَكْسُ الرُّشْدِ)، (إغواء) واتە: شتێك وا بکەی کە ببێتە خاوەنی (غِوَايَة)، (غِوَايَة)ش، پێچەوانەی (رُشْد)ە، (رُشْد)یش، یانی: سەر ڕاستیی‌و بە ئامانج گەیشتن، (غِوَايَة)ش، واتە: سەرلێشێوان‌و بە ئاکام نەگەیشتن.

(إِجْرَامِى ): (الإجْرَام: اكْتسابُ الجُرْمِ وَهو الذَّنْب)، (إجْرَام) لەسەر کێشی (إفْعَال)ە، واتە: وەدەست هێنانی گوناح، (جُرْم) کە مەبەست پێی گوناهە.

(فَلَا تَبْتَئِسْ ): واتە: دڵتەنگ‌و خەمبار مەبە، (الإبْتِئَاسُ: إفْتِعَالٌ مِنَ البُؤْسِ، وَهو الهَمّ والحُزْنُ، أي لاَ تَحْزَن)، وشەی ﴿ تَبْتَئِسْ ﴾، دیارە (إفتعال)ە لە (بُؤْس)ەوە، (بُؤْس)، بریتیە لە خەم‌و پەژارە کەواتە: (لاتبتئس) واتە: خەمبارو پەژارەدار مەبە، بە شێوەیەك کە بە دەم‌و چاوتەوە دیار بێ.

(سَخِرُواْ): (سَخِرْتُ مِنْهُ وَاستَسْخَرْتُهُ: للهزء بهِ)، (سَخِروا مِنْهُ) واتە: گاڵتەیان پێکرد، گەمەیان پێکرد، پێیان ڕابوارد، دەگوترێ: (سَخِرْتُ مِنْهُ وَاستَسْخَرْتُهُ)، بۆ گاڵتە پێکردن بەکاردێ.

(وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ): (حَلَّ حلُولاً: نَزَلَ، حَلَّ الدَّيْن: وَجَبَ أداؤُه)، ﴿وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ﴾ دەڵێ: (حَلَّ حلُولاً) یانی: ئەو شتە پێویست بوو، یاخود دابەزیە سەری، یاخود دەگوترێ: (حَلَّ الدَّيْن)، واتە: قەرزەکە کاتەکەی هاتوە پێویستە بدرێتەوە.

(مُّقِيمٌ): (أقَامَ الشيءَ: أدَامَهُ، المقيم: الملازِم)، دەگوترێ: (أقَامَ الشيءَ) واتە: بەردەوام بووە لەسەر شتەکە، (مُقِيم) واتە: مولازِم، یانی: هەمیشە لەگەڵیەتیو لە کۆڵی نابێتەوە.

(وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ): واتە: تەندوورەکە هەڵقوڵی، دەڵێ: (فَارَت القِدْرُ: جَاشت، فَوْرَاناً، الفورُ: شدّة الغَيلان)، (تنور)، دیارە بەو تەندوورە دەگوترێ، کە نانی تێدا دەکرێ، ئنجا (فَارَت القِدْرُ)، مەنجەڵەکە فەوەرانی کرد، واتە: قوڵپی دا، وشەی (فور) بە شتێك دەگوترێ، کە زۆر بکوڵێو قوڵپبدا، لێرەوە خوازراوەتەوە بۆ هەڵقوڵینی ئاو لە تەندوورەکە، یان لە هەر شوێنێکی دیکە.

(مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآ) : (هُما مَصْدَرَان مِنْ أجْرَيْتُ السّفِينَة وَأرْسَيتُها)، ئەگەر (مُجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا) بن، ئەوە دەبن بە چاوگ، لە وشەی: (أجْرَيْتُ وَأرسَيْتُ)، (أجْرَيْتُ)، واتە: کەشتییەکەم لێخوریو، (أرْسَيْتُ)، واتە: کەشتییەکەم ڕاگرت، کەواتە: (مُجْرى)، واتە: ڕۆیشتن، (مُرْسى)، واتە: لەنگەر گرتنی کەشتیی.

بەڵام ئەگەر : ﴿مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآ﴾ بن، ئەوە ئەو کاتە دەبن بە ناوی شوێن، یان دەبن بە ناوی کات (اسم مكان، أو اسم زمان)، (مِنْ جَرَتِ السّفينة وَرَست)، ئەو کاتە: یانی: کات یان شوێنی ڕۆیشتنی کەشتییەکەو، کات یان شوێنی لەنگەر گرتنی.

( مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ ) : (مَوج)، (اسم جمع موجة) ناوی کۆیە بۆ (موجة)، واتە: یەك شەپۆل، (موج) ناوی کۆیە، واتە: شەپۆل بە گشتیی، نەك یەك شەپۆل، ئنجا دیارە (موجة) بە (أمْوَاج) کۆدەبێتەوە، واتە: شەپۆلەکان، شەپۆل بریتیە لە

چی ؟ (ما عَلا مِن سَطْحِ الماء وَتَتَباع)، ئەو ئاوەیە کە دەکەوێتە سەر ڕووی ئاو، دەجوولێ، کە بە کوردیی شەپۆلی پێ دەڵێین، کە با دەیجوولێنێ‌و بەرز دەبێتەوە لەسەر ئاستی ئاو.

( مَعۡـزِلٖ ) : (مكان العزلة، أي الإنفراد)، (فِي معزلٍ)، واتە: لە شوێنێکی لاچەپ، لە شوێنێکی پەڕیدە، لە شوێنێکی کەنار، واتە: کوڕەکەی بە تەنیا بوو.

( سَـَٔاوِيٓ ) : واتە: پەنای پێدەبەم، (آوي: مصدرهُ: الأُوِيُّ) (آوي) یانی: (اَلتَجيءُ) پەنا دەبەم، (أُوِيّ) یانی: پەنا پێبردن.

( يَعۡصِمُنِي ) : (العِصْمَةُ: المنْعُ، وَالحِفْظُ)، واتە: ڕێ لێگرتن‌و پاراستن، کەواتە: (يَعْصِمُني) یانی: ڕێ لە ئاو دەگرێ کە بمخنکێنێ‌و، دەمپارێزێ.

( وَقِيلَ يَـٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي ): (بَلِعَ الشيءَ: ابْتَلَعهُ)، واتە: قووتی دا، هەڵیلووشی، (ابْلَعْتُ الشيء غيري)، واتە: وام کرد کە غەیری من ئەو شتە قووت بداو، لە قورگی ئەو دیوی بکات.

( أَقۡلِعِي ) : (الإقْلاعُ عَنِ الشيء: الكَفُّ عَنْهُ، أَقْلَعَ عَما كانَ عَلَيْهِ أَي: تَرَكَهُ)، وشەی (إقلاع) بەکاردێ بۆ وازهێنان لە شتێك، کەواتە: (يا سَماء أَقْلِعي)، ئەی ئاسمان! بەس بکە، واز بێنە، واتە: واز بێنە لە دارژاندن‌و هەڵرشتنی ئاوی زیاتر، دەگوترێ: (أَقلَعَ عَما كانَ عَلَيْهِ)، واتە: ئەو کەسە ئەو کارەی کە دەیکرد پێشتر، وازی لێهێناو دەستی لێ هەڵگرت.

( وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ ) : دەگوترێ: (غَاضَ الماءُ أي: قَلَّ وَنَضَبَ)، ئاوەکە کەم بوو، وردە وردە لە وشکایی دا، (وَغِيضَ الماءُ: فُعِلَ بِهِ ذَلِكَ)، (غَاضَ الماءُ)، واتە: ئاوەکە ڕۆچوو، بەڵام ﴿ وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ ﴾، واتە: ئاوەکە ڕۆچوێندرا، نقووم کرا بە زەویدا.

( وَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ ) : (أي فُصِلَ، أو نُفِّذَ وأُبْرِمَ)، واتە: بڕیارەکە تەواو بوو، یاخود بڕیارەکە جێبەجێ کراو، کارەکە تەواو بوو، واتە: ئەوانەی بێبڕوا بوون، لە تۆفانەکەدا خنکێنران، مەبەست ئەوەیە.

( وَٱسْتَوَتْ ) : واتە: لەنگەری گرت، (استوَت) واتە: (رَست) لەنگەری گرتو، ڕاوەستا لەسەر چیای جوودیی.

( أَهْلِي ) : (أَهْلُ الرَّجُلِ: قَرَابَتُهُ، وَهو اسْم جَمْعٍ لاَ وَاحِدَ لَهُ)، وشەی (أهل)، ناوی کۆیە تاکی نیە، کە (أَهْلُ) بریتیە لە ڕەچەڵەکی مرۆڤ و، نزیکەکانیو خزمەکانی، (وَيُطْلَقُ عَلَى الزَّوْجَة)، (أَهْل) بە پلەی یەکەم بۆ هاوسەر بەکاردەهێنرێ.

( ٱهْبِطْ ) : (الهُبُوطُ: النُزُولُ)، واتە: دابەزە، شۆڕبەوە لە کەشتییەکە وەرە خوارێ.

( بِسَلَٰمٍ ) : واتە: بە ئاشتییەوە، (وَأَصْلُهُ مِنَ السَّلاَمَةِ، فَاستُعْمِلَ عِنْدَ اللِّقَاء إيْذَانا بتأمِين المرْءِ مُلاَقِيَهُ)، وشەی (سَلاَم)، لە ڕیشەدا لە (سَلاَمَة)ەوە هاتوە، کە بەکارهێنراوە بۆ پێکگەیشتن لە کاتی دیداردا، کە ئەو کەسەی سەلام دەکات، بەرانبەرەکەی ئاگادار دەکاتەوە، کە لەو دڵنیا بێ و، لەلایەن ویەوە، سەلامەت دەبێ.

( وَبَرَكَٰتٍ ) : (البَرَكَاتُ وَاحِدُهَا بَرَكَة: الخَيْرَاتُ النامِية، وَهِيَ مِنْ كَلمات التحية مُستعْمَلة فِي الدُّعاء)، وشەی (بَرَكَات) کە تاکەکەی (بَرَكَة)یە، واتە: خێرو نیعمەتێکی گەشەسەندووی بەردەوامو، وشەی (بَرَكَات) لە وشەکانی سڵاو لێکردنە لێرەدا بۆ کاتی پاڕانەوە بەکارهێنراوە، (البَرَكَة: ثُبُوت الخَيْرِ الإِلَهِي فِي الشيء)، (بَرَكَة) بریتیە لە چەسپانی خێرو چاکە خوایی لە شتێکدا.

# مانای گشتی ئایەتەكان

هەڵبەتە ئێمە بە خێرایی بەسەر مانا گشتییەكەیدا دەڕۆین، چونكە دوایی هەم باسێكی تایبەت دەربارەی بەسەرهاتی نووح‌و گەلەكەی دەكەین، هەم لە مەسەلە گرنگەكاندا، زۆر بە وردیی تیشك دەخەینە سەر بەسەرهاتی نووح ﵇ و، چەمك‌و واتای ئەو ئایەتانەو ئەو وردەكارییانەی كە تێیاندان، وەك عادەتی خۆمان، بۆیە ئێستا بە خێرایی بەسەریدا دەڕۆین.

خوا ﷻ بەسەرهاتی نووح ﵇ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ ﴾، ئەم (و)وە، ئێرە دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی پێشی، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! وەك چۆن پەیام‌و سروشمان بۆ تۆ ناردوە، یان ئەی خەڵك‌و مرۆڤایەتی! وەك چۆن (محمد)مان ڕەوانە كردوەو، قورئانمان بۆ ناردوەو، سروشمان بۆ كردوە، بە هەمان شێوەش ئێمە (نووح)مان نارد بۆ لای گەلەكەی، ئنجا ئایا چی پێ گوتن؟ گوتی: ﴿ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، من بۆ ئێوە ترسێنەرو ورپاكەرەوەیەكی ڕوون‌و ئاشكرام، هیچ پێچ‌و پەنای تێدا نیەو، من هیچ تەم‌و مژێكم بەسەرەوە نیە، كە لەلایەن خواوە نێردراوم، بۆ ئەوەی وشیارتان بكەمەوەو ورپاتان بكەمەوە، بتانترسێنم، كە ئەگەر بێت‌و ڕاستە ڕێ نەگرن، ئەوە ڕۆژێكی خراپ‌و چارەنووسێكی ڕەش، چاوەڕێتان دەكات، ﴿ أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، هاتووم پێتان ڕابگەیەنم: كە جگە لە خوا نەپەرستن، ﴿ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴾، بێگومان من مەترسیی ئازارو سزای ڕۆژێكی بە ئێشم لە ئێوە هەیە، واتە: مەترسییم هەیە كە تووشتان بێ.

﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ ﴾، دەست ڕۆیشتووانی بێبڕوا لە گەلەكەی، بڕیار بە دەستان‌و داروودەستەكان، كە شتیان بە دەست بوو، گوتیان: ﴿ مَا نَرَىٰكَ

﴿إِلَّا بَشَرًا مِّثۡلَنَا﴾، تۆ مرۆڤێکی هەر وەك خۆمان دەتبینین، ﴿وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ﴾، ئەوانەش کە شوێنت کەوتوون، هەر وایان دەبینین: کە خەڵکی سادەو عەقڵ سووكو کەم بایەخن، ﴿وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ﴾، هیچ زیدەییەکی ئێوە، هیچ چاکەیەکی ئێوە بەسەر خۆمانەوە نابینین، کە تۆ ببی بە پێغەمبەر ﷺ، ئەوانیش ببنە بڕوادار، ئنجا ئەوان بچنە بەهەشتو ئێمە نەچین، ﴿بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ﴾، بەڵکو ئێمە پێمان وایە کە ئێوە درۆ دەکەن.

نووح وەڵامێکی ددان شکێن دەداتەوە لە چەند بڕگەیەکدا، کە دواتر بە وردی باسی دەکەین : ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ﴾، (نووح) گوتی: ئەی گەلەکەم! هەواڵم پێ بدەن! ئەگەر من لەلایەن پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشن بم، بەرچاو ڕوون بم، دڵنیابمو، (خوا) لەلایەن خۆیەوە بەزەیی بە من دابێ (کە پلەی پێغەمبەرایەتیی‌و وەحی بۆ ناردنە)، ﴿فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ﴾، بەڵام لە ئێوە پەنهان کرابوو، لە ئێوە کوێر کرابوو، واتە: نەتاندەبینی، لێتان شێردرابۆوە، ﴿أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە ئێوە ناتانەوێ‌و پێتان خۆش نیەو حەزی لێ ناکەن، ئایا هەر لەملتان بپێچین ناچارتان بکەین؟ واتە: ئەگەر خۆتان نەتانەوێ، ئێمە ناچارتان ناکەین.

﴿وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًا﴾، ئەی گەلەکەم! من لەسەر ئەو ئایین‌و بەرنامەیەی خوا کە پێتان ڕادەگەیەنم، ماڵ‌و سامانتان لێ داوا ناکەم، ﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾، پاداشتی من تەنیا لەسەر خوایە، بەس چاوەڕوانییم لە خوا هەیە، ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، من دەرکەریان نیم، دوور

خەرەومیان نیم، دیارە داوایان لێکردوە: ئەو ڕەش‌و ڕووتانە دەربکە لە مەجلیسەکەت، بۆ ئەوەی گوێت بۆ بگرین، چونکە ئەوانە شایستەی ئەوە نین بێنە مەجلیسی ئێمەوە، وەك هەمان شتیش بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، هاتۆتەوە پێش، ﴿إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ﴾، ئەوان دەگەنە پەروەردگاری خۆیان، بەڵام ئێوە دەبینم کۆمەڵێکن نەفامیی دەنوێنن، یانی: ئێوە نەفامیی دەکەن، کە خۆتان پێ لە خەڵك زیادەو، ئەوانەتان پێ شایستەی ئەوە نیە، کە خوا بیانباتە بەهەشت.

﴿وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡ﴾، وە ئەی گەلەکەم! کێ لەلایەن خواوە من سەردەخاو پشتم دەگرێ، ئەگەر من ئەوان دەربکەم، واتە: ئەگەر خوا بیەوێ لەسەر ئەوە سزام بدات، لەسەر دەرکردنی ئەوان، کێ پشتم دەگرێ‌و کێ دەفریام دێ؟ ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾، ئایا بیر ناکەنەوە؟

ئنجا دەفەرموێ : ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ﴾، هەروەها پێشتان ناڵێم: عەمبارو خەزنەکانی خوا لەلای منن، ﴿وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ﴾، هەروەها پێشتان ناڵێم: پەنهان‌و نادیار دەزانم، ﴿وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ﴾، پێشتان ناڵێم: من فریشتەم، ﴿وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًا﴾، ئەوانەش کە چاوی ئێوە بە کەم بایەخیی تەماشایان دەکات، چاوی ئێوە بە سووکیان دەبینێ، ناڵێم: خوا هیچ چاکەیەك‌و هیچ نیعمەتێکیان پێنادات، یانی: شایستەی ئەوە نین بیانباتە بەهەشت، یان شایستەی ئەوە نین کە ئیمان بێنن، ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾، خوا زاناترە بەوەی کە لە دەروونیاندا هەیە، یانی: مرۆڤەکان بەوە لە یەك جیادەکرێنەوە، کە لە عەقڵ‌و دڵیاندا هەیە، نەك بەوەی کە بە ڕواڵەت‌و دیمەنیانەوە دیارە، ﴿إِنِّيٓ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، بێگومان ئەگەر من وا بکەم (ئەوان دەربکەم) ئەو کاتە من لە ستەمکاران دەبم.

﴿ قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدۡ جَٰدَلۡتَنَا فَأَكۡثَرۡتَ جِدَٰلَنَا ﴾، گوتیان: ئەی نووح! شەڕە قسەت لەگەڵدا کردین و زۆریشت شەڕە قسە کرد، واتە: زۆری لەسەر ڕۆیشتی، ﴿ فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، دە ئەوەی کە بەڵێنمان پێ دەدەی، واتە: ئەوەی هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەکەی، بیهێنە ئەگەر لە ڕاستانی، واتە: ئەوە کە دەڵێی: خوا سزاتان دەدات، ڕۆژێکی بە ئازارتان لەپێشە، فەرموو با بێتە پێش.

﴿ قَالَ إِنَّمَا يَأۡتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴾، (نووح ﷺ) گوتی: بێگومان ئەو بەڵاو ئازارە تەنیا خوا دەتوانێ بیهێنێ، ئەگەر بیەوێ و، ئێوە ئەو کاتە ئەگەر خوا بەڵای بەسەرهێنان، دەستەوسانکەر نابن، واتە: دەرباز نابن و، قوتار نابن لە تۆڵەی خوا، ﴿ وَلَا يَنفَعُكُمۡ نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغۡوِيَكُمۡ ﴾، دڵسۆزیی نواندنیشم بۆ ئێوە، ئەگەر بمەوێ دڵسۆزییتان بۆ بنوێنم و بە تەنگتانەوە بێم، دادتان ناداو سوودتان پێ ناگەیەنێ، ئەگەر خوا بیەوێ بێمرادو بێئاکامتان بکات و سەرگەردانتان بکات، لەبەرئەوەی شایستەی سەرفرازیی نین، چونکە خۆتان ڕێی بێمرادیی و ناکامییتان گرتۆتە بەر، ﴿ هُوَ رَبُّكُمۡ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، هەر ئەو خاوەن و پەروەردگارتانە و، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

ئنجا خوا ﷻ ئەمە ناواخن دەکات و دێتەوە سەر باسی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و قورئان و، دەفەرموێ : ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُ ﴾، یان ئایا دەڵێن: (موحەممەد ﷺ) قورئانی هەڵبەستوە، بە درۆ بەناوی خواوە هەڵیبەستوە؟ ﴿ قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي ﴾، بڵێ: ئەگەر من هەڵمبەستبێ تاوانباریی خۆم لەسەر خۆمە، ﴿ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجۡرِمُونَ ﴾، منیش دوورم لەو تاوانباریی و خراپە کارییەی کە دەیکەن و، پەیوەندییم پێوەی نیە، واتە: ئەگەر من تاوانم کردبێ و قسەم بە ناوی خواوە هەڵبەستبێ، ئەوە خۆم بەرپرسیارێتیی خۆم تەحەممول دەکەم و، خۆم باجی تاوانی خۆم دەدەم، ئێوەش کە تاوانباریی دەکەن و خراپەکاریی دەکەن و کە بە

ناهەق بڕوا بە من ناهێنن‌و بڕوا بە قورئان ناهێنن‌و، بە هەڵبەستراوی دەزانن، کە ئەوە تاوانێکە دەیکەن، منیش لەو تاوانەی ئێوە بەرییم، چونکە من ئەرکی سەرشانی خۆمم بەرانبەر بە ئێوە ئەنجام داوە.

﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾، ئنجا سروش بۆ نووح کرا، بە نووح ڕاگەیەنرا، (ئەمەش نێومرۆکی پەیام‌و سروشەکەیە): کە دڵنیابە هەرگیز هیچ کەس لە گەلەکەت جگە لەوانەی کە بڕوایان هێناوە، بڕوا ناهێنێ، ﴿فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾، بۆیە خەمبارو دڵتەنگ‌و نارەحەت مەبە، بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد.

﴿وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾، هەروەها کەشتیی دروست بکە لەژێر چاودێریی ئێمەداو، بە فەرمان‌و ڕێنمایی ئێمە، ﴿وَلَا تُخَـٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟﴾، لەبارەی ئەوانەشەوە کە ستەمیان کردوە، مەمدوێنە، واتە: هیچ تکایەکم بۆ ئەوان لێ مەکە، ﴿إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ﴾، بە دڵنیاییەوە ئەوان خنکێنراون، نغرۆ دەکرێن لە تۆفاندا، واتە: با هەر لە ئێستا ڕا پێت بڵێم: داوایەك مەکە کە وەرنەگیرێ، وەك گوتراوە: (قسە بکە جێ بگرێ، ڕبە بپێوە سەر بگرێ).

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ﴾، ئەوە (نووح) کەشتییەکە دروست دەکات، خوا ﷻ بە (فعل المضارع) دەیهێنێ، بۆ ئەوەی تێی ڕابمێنین، ئەوە نووح کەشتییەکە دروست دەکات لەو بەیارە، لە شوێنێکی وشکانیی کەشتی دروست دەکات‌و، هەر کاتێك کۆمەڵێك لە دەست ڕۆیشتووانی گەلەکەی بە لایدا ڕەت دەبوون، گاڵتەیان پێدەکرد.

ئنجا لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا هاتوە پێیان دەگوت: باشە ئاخر کەشتیی‌و بەیارا لەو وشکانییە چۆن کەشتیی دەڕوات، هەندێکی دیکە دەیانگوت: نووح تاکو

ئێستا پێغەمبەر بووە، ئێستا بووە بە دارتاش، ئاوا گاڵتەیان پێدەکرد، بەڵام خوای پەروەردگار باسی نەکردوە، چۆن گاڵتەیان پێکردوە.

ئنجا نووح ﷺ وەڵامی دانەوە، چونکە لە بەرانبەریاندا بێدەنگ نەبووە: ﴿قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە ئێستا گاڵتە بە ئێمە دەکەن، ئەوە ئێمەش دوایی گاڵتەتان پێ دەکەین، وەك چۆن ئێوە گاڵتەمان پێدەکەن، واتە: گاڵتەتان پێدەکەین کاتێك ئێوە دەخنکێن‌و، گاڵتەتان پێدەکەین کاتێك دەبرێنە دۆزەخ، دەڵێین: ئەها ئەوەی کە خوا فەرموو بووی، وەك پێغەمبەران فەرموویان، ڕاست دەرچوو، دە بیچێژن، ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾، لەمەو دوا دەزانن کێ ئازارو سزایەکی بۆ دێ، ڕیسوای دەکات‌و، ئازارو ئەشکەنجەیەکی بەردەوامی دێتە سەرێ کە لە کۆڵی نابێتەوە.

ئنجا خوا ﷻ باسی دەستپێکردنی تۆفان‌و لافاوە مەزنەکە دەکات : ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾، واتە: ئەو مشت‌و مڕەی نێوان نووح‌و گەلەکەی، گاڵتە پێکردنی ئەوان بە نووح سەلامی خوای لەسەر بێ‌و، وەڵامدانەوەی نووح بۆ ئەوان، ئەو مشت‌و مڕە بەردەوام بوو، چونکە: (حَتَّى لبلُوغ الغَايَة)، واتە: ئەوە بەردەوام بوو، یاخود دروست کردنی نووح بۆ کەشتییەکەی‌و ئامادەکردنی، بەردەوام بوو، تاکەی؟ ﴿إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا﴾، تاکو فەرمانی ئێمە هات، واتە: تاکو فەرمانی خوا هات، بە هەڵسانی تۆفان، لافاو، ﴿وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾، واتە: تەندوورەکە هەڵقوڵی، قوڵپی دا، واپێدەچێ ئەوە نیشانەی خوای کارزان‌و نووح ﷺ بوو بێ، کە هەر کاتێك تەندوور ئاوی لێ هاتە دەرێ‌و هەڵقوڵی، ئەوە لافاوو تۆفان دەست پێدەکات، چونکە جاری دیکەش هەبووە، ئاسمان بارانی لێ باریوەو، ئاوی زۆری لێ ڕژاوە، ئەدی چۆن بزانێ: کە ئایا ئەوە سەرەتای ئەو تۆفانەیە، یان هەر بارانێکی ئاساییە، بۆیە تەندوورەکە کراوە بە نیشانە، چونکە عادەت وا نیە ئاو لە تەندوور هەڵبقوڵێ، ئنجا

کاتێك کە تەندوور فوڵپی داو هەڵقوڵی، ﴿ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ﴾، گوتمان، واتە: بە (نووح)مان گوت: لە هەر کامیان جووتێك، دووانی سوار بکە، واتە: لە هەر جووتێك لەو ئاژەڵو پەڕەوەرانەی کە لە وشکانییدا نەبێ ناژین‌و، لە ناودا دەخنکێن، لە هەر کامێك لەوانە دووانی سواربکە.

خوێنراویشەتەوە: (مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ)[1].

﴿ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ ﴾، هەروەها کەس‌و کارەکەت‌و نیزیکەکانیشت‌و ماڵ‌و خێزانەکەشت هەموویان سوار بکە، جگە لەوەی کە بڕیاری لەسەر تێپەڕیوە، پێشتر بڕیاری لەبارەوە دراوە، کە هاوسەرەکەی بووە، ﴿ وَمَنْ ءَامَنَ ﴾، هەموو ئەوانەش کە بڕوایان پێ هێناوی، هەموو ئەوانە سوار بکە، ﴿ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾، بەڵام جگە لە کەمێك، هیچ کەس لەگەڵی دا بڕوای پێ نەهێنا.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ﴾، (نووح) گوتی: تێیدا سواربن، بە ناوی خوایە ڕۆیشتن‌و لەنگەر گرتنی، یاخود کات‌و شوێنی پێدا ڕۆیشتنی‌و، کات‌و شوێنی تێدا لەنگەر گرتنی، چونکە دەگونجێ (مُجْرَاهَا، وَمُرْسَاهَا) بخوێنرێتەوەو، دەگونجێ (مَجْرَاهَا، مَرْسَاهَا) بخوێنرێتەوە، شایانی باسیشە (حفص)، (مَجْرَاهَا) بە (إمالـة)، دەخوێنێتەوەو دەڵێ: مەجرێها،

﴿ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان پەروەردگاری من زۆر لێبوردەیەو زۆر میهرەبانە، ﴿ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ ﴾، ئنجا کەشتییەکە دەڕۆیشت، ئەوانەی دەبرد بە نێو شەپۆلانێکدا، وەك چیایانی بەرز، ﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ ﴾، نووح بانگی کوڕەکەی خۆی کرد، ﴿ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ ﴾، کە لە پەرگەیەك بوو، لە کەنارێك

---

[1] ) واتە: لە هەر جووتێك دووان.

بوو، لە شوێنێکی بە تەنیا بوو، چی پێ گوت؟ ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾، ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! (چونکە لە زمانی عەرەبییدا، شت کە بچووك دەکرێتەوە، بۆ خۆشەویستیی و گرنگیی پێدان و خەم خواردنە، چونکە منداڵی بچووك، زیاتر خۆشدەویسترێ و، خەمی لێدەخورێ و، پێویستیی بە چاودێریی و ڕەچاو کردنی زیاتر هەیە)، لەگەڵمان سواربە، ﴿وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، لەگەڵ بێبڕوایان دا مەبە، دەنا لەگەڵ واندا سەرت بە فەتارەت دەچێ، وەرە سواری کەشتیی نەجات بە، نەك لەگەڵ خەڵکیکدا بی، کە بەرباد دەبن، ﴿قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِ﴾، (کوڕەکەی)، گوتی: پەنا دەبەمە بەر چیایەك، واتە: لووتکەی بەرزی چیایەك، کە لە ئاو دەمپارێزێ، ئاوم لێ دەگێڕێتەوە، ناهێڵێ بخنکێم، ﴿قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلۡيَوۡمَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ﴾، (نووح ﷺ)، گوتی: ئەمڕۆ پارێزەر نییە لە فەرمانی خوا، (واتە: لەو بەڵایەی کە خوا بە فەرمانی خۆی ناردوویەتی، لەو تۆفانەی کە بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە)، هیچ پارێزەرێك نییە ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ﴾، مەگەر کەسێك خوا بەزەیی پێیدا بێتەوە، خواش تەنیا بەزەیی بەو کەسانەدا دێتەوە، کە بە دوای پێغەمبەرەکەی دەکەون و، سواری کەشتییەکەی دەبن، ﴿وَحَالَ بَيۡنَهُمَا ٱلۡمَوۡجُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡمُغۡرَقِينَ﴾، ئنجا شەپۆلیان کەوتنە بەین و، لە خنکاوان بوو، ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ﴾، گوتراش: (کە بێگومان خوا ﷻ فەرموویەتی، بەڵام لێرەدا بۆیە بە (مجهول الفاعل) هێنراوە، چونکە هەر دیارە کێ بە زەوی دەفەرموێ: ئاوەکەت قووت بدەو، بە ئاسمان دەفەرموێ: چیدیکە مەبارێنە! ئەو هەموو کارانە دەکات؟ بێگومان هەر خوای پەروەردگارە)، ئەی زەوی ئاوەکەت قووت بدە، ﴿وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي﴾، ئەی ئاسمان! وازبێنە، واتە: چی دیکە مەبارێنە، ئاو هەڵمەڕێژە، ﴿وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ﴾، ئاوەکە ڕۆچوێنرا، برایە ناخی

زەوییەوە، ﴿ وَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ ﴾، کارەکەش تێپەڕی، بڕیارەکە جێبەجێ کرا، تۆفانەکە هاتو کافرەکان خنکان، ﴿ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِيِّ ﴾، کەشتییەکەش ڕاوەستا، لەنگەری گرت لەسەر جوودیی {(جودي) چیایەکە لە باکووری کوردستانو دەکەوێتە نێو سنووری پارێزگای ئامەد (دیاربەکر)ی ئێستا، کە لە زنجیرە چیای ئەڕاراتە}، ﴿ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، گوتراش: دووریی بۆ کۆمەڵی ستەمکاران، واتە: دووربن لە ڕەحمەتی خوا، با بڕۆن، وەك کوردەواریی دەڵێن: (ئاواو ئاو چن).

﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾، نووح ﷺ بانگی پەروەردگاری کرد، گوتی: پەروەردگارم! کوڕەکەم لە نیزیکانی منەو، بەڵێنی تۆش ڕاستە، کە فەرمووتە: نیزیکانی تۆ دەرباز دەکەم، تۆش دەست ڕۆیشتووترینو بەهێزترینی حوکمڕانانی، ﴿ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ﴾، (خوا) فەرمووی: ئەی نووح! ئەو (کوڕە) لە نیزیکانی تۆ نیە، ﴿ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ﴾، ئەو کردەوەی نا چاکە، یانی: کردەوەی باش نیە، کەواتە: مرۆڤ لە کردەوەدا بەرجەستە دەبێ، ئەویش کردەوەی باشی نەبوون، ﴿ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، ئنجا شتێکم لێ داوا مەکە کە زانیارییت دەربارەی نیە، ﴿ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، من ئامۆژگارییت دەکەم کە لە نەفامان نەبی، داوای بێجێ لە خوا نەکەی، ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، (نووح)، گوتی: پەروەردگارم! من پەنات پێدێنم کە داویەکت لێبکەم، زانیارییم دەربارەی نەبێ، ﴿ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾، ئەگەر لێم نەبووریو بەزەییت پێمدا نەیەتەوە، بێگومان من لە زیانباران دەبم، ﴿ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ﴾، گوترا: ئەی نووح! دابەزە بە ئاشتییو

سەلامەتیی و بە بەرەکەتو پیتەوە لە ئێمەوە لە سەر خۆتو، لە سەر کۆمەڵانێك کە لەگەڵ تۆ دان، واتە: لەگەڵ تۆدا سواری کەشتییەکە بوون، (دوایی دەبن بە ئەسڵ بۆ وەچە، بۆ چەندان کۆمەڵو نەتەوە)، ﴿ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، چەند کۆمەڵانێکیش هەر لە دنیادا دەیانژیەنینو پێیان دەگوزەرێنین، بەڵام دوایی لە ئێمەوە ئازارێکی بە ئێشیان پێدەگات (لەبەر ئەوەی ڕاستە ڕێ ناگرن).

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَ ﴾، ئەوانە لە هەواڵەکانی نادیارن، بۆ تۆیان دەنێرین (ئەم بەسەرهاتانە کە بۆ تۆیان دەنێرینو بۆت سروش دەکەین)، ﴿ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَا ﴾، کە نە خۆتو نە گەلەکەت لە پێش ئەمەدا، نەتاندەزانین، واتە: پێش ئەم قورئانە نەتاندەزانین، یانی: بەم وردەکارییەو بەم ڕوونییە نەتاندەزانین، هەرچەندە شتێکیشتان لەوبارەوە بیستبێ، ﴿ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾، دەجا خۆڕاگربن! بێگومان سەرەنجام بۆ پارێزکارانە.

# چیرۆکی نوح (علیه السلام) و گەلەکەی لە پێنج تەوەردا

ئێمە لە پێنج تەوەردا بەسەرهاتی نووح ﷺ و گەلەکەی باس دەکەین.

تەوەری یەکەم: پێناسەی نووح ﷺ و گەلەکەی.

تەوەری دووەم: پانتایی بەسەرهاتی نووح ﷺ و گەلەکەی لە سوورەتەکانی قورئاندا.

تەوەری سێیەم: پوختەیەک لە بەسەرهاتی نووح ﷺو گەلەکەی.

تەوەری چوارەم: درێژەی بەسەرهاتی نووح ﷺو گەلەکەی لەبەر رۆشنایی (٢٥) ئایەتەکەی سوورەتی (هود)دا.

تەوەری پێنجەم: وەڵامی چەند پرسیارێک لەبارەی نووح ﷺو گەلەکەی و کەشتیی و تۆفانەوە.

## تەوەری یەكەم : پێناسەی نووح ﷺ و گەلەكەی.

نووح ﷺ كێ بووە؟ كەی هاتوە؟ گەلەكەشی كێ بوون؟ زانیاریی لەبارەیانەوە چۆنە؟ ئێمە لە چوار خاڵی كورتدا پێناسەی نووح ﷺ و گەلەكەی دەكەین :

١/ نووح ﷺ دووەمین پێغەمبەری خوایە، كە لە دوای ئادەمەوە صەڵاتو سەلام لەسەر نووحو لەسەر ئادەمو هەموو پێغەمبەران بێ، باسكراوە، واتە: دوای ئادەم باسی ئیدریس كراوەو، دوای وی ڕاستەوخۆ باسی نووح كراوە، بە پێی ڕیزبەندیی كە بۆ ئێمە زانراوەو، دەزانیین لە ڕووی قورئانەوە: ئادەم، ئیدریس، نووح.

٢/ نووح یەكەمین ڕەوانەكراو (رسول)ە، ئەمە لە (صحیح البخاري وصحیح مسلم)دا هاتوە لەو فەرموودەیەدا كە بە (حدیثُ الشَفاعة) ناسراوە ئەو كاتەی كە مرۆڤایەتیی هەمووی لە ڕۆژی دواییدا دوای ئەوەی كە قیامەت دێ، لە گۆڕەپانێكدا كۆدەبنەوەو، زۆر نارەحەت دەبن، ئنجا دەچن بۆ لای ئادەم ﷺ داوای لێدەكەن كە داوا لە خوای پەروەردگار بكات، كە دەست بكرێ بە لێپرسینەوەی خەڵك، تاكو لەو سەغڵەتیی‌و نارەحەتییە دەربازیان بێ، بەڵام ئادەم عوزریان بۆ دێنێتەوەو دەڵێ: ئەوە بە من ناكرێ‌و، دەیاننێرێ بۆ لای نووح، ئنجا كە دەچن بۆ لای نووح، دەڵێن : {فَيَأْتُونَ نوحاً فَيَقُولُونَ: يَا نوحُ ! أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، وَسَمَّاكَ اللهُ عَبْداً شَكوراً، أَلا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلا تَرَى إِلَى مَا بَلَغَنا؟ أَلا تَشْفَعُ لَنا إِلَى رَبِّكَ؟}[1]، واتە: دەچن بۆ لای نووح دەڵێن: ئەی نووح! تۆ یەكەمین ڕەوانەكراو بووی بۆ خەڵكی سەر زەوی‌و، خوا ناوی لە تۆ ناوە: بەندەی سوپاسگوزار، ئایا نابینی ئێمە لە چ حاڵێكداین؟! ئایا نابینی گەیشتووینە چی؟! ئایا تكامان لە لای پەروەردگارت بۆ ناكەی ؟

واتە: داوای لێ دەكەن داوا لە خوا بكات، تاكو دەست بكرێ بە لێپرسینەوەو، لەو سەغڵەتیی‌و تەنگانەیە دەربازیان بێ‌و، هەر كەسەو ڕێی خۆی ببینێ.

---

١) أَخرَجَهُ أَحْمَد، برقم : (٩٦٢١)، وَالبُخَارِيُ، برقم: (٤٤٣٥)، وَمُسْلم، برقم: (١٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٤٣٤)، وَالنَّسائِي فِي الكبرى، برقم: (١١٢٨٦)، وَابْنُ أَبي شيبَة، برقم: (٣١٦٧٤) .

هەڵبەتە لە درێژەی حەدیسەکەدا هاتوە کە نووحیش ﷺ پاساوو پۆزشیان بۆ دێنێتەوە کە ئەوە کاری ئەو نیەو، دوایی دەچن بۆ لای ئیبراهیمو، پاشان بۆ لای مووساو، دوایی بۆ لای عیسا، تاکو سەرەنجام دەچن بۆ لای موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خاتەم، پێغەمبەری خواش ﷺ تکا دەکات لە لای خوای پەروەردگارو، سەجدە دەباتو بە شێوەیەك مەدحو سەنای خوای تاكو تەنیا دەکات، کە پێشتر هیچ کەس بەو شێوەیە مەدحو سەنای خوای نەکردوەو، خوای پەروەردگار لەو کاتەدا، فێری موحەممەدی ﷺ دەکات، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: (سَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ) واتە: داوا بکە، وەڵامت دەدرێتەوەو پێت دەبەخشرێو، تکا بکە، تکایەکەت وەردەگیرێ، ئیدی پێغەمبەریش ﷺ تکا دەکات بۆ هەموو مرۆڤایەتیی کە لەو حاڵە دەرباز بنو، دەست بکرێ بە لێپرسینەوەیانو، ئەوەش لە سوورەتی (الإسراء)دا ئاماژەی پێکراوە، خوا دەفەرموێ : ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ٧٩ ﴾، واتە: لە شەوگاردا شەونوێژ بکە وەك زیدە (خوا پەرستیی)یەك بۆ تۆ (ئەی موحەممەد!) نزیکە کە پەروەردگارت پێگەی ستایشکراوت پێ بدات، کە لە فەرموودەکەدا هاتوە: (يَحْمَدُهُ الأَوَّلُونَ وَالآخَرُون)، هەموو مرۆڤایەتیی ستایشی پێغەمبەر ﷺ دەکات، لەسەر ئەو تکاکردنەیو ئەو تکا وەرگیرانەیو، دەربازبوونی خەڵك لەو میحنەتو ناڕەحەتییە کە تێیدان، دیارە ئێمەش لە دوای هەر بانگێك، سوننەتە ئەو پلەیە بۆ پێغەمبەر داوا بکەین، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە : {مَنْ قَالَ حِيْنَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَامَّةِ، وَالصَّلَاةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ، وَالفَضِيلَة، وَابْعَثْهُ مَقَاما مَحْمُوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتي يَوْمَ القِيَامَةِ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٤٨٥٩)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٦١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٥٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢١١) وَقَالَ: صَحِيحٌ حَسَنٌ غَرِيب، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٧٢٢)، وَابْنُ خُزَيْمَة، برقم: (٤٢٠)، وَابْنُ حِبانَ، برقم: (١٦٨٩) عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ}.

واتە: هەر کەسێك کاتێك گوێی لە بانگ دەبێ، بڵێ: ئەی خوایە! پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تێرو تەواوەو، ئەم نوێژە بەرپاکراوە! وەسیلەو فەضیلە، بە موحەممەد ببەخشەو، ئەو پێگەیەی کە تێیدا ستایش دەکرێ کە بەڵێنت پێداوە پێی ببەخشە، (هەر کەسێك ئەو دوعایە بکات دوای بانگ) ئەوە

شەفاعەتی منی بۆ پێویست دەبێ لە ڕۆژی دواییدا، (واتە: شایستەی ئەوە دەبێ کە پێغەمبەر ﷺ شەفاعەتو تکای بۆ بکات).

٣/ هەرچەندە زانایان ڕەچەڵەکێکیان لە نووحەوە تاکو ئادەم ڕیز کردوە، کە نووح بە نۆ پشت دەگاتەوە ئادەم، بەڵام بە بۆچوونی من جێی متمانە نیە، چونکە لە تەوڕات وەرگیراوە، لە پەیمانی کۆن، بۆیە من نەمهێنا، پاشان (عبدالوهاب النجّار) لە کتێبەکەی خۆی (قصص الأنبياء) لە لاپەڕە (٣٠)دا کە دیارە ئەویش لە کتێبی (إظهار الحق)ی (رحمت الله بن خليل الرحمن الهندي)ەوە هێناویەتی، دەڵێ: (جیاوازیی لە نێوان دەقە عیبرییو سامیرییو یونانییەکەدا هەیە، واتە: ئەو تەوڕاتەی کە بە عیبریی نووسراوە، لەگەڵ ئەوەی کە بە سامیریی نووسراوە، لەگەڵ ئەوەی کە بە یۆنانیی نووسراوە، لەو مەسەلەیەی ڕەچەڵەکی نێوان نووحو ئادەم دا، جیاوازییان هەیە).

ئنجا هەڵبەتە ئەو مەسەلەیە لە نادیار(غیب)ەو غەیبیش مەگەر لە سەرچاوەیەکی متمانە پێکاوەوە هاتبێ، ئەگەرنا متمانەی پێناکرێو وەرناگیرێ، بەڵێ دەگونجێ وەك بەرچاوڕوونییەك ئینسان لێی بەهرەمەند بێ، وەك من جارجار ئاماژە دەکەم بە پەیمانی کۆن، یان پەیمانی نوێ، (العهد القديم، والعهد الجديد) وەك بەرچاوڕوونییەك، یان زێدە زانیارییەكو وردەکارییەك کە بیهێنین، ئەگەرنا هەموو ئەو شتانە کە پەیوەستن بە نادیار (غیب)ەوە، دەبێ ئەسڵەکەیان لە وەحی مەعصوومو متمانەپێکراودا هەبێ کە قورئانەو، سوننەتی ڕاستو دروستی پێغەمبەرە ﷺ، ئەوەی سەنەدەکەی ڕاست بێو لێی دڵنیا بین کە دەگەڕێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ.

٤/ واپێدەچێ گەلی نووح، هەموو مرۆڤایەتیی ئەو ڕۆژگارە بووبێ، هەڵبەتە من وای تێدەگەم، هەندێك لە زانایانیش وایانگوتوە، ئنجا من ئەوەم لە چی هەڵهێنجاوە کە واپێدەچێ، ئەو خەڵکەی نووحیان بۆ لا ڕەوانەکراوە، هەموو مرۆڤایەتیی ئەو ڕۆژگارە بووبن؟ لەوەم هەڵهێنجاوە کە خوا ﷻ لە دوای بەسەرهاتی نووح، وەك دوایی باسی دەکەینو، سواربوونی بڕواداران و شوێنکەوتووانی نووح لە کەشتییەکەداو، دوای خنکانی هەموو ئەو خەڵکەی کە بڕوایان بە نووح نەهێناوە

دوایی خوا لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ٧٧ ﴾، واتە: هەر وەچەکەی ئەومان هێشتەوە کەواتە: جگە لەوانەی کە لەگەڵ نووح دا دەربازیان بووە لە کەشتییەکەدا، کەسی دیکە نەماوەتەوە بە دەقی ئایەت، بەڵێ دەگونجێ بڵێین: واتە: لەو قەومە کە نووحیان بۆ لا ڕەوانەکراوە، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، ئەو ڕایەش ڕای بەهێزو زاڵە کە تۆفانەکەی نووح، هەموو سەر زەوی گرتۆتەوە، یان بە لای کەمەوە، هەموو ئەو شوێنانەی گرتۆتەوە، کە مرۆڤیان تێدا بوون.

کەواتە: دەبێ نووح ﵇ بۆ سەرجەم مرۆڤەکانی ئەو ڕۆژگارە نێردرابێ، چونکە ناگونجێ لە چەند شوێنێکدا مرۆڤ بوو بن و، نووحیش تەنیا بۆ لای کۆمەڵێکیان نێردرابێ، بەڵام دوایی کە تۆفان هاتوە، هەموویان خنکێنرابن! بە پێی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: تەنیا وەچەکەی ئەومان هێشتەوە.

کەواتە: دەبێ ئەوانەی کە نووح بۆ لایان ڕەوانە کراوە، هەموو ئەو مرۆڤانە بوو بن، کە لەو کاتەدا لەسەر زەوی ژیاون و، واپێدەچێ لە شوێنێکی دیاریکراویش دا بووبن، کە نووح ﵇ بتوانێ پەیامی خوا بە هەموویان ڕابگەیەنێ و، ماوەیەکی زۆریشیان لەنێودا ماوەتەوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

## تەوەری دووەم : پانتایی بەسەرهاتی نووح ﷺ و گەلەکەی لە سوورەتەکانی قورئاندا :

کە ئێمە لە دوو خاڵدا باسی دەکەین :

أ/ ناوی نووح ﷺ (٤٣) جار لە قورئاندا هاتوە، کە دیارە بە پێی خشتەیەك ئێمە ڕیزمان کردوون :

| ڕیزبەندیی سوورەت | ناوی سوورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|---|
| ٣ | آل عمران | ٢٣ |
| ٤ | النساء | ١٦٣ |
| ٦ | الأنعام | ٨٤ |
| ٧ | الأعراف | ٥٩ و ٦٩ |
| ٩ | التوبة | ٧٠ |
| ١٠ | يونس | ٧١ |
| ١١ | هود | ٢٥، ٣٢، ٣٦، ٤٢، ٤٥، ٤٦، ٤٨، ٨٩ |
| ١٤ | إبراهيم | ٩ |
| ١٧ | الإسراء | ٣، ١٧ |
| ١٩ | مريم | ٥٨ |
| ٢١ | الأنبياء | ٧٦ |
| ٢٢ | الحج | ٤٢ |
| ٢٣ | المؤمنون | ٢٣ |
| ٣٥ | الفرقان | ٣٧ |
| ٢٦ | الشعراء | ١٠٥، ١٠٦، ١١٦ |
| ٢٩ | العنكبوت | ١٤ |
| ٣٣ | الأحزاب | ٧ |
| ٣٧ | الصافات | ٧٥، ٧٩ |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٨ | ص | ١٢ |
| ٤٠ | غافر | ٥، ٣١ |
| ٤٢ | الشورى | ١٣ |
| ٥٠ | ق | ١٢ |
| ٥١ | الذاريات | ٤٦ |
| ٥٣ | النجم | ٥٢ |
| ٥٤ | القمر | ٩ |
| ٥٧ | الحديد | ٢٦ |
| ٦٦ | التحريم | ١٠ |
| ٧١ | نوح | ١، ٢١، ٢٦ = ٤٣ |

ب/ پانتایی بەسەرهاتی نووحو گەلەکەی لە قورئاندا:

بە پێی ئەوە کە من تەماشای قورئانم کردوەو، سەرنجی ئایەتەکانو سوورەتەکانم داوە، سەرجەم دەوری (١١١) ئایەتو، دەشگونجێ دوو، سێ ئایەتی دیکەشیان بخرێنە گەڵ کە ناوی (نوح)یان تێدا هاتوە، یان هەروا بە ئامازەیەك، ئامازە کراوە بۆ بەسەرهاتەکەی، بەڵام ئەوەی کە تۆزێك مەعلووماتو زانیاریی تێدا هەبێ، دەربارەی نووح ﷺ و گەلەکەی، کە چییان بەسەر هاتوە، لەو سەدو یانزە (١١١)ە ئایەتەدا هاتوە، کە (١١١) ئایەتەکەش لە کۆی (١٢) سوورەت دان:

١- سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٥٩) تا (٦٤) واتە: (٦) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

٢- لە سوورەتی (یونس)دا، ئایەتی (٧١) تا (٧٣) واتە: (٣) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

٣- لە سوورەتی (هود)دا، (٢٥) تا (٤٩) واتە: (٢٥) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

٤- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، ئایەتەکانی: (٧٦ و ٧٧) واتە: (٢) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

٥- لە سوورەتی (المؤمنون)دا، ئایەتەكانی: (٢٣) تا (٣٠)، واتە: (٨) ئایەتی بۆ تەرخان كراون.

٦- لە سوورەتی (الفرقان)دا، ئایەتی ژمارە (٣٧)، واتە: (١) ئایەتی بۆ تەرخان كراون.

٧- لە سوورەتی (الشعراء)دا، ئایەتی (١٠٥) تاكو (١٢٢)، واتە: (١٨) ئایەتی بۆ تەرخان كراون.

٨- لە سوورەتی (العنكبوت)دا، ئایەتەكانی: (١٤و ١٥)، واتە: (٢) ئایەتی بۆ تەرخان كراون.

٩- لە سوورەتی (الصافات)دا، ئایەتی (٧٥) تا (٨٢)، واتە: (٨) ئایەتی بۆ تەرخان كراون.

١٠- لە سوورەتی (القمر)دا، ئایەتی (٩) تا (١٧)، واتە: (٩) ئایەتی بۆ تەرخان كراون.

١١- لە سوورەتی (التحریم)دا، ئایەتی ژمارە (١٠)، واتە: (١) ئایەتی بۆ تەرخان كراون.

١٢- لە سوورەتی (نوح)دا، كە هەر بە ناوی (نووح)ەوەیە عليه السلام، سوورەتەكەی هەموو بۆ تەرخانكراوە، كە بیستو هەشت ئایەتە، لە ئایەتی ژمارە (١) تاكو (٢٨).

ژمارەی هەمووی دەكاتە (١١١) ئایەت لە قورئاندا، كە بۆ بەسەرهاتی نووحو گەلەكەی تەرخانكراوە، كە دیارە لە هەموو ئەو (١٢) شوێنەدا زانیاریی جۆراو جۆر، بە تەعبیرو شێوازی جۆراو جۆرو، هەرجارە بە شێوەیەكو، هەرجارە گۆشەیەكو بە شێوە دارشتنێك، كە لەگەڵ ئەو سیاقەداو، لەگەڵ ئەو هەلو مەرجەدا كە قورئانی تیدا هاتۆتە خوار، گونجاوە، بەسەرهاتی نووح عليه السلام باسكراوە.

## تەوەری سێیەم : پوختەیەك لە بەسەرهاتی نووح و گەلەكەی :

دیارە ئێمە لە حەوت خاڵدا پوختەیەك لە بەسەرهاتی نووح‌و گەلەكەی دەخەینەڕوو:

یەكەم : پاش ئادەم‌و ئیدریس (علیهما السلام) مرۆڤایەتیی لایداو، كەوتنە سەر بت پەرستیی، چونكە ماوەیەكی زۆری پێچوو، واتە: ماوەیەكی زۆر لە نێوان ئیدریس ﷺ و (نوح)دا هەبوو، ماوەیەكی پێچوو بوو، وەك لەو چەند دەقەدا - كە دوایی دەیانهێنین - چەند زانیارییەك لەوبارەوە هەن، بۆیەش لە دوای ئیدریسەوە كە ماوەیەكی پێچوو، هیچ پێغەمبەر نەهاتوون، مرۆڤایەتیی بە لاڕێدا ڕۆیشتوون‌و، تووشی بت پەرستیی‌و، تووشی دوور لە خوایی بوون، با تەماشای ئەم چەند دەقە بكەین:

أ/ {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَنَبِيٌّ كَانَ آدَمُ؟ قَالَ: نَعَمْ نَبِيٌّ مُكَلَّمٌ، قَالَ: فَكَمْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ نُوحٍ؟ قَالَ: عَشَرَةُ قُرُونٍ} {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ، بِرقم: (٣٠٣٩) وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، قَالَ الذَّهَبِيّ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَالطَّبَرَانِي في (الكبير)، برقم: (٧٥٤٥)، وَابْنُ حِبانَ، برقم: (٦١٩٠)، قَالَ شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ}.

واتە: ئەبو ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئایا ئادەم پێغەمبەر بووە؟ فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەرێك بووە، خوا ئاخاوتنی لەگەڵدا كردوە، (فەرمایشتی لەگەڵدا فەرمووە)، پیاوەكە پرسی: ماوەی چەند لە نێوان ئەوو نووحدا هەبوو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دە سەدە.

ئنجا ئایا ئەو دە سەدەیە، دەبێ مەبەست پێی هەزار ساڵ بێ، واتە: هەر سەدەی سەد ساڵ، یاخود مەبەست پێی دە پشت (جیل) بووە؟ كە جیلی ئەو كاتە هەر پشتێك ڕەنگە هەزار (١٠٠٠)ساڵ زیاتر بوو بێ، بۆ وێنە: نووح كە

(٩٥٠) ساڵ وەك پێغەمبەر لە نێو گەلەکەیدا بووە، پێش تۆفان، دیارە پێشتریش تەمەنی هەبووەو، دواتریش ماوەیەك لە نێو گەلەکەیدا ماوەتەوە، مانای وایە دەبێ لە هەزاری تێپەڕ کردبێ، ئنجا ئایا مەبەست لە سەدە (قرن)، بە پێی ژیانی مرۆڤەکان بووە لە جیلێکدا لەو کاتەدا، کە مەرج نیە وەك ئێستا بووبێ، کە جیلی ئێستا (٦٠) یان (٧٠) ساڵە، یاخود ئەوپەڕی (١٠٠) ساڵە؟! پێم وایە زۆر دوورە جیلی ئەو کاتەش هەر ئەوەندە بووبێ، بە هەر حاڵ ئەوە دیار نیە، گرنگ ئەوەیە ماوەیەکی زۆر لە نێوان ئادەمو نووحدا (علیهما السلام)، هەبووە.

ب/ {عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ بَيْنَ آدَمَ وَنُوحٍ عَشَرَةُ أَقْرُنٍ، كُلُّهَا عَلَى الإِسْلَامِ} {أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَةَ، برقم: (٣٤٦٢٩)، وَالبَزَّار، برقم: (٤٨١٥) وَغَيْرُهُمَا}.

واتە: عیکریمە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: لە نێوان ئادەمو نووحدا، دە سەدە هەبوون، هەموویان لەسەر (شەریعەتی) ئیسلام بوون.

واتە: تاکو دە وەچەو دە سەدە لە دوای ئادەم، وەچەی ئادەمو کوڕو کچەکانی ئادەم، هەر لەسەر دینداریيو خوا پەرستییو خوا بەیەکگرتن بەردەوام بوون، بەڵام دوایی تووشی لادان بوون.

ج/ {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَنْ تَفْسِيرِ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾﴾ نوح، هَذِهِ أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نوحٍ، فَلَما هَلَكُوا أَوْحَى الشيطانُ إِلَى قَوْمِهِمْ أَنْ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمْ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ، أَنْصَابًا وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ، فَفَعَلُوا، فَلَم تُعْبَدْ حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ وَتَنَسَّخَ الْعِلْمُ، عُبِدَتْ، قَالَ: صَارَتْ الأَوْثَانُ الَّتِي كَانَتْ فِي قَوْمِ نوحٍ فِي الْعَرَبِ بَعْدُ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيّ، برقم: (٣٩٧)، باب : تفسير سورة نوح}.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، لە كاتی ڕوونكردنەوەی فەرموودەی خوای بەرزدا كە دەفەرمووێ : ﴿ وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ ﴾نوح، كە نووح عليه السلام دەگێڕێتەوە: قەومەكەی چۆن دەستیان كردوە بە بت پەرستیی، دەڵێ: گوتیان واز لە وەددو سواع‌و یەغووث‌و یەعووق‌و نەسڕ (كە ناوی پێنج بتان بوون) مەهێنن‌و هەر بیانپەرستن. ئنجا عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ئا ئاوانە ناوی پیاوانێكی باش بوون، (پیاوانێكی صالح‌و بۆ خوا صوڵحاو بوون) لە گەلی نووح، دوای ئەوەی كە مردوون، شەیتان وەسوەسەی كردوە بۆ خەڵكەكەیان، كە لەو شوێنانەی تێیان دا بوون‌و خوا پەرستییان تێدا كردوون، بێنن پەیكەریان بۆ دابنێن‌و، بە ناوی ئەوانیشەوە پەیكەریان بۆ دابنێن، ئەوانیش وایان كردوەو لە سەرەتاوە ئەو پەیكەرانە نەپەرستراون، بەڵام دوای ئەوەی ئەوانەی پەیكەرەكانیان داناوە مردوون‌و، وردە وردە زانیاریی نەماوە، (واتە: زانیاریی بە شەریعەت‌و بە خوا بە یەكگرتن نەماوە)، ئنجا دەستیان كردوە بە پەرستنیان.

عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: دوایی ئەو بت‌و صەنەمانە، كە لە نێو گەلی (نوح)دا بوون، هاتنە نێو گەلی عەرەبیشەوە.

لە شوێنی دیكەدا هاتوە كە ئەوانە بۆیە وێنەی ئەو پیاو چاكانەیان لە پەرستگاكانی خۆیاندا كێشاوەو پەیكەریان بۆ داناون، گوتوویانە: بۆ ئەوەی كە ئەوانمان بینی، خوا پەرستیی‌و تاعەتی ئەوانمان بێتەوە بیر، تاكو ئێمەش وەك ئەوان خوا پەرست بین، بەڵام دوایی وردە وردە خوا پەرستییەكەی ئەوانیان لە بیر چۆتەوەو، خودی ئەوانیان پەرستوە، كە بەشەر ئاوا زوو هەڵدەخەڵەتێ، ئەگەر وەحی دەستی نەگرێ‌و بە هیدایەتی خوا، عەقڵ‌و دڵی ڕۆشن نەبێ، بەشەر زیاتر ڕواڵەت بین‌و كورت بینەو، مامەڵەی بەرهەستی پێ خۆشترە لە مامەڵەكردن لەگەڵ نادیار (غیب)دا، هەر بۆیەش خوا ﷻ لە سەرەتای سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرمووێ : (بسم الله

الـرحمن الـرحيم ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ... ﴿٣﴾ ﴾، ئەلیف، لام، میم، ئەم قورئـانە هیچ دوو دڵیی تێدانیە، ڕێنماییە بۆ پارێزکاران، ئەوانەی بڕوا بە نادیارو بە پەنهان دێنن.

د/ {عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلمةَ، ذَكرتا كَنِيسةً رَأَيْنَهَا فِي أَرْضِ الحَبَشَةِ يُقَالُ لَـهَا: مارِيـةُ، وَذَكَرنَ مِنْ حُسْنِهَا وَتَصَاوِيرَ فِيهَا، فَرَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ رَأْسَهُ، فَقَالَ: إِنَّ أُولَئِكَ إِذَا مَاتَ مِنْهُمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ، بَنَوا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِداً، ثُمَّ صَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ} {أَخْرَجَهُ مالِك، برقم: (٧٦٦)، وَالبُخارِيُّ، برقم: (١٢٧٦)، وَالنَّسائِي فِي الكُبْرَى، برقم: (٦٩٤)، وَابْنُ حِبان، برقم: (٣١٨١)}.

واتە: دایکی بڕواداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك ئوممو سەلەمەو ئوممو حەبیبە (ئەوانیش هەردووکیان هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەری خوانو لە دایکانی بڕوادارانن)، باسی ئەو کڵێسەیان کرد کە لە وڵاتی حەبەشە بینیویانە، ناوی ماریە بووەو، باسیان کرد کە کڵێسایەکی ئەوەندە جوان بووەو ئەو هەموو نەخش‌و نیگارو وێنەو پەیکەرانەی تێدا بوون، پێغەمبەریش ﷺ لەو کاتەدا سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: ئەوانە ئەگەر پیاوێکی صاڵحیان لە نێودا مردبایە، لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتێکیان دروست دەکرد، دوایی وێنەی ویان لەسەر دەکێشا، ئا ئەوانە خراپترین دروستکراوانی خوای زاڵی پایە بەرزن.

ئنجا کە گەلی نووح ئاوا دەست دەکەن بە بت پەرستیی، خوا ﷻ نووح دەنێرێ، وەك لە سەرەتای سووڕەتی (نوح) {ئایەتی ژمارە (١ - ٣)} دا خوا ﷻ باسی چۆنیەتی ڕەوانەکردنی (نووح)ی کردوە، هەروەها لە سووڕەتی (الأعراف)داو، لە سووڕەتی (الشعراء)داو، لە سووڕەتی (هود)دا، باس دەکات، لە سەرەتای سووڕەتی (نوح)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ

أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾﴾، واتە: ئێمە نووحمان بۆ لای گەلەکەی ڕەوانە کرد کە: گەلەکەت بترسێنەو وریایان بکەوە بەرلەوەی سزایەکی بە ئێشیان بۆ بێ، نووحیش چووە لایانو گوتی: ئەی گەلەکەم! من بۆ ئێوە ترسێنەرو وریا کەرەوەیەکی ئاشکرام، کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەنو، پارێزی لێبکەنو، فەرمانبەریی من بکەن (بۆ ئەوەی بە ڕێی خواتاندا بەرم).

ئنجا لە درێژەی ئایەتەکان دا دەردەکەوێ، کە لە ڕاستییدا سووڕەتی (نوح) وەك ئەوە وایە کە نووح عليه السلام ڕاپۆرتی خۆی، دەربارەی کارو چالاکییو بانگەوازیی خۆیو، زەحمەتو ماندووبوونی خۆیو، کەللەڕەقیی گەلەکەی خۆی، بۆ خوای پەروەردگار بگێڕێتەوە، کە دوایی وەك زەمینە سازیی دەبێ، بۆ ئەو پاڕانەوەو داوایەی کە لە خوای پەروەردگار دەیکات، تاکو ئەو گەلە کەللە ڕەقە لە بەین بەرێ، وەك لە درێژەی سووڕەتەکەدا هاتوە.

دووەم: نووح عليه السلام زۆر خۆ ڕاگرانەو، زۆر پشوو درێژانە لەگەڵ گەلەکەیدا بانگەوازی کردو خەریك بوو تاکو بیانهێنێتە سەر ڕێو، نۆسەدو پەنجا(٩٥٠) ساڵ لە نێویاندا بانگەوازی کرد، وەك لە سووڕەتی (العنكبوت) ئایەتی (١٤)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٤﴾﴾، واتە: بێگومان نووحمان بۆ لای گەلەکەی ڕەوانە کرد، ئنجا هەزار ساڵ لە نێویاندا مایەوە جگە لە پەنجا، (واتە: (٩٥٠) ساڵ لە نێویاندا مایەوە) دوایی تۆفان گرتنی لە کاتێکدا کە ستەمکار بوون.

کەواتە: نووح پێش تۆفان، نۆ سەدوپەنجا (٩٥٠) ساڵ لە نێو گەلەکەیدا ماوەتەوە، ئنجا بۆ ئەوەی بزانین نووح عليه السلام ئەو (٩٥٠) ساڵە چی گوتومو چی کردوە؟! با سەرنجێکی ئەو بازدە ئایەتەی سووڕەتی (نوح) بدەین، واتە: ئایەتی: (٥) تا (٢٠)و، بە کورتیی مانایان دەکەین، کە ئەمە دەقەکەیانە:

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَاءِي إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّي
كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ
وَأَصَرُّوا وَٱسْتَكْبَرُوا ٱسْتِكْبَارًا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعْلَنتُ
لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ
ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ
أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ
خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا
﴿١٦﴾ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾
وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾ ﴾.

{واتە: (نووح) گوتی: پەروەردگارم! من بە شەوو ڕۆژ بانگی گەلەکەم کرد
﴿٥﴾ بەڵام بانگکردنی من، هەر ڕاکردنو دوورکەوتنەوەی تێدا زیادکردن ﴿٦﴾
ئنجا من هەر کاتێك بانگم دەکردن، تاکو تۆ لێیان ببووری، پەنجەکانی خۆیان
دەخستنە گوێیەکانیانەوەو، بە پۆشاکەکانیان خۆیان دادەپۆشیو، هەر بەردەوام
بوون لەسەر کوفرو، خۆیان بە زلگرت، بە خۆ بەزل گرتنێکی دەگمەن ﴿٧﴾
پاشان من بە دەنگی بەرز بانگم کردن ﴿٨﴾ دوایی من بە ئاشکرا بانگم کردنو،
بە پەنهانییو لە پەنامەکییشدا بانگم دەکردن ﴿٩﴾ پێمگوتن: داوای لێبوردن
لە پەروەردگارتان بکەن، بێگومان ئەو زۆر لێبوردەیە ﴿١٠﴾ ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ
لای پەروەردگار، لە سەرێوە ئاوی بە خوڕزەمتان بەسەردا دەڕێژێ ﴿١١﴾ هەروەها
بە سامانو بە کوڕان (واتە: وەچەتان زۆر دەکات ماڵو سامانتان زۆر دەکات)،
هاوکارتان دەبێو بۆتان زیاد دەکاتو، باغو بێستانی زیاترتان بۆ دەڕەخسێنێو،

وا دەكات ڕووبارو جۆگاوجۆبار بەلای كۆشكەكانتانداو بە نێو باغەكانتاندا بڕۆن ﴿١٢﴾ بۆچی سامو هەیبەتتان بەرانبەر بە خوا نیەو ڕێزی لێ ناگرن ﴿١٣﴾ لە حاڵێكدا كە ئێوەی بە چەندان قۆناغ دروست كردوە (لە سكی دایكتاندا) ﴿١٤﴾ ئایا نابینن كە خوا حەوت ئاسمانی لەسەر یەكدی دروست كردوون! ﴿١٥﴾ هەروەها مانگی تێدا ڕووناك كردوونەوەو، خۆری تێدا كردوون بە چرایەكی تیشكدەر! ﴿١٦﴾ ئنجا خوا ئێوەی لە زەویدا پێگەیاندوە (وەك ڕووەكێك كە دەڕوێ) ڕواندوونی لە زەویدا ﴿١٧﴾ دواییش هەر دەتانگێڕێتەوە بۆ نێو زەویو، جارێكی دیكەش لەوێ دەرتان دێنێتەوەو زیندووتان دەكاتەوە ﴿١٨﴾ هەروەها خوا زەمینی وەك بەڕەیەك، وەك فەرشێك بۆ ڕاخستوون ﴿١٩﴾ تاكو لەو سەر زەوییە، ڕێو بانان لە دۆڵو شیوەكانی دا پەیدا بكەن ﴿٢٠﴾}.

ئاوا نووح ﷺ بەو شێوەیە (٩٥٠) ساڵی لە نێو گەلەكەیدا گوزەراند.

سێیەم : بەڵام دیارە ئەوان ئەو هەموو ماندووبوونو هەوڵو تەقەللاو دەردەسەرییو دڵسۆزییەی نووح ﷺ هیچ سوودی پێنەگەیاندنو، جگە لە ژمارەیەكی كەم بە دەنگیەوە نەهاتنو، سەرەنجام پاش ئاگاداركردنەوەی خوا ﷻ بۆ نووح ﷺ كە با لێیان نائومێد بێ، (واتە: خوا ئاگاداری كردوە كە تازە كەسیان بڕوا ناهێنێ)، وەك لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ : ﴿ وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: سروش كرا بۆ نووح، پێی ڕاگەیەندرا، كە لە گەلەكەت هەرگیز كەسی دیكە بڕوا ناهێنێ، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوە، ئنجا زۆر خەفەتبار مەبە بەهۆی ئەوەوە كە دەیكەن.

دوای ئەوەی خوا ئاگاداری كردوە، كە تازە كەسیان بڕوا ناهێنێ، بۆیە لێیان نائومێد بووەو، ئەم پاڕانەوەیەی كرد، وەك لە سووڕەتی (نوح)دا هاتوە:

﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟

عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓاْ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾﴾، واتە: نووح گوتی: پەروەردگارم! تاکێك لەسەر زەوی لە کافران مەهێڵە، {(دیَّار): یانی: ماڵ نشینێك، کەسێك کە لە خانوودا نیشتەجێ دەبێ}، مەهێڵە چونکە ئەگەر تۆ بیانهێڵی، دوایی بەندەکانت گومڕا دەکەن‌و، ئەوەی کە لێشیان دەبێ، هەر تاوانبارو بێبڕوایە.

چـوارەم : خوای دادگەرو کارزانیش پاڕانەوەکەی نووحی گیرا کرد، چونکە لەکاتی خۆیدا بووو، دوای ئەوە بوو کە خوا ﷻ ئاگاداری کردبۆوە، کە تازە کەسیان بڕوا ناهێنێ‌و، فەرمانی بە نووح کرد، کە کەشتییەك دروست بکات، تاکو خۆی‌و شوێنکەوتووانی‌و، لە هەر ژیاندارێك جووتێك سوار بکات، تاکو خوا سەر زەوی لە کافرەکان پاك بکاتەوەو، بژارێکی باشی ئەم سەر زەوییە بکات، لەو کافرە ملهوڕانەی کە پێغەمبەرێکی پایەبەرزی وەك نووح ﷺ نۆ سەدو پەنجا (٩٥٠) ساڵ لەگەڵیاندا خەریك بووە، خۆی ماندوو کردوە، کەچی سوودی نەبووە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾﴾المؤمنون، کە دوایی ئێمە بە درێژیی تەفسیری ئایەتەکان دەکەین، پێشتریش لە مانای گشتییەکەدا تۆزێك مەبەستەکەمان ڕوونکردۆتەوە واتە: بە (نوح)مان ڕاگەیاند: لە ژێر چاودێریی ئێمەداو، بە ڕێنمایی ئێمە کەشتییەکە دروست بکە، هەتا کاتێك کە فەرمانی ئێمە هات، (واتە: فەرمانی ئێمە هات، بە هەڵسانی تۆفان‌و لافاو)و، تەندوورەکە فوڵپی داو هەڵقوڵی، (واپێدەچێ ئەمە نیشانەیەکی نێوان خوای پەروەردگارو نووح بووبێ، کە هەرکات تەندوور ئاوی لێ هەڵقوڵی، واتە: تۆفان دەست پێدەکات، پێمان گوت:) لە هەر جووتێك دووان (واتە: لە جۆری هەر ئاژەڵێك نێرو مێیەك)، سواری کەشتییەکە بکە، (لەو پەلەوەرو ئاژەڵانەی کە لەسەر وشکانیی نەبێ، ناژین، لە ئاودا دەخنکێن)و نیزیکەکانیشت، جگە لەوانەی کە پێشتر بڕیار لەبارەیانەوە

دەرچووەو، ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە، وە جگە لە کەمێکیش بڕوایان پێ نەهێنابوو.

پێنجەم : سەرەنجام هەموو گەلی نووح خنکانو، تەنیا خۆیو سێ کوڕەکەیو سێ بووکەکەی، لەگەڵ هاوسەرێکی دەربازیان بوو، لەگەڵ هەندێك لەوانەی دیکە کە بڕوایان پێی هێنابوو، ئەوە بەڕای هەندێك لە زانایان، چونکە هەندێك لە زانایان دەڵێن: تەنیا نووحو هاوسەری، لەگەڵ حامو سامو یافیث، کە سێ کوڕەکەی بوون، لەگەڵ هاوسەرەکانیان، واتە: هەموو کەشتییەکە ئەو هەشت (٨) کەسەی تێدا بوون، ئەم ڕایەش زۆر ڕێی تێدەچێ، با تەماشای ئەم ئایەتانە بکەین :

لە سووڕەتی (الصافات) ئایەتی (٧٥) تا (٨٢)دا، خوای پەروەردگار لەو هەشت ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾، واتە: بێگومان نووح بانگی کردین (لێمان پاڕایەوە)، ئێمەش باشترین وەڵامدەرەوەی بووینو، خۆیو کەسوکارو نیزیکەکانیمان لە بەڵاو خەفەتی گەورە دەرباز کردو، هەر وەچەکەی ئەومان هێشتەوەو، بەوە خەڵاتمان کرد، لە نێو میللەتانی دواییدا، کە ئاشتیی (خوا) لەسەر نووح لە نێو جیهانییاندا، ئاوا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ئەو لە بەندە بڕوادارەکانی ئێمە بوو، دوایی ئەوانی دیکەمان خنکاند.

بە پێی ئەمەش کە دەفەرموێ : ﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴾، وا دێتە بەرچاو کە تەنیا نووح عليه السلام و هاوسەری، لەگەڵ سێ کوڕەکەیو سێ بووکەکەی، ڕزگاریان بووبێ، کە دیارە لە تەوڕاتیش وا دەڵێو، ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێ.

هەڵبەتە ئێمە دوایی باس دەکەین، کە دەبێ نووح ﷺ دوو هاوسەری بووبن، چونکە بە تەئکید هاوسەرێکی کافر بووە، وەك لە ئایەتی ژمارە (١٠)ی سوورەتی (التحریم)دا هاتوە، کە بە دڵنیایی لەگەڵی سواری کەشتییەکە نەبووە، کەواتە: هاوسەرێکی دیکەی هەبووە، ناوی سێ کوڕەکانیشی لە تەوراتدا هاتوە، بەڵام لە مێژوونووسانیش دەماودەم باسکراون، دیارە ئێمە دواتر وردەکاریی زیاتر لەوبارەوە باس دەکەین.

شەشەم: دوای ئەوەی گەلی نووح ﷺ قڕەبڕ بوونو کەسیان لێ نەماوەو جۆماڵ کراون، ئنجا کەشتییەکە لەسەر چیای جوودیی نیشتۆتەوە، وەك خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٤٤)ی سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: گوترا: ئەی زەوی! ئاوەکەت قووتبدە، هەڵیلووشەو، ئەی ئاسمان! واز بێنە، چی دیکە مەبارێنەو، ئاوەکە بە زەویدا ڕۆچوێنراو، کارەکە تێپەڕیو، کەشتییەکە لەسەر چیای جوودیی لەنگەری گرتو، گوترا: دووریی بۆ کۆمەڵی ستەمکاران.

بەو شێوەیە، کۆتایی بە گەلی نووح هاتو نووحو ئەوانەی لە کەشتییەکە لەگەڵی سوار بوو بوون، ڕزگاریان بوو.

حەوتەمو کۆتایی: یەکێك لە خنکاوانیش کوڕی نووح بووە، کە لە تەوراتدا دەڵێ: ناوی کەنعان بووەو، لەلای مێژوونووسانی دیکەش، کەمو زۆر ئەوە باسکراوە، ئنجا ئایا هەر لە تەوراتەوە هێناویانە، یاخود لەو چیرۆكو بەسەرهاتانە بووە کە دەماو دەم گێڕدراوەنەوە؟ دیارە کوڕەکە ـ وەك دوایی بە درێژیی باسی دەکەین ـ کە بابی داوای لێ دەکات لەگەڵی سواری کەشتییەکە بێ، سوار نابێو، سەرەنجام شەپۆل دەکەوێتە نێوانیانو دەخنکێ.

ئنجا ئایا نووح ﷺ دەبێ دوای ئەوەی کە تۆفانەکە نیشتۆتەوە، یاخود پێش ئەوە لە خوا پاڕابێتەوە؟ هەرچەندە لە ڕیزبەندیی باسکردنەکەدا خراوەتە

دوایی، بەڵام ناگونجێ تۆفان بنیشیتەوەو نووح بزانێ كە كەس نەماوە، جگە لەوانەی كە لە كەشتییەكەدا لەگەڵی سوار بوون، كە دیارە ئەو كاتە دەبێ دڵنیا بووبێ، كە كوڕەكەی نەماوە، ئاوا لەو كاتەدا لە خوا بپاڕێتەوە! بۆیە ناگونجێو ڕێی تێناچێ ئەو كاتە لە خوا پاڕابێتەوە، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ :

﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ۝٤٥ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ۝٤٦ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ۝٤٧ ﴾.

واتە: نووح بانگی پەروەردگاری كرد، (لێی پاڕایەوە)، گوتی: پەروەردگارم! كوڕەكەم لە نیزیكانی منەو، بەڵێنی تۆش ڕاستەو، تۆش بەهێزترینو دەستڕۆیشتووترینی حوكمڕانانو بڕیاردەرانی، (واتە: سۆراغی كوڕەكەم دیارنییەو، تۆش بەڵێنت داوە نیزیكانو بنەماڵەی من دەرباز بكەی)، خوا ﷻ فەرمووی: ئەو (كوڕە)، لە نیزیكانی تۆ نیە، چونكە كردەوەی باش نیە، من ئامۆژگارییت دەكەم كە لە نەفامان بی، نووح فەرمووی: پەروەردگارم! من پەنا دێنمە بەر تۆ كە لە نەفامان بم، یان داوایەكت لێ بكەم كە زانیارییم پێی نەبێو، ئەگەر تۆ لێم نەبووریو بەزەییت پێم دا نەیەتەوە، لە زیانباران دەبم.

## تەوەری چوارەم : درێژەی بەسەرهاتی نووح و گەلەکەی لەبەر ڕۆشنایی (٢٥) ئایەتەکانی سوورەتی (هود) دا :

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :**

**ڕەوانەکرانی نووحو گەیاندنی پەیامەکەی بە گەلەکەی :**

خوا ﷻ دەفەرمویٚ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە نووحمان بۆ لای گەلەکەی ڕەوان کرد، پێی گوتن: من بۆ ئێوە ترسێنەرو ورياکەرەوەیەکی ئاشکرام، هاتووم پێتان بڵێم: کە جگە لە خوا نەپەرستن، من مەترسیی سزای ڕۆژێکی بە ئێشتان لیٚ دەکەم، (واتە: ئەگەر لەسەر پەرستنی غەیری خوا بەردەوام بن).

بۆیە دەفەرمویٚ : ﴿ وَلَقَدْ ﴾، کە دیارە (و)ەکە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە بۆ سەر پێشیٚو (واو العَطف)ەو دەیگێڕێتەوە بۆ سەر پێشیٚ، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! وەك چۆن وەحییمان بۆ تۆ کردوە، لەسەردەمو ڕۆژگاری خۆتدا، پێشتریش پەیامو وەحییمان ناردبوو بۆ نووح ﷺو، نووحمان بۆ لای گەلەکەی ڕەوانە کردبوو، ئنجا جەخت کردنەوەکە لەبەر گومانو نکووڵیی لێکردنی کافرەکانە، یانی: هیچ گومانتان نەبیٚ، کە ئێمە ڕەوانەمان کردبوو بۆ لای گەلەکەی، هەر لەخۆوە نەچوو بووو، قسەی گیرفانی خۆی نەبوو، بەڵکو پەیامی ئێمە بوو، پێی ڕادەگەیاندن.

کە دەفەرموێ : ﴿ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ ﴾، (قوم) یانی: کۆمەڵە خەڵکێك، کە ئەو کۆمەڵە خەڵکە، واپێدەچێ هەموو ئەو مرۆڤانە بووبن، هەموو ئەو بەشەرانە بووبن، کە ئەو کاتە لەسەر زەوی ژیاون، وەك پێشتریش باسمان کرد، چونکە دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: هەموومان لەبەین بردن، تەنیا وەچەکەی نووحمان هێشتەوە، لەسەر زەوی، کەواتە: دەبێ ئەوانەی کە نووحیان بۆ لا رەوانە کراوە، هەموو ئەو مرۆڤانە بووبن، کە ئەو کاتە لەسەر زەوی بوون‌و، دەبێ لە شوێنێکی دیاریکراویش بووبن، چونکە لەگەڵ حیکمەت‌و میهرەبانیی‌و دادگەریی خوا ﷻ ناگونجێ، بەشەری دیکە لە شوێنی دیکە بووبن، نووح بۆ لایان نەچووباو، هیچ پێغەمبەری دیکە بۆ لایان نەچووبن‌و، بە تۆفانەکەی نووحیش خنکابن، بێئەوەی بزانن لەسەر چی دەفەوتێن‌و تۆفان لێیان دەدا! چونکە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ۝١٥ ﴾الإسراء، واتە: ئێمە سزای خەڵك نادەین، تاکو پێغەمبەر رەوانە نەکەین، کە دەگونجێ مەبەست پێی سزای دنیایی بێ، واتە: لە دنیادا بەڵایان بۆ نانێرین‌و سزایان نادەین، هەتا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین‌و، ئەو پێغەمبەرە ﷺ پەیامی خوایان پێرانەگەیەنێ، ئنجا ئەوانیش ئەگەر وەڵامی نەرێنیی‌و خراپیان هەبێ، ئەو کاتە شایستەی سزادان دەبن، هەروەها لە دوارۆژیشدا هەر بە هەمان شێوە لە سوورەتی (الأعراف)دا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ۝٥٩ ﴾، واتە: بێگومان نووحمان بۆ لای گەلەکەی رەوان کرد، گوتی: ئەی گەلەکەم! بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، من مەترسیی رۆژێکی مەزنتان لێ دەکەم.

لێرە دەفەرموێ : ﴿ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾، کە دیارە سزای خوا، هەم مەزنەو، ئەو رۆژەش کە سزای خوای تێدا دێ، هەم رۆژێکی مەزنە، هەم رۆژێکی بە ئێش‌و ژانە.

ئنجا پەیامەکەی نووح ﷺ کە پێی ڕاگەیاندن، چی بوو؟! ﴿أَن لَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، بێجگە لە خوا مەپەرستن، بەندایەتیی بۆ غەیری خوا مەکەن، بەندایەتیی بە مانای فراوانو گشتگیری، واتە: هیچ کەستان وەك خوا خۆشنەوێو، هیچ کەستان بەقەدەر خوا لەلا مەزنو گەورە نەبێو، وەك بۆ خوا ملکەچن، بۆ هیچ کەس وا ملکەچ مەبنو، تەنیا پشت بە خوا ببەستنو، تەنیا سامو ترستان بەرانبەر بە خوا هەبێ، تا کۆتایی ئەو شتانەی کە تایبەتن بە خوای پەروەردگارەوە، بە هەموویان چەمكو واتای بەندایەتییو پەرستن پێك دێنن.

کە نووح ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ﴾، هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥٩﴾، من مەترسیی ئازاری ڕۆژێکی بە ئێشتان لێ دەکەم، مەترسیی ئازاری ڕۆژێکی مەزنتان لێ دەکەم، دەگونجێ مەبەست پێی سزای دنیا بێو، دەشگونجێ مەبەست پێی سزای دواڕۆژ بێ، کە هەم سزا دنیاییەکە گەورەش بووو بە ئێشیش بووو، هەم سزا قیامەتییەکەش بە تەئکید بە ئێشتریشەو مەزنتریشە.

## مەسەلەی دووەم:

**بەرپەرچدانەوەی زەق و ڕەق و بێ نەزاکەتی گەلی نووح ﷺ بۆ داواو بانگەوازی نووح ﷺ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ ٢٧﴾، واتە: دەستڕۆیشتووانێك کە بێبڕوا بوون لە گەلەکەی، یانی: ئەو بڕیار بە دەستو دەستڕۆیشتووانەی کە

هەمیشە حیسابیان بۆ خەڵك و كۆمەڵگا نەكردووە، هەمیشە خۆیان بە دەمڕاست و بڕیار بەدەست و قسەكەری خەڵك زانیوە، پێیان وابووە كە خەڵك وەك مەڕو ماڵێك وایە، دەبێ ئەوان شوان و گاوانی بن، ئەمما خەڵك مافی نیە، كە بۆخۆی بیر بكاتەوە، بۆیە هەمیشە لە قورئاندا خوا ﷻ باسی (ٱلۡمَلَأُ ) دەكات، یانی: دەستڕۆیشتووان، ئەوانەی كە چاوی خەڵك پڕ دەكەن لە سەرسامیی و دڵیان پڕ دەكەن لە سام و هەیبەت، بە هۆی زرق و برق و، خۆ ڕانواندن و كەشخەلێدانێكەوە كە بەسەر خەڵكی دا دەیكەن، بەو سامان و هێزەوە كە لە دەوروبەری خۆیان كۆی دەكەنەوە، وەك چۆن ئەو پەلەوەرانەی كە هەست بە نوقصانیی و ناتەواویی دەكەن لە خۆیاندا، خۆیان فش دەكەنەوە، (تَكَبُّر و إستكبار) یانی: چی؟ یانی: خۆ گەورە كردن، خۆ بە زل گرتن، یانی: گەورە نیە، بەلام خۆی گەورە دەكات، جا ئەو دەستڕۆیشتووانەی كە بێبڕوا بوون لە گەلەكەی، ئاوا وەلامی نووح ﷺ یان دایەوە.

كە لە چوار بڕگەدا دەیخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەكەم :** ﴿مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثۡلَنَا﴾، ئێمە تەنیا وەك مرۆڤێكی وەك خۆمان دەتبینین و، مرۆڤی وەك و ئێمەش شایستەی ئەوە نیە ببێتە نوێنەری خواو پێغەمبەری خوا، مەبەستەكەیان ئەوەیە، واتە: تۆش تەنیا مرۆڤێكی وەك ئێمەی و، ڕێت ناكەوێ و شیاوو شایستەی ئەوە نی، خوا بتكاتە نوێنەرو ڕەوانەكراوی خۆی و، بەتایبەت پەیامت بۆ بنێرێ و، فەرمایشتت لەگەڵدا بكات، دیارە وشەی (بشر) واتە: مرۆڤ نێر بێ، یان مێ بێ، تاك یان كۆ بێ، هەر پێی دەگوترێ: (بشر)، جاری واش هەیە (بشر) كراوە بە دووان، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿...لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا...﴿٤٧﴾﴾ المؤمنون، بەلام كە گوترا: (بشر) واتە: تاك و كۆ، نێرو مێ دەگرێتەوە.

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ ﴾ ناشبینین هیچکەس شوێنت کەوتبێ، جگە لەوانەمان کە بێبایەخن‌و، عەقڵ سووکن‌و، زوو بڕوا بە شت دەکەن‌و کەم هۆشن.

وشەی (أراذل) کۆی (أرذل)ە، یاخود کۆی (رذل)ە، (رذل: المحْتَقَرُ المرْغُوبُ عَنْهُ لِرَذَائَتِهِ)، (رذل) بریتیە لە کەسێك کە بە سووك تەماشا بکرێ‌و، نەویسترێ لەبەر خراپییانی.

کە دەفەرموێ : ﴿ بَادِىَ ٱلرَّأْىِ ﴾، (بادِي) دەڵێ: (بَدَا، يبدو يعني: ظَهَرَ)، یانی: ڕایەکی ڕووکەشیان هەیە، عەقڵێکی ڕووکەشیان هەیە، کە دیارە خوێندراویشەتەوە: (باديءَ الرأيِ) (باديء) یانی (أول)، واتە: کەسێك کە ڕایەکی سەرەتای هەیە، عەقڵێکی سەرەتای هەیە، هەر لە سەرەتاوە بڕوا بە شت دێنێ، بەبێ ئەوەی لێی بکۆڵێتەوەو لێی تێبگات، دیارە پێشێ لە بڕگەی یەکەمدا، دەست ڕۆیشتووان‌و خۆ بە زلگرانی گەلی نووح، نووح ﷺ تۆمەتبار دەکەن، دەڵێن: تۆ ڕاست ناکەی، تۆش بەشەرێکی وەك ئێمە، بەشەریش شایستەی ئەوە نیە کە خوا بیکاتە پێغەمبەرو نوێنەری خۆی، ئەوانە لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوون، هەروەك چۆن ئێستاش کەسانێك کە خۆیان بە مەیموون زادەو، بە وەچەی چەقەڵ‌و بۆق‌و ئەو ئاژەڵ‌و شتانە دەزانن، زۆر بە سووکیی تەماشای مرۆڤ دەکەن‌و پێیان وایە کە مرۆڤ لەوە کەمترو بچووکترە بتوانێ ببێتە پێغەمبەری خواو، جێنشینی خوا، بەڵام ئەوانە لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوون، بەڵێ مرۆڤ ئەگەر ئاگای لە خۆی نەبێ، زۆر دەچێتە خوارێ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ۝٥ ﴾التین، بەڵام ئەگەر ئاگای لە خۆی بێ‌و، تێبکۆشێ‌و، لە خوا نیزیك بێ‌و، بەندایەتیی ڕاست‌و دروست بۆ خوا بکات، زۆر بەرز دەبێتەوەو دەچێتە (أعلى عليِّين)، هەروەك چۆن ئەگەر شۆڕیش بێتەوە، دەتوانێ بچێتە (أسفل سافلين).

دوایی کافرە خۆبەزلگرەکان، شوێنکەوتووانی نووح تۆمەتبار دەکەن کە ئەوانە خەڵکی هەرچی‌و پەرچی‌و سادەو بێ بایەخن، پاشان عەقڵ سووکیشن، زوو بڕوا بە شت دەکەن.

هەڵبەتە هەموو خۆ بەزلگرەکانی مێژوو هەروا بوون، هەمیشە خەڵكو جەماوەرێك كە پشتگیری هەق دەكەنو بە دوای پێغەمبەران دەكەون، بە خەڵكی سادەو هەرچیو پەرچیو خەڵكی بێ بایەخو عەقڵ سووكیان تەماشا دەكەن، هەمیشە خۆ بەزلگریی وا لە مرۆڤ دەكات، كە خۆی زۆر پێ گەورە بێ، خەڵكیشی زۆر پێ كەم بێ، كە لە ڕاستییدا نە خۆی زۆر گەورەیەو، نە خەڵكیش زۆر كەمە، هەموو وەك یەكنو، تەنیا بە چاكە ئینسان بەرز دەبێتەوەو، بە خراپەش نزم دەبێتەوە.

**برگەی سێیەم :** ﴿ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ ﴾، هیچ چاكەیەكی ئێوەش بەسەر خۆمانەوە نابینین، دەڵێ: (الفَضْلُ: الزِّيَادَةُ فِي الشَّرَفِ وَالكَمال) هیچ زیدەییەكی ئێوە بەسەر خۆمانەوە نابینین، واتە: ئێوە كە دەڵێن: ئەوەی كە بڕوادار بێ، دوایی خوا لێی خۆش دەبێو، خوا خۆشی دەوێو، دەیباتە بەهەشت، ئێمە نابینین ئێوە زیادەیەكتان بەسەر ئێمەوە هەبێ، كە دوایی ئێوە بچنە بەهەشتو، ئێمە بچینە دۆزەخ، هەر لەبەرئەوەی ئێمە كوفرمان تەبەنیی كردوە، وەك بیروبڕواو عەقیدە.

**برگەی چوارەم :** ﴿ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴾، بەڵكو ئێمە پێمان وایە كە ئێوە درۆ دەكەن، (الظَّنُّ: هُنا بمَعْنَى العِلم)، وشەی (ظَنْ) لێرەدا بە مانای زانیارییە، چونكە: وشەی (ظَنّ) بریتیە لە زانیاریی هەبوون بە شتێك، ئنجا جاری وایە ئەو (ظَنّ) لە قۆناغی سەرەتاییدایەو زانیارییەكە زانیارییەكی سادەیەو زۆر ڕۆ نەچووەو هەر گومانێكی زاڵە، تەنیا لە دوو دڵیی (شك) بەولاوە چووەو بۆتە گومانێكی زاڵ، واتە: بوونی شتەكە بەسەر نەبووندا، یاخود نەبوونی بەسەر بوونیدا زاڵ دەكات، بەڵام دوایی ئەگەر بەهێزتر بوو دەگۆڕێ بۆ زانیارییەكی جێی دڵنیایی، كە (ظَنّ) لە قورئاندا، هەم بە مانای گومانی زاڵ (الظَنّ الرّاجع)و، هەم بە مانای زانیاریی یەقینییش هاتوە.

لە سوورەتی (الأعراف)دا ئەو مەسەلەیە ئاوا باس دەکات، دەفەرموێ :

﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾﴾، واتە: دەستڕۆیشتووان لە گەلەکەی گوتیان: ئێمە بە دڵنیاییەوە تۆ لە گومڕاییەکی روون و ئاشکرادا دەبینین.

هەروەها لە سوورەتی (القمر)دا دەفەرموێ : ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ ﴿٩﴾﴾، واتە: گەلی نووح لە پێش واندا، (واتە: لە پێش کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ) بێبڕوا بوون، بەندەکەی ئێمەیان بە درۆ دانـاو، گوتیان: شێتەو تێوە خوڕێنراوەو دەرکراوە، یان: سەرزەنشتکراو تێوەی خوڕێنرا، کەواتە: بەو شێوەیە لەگەڵ نووح دا ڕووبەڕوو بوونەوە.

**مەسەلەی سێیەم :**

**وەڵامی نووح ﷺ بۆ قسەو قاڵو تۆمەتەکانی گەلەکەی**

**لە پازدە (١٥) بڕگەدا.**

ئایەتەکانی: (٢٨ و ٢٩ و ٣٠ و ٣١) واتە: چوار ئایەت تەرخان کراون بۆ وەڵامی نووح ﷺ، وەڵامی ددان شکێن، وەڵامی ئیقناعکەر بۆ هەر کەسێك کە بە دوای ڕاستییدا بگەڕێ‌و، عەودالی هەق بێ.

کە لە پازدە (١٥) بڕگەدا باسی دەکەین، هەڵبەتە ئەوەش جۆرێکە لە داهێنانی خۆم، کە من ئایەتەکان بە پێی مەبەستەکان دابەش دەکەم، بۆ بڕگەی جۆراو جۆر:

**بڕگەی یەکەم :** ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ﴾: (نووح)، گوتی: ئەی گەلەکەم! واتە: ئێوە خەڵکی خۆمن، من لە نێو ئێوەدام‌و، ئێوە کۆمەڵگای منن‌و، من یەکێکم لە خۆتان، ئەوە بۆ جووڵاندنی سۆزو هەستیانە، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) هەمیشە گوتوویانە: (یا قوم، یا قوم) گەلەکەم! خەڵکەکەم!

کۆمەڵگایەکەم! واتە: من یەکێکم لە خۆتان، لە خۆشییدا بن، خۆشییەکە منیش دەگرێتەوە، لە ناخۆشییدا بن، ناخۆشییەکە منیش دەگرێتەوە، منیش یەکێکم لە خۆتانو هەست بە بەرپرسیارێیتی دەکەم لە بەرانبەرتانداو، من بە ئێوە بێگانەو نامۆ نیم.

**برگەی دووەم :** ﴿ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي ﴾: پێشتر گوتوومانە: (أَرَءَيْتُمْ) واتە: بینیتانو زانیتان، ئنجا لەو بینینو زانینەی خۆتان، هەواڵم پێ بدەنو ئاگادارم بکەنەوە، بەڵام زانایان یەکسەر دەڵێن: (أَرَءَيْتُمْ)، واتە: (أَخْبِرُونِي)، واتە: هەواڵم پێ بدەن، ﴿ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي ﴾ هەواڵم پێبدەن، ئەگەر من لە لایەن پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرابم.

**برگەی سێیەم :** ﴿ وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ ﴾: لە لایەن خۆیەوە بە زەمییەکی تایبەتی پێداوم، بەڵام لە ئێوە لێڵ کرابێ، نادیدە گیرابێ، یاخود لە ئێوە کوێر کراوەتەوە، یانی: وا کراوە کە نەیبینن، کە لێرەدا مەبەست لە ڕەحمەت: پێغەمبەرایەتییە ﴿ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ ﴾: دیارە خوێنراویشەتەوە: (عَمِيَتْ عَلَيْكُمْ)، یانی: ئەو ڕەحمەتو ئەو بەزمییە تایبەتییەی خوا، بە نسبەت ئێوەوە وەك کوێرە، واتە: ڕێتان تێنابات، ناتوانێ بۆ لاتان بێ، بەڵام: (عُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ) واتە: لێتان کوێر کراوە، یانی، وا دێنە بەرچاو کە ئەصڵەن ئەو بەخششو بەزمییە نەبینن، ئەو پلەو پێگەیە کە خوا بە منی داوە، لە ڕووی بەزمیی خۆیەوە، کە پلەی پێغەمبەرایەتییە، لێتان پەنهان کراوەو، لێتان شێردراوەتەوە، واتە: لێتان کوێر کراوە، ئەگەر (عُمِّيَت) بێ، یاخود لە بەرانبەرتان دا کوێر بووە، ئەگەر (عَمِيَتْ) بێ.

**بڕگەی چوارەم :** ئەمجار ئەمە وەڵامی (أَرَءَيۡتُمۡ)ە، یانی: هەواڵم پێبدەن، دەفەرموێ : ﴿أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ﴾: ئایا بە ئێوەوە پەیوەستی بکەین، لە ملی ئێوەی بپێچین، لە حاڵێکدا ئێوە پێشتان ناخۆش بێ؟ وەك (سَید قُطب) رەحمەتی خوای لێبێ لە تەفسیرەکەی خۆی (في ظِلال القرآن)دا دەڵێ: ئەگەر تەماشا بکەین ئەم ڕاناوانە (أَنُلۡزِمُكُمُوهَا) بە تۆپزیی پێکەوە لکێنراون، چونکە زۆر جاران هەر جەرەس و دەنگی وشەکان، مانای وشەکان و مەبەستەکان دەگەیەنن، (أَنُلۡزِمُكُمُوهَا) ئایا لە ملی ئێوەی بپێچین، ئێوەی پێوە پەیوەست بکەین، لە حاڵێکدا کە خۆشتان پێتان ناخۆشبێ؟ واتە: ئەگەر خۆتان ویستو ئارەزووتان نەبێ لە هەق، هەق بە زۆریی بەسەر خەڵکدا ناسەپێنرێ، سروشتی ئاینی خوا وا نیە، دەبێ خەڵك مەمنوون بێ ئەوجار بەندایەتیی بۆ خوا بکاتو، دەبێ خەڵك مەمنوون بێو، زۆر سوپاسی خواش بکات، ئنجا ئاینەکەیو پەیامەکەی قبووڵ بکات، خوا مەمنوونی خەڵك نابێ، چونکە خوای پەروەردگار بەزەیی بە خەڵکدا دێتەوە، کە پێغەمبەرانیان بۆ دەنێرێو پەیامو بەرنامەیان بۆ دەنێرێو کتێبیان بۆ دادەبەزێنێ کە ئاوا بژین، ئەی بەندەکانم! بەو ڕێیەدا بڕۆن، ئەوە بکەن، ئەوە مەکەن، بەوە سەرفراز دەبن لە دواڕۆژدا، بەوە بەختەوەر دەبن لە دنیادا، لەبەرئەوە ناگونجێ ئەو هەقە کە لە لایەن خوای هەقەوە دێ، بە زۆر بەسەر خەڵکدا بسەپێنرێ.

**بڕگەی پێنجەم :** ﴿وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾: ئەی گەلەکەم! من سامانتان لێ داوا ناکەم، لەسەر ئەو پەیامە کە پێتان ڕادەگەیەنم، واتە: لەسەر ئەو خزمەتە کە دەتانکەم، ئەو دڵسۆزییە کە بۆتان دەنوێنم، ئەو پەیامەی خوا کە پێتان ڕادەگەیەنم، هیچ چاوەڕوانییەکم لێتان نیەو، هیچ بار گرانییەکم بۆ سەر ئێوە نیە، پێتان وابێ تەماعم لە ماڵو سامانتاندا هەیە، تەماعم لەوەدا هەیە کە خۆمتان بەسەرەوە بکەمە حوکمڕانو دەسەڵاتدارو، ماڵو سامانەکەتان بۆ خۆم بەرم، وەك تاغووتو

فیرعەونەكان، واتان لێ دەكەن، وەك دەست ڕۆیشتووو خۆ بەزلگرەكان تەماعیان لە ماڵو نەفسو نامووستاندا هەیە، بۆیە كوێخایەتییتان بەسەردا دەكەنو، دەیانەوێ: ئەو پەیامە هەقەی كە خوا بە مندا ناردوویەتی، نەگات بە گوێی ئێوە، چونكە: ئەوە بانگی ئازادییە، بانگی دەربازكرانی ئێوەیە لە كۆیلایەتیو ژێر دەستەیی، ئەو پەیامە دەڵێ: هەمووتان بەندەی خوانو پێكەوە بران، دەبێ پێكەوە تەبابن، نابێ كەس بەسەر كەسدا ببێتە ئاغاو كوێخا، نابێ كەس خۆی بەسەر كەسدا فەرز بكات، نابێ كەس تەماع لە نەفسو ماڵو نامووسی ئەوی دیكە بكات، خوا زەوی داناوە بۆ مرۆڤەكان، نیعمەتەكان بۆ هەموویانن بە یەكسانیی، مەگەر كەسێك تێكۆشانی زیاتر بكاتو ڕەنجی زیاتر بدات، ئەگەرنا كەس لە كەس زیاتر بەشی بە نیعمەتەكانی خواوە نییەو، من پاداشتم تەنیا لەسەر خوایە، واتە: ترستان نەبێ، هیچ تەماعم لە ماڵتاندا نییەو، پاداشتیشم لەسەر خوایەو هیچ چاوەڕوانییەكم لە ئێوە نیە.

**بڕگەی شەشەم :** ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ﴾: هەروەها من دەركەری ئەوانە نیم كە بڕوایان هێناوە، ئەوان دەگەنە پەروەردگاری خۆیان.

بە تەئكید ئەمە وەڵامی داوایەكی ئەوانە، كە داوایان لێ كردوە: بڕوادارەكان دەربكات، وەكو كافرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ داوایان لێ دەكرد كە بیلالی حەبەشەییو صوهەیبی ڕۆمییو سەعدو كێو كێ كە ڕەشو ڕووت بوون، ئەوانە دەربكات لە مەجلیسی خۆی، بۆ ئەوەی زلەزلەكان بێنە مەجلیسەكەیەوە، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ ﴿٥٢﴾﴾، واتە: ئەوانەی كە بەیانیانو ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو، دیداری ڕووی خوا (ڕەزامەندیی خوایان) دەوێ، دەریان مەكە (لە كۆڕو مەجلیسی خۆت).

دیارە ئەوە عادەتی لە مێژینەی کافرو ملهووڕەکان بووە، کە خۆیان لە خەڵك بە زیاد زانیوەو، ئەو خەڵکەیان بە شایستەی ئەوە نەزانیوە کە لە کۆڕو مەجلیسیاندا دابنیشن، ئنجا نووح ﷺ لێرەدا وەڵامی ئەوان دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّلَـٰقُوا۟ رَبِّهِمْ ﴾، من دەرکەری ئەوانە نیم، کە بڕوایان هێناوە، ئەوان دەگەنە پەروەردگاری خۆیان، واتە: دەگەنە پەروەردگاری خۆیان، ئنجا پەروەردگاریان ئەگەر شایستەی ڕێز لێنان بن، ڕێزیان لێ دەنێ‌و، ئەگەر شایستەی ڕێز لێنان نەبن، ڕێزیان لێ نانێ، ئەمما من بۆم نیە، لەبەرئەوەی سەروەت‌و سامانیان نیە، یان بێدەسەڵاتن‌و سادەن ڕەش‌و ڕووتن، دەریان بکەم، بە پێچەوانەوە: شوێن کەوتووانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئێستاش پەیڕەوانی ڕێبازی خوا، بە زۆریی خەڵکی ڕەش‌و ڕووت‌و سادەن، ئەوانەی کە بەرژەوەندییە ناشەرعییەکان کۆت‌و زنجیری نەکردوون، ئەوانەی کە عەقڵێکی ئازادو دڵێکی ئازایان هەیە، ئەوانەی کە تەماعیان لە بارودۆخ‌و هەلومەرجێکی ناشەرعیی‌و ستەمکارانەدا نیە، بەڵکو دەیانەوێ بارودۆخی ستەمکارانە بگۆڕدرێ، ئا ئەوانە بەزۆریی شوێن کەوتووانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و شوێن کەوتووانی ڕێبازی خوای پەروەردگارن.

ئنجا کە وشەی (طرد)ی بەکارهێناوە، (طرد) واتە: دەرکردن (الطَّرْدُ: هو الإِبْعَادُ مَعَ التَّحْقِير)، (طرد) بریتیە لە دەرکردن‌و بە سووك تەماشاکردن، بە تەئکید ئەوە تەعبیری ئەوانە، هەروەك پێشتر لە تەفسیری سووڕەتی (الأنعام)دا باسمان کرد، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴿٥٢﴾ ﴾، ئەوە تەعبیری کافرەکان بووە، کە گوتوویانە: (أُطْـرُدهُم) بۆیە خوای پەنهانزان هەمان تەعبیری بەکارهێناوەتەوە، ئەگەرنا بێگومان پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا، کە لە لووتکەی ڕەوشتی بەرزو جواندا بوون‌و، قەت بە شایستەی خۆیانیان نەزانیوە، خەڵك لە کۆڕو مەجلیسی خۆیان، تەنانەت بە ئەدەبیشەوە دوور بخەنەوە، چ جای بە سووکایەتیی

پێکردنو بە دەرکردن، دەریان بکەن، بەڵام ئەوە تەعبیری ئەوانە، خوای کارزان بەکاری هێناوەتەوە.

**بڕگەی حەوتەم :** ﴿ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴾: بەڵام من ئێوە بە کۆمەڵێك دەبینم، کە نەفامیی دەکەن، چونکە ئەو ڕاستییانە نازانن، ئەگەرنا داوای واتان لە من نەدەکرد! ئەگەر ئەو ڕاستییانەتان زانیبان، کە ڕێزو حورمەتی مرۆڤەکان بە پارەو سەروەتو سامانو دەسەڵاتو بەو شتە ڕووکەشو ڕواڵەتییانە نیە، مرۆڤەکان دەبێ بە ناخیان هەڵبسەنگێندرێن، بە عەقڵو دڵیان هەڵبەسگێندرێن، بە ڕەوشتو ئاکاریان، بە هەڵوێستەکانیان، بە جەوهەرو مەعدەنی مەعنەوییان هەڵبسەنگێندرێن، نەك بە سەروەتو سامانیان، نەك بەو شتانەی کە بە دەست چاكو خراپ دەکەون، بەڵکو بەو شتانەی کە ئینسان دەبێ خۆی بەدەستیان بێنێ، هۆکاری بەرزبوونەوەو چاکبوونی ئینسانو، پوختە بوونیو نیزیك بوونەوەینی لە خوای بالادەست.

**بڕگەی هەشتەم :** ﴿ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ ﴾: ئەی گەلەکەم! کێ لە بەرانبەر (سزای) خوادا، سەرمەدەخاو پشتم دەگرێ، ئەگەر من ئەوانە دەربکەم؟

پرسیارکردنی نکووڵیی لێکەرانەیە، واتە: هیچکەس نیە.

ئەگەر من ئەوانە دەربکەم خوا سزام دەدات، ئنجا کێتان دێ پشتم بگرێ بەرانبەر سزای خوا؟! (النَّصْرُ : إِعَانَةُ المقَاوِمِ فِي ضِدٍّ أَوْ عَدوٍ، وَضُمِّنَ مَعْنَى الإِنْجَاءِ فَعُدِّيَ بِمِنْ أَي: مَنْ يُخَلِّصُنِي؟)، وشەی (نَصر) بریتیە لە یارمەتییدانی کەسێك کە لە بەرانبەر دژێك یان دوژمنێکدا وەستاوەو، لێرەدا وشەی (نَصر) بۆیە بە وشەی (مِنْ) تەعەددای کراوە؟ چونکە مانای (إنجاء)ی تێخراوە، واتە: (مَن یُنقِذُني مِن عذاب اللهِ) وەك پێشتر باسمان کردوە، لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە کە وشەیەك بەکاردێ، مانای وشەیەکی دیکەشی دەخرێتە نێوو، لەگەڵی نێواخن دەکرێ، بۆیە بە پیتێکی دیکە کە عادەت نیە بەو پیتە تەعەددا بکات بۆ (مفعول)، تەعەددا دەکات.

**بڕگەی نۆیەم** : ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾: ئەمە بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە:

١- (تَذَكَّرون).

٢- (تَذَّكَّرون) کە لە ئەسڵدا (تَتَذَكَّرونَ)ە، (تَذَكُّر)یش بریتییە لەوە کە ئینسان شتێکی زانیبێ‌و لە بیری چووبێتەوە یانی: ئایا نایهێننەوە بیر خۆتان؟ یان: ئایا پەند وەرناگرن‌و بیر ناکەنەوە؟

**بڕگەی دەیەم** : ﴿ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ ﴾: پێتان ناڵێم: خەزێنەکانی خوا لەلای منن، عەمبارەکانی خوا لەلای من نین.

(خزائن) کۆی (خِزانة)یە، (ما يُحفَظ فيه المالُ) (خِزانة)ە، واتە: شوێنێك کە شتی تێدا دەپارێزرێ، عەمبار دەکرێ، کە کۆیەکەی (خزائن)ە، واتە: من ناڵێم: خەزێنەکانی خوا، ئەو شتانەی کە خوا خوڵقاندوونی، عەمبارەکانی لە لای منن، ئیددیعای وام نەکردوەو ناکەم.

**بڕگەی یازدەیەم** : ﴿ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ ﴾: پەنهانیش نازانم، واتە: من لافی ئەوەش لێ نادەم، کە پلەو ئیمتیازم بەسەر ئێوەدا هەیەو، ئێوە پەنهان نازانن‌و من پەنهان دەزانم.

**بڕگەی دوازدەیەم** : ﴿ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ ﴾: ناشڵێم: من فریشتەم.

چونکە گوتوویانە: ﴿ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا ﴿٢٧﴾ ﴾هود، واتە: تۆ تەنیا مرۆڤێکی وەك خۆمانت دەبینین، ئنجا ئەمە بەرپەرچی ئەو قسەیانە، واتە: من نەمگوتوە: مرۆڤێکی وەك‌و ئێوە نیم‌و، نەمگوتوە فریشتەم، یانی: من ئیددیعای وام نەکردوە، ئنجا هەرچەندە مرۆڤێکی وەك ئێوەم، بەڵام مرۆڤی وەك ئێوەش دەتوانێ بەهۆی نزیکبوونەوە لە خواوە، ڕێزو حورمەتێك پەیدا بکاو شایستەییەك پەیدا بکات، کە ببێتە دۆستی خوا، هەڵبەتە پلەی پێغەمبەرایەتیی بەخشراو (وهبي)یەو دەست هێنراو (کسبي) نیە، دەبەخشرێ‌و بەدەست ناهێنرێ، بەڵام جگە لە پێغەمبەرایەتیی، مرۆڤەکانی

وەك ئێوە ئەی گەلی نووح! ، هەموو گەلانی دیکەش لە بارانیاندا هەیە کە زۆر لە خوا نیزیك ببنەوە، لە بارانیاندا هەیە، دۆستی زۆر نیزیکی خوابن‌و، خوای پەروەردگار لوتف‌و کەرەمی تایبەتییان لەگەڵدا بنوێنێ.

**برگەی سێزدەیەم** : ﴿وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًا﴾: بەوانەش ناڵێم کە چاوی ئێوە بە کەمیان دەبینێ: خوا چاکەیان ناداتێ، وە خێرو نیعمەتیان پێ نابەخشێ، لە دنیادا ئیمانیان پێناداو، لە دواڕۆژدا بەهەشتیان پێنادات،

(الإزدراءُ من الزري، وهو الإحتقار والصاق العيب، فأصلُهُ إزتراء)، وشەی (إزدراء) لە (زَرِي)یەوە هاتوە (زَرْي) بریتیە لە بە کەم تەماشاکردن‌و بە سووك سەیرکردن‌و، عەیب‌و عار بە دوا خستن‌و عەیب تێدا دیتنەوە، ئەسڵی (إزدراء)یش، لە (إزتِراء)ەوە هاتوە، بەڵام کراوە بە (إزدراء) ئەوەش بە پێی بنچینەیەکی زانیاریی (صرف)، ئنجا هەندێك وردەکاریی هەیە لەو بوارەدا، بەڵام خوێنەری کورد زمان زۆر پێویستییان بەو وردەکارییانە نیەو، ئەوەی زۆریش پێویست نەبێ، من ئاماژەی پێ ناکەم.

ئنجا بۆچی دەفەرموێ : ﴿تَزۡدَرِيٓ أَعۡيُنُكُمۡ﴾: چاوتان بە کەمیان دەبینێ؟ چونکە بە زۆریی وایە ئینسان بە چاو شت بە کەم سەیر دەکات‌و، ئەگەر بیەوێ شتێك بە کەم تەماشا بکات‌و سووکایەتیی پێ بکات، بە چاو ئاماژە دەکات‌و لە چاویدا دەخوێندرێتەوە.

**برگەی چواردەیەم** : ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾: خوا زاناترە بەوەی کە لە دەروونیاندا هەیە، ئەمە ئاماژەیە بەوە، کە خێرو چاکە ئەوەیە کە لە دڵدا هەیەو لە عەقڵدا هەیە، نەك لە ڕواڵەتدا، واتە: بەڵێ ڕواڵەت‌و دیوی دەرێیان نابەرچاوە، بەڵام هەر خوا دەزانێ چ لە دەروونیاندا هەیەو، لە ڕاستییشدا مرۆڤ بەوە بەرزو نزم دەبێ کە لە دەروونییدا هەیە، ئەگەر هەقی لە دەروونیدا هەبێ، وەك: بووناسییەکی ڕاست‌و، خۆی بناسێ‌و خوا بناسێ، وە

ئیمانو عەقیدەیەكی ڕاستو دروستو، بەندایەتیەكی چاكو، ئاكارو سیفەتی بەرزو جوانو، ڕازابێتەوە بە ڕەوشتی بەرزو جوان، بەوانە مرۆڤ چاك دەبێ.

**بڕگەی پازدەیەم :** ﴿إِنِّيٓ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾: واتە: ئەگەر من ئەوانە دەربكەم، یان ئەگەر بێتو ئەو ئیدیعایانە بكەم كە ئێوە پێتان وایە دەیانكەم، بێگومان من لە ستەمكاران دەبم، لێرەدا بە سێ شێوە تەئكیدی كردۆتەوە :

١/ (إِنّي). ٢/ (إِذًا). ٣/ (لمنَ الظّالمين).

١ـ بێگومان، من، چونكە (إنّي)، یانی : (إنّني)، واتە: ئەگەر وا بكەم، سەرەنجامەكەی وایە.

٢ـ (إذًا) : یانی: كەواتە، یان لە ئەنجامی ئەوەدا.

٣ـ (لمنَ الظّالمين) (ل) مانای جەختكردنەوەو سوێند خواردن دەگەیەنێ، واتە: دەچمە نێو ڕیزو قوولایی ستەمكارانەوە.

لە سوورەتی (الأعراف)دا نووح ﷺ هەر ئاوا وەڵام دەداتەوە : ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦١﴾، ئەوان پێی دەڵێن: ئێمە تۆ لە گومڕاییەكی ڕووندا دەبینین، ئەویش دەڵێ: ئەی گەلەكەم! هیچ گومڕایی لە مندا نیە، بەڵكو من ڕەوانە كراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە.

**مەسەلەی چوارەم :**

**وەڵامدانەوەی گەلی نووح ﷺ، و بێ منەتییان**

**لە هاتنی سزای خوای دادگەر:**

خـوا دەفەرموێ : ﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدۡ جَٰدَلۡتَنَا فَأَكۡثَرۡتَ جِدَٰلَنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٣٢﴾، گەلەكەی گوتیان: ئەی نووح! شەڕە

قسەو مشتو مڕت لەگەڵ کردین‌و زۆریشت مشتو مڕ لەگەڵ کردین، ئنجا ئێستا ئەوەی کە بەڵێنمان پێدەدەی (هەڕەشەی پێ لێمان دەکەی)، بۆمان بێنە، ئەگەر لە ڕاستانی.

(المجَادَلة: المخاصَمَةُ)، (مُجَادَلة) یانی: مشتو مڕ، شەڕە قسە، بە کوردیی دەڵێن: دەمبەدەمە.

﴿ فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا ﴾، ئەوەش جۆرێکە لە بێزاریی‌و نارەزایی دەربڕین، دەڵێن: زۆرت قسە لەگەڵدا کردین‌و، ئەمە بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە کە ئەوانە بەزیون لە بواری هێزی لۆژیك (قوة المنطق)دا، بۆیە ویستوویانە ئەو بوارە بەجێبهێڵن‌و بگوازنەوە بۆ بواری لۆژیکی هێز (منطق القوة)، لەبەرئەوەی قسەو لۆژیکەکەیان قووەتی تێدا نەبووە، ویستوویانە لەگەڵ نووحدا بیگوازنەوە بۆ مەنتیقی هێزو لۆژیکی هێزی لەگەڵدا بەکار بێنن، نەك هێزی لۆژیك، بە کورتیی ویستوویانە: لە مەیدانی قسەو باس‌و وتووێژدا، کە بەزیون لەگەڵی بگوازنەوە بۆ مەیدانی هەڕەشەو گوڕەشە، ﴿ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، ئنجا فەرموو سزا بێنە، ئەگەر لە ڕاستانی.

**مەسەلەی پێنجەم :**

**وەڵامی نووح بۆ داواکردنی کەلەکەی بە هاتنی سزا:**

خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾، نووح عليه السلام گوتی: سزا تەنیا خوا بۆتان دێنێ، ئەگەر بیەوێ، ئێوە دەستەوسانکەر نین، واتە: دەرباز نابن لە سزای خوا.

کە دەفەرموێ : (إِنْ شاءَ) ئەمە دووربینیی کردنی نووح عليه السلام، کە دیارە مەبەست پێی سزای دنیایە، ئەوانیش داوای سزای دنیایان کردوە، واتە: نازانم داخۆ سزای دنیا خوا کەی دەیهێنێ! ئایا دەیهێنێ، یان نایهێنێ؟ هەڵبەتە لێرەدا

مەبەست پێی سزای دوارۆژ نیە، چونکە سزای دوا ڕۆژ پێویست ناکات ببەسترێتەوە بە ویستو خواستی خواوە، سزای دوارۆژ هەر دێو، خوای زاناو توانا ویستوویەتی، بەڵام سزای دنیا، کەی دێو چۆن دێو، چەندی دێ؟ ئەوە دیارە لە بازنەی ویستی ڕەهای خوای پەروەردگاردایە، کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴾، یانی: ئێوە دەرباز نابن لەو هەڕەشەو سزایە ئەگەر خوا بیهێنێ.

﴿ وَلَا يَنفَعُكُمۡ نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ ﴾، (النُّصْحُ: إرادَةُ الخَيْرِ لِلمَنْصُوحِ)، (نُصْحُ) بریتیە لە خێرخوازیی بۆ ئەو کەسە کە تۆ (نُصْح)ی ئاڕاستە دەکەی، واتە: چی بۆی چاکە ئەوەت بۆ بوێ، واتە: دڵسۆزیی نواندن، یانی: ئەگەر بمەوێ دڵسۆزیی بنوێنم، دڵسۆزییتان پێناگەیەنم، ﴿ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغۡوِيَكُمۡ ﴾، ئەگەر خوا بیەوێ بێ مرادو بێ ئاکامتان بکات.

(الإغْواءُ : جَعْلُ الشخصِ ذَا غِوَايَة)، (إغْواء) بریتیە لەوەی کەسێك بکەیە خاوەن (غِوَايَة)، (غِوَايَة)ش واتە: بێ مرادیی‌و بە ئاکام نەگەیشتن‌و ڕۆژ ڕەشیی.

﴿ هُوَ رَبُّكُمۡ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، هەر ئەو پەروەردگارتانە، یانی: ئەو بەدیهێنەرتانە، ڕۆزیی دەرتانە کاروبارتان بەڕێوە دەباتو، مشوورخۆرتان هەر ئەوە، (ئەوە کاری من نیە)و، هەر بۆ لای ئەویش دەگێڕدرێنەوە.

لێرەدا کە (الجار والمجرور) پێش خراوە، مانای زێدە گرنگیی پێدان‌و بایەخ پێدانە.

لە سوورەتی (الأعراف)دا لەوبارەوە خوا دەفەرموێ : ﴿ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ۝٦٢ ﴾، واتە: پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم‌و، دڵسۆزییتان بۆ دەنوێنم‌و، ئەوەی من دەیزانم لە لایەن خواوە ئێوە نایزانن.

واتە : من دەزانم کە ئەگەر بێت‌و ڕێی ڕاست نەگرنە بەر، بەرەو خوا نەگەڕێنەوە سزایەکی سەخت چاوەڕێتان دەکات.

**مەسەلەی شەشەم :**

### ئاوڕدانەوەیەکی خێرا لە قورئان و محەممەد ﷺ:

لێرەدا خوای پەروەردگار ئەو ئایەتە نێواخن دەکات لەگەڵ بەسەرهاتی نووحدا، کە دەفەرموێ : ﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَعَلَيَّ إِجْرَامِي وَأَنَا بَرِيءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾، یان ئایا دەڵێن: (موحەممەد ﷺ) قورئانی هەڵبەستوە! بڵێ : ئەگەر من هەڵم بەستبێ، تاوانی خۆم لەسەر خۆمەو، من دوورم لەوەی کە ئێوە تاوانبارانە ئەنجامی دەدەن.

ئەمە دیارە ڕستەیەکی نێواخنە بۆ ئەوەی کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بیریان بخرێتەوە، کە لە بەرانبەر قورئاندا بە هەڵە داچوونو، ئەم ڕستەیە پەیوەست نیە بە بەسەرهاتەکەی نووحەوە ﷺ، هەرچەندە هەندێك لە زانایان وایان تەفسیر کردوە، کە ئەوەش هەر مەبەست پێی نووحە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە نێواخن کردنی ڕستەیەکە لەگەڵ بەسەرهاتەکەی نووحدا ﷺ، بۆ بیرخستنەوەی کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، ئەها گەلی نووح چییان لێدی، لە ئەنجامی کەللەڕەقیی و سەرەخەرییدا، ئێوەش وریا بن، بەهۆی قبووڵ نەکردنی قورئانو پەیامی پێغەمبەرەوە ﷺ، بە هەمان مەرەد نەگەنو، بە هەمان دەرد نەچن.

**مەسەلەی حەوتەم :**

### ڕاگەیاندنی خوا بە نووح ﷺ کە [redacted] تەما نەبێ، هیچ کام لە گەلەکەی لە مەودوا بڕوا بێنن.

وەك لە ئایەتەکانی : (٣٦ و ٣٧) لە چوار بڕگەدا، ئەمە دەخاتە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ آمَنَ ﴾: سروش بۆ نووح کرا، نیگای بۆ کراو، پێی ڕاگەیەنرا کە: بە دڵنیایی

هەرگیز هیچ کەس لە گەلەکەت بڕوات پێ ناهێنن، مەگەر ئەوەی لەمەو پێش بڕوای هێنابێ.

واتە: لێرەوە کۆتایی بە هەوڵو کۆششەکانی خۆت بێنە، چونکە بێسوودە، دیارە بەس خوا ﷻ خۆی دەزانێ: کێ ئیمان دێنێو، کێ ئیمان ناهێنێ؟ دیارە گەیشتۆتە سنووری خۆی، کە ئەوانە سزا بدرێنو، زەوییان لێ پاك بکرێتەوە، بەو تۆفانەی کە دەینێرێت.

**برگەی دووەم** : ﴿ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾: کەواتە: خەفەت بارو دڵتەنگ مەبە بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد.

(الإِبْتِئاس: إفْتِعَالُ البُؤس، وهو الهَمُّ والحُزْنُ)، (إبتئاس) لەسەر کێشی (إفتعال)ەو لە (بۆس)ەوە هاتوە، (بۆس)یش بریتییە لە دڵ تەنگییو خەفەتبارییو مەینەتییو نارەحەتیی، بە شێوەیەك کە بە دەمو چاوی مرۆڤەوە دیار بێ، واتە: خەفەتبار مەبە، چونکە تۆ ئەرکی سەرشانی خۆتت بەرانبەریان ئەنجام داوە، بەڵام ئەوان کەللە ڕەق بوونو نەهاتنە ژێر سایەی پەیامو بانگەوازە دڵسۆزانەکەی تۆ.

**برگەی سێیەم** : ﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا ﴾: هەروەها کەشتیی دروست بکە، لە ژێر چاودێریی ئێمەداو، بە سروشو ڕێنمایی ئێمە.

لە ژێر چاودێریی ئێمەدا، واتە خوا بۆخۆی ئاگای لێیەو لە ڕێی فریشتەکانەوە ڕێنمایی نووح دەکات، کە کەشتییەکە چۆن دروست بکات، کەرەستەکان چی بنو، کەشتییەکە چۆن بێ؟ چونکە بێگومان کەشتییەکە زۆر گەورەو گرنگ بووەو، لەوانەیە یەکەم کەشتییش بووبێ، یانی: لە وردەکارییەکانی چۆنیەتی پێکهاتەی ئەو کەشتییەدا، چاودێریو ڕێنمایی ئێمە ڕەچاو بکە.

**برگەی چوارەم** : ﴿ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴾: دەربارەی ئەوانەش کە ستەمیان کردوە، مەمدوێنە، بێگومان ئەوان خنکێنراون.

﴿ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟﴾، یانی: ئەوانەی بێبڕوا بوون، چونکە کوفرو شیرك گەورەترین ستەمە : ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾لقمان، دیارە شیرکیش جۆرێکە لە کوفر، لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلْكَـٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾﴾، بێبڕوایان، (یان ئەوانەی سپڵەن بەرانبەر بە خوا) ئەوانە ستەمکاری ڕاستەقینەن.

کە دەفەرموێ: لەبارەی ئەوانەوە مەمدوێنە، چونکە ئەوان بڕیاریان لەسەر دراوەو خنکێنراون، دەبێ نغرۆ ببن و نقووم بن، لە نێو ئاوداو، بخنکێن، بۆیە تکایان بۆ مەکە.

هەڵبەتە ئەمە ئاماژەیەکی پەروەردگار بووە، بۆ نووح سەلامی خوای لەسەر بێ، لەبارەی هاوسەریەوە، کە بێ بڕوا بووەو، کوڕەکەی، ناوی (کەنعان) بووە، کە تەکلیفیان بۆ نەکات، چونکە ئەوانیش لە ڕیزی کافرەکان دا بوون و، ئامادەش نەبوون لەگەڵی سواری کەشتییەکە بن و، گاڵتەشیان بە قسەکانی نووح کردوەو لەوبارەوە، بڕوایان پێ نەکردوە: تۆفانی چی و، لافاوی چی؟!

## مەسەلەی هەشتەم :

**دروستکردنی کەشتیی و، گاڵتە پێکردنی گەلەکەی بە نووح و، وەڵامی (نوح)یش، بۆ گەلەکەی سەلامی خوا لەسەر نووح بێ:**

لە ئایەتەکانی: (٣٨ و ٣٩)دا، خوا دیسان لە چوار برگەدا ئەمە دەخاتە ڕوو:

برگەی یەکەم : ﴿وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ﴾: کەشتییەکەی دروست دەکرد، خەریکی دروست کردنی کەشتیی بوو، بۆچی خوا ﷻ بەو تەعبیرە دەیهێنێ؟ زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: شتێك کە لە ڕابردوودا بووە، بە کرداری ئێستا (فعل المضارع) دەیهێنێ، بۆ ئەوەی تەماشای بکەی، بە چاوی خەیاڵ، کە ئەوە نووح خەریکی کەشتییەکەیە، تەختان دەهێنێ و بزماران دا دەکوتێ،

یاخود بە پەتی قایم بەستوویەتەوە! بۆ ئەوەیە کە حاڵەتی دروستکردنی کەشتییەکە، بێنێتە بەرچاو.

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِ سَخِرُوا مِنْهُ ﴾: لە کاتی دروستکردنی کەشتییەکەدا، هەر کاتێك کۆمەڵەی دەست ڕۆیشتووان و بڕیار بەدەستانی گەلەکەی، بەلایدا تێپەڕ دەبوون، گاڵتەیان پێ دەکرد، هەر کاتێك بەلایدا ڕەت بووبان، توانجێکیان تێ دەگرت و گاڵتەیان پێدەکرد.

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ قَالَ إِن تَسْخَرُوا مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴾: (نووح)، گوتی: ئەگەر ئێوە گاڵتەمان پێدەکەن، ئەوە بەدڵنیاییەوە ئێمەش گاڵتەتان پێ دەکەین، وەك گاڵتە پێ کردنەکەی خۆتان، واتە: کاتێك دێ ئێمەش گاڵتەتان پێ بکەین، بە زاراوی ئێستا: دەبن بە فیلم.

**بڕگەی چوارەم :** ﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾: بە دڵنیاییەوە لەمەدوا باش دڵنیا دەبن و دەزانن، کێ ئازارێکی بۆ دێ، سەرشۆڕو زەبوونی دەکات، دواییش ئازارێکی بەردەوام کە لە کۆڵی نابێتەوە، دێتە سەری.

(السخرية: الإستهزاء: وهو تعجُّبٌ باحتقار واستحماق)، (سخرية) بریتیە لە گەمەو گاڵتە پێکردن و پێ ڕابواردن، ئەویش بریتیە لە سەرسووڕمان دەربڕین بەرانبەر بە کەسێك، کە بە کەم تەماشا بکرێ و، بە نەفام دابنرێ، لە کوردییشدا ئەو وشەیە هەر ئاوا بەکاری دێنین.

ئنجا ئایا گاڵتەی ئەوان چۆن بووە؟

خوای پەروەردگار هەر بە گشتی فەرموویەتی، بەڵام وا دیارە : چونکە نووح کەشتییەکەی لەسەر وشکانیی دروست کردوە، نە ئاو، نە دەریا، نە ڕووبار، هیچی لێ نەبووە لەو شوێنە، گوتوویانە: لەو شوێنە وشك و بەیارە، ئەو کەشتییە چۆن دەڕوات؟ یان ڕەنگە پێیان گوتبێ: تۆ تا ئێستا داوای

پێغەمبەرایەتییت دەکرد، کەچی ئێستا لێمان بووی بە دارتاش! کاتێک کە تەختەو بزماری هێناون و لێکی داون و پێکەوەی بەستوونەوە.

ئنجا ئایا وەڵامو گاڵتەی نووحو شوێن کەوتووانی بەرانبەر بە کافرەکان چۆن بووە؟ وا دیارە پێیان گوتوون: ئێوە ئەوەندە نەفامن بەرانبەر بە خوای خۆتانو خاوەنی خۆتان، کەسێکی بۆ ناردوون، بۆ ئەوەی لە نەفامییو نەزانیی رزگارتان بکات، کە چۆن ژیانی دنیا بگوزەرێنن، تاکو بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دوارۆژ بەدەست بێنن، ئنجا ئەگەر وەڵامی نەدەنەوە، دیارە مایەی ئەوەن کە گاڵتەتان پێبکریٰ، ﴿فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ﴾، ئەمە مەبەست پێی دنیایە، یانی: لەمەودوا دەزانن: کێ چ ئازارێکی بۆ دێت، کە سەرشۆڕو زەبوونی دەکات.

ئەوە بە نسبەت دنیاوە، ﴿وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ مُّقِيمٌ﴾، ئنجا سزایەکی بەردەوامیشی دێتە سەر، کە مەبەست پێی سزای دوارۆژە، کە بەردەوامەو لە کۆڵ نابێتەوە، ئەگەرنا هی دنیا هەرچۆن بێ، هەر دەبڕێتەوە، یانی: لە دنیادا زەبوونو سەرشۆڕ دەبن، لە قیامەتیشدا تووشی ئازارێکی بەردەوامو نەبڕاوە دێن.

لە سوورەتی (القمر)دا ئاوا باس دەکات : ﴿وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ ﴿١٣﴾ تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا جَزَآءٗ لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾﴾[1].

واتە: نووحمان هەڵگرت لەسەر خاوەن تەختانو بزماران، یان: پەتان، (یانی: تەختەداری گەورە گەورە لەگەڵ شتێک دا کە ئەو تەختە دارانەی پێ پێکەوە لکێنرابوونو بەسترابوونەوە)، (کەشتییەکە) لە ژێر چاودێری ئێمەدا دەڕۆیی، (ئاگامان لێبوو)، ئەوەش مەبەستی پاداشت دانەوە بوو بۆ کەسێک کە سپڵەیی بەرانبەر کرابوو، (کە پێغەمبەر نووح بوو، سەلامی خوای لەسەربێ).

---

١) (دُسُر) کۆی (دِسار)ە کە هەم بە بزمار دەگوترێ، هەم بە پەتو حەبلێکیش دەگوترێ کە کەشتی پێ قایم دەکرێ.

دیارە لە تەوراتدا وردەکاریی زۆر باسکراوە، کە ئەو کەشتییە چۆن بووە؟ چەند قات بووە؟ بەرزایی و پانایی و درێژییەکەی چەند بووە؟ درێژییەکەی سەدو پەنجا (١٥٠) مەتر بووە، پانییەکەی حەفتاو پێنج (٧٥) مەتر بووەو، بەرزییەکەی نیزیکەی (١٤ تا ١٥) مەتر بووەو، ئەو کەشتییە سێ قات بووە: قاتی بنەوەی بۆ ئاژەڵو درندەکان بووەو، قاتی نێوەڕاستی بۆ مرۆڤەکان بووە، قاتی سەرەوەشی بۆ پەلەوەرو باڵندەکان بووە، بەڵام خوای پەنهانزان لە قورئاندا ئەو وردەکارییانەی باس نەکردوون، دیارە بە پێویستیی نەزانیوە، ئەو وردەکارییانە بۆ ئێمە بخاتە ڕوو، چونکە ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە، ئەوەیە کە ئێمە پەند لەم بەسەرهاتەی نووحو لەو کەشتیی و تۆفانە وەربگرین، نەك خوا بیەوێ ئێمە فێری دروست کردنی کەشتیی بکاتو، ئەو وردەکارییانە ئێمە پەکمان لەسەریان نەکەوتوە.

**مەسەلەی نۆیەم :**

**تۆفانو نیشانەی دەستپێکردنەکەی:**

کە خوای زاناو شارەزا لە ئایەتی ژمارە (٤٠)دا، لە پێنج بڕگەدا، ئەمە دەخاتە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا ﴾: هەتا کاتێك فەرمانی ئێمە هات.

(حتى لبلوغ الغاية)، لێرەوە ڕۆیشتم هەتا فلان شوێن، (یصنع الفلك)، یانی: هەتا گەیشتن بەو کۆتاییە، واتە: هەر لەسەر دروستکردنی کەشتییەکە بەردەوام بوو، چونکە لە پێشدا تەنیا باسی دروستکردنی کەشتیی کراوە.

بەڵام من وای تێدەگەم، یانی: ئەم گاڵتە پێکردنو شەڕە قسەو موناقەشەیەی نێوانیان هەر بەردەوام بوو، تاکو فەرمانی ئێمە هات، واتە: تاکو فەرمانەکەی خوا هاتوەو تۆفان دەستی پێکردوە، ئەوانە هەر بەردەوام بوون.

دەشگونجێ مەبەستی پێی دروستکردنی کەشتیی بێ.

دەگونجێ مەبەستیشی پێ شتی دیکە بووبێ، بۆ وێنە: ئەوان لەسەر کوفری خۆیان هەر بەردەوام بوون، هەتا فەرمانەکە دەستی پێکرد.

ئنجا دەگونجێ فەرمانمان (أمرُنا) لێرەدا، مەبەست پێی فەرمانی قەدەریی بێ، واتە: تاکو ویستی خوا کەوتە کارو، بڕیاری خوا جێبەجێ بوو، کە بریتی بوو لە هاتنی تۆفان‌و دروست بوونی لافاو.

دەشگونجێ مەبەست لە (أمرُنا) فەرمانی شەرعیی بێ، یانی: هەتا فەرمانی خوا هات بە خنکاندنی مرۆڤە بێبڕوایەکان، ئەوانەی کە پشتیان لە بانگەوازەکەی نووح کرد، هەردووکیان دەگرێتەوە.

**بڕگەی دووەم** : ﴿وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾: تەندوور قوڵپی دا، (الفَوَران : غَلَيَان القِدْر، وَيُطْلَق عَلَى نَبْع الماء بشِدّةٍ، تَشْبِيهاً لَهُ بفَوران الماء في القِدْر إذَا غَلِيَ)، (فار) کە چاوگەکەی دەبێتەوە بە (فوران)، (فَار، يفور، فوراناً)، بریتییە لە کوڵینی مەنجەڵ، واتە: کوڵینی ئاو، یان چێشت، کە لە مەنجەڵەکە دایە، دوای ئەوەی زۆر گەرم دەبێ‌و لە پلەی سەد (١٠٠) تێدەپەڕێ، دەکوڵێ، وشەی (فوران) بۆ هەڵقوڵینی ئاویش بەکاردێ، کە زۆر بە قوڵپ‌و بەهێز هەڵدەقوڵێ، یانی: چوێنراوە بە کوڵینی ئاوی نێو مەنجەڵەوە.

ئنجا ئایا مەبەست لە (التنور) چییە؟ دیارە ئێمە بە کوردیی دەڵێین: تەندوور، ئەوەی کە نانی تێدا دەکەن، توێژەرەوانی قورئان لەوبارەوە سێ ڕایان گوتوون:

<u>یەکەم</u>: پێیان وایە کە تەندوورێکی دیارییکراو بووە، هەتا لە تەوراتدا ناوی پیرە ژنەکەش هاتوە، کە تەندووری فڵان پیرە ژنە بووە، تەندوورێکی دیارییکراو بووەو خوای باڵادەست بۆ نووح دیاریی کردوە، کە هەر کاتێک ئاوی نێو ئەو تەندوورە قوڵپی دا، ئەوە نیشانەی لافاوەکەیەو دەستی پێکردوە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر هەر باران‌و ئاو هاتنە خوار بێ، لە ئاسمانەوە بە خوڕەم، ئەوە ساڵانە دووبارە دەبێتەوە، بۆیە دەبێ نیشانەیەکی هەبێ بۆ نووح سەلامی خوای لەسەر بێ، ئەگەرنا ئەگەر هەر ئاو هاتنە خوارەوەبێ لە ئاسمان، بارانبارین بێ، وا دەزانن ئەوە هەر بارانبارینێکی ئاساییە، ئاو

هاتنە خوارێكی ئاساییە، وەك ساڵانی دیكە.

دووەم: یاخود مەبەست لە (تنور)، واتە: ڕووی زەوی، هەموو ڕووی زەوی وەك تەندوورێكە، كە ئاگری تێدا دایسێ، ئاوا هەموو زەوی بووە بە كانیی‌و سەرچاوەو هەڵقوڵیوە، وەك دوایی باسی دەكەین.

سێیەم: دەڵێن: ئەمە وێنە هێنانەوەیەكە بۆ گەیشتن بەوپەڕی سنووری شتێك كە لەوە زیاتر تەحەممول ناكرێ، وەك عەرەب ئەو پەندانەیان هەیەو، لە كوردییشدا ئەو جۆرە پەندانە هەن، بۆ وێنە: عەرەب دەڵێن: (بَلَغَ السّيل الزُّبَى)، واتە: لافاوەكە گەیشتە سنووری خۆی، یان دەگوترێ: (إمتلأ الصاع) واتە: ڕبەكە پڕ بوو، ئیدی لە هەموو زماناندا ئەو جۆرە تەعبیرانە هەن، لە كوردییدا دەڵێن: (كاكە بەسە بەس، تێتپەڕاند!).

دیارە وشەی (تنور)یش، (اسمٌ لموقد النار للخبز) واتە: ناوە بۆ ئەو شوێنەی كە ئاگری تێدا دەئایسێ، بۆ ئەوەی نانی تێدا بكرێ‌و ببرژێنرێ.

لە سوورەتی (القمر)دا خوای پەروەردگار ئاوا هەڵقوڵینی ئاو لە زەوی‌و داباریین‌و دارژانی ئاو لە ئاسمانمان بۆ وێنا دەكات‌و دەفەرموێ: ﴿ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: دەروازەكانی ئاسمانمان كردنەوە بە ئاوێكی هەڵڕژاوو، سەر زەویشمان هەموو تەقاندەوە بە سەرچاوە، كاتێك هەردووك ئاوی زەوی (كە هەڵدەقوڵا)، ئاوی ئاسمان (سەرێ) كە هەڵدەڕژاو دادەباری، گەیشتنە یەك، بە پێی فەرمانێك كە پێشتر ئەندازەگیریی بۆ كرابوو، (كە فەرمانی خوا بوو: ئەم لافاوو تۆفانە دەبێ، بەو شێوەیە بێ).

بڕگەی سێیەم: ﴿ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ﴾: واتە: پێمانگوت: لە هەر جۆرێك نێرو مێیەك، دووان، سوار بكە، واتە: لە هەر جۆرێك لەو جۆرە پەلەوەرو ئاژەڵانەی كە لەسەر زەوی نەبێ ناژین‌و، لە نێو ئاودا دەخنكێن، بۆ ئەوەی تۆویان نەبڕێتەوە، سواری كەشتییەكەیان بكە.

ئەم وشەیە: (كلّ)، بە دوو شێوە خوێندراوەتەوە:

١/ ﴿ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ﴾، واتە: لە هەر جۆرێك جووتێك، یانی: نێرو مێیەك، چونكە لە زمانی عەرەبیدا، هەم بە نێرەكە دەگوترێ: (زوج) هەم بە مێیەكە دەگوترێ: (زوج)، بەڵام دوایی لە عورفو باوی ئێستادا بە ئافرەت دەگوترێ: (زوجة)، ئەگەر نا لە هەموو قورئاندا بۆ ژن وشەی (زوجــة) بەكارنەهـــاتوە، ﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ ﴿٣٥﴾ ﴾ البقـرة، واتە: گوتمان ئەی ئادەم! تۆو جووتەكەت (كە حەووایە)، لە بەهەشت دا نیشتەجێ بن، هەروەها ئەوە بۆ مرۆڤو پەلەوەرو ژیانداران‌و درندانیش هەر وایە، كەواتە: ﴿ مِن كُلٍّ ﴾، واتە: (مِنْ كلِّ نوعٍ)، لە هەر جۆرەی، یانی: لە هەرچی خوا دروستی كردوە، نا! بەڵكو لەو جۆرانەی ناتوانن لەسەر وشكانیی دا بژین‌و، ئەگەر ئاو بێ دەخنكین، بۆ ئەوەی كە تۆویان نەبڕێتەوە، وەچەیان نەبڕێتەوە.

٢/ بە (مِن كلِّ زوجينِ اثنين)یش، خوێنراوەتەوە، یانی: لە هەر جووتێك دووان، (الزَّوْجُ: شيءٌ يكونُ ثانِياً لآخَرَ فِي حالةٍ، وَكُلٌّ مِنْهُما زَوْجٌ لآخَرٍ)، (زوج): شتێكە دەبێتە دووەم بۆ ئەوی دیكە لە حاڵەتێكداو، هەر كامێكیان پێی دەگوترێ: (زوج) بە نسبەت ئەوی دیكەوە، كەواتە: (زوج) واتە: جووت، جاری واش هەیە لە زمانی عەرەبیی دا، مەرج نیە تەنیا مەبەست نێرو مێ بێ، دەگوترێ: جووتە پێڵاوێك، یان جووتە گۆرەوییەك، ئەمە لە كوردییشدا هەروا دەگوترێ.

لە تەورات لە (سفر التكوين)دا، زۆر بە تەفصیلێ باسی ئەو جۆرە ژیاندارانەی كردوە كە سواری كەشتییەكە كراون‌و، ناوی زۆریانی هێناوە، كە چۆن دانراون: زوور زوورو، هەندێ وردەكاریی دیكە: پشیلە وای گوت‌و، فیل وای كردو، شێر واچوو، كە بێگومان ئەوە لە هەواڵی نادیار (غیب)ەو ئێمەش پێویستییمان پێی نیەو، ئەگەر جار جارەش بۆ بەرچاو ڕوونیی زیاتر بە

پێویستیی بزانین، ئەوە سوودی لێ دەبینین.

**برگەی چوارەم :** ﴿وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ﴾: هەروەها ماڵەوەشتان، سوار بکە، ﴿إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ﴾: مەگەر ئەوەی پێشتر بڕیاری فەوتاندنی لەبارەوە دراوە، (أَهْلُ الرَّجُلِ: قَرَابَتُه وَأَهْلُ بَيْتِهِ، وَهُو اسْمُ جَمْعٍ لا وَاحِدَ لَهُ، وَزَوْجُهُ أَول مَنْ يُبادِرِ إلى الذهن)، واتە: ئەهلی پیاو بریتیە لە نیزیکەکانیو، ئەوانەی کە لە ماڵیدا لەگەڵی دەژینو، وشەی (أهل) ناوی کۆیەو تاکی نیە، هاوسەرەکەی نووح ﷺ یش یەکەمین کەسێکە کە دێتە زەینەوە، کاتێك وشەی (أهل) بەکاردەهێنرێ.

بەڵکو لە قورئاندا وشەی (أهل البيت) کە تەنیا لە سوورەتی (الأحزاب)و، لە سوورەتی (هود)دا بەکارهاتوە، تەنیا بە مانای هاوسەری پیاو دێ.

هەڵبەتە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە دەبێ نووح ﷺ دوو هاوسەری بووبن، کە یەکێکیان کافر بووە، وەك لە سوورەتی (التحريم)دا دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ۝١٠﴾، واتە: خوا وێنەی هێنایەوە بۆ ئەوانەی بێبڕوان، بە ئافرەتەکەی (نوح)و ئافرەتەکەی (لوط) کە لە ژێر دوو لە بەندە چاکەکانی ئێمەدا بوون، (واتە: هاوسەری ئەوان بوون)، بەڵام خیانەتیان پێکردن (واتە: لەڕووی عەقیدەو بیروبڕواوە لەگەڵیان نەبوون، یارمەتیدەرو هاوکاریان نەبوون)، دوایی (نووحو لووط) هیچ سوودێکیان پێنەگەیاندن، (نەیانتوانی تکایان بۆ بکەن)و، پێیان گوترا: بچنە نێو ئاگرەوە لەگەڵ ئەوانەی کە دەچنە نێوی.

کەواتە: ئەو خێزانەی نووح کە دەربازی بووە، جیایە لەوەی کە خنکاوە، بۆیە ئەمەش ئەوە دەردەخات کە دەبێ نووح دوو هاوسەری بووبن، هەڵبەتە

لە تەوراتدا باسی یەك ئافرەت دەكاتو، باسی ئەوەش ناكات كە هاوسەرەكەی كافر بووبێ، بەڵام قورئان ئەو هەواڵەی پێداوین، چونكە دوایش هیچ ئافرەتی دیكە نەماون، تاكو نووح هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بكات، لە دوای تۆفان، چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ۝٧٧﴾ الصافات، واتە: تەنیا وەچەكەی ئەومان لەسەر زەوی هێشتەوە.

كەواتە: وشەی (أهل) لێرەدا هاوسەر دەگرێتەوەو، خوای پەروەردگاریش لێرەدا نەیفەرموە، هاوسەرەكەی لەگەڵیدا سوار نەبووە، كەواتە: دەبێ دووانی بووبن، یەكێكیانی لەگەڵ سوار بووە، كە مسوڵمانەكە بووە، یەكێكیشیانی لەگەڵ سوار نەبووەو فەوتاوە، كە بێبڕوایەكە بووە.

هەروەها كوڕەكەشی لەگەڵی سوار نەبووە، كە دیارە ئەو هاوسەرە كافرەی، لەگەڵ ئەو كوڕە كافرەی (كە ناوی كەنعان بووە)، پێشتر بڕیاریان لەبارەوە دراوە، لەبەر ئەوەی شایستە نەبوون كە لەگەڵ نووحدا سواربن‌و، خۆشیان ئامادە نەبوون، بەڵكو گاڵتەشیان بە نووح كردوە صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر نووح بێ.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ﴾: {عُدِّي (سَبَقَ) بحرف (على) لتضمين سبق، معنى حكم} بۆیە وشەی (سَبَق) بە پیتی (على)، تەعەددای كردوە بۆ (مفعول)، (یانی: ئەوەی قسە لەبارەیەوە تێپەڕیوەو گوزەراوە)، بۆ ئەوەی وشەی (سَبَق) مانای (حَكَم)ی بخرێتە نێو.

كە بە پێی بنچینەیەك لە زمانی عەرەبییدا: ئەگەر كردارێك بۆ خۆی تەعەددا بكات، یان عادەتی وابێ بە پیتێك تەعەددا بكات بۆ بەركار (مفعول به)، بەڵام بە پیتێكی دیكەی جیا، كە عادەت وانەبێ بەو پیتە (مفعول) بخوازێو بۆی بەكاربهێنرێ، ئەوە مانای كردارێكی دیكەشی دەخرێتە نێو، لێرەش دا وشەی (سَبَقَ) وێڕای ئەوەی كە مانای تێپەڕبوون‌و ڕەت بوونی هەیە، مانای بڕیاردان (حُكْم)شی هەیە، لەبەرئەوەی بە پیتی (على) بەركار (مفعول)ی خواستوە.

**بڕگەی پێنجەم** : ﴿وَمَنْ ءَامَنَ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ﴾: واتە: هەر {کەسێك بڕوای هێناوە سواری بکە، (بەدەر لە ماڵو منداڵی خۆت)}، کەمێکیش نەبێ، بڕوایان لەگەڵ نەهێنا.

ئنجا زانایان هەندێکیان گوتوویانە: حەفتاو ئەوەندە کەسە بوونو، هەندێکیان گوتوویانە: هەشتاو ئەوەندە، بەڵام بە دڵنیایی خوای پەنهانزان دەری نەخستوە، چەند بوون؟ دواییش کە خوا فەرمویەتی : ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ٧٧﴾ الصافات، تەنیا وەچەکەی ئەومان لەسەر زەوی هێشتەوە، ئنجا لەبەرئەوەی کە نووح تەمەنی زۆر بووە، واپێدەچێ: ئەوانەی بڕواشیان پێ هێناوە هەر لە وەچەی نووح بووبن، بەڵام دوورکەوتوونەتەوە لە ڕووی ڕەچەڵەکەوەو بە کەسوکارو ماڵو منداڵی ئەو دانەنراون، بەڵام دیارە هەر چۆن بێ، ئەوانیش ژمارەیان کەم بووە.

**مەسەلەی دەیەم :**

**سواربوونی نووح عليه السلام و ماڵو منداڵی نووحو، کەوتنە ڕێی کەشتییەکە، بەنێو شەپۆلە چیا ئاساکانی دەریادا، کە بەهۆی ئەو تۆفانەوە دروست بوو بوون:**

**خوای باڵادەست لە سێ بڕگەدا باسی ئەو بابەتە دەکات:**

**بڕگەی یەکەم** : ﴿وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا﴾: (نووح)، گوتی: تێیدا سوار بن.

وشەی (ارکبوا)، پێویست بە پیتێك ناکات تەعەدای پێ بۆ (مفعول) بکات، چونکە بۆ خۆی لازمەو تەعەددا دەکات، ئنجا دەگوترێ : (إركَبِ الفَرَسَ)، واتە: سواری ئەسپەکە ببە، بەڵام لێرەدا وشەی (ارکبوا) بە پیتی (في) تەعەددای پێکراوە بۆ (مفعول به)، شارەزایانی زمان دەڵێن: (جَرياً عَلَى الفَصِيحِ، لأَنَّ ركوب السَّفِينَة مجاز، وَإِنَّما هو جُلوسٌ وَاستِقرار)، واتە: ئەوە بە گوێرەی تەعبیری پاراوتری زمانە، چونکە لە ڕاستییدا سواربوونی، کەشتیی، (تەیارە، سەیارە...)

بریتیە لە تێدا دانیشتنی، بۆیە دەفەرموێ : ﴿وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا﴾، واتە: سواری بنو تێیدا دابنیشن، بە هۆی (فِي)ەکەوە مانای نیشتەجێ بوون هاتۆتە دی.

**برگەی دووەم :** ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآ﴾: (بڵێن): بە ناوی خوا، ڕۆیشتنیو لەنگەر گرتنی، دیارە ئەمە بە چەند شێوەیەك خوێنراوەتەوە زۆربەیان بە (مُجْرَاها وَمُرْساهَا)یان خوێندۆتەوە، ئەو کاتە (مُجْرى ومُرْسى) دەبن بە چاوگ بۆ وشەی (أَجْرى السفينة إذا جعلها جارية، أي سَيَّرها بِسُرْعَةٍ وأَرساها أي جَعَلَهَا رَاسيةً، أي واقفةً عَلى الشاطيء)، دیارە زۆربەی قورئان خوێنەکان لە حەوت قیرائەتەکان، یان دە قیرائەتەکاندا بەم شێومیان خوێندۆتەوە، ئەوە ئەوکاتە هەردووکیان چاوگ دەبن لە کرداری (أجرى)و (أرسى): (أجرى السفينة)، واتە: کەشتییەکەی لێخوڕی بە نێو دەریاو تۆفاندا، وە (مُرْساها) چاوگە لە (أرساها)، یانی: (أرسى السفينة) وایکرد کەشتییەکە لەنگەر بگرێو ڕابوەستێ لە کەناردا، واتە: هەم ڕۆیشتنیو هەم لەنگەر گرتنی ئەو کەشتییە، بە ناوی خوا.

هەروەها خوێنراویشەوە (مَجْراهَا ومَرْساها)کە ئەو کاتەش دەگونجێ چاوگ بنو، دەشگونجێ ناوی کات، یان ناوی شوێن بن (اسم زمان واسم مكان)، واتە: ڕۆیشتنو لەنگەر گرتنیو، کاتی ڕۆیشتنیو شوێنی ڕۆیشتنیو، کاتی لەنگەر گرتنیو شوێنی لەنگەر گرتنی، بە ناوی خوا، هەروەها (حفص)یش خوێندوویەتەوە: (مَجْرَيها)، واتە: بەلاریی، کەمێك دەمت لار بکەیەوە.

**برگەی سێیەم :** ﴿إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾: واتە: بێگومان پەروەردگاری من زۆر لێبوردەیەو زۆریش میهرەبانو بە بەزەیی یە.

واتە: ڕزگاربوونو قوتاربوونی ئەوان، لە لێبوردنو میهرەبانییو بەزەیی خوای پەروەردگارەوە سەرچاوە دەگرێ.

**مەسەلەی یازدەیەم:**

**بانگکردنی نووح ﷺ بۆ کوڕەکەی، کە لەگەڵی سواربێ و لە نێو کەشتییەکەدا سوار بێ، بۆ ئەوەی لەگەڵ کافرەکاندا نەفەوتێ:**

کە لە ئایەتەکانی: (٤٢ و ٤٣)دا، لە شەش بڕگە باسی دەکات:

**بڕگەی یەکەم :** ﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ﴾: وە ئەو (کەشتییە) دەیبردن لە نێو شەپۆلانێکدا وەك چیایان.

(وهي) دیارە ڕاناوەکە بۆ کەشتییەکە دەگەڕێتەوە، یانی: کەشتییەکە دەیبردن بە نێو شەپۆلی گەورە گەورەدا، کە وەك چیای بەرز وا بوون.

وشەی (موج) ناوی کۆیە بۆ (موجة)، کۆی (موجة)ش بریتیە لە (أمواج)، واتە: شەپۆلەکان، شەپۆل (موج)یش بریتیە لەو ئاوەی کە لە ئاستی ئاسایی ئاوەکە زیاتر بەرز دەبێتەوەو دێت و دەچێ و، بۆیەش بە (فعل المضارع) هێناویەتی، بۆ ئەوەی تێوەی ڕابمێنین و تەماشای بکەین بە چاوی خەیاڵ، کە کەشتییەکە دەڕوات بە نێو شەپۆلی گەورە گەورەدا، هێندەی چیای بەرز، کە لە ڕاستییدا تەنیا ئەوانەی سواری کەشتیی دەبن لە دەریای گەورەدا، هەست بەوە دەکەن و ئەو دیمەنە دەبینن.

**بڕگەی دووەم :** ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ﴾: نووح بانگی کوڕەکەی خۆی کرد، لە حاڵێکدا لە پەڕگەیەك بوو، لە شوێنێك بوو بە تەنیا.

**بڕگەی سێیەم :** ﴿يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ﴾: ئەی ڕۆڵە شیرینەکەم! لەگەڵمان سواربەو لەگەڵ بێبڕوایان مەمێنەوە.

لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: {بُنَيَّ: تَصْغِير مُضَافاً إلى (ي) المتَكَلِّم، والتَّصغير هنا، تصغير شَفَقَةٍ، يُجْعَلُ كالصغير، في كونه مَحَلَّ شفقة ورحمة}، ئەمە بنچینەیە لە زمانی عەرەبییدا: کە شتێکت بچووك کردەوە، مانای وایە زیاتر سۆزو خۆشەویستیی دەدەیە، چونکە منداڵی بچووك زیاتر

پێویستیی بە سۆزو خۆشەویستییە، ئەو کاتە نووح کوڕەکەی گەورە بووە، بەڵام کە گوتوویەتی : (بُنَيَّ) یانی: وەك منداڵێکی بچووك بە تەنگ تۆوەم، لەگەڵمان سواربەو لەگەڵ بێبڕوایان مەبە.

سبحان الله !

لە کاتێکدا کە زانیویشیەتی کافرە، بەڵام چەند بە ڕەحمو سۆز بووە بەرانبەری! گوتوویەتی بەڵکو ئیمان بێنێ‌و بڕوا بە بابی ﷺ بکات، کە پێغەمبەری خوایە!

**برگەی چوارەم** : ﴿قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ﴾: کوڕە کافرەکەی نووح، وەك لە پەیمانی کۆندا هاتوە: ناوی (کنعان) بووە، نووح ﷺ چوار کوڕی هەبوون: (سام، حام، یافث)، ئەم سێ کوڕەی کە لەگەڵ خێزانەکانیان دا مسوڵمان بوون، بەڵام کەنعان کافر بووە، گوتی: من پەنا دەبەم بۆ چیا، (واتە: دەچمە سەر لووتکەی چیایەك) لە ئاو دەمپارێزێ.

لە جیاتی ئەوەی هانا بیات بۆ خواو بچێ لەگەڵ بابی خۆی بێ‌و سواری ئەو کەشتییە بێ، تەماشا بکەن! مرۆڤ کاتێك کوفر لە عەقڵ‌و دڵی دا جێگیر دەبێ، چۆن هەستەوەرەکانی لە کار دەخات، وای لێدێ کە: نە عەقڵی باش کار بکات، نە گوێی هەق ببیستێ، نە چاوی هەق ببینێ.

**برگەی پێنجەم** : نووح ﷺ وەڵامی دەداتەوە: ﴿قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ﴾: (نووح) گوتی: ئەمڕۆ پارێزەر نیە لە فەرمانی خوا، مەگەر کەسێك خوا ڕەحمی پێ بکات، واتە: لەو بڕیارەی خوا کە: ئەمڕۆ هەرچی کافر بێت، دەفەوتێ، ئەمە واتایەکی.

یاخود (أَمْرِ ٱللَّهِ)، واتە: فەرمان پێکراو (مأمور)ی خوا، کە بریتیە لە هاتنی تۆفانەکە، ئەمڕۆ پارێزەر نیە لەو فەرمان پێکراوەی خوا، کە تۆفانەکەیەو خوا ناردوویەتی، (إِلَّا مَن رَّحِمَ)، مەگەر کەسێك خوا بەزەیی پێیدا هاتبێتەوە، خواش بەزەیی بە کەسێکدا دێتەوە کە ئیمانی پێ بێنێ‌و تەنیا ئەوان ڕزگاریان دەبێ.

**بڕگەی شەشەم :** ﴿وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ﴾: ئنجا شەپۆل کەوتە نێوانیانەوەو لە خنکاوان بوو، واتە: لەگەڵ ئەو کەسانەی خنکان، خنکاو نغرۆ بوو، (چونکە بە قسەی بابی نەکرد).

**مەسەلەی دوازدەیەم :**

**کۆتایی تۆفان و، نیشتنەوەی کەشتیی لەسەر چیای جوودیی:**

کە لە ئایەتی ژمارە (٤٤)دا خوای زاناو شارەزا لە حەوت بڕگەدا دەیخاتە ڕوو، دەفەرموێ : ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾:

**بڕگەی یەکەم :** ﴿وَقِيلَ﴾: (وَقِيلَ)، گوترا، بێژەری ئەم گوتەیە هەر دیارە کێیە؟ خوایە ﷻ، چونکە جگە لە خوا، کێ دەتوانێ بە زەوی بڵێ: ئاوەکەت قووت بدەو هەڵیمژەو، بە ئاسمانێ بڵێ: چی دیکە ئاو مەبارێنە، بێگومان هەر خوای باڵادەستو پەروەردگارە بەڵام لێرە بۆیە بێژەری قسەکە بە نەزانراو (مجهول) دەهێڵێتەوە، چونکە ئەوە هەیبەتو گەورەیی زیاتری تێدایە.

**بڕگەی دووەم:** ﴿يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِي مَآءَكِ﴾: ئەی زەوی! ئاوەکەت هەڵمژەو قووتی بدە.

(البَلْعُ: إجْتِيَازُ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ إِلى الحَلْقِ بدُون استقْرَارٍ فِي الفَمِ، وَهو هُنا استعَارَة لإدْخَال الشيءِ فِي باطِنِ الأَرْضِ بسُرْعَةٍ).

(بَلْع) بریتیە لە شتیك کە بەبێ ئەوەی ڕاوەستێ لە زارتدا، یەکسەر لە قوڕگ ڕەت بێو قووتی بدەی، لێرەدا ئەم وشەیە خوازراوەتەوە بۆ شتیك کە بخرێتە نێو زەوییەوە بە خێرایی، واتە: ئەی زەوی ئاوەکەت! هەڵیمژە بۆ ئەوەی ئەو هەموو ئاوو تۆفانە بەخێرایی نەمێنێ.

**برگەی سێیەم :** ﴿ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي ﴾: ئەی ئاسمان! (یانی: هەور کە لە سەرەوەیە)، تۆش واز بێنە با چیدی نەبارێ.

(الإِقْلاَعُ: الكَفُّ وَالإِنْتِهَاء)، (إقلاع)، واتە: وازهێنانو کۆتایی پێ هێنان، یانی: بەسە، تۆش چیدیکە ئاو مەبارێنە.

**برگەی چوارەم :** ﴿ وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ ﴾: (الغَيْضُ: النَّقْص والنضُوب)، (غَيْض)، بریتیە لە کەم کردنو نەمان، بەڵام لێرەدا (وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ)، کە دیسان بە بکەر نەزانراو (مجهول الفاعل) هێنراوە، واتە: ئاوەکە ڕۆچوێنراو برایە نێو ناخی زەوی یەوە، بۆیەش وشەی (غَيْض) بەکارهێنراوە، چونکە پلە پلەو وردە وردە ڕۆچوێنراوەو نەهێڵراوە.

**برگەی پێنجەم :** ﴿ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ﴾: کارەکە تەواو بوو، بڕیارەکە جێبەجێ بوو، واتە: ئەوەی خوای کارزان ئامانجی بوو، کە لە نێوبردنی کافرەکان بوو، بەو تۆفانە، ئەوە جێبەجێ بووو ئەوان نەمانو تیاچوون.

**برگەی شەشەم :** ﴿ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّ ﴾: کەشتییەکەش لەنگەری گرتو جێگیر بوو لەسەر چیای جوودیی.

(الجودي: اسْم جَبَلٍ بَيْنَ العِرَاق وَأَرْمِينيا فِي أَرْض كوردستان الشمالية)، (جودي) ناوی ئەو چیایەیە {کە لە جەزیرەیە، لە قەزای جەزیرە، سەر بە پارێزگای (ئامەد، دیاربەکر)، کە لە زنجیرە چیای (ئەراراتە)}، لە نێوان عێراقو ئەرمینیایە لەسەر خاکی باکووری کوردستان.

**برگەی حەوتەم :** ﴿ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾: گوتراش: دووریی بۆ کۆمەڵی ستەمکاران.

(بُعْدًا) چاوگە، یانی: (ليبعدوا بعداً)، با دوور بن، بە دووریی، وەك: (كَرِمَ) و (فَرِحَ) وایە، یانی: با لە ڕەحمەتی خوا دووربنو بفەوتێن.

هەندێکیان گوتوویانە: (بُعْدًا) واتە: فەوتان بۆ ئەوان (هَلَاكًا).

هەڵبەتە ئەم ئایەتە موبارەکە (ئایەتی ژمارە (٤٤)) وەك (محمد رشید رضا)و (محمد الطاهر بن عاشور)و زانایانی دیکە باسیان کردووە، ڕەوانبێژترین ئایەتی قورئانە، ئنجا ئێمە قسەکەی (محمد رشید رضا) دێنین، کە ئەو زۆر بە درێژیی قسەی لەسەر کردوەو، تەفسیرەکانی دیکەش بە درێژیی قسەیان لەسەر ئەو ئایەتە کردوە، بەلاّم تەنیا کەسانێك کە شارەزای زمانی عەرەبی بن، لەو وردەکارییانە تێدەگەن، کە دەڵێ: (قَرَّرَ عُلَمَاءُ الْبَلَاغَةِ الْفَنِّيَةِ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ أَبْلَغُ آيَةٍ فِي الْكِتَابِ الْعَزِيزِ، أَحَاطَتْ بِالْبَلَاغَةِ مِنْ جَمِيعِ جَوَانِبِهَا وَأَرْجَائِهَا اللَّفْظِيَةِ وَالمَعْنَوِيَةِ الَّتِي وُضِعَتْ لِفَلْسَفَتِهَا الْفُنُونُ الثَّلَاثَةُ: المَعَانِي وَالْبَيَانُ وَالْبَدِيعُ)[1].

واتە: زانایانی هونەری ڕەوانبێژیی بڕیاریان داوە، کە ئەم ئایەتە لە هەموو ئایەتەکانی کتێبی زاڵی (خوای پەروەردگار) زیاتر لایەنی ڕەوانبێژیی تێدایەو، دەوری ڕەوانبێژیی داوە لە هەموو لایەکانیەوە لە ڕووی بێژەیی‌و لە ڕووی ماناوە، کە بۆ فەلسەفەی ڕەوانبێژیی هەرسێك زانیاریی (المَعَانِي وَالْبَيَانُ وَالْبَدِيعُ) دانراون.

دیارە ئەم زاراوانەش کەسانی پسپۆڕو شارەزا لێیان تێدەگەن‌و، دەزانن چەمك‌و واتاکەیان چییە؟ هەڵبەتە بۆ کەسێك کە تۆزێکیش شارەزای زمانی عەرەبی بێت، ئەم ئایەتە زۆر زۆر جێگای سەرسوڕمانە! چونکە دوو فەرمانی تێدان‌و، دوو هەواڵی تێدان‌و، دوای ئەوە، دوو بڕیاری تێدان! بەشێوەیەك کە هەر لە خوای بالآدەست‌و زانا دەوەشێتەوە، بەو شێوەیە فەرمایشت بکات‌و بدوێ.

١) تفسير القرآن الحكيم ج١٢، ص٦٦.

**مەسەلەی سێزدەیەم:**

## پارانەوەی نووح لە پەروەرگاری دەربارەی کوڕەکەی و، بانگکردنی بە کنارە بۆ پەروەرگاری کە ئایا دەبێ کوڕەکەی سەرو سۆراغی چۆن بێ؟

دەفەرموێ : ﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾، ئنجا نووح بانگی پەروەردگاری کردو لێی پاڕایەوە، گوتی: پەروەردگارم! کوڕەکەم لە نیزیکانی منەو، بەڵێنی تۆش ڕاستە (کە نیزیکەکانم ڕزگار بکەی)و، تۆش بەهێزترینو باشترین حوکمڕانیی، (هیچ شتێك لەبەر دەستی تۆ دەرناچێ).

(النداء: الدعاء)،(نداء)، یانی: پاڕانەوە،﴿ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى ﴾، ئەمە ڕوونکردنەوەی پاڕانەوەکەیەتی، پاڕانەوەکەی بۆچی بوو؟ بۆ ئەوە بوو، گوتی: ئەی پەروەردگارم! کوڕەکەی من لە نیزیکانی منە، لە چوارچێوەی ماڵو خێزانی من دایە، بەڵێنی تۆش ڕاستەو، تۆش دەست ڕۆیشتووترین (یان کارزانترین) حوکمڕانیی.

لێرەدا تەماشا دەکەین: نووح ﷺ بە ڕوونیی داوایەکەی نەکردوە چونکە گوتوویەتی: ئەی پەروەردگارم! کوڕەکەم لە چوارچێوەی خێزانی من دایە، بەڵێنی تۆش ڕاستە، تۆش دەست ڕۆیشتووترین حوکمڕانی.

ئیدی نەیفەرمووە: کوڕەکەم بۆ دەرباز بکە، بەڵکو بە کنارەو زۆر بە ئەدەبەوە بۆ خوای پەروەردگار پێشنیار دەکات، ئنجا هیچ گومانی تێدانیە، کە نووح ﷺ زۆر ڕێزو حورمەتێك، کە بۆ خوا شایستەیە، بە خەرجی داوەو، ئەمە وەك زەمینە خۆشکردنیش بووە بۆ پاڕانەوەکەی، کە ئایا خوای کاربەجێ مۆڵەتی دەدات کە بۆ کوڕەکەی بپاڕێتەوە، یان نا؟ کە لە ڕاستییدا ڕواڵەتی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ، هەر بۆیەش ئێمە گوتوومانە: پاڕانەوەی نووح لە پەروەردگاری لە بارەی کوڕەکەیەوە کە ئەی خوای میهرەبان! دەبێ کوڕەکەم چۆن بێ؟ چی بەسەر بێ؟ ئنجا وەك زەمینە خۆش کردن، بەم شێوازە قسەی کردوە.

**مەسەلەی چواردەیەم :**

**وەڵامدانەوەی خوا ﷻ بۆ نووحو، ڕەخنەگرتنی لێیو پەشیمانبوونەوەیو، داوای لێبوردن کردنی:**

**خوا عزَّوجلَّ لە ئایەتەکانی: (٤٦ و ٤٧)داو، لە شەش بڕگەدا، ئەمە دەخاتەڕوو، دەفەرموێ :** ﴿ قَالَ يَـٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَـٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾:

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ قَالَ يَـٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ﴾: **(خوای کاربەجێ)، فەرمووی: ئەی نووح ! ئەو (کوڕەت) لە نیزیکانی تۆ نیە، لە چوار چێوەی کەسوکاری تۆدا نیە، واتە: چونکە بڕوادار نیە نزیکی تۆ نیە، هەرچەندە لە تۆش نزیک بێ.**

**بڕگەی دووەم :** ﴿ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَـٰلِحٍ ﴾: **واتە: ئەو کوڕە کردەوەی باش نیە، چونکە مرۆڤ بریتیە لە کردەوە، ئەو کوڕەش هیچ کردەوەیەکی باشی نیە، خوێنراویشەتەوە: (إِنَّهُ عَمِلَ غَيْرَ صَالِحٍ)، کە من زیاتر ئەم خوێندنەوەیەم لە قالب خۆشترە، ئەگەرنا هەردووکیان هەر ڕاستن، واتە: بێگومان ئەو کردەوەی ناچاکی کردوە، یانی: ئەو کردەوەی باشی نەکردوە، بۆیە شایستەی ئەوە نیە کە سزای لەسەر لابچێتو، شایانی ئەوە نیە کە تکای بۆ بکرێ.**

**ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە جەوهەری مرۆڤ و، کەسایەتیی مرۆڤ، لە کردەوەو هەڵسوکەوتو ڕەفتارەکانی دا بەرجەستە دەبێ، نەك لە قسەو ئیددیعایدا، وە نەك لە ڕووکەشو ڕواڵەتییدا، بەڵکو ئایا کردەوەی چۆنە؟ هەڵوێستی چۆنە؟ ئاکاری چۆنە؟ ئەوە دەرخەری چییەت(ماهیة)و جەوهەریەتی.**

**بڕگەی سێیەم** : ﴿فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾: داوای شتێكم لێ مەكە كە زانیارییت دەربارەی نیە، خوێنراویشەتەوە: (فَلَا تَسْئَلَـنِّي)، یانی: بە تەئكید نەچی داوای شتێكم لێبكەی كە تۆ زانیارییت لەسەری نیە.

**بڕگەی چوارەم** : ﴿إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾: من ئامۆژگارییت دەكەم كە لە نەفامان بی، چونكە ئەوە عادەتی نەفامانە: داوای شتێك بكەن لە خوا، كە لە جێی خۆی دا نەبێ.

**بڕگەی پێنجەم** : ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ﴾: نووح ﷺ وەڵامی خوای پەروەردگار دەداتەوە، ئەی پەروەردگارم! من پەنات پێدەگرم، كە داوای شتێكت لێبكەم: زانیاریم لەسەری نیە، بمپارێزە لەوەی كە داوای شتێكت لێبكەمو جێی خۆی نەبێو، داوای شتێكت لێبكەم كە زانیاریم لەبارەیەوە نەبێ، واتە: زانیاریم نەبێ كە: ئایا دەگونجێ من داوای ئەو شتەت لێ بكەم، یان نا؟ بەرچاو ڕوونییم نەبێ، كە بێگومان نووح ﷺ زانیاریشی لەبارەی كوڕەكەیەوە نەبووە، بۆیە وەك پێشنیار خستوویەتە بەردەم خوای پەروەرگار، دەفەرموێ: كوڕەكەم دیار نیەو، ئەویش یەكێك لە كەسەكانی خێزانەكەمەو، بەڵێنی تۆش ڕاستەو، هیچ شتێكت لەبەردەست دەرناچێ، چونكە تۆ باشترین حوكمڕانی، ئا ئەم قسانە پێشنیارن.

**بڕگەی شەشەم** : ﴿وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾: ئنجا ئەگەر تۆ لێم نەبووریو بەزەییت پێمدا نەیەت، ئەوە بێگومان من لە زیانباران دەبم.

واتە: نووح ﷺ هەم داوای لێبوردن لە خوا دەكات، هەم داوای بەزەییشی لێ دەكات، دیارە لێبووردنەكە بۆ پاكبوونەوەو بژاركرانیەتیو، ڕەحمەتو بەزەییەكەش بۆ ڕازاندنەوەو چاك بوونیەتی، واتە: هەم داوای پاكسازیی لە خوا كردوە، هەم داوای چاكسازیشی لێ كردوە.

# کورتە باسێک دەربارەی ڕەخنەگرتنی خوای پەروەردگار لە نووح و، چەند ڕاستییەکی گرنگ

## أ/ ڕەخنەگرتنی خوای کارزان لە نووح:

زانایان لێرەدا کەوتوونەتە ڕاجیایی، کە ئایا ئەو کوڕە، کوڕی نووح بووە، یان کوڕی نەبووەو ؟ ئایا بۆچی خوا ﷻ بەم شێوەیە ڕەخنەی لە نووح گرتوە ؟

هەندێکیان گوتوویانە: ئەو کوڕە، کوڕی نووح نەبووە، واتە: ئەو کوڕە لە خۆی نەبووە، یانی: هاوسەری نووح داوێن پیسیی کردوەو کوڕەکە لە نوتفەی نووح پەیدا نەبووە، کە بێگومان ئەم قسەیە ڕووی مەجلیسی نیە، چونکە خوای تاك‌و پاك پێغەمبەرانی خۆی پاراستوە، لە هەر شتێك کە بە عورف‌و عادەت‌و بە پێی عەقڵ‌و لۆژیکی خەڵك‌و کۆمەڵگای خۆیان، مایەی شەرمەزاریی‌و عەیبەو کەموکوڕیی بوو بێ.

کە کوفرو شیرك‌و دوورکەوتنەوە لە خواو بت پەرستیی، نەك مایەی شەرمەزاریی‌و عەیبداریی نەبووە، بەڵکو مایەی شانازییان بووە، بۆیە شتێکی ئاساییە کە خێزانی هەر یەك لە نووح‌و لووط کافر، بووبن، چونکە ئەوکاتە کافر بوون عەیب نەبووە، بەڵکو ئیمان هێنان‌و ڕووکردنە خوا، لەو ڕۆژگارەدا بە نوقصانیی دانراوەو، خەڵکی بڕواداریان بە شێت داناوەو، بە لەڕێ لادەر داناوە! بەڵام داوێن پیسیی (زنا) جگە لەوەی کە ڕەچەڵەك‌و وەچەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خەلەلی تێدەکەوێ، لە عورف‌و باوی ئەوانیش دا، عەیبدارییەکی گەورە بووەو، پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لەسەربێ، خوا پاراستوونی لە

عەیبداریی‌و شەرمەزاریی، چونکە دوایی خەڵك قسەیان لێ وەرناگرێ، ئەدی چۆن بووە؟ زانایان لەوبارەوە چەند شتێکیان گوتوە، کە لە هەموویان پەسندترو باشتر ـ بە ڕای بەندە ـ ئەوەیە کە :

داواکارییەکەی نووح، هەڵەیەکی ئیجتیهادیی بووە:

هەڵبەتە داواکارییەکەش بە شێوەیەکی ڕوون نەبووە، بەڵکو شێوەی پێشنیاری هەبووە، بەلام هەرچۆن بێ، نووح بە بۆچوونی خۆی ئیجتیهادی کردوەو پێی وابووە کە دەگونجێ داوا لە خوا بکات بۆ کوڕەکەی، بەلام دوایی خوای زاناو شارەزا وەلامی داوەتەوەو فەرموویەتی: داوام لێمەکە، نووحیش داوای نەکردوەو تەنیا پێشنیاری کردوە.

شایانی باسە، کە خوا عزّ وجلّ پێشتریش ئاماژەی پێداوە: ﴿وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ٣٧﴾ هود، واتە: دەربارەی ستەمکاران مەمدوێنە، تازە ئەوان بڕیاریان بۆ دراوە، کە دەبێ لە خنکێنراوان بن.

کەواتە: هەر ئەوە بووە کە نووح ﷺ ئیجتیهادی کردوەو ئەو پێشنیارەی کردوە، بەلام دیارە لە ئیجتیهادو کۆششەکەیدا نەیپێکاوە، بۆیە خوا ﷻ ڕەخنەی لێگرتوە، ئەگەرنا دوایی کە دەفەرموێ : ﴿فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ﴾، واز لە شتێك، لە داوایەك بهێنە کە زانیارییت لەسەری نیە، واتە: تاکو ئێستا لە قۆناغی پێشنیاردایەو، مەیکە بە پاڕانەوەو داواکردن، بۆیە دەفەرموێ : ﴿إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾، من ئامۆژگارییت دەکەم کە لە نەفامان نەبی، یانی: داوای شتێکی وا نەکەی، ئەگەرنا دەچیە ڕیزی نەفامانەوە.

ئنجا دواییش نووح دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! من پەنا بە تۆ دەگرم لە داواکارییەك کە زانیاریم لەسەری نیە، خوایە! بمپارێزە. ﴿وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾، ئەو لێبووردن‌و بەزەییەش بۆ ئەوەیە کە لە خستنەڕووی پێشنیارەکەی دا، کە بە ئیجتیهاد بووە، نەیپێکاوە.

ب / سێ ڕاستیی گرنگ :

یەکەم: ئیمان و کردەوەی باش، پەیوەست نین بە نەسەب و ڕەچەڵەکەوە:

مەرج نیە کەسێك کوڕی پێغەمبەر بێ، چاك بێ، یان کوڕی زانایەك بێ، باش بێ، کچی پیاوێکی باش بێ و لە خێزانێکی باش بێ، ئەویش باش بێ، مەرج نیە، بەڵکو ئیمان و کردەوەی باش، پەیوەندییان بە خودی مرۆڤەوە هەیە، نەك بە ڕەچەڵەکەوەو، چاکیی لە ڕێی کرۆمۆسومات و جیناتی بۆماوەییەوە، نەقڵ نابێ، لە دایك و بابەوە بۆ ڕۆڵە!.

دووەم: پاداشتی دنیا و دواڕۆژی خوا، بە نەسەب و ڕەچەڵەکەوە نەبەستراوەتەوە:

کەواتە: کردەوەی مرۆڤ، سەنگی مەحەکە لە تەرازووی خوای پەروەردگارداو، دنیاو دواڕۆژی مرۆڤ بە کردەوەی مرۆڤ خۆیەوە، بەستراوەتەوە.

سێیەم: خۆ بە نەسەب و ڕەچەڵەکەوە هەڵکێشان، هیچ سوودێکی نیە:

بە داخەوە هەندێك کەس خۆیان بە نیزیکی پێغەمبەر دەزانن، لە ڕووی نەسەب و ڕەچەڵەکەوەو، زۆر باسی خۆیان دەکەن و خۆیانی پێ هەڵدەکێشن و، خۆیان پێ لە خەڵکی دیکە جیایە، کە لە ڕاستییدا ئەمە وەك ئیعتیباری دنیایی، بەڵێ جاری وایە کەسانێك ڕێز لە کەسێك دەنێن، دەڵێن: ئەوە کوڕی یان کچی فلان سەیدە، یان کوڕی یاخود کچی فلان شێخە، یان کوڕی یاخود کچی فلان ئاغایە، فلان بەگە، فلان حوکمڕانە ... هتد، وەك عورف ئەمە هەیە، بەڵام وەك گوتراوە: (ئەوەی لەلای عەبد خەیاڵە، لە لای خوا بەتاڵە)، ئەوەی لە لای خوا گرنگە، تەنیا خودی بەندەکەیە، ئنجا لەویشدا کردەوەو جەوهەری ئەو بەندەیە چۆنە؟ ئەوە گرنگە.

لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {يَا فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ! سَلِينِي مِنْ مَالِي مَا شِئْتِ، لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيئاً} {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، بِرقم: (٤٧٧١)، وَمُسْلم، برقم: (٢٠٦)}.

واتە: ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد! لە موڵكو سامانی خۆم چیم لێ داوا دەکەی، داوای بکە، بەڵام بە نسبەت لای خواوە، هیچ سوودت پێ ناگەیەنم، یانی: نابێ بە تەمای من بیو پشتێندی لێ بکەیەوە.

ئنجا ئەگەر بە نسبەت فاتیمەوە خوا لێی ڕازی بێ، وا بووبێ، کە گەورەی ئافرەتانی دنیایەو، پێغەمبەری خوا زۆر زۆری خۆشویستوە، وەك فەرموویەتی: {يا فَاطِمَةُ! أَلا تَرْضَيْنَ أَنْ تَكوني سَيدةَ نِساءِ المؤْمِنِينَ، وسَيدةَ نِساءِ هَذِهِ الأُمَّةِ} {أَخْرَجَهُ البُخارِيُّ، برقم: (٥٩٢٨)، وَمُسْلم، برقم: (٢٤٥٠)}.

واتە: ئەی فاتیمە! ئایا ڕازی نابی کە گەورەی ئافرەتانی بڕواداران‌و، گەورەی ئافرەتانی ئەم ئوممەتە بی؟

ئەدی ئەوانەی کە بە سی، چل (٣٠ ـ ٤٠) پشت، ئنجا دەگەڕێنەوە سەر فاتیمە، بێگومان بۆ ئەوان دوورتریشە، بۆیە نابێ بە نەسەبو نزیکیی لە پێغەمبەر تێبکەون، ئەوەتا فاتیمە کچی پێغەمبەرﷺ خۆیەتی، ئنجا بەو شێوەیە ڕاستەوخۆ وای پێ دەفەرموێ، کە دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستوویەتی هەم ئامۆژگاریی فاتیمە بکات، هەم هی ئەوانەی کە لە فاتیمەوە پەیدا دەبن‌و، هەم ئامۆژگاریی هەموو مسوڵمانان بکات، کە بە تەمای نەسەبو ڕەچەڵەك تێنەکەون، وەك خوای دادگەر لە سووڕەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ : ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ١٠١ ﴾، واتە: ئەگەر فوو بە کەڕەنادا کرا، لەو ڕۆژەدا نە ڕەچەڵەکیان لە نێواندا دەمێنێ‌و نە کەس لە کەس دەپرسێ.

هەروەها لە سووڕەتی (مریم)دا دەفەرموێ : ﴿ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ٩٥ ﴾، واتە: هەر کام لە مرۆڤەکان لەو ڕۆژەدا، بە تەنیا دێتە خزمەتی (خوای پەروەردگارو بەردەم دادگای خوا).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : {مَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَم يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ} {رَوَاهُ مُسْلم، برقم: (٢٦٩٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٩٤٥)، وابْنُ ماجَهْ، برقم: (٢٢٥)، وَالدَّارَمِي، برقم: (٣٤٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}.

واتە: هەر کەسێك کردەوەکەی دواى بخات، ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات.

ئنجا بە ڕاستیی ئەوە دەرسێکی گەورەی تێدایە، نووح سەلامی خوای لەسەر بێ، هەر تەنیا پێشنیاری کرد بۆ خوا ﷻ دەربارەی کوڕەکەی، بەڵام خوای کارزان ئامۆژگاریی کرد، کە نەچێ تکا بکات بۆ کوڕەکەی.

هەروەها هەر کام لە خێزانەکانی لووطو نووح، کە کافر بوون، خوا ﷻ بە دەقی ئایەت دەفەرمووێ: ﴿فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ ﴿١٠﴾﴾التحريم، واتە: هیچ سوودیان پێنەگەیاندن، {(نووح) و (لووط) سوودیان بە نیزیکترین کەسی خۆیان نەگەیاند کە خێزانەکانیان بوون} و، پێیان گوترا: بچنە نێو ئاگر، لەگەڵ ئەوانەدا کە دەچنە نێوی.

هەروەها ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێ، کە بابی کافر بووە، بە هەمان شێوە: سوودی بە بابی نەگەیاند، هەروەها ئەبو لەهەب کە مامی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، خوا دەربارەی دەفەرمووێ: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾﴾المسد، واتە: هەردووك دەستی ئەبو لەهەب بفەوتێنو، فەوتاشن، خوای کاربەجێ لە قورئاندا ناوی یەك کافریشی نەهێناوە، جگە لە ئەبو لەهەب، کە ئەویش مامی پێغەمبەرە ﷺ! ئەمانە هەموویان دەرسی زۆر گەورەن بۆ ئێمە.

ئەوەتا پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك ئیبراهیم سوودی بە بابی نەگەیاندو، پێغەمبەر موحەممەد ﷺ سوودی بە مامی کافری نەگەیاندو، نووحو لووط سوودیان بە خێزانەکانیان نەگەیاند، هەروەها نووح سوودی بە کوڕەکەی نەگەیاند، کەواتە: نابێ هیچ کەسێك چاوەڕێی ئەوە بکات کە بە هۆی خزمایەتیی پێغەمبەرەوە، دەربازی ببێ، هەرچەند وەك ئیعتیباری دنیایی: خەڵك دەڵێن: سەید زادەو، شێخ زادەو، بەگ زادەو، ئاغا زادەو، مەلا زادەو ... هتد، ئەوانە دەکرێ بگوترێن، بەڵام بۆ لای خوای دادگەر جگە لە کردەوەی مرۆڤ خۆی، پێش ئەوەش: ئیمانو عەقیدەی باشو ڕاستەقینەی مرۆڤ خۆی، شتێکی دیکە بە هانای مرۆڤەوە نایەت.

بەڵێ ئەوە قورئان ئاوا بە مسوڵمانان دەفەرموێ، بەڵام ئەوەی کە وەك عورف و عادەت و کلتوور لە نێویاندا دەبێتە باو، ئەوە شتێکی دیکەیە و، پەیوەندیی بە دینی خواوە نیە.

## مەسەلەی پازدەیەم :

### دابەزینی نووح و سواربووانی کەشتییەکە:

خوا ﷻ ئەمیش لە ئایەتی (٤٨)دا دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ : ﴿ قِيلَ يَـٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَـٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَـٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾ ﴾، لێرەدا خوای پەروەردگار ڕێنمایی نووح دەکات و فەرمانی پێ دەکات، گوترا: ئەی نووح! دابەزە لەلایەن ئێمەوە، بە ئاشتیی و سەلامەتیی و، پیت و پێز لەسەر خۆت و لەسەر ئەو کۆمەڵانەی کە لەگەڵتن.

واتە: ئەو کەسانەی کە لەگەڵتن، دوایی دەبن بە ئەسڵ بۆ چەندان گەل و نەتەوە، کە دوایی لەسەر زەوی پەیدا دەبن، هەم ئاشتیی و سەلامەتیی لە منەوە، هەم بەرەکەت و پێز، بۆ خۆت و بۆ ئەو گەلانەش کە لەوانە پەیدا دەبن، کە ئێستا لەگەڵ تۆ لە کەشتییەکەدا سوار بوون.

ئنجا ئەمەش موژدە بووە بۆ ئەوە کە ئۆممەتان و کۆمەڵگایانێکی زۆر لە نەسل و وەچەی نووح سەلامی خوای لەسەر بێ پەیدا دەبن، وەك خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونیی لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتە: هەر وەچەی ئەومان هێشتەوە، کەسی دیکە لەسەر زەویی نەما، لە دوای نووح عليه السلام ەوە، چونکە تەنیا نووح و ئەوانەی کە لە کەشتییەکەدا لەگەڵی سوار بوون، کە هەر وەچەو خزم و نیزیکانی خۆی بوون، مرۆڤ هەر لەوانەوە داکەوتنەوەو، جارێکی دیکە بە زەویدا بڵاوبوونەوەو، ئەو هەموو نەتەوەو کۆمەڵگایانەیان لێ پێکهاتن.

دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، کۆمەڵانێکیش هەن (لەوانەی کە دوایی لە نەسلو وەچەی تۆ ـ ئەی نووح ! ـ پەیدا دەبن)، ئێمە ماوەیەکی کەم ژیانی دنیایان پێ دەگوزەرێنین، بەڵام دوایی لەلایەن ئێمەوە سزایەکی بە ئێشو ژانیان تووش دەبێ.

ئەمە بە کنارە قسەکردنە لەگەڵ ئەهلی کوفردا، واتە: ئەی ئەهلی کوفر! با لە وەچەی نووحیش بووبن، بەڵام ئەگەر بە ڕێگای ئەودا نەڕۆن، بەڵێ لە دنیادا دەتانژیەنین وەك مسوڵمانان، چونکە لە دنیادا ڕەحمەتو خێرو بەرەکەتەکانی خوا بۆ هەموو مرۆڤەکانن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە دنیا شوێنی تاقیکردنەوەیە، بەڵام ئەگەر بێتو ڕێی نووح نەگرن، ڕێی ئەو باپیرەیەتان نەگرنو، لەسەر ڕێبازی ئەو نەڕۆن، کە خوا بەیەکگرتنو بەندایەتیی کردنە بۆ خواو، خۆ دوور گرتنە لە شیركو کوێرە ڕێیەکانو ڕێچکە شەیتانییەکان، ئەوە بێگومان: لەلایەن ئێمەوە تووشی ئازارو سزایەکی بە ئێش دەبن.

## مەسەلەی شازدەیەمو کۆتایی :

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە: کە ئەم هەواڵە لە پەنهان (غیب)ەوە نێردراوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾، ئا ئەم هەواڵانە هەواڵی نادیارن بە تۆیان ڕادەگەیەنین، بۆ تۆیان سروش دەکەین، کە پێش ئەم قورئانە، نە خۆتو نە گەلەکەت نەتاندەزانین، خۆڕاگربە، بێگومان سەرەنجامی چاك بۆ پارێزکارانە.

ئنجا ئایا لە نێو گەلی عەرەبدا بەسەرهاتی نووح نەبووەو؟ پێغەمبەری خوا موحەممەد صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ هیچی نەبیستوە؟ با، بە تەئکید بووەو بیستراوە، بەڵام نەك بەو وردەکارییەی ئێستا، تۆ ئێستا تەوراتیش بخوێنەوە، کۆمەڵێك غەڵەتو پەڵەتی تێخراون، هەرچەندە تەورات باسی تۆفانی (نوح)

دەکات، کە دیارە تەورات بە لایەنی کەم هەزارو دوو هەزار (٢٠٠٠) ساڵ پێش پێغەمبەری خاتەم صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ بۆ مووسا ﷺ هاتوە، کە ئێستا ئەهلی کیتاب پێی دەڵێن: پەیمانی کۆن (العهد القديم) بەڵام کۆمەڵێك هەڵەی تێدانو، زیدەڕۆیی‌و کەم‌و کورتیی زۆری لەوبارەوە تێدایە، کەواتە: ئەو زانیارییە ڕاست‌و دروستە، ئەوە هەواڵی نادیارە، لەلایەن خوای پەنهانزانەوە بۆ تۆ نێردراوە، کە نە تۆو نە گەلەکەت پێشتر ئەوەتان نەزانیوە، با پێشتر هەندێك زانیاریی دەماو دەم‌و پچڕ پچڕتان بیستبێ.

بە دڵنیاییی ئەگەر هۆزی قوڕەیش زانیبایان، دەیانگوت: ئەی موحەممەد! ئەو ئایەتەی بۆت هاتوە، وانیە، ئێمەش زانیومانە، ئێمەش دەزانین ئەو بەسەرهاتە ئاوا بووەو، ئاوا چووە، بەڵام دیارە نەیانزانیوە، واتە: بەو وردەکارییەوە نەیانزانیوە.

کە دەفەرموێ: ﴿فَٱصْبِرْ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ٤٩﴾، خۆڕاگربە! بێگومان سەرەنجام بۆ پارێزکارانە، واتە: ئەوانەی کە خۆیان دەپارێزن لە لادان لە شەریعەت، کە هەر شەریعەتیش فەرمان دەکات بە ڕەچاوکردنی یاساکانی خوا (سُنن الله)، لە ژیانی بەشەردا، ئنجا ئەوانەی خۆیان بپارێزن، لە سەرپێچیی لە شەریعەت‌و، سەرپێچیی لە یاساکانی خوا (سُنن الله) بێگومان سەرەنجامی چاك لە گرەوی ئەواندایە، لە دنیاو دواڕۆژدا.

**تەوەری پێنجەم :**

# وەڵامی چەند پرسیارێک لە بارەی : نووح و گەلەکەی و، کەشتییەکەی و، تۆفانەکەیەوە :

**یەک** : تەمەنی نووح چەند بووەو؟ چەند هاوسەرو چەند منداڵی هەبوون؟

**دوو** : ئایا بەسەرهاتی تۆفانی نووح لە تەوراتو لە مێژووی کۆندا هاتوە؟

**سێ** : ئایا تۆفان گشتگیر بووە، یان ناوچەیی بووە؟

**چوار** : کەشتییەکەی نووح، چۆن بووە؟

**پێنج** : کەشتییەکەی نووح، لە کوێ لەنگەری گرتۆتەوەو نیشتەجێ بووە؟

## وەڵامی پرسیاری یەکەم:

### تەمەنی نووح چەند بووە، چەند هاوسەرو، چەند منداڵی هەبوون؟!

ئەم پرسیارە لە سێ لقاندا وەڵام دەدەینەوە:

### لقی یەکەم: تەمەنی نووح عليه السلام:

لە قورئاندا تەمەنی نووح دیاریی نەکراوە، کە ئایا هەموو تەمەنەکەی چەند بووە؟ تەنیا ئەوە هاتوە کە نۆسەدو پەنجا (٩٥٠) ساڵ پێش هاتنی تۆفان، لە نێو گەلەکەیدا ماوەتەوە، وەك لە سووڕەتی (العنكبوت) ئایەتی (١٤)دا هاتوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە نووحمان بۆ لای گەلەکەی ڕەوانەکرد، هەزار ساڵ، جگە لە پەنجا ساڵ، لە نێویان مایەوە، دوایی تۆفانو لافاو گرتنی، لە کاتێکدا کە ستەمکار بوون.

ئنجا ئەگەر(٩٥٠) ساڵ بەس وەك پێغەمبەر مابێتەوە، دیارە پێش ئەوەی بووبێ بە پێغەمبەریش، تەمەنێکی هەر بووە، بۆ نموونە: چل (٤٠) ساڵێك هەر هەبووە، بە لای کەمەوە، ئەگەر زیاتریش نەبوو بێ! چونکە ئەو کاتە تەمەنی مرۆڤەکان زیاتر بووە، هەروەها دوای ئەوەش کە تۆفان هاتوەو کەشتییەکەی نیشتۆتەوە، دیسان تەمەنێکی دیکەی گوزەراندوە لە نێو ئەو خەڵکەدا کە لە کەشتییەکەدا ڕزگاریان بووە، کەواتە: هەرچۆن بێ، تەمەنی نووح لە هەزار (١٠٠٠) ساڵ تێپەڕیوە.

بۆیە ئەوەی کە لە تەوراتدا هاتوە، کە دەڵێ تەمەنەکەی هەمووی نۆسەدو پەنجا (٩٥٠) ساڵ بووە، لە ڕاستییدا وا نیە، چونکە (٩٥٠) ساڵ بەس لە نێو گەلەکەیدا، پێش تۆفان، ژیاوە! لە تەوراتدا ئاوا هاتوە: {وَعَاشَ نوح بَعْدَ الطوفَانِ ثَلَاثَ مِئَة وَخَمْسِينَ سَنَة، ثُمَّ مَاتَ وَلَهُ مِنَ العُمُرِ تِسْعُ مِئَة وَخَمْسونَ سَنَة}[1].

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح :٩ ، ص ٢٩.

واتە: نووح لە دوای تۆفان سێ سەدو پەنجا ساڵ ژیاو، کاتێك کە مرد، تەمەنی (٩٥٠) ساڵ بوو.

ئنجا ئەگەر ئەو قسەیەی تەورات ڕاست بێ، کە دەڵێ: پاش تۆفان سێسەدو پەنجا (٣٥٠)ساڵ ژیاوە مانای وایە: تەمەنی نووح لە هەزارو سێسەدو پەنجا (١٣٥٠)ساڵ کەمتر نەبووە.

پێویستە بشزانرێ کە ئەو کاتە تەمەنی مرۆڤان بە گشتی زیاتر بووەو، ژمارەیان کەمتر بووە، یانی: وە نەبێ نووح هەر دراوسێیەکانی بەڕێ کردبن‌و بۆ خۆشی هەر مابێتەوە، خۆی مابێ‌و خەڵکیش هەر مردبن!

زانایان باسی ئەوەیان کردوە کە بە پێی هەندێك زانیاریی دەبێ نووح سەد هەزار (١٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر ژیابێ، هەرچەندە بە پێی قسەی پەیمانی کۆن، ڕەنگە ڕۆژگاری نووح، نەگاتە دە هەزار (١٠٠٠٠) پێش ساڵیش! بەڵام بە پێی ئەوە کە شوێنەوار ناسان دەڵێن، وەك دوایی باسی دەکەین، کە تەماشای شوێنەوارەکانی کەشتییەکەی نووحیان کردوە، تەمەنی کەشتییەکەی نووح، لە سەد هەزار (١٠٠٠٠٠) ساڵ تێدەپەڕێ، ئنجا ئەو کاتە دیارە مرۆڤەکان بەگشتی تەمەنیان زیاتر بووە، بەدەنیان بەهێزتر بووە، کەلەشیان گەورەتر بووەو، لەبەر ئەوەی ژمارەشیان کەمتر بووە لەسەر زەوی، نەخۆشییان کەمتر بووەو خوای کاربەجێ تەمەنی زیاتری پێداون .

**لقی دووەم: هاوسەری نووح ؈:**

بە نسبەت هاوسەرەوە، وا پێدەچێ نووح دوو هاوسەری هەبووبن، یەکیان کافر بووە کە لەگەڵیان سواری کەشتییەکە نەبووە، بە بەڵگەی ئایەتی ژمارە (٤٠)ی سووڕەتی (هود)، کە دەفەرمووێ : ﴿ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ ﴾، هەروەها خێزانەکەت، جگە لەوەی کە بڕیاری لەبارەوە دراوە.

چونکە (أهل) پێش هەموو کەس: هاوسەر دەگرێتەوە، ئنجا مادام خوا ﷻ بە ڕوون‌و ڕاشکاویی فەرموویەتی : ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ

نُوحٍ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٍ ﴿١٠﴾ ﴾التحريم، کە پێشتر باسمان کرد.

ئنجا فەرموشیەتی: ئەوەی پێشتر بڕیاری فەوتاندنی لەسەر دراوە، سواری کەشتییەکەی مەکە، کەواتە: ئافرەتە کافرەکەی سواری کەشتییەکە نەبووە، ڕەنگە هەر خۆشی ئامادە نەبووبێ، وەك چۆن کە نووح بانگی کوڕەکەشی کرد، ئامادە نەبوو.

ئنجا مادام خوا فەرموویەتی: (وَأَهۡلَكَ )، دیارە دەبێ ژنێکی دیکەی دووەمیشی بووبێ، لەگەڵی سوار بووبێ، ئەگەرنا وشەی (وَأَهۡلَكَ )، چەمكو واتایەکەی کێ دەگرێتەوە؟ پێش هەموو کەس هاوسەر دەگرێتەوە.

ئنجا شایانی باسە کە تەوڕات تەنیا باسی یەك هاوسەر دەکات، بۆ نووحو، گوایە لەگەڵیشی سواری کەشتییەکە بووە، وەك لە سەرچاوەی پێشوودا لە تەوڕاتدا دەڵێ: (فدخل نوح إلى الفلك مع زوجته وأبنائه وزوجاتهم لينجو من مياه الطوفان)[1].

واتە: نووح لەگەڵ هاوسەرەکەیو هەر سێ کوڕو بووکەکانی، سواری کەشتییەکە بوون، بۆ ئەوەی لە ئاوی تۆفانەکە دەرباز بن.

سێ کوڕەکەی، یانی: (حام، سام، یافث)و هاوسەرەکانیان.

**لقی سێیەم: منداڵەکانی نووح ﷺ:**

بە نسبەت منداڵەکانیەوە، قورئان دیاریی نەکردوە کە نووح ﷺ چەند منداڵی هەبوون، چەند کوڕو چەند کچی بوو ون؟ بەڵام لە تەوڕاتدا هاتوە کە: نووح ﷺ سێ کوڕی لەگەڵ خۆیدا سوار بوو ونو، دەربازیشیان بووە، کوڕەکانیشی بە ناوی (حام، سام، یافث)، هەڵبەتە تەوڕات باسی کەنعانیشی کردوە، بەڵام نەك ئەوە کە لە تۆفاندا خنکابێ، بەڵکو دەڵێ: کاتی خۆی لەکاتی خەودا، کە نووح ﷺ خەوتوە، لەوکاتەدا پۆشاکەکەی لەسەری لاچووەو، ئەویش سەیری عەوڕەتی بابی کردوە، بۆیە نووح لەعنەتی لێکردوەو سزای داوە.

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح : ٧ ، ص٢٥.

وەك لە (سفر التكوين، الإصحاح : ٩)دا هاتوه، بەلاّم قورئان باسی ناوی ئەو كوڕە فەوتاوەی نووحی نەكردوە، تەنیا فەرموویەتی: كوڕێكی هەبووە، كافر بووە، بەلاّم ناوەكەی لە تەوراتدا هاتوە، كە دەڵێ: ناوی كەنعان بووەو دەشگونجێ وا بووبێ.

ئنجا بە نسبەت ئەو سێ كوڕەی (نووح)ەوە، لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە : {سامُ أَبُو الْعَرَبِ، وَحَامُ أَبُو الْحَبَشِ، وَيَافِثُ أَبُو الرُّومِ} {أخرجه أحمد، برقم: (٢٠١١١)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف، وأخرجه الترمذي، برقم: (٣٩٣١)، وقال: حسن، والطبراني، برقم: (٦٨٧١)، والحاكم برقم: (٤٠٠٦) وقال: صحيح الإسناد، عَنْ سَمُرَةَ} .

واتە: سام دەبێتە باپیرە گەورەی عەرەبانو، حام دەبێتە باپیرە گەورەی حەبەشەییان، (واتە: ڕەش پێستەكان)و، یافیث دەبێتە باپیرە گەورەی ڕۆمەكان.

زانایان هەندێكیان دەڵێن: (یَافِث) باپیرە گەورەی گەلانی ڕۆژهەلاّتی ئاسیایە.

## وەڵامی پرسیاری دووەم

### ئایا بەسەرهاتی تۆفان، لە تەوراتو مێژووی کۆندا هاتوە؟

یەکەم: بە نسبەت تەوراتەوە کە پێی دەگوترێ: پەیمانی کۆن، کە دیارە هەموو کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس)، دەبێتە دوو بەش: (پەیمانی کۆن)و (پەیمانی نوێ)، پەیمانی کۆن تەوراتو کۆمەڵێك کتێبی دیکە دەگرێتە خۆی، پەیمانی نوێش چوار ئینجیلەکانو کۆمەڵێك کتێبی دیکە دەگرێتە خۆی.

ئنجا لە پەیمانی کۆندا لە (سفر التكوين)دا، کە(سفر)یش لە جێی کتێبە، بەسەرهاتی تۆفانی نووح، زۆر بە درێژیی هاتوەو وردەکاریی زۆری تێدایەو، لە جەوهەری قسەکانیدا لەگەڵ قورئاندا گونجاوە[1]، بە وردیی لەویدا زۆر شت باس کراوە، وەك دوایی زیاتریش باسی لێوە دەکەین، کە زۆربەی قسەکانی لەگەڵ دوایین کتێبی خوای پەروەردگاردا، کە قورئانە، گونجاوەو لەگەڵیدا تەبایە.

دووەم: بە نسبەت مێژووی کۆنەوە، دیارە لە مێژووی کۆنیشدا باسو خواسی تۆفان زۆرە:

١) گێڕانەوەی کلدانییەکان :

(نَقَلَ عَنْهُمْ بَرْهوشَعْ وَيُوسفُوس أنَّ زِيزستروس رَأَى فِي الحلم بَعْدَ مَوْتِ وَالِدِهِ (أُوتِيرت) أَنَّ المِيَاه ستطْغَى وتُغْرِقُ جَمْيعَ البَشَرِ، أَمَرَهُ ببنَاء السَّفِينَةِ يَعْتَصِمُ فِيهَا هو وَأَهْلُ بَيْتِهِ وَخاصَّةُ أَصْدِقَائِهِ، فَفَعَلَ).

واتە: (بَرْهوشَعْ وَيُوسفُوس) (دیارە ئەوانە دوو مێژوونووسی کلدانیی بوون)، نەقڵیان کردوە، زیزستروس (کە پادشاو حوکمڕان بووە، لە کلدانییەکان) لە خەوندا بابی کە ناوی (أُوتیرت) بووە، بینیویەتی، پێی گوتوە، کە کاتێك دێ ئاوەکان زۆر دەبن، ئەو کاتە تۆفان هەڵدەستێ‌و هەموو مرۆڤەکان نغرۆ

---

١) بڕوانە: (الكتاب المقدس)، (العهد القديم)، (سفر التكوين)، (قصة نوح)، (الإصحاح: ٦ و ٧ و ٨ و ٩ و ١٠) لە لاپەڕە (٢٢ تا ٣١).

دەکاتو ژێر ئاو دەکەونو دەخنکێن، بۆیە فەرمانی پێکرد: کەشتییەك دروست بکات، خۆیو خێزانەکەیو، هاوەڵە تایبەتییەکانی پەنای پێ بگرن، (بۆ ئەوەی سەلامەت بن)، ئەویش وایکرد.

دیارە من ئەمە هەمووی لە (تفسير القرآن الحكيم)[1]ی (محمد رشيد رضا) نەقڵ دەکەم، دەڵێ: (وَقَدْ عَثَرَ بَعْضُ الإِنْكِلِيزِ عَلَى أَلْوَاحٍ مِنَ الْآجُرِّ، نُقِشَتْ فِيهَا هَذِهِ الرِّوَايَةُ بِالْحُرُوفِ المسْمَارِيَةِ فِي عَصْرِ أَشُورَ بَانِيبَالَ، مِنْ نَحْوِ ٦٦٠ سَنَةً قَبْلَ مِيلَادِ المسِيحِ، وَأَنَّهَا مَنْقُولَةٌ مِنْ كِتَابَةٍ قَدِيمَةٍ مِنَ الْقَرْنِ السَابِعِ عَشَرَ، قَبْلَ المسِيحِ أَوْ قَبْلَهُ).

واتە: هەندێك لە شوێنەوار ناسانی ئینگلیز، هەندێ لەوحیان دۆزیونەوە کە لە خشتی سوورەوەکراو دروست کراون، بە پیتی مسماریی ئەو بەسەرهاتەی تۆفانیان لەسەر نووسراوە کە ئەویش لە سەردەمی ئاشوور بانی پاڵ، (یەکێك بووە لە پادشا گەورەکانی کلدانییەکان)، ئەویش شەش سەد (٦٠٠) ساڵ پێش لەدایك بوونی مەسیح نووسراوەتەوەو، ئەو نووسراوەش نەقڵ کراوە لە نووسینێکی کۆنتر، کە سەدەی حەڤدەی (١٧) پێش زایین، یان پێشتریش، نووسراوە.

٢) گێڕانەوەی یۆنانییەکان:

لە ڕیوایەتێکدا هاتوە: (أَوْرَدَ خَبَرَ الطوفَانِ أَفْلَاطون، وَأَوْرَدَ مَانِيتُونُ خَبَرَ طوفَانٍ حَدَثَ بَعْدَ هَرْمَسَ الأَوَّلِ الَّذِي كَانَ بَعْدَ مِينَاسَ الأَوَّلِ)[2].

واتە: ئەفلاتوون هەواڵی تۆفانی هێناوە، (واتە: گێڕاوەتەوە)و، مانیتوون هەواڵی تۆفانێکی گێڕاوەتەوە کە لە دوای هەرمەسی یەکەم، ئەویش کە لە دوای میناسی یەکەم بووە، (ئەوانە هەموویان کەسایەتیی ناسراوی ئەو سەردەمە بوونو، هەواڵی ئەو تۆفانەیان گێڕاوەتەوە).

---

١) ج ١٢، ص ٨٦ و ٨٧).

٢) سەرچاوەی پێشوو.

### ٣) گێڕانەوەی فارسەکان:

(وَرُوِيَ عَنْ قُدَمَاءِ الْفُرْسِ طوفَانٌ أَغْرَقَ اللهُ بِهِ الأَرْضَ، بِمَا انْتَشَرَ فِيهَا مِنَ الْفَسَادِ وَالشُّرُورِ بِفِعْلِ (أَهْرَيْمَانَ) إِلَهِ الشَّرِّ، وَقَالُوا: إِنَّ هَذَا الطوفَانَ فَارَ أَوَّلاً مِنْ تَنورِ الْعَجوزِ (زُول كوفَهْ) إِذْ كَانَتْ تَخْبِزُ خُبْزَهَا فِيه)(١).

واتە: لە پێشینەکانی فارسیشەوە هەواڵی ئەو تۆفانە کە خوا هەموو زەوی پێ داپۆشیوە، گێڕدراوەتەوە، بە هۆی ئەوەوە کە خراپەو تێکدانی تێداکراوە (مرۆڤەکان لە زەویدا خراپەیان زۆر کردوە) ئەویش بە هۆی ئەهریمەنەوە، کە پەرستراوی خراپەیە.

(بە پێی عەقیدەی کۆنیان، فارسەکان گوتوویانە: دوو پەروەردگارو پەرستراو هەن: یەکیان: یەزدان، ئەوی دیکە ئەهریمەن، کە یەزدان هەر چاکە دەکات، بەڵام ئەهریمەن خراپە دەکات، بەڵام بە بۆچوونی من ئەو ئەهریمەنە هەر ئیبلیسە، بەڵام ئەوان ئیبلیسیان لە قەبارەی خۆی گەورەتر کردوەو بردوویانەتە ئاستی خوا، ئنجا هەرچەندە ئیبلیس بەڵێ هەر خەریکی خراپەیە، بەڵام ئیبلیس زۆر لەوە بچووکترە کە لە ریزی خوای پەروەردگار دابێ، چونکە خوای بێوێنە بۆخۆی ئیبلیسی دروست کردوەو، بۆخۆشی مۆڵەتی داوە بمێنێتەوە، بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان، هەروەك چۆن مەلەك طاووسی ئێزیدییەکانیش هەر ئەو شەیتانو ئیبلیسەیە کە خوا بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان دروستی کردوە، کە ئێزیدییەکانیش قەبارەی زۆر گەورەتریان داوە بە مەلەك طاووسو تەنانەت پەرستشی بۆ ئەنجام دەدەن، بۆ ئەوەی لە شەڕو خراپەی بە دووربن، ئەگەرنا ئەوانیش دەزانن کە هەر خوا ئەوی دروست کردوە، بەڵام لە قەبارەی خۆی گەورەتریان کردوە، هەڵبەتە لە ئەنجامی لادانیدا لە تەعالیمی کتێبە ئاسمانییەکان} دا.

کە لە سەرەتاوە لە تەندووری پیرێژن، پیرێژنێك بە ناوی (زول کوفة)، کە نانی تێدا دروست کردوە، پێشێ لەوێوە ئاوەکە هەڵقوڵیوە

---

١) هەمان سەرچاوە.

وەك لە قورئاندا هاتوە، خوا دەفەرموێ : ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ﴿٤٠﴾ ﴾هـود، وەك نیشانەیەکی بەینی خوای کارزانو نووح، کە نووح ئاگادار بێ، ئەوە تۆفان دەستی پێکرد. وەك پێشتر باسمان کرد.

٤) گێڕانەوەی هیندییەکان:

{وَكَذَا قُدَمَاءُ الْهُنُودِ يُثْبِتُونَ وُقُوعَ الطوفَانِ سَبْعَ مَرَّاتٍ فِي شَكْلٍ خُرَافِيٍّ، آخِرُهَا أَنَّ مَلِكَهُمْ نَجَا هو وَامْرَأَتُهُ فِي سَفِينَةٍ عَظِيمَةٍ، أَمَرَهُ بِصُنْعِهَا إِلَهُهُ فِشْنُو، وَشَدَّهَا بِالدُّسُرِ حَتَّى استوَتْ عَلَى جَبَلِ جِيمافَاتَ (حِمَلايَا)}[1].

واتە: پێشینەکانی هیندییەکانیش گوتوویانە: تۆفان حەوت جاران هاتوە، بەڵام ئەوان بە شێوەیەکی ئەفسانەیی دەیهێنن، دواجاری ئەو تۆفانە ئەوە بووە کە پادشاکە خۆیو خێزانەکەی، لە کەشتییەکی مەزندا دەربازیان بووە، کە ئەو کاتە فشنەر (کە پەرستراوێکیان بووە) فەرمانی پێکردوەو، تەختەکانی بە پەتو بزماران قایم کردوون.

{وەك لە قورئانیشدا دەفەرموێ : ﴿ وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ ﴿١٣﴾ ﴾ القمر}.

دوایی لەسەر چیای حیمەلایا جێگیر بوو.

١) تفسير القرآن الحكيم ج١٢، ص٨٦ . ٨٧.

## وەڵامی پرسیاری سـێیـەم:

## ئـایا تۆفـانەکـە، گـشـتـگـیـر بـووە؟ یـان نـاوچـەیی بـووە؟

لەوبـارەوە توێـژەرەوان‌و مـانـا لـێکدەرەوانی ئـایـەتـە موبـارەکەکـانی قورئـان، ڕاجیاییـەکی زۆر لـە نێوانیاندا هەیـە:

هـەندێکیان گـوتـوویـانە: گـشـتـگـیـر بـووە.

هـەندێکیان گـوتـوویـانە: نـاوچـەیی بـووە.

هـەم تەفسیـرە کۆنەکان، هـەم تەفسیـرە نـوێیـەکانیش لەوبـارەوە، ڕاجیـاییـان هەبووەو هـەیـە.

بەڵام بە بۆچوونـی بەنـدە، بە پێی ئـەوە کـە سـەرنجـی ئـایـەتەکـانی قورئـانـم داوە، کـە زۆر لـێیـان وردبوومەوەو، بە پێی سەرچاوەکانی دیکەش کە تێیـاندا بـاسی ئەو تۆفـانە کـراوە، هـەروەهـا لـە پەیمانی کۆنیشـدا لـە تەوراتدا[١]، زۆر بە ڕوونیـی بـاسی ئـەوە کـراوە، کـە ئـەو تۆفـانە تۆفـانێکی گـشـتـگـیـرو جیهانیی بـووە، تەنیـا نـاوچـەیی نەبـووە.

بۆ وێنـە: بـا لـێرەدا هـەندێ قسەی تـەورات نـەقڵ بکـەم:

{وَاســتمرَّ هَــذَا الطوفَــانُ عَلَـى الأَرْضِ لَيْــلاً وَنَهَــاراً مــدّة أَرْبَـعِين يَوْمــاً... وَتَعاظمت المِيَاه جِدّاً فَوْقَ الأَرْضِ حَتَّى أُغْـرِقَـت جَمِيع الجبال العَالِيـة الّتي تَحْتَ السَّماء كُلِّها، وَبَلَغ اتفاعـها خَمْسَ عَشَـرَةَ ذِرَاعـاً (نحـو سَبْـعَة أَمْتـار) عَنْ أَعْلَـى الجِبال، فَمـاتَ كُلّ كـائِن حيّ يتحـرّك عَلَى الأَرْض، مِنْ طيور وبَهَائِم ووحـوش وَزواحف وَكُـل بَشَرٍ...)[٢].

واتـە: ئـەو تۆفانـە لەسـەر زەوی بـۆ مـاوەی چـل شـەوو ڕۆژ، بـەردەوام بـووەو، ئـاوەکـان زۆر بـەرز بـوون لەسـەر ڕووی زەوی، هەتـا هـەموو چیـا بەرزەکانیشـیان نقووم کـردو، پـازدە گـەز (کە دەکاتە نیزیکەی حەوت مەتر) ئـاو بەسـەر بەرزتـرین

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح : ٧، ص ٢٥و ٢٦.

٢) سەرچـاوەی پێشوو.

چیاش کەوت، بۆیە هەرچی زیندەوەری کە لەسەر زەوی دەجووڵێن، لە باڵندانو زیندەوەرانو دڕندانو لە خشۆکانو، لە مرۆڤان، هەموویان فەوتان لەو تۆفانەدا.

دیارە جگە لەوانەی خوا قوتاری کردن، کە لە تەوراتدا بە تەفصیل باسی ئەو ئاژەڵو دڕندەو پەلەوەرانە دەکات، کە نووح لە کەشتییەکەیدا سواری کردوون، لە هەر کامێکیان جووتێك، بۆ ئەوەی نەسلو وەچەیان بەردەوام بێتو تۆیان نەبڕێتەوە.

ئنجا من ڕام وایە ـ وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا ـ تەنیا ئەوەندە خەڵکەی نووح بۆ لایان ڕەوانە کراوە، هەر ئەوەندە مرۆڤە لەسەر زەوی هەبوونو، لە شوێنێکی دیاریکراویش هەبوون، چونکە ناگونجێ لە هەموو سەر زەوی مرۆڤ هەبووبن، نووحیش بەسەر هەموو زەویدا گەڕابێ، قەت شتی وا نابێو ناگونجێ! هەروەك ناشگونجێ بەبێ ئاگادارکرانەوە، خوای کاربزان فەوتاندبنی.

بۆیە پێم وایە مرۆڤەکان هەموویان لە شوێنێکی دیاریکراو بوون، ئنجا هەر چەندە ئەوەش غەیبە، بەڵام وای مەزندە دەکەم کە لەو ناوچەیەی پێی دەگوترێ: میزۆپۆتامیا، نێوان دوو ڕووبارەکان، (دیجلەو فوڕات)، ئەوە یەکەمین لانکەی مرۆڤایەتی بووە، بۆچی؟

چونکە دواییش کەشتییەکەی نووح هەر لەسەر چیای جوودیی نیشتەجێ بووە کە ئەویش هەر دەکەوێتە ئەو ناوچەیە، واپێدەچێ هەر لەو شوێنە خەڵك هەبووبێو، دواییش تۆفانەکە هەموو دنیای گرتۆتەوە، دوایی خەڵکەکە هەر لە شوێنەکەی خۆیان، ئەو شوێنەی کە پێی ئاشنان، بە شیوو دۆڵەکانی، بە چیایەکانیو قەد پاڵەکانی، بە ڕووبارەکانی، هەر لەوێ دووبارە دەستیان بە ژیانێکی تازە کردۆتەوە.

چونکە ئەگەر لەسەر هەموو گۆی زەوی مرۆڤ بووبێ، ئەوە زۆر دوورە، چونکە نووح سەلامی خوای لەسەر بێ، لەگەڵ ئادەم {وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە} دە (١٠) سەدە، دە جیلیان لە نێوان دا بوون، ئنجا هەرچەندە مەرج نیە ئەو وەچانە تەنیا (١٠٠) یان (٧٠) ساڵیان تەمەن بووبێ،

چونکە ئەگەر نووح ﷺ (٩٥٠) ساڵ پێغەمبەرایەتیی کردبێ، پێش تۆفان، پێشتریش تەمەنێکی هەبووەو، دواتریش تەمەنێکی گوزەراندوە، کەواتە: وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ العنكبوت، لە نێو ئەو کۆمەڵگا خەڵکەدا ئەوەندە ماوەتەوە، ئنجا ئەگەر خەڵکەکە تەمەنیان لەو کەمتر بووبێ، ئەوە دەبێ چەندان جیلی بەڕێ کردبن، ئەو کاتەش نەدەگونجا خوای شارەزا بفەرموێ: ﴿ فَلَبِثَ فِيهِمْ ﴾، واتە: لە نێویاندا مایەوە، چونکە ئەو کاتە لە نێو چەند جیلێکدا (٩٥٠) ساڵ دەمایەوە، نەك لە نێو خەڵکێکی دیارییکراودا!

بەڵام وێڕای ئەوەش دە (١٠) وەچە (جیل) زۆر لەوە کەمترن، کە مرۆڤەکان لەو ژیانە سادەیەی ئەوساکەدا، فریای ئەوە کەوتبن بە هەموو زەویدا بڵاوببنەوەو بگرە تەنانەت بە چەند ناوچەیەکی دوورە دەستیش دا!

دیارە ناشگونجێ خوای میهرەبان خەڵکێك بفەوتێنێ، پێش ئەوەی پێغەمبەریان بۆ بنێرێ‌و ئاگاداریان بکاتەوە، چونکە بە دەقی ئایەت دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾ الإسراء، واتە: ناگونجێ مرۆڤان سزا بدەین، هەتا پێغەمبەر نەنێرین، کە ئەمە هەم سزادانی دنیایی دەگرێتەوە، هەم سزادانی دواڕۆژیش دەگرێتەوە.

ئنجا وەك گوتمان: ناشگونجێ کە نووح سەلامی خوای لێبێ، بەو هەموو خەڵکە ڕاگەیشتبێ، بۆ هیند چوو بێ، بۆ ئەفریقیا چوو بێ، بۆ ئەورووپا چوو بێ، بە شوێنەکانی ئاسیادا گەڕابێ، چوو بێ بۆ ئەمریکا، ئەوە هەرگیز مەعقووڵ نیەو ناشگونجێ، کەواتە: دیارە هەر ئەوەندە کەسە هەبوون، لە شوێنێکی دیارییکراودا، کە تووشی تۆفان هاتوون‌و، تەنیا ئەوانەی لەگەڵ نووح سواری کەشتییەکە بوون، ڕزگاریان بووەو ئەوانی دیکە هەموویان فەوتاون.

## وەڵامی پرسیاری چوارەم

### ئایا کەشتییەکەی نووح چۆن بووە؟

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (القمر) ئایەتی ژمارە (١٣)دا، تەنیا ئەوەندەمان بۆ دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: هەڵمان گرت (نووحمان هەڵگرت) لەسەر شتێك كە خاوەنی تەختەو بزماران بوو {یان: پەتان (حبال) بوو}، یانی: کەشتییەکەی نووح سەلامی خوای لەسەر بێ، خوای زاناو توانا پێکهاتە سەرەکییەکەی لە دوو شتاندا پوختە دەکاتەوە:

یەکەمیان : تەختان (ألواح)، كە گومانی تێدانیە تەختەداری گەورە گەورە بوون.

دووەمیان : پاشان (دُسُر)، کە کۆی (دِسار)ە، (الدِّسارُ: خیوطٌ تُشَدُّ بهَا أَلْوَاحُ السَّفِينَةِ، وَقِيلَ : هِيَ المسامِير)، (دسار) بریتیە لە چەند پەتێك كە تەختەكانی کەشتیی پێ دەبەسترێنەوەو، گوتراوە : (دُسُرْ) کە کۆی (دِسار)ە، یانی : (مسامیر) کە کۆی (مِسْمار)ە، یانی: بزماری گەورە گەورە، كە ئەو تەختانەیان پێ پێکەوە بەستراون.

هەروەها لە سوورەتی (الشعراء)یش لە ئایەتی (١١٩)دا، هەر ئەوەندە دەفەرموێ: ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾ ﴾، واتە: خۆیو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون ڕزگارمان کردن، لە کەشتییەکی پڕدا.

کە دیارە کەشتییەکە پڕپڕ کراوە لە چەندان جۆر لە دروستکراوەکانی خوای زاناو توانا، بەڵام تەوڕات وردەکاریی زۆر لەوبارەوە باس دەکات، کە من هەمووی ناهێنم، چونکە ئەو باسی ئەوە دەکات، کە کەشتییەکە سێ قات بووەو، هەر قاتەی چەندان ژوور بووەو ... هتد، بەڵام ئەوەی کە خاوەن کتێبەکان بۆمان باس دەکەن، ناتوانین هەموویان لێ وەربگرینو، ناشتوانین هەمووی ڕەت بکەینەوە، مەگەر ئەوەی کە لەگەڵ عەقڵدا، یان لەگەڵ قورئاندا، یان لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ، نەگونجێ، بەڵێ ئەو وردەکارییە ناتوانین بڵێین: هەمووی وایە، وە

ناشتوانین بڵێین: هەمووی وانیە، بۆ وێنە: لەبارەی ئەو کەشتییەوە، کە چۆن دروست کراوەو چۆن بووە؟ تەورات دەڵێ:

{ليكُنْ طولُهُ ثَلاثَ مِئَةِ ذِرَاع (نَحو مِئَةٍ وَخَمْسَة وَثَلاَثِين مِتْراً) وعُرْضُهُ خَمْسِين ذِرَاعاً) (نَحو اثْنَيْن وَعشْرين مَتْراً وَنِصْف المتْر)، وارتفَاعُه ثَلاَثِين ذِرَاعاً (نحو ثَلاَثَة عَشَرَ مِتْراً وَنِصْف المتر... )}[1].

واتە: (خوا ﷻ بە نووحی فەرموو) با درێژییەکەی سێ سەد (٣٠٠) گەز بێ، کە دەکاتە سەدو سێو پێنج (١٣٥) مەتر، {هەندێکیشیان گوتوویانە: دەکاتە سەدو پەنجا (١٥٠) مەتر} و، پانییەکەشی پەنجا (٥٠) گەز بێ، کە دەکاتە بیستو دوو (٢٢) مەترو نیوو، بەرزییەکەشی، سی (٣٠) گەز بێ، کە دەکاتە سێزدە (١٣،٥) مەترو نیو.

تەورات ئەو وردەکارییانە باس دەکات، بەڵام بۆچی لە قورئاندا ئەو وردەکارییانە، باس نەکراون؟ چونکە هیچ حیکمەتێکی تێدانیەو، ئەوەی کە لە قورئاندا خوا باسی دەکات، ئەوەیە کە ئەسڵی بەسەرهاتەکەیە، پاشان ئەو دەرسو پەندانەی کە لێی وەردەگیرێ.

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح ٦، ص٢٤.

## وەڵامی پرسیاری پێنجەم

## کەشتییەکەی نووح، لە کوێ لەنگەری گرتوە؟

خوای زاناو شارەزا زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی لە سووڕەتی (هود)دا، فەرموویەتی: ﴿وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ ﴿٤٤﴾﴾، لەسەر جوودیی لەنگەری گرت.

ئنجا ئایا جوودیی چییەو لە کوێیە؟

هەڵبەتە چیای جوودیی مەشهوورو ناودارە، نەك هەر لە زمانی عەرەبییدا، بەڵکو لە هەموو زمانەکانی دیکەشدا.

دەڵێ: {جَبَل الجودِي: يَقَع إلى الجُنوب مِن جبال (أرارات) المعروف شرق تركيا، فِي المكان المسَمَّى بجزيرة إبْنُ عُمَر والذي وجدت عَلَيْهِ السَّفِينَة فِي زَمانِنا وبالتحديد)[1]، زۆربەی تەفسیرە کۆنو نوێیەکانی سەردەم ئەمەیان هێناوە، چونکە چیای جوودیی مەشهوور بووە.

واتە: چیای جوودیی دەکەوێتە خوارووی زنجیرە چیای ئەراڕات، کە زنجیرە چیایەکی ناسراوە لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا، لەو شوێنەی کە پێی دەگوترێ: جەزیرەی ئیبنو عومەر، {کاتی خۆی بە کوردستانی باکوور، کە ئێستا خراوەتە نێو خاکی تورکیاوە، گوتراوە: (جزيرة ابن عمر)، دیارە لە دوای سەردەمی هاوەڵانەوە ئەو ناوەی لێنراوە}، کە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا ئەو کەشتییە ڕێك لەسەر وێ دۆزراوەتەوە، واتە: کە قورئان دەفەرموێ: لەوێ لەنگەری گرتوە، شوێنەوار ناسانانی ئێستا، ئەو کەشتییەیان لەوێ دۆزیوەتەوە.

---

١) سيرة النبين والمرسلين، محمد عيد عبد الله يعقوب الحسيني، ج ١، ص ١١٢.

## قۆناغەکانی دۆزرانەوەی کەشتییەکەی نووح[1] ﷺ

**قۆناغی یەکەم:** لە ساڵی (١٩٤٨)دا شوانێکی تورك، بەڵام ئەو شوانە ڕەنگە کورد بووبێ، چونکە ئەو شوێنە تەنیا کوردی لێن، (کتێبەکە دەڵێ: تورك، واتە: خەڵکی تورکیا، دەوڵەتی تورکیا)، دوای بارانێکی زۆر، وە سێ بوومەلەرزە کە بە دوای یەکداهاتوون، تەماشای کردوە، شتێك دیارە وەك ئەو چیایە ناچێت، ئنجا دواتر خەڵکی لێ ئاگادار کردۆتەوە، کەسە بەرپرسەکانی لێ ئاگادار کردۆتەوە کە من شوانم مەڕ لێرە دەلەوەڕێنم، وەرن ئێرە شوێنەواری کۆنی لێیە.

**قۆناغی دووەم:** ئنجا لە ساڵی (١٩٥٩)دا، یەکێك لە فڕۆکەوانە سەربازییە ئەمریکییەکان کە لە سەفەرێکی پشکنینی سەربازیی دۆزینەوەدا بووە، چەند وێنەیەکی چیای ئەڕارات دەگرێ، لە بەرزیی (٦٣٥٠) پێ وە، کە زۆر بە جوانیی شێوەی کەشتییەکە دەردەخات، بە درێژیی (٣٠٠) گەزو، بە پانیی (٥٠) گەزو، بە بەرزیی (٣٠) گەز، وەك ئەوەی کە لە تەوراتدا هاتوە.

**قۆناغی سێیەم:** لە ساڵی (١٩٧٧)دا زانایەکی ئەمریکیی شوێنەوارناس، بە دوای سۆراغی کەشتییەکەدا دەگەڕێ، دەچێ بۆ دێیەك کە (١٥) میل دوورە لە شوێنی کەشتییەکەوە، لەوێ گاشە بەردی زۆر گەورەو پارچە شاخ دەبینێ کە کتێبی ناوبراو (سيرة النَّبيِّين والمرسلين)، وێنەکانی هەموو هێناون، ئەو گاشە بەردانە کون کراون، کە هەر کامێکیان لەوانەیە چەند تەنێك قورس بێ‌و، کونی گەورە گەورەیان تێکراون، کە لە ڕۆژگاری کۆندا ئەو گاشە بەردانە بەکارهێنراون، بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگیی کەشتیی، یاخود لە کاتی وەستاندنی کەشتییەکاندا، حەبلەکانیان لەو کونانە خستوون، بۆ ئەوەی کەشتییەکە جێگیر بێ‌و نەڕوات‌و، ژمارەی ئەو گاشە بەردە گەورانە، سێزدە (١٣) دانەیە.

---

١) بڕوانە: (سيرة النَّبيِّين والمرسلين)، ج١ص١١٢و١١٧-١٣٧، کە زۆربەی ئەو زانیارییانەم لەوێ وەرگرتوون، وێڕای چەند تەفسیرێك. بەڵام من کورت‌و پوختم کردوونەوە.

**قۆناغی چوارەم** : لە ساڵی (١٩٧٨)دا لە ناوچەی خوارووی زنجیرە چیای ئەڕارات، بوومە لەرزەیەکی سووك ڕوودەدات، دەبێتە هۆی ئەوەی کەشتییەکە بە درێژایی (٣٠) پێ دەربکەوێ، کە (٥١٥) پێ درێژەو، پانییەکەی (١٣٨) پێیەو، بەرزییەکەشی (١٤) مەترە، شەش (٦) مەتری لە سەرووی زەوی یەوەو، هەشت (٨) مەتریشی لە ژێر زەوی دایە، یانی: بە هەمان ئەو قیاسانەی کە لە پەیمانی کۆندا هاتوون.

**قۆناغی پێنجەم** : دوایی دووبارە پشکنینێکی پێشکەوتووتر و پەرەسەندووتر لە بارەی کەشتیی (نووح)ەوە، بەردەوام دەبێ‌و، پارچەی لێ وەردەگرن‌و لە تاقیگەکاندا بۆیان دەردەکەوێ، کە ئەو کەشتییە دەگەڕێتەوە بۆ سەد هەزار (١٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، چونکە ئێستا زانایانی زەوی ناسیی (جیۆلۆجی)، تاقیگەو ئامێری وایان هەیە، کە ئەگەر بۆ نموونە: بیانەوێ بەردێك فەحص بکەن، تاکو بزانن ئەو بەردە تەمەنی چەندە؟ بەهۆی پشکنینەوە بۆیان دەردەکەوێ، ئنجا لەو ڕێگایەوە بۆیان دەرکەوتوە، کە تەمەنی ئەو پارچە کەشتییە سەد هەزار (١٠٠٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش بووە.

**قۆناغی شەشەم**: لە ساڵی (١٩٨٤)دا، کۆمەڵێك لە زانایان هەڵدەستن بە پشکنینێکی جیۆلۆجیی گشتگیر، بۆ ئەو شوێنەی کە کەشتییەکەی لێیەو دەوروبەری‌و، لە ساڵی (١٩٨٦)دا هەڵدەستن بە پشکنینێکی ڕاداریی‌و، وێنە گرتنێکی بەش بەش‌و، سەرەنجام بۆیان دەردەکەوێت کە ئەو کەشتییە سێ چینە، قاتی سەرەوەی بۆ باڵندەکان بووەو، قاتی نێوەڕاستیشی بۆ مرۆڤەکان بووەو، قاتی خوارەوەشی بۆ ئاژەڵ‌و دڕندەکان بووەو، هەر قاتێك چەندان ژووری تێدان‌و، هەر ژوورێك چەندان قاڵدرمەی تێدان‌و، پانتایی هەر ژوورێك (٦) مەترو نیو دووجایەو، لە قاتی نێوەڕاستیدا، شوێنێك هەیە بۆ (قیادة)، واتە: ئەو کەسەی کە کەشتییەکەی لێخوڕیوە.

هەموو ئەم زانیارییانە، وەك گوتم: لەو سەرچاوەیەوە هێناومن کە باسم کرد، کە بێگومان ئەویش لە کۆمەڵێ سەرچاوەی دی هێناونی‌و، هەموو وێنەکانیشی لەگەڵ هێناون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئـەم دەرسـەمـان لـە یـازدە (١١) ئـایـەت پێکدێ، کـە بریتیـن لـە ئـایـەتـەکـانی : (٥٠ ـ ٦٠)، ئـەم (١١) ئـایـەتە تەرخـان کـراون، بـۆ گـێڕانەوەی بەسـەرهـاتی هـوود ﷺ، و گەلـەکـەی (عـاد)، هەڵبەتە کـە سـەرنجم داوەتـە ئـایـەتەکـان، هـەر چـەند ئـایـەتێکـم پێکەوە پەیوەست کردوون‌و، دابەشـم کـردوون بۆ سـەر چـوار بڕگـە:

بڕگـەی یـەکـەم : بـاسی نـاردنـی هـوود ﷺ دەکـات بۆ لای گـەلـەکـەی (عـاد)، بۆ ئـەوەی ئـامـۆژگـاریـیـان بکـات کـە خـوا بپـەرسـتن‌و هـاوەڵ بـۆ خـوا دانـەنێـن‌و، پێیـان ڕابگـەیـەنـێ: من هیـچ پـلـەو پـایـەیـەکـتـان لـێ داوا نـاکـەم‌و، داوایـان لـێبکـات کـە داوای لـێبوردن لـە خوا بکـەن‌و، بگـەڕێـنـەوە بـۆ لای خـوا، ئەگـەر وا بکـەن ، خـوا خـێـرو بـێـرو هـێـزو پـێـزیـان بۆ زیاد دەکات.

بڕگـەی دووەم : بـاسی ئەوەیـە کـە گـەلی عـاد بـە هـوود ﷺ بـێبـڕوا دەبـن‌و، ئـامـادە نـابن واز لـە پـەرسـتـراوەکـانیان بێـنـن، دەشـڵێن: پێمان وایـە کـە پـەرسـتـراوەکـانـمـان دەستیان لـە تۆ وەشـانـدوەو حـاڵی تـۆیـان تـێـکـداوە!

بڕگـەی سـێـیـەم : هـوود ﷺ حـاشـایـان لـێ دەکـات‌و، بـێـمـنـەتـیـی خـۆیـشی بـەرانـبـەریـان ڕادەگـەیـەنـێ‌و دەڵـێ: من لـێـتـان بێـمـنـەت‌و بـێـبـاکـم‌و، پشـت بەسـتنی خـۆی بـە خـوا، پێیـان ڕادەگـەیـەنێ‌و، پێیـان دەڵێ: ئەوە من پەیـامی خـوام پـێ ڕاگـەیـانـدن، ئەگـەر ئێـوە نەگـەڕێـنـەوە بـۆ لای خـوا، بێگومان خـوا ﷻ ئێـوە لادەبـات‌و، خەڵـکـیـکی دیـکـە دێـنـێـتـە شـوێـنی ئـێـوە.

بڕگەی چوارەم: ئیدی گەلی عاد هەر لەسەر كەللەڕەقیی خۆیان بەردەوام دەبن، تا ئەو كاتەی خوا فەرمان دەنێرێ، بە لەبەینبردنی گەلی عاد، بە سزایەكی قورس و بێ ڕەزا، كە بریتیە لە بایەكی بەهێزی تێكشكێنەرو، لە نێویان دەبات.

هوودو ئەوانەش كە لەگەڵیدا بوون، بە ڕەحمی خوا دەربازیان دەبێ و، ئەوانەی بێبڕوان، لە دنیاو دواڕۆژدا نەفرینی خوایان دێتە سەروو، بنبڕ دەبن و شوێنەواریان نامێنێ.

﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ
إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا
عَلَى ٱلَّذِى فَطَرَنِىٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾ وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ
يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟
مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ يَٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن
قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ
قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓا۟ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى
جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ
ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّآ
أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا
وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا۟ رُسُلَهُۥ
وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ
إِنَّ عَادًا كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾ ﴾.

# مانـای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{ئنجا هوودی برایانمان بۆ لای (گەلی) عاد نـارد، گـوتی: ئەی گەلەکـەم! خـوا بپەرسـتن بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکتـان نیـە (شایسـتەی پەرسـتـران بـێ) ئێـوە (بە پەرستنی پەرسـتـراوەکانتـان) بەس درۆ هەڵدەبەسـتن ﴿٥٠﴾ ئـەی گەلەکـەم! مـن هیچ کرێـتـان لە بەرانبـەریدا لـێ داوا نـاکەم، پاداشـتم بـەس لەسـەر ئەو کەسـەیـە کـە هێناومیـە دی، ئـایـا نـافـامـن! ﴿٥١﴾ ئـەی گەلەکـەم! داوای لێبـوردن لـە پەروەردگارتـان بکەن، دوایی بگەڕێنەوە بۆ لای، ئـاوی بـە خـوڕزەمتـان لـە سـەرێوە بەسـەردا دەڕێژێ‌و، هێـزی دیکـە دەخـاتە گـەڵ هێـزو توانـاتـان‌و، تـاوانبـارانە پشـت هەڵمەکـەن، ﴿٥٢﴾ (گەلەکـەی) گوتیـان: ئـەی هـوود! بەڵگەیەکـی ڕوونـت بـۆ نەهێنـاوین‌و، ئێمەش لەبەر قسەی تۆ دەسـتبەرداری پەرسـتـراوەکانمان نـابین‌و، بۆ تۆ نـابینـە بـڕوادار ﴿٥٣﴾ ئێمە تەنیا دەڵێین: هەندێك لە پەرسـتـراوەکانمان دەستی خراپیـان لـێ وەشـاندووی! (هوود) گوتی: من خوا بە شایەد دەگرم‌و، ئێوەش شایەدیی بدەن، کە: من حـاشـا لەوانە دەکەم کە دەیانکەنە هاوبەش لە جیـاتی وی (خـوا) ﴿٥٤﴾ دەجا تێکـڕاتـان پیلانم لە دژ بگێڕن، ئنجا چاوەڕێشم مـەبن (مۆڵـەتم مـەدەن) ﴿٥٥﴾ بە دڵنیـایی من پشتم بە خـوا، پەروەردگارم‌و پەوەردگاریشتـان بەسـتـوە، هیچ پێـڕۆ (ژیـاندار)ێك نیـە، مەگـەر (خـوا) بگری پێشە سـەریـەتی، بێگومان پەروەردگـارم (لـە مـامەڵـە لەگەڵ دروستکراوەکانیدا) لەسـەر ڕێـیـەکی ڕاستـە ﴿٥٦﴾ ئنجا ئەگـەر پشـت هەڵبکەن، بە دڵنیایی ئەو (پەیـام)ەی، پێی بۆ لاتـان ڕەوانە کرابووم، پێم ڕاگەیـاندن‌و، پەروەردگـارم کۆمەڵێکی دیکەی جگـە لـە ئێوە، دێنێتـە شوێنتـان‌و، (ئەگـەر هـەر نەگەڕێنەوە)، هیچ زیـانیشی لێنـادەن، مسۆگەر پەروەردگارم پارێـزەرە بەسـەر هەموو شتێکەوە، ﴿٥٧﴾ ئنجا کاتێـك فەرمـانمـان هات (بە فەوتـانـدنـی گەلـی عـاد) هـوودو

ئەوانەی لەگەڵی بڕوایان هێنابوو بە بەزەییەك لەلایەن خۆمانەوە ڕزگارمان کردن‌و، لە ئازارێکی سەخت‌و بێ ڕەزا قوتارمان کردن ﴿٥٨﴾ ئەوەش (گەلی) عادە، نکووڵییان لە نیشانەکانی پەروەردگاریان کردو، سەرپێچییان لە پێغەمبەرەکانی کردو، بە دوای هەر زۆردارێکی خوێنڕێژی خۆ پەسند کەوتن ﴿٥٩﴾ ئنجا (لە سزای ئەوەدا) لەم دنیایەداو لە قیامەتیشدا، نەفرینیان شوێن خرا، ئەها! (ئاگاداربن) عاد بەرانبەر پەروەردگاریان سپڵە بوون، ئەها! عادی گەلی هوود هەر دووربن (لە بەزەیی خوا) ﴿٦٠﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( فَطَرَنِيَ ) : (أَصْلُ الفَطْرِ: الشَقُّ طولاً) وشەی (فطر) لە بنچینەدا بە مانای شتێکە کە بە باری درێژییدا لەتی بکەی، دەگوترێ: (فَطَرَ اللهُ الخَلْقَ: أَوْجَدَهُ وَأَبْدَعَهُ)، واتە: وەدیهێناو لە نەبوون هێنایە دی.

( مِّدْرَارًا ) : (أَصْلُهُ مِنَ الدَّرِّ وَالدِّرَّةِ، أَي اللَّبَنُ، وَيُستعارُ لِلمطَرِ) وشەی (مِدْرَار) لە (دَرّ) و لە (دِرَّة)ەوە هاتووە، کە بە مانای شیرە، شیرێك کە لە گوانی ئاژەڵ دێتە خوار، (ئنجا حوشترە، مانگایە، مەڕە، بزنە)و، دەخوازرێتەوە بۆ بارانو، (مِدْرَار)، واتە: زۆر هەڵڕێژەر، بۆیە من گوتوومە: ئاوێکی بە خوڕزەم، یانی: (مِدْرَار) صیغەی موبالەغەی (دَرّ) واتە: زۆر هەڵڕژاو.

( اَعْتَرَىٰكَ ) : دەگوترێ: (عَرَاهُ كَذَا وَاعْتَرَاهُ: غَشيه، وَالعَرَا: الناحِيةُ وَعَرَاهُ وَاعْتَرَاهُ: قَصَدَ ناحِيَتَهُ) وشەی (عَرَا) بە بێ هەمزە، واتە: تەنیشت، ئنجا (عَرَاهُ وَاعْتَرَاهُ) واتە: هاتە سەری، دایپۆشی، بەسەری هات، کە دەگوترێ: (اعْتَرَاهُ) یانی: ڕووی کردە لایەکی، ڕووی کردە تەنیشتێکی، بۆ ئەوەی کە زیانی لێبدات.

( فَكِيدُونِي) : واتە: پیلانم لە دژ بگێڕن، (الكيد: ضَرْبٌ مِنَ الإِحْتِيالِ)، (كيد) جۆرێکە لە نەخشە دانان، جۆرێکە لە فێڵ، وەك ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بێ، بە گەلەکەی خۆی دەڵێ: ﴿ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم ... ﴿٥٧﴾ ﴾الأنبياء، یانی: پیلانێك، نەخشەیەك دادەڕێژم بۆ شکاندنی بتەکانتان، واتە: (لأريدنَّ بها سوءاً) واتە: نیازێکی خراپم بەرامبەریان هەیە، کە تێکیان بشکێنم.

( تُنظِرُونِ ) (أَنْظَرتُهُ: أَخَّرتُهُ وَأَمهَلتُهُ)، (وَلاَ تُنْظِرُون)، یانی: هیچ دوام مەخەن، پیلانم لە دژ بگێڕنو هیچ دوام مەخەن، هیچ مۆڵەتم مەدەن، چاوەڕێم مەکەن، ئەوە ئەوپەڕی بێمنەتییە.

( ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآ )، (آخِذٌ)، واتە: بگر (أَخَذَ)، یانی: گرتوویەتی، (ناصِیة) کۆیەکەی (نواصِي)یە، تووکی پێشە سەر پێی دەگوترێ: (ناصِیة)، کە دەفەرموێ : ﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٦﴾، هیچ ژیانداریێك، زیندەوەرێك نییە، مەگەر پەروەردگارم پێشە سەرەکەی گرتوە، بۆیەش باسی پێشە سەر دەکات، چونکە ئەگەر کەسێك پێشە سەری بگیرێ، مانای وایە مەرزەم کراوەو، خراوەتە ژێر کۆنترۆڵەوە، واتە: پەروەردگاری من، هەموو دروستکراوەکان لە ژێر کۆنترۆڵی خۆی دان.

( جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ ): (الجُحود: الإنْكارُ مَعَ العِلم)، (جحد) بریتییە لە نکوولیی کردن لە شتێك، دوای ئەوەی کە دەشزانی ئەو شتە وایە، بەڵام دانی پێدا نەهێنی.

( غَلِيظٖ ) (الغِلْظَةُ: ضِدُّ الرقَّةِ، غِلْظَة وَغُلْظَة أي : خشونَة)، (غِلْظَة) پێچەوانەی نەرمو ناسکییە، ئنجا (غِلْظَة) و (غُلْظَة) هەردووکیان یانی: زبرو، پتەوو، بێرەزا، لە زمانی کوردییدا، ئەگەر شتێك بیانەوێ بڵێن: زۆر قایمە، زۆر گەورەیە، یان زۆر بێ ئامانە، دەڵێن: زۆر بێرەزایە، ئاوێکی بێرەزا هات، لافاوێکی بێرەزا هات، مارێکی بێرەزا، واتە: چارەسەری ناکرێو بەرهەڵستیی بە زەحمەتە.

( جَبَّارٍ ) : (أَصْلُ الجَبْرِ: إِصلاحُ الشيء بِضَربٍ مِنَ القَهْرِ، الجبَّارُ: القاهِرُ الَّذِي يَقْتُلُ عَلَى الغَضَبِ، وَالجبَّارُ: القاهِرُ الَّذِي يُجبِرُ الناس عَلَى اتِّباعِهِ بالقَهْرِ وَالإِذْلالِ)، ئەسڵی وشەی (جَبْر) بریتییە چاك کردنی شتێك بە زۆرو، (جبَّار)

ئەو حوكمڕانەیە كە لە هەر كەسێك تووڕە بوو، بیكوژێ، هەروەها (جبّار) ئەو كەسەیە كە تۆبزیی لە خەڵك دەكات، خەڵك ناچار دەكات شوێنی بكەون، بەڵام بە زەبری گرتنیانو خستنە ژێر ڕكێفی خۆی، نەك لەو ڕووەوە كە وابكات قەناعەتیان بێتو ڕێزی لێبگرنو خۆشیان بوێ، بەڵكو لەبەر لێترسان، بە قسەی بكەن.

( عَنِيدٍ ) : (العَنِيد: المعْجَبُ بما عِنْدَه، وَالمعانِدُ المباهِي بما عِنْدَهُ، وَجمعُ عَنِيد، عِنَدٌ، وَالعَنِيد: الطاغِي الَّذِي يأْبَى الحَقّ، وَلايُذْعِن لَهُ وَإِنْ ظَهرَ لَهُ، وَقامَ عَلَيْهِ الدَّلِيلُ عِنْدَهُ) وشەی (عنید) هەندێكیان وایان مانا كردوە:

دەڵێن: ئەو كەسەیە كە سەرسامە بەوەی كە بۆخۆی هەیەتیو لە لایەتی، هەندێكی دی گوتوویانە: ئەو كەسەیە كە خۆی هەڵدەكێشێ، بەوەی كە لە لایەتی، (عنید) كۆیەكەی (عِنَد)ەو، هەندێكی دی گوتوویانە: (العنید) ئەو كەسەیە كە یاخی بووەو هەق قبووڵ ناكاتو بۆی ملكەچ نابێ، هەرچەندە بە بەڵگەش بۆی دەركەوتبێ كە هەقە، هەر تەسلیمی نابێ.

## مانــای گــشــتـی ئایـەتەکـــان

وەك گوتمان: ئەم یازدە ئایەتە باسی بەسەرهاتی هوود ﷺ و گەلەکەی عاد دەکەن، شایانی باسە: ئێمە لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (الأعراف)دا، قسەمان لە بارەی بەسەرهاتی (هود) و گەلەکەی (عاد)ەوە کردوە، لێرەشدا بە خێرایی بەسەر مانای گشتییەکەیدا دەڕۆین، چونکە دواتر ئێمە لە حەوت بڕگەدا، کورتە باسێك لە بارەی بەسەرهاتی (هود) و گەلەکەی (عاد)ەوە دەکەین.

خوا ﷻ هەر لە درێژەی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة السلام) لەم سوورەتەدا، بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، بۆ شوێنکەوتووانی، کە دەرسو پەندی لێ وەربگرنو، چاو لەو پێغەمبەرە پایە بەرزانە بکەن، کە چەند خۆڕاگر بوونو، چەند بە نەزاکەت بوونو، چەند بە پەرۆش بوونو، چەند پشت بە خوا بەستوو بوون، هەروەها چاو لە شوێنکەوتووانی وانیش بکەن، پەندیش وەربگرن لەو نەیارو دوژمنو ناحەزانەیان، کە ئاوا کەللە ڕەق بوونە، لە بەرانبەر پێغەمبەرانداو، ئاوا بێ نەزاکەت بوون، هەروەها دڵنیاش بن: کە سەرەنجامی کەسانێك کە لە ڕۆژگاری ئەوانیشدا هەن، کەسانی نەزانو کافرو لاڕێ، سەرەنجامی کافرەکانی ڕۆژگاری ئەوانیش، هەروەك سەرەنجامی کافرەکانی ڕۆژگاری کافرەکانی پێغەمبەرانی پێشوو، دەبێ.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ﴾، ئەم واوە (و) کە یەکێکە لە ئامرازەکانی گێڕانەوەو بادانەوەی شتێك بۆ سەر شتێك، واتە: وەك چۆن ئەی موحەممەد ﷺ! وەحییمان بۆ تۆ ناردوەو، تۆمان بۆ لای ئەو خەڵکە ناردوە، بۆ لای گەلی عادیش هوودی برایانمان ناردبوو، کە دیارە برای نەسەبیی و ڕەچەڵەکییانە ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، بێجگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، یانی: پەرستراوێکی شایستەی

پەرستن، ئەگەرنا پەرستراویان هەبوون، بەڵام یانی: ئەوانە هیچیان شایستەی پەرستن نین، ئێوە بە ناهەق دەیانپەرستن‌و سیفەتی پەرستراویان پاڵ دەدەنە لا، ئەگەر نا: یان وەك خۆتانن ئەگەر مرۆڤ بن، وەك طاغووت‌و فیرعەونەکان، یان لە خوار خۆتانەوەن، کە دارو بەردو خۆرو مانگ‌و ئەستێرەو، ئەو شتانەی دیکە بوون، ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ﴾، ئێوە تەنیا هەڵبەستەرن، واتە: ئێوە بەس درۆ هەڵدەبەستن، درۆو بوختان بەو دروستکراوانەی خواوە دەکەن، کە سیفەتی پەرستراویان دەدەنە پاڵ.

﴿يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾، ئەی گەلەکەم! من لەسەر ئەم پەیام گەیاندنە، کرێتان لێ داوا ناکەم، چاوەڕێی هیچ دیاریی‌و پاداشتێك نیم لە ئێوە، هیچ بار گرانییەکم بۆ سەر ئێوە نابێ، ﴿إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِى فَطَرَنِىٓ﴾، پاداشتی من تەنیا لەسەر ئەو کەسەیە کە منی هێناوەتە دی‌و، منی بۆ لای ئێوە ناردوە، دەمژیەنێ‌و دەمەرێنێ، هەر ئەویش پاداشتم دەداتەوە، بێجگە لە خوا، چاوەڕوانیی هیچ شتێکی دیکەم لە هیچ کەس نیە، ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، ئایا نافامن؟ ئەگەر هەر تۆزێك بفامن، دەبووایە بزانن کە من جگە لە دڵسۆزییم بۆ ئێوەو، جگە لە بەندایەتییم بۆ خواو، جێبەجێکردنی فەرمانی خواو، گەیاندنی پەیامی خوا، هیچ هاندەرو پاڵنەرێکی دیکەم نیە، بۆچی لەخۆوە تۆمەتبارم دەکەن، دەڵێن: شێت بووی! یان لە شوێنەکانی دیکە بە پێغەمبەرانیان گوتوە: دەتانەوێ گەورەیی بۆ ئێوەبێ: ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ ۝٧٨﴾یونس، ئەو تۆمەتانەو، ئەو لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا کردنانە، کە ئێستاش هەر بەردەوامن، بۆ شوێن کەوتووانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئەو درۆو بوختانانە کە لەلایەن ناحەزانی ئایینی خواو ڕێبازی پێغەمبەرانەوە، دەکرێن، لە ڕاستییدا ئەگەر کەسێك بفامێ، عەقڵی هەبێ‌و ویژدانی هەبێ، دەزانێ هەر کەسێك مسوڵمانی بە ڕاستیی بێ‌و بەندەی خوا بێ، بێجگە لە خوا چاوەڕوانییەکی دیکەی لە خەڵك نیە، تەنیا دڵسۆزیی بۆ خەڵك هەیە.

ئنجا هـوود هـەر بـەردەوام دەبـێو دەفەرمـوێ: ﴿وَيَٰقَوۡمِ﴾، هـەموو جـارێش دەفەرموێ: (یـا قوم) ئەی گەلـەکەم! واتە: ئێوەش خەڵکـی مـنن، منـیش یـەکـێکم لـە ئێـوە، کۆمەڵگـای مـنن، لـە نێوتـاندام، قـازانجو زیـانی ئێـوەم پـێ وەك هـی خـۆمە، خۆشییم لـەگـەڵ خۆشییتـانە، نـاخۆشـییم لـەگـەڵ نـاخۆشییتـانە، ﴿ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ﴾، داوای لێبـوردن لــە پەروەردگـارتــان بکــەن، ﴿ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾، دوایـی بگـەڕێنەوە بۆ لای، واتە: پێشی خـۆتـان پاك بکـەنەوەو پاکسازیی خـۆتـان بکـەنو، دان بە هـەڵەو کـەموکوڕییـەکانی خـۆتـاندا بێـننو، داوای لـێبوردن لـە خـوا بکـەن، ئەگەر تـاکو ئێسـتا هـاوبەشـتـان بۆ دانـاوەو، بە لاڕێـدا ڕۆیشـتوون، داوای لـێبوردنی لـێبکـەن، ﴿ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾، دوایی بۆ لای بگەڕێنەوە، وەك ئەهلـی تەصەووف دەڵێن: (التَّخْلِية ثُمَّ التَحْلِية)، دەبـێ پێشی خـۆت بـژار بکـەی لـە سیفەتی خـراپ، ئنجا دەتوانی خـۆت برازێنیـەوە، بە سیفەتی بەرزو چاك، یـان وەك زانـایـانی تەوحیـد دەڵـێن: (النَّفِي ثُمَّ الإِثْبَـات) وشـەی (لا إلـه إلاّ الله) وشـەی (نفـي) و (إثبـات)ی پـێ دەڵـێن، تـۆ پێشـێ هـەرچی پەرسـتـراوی سـاختـەیـە، لایـدەبـەی، (لا إله) هیـچ پەرسـتـراوێك نیـە، (إلاّ الله) جگـە لـە خـوا، دوایـی پەرسـتـراوێتیـی خـوا، کـە هـەر ئـەو پەرسـتــراوی بـە هـەقـە، دەچەسـپێنی.

هـوود ﷺ بـەم شێوەیـە داوا لـە خەڵکەکـەی دەکـات، دەفـەرموێ: پێشـی داوای لـێبوردن بکـەنو، دان بە هەڵەو کەموکوڕییەکانتـان دابێننو، کەموکوڕییـەکانتـان بە کەموکوڕیی و هـەڵەو عـەیب، ببینـنو، دەسـتبەرداریـان بن، ئنجا دوایی بگـەڕێنـەوە بۆ لای خـوا.

ئنجـا ئەگـــەر واتـانکـــرد: ﴿يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا﴾، ئـاوی بـە خورزەمتـان لـە ئـاسمـانەوە بەسـەردا دەبـارێ، وشـەی (سمـاء) لـە قـورئـاندا، وە لـە زمـانی عـەرەبییـدا، بە مـانای بـاران هـاتوەو، بە مـانای هـەور هـاتوەو، بە مـانای سـەرەوە هـاتوە، یـانی: مەرج نیـە ئـاسمـان تەنیـا بەو مـانـایـە بێ کـە ئەو حەوت ئـاسمـانە بن، کـە خـوای پـەنهانزان بـاسیـان دەکـات، (السَّمـاءُ: کُلُّ مـا فَوْقَـكَ، كُلُّ مـا عَـلاكَ)،

واتە: هەرچی لە سەرووی تۆوەبێ، پێی دەگوترێ: ئاسمان، هەور بۆچی پێی دەگوترێ: ئاسمان؟ چونکە لە سەرووی تۆوەیە، باران بۆیە پێی دەگوترێ ئاسمان، چونکە لە سەرەوەیەو، نەشیفەرمووە: باران (مَطَر) بۆچی؟ لە قورئاندا بە زۆریی دەفەرموێ: (أَنْزَلَ مِنَ السَّماءِ ماءً)، هەندێ جاریش باسی (مَطَر) دەکات، چونکە کە دەفەرموێ: ئاو (ماء) هەم باران، هەم بەفر، هەم تەرزە دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر بفەرموێ: (مَطَر) بەس باران دەگرێتەوە.

﴿وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ﴾، هێزی دیکەش دەخاتە گەڵ هێزو تواناتان، دیارە گەلی عاد وەك دوایی باسی دەکەین، زۆر بەهێزو بە کەلەش بوون، واتە: ئەو نیعمەتەی کە خوا پێی داون، کە هێزی جەستەیە، هێزی دیکەشتان بۆ زیاد دەکات، بەهۆی ئیمانو تەقواوە، ﴿وَلَا تَتَوَلَّوْا مُجْرِمِينَ﴾، تاوانبارانەش پشت مەکەنە منو پەیامەکەمو خوای پەروەردگارتان.

هوود ﷺ بەم شێوەیە بانگی کردن، ئنجا گەلەکەی وەڵامی دەدەنەوە: ﴿قَالُوا يَا هُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾، گەلی عاد گوتیان: ئەی هوود! هیچ بەڵگەیەکی روونت بۆ نەهێناوین (کە بە تەئکید درۆیان کردوە) ئێمەش لەبەر قسەی تۆ دەستبەرداری پەرستراوەکانمان نابینو، بۆ تۆ نابینە بڕوادار، ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ﴾، ئێمە تەنیا ئەوە دەڵێین: کە هەندێ لە پەرستراوەکانی ئێمە تۆیان تووشی زیان کردوە، دەستیان لێ وەشاندووی، وەك لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: (دەستی لێ وەشێنراوە)، واتە: تۆیان شێت کردووەو عەقڵت تێکچووە.

هوودیش ﷺ یەکسەر وە دەنگ دێتەوە : ﴿قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ۝ مِن دُونِهِ﴾، (هوود ﷺ)، فەرمووی: من خوا بە شایەد

دەگرم، خوا ئاگادارەو با شایەدم بێ و، ئێوەش شایەدیی بدەن بەوە کە من دوورم لەوەی ئێوە لە جیاتی خوا دەیانکەنە هاوبەش، واتە: ئەوانەی کە لە خوار خواوەن، لە جیاتی خوا دەیانکەنە هاوبەش و، لەوان بێمنەتم و لێیان دوورم، واتە: نەك هەر دەستیان لێ نەوەشاندووم، بەڵکو هیچ منەتیان نازانم، چونکە هیچ نین.

﴿فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ﴾، ئنجا بە تێکرا هەمووتان وێکرا، فێڵم لێبکەن، پیلانم لە دژ بگێڕن، دواییش هیچ مۆڵەتم مەدەن، هیچ چاوەڕێم مەکەن، ﴿إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم﴾، بێگومان من پشتم بە خواش پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوە بەستوە، پشتم بەو قایمە، بۆیە ئاوا لە ئێوە بێمنەتم، ئەوەی پشتی بە خوا قایم بێ، ئەوەی بەڕاستیی خۆی بە دۆستی خوا بزانێ و، خوا بە دۆست و سەرپەرشتیاری خۆی بزانێ، لە ناحەزانی خوا، بێمنەتە.

﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ﴾، هیچ پێڕۆیەك، هیچ ژیانداریك نیە، مەگەر خوا بگری پێشە سەرەکەیەتی، جڵەوەکەی لە ژێر کۆنترۆڵی ئەو دایە، ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾، بێگومان پەروەردگارم لەسەر ڕێیەکی ڕاستە، واتە: پەروەردگارم لە ڕێیەکی ڕاستەوە، مامەڵە لەگەڵ دروستکراوەکانی دا دەکات، واتە: بەو سیستەم و یاسایانە کە دایناون، خۆ کاری خوای کاربەجێ گۆترەکاریی و هەڕەمەکیی نیە، بەڵکو سیستماتیکیی و ڕێکخراوو ڕێك و پێکە، ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ﴾، یانی: ئەگەر پشت هەڵبکەن و ڕوو وەربگێڕن، ئەوە بە دڵنیایی من ئەوەی کە پێی ڕەوانەکرابووم بۆ لای ئێوە، پێم گەیاندن.

ئنجا وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ﴿٩٩﴾﴾ المائدة، نێردراو تەنیا گەیاندنی لەسەرە.

لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿...فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾﴾ النحل، واتە: ئایا ڕەوانەکراوان جگە لە گەیاندنی ڕوون و ئاشکرا، چی دیکەیان لەسەرە؟

﴿ وَيَسۡتَخۡلِفُ رَبِّي قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيۡـًٔا ﴾، ئنجا ئەگەر ئێوە بەردەوام بن، لەسەر ئەو کوفرو خراپەکارییەی خۆتان، ئەوە خوا ئێوە لادەبات‌و کۆمەڵێکی دیکەی جیا لە ئێوە، دێنێتە شوێنی ئێوەو، هیچ زیانیش بە خوا ناگەیەنن، کە تۆڵە بکەنەوە، یان لەبەر دەستی خوا ڕابکەن، هیچتان لە دەست نایەت بەرانبەر بە خوای بالآدەست. ﴿ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَفِيظٞ ﴾، بێگومان پەروەردگارم پارێزەرە بەسەر هەموو شتێکەوە، هەموو شتێك لە ژێر چاودێریی‌و هەیمەنەو دەستەڵاتی ڕەهاو بێسنووری خوای پەروەردگار دایە، چونکە بۆخۆی هەموو شتەکانی دروست کردوون.

ئنجا باسی قۆناغی چوارەم‌و کۆتایی بەسەرهاتی هوود ﷺ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا هُودٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَنَجَّيۡنَٰهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ﴾، کاتێك فەرمانمان هات، (واتە: بڕیاری کۆتاییمان هات، بە فەوتاندنی گەلی عاد، کە بریتی بوو لە بایەکی بەهێز، وەك لە سوورەتەکانی دیکەدا باس دەکات)، هوودو ئەوانەی لەگەڵی دا بڕوایان هێنابوو، بە بەزەییەکی تایبەت لەلایەن خۆمانەوە، ڕزگارمان کردن‌و، لە ئازارێکی سەخت‌و بێ ڕەزا قورتارمان کردن.

﴿ وَتِلۡكَ عَادٞ ﴾، ئا ئەوەش گەلی عاد بوو، خوا عزّوجل وەك ئاماژەی دوور دەفەرموێ: ئەوانە گەلی عاد بوون، فڕێ درانە زبڵدانی مێژووەوەو، بوونە بەسەرهاتێك لە بەسەرهاتەکان، ﴿ جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ ﴾، نکووڵییان لە نیشانەکانی پەروەردگاریان کرد، وشەی (جحد) بریتییە لەوەی کە نکووڵیی لە شتێك بکەی، لەگەڵ ئەوەی بشزانی ئەو شتە وایە، بەڵام دانی پێدا نەهێنی، ئنجا نیشانەکان: یان ئەو موعجیزەو بەڵگانە بوون، کە هوود ﷺ پێی بوون، یان ئەو پەیامەی خوا بووەو ئەو فەرمایشتە بووە کە خوا بە هوود دا ﷺ ناردوویەتی، یان مەبەست پێی ئەو دیاردە سروشتییانەی خوان بووە، کە هەموویان تاك‌و تەنیایی خوا، سیفەت‌و ناوە بەرزو پەسندەکانی خوایان،

تێدا دەدرەوشێتەوە، هەموویان دەگرێتەوە، ﴿وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ﴾، وە سەرپێچییان لە پێغەمبەرەکانی خوا کرد.

ئنجا دیارە ئەوان سەرپێچییان لە یەك پێغەمبەر کردوە کە هوودە ﷺ، بەڵام بۆیە دەفەرموێ : ﴿وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ﴾، چونکە هوود ﷺیش هەر بە ڕێبازو ڕاستە شەقامێکدا ڕۆیشتوە کە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەسەری ڕۆیشتوون، کەواتە: هەر بێبڕوایەك، بڕوا بە یەکێك لە پێغەمبەران نەکات، وەك ئەوە وایە، بڕوا بە هیچ یەکێك لە پێغەمبەران نەکات.

﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ﴾، (گەلی عاد) بە دوای هەر زۆردارێکی خوێنڕێژی خۆ پەسند کەوتن، یان هەر زۆردارێکی کەللەڕەق، (جبّار) کەسێکە کە زۆر لە خەڵك بکات، بە زۆر خۆی بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ‌و، (عنید) کەسێکە، خۆی هەڵکێشێ بە شتێك کە لەلایەتی، یان کەسێك کە دان بە هەقدا نەهێنێ، هەرچەندە لەلاشی ڕۆشن بووبێتەوە.

﴿وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، ئنجا لە سزای ئەوەدا لەم دنیایەداو لە قیامەتیشدا، نەفرینیان شوێن خرا، واتە: خوا لەعنەتی لێکردن، (اللّعْنُ: الطّرْدُ وَالإِبْعادُ مِنْ رَحْمَةِ الله)، (لعن) بریتیە لە دوورخستنەوەو دەرکردن لە بەزەیی خوا، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡ﴾، ئەها! ئاگاداربن، وریابن، گەلی عاد بەرانبەر پەروەردگاریان بێبڕوا بوون، یان بێنمەك‌و بێ وەفاو سپڵە بوون، ﴿أَلَا بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ﴾، ئەها! وریا بن عادی گەلی هوود هەر دوور بن لە بەزەیی خوا، ئەمەش تووك‌و دووعایەو، کە خواش ﷻ بە صیفەی تووك‌و دووعا دەیهێنێ، واتە: وایان لێ هات، چونکە خوا داوا لە کێ بکات؟!

# کورتە باسێک لەبارەی هوود ﷺ و گەلی عادەوە لە حەوت تەوەردا

لە حەوت تەوەردا ئەم بابەتە دەتوێژینەوەو، دوایش دووبارە لە کاتی خستنەڕووی مەسەلە گرنگەکانی ئەم یازدە ئایەتەدا، تیشکی زیاتر دەخەینە سەر، وردەکاریی ماناو مەبەستی ئایەتەکانو، بەسەرهاتی هوود ﷺ و گەلەکەی:

**تەوەری یەکەم : ژمارەی ناوهێنرانی هوود ﷺ لە قورئاندا :**

تەنیا حەوت جاران لە قورئاندا ناوی پێغەمبەر هوود ﷺ هێنراوە، ئەویش بەم شێوەیە:

١/ ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾﴾ الأعراف.

٢/ ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾﴾ هود.

٣/ ﴿قَالُوا يَا هُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾﴾ هود.

٤/ ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا هُودٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَنَجَّيۡنَٰهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ۝٥٨﴾ هود.

٥/ ﴿وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ ۝٦٠﴾ هود.

٦/ ﴿وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ۝٨٩﴾ هود.

٧/ ﴿إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ۝١٢٤﴾ الشعراء.

**تەوەری دووەم: بەسەرهاتی هوود ﷺو گەلی عاد:**

**دیارە ئەم بەسەرهاتە، تەنیا لە قورئاندا هاتوە، لە کتێبەکانی دیکەدا: پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێو، لە زەبووری داوودو، لە ئەناشیدی سولەیماندا، نەهاتووە، ئنجا ئەو کتێبانەش چەندیان ڕاست ماوەتەوەو چەندیان دەستکاریی کراوە، کە بەتەئکید دەستکاریی کراون، لە هیچیاندا باسی هوود ﷺو، گەلی عاد نەکراوە، تەنیا لە قورئاندا باسکراوە، هەڵبەتە هەم گەلی عادو هەم گەلی سەموودیش، کە هوود ﷺ بۆ گەلی عاد نێردراوەو، صاڵح بۆ ثەموود نێردراوە، بە ڕای زانایانی مێژووناس، ئەوانە لە قۆناغی پێش نووسرانەوەی مێژوودا بوون، هەروەك و نووحیش بە هەمان شێوە، صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ.**

## تەوەری سێیەم: پانتایی تەرخانکراو بۆ بەسەرهاتی هوود ﷺو گەلی عاد:

سەرجەم حەفتاو چوار ئایەت لە قورئاندا، تەرخان کراون، بۆ قسە کردن لەبارەی بەسەرهاتی هوود ﷺو گەلەکەیەوە :

١) لە سوورەتی (الأعراف)، ئایەتی (٦٥) تاکو (٧٢)، واتە: هەشت (٨) ئایەت.

٢) لە سوورەتی (هود)، ئایەتی (٥٠) تاکو (٦١)، واتە: یازدە (١١) ئایەت.

٣) لە سوورەتی (المؤمنون)، ئایەتی (٣١) تاکو (٤١)، واتە: یازدە (١١) ئایەت.

٤) لە سوورەتی (الشعراء)، ئایەتی (٢٣) تاکو (٤٠)، واتە: هەژدە (١٨) ئایەت.

٥) لە سوورەتی (فصلت)، ئایەتەکانی: (١٥) و (١٦)، واتە: دوو (٢) ئایەت.

٦) لە سوورەتی (الأحقاف)، ئایەتی (٢١) تاکو (٢٦)، واتە: شەش (٦) ئایەت.

٧) لە سوورەتی (الذاریات)، ئایەتەکانی: (٤١) و (٤٢)، واتە: دوو (٢) ئایەت.

٨) لە سوورەتی (النجم)، ئایەتی (٥٠) تاکو (٥٥)، واتە: شەش (٦) ئایەت.

٩) لە سوورەتی (القمر)، ئایەتەکانی: (٦) و (٧) و (٨)، واتە: سێ (٣) ئایەت.

١٠) لە سوورەتی (الفجر)، ئایەتەکانی: (٦) و (٧) و (٨)، واتە: سێ (٣) ئایەت.

کەواتە: کۆی ئەو ئایەتانەی لە قورئانی بەرزو بەپێزدا، بۆ قسەکردن لەبارەی هوود ﷺو گەلەکەیەوە (عاد)، تەرخان کراون، (٧٤)ن.

بەڵام لە سوورەتی (البراءة)یشدا، باسی گەلی عاد کراوە، هەروەها لە سوورەتی (إبراهیم)داو، لە سوورەتی (الفرقان)داو، لە سوورەتی (العنکبوت)داو، لە سوورەتی (ص)داو، لە سوورەتی (ق)دا، باسی گەلی (عاد) کە ناوی گەلی هوودە، کراوە، بەڵام ناوی (هود) لەگەڵ واندا نەهاتوە.

## تەوەری چوارەم: شوێنی جوگرافیی گەلی هوود ﷺ:

لە قورئاندا ناوی ئەو ناوچەیەی کە گەلی عاد تێیدا نیشتەجێ بووەو، پێغەمبەر هوود ﷺ بۆ لایان ڕاوانەکراوە، بە ناوی: (أَحْقَاف) هاتوە، (أَحْقَاف)یش کۆی (حِقْف)ە، (الحِقْفُ: ما استطالَ وَاعْوَجَّ مِنَ الرَّمْلِ، جمعُهُ أَحْقَاف وَحُقُوف)[1]، (حِقْف) بریتیە لە لمێك كە درێژ دەبێتەوەو لاردەبێتەوەو، كۆیەكەی (أَحْقَاف) و (حُقُوف)ە.

دەربارەی دیارییکردنی ئەو ناوچەی کە گەلی عادی لێ نیشتەجێ بووە، کە ئێستا شوێنەوارەکەیان دۆزراوەتەوە، وەك دوایی باسی دەکەین، زانایان گوتوویانە: (هو ما بَيْنَ عُمان وَعَدَن إلى البَحْر الأَحْمَر الَّذي كانَ سابِقاً يُسَمَّى بحَرُ القُلْزم، فَبَعد أَنْ ينتهي الرّجل من اختراق أَرْض عُمان، يَبْدَأ بالأحقاف أي بالأَرَاضِي الرَّمْلِية الوَاسِعَة الشاسِعَة، فَتِلْكَ هي بلاد عاد)[2].

واتە: ئەحقاف ئەو ناوچەیەی کە گەلی عادی لێبوون، دەکەوێتە نێوان عومان و عەدەن، بەرەو لای دەریای سوور، کە پێشتر بە دەریای سوور گوتراوە: دەریای (قُلْزم)، ئنجا دوای ئەوەی کە پیاوێك دەڕوات و لەسەر زەمینی عومان دەردەچێ، دەست دەکات بەو شوێنە لماوییە، کە دەشتێکی لماوییەو زۆر فراوانە، ئەو شوێنە، شوێنی گەلی عاد بووە.

هەروەها (عبدالوهاب النّجار) دەڵێ: (هِيَ تَقَعُ فِي شمال الحَضْرَمُوت، وَفِي شمالِها الربع الخَالِي، وَفِي شَرْقِها: عُمان)[3].

واتە: دەکەوێتە باکووری حەزرەمەوت و، لە باکووری ئەحقاف، بیابانی (رُبْع الخَالِي) چواریەکی بۆش، هەیە (کە فراوانترین بیابانە لە وڵاتانی عەرەباندا) و لە ڕۆژهەڵاتیەوە: عومان هەیە.

---

١) المعجم الوسيط، ص١٨٧.

٢) سيرة النبين والمرسلين، ج ١، ص ١٢٩.

٣) قصص الأنبياء، ص ٥١.

## دۆزینەوەی شوێنەکەیان

هەندێك وردەكاریی، كە لەم ڕۆژگارەدا زیاتر دەست كەوتوون:

١/ یەكەمجار لە ساڵی (١٩٨٤)دا، {مؤسسة بحوث الفضاء الأمريكية (ناسا)}

دامەزراوەی لێكۆڵینەوە گەردوونییەكانی ئەمریكیی، كە پێی دەگوترێ: (ناسا) هەندێك زانیاریی لەوبارەوە دەستكەوت، چونكە دەتوانێ بە قووڵایی چەند مەترێك ژێر زەوی كەشف بكاتو بیپشكنێ، وە هەروەها زانیارییەكانی كەشتییە ئاسمانییەكان (المكوك الفضائية)، كە هەڵیان دەدەن، ئەویش هەندێك زانیاریی دەرخست، كە لەگەڵ ئەو زانیارییانەی (بەطلیمووس)، كە بابایەكی گەردووناسی جوگرافییەو ئەسكەندەریی بووەو، لە ساڵی (١٠٠) تاكو (١٧٠) زایینیی دا ژیاوە، كاتی خۆی هەندێك زانیاریی گوتوون دەربارەی شوێنی گەلی عاد، ئەو زانیارییانەی كە لە ڕێی مانگەكانو كەشتییە ئاسمانییەكانەوە دەستهاتن، لەگەڵ ئەو زانیارییانەی دی دا، تێكیان دەگردەوە.

دیارە كاتی خۆی (بەطلیمووس)، وێنەی شوێنەكەی كێشاوە، كە ڕووباری لێبووەو، ڕێبازو ڕێو بانی لێبووە، دیارە ئەو كاتە شوێنەكەیان نەكەوتۆتە ژێر لمو نەشێردراوەتەوە، بۆیە (بەطلیمووس)، نەخشەی شوێنەكەیانی كێشاوە، وەك جوگرافیی زانێكو گەردووناسێكی ڕۆژگاری خۆی.

٢/ دووەمجار لە ساڵی (١٩٩١ تاكو ١٩٩٨)، مانگە دەستكردەكانو، لیژنەكانی پشكنین

بەردەوام بوون، سەرەنجام قەڵایەكی هەشت لایی، دیوار ئەستوورو خاوەن بورج، كە لە گۆشەكانیدا دینگەی بەرزی نۆ (٩) مەتر درێژو، تیرەی هەر دینگەیەك سێ مەتر ئەستوور، دروست كرابوون، ئەوە دۆزرایەوەو، لە (٥/ ٢/ ١٩٩٢)دا لە ڕۆژنامەی (نیویورك تایمزی ئەمریكیی)دا، باسی ئەو زانیارییانە كراو گوتیان: ئەوە شاری ئیرەمی شەددادی كوڕی عادە، كە خۆی دروستی كردوە.

٣/ لەم دواییانەشدا : كۆمپانیای (أرامكو)ی سعوودیی لە (صحراء الربع الخالي)دا

كە كاری پشكنینی دەكرد بۆ نەوت، پەیكەرێكی ئیسقانی زۆر گەورەو مەزنی

دۆزیەوە، کە کتێبی: (سیرة النبیّین والمرسلین)، وێنەکەی داناوەو نەفەرێك لەلای کەللە سەرەکە وەستاوە، نەفەرەکە لە کەللە سەرەکە بچووکترە، هەموو ئەو زانیارییانەش لە کتێبی: (سیرة الأنبیاء والمرسلین)دا هاتوە، کە وێنەی قەڵاکانو شوێنەوارەکانو، وێنەی ئەو مرۆڤە عیملاقەشی تێدا داناوە[1].

## تەوەری پێنجەم: گەلی عاد لە دوای گەلی نووح هاتوون:

بە پێی سەرنجدانی ئایەتە موبارەکەکانی قورئان، گەلی عاد لە دوای گەلی نووح هاتوونو، ئەوانیش هەر بتپەرست بوون، دوای ئەوەی وەچەی نووح زۆر بوونو دووبارە تووشی لادان بوون، ئنجا گەلی عاد هاتوون، کە درێژکراوەی وانن.

گوتراوە: هوود ﷺ یەکەمین کەسێك بووە کە بە زمانی عەرەبیی قسەی کردووە، یەکەمین کەسێك بووە کە لە نەوەی سامی کوڕی نووح، وەك پێغەمبەر ڕەوانە کراوە، بۆیەش نووح پێی گوتراوە: دووەمین بابی مرۆڤایەتیی، شارەزایانی مێژوو دەڵێن: لە نەوەی نووح ﷺ هوود ﷺ یەکەمین پێغەمبەر بووە، کە دەچێتەوە سەر سامی کوڕی نووح، کە (نووح) ﷺ، جگە لە سام، دوو کوڕی دیکەشی هەبوون، بە ناوی (یافث) و (حام)[2].

ئنجا بە پێی ئایەتەکانی سووڕەتی (الشعراء) (ئایەتەکانی: (١٢٣) تاکو (١٤٠)، واتە: هەژدە (١٨) ئایەت)، گەلی عاد کۆمەڵگایەکی زۆر خاوەن ئیمکانیەتی ماددیی بوون، وێڕای ئەوەی کە هێزێکی جەستەیی زۆر لە سنوور بەدەریان هەبووە، جیا لە هەموو ئەو مرۆڤانەی کە ژیاون، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ : هوود ﷺ بە گەلەکەی خۆی گوت : ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا

---

١) ص١٥٣ - ١٥٨.

٢) تفسير القرآن الحكيم ج ١٢، ص ٩٥.

ٱلَّذِىٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنۡعَـٰمٖ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّـٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾﴾، واتە: ئایا لەسەر هەموو شوێنێکی بەرز قەڵایەك، نیشانەیەك دروست دەکەن، هەروا و بۆ گاڵتەو کات بەسەربردن. (دیارە زۆر خاوەن ئیمکانیەت بوون و پارەیان زۆر بووە)و، قەڵایان دروست دەکەن، بۆ ئەوەی لەو قەڵایانەدا بمێننەوەو. هەر کاتێك کە سزای خەڵك دەدەن و ڕێگریی دەکەن. زۆر ستەمکارانە سزای خەڵك دەدەن. پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەریی من بکەن و. پارێز لەو خوایە بکەن، کە دەزانن ئەو شتانەی بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە. کە بریتیە لە ئاژەڵ و کوڕان و. باغ و بێستانی زۆرو کانیو سەرچاوەی زۆر.

{ئا ئەو خوایە بپەرستن و فەرمانبەریی بۆ بکەن، بەڵام بە قسەیان نەکردوە} .

## تەوەری شەشەم: بۆ هوود ﷺ باسی موعجیزەو بەڵگەیەکی دیاریکراو، نەکراوە:

هەڵبەتە گەلەکەشی، واتە: عاد تۆمەتباریان کردوە کە بێ بەڵگەیە، گوتوویانە: ﴿قَالُواْ يَـٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖ ... ﴿٥٤﴾﴾هود، واتە: ئەی هوود! تۆ بەڵگەو موعجیزەیەکت بۆ نەهێناوین و، ئێمە دەستبەرداری پەرستراوەکانی خۆمان نابین، بەهۆی قسەکانی تۆوەو، ئێمە بڕوا بە تۆ ناهێنین، ئێمە پێمان وایە کە هەندێك لە پەرستراوەکانی ئێمە بە خراپە دەستیان لێ وەشاندووی.

بەڵام ئێمە دڵنیاین کە: هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، بەڵگەو موعجیزەیەکی وای نەبێ، سەلمێنەری ئەوەبێ، کە پێغەمبەری خوایە، بۆچی؟

چونکە لە چەندان ئایەتدا، خوای زاناو شارەزا ئاماژەی بەوە کردوە بۆ نموونە : خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَـٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِ ... ﴿٢٥﴾﴾الحدید، واتە : بە دڵنیاییەوە ئێمە پێغەمبەرانی

خۆمانمان بە بەڵگە ڕوونو ئاشکرایەکانەوە ناردوونو، کتێبو تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونەخوار (واتە: بەرنامەو شێوازی جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیەش)، ئەوە بەگشتی خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾، واتە: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە بە بەڵگەو موعجیزەیەکەوە نەیەت، کە بتوانێت ئیسپاتی دەعوای خۆی پێ بکات لەسەر گەلەکەی‌و، لە ڕۆژگاری خۆیدا.

موعجیزەی هەر کام لە پێغەمبەرانیش ـ وەك پێشتریش باسمان کردوە ـ گونجاو بووە لەگەڵ کلتوورو فەرهەنگ‌و بیرکردنەوەی ئەو کاتەو ئەو بارودۆخە سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و فیکرییەی، کە ئەو کۆمەڵگایە تێیدا ژیاوە، لە فەرموودەشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : {ما مِنَ الأنبياءِ نَبيٌّ إلاَّ أُعْطِي ما مِثلُهُ آمَنَ عَلَيهِ البَشَرُ، وَإنَّما كانَ الَّذي أُوتيتُ وَحياً أوحَاهُ اللهُ إليَّ، فَأرْجو أنْ أكونَ أكثَرَهُمْ تابعاً يَومَ القِيامَةَ} {رَواهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلم، برقم: (٣٨٣)، عَن أبي هُرَيرَة ﷺ}.

واتە: هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) نەبووە، کە بەڵگەیەکی پێ نەدرێ، لەسەر ئەوە خەڵك ئیمانی پێ بێنن (بزانن کە ڕاست دەکات) ئنجا ئەوەی بەمن دراوە لەو بوارەدا وەحییە بۆم هاتوە، (واتە: ئەوەی کە پێم دراوە، وەك بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتییم، وەحی‌و پەیام‌و بەرنامەی خوایە)، بۆیە ئومێدم وایە کە لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بن.

چونکە هی ئەو ماوەتەوە، بەڵام موعجیزەکانی پێغەمبەرانی دیکە (علیهم الصلاة والسلام) بە وەفاتی خۆیان، کۆتایی یان پێهات، حیکمەتی ئەوەش: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر کامێکیان بۆ قۆناغێك‌و هەلومەرجێك‌و، بۆ گەل و میللەتێکی دیاریکراو، هاتوونو، موعجیزەکەیان هەر ئەوەندە پێویست بووە، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی، بۆ هەموو بەشەر هاتوە، بە پانایی زەمین، بە درێژایی زەمان، بۆیە موعجیزەکەشی، هەموو ڕۆژگارو سەر زەمینی گرتۆتەوە.

## تەوەری حەوتەم: گەلی عاد زۆر سەرکێش و خۆبەزلگر بوون:

ئەم گەلە ستەمکارە هیچ گوێیان بەو هەموو قسە ڕوونو، بەڵگە بێ چەندو چوونو ئەو هەموو دڵسۆزیی و خۆشەویستیی و بە تەنگەوە بوونەی هوود ﷺ نەداوە، هۆکارێکی بنەڕەتیی ئەو یاخیبوونو ملهوڕیی و خۆبەزلگرییەیان، ئەوە بووە کە خاوەنی جەستەیەکی زۆر زل و بەهێز بوون، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي ٱلْبِلَٰدِ ۝٨﴾ الفجر، واتە: لە وڵاتاندا وێنەی وان دروست نەکرابوو، یانی: ئەوەندە زل و بەهێز بوون.

لە تەفسیرەکاندا، هەتا لە تەفسیرە نوێیەکانیشدا، لەبارەی گەلی عادەوە باسی هەندێ شت کراوە، کە بێگومان ئەوە جۆرێکە لە ئەفسانەو زیدەڕۆییەکی زۆری تێدایە، بۆ نموونە: یەکێك لە تەفسیرەکان دەڵێ: وەك چۆن یەکێك لە ئێمە بڕکە نۆك و نیسکێك، یان بڕکە پنگێك هەڵدەقەنێ، ئەوانیش بەو شێوەیە دارو درەختی گەورەیان هەڵقەندوە! کە بێگومان ئەمە زیدەڕۆییەکی زۆرە، بەڵام بە هەر حاڵ مادام خوای زاناو تواناش لەسەر زمانی ئەوان فەرموویەتی: ﴿مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۝١٥﴾ فصلت، ئنجا خوای پەروەردگاریش ئەو قسەیەی لێ هەڵنەوەشاندوونەوە، بەڵکو فەرموویەتی : ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ۝١٥﴾ فصلت، واتە: ئایا نەیاندەزانی، ئەو خوایەی کە دروستی کردوون، لەوان بەهێزترە؟!

کەواتە: گەلی عاد زۆر بەهێزو بە توانا بوون، بۆیەش زۆر لە خۆبایی بوون، هەڵبەتە مرۆڤ کە ئیمانی نەبوو، بەهێزیش بێ، ئەوە بە بەهێزبوونەکەی لەخۆ بایی دەبێ، هەروەها ئەگەر ئیمانی نەبووو دەوڵەمەندیش بوو، بەهۆی دەوڵەمەندییەکەیەوە، لەخۆ بایی دەبێ، ئەگەر ئیمانی نەبوو، خەڵکیشی زۆر بە دەورەوە بوو، ئەوە یەکسەر هەوایەکی دەکەوێتە کەللە، بەڵام ئەگەر ئیماندار بوو، دەسەڵاتەکەی و عیلمەکەی و قەڵەباڵغیەکەی دەوری، هەمووی بە چاکەو نیعمەتی خوا دەزانێ،

لە جیاتی ئەوەی پێی لەخۆی بایی بێ، زیاتر سەری بەندایەتیی بۆ خوا دادەنەوێنێ.

ئنجا سەرەنجام خوا ﷻ بایەکی زۆر بەهێزو تێکشکێنەری بۆ ناردن، هەموویانی فەوتاندن، با لەوبارەوە تەماشای چەند ئایەتێك بكەین، كە لە ژێر ناوونیشانێکی تایبەتدا هێناو من، چونکە لەبەینبرانی گەلی عادو فەوتێنرانیان، خوای توانا و زاڵ لە قورئاندا زۆری باسکردوە.

# چۆنیەتی فەوتێنرانی گەلی عاد

١) دوای ئەوەی کە خوا ﷻ لە قورئاندا باسی هوود ﷺ لەگەڵ گەلەکەی دەکات، دەفەرموێ: ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ وَمَا كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٧٢﴾﴾الأعراف، واتە: خۆیو ئەوانەی کە لەگەڵی بوون (واتە: ئەوانەی کە بڕوایان پێ هێنابوو) بە بەزەییەکی تایبەتیی خۆمان دەربازمان کردنو، ئەوانەی بە نیشانەو ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوا بوون، دوابڕاومان کردن، (بۆیەش وامان بەسەرهێنان)، چونکە بڕوادار نەبوون.

٢) خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (فصلت)دا، کە باسی فەوتاندنی گەلی عاد دەکات، دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۖ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾﴾، واتە: بەڵام هەرچی گەلی عاد بوو، لەسەر زەویدا خۆیان بەزلگرت بە ناهەق، (ئنجا خۆ بە زلگرتن هەر بە ناهەقە، بەڵام خوای قسە لەجێ بۆئەوەی خۆ بە زلگرییەکەیان، قێزەوەنتر پێشان بدات، وادەفەرموێ)، گوتیان: کێ لە ئێمە بەهێزترە؟! (خوا دەفەرموێ) ئەدی نەیاندەبینی، نەیاندەزانی ئەو خوایەی کە دروستی کردوون، لەوان بەهێزترە؟ بەرانبەر بە ئایەتەکانی ئێمە نکووڵییکەر بوون، (واتە: دەیانزانی کە هەقن، واتە: زلەزلەکانو دەستڕۆیشتووەکانیان، بەڵام نکووڵییان لێ دەکردنو دانیان پێدانەدەهێنان).

ئنجا ئایا سەرەنجام خوای دادگەر چی لێکردن؟ دەفەرموێ : ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ ﴾، ئنجا بایەکی زۆر بەهێزو زۆر ساردمان، لە ڕۆژانێکی شوومو بێخێردا، نارده سەریان، (هەڵبەته بەنسبەت ئەوانەوه ڕۆژەکان شوومو بێخێر بوون، ئەگەرنا ڕۆژەکان هەر هەموویان وەك یەکن، هەر لەوکاتەوە کە گەلی عادی فەوتاندوە، هوود ﷺو ئەوەی کە بڕوای پێهێناوه، ڕۆژێکی موبارەك بووه بۆ ئەوان، هەروەها بۆ خەڵکی دیکه کە بۆ خوا صوڵحاو بووه، بەڵام هەر کەسێك دوور لە خواو دوور لە شەریعەتی خوا بێ، هەموو تەمەنی دەبێتە شوومیی‌و نەگبەتیی‌و بێخێریی)، دوایی دەفەرموێ : ﴿ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، بۆئەوەی سزای سەرشۆڕیی‌و زەبوونییان لە ژیانی دنیادا پێ بچێژین، ئایا بەس ئەوەندە؟ نەخێر ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾، وە ئازارو سزای دۆزەخیش پڕ ڕیسوایی‌و زەبوونیی تریشەو، یارمەتییشیان نادرێ‌و پشتگیرییشیان ناکرێ.

ئنجا ئایا کێ هەیە لە بەرانبەر خوادا بتوانێ یارمەتی کەسانێك بدات، کە خوای دادگەرو باڵادەستو کارزان، بیەوێ سزای بدات؟!

وشەی (صَرْصَر) دەڵێ: (ريح يَضْرِب النَّبات وَالحرْث، شَدِيدة البرد وَشَدِيدة الصَّوْت)[1].

(صَرْصَر) واتە: بایەکی زۆر سارده لە ڕووەكو کشتوکاڵ دەدات، کە (بێ ڕەنگو بۆی دەکات، یاخود جاری وایه دەیفەوتێنێ)، دەنگێکی بەهێزی هەیە.

دیاره ئەوه زانایان بە گشتی وایانگوتوه، ئنجا ئەدی دەبێ ئەو بایەی خوای باڵادەست بە تایبەت بۆ گەلی عادی ناردوه، چەند سارد بووبێ‌و چەند بەهێز بووبێ؟ بە پێی شوێنەوارەکەی دەزانین بایەکە چۆن بووەو، چی بەسەر هێناون.

---

١) المعجم الوسيط، ص ٥١٢، مختار الصحاح، ٣٦١.

وشەی (نحس) (النَّحْس: ضِدُّ السَّعد، نَحِسَ الشيءُ)[1]، (نَحْس) پێچەوانەی (سَعْد)ە، (سَعْد)، واتە: خێردارو خۆشبەختی، وە (نَحْس)، واتە: بێخێرو شووم.

٣) لە سوورەتی (الأحقاف) لە ئایەتەکانی : (٢٤و ٢٥)دا، خوای دادگەر باسی چۆنیەتی سزادانی گەلی عاد دەکات، دیارە دەبێ چەند ڕۆژێك بووبێ، یان ماوەیەك بووبێ بارانیان نەدیبێ، ئنجا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان زیدەڕۆیی دەکەنو دەڵێن : حەوت (٧) ساڵ بووەو، هەندێك دەڵێن : سێ (٣) ساڵ بووە، بارانیان نەدیوەو هەور نەهاتۆتە سەر وڵاتەکەیان، ئەوانەش خاوەنی پیشەی کشتوکاڵو ئاژەڵداریی بوون، بۆیە زۆر پێویستییان بە ئاوو باران بووە، ئیدی خوای کاربەجێش ئاوا سزای داون، هەڵبەتە من ناڵێم سێ ساڵ، یان حەوت ساڵ بووە، چونکە شتێکی وا دەبێ لە ڕێی وەحییەوە بزانرێ، هیچ بەڵگەیەکی واشمان لەبەردەستدا نیە، بەڵام وادیارە ماوەیەکی زۆر بووە، ساڵێك بووە، یان چەند مانگێك بووە، زۆر چاوەڕێی ئاوو باران بوو ون، ئیدی پەڵە هەورێکیان بینیوە، دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا﴾، واتە: بۆیە کاتێك بینیان پەڵە هەورێك بەرەو دۆڵو نشیوو کێڵگەکانیان دێ، گوتیان: ئەوە هەورێکە بارانمان بۆ دەبارێنێ، (دیارە هوود ، پێی گوتوونو هەڕەشەی لێکردوون، کە ئەگەر وەڵامم نەدەنەوە، ئەوە خوا سزاتان دەدات، ئەوانیش هەر گوێ قوڵاغو لەسەر هەست بوون، ئنجا کە ئەو هەورەیان بینیوە، گوتوویانە: ئەوە لە جیاتی ئەوەی قسەکەی هوود ڕاست دەربچێ، کە سزامان بۆ بێ، ئەوە هەورو بارانمان بۆ هات)، خوا دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ﴾، بەڵکو ئەمە ئەوەیە کە پەلەتان لێکرد، چونکە لە چەند شوێنان دەفەرموێ، بە هوودیان گوتووە: دەی بۆمان بێنە، با خوا سزامان بدات! ئەمە ئەوەبوو کە پەلەتان لێدەکرد، ﴿رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، بایەکە ئازارێکی بە ئێشی تێدایە.

---

١) مختار الصحاح، ٦٤٩.

وشەی (ریاح) لە قورئاندا هەمیشە بۆ ئەو بایانە بەکاردێ، کە بەرهەمدارنو سەربەخێرن: بەلەمو کەشتیی دەڕوێنن بە لە باریی، بۆ کشتوکاڵ باشن، بۆ مرۆڤ و ئاژەڵ باشن، یاخود هەورەکان دێننو باران بارینیان بە دوادا دێ.

بەڵام ئەگەر بۆ سزادان بێ، ئەوە وشەی (ریح) بەکارهاتوە، واتە: بە تاك (مفرد)، بایەکە سزاو ئازارێکی بە ئێشی تێدایە، ﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا ﴾، هەموو شتێك بە فەرمانی پەروەردگاری وێران دەکات، واتە: هەموو شتێك کە خوا مەبەستی بێ وێرانی بکات، ئەگەرنا بێگومان کەونو کائیناتی وێران نەکردوە! (كُلَّ شَيْءٍ)، لێرەدا زانایان گوتوویانە: یانی: ئەو شتانەی کە پێویست بووە وێرانیان بکات، کە ژیانی گەلی عادیان پێوە بەستراوە، ﴿ فَأَصْبَحُوا لَا يُرَى إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ ﴾، ئیدی سەرەنجام وایان لێهات، تەنیا ماڵو حاڵەکانیان دەبینران، یانی: خانووەکانیان هیچ کەسیان تێدا نەمابوو، ﴿ كَذَلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴾، ئاوا کۆمەڵی تاوانباران سزا دەدەین.

٤) لە سوورەتی (الذاريات)یش دا، خوای پەروەردگار باسی چۆنیەتی فەوتاندنی گەلی عاد دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ ﴾، واتە: وەك چۆن مووساو گەلی مووسا کە لەگەڵ فیرعەوندا ڕووبەڕووبوونەتەوە، چەندان نیشانە هەن لەسەر بەرزییو باڵادەستیی خوا، بۆ پشتیوانیی بڕواداران‌و، تۆڵەستاندنی خوا لە بێبڕوایان.

هەروەها لە گەلی عادیشدا دیسان نیشانەو بەڵگە هەن بۆ باڵا دەسەڵاتیی خوا، بۆ ئەوە کە ئەگەر خەڵکێك لە خوا هەڵگەڕێتەوەو بە قسەی پێغەمبەرانی نەکات، سزای دەدات، هەر لە دنیادا پێش دواڕۆژیش، ﴿ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ ﴾، واتە: کاتێك بایەکی نەزۆكو بێخێرمان نارده سەریان.

وشەی (ریح) وەك گوتمان: بۆ سزادان بەكاردێ، (عقیم)، واتە: بێخێر، لە ئەسڵدا بە ژیانداریَك دەگوترێ كە زاوزێی نەبێ، یانی وەچەی نەبێ، ئنجا لەوەوە خوازراوەتەوە بۆ هەرشتێك كە بەرهەمی نەبێ، بەڵكو بێخێرو بە زەرو زیانبێ، ئایا ئەو بایە بێخێرو نەزۆكە چی پێكردن؟ ﴿ مَا تَذَرُ مِن شَىْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴾، هیچ شتێكی بەجێ نەدەهێشت كە بەسەریدا دەرۆیی، مەگەر وەك خۆڵەمێشی لێدەكرد.

(رمیم)، یانی: خۆڵەمێش، یان هەرشتێكی دیكە كە تێكدەشكێنرێ‌و دەكەوێتە سەریەك.

٥) لە سوورەتی (النجم)یشدا هەر لەوبارەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: خوا عادی یەكەمیشی فەوتاندو، گەلی سەموودیشی فەوتاند، واتە: هیچی لێ نەهێشتن، وەك لە كوردەوایی دا دەڵێن: (چوێلەكە كوژیان نەما).

٦) لە سوورەتی (القمر)یش، لە چوار ئایەتەكانی: (١٨و ١٩و ٢٠ و ٢١)دا، تیشكی زیاتر دەخاتە سەر ئەو رووداوە، دیارە لە هەر شوێنێك، بەپێی سیاقی ئایەتەكان‌و بەپێی چۆنیەتی بابەتەكەو، ئەو هەلومەرجەی ئەو ئایەتانەی تێدا دابەزیون‌و، بە پێی ئەو بابەتەی كە ئەو زنجیرە ئایەتە قسەی لێ دەكەن، خوای پەروەردگار باسی لایەك‌و گۆشەیەكی ئەو بابەتە دەكات: ﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: گەلی عاد (ئایەتەكانی خواو پێغەمبەری خوایان) بە درۆ دانا، ئنجا ئایا هەڕەشەو ترساندنی من (سەرەنجامەكەی) چۆن بوو؟! ئێمە بایەكی زۆر ساردو تێكشكێنەرو دەنگ بەهێزمان نارده سەریان، لە رۆژێكدا كە شوومیی‌و بێخێرییەكەی بەردەوام

بوو. خەڵکی (لەو شوێنانەی خۆیانیان تێدا حەشاردا بوو) دەردەهێنا وەك بنکی دارخورمای کە لە ڕەگەوە هاتبێ (ئاوا دەکەوتنە گوڕێ). ئایا سزاو جەزرەبەو ترساندنی من، چۆن بوو؟

(أعجاز) کۆی (عَجُزْ)، (عَجُز: مُؤَخّر الشيء يذكر ويؤنّث، جمعُهُ أَعْجَاز)[1]، واتە: (عَجُز) هەم بۆ نێر بەکاردێ، هەم بۆ مێ، دەگونجێ بڵێی: (هَذِهِ عَجُز، وَهَذَا عَجُزٌ)، بە (أعجاز) کۆدەکرێتەوە، بە بەدواوەی هەر شتێك دەگوترێ.

ئنجا دەگوترێ: (قَعَرْتُ الشَّجَرَة: قَلعْتُها مِنْ أَصْلِها فَانْقَعَرَتْ، والقَعْرُ للبئر وَغَيْرِها العُمْق)[2]، واتە: درەختەکەم لە ڕەگەوە هێنا، هەڵمقەند، وشەی (قَعْر) بۆ بنی بنەوەی بیرو چاڵ بەکاردێ، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ﴿٢٠﴾ ﴾، خەڵکی دەردەکێشا وەك بنكو ڕەگو ڕیشەی دارخورمای هەڵقەنراو، وەك چۆن ڕەگو ڕیشەی دارێك لە بنەوە هەڵدەقەنرێ، دەبێ ئەو بایە کە لێیداون سەریان پەڕیبێ، وەك دارخورمایەك کە لە ڕەگەوە دەردەکێشرێو هەڵدەقەنرێ، یاخود ڕەنگە بایەکە لە هەر شوێنێکی داون، قڵت قڵتی کردبن.

لە هەندێ تەفسیرەکاندا هاتوە: کە گەلی عاد لە نێو بیران، یاخود چاڵان دابوون، بە یەکدییان دەگوت: ئەرێ بۆچی سەر دەرناهێنی، بزانە بایەکە هەر ماوە؟ ئنجا لەوکاتەدا کە یەکیان سەری خۆی دەردەهێنا، ئەوەندەی بەر بایەکە دەکەوت، سەری دەبرد!! هەڵبەتە ئەوەش ڕەنگە جۆرێك بێ لە زیدەڕۆیی، بەڵام ئەوەش لە قورئاندا هاتوە کە بایەکە ڕای دەکێشان‌و هەڵیدەقەندن، دیارە لە نێو چاڵەکانیش دەریهێناون.

٧) لە سوورەتی (الحاقة) ئایەتەکانی: (٦و ٧و ٨)، لەو سێ ئایەتەشدا، خوا ﷻ بە جۆرێکی دیکە چۆنیەتی ئەو سزادانەی گەلی عاد، دەخاتەڕوو، دەفەرموێ :

---

١) مختار الصحاح، ص ٤٢٣.

٢) مختار الصحاح، ص ٥٤٥.

﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: بەڵام گەلی عاد فەوتێنران بە بایەکی زۆر ساردو بەهێزی لە سنوور دەرچوو، (واتە: لە سنووری بای ئاسایی دەرچوو بوو). حەوت شەو هەشت ڕۆژان ئەو بایەی لە ڕاست ڕاهێنانو تێیەبردان، وە بایەکە بە دوای یەکدابوو، ئیدی ئەو کۆمەڵە خەڵکەت دەبینی (لە شارو شوێنەکانی خۆیاندا) کەوتبوون، وەك بنکی دارخورمای دارماو. ئنجا ئایا کەسیانت لێ دەبینی، مابێتەوە؟ (بە دڵنیایی نەخێر).

وشەی (عَاتِيَةٍ) دەڵێ: (العاتية : شديد العصف) واتە: بایەکی زۆر بەهێزو دەنگێکی بەهێزی هەبێ، (العاتِي: المجَاوِزُ للْحَدِّ فِي الإِسْتِكْبَارِ، وَالعاتِي: الجَبَّار)[1]، (عاتِي) ئەوەیە کە لە سنوور دەرچێ لە خۆ بەزلگریی دا، ئەوە بۆ مرۆڤان، بەڵام بۆ (با)، یانی: لە سنوور دەرچێ لە هێزدا، هەروەها (عاتي) بە مانای (جَبّار)یش دێ، کەسێك کە خەڵك ناچار بکات، دیارە ئەو بایەش خەڵکی زۆر ناچار کردبوو و بە دوای کەسێکدا دەگەڕا، خۆی لێ پەنهان کردبێ، کە بەوەش هەر دەربازیان نەدەبوو.

کە دەفەرموێ: (حُسُومًا) (حَسَمهُ: قطعهُ، وحسوماً، أي: مُتَتَابِعَة، وَقِيلَ: الحُسومُ: الشؤمُ، لأنَّها تَحْسِمُ الخَيْرَ عَنْ أَهْلِهَا، وَالحُسام السَّيْفُ القَاطِع)[2]، (حسم) بە مانای (قطع) دێ، (حَسَمَه) واتە: بڕی، (حُسوم) واتە: بایەکە بەدوای یەکدا دەهات، وە (حسوم) بە مانای نەگبەتییو بێخێرییش دێ، چونکە خێر لە خەڵکەکە دەبڕێ، هەر بۆیەش ناو لە شمشیری بڕندە (السَّيْفُ القَاطِع) نراوە: (حُسام)، واتە: شمشێرێك کە زۆر بڕندەیەو لە هەر شتێکی بدەی، دەیبڕێ.

---

١) مختار الصحاح، ص ٤١٢.

٢) مختار الصحاح ص١٢٦.

☜ دەفەرموێ : (خَاوِيَةٍ ) (خَوَتِ الدَّارِ تَخْوِي خواءً: أَقْوَت وَسَقَطَت)[١]، دەگوترێ: (خَوت الدَّار تَخْوِي خواءً)، واتە: (أَقْوَت) خاڵی بۆوە، کەسی تێدا نەمابوو، یاخود (خَاوِيَة)، واتە: خانووبەرەکان هەموو کەوتبوونو ڕووخا بوون، تێك ڕما بوون، لە شوێنێکی دیکەدا باس دەکات دەفەرموێ : ﴿ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً ﴿٥٢﴾ ﴾النمل، ئەوانە ماڵەکانیان بوون، خاڵیی بوون، کەسیان تێدا نەمابوو، یان: خانووەکانیان دارِمابوون.

که دەفەرموێ: (صرعى)، (صَرَعه: أي طرحهُ أرضاً، والصَّريع جمعُهُ صرعى: المصْرُوع)، (صريع) (فعيل)ە، بە مانای (مفعول) واتە: (مصروع) واتە: لە زەویدا کەوتبوو، بە مردوویی، بە بێ گیانیی.

٨) لە سوورەتی (الفجر)یش، ئایەتەکانی: (٦ و ٧ و ٨)دا خوای پەروەردگار باسی گەلی عاد دەکات، دەفەرموێ : ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: ئایا نەتبینی، یان نەتزانی پەروەردگارت چی بە عاد کرد؟ (واتە: مێژوو بخوێنەوەو سەرنج بدەو بە شوێنەوارەکاندا بگەڕێ، بەدواداچوونی بۆ بکە، بزانە چی پێکردن؟). (کۆشكو قەڵایەکانیان) خاوەن پایەی بەرز بوون. ئەو گەلی عادەی کە وێنەی وان لە وڵاتدا دروست نەکرا بوو.

هەر بۆیە ئەوانیش بیناسازییەکی وایان هەبووو، کۆشكو قەڵای وایان دروست کرد بوو، دینگەو پایەی وایان دابوونەبەر کە ڕەنگە کەسی دیکە نەتوانێ بینای وا دروست بکات، بینای ئاوا بەهێزو پێزو خۆڕاگر.

که دەفەرموێ : ﴿ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴾، (عاد) بە ﴿ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴾، واتە: ئیرەمی خاوەن پایەو دینگە، تەفسیر دەکات، کە ڕەنگە خەڵکی دیکە بووبێ،

---

١) مختار الصحاح ص١٩٤.

بە ناوی عاد، چونکە لە شوێنێکی دیکەشدا دەفەرموێ : ﴿ وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾النجم، ئەوە کە (خوا) عادی یەکەمی لە نێو برد.

دیارە گەلی دیکەش هەبووە، بە ناوی عاد، بەڵام ئەمەیان بە ئیرەم ناسراوەتەوە، هەندێکی دیکەش گوتوویانە: ئیرەم ناوی شارێکی گەورەی ئەوان بووە[1].

ئێستاش لەبەر ڕۆشنایی تەفسیرکردنی ئایەتەکانی سووڕەتی (هود)دا، لە چوار مەسەلەدا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر بەسەرهاتی هوود عليه السلام و گەلەکەی عاد.

---

(1) المعجم الوسيط ص٥١٣.

## چەند مەسـەلەیەکی گرنـگ

**مەسەلەی یەکەم:**

**لە ئایەتەکانی: (٥٠و ٥١و ٥٢)دا، خوای پەروەردگار باسی ڕەوانەکرانی هوود ﷺ بۆ لای گەلەکەی عاد دەکاتو، دەستکردنی بە ڕاگەیاندنی پەیامی خوا پێیانو، دڵخۆشکردنیو ترساندنی بۆیان.**

﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَا قَوْمِ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى الَّذِي فَطَرَنِي ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾ وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەو چوار ئایەتە لە (١٠) برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ﴾، ئنجا بۆ لای گەلی عاد هوودی برایانمان نارد، چونکە پێشتر فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ ﴾هود، لێرە پێویست ناکات بفەرموێ: (أَرسَلنا) یەکسەر دەفەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ﴾، یانی: ناردمانە لای گەلی عاد، هوودی برایان، کەواتە: هوود لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە لە گەلی عاد بووە، بۆیە هەموو جارێکیش گوتوویەتی: (یا قوم، یا قوم)، ئەی گەلەکەم! ئەی

گەلەکەم! وەك لە سوورەتی (الأحقاف)دا دەفەرموێ : ﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾﴾، واتە: یادی برای عاد بکەوە، یانی: هوود، کە گەلەکەی خۆی ترساندو وریای کردەوە لە ئەحقاف[1]، کە وریاکردنەوەکان، (یاخود پێغەمبەران) لەملاو لایانەوە، (یاخود لە پێشیانەوەو لە دوایانەوە)، تێپەڕی بوونو خەڵکیان وریا کردبۆوە. (ئنجا ئایا ترساندنو وریاکردنەوەکەی ناوەڕۆکەکەی چی بوو؟) جگە لە خوا مەپەرستن، من مەترسیی سزای ڕۆژێکی مەزنتان لێدەکەم، (ئەگەر بێتو هەر لەسەر وەزعی خۆتان بەردەوام بن).

**بڕگەی دووەم :** ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾، باسی چۆنیەتی پەیام گەیاندنەکەی دەکات، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، جگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکەتان نیە، ئەم ڕستەیە دەستپێکی بانگەوازو پەیامی سەرجەم پێغەمبەران بووە، سەلامی خوایان لەسەر بێ، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا باسمان کرد، لەسەر زمانی نووح ﷺ لە ئایەتی (٥١)دا، هوود ﷺ لە ئایەتی (٦٥)دا، صالح ﷺ لە ئایەتی (٧٣)دا، شوعەیب ﷺ لە ئایەتی (٨٥)دا، ئەم ڕستەیە دووبارە بۆتەوە: ﴿يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾، واتە: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکەتان نیە.

لە ڕاستییدا گرفتی مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو، بریتی نەبووە لە ئیلحادو دان نەهێنان بە بوونو بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتییو خاوەندارێتیی خوادا،

---

١) (أحقاف) کە کۆی (حقف)ە، (حقف)یش بە لمێك کە خوار بووبێتەوەو هەڵچنرابێ، بە هۆی باوە، کە شەپۆلی با لێی دەدات بێگومان لە بیاباندا وایە، با ئەو لمە خوارو خێچ دەکاتو ئنجا هەڵی دەچنێتە سەریەك، کە شوێنی نیشتەجێ بوونی گەلی عاد لەو بیابانە دا بووە.

بەڵكو بریتی بووە لە هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)و، لە چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ خوادا، مرۆڤ تووشی لارێ بوونو لادان بووە، نەك لە دان پێدانەهێنانیدا، حاڵەتی ئیلحادو دان بە بوونی خوادا نەهێنان، حاڵەتێكی زۆر دەگمەنو ڕیزپەڕو كەم بووە، ئێستاشو ئەو كاتیش، خەڵك خوای ناسیوە، بەلام لە مامەڵەكردن لەگەڵ خوادا، بە هەڵەدا چوون، دروستكراوەكانی هێناوەتە ڕیزی خوا، یاخود ئاستی خوای نزم كردۆتەوە بۆ ئاستی هەندێك لە دروستكراوەكانی، وەك لە سووڕەتی (الشعراء)دا خوا ﷻ لەسەر زمانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دەفەرمـــــــوێ : ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەكی ئاشكرادا بووین. كاتێك ئێوەمان یەكسان دەكرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانیاندا.

ئنجا یان هەندێك سیفەتیان بۆ پەرستراوەكان داناون، كە هی خوا بوون، واتە: خوای پەروەردگاریان هێناوەتە ڕیزی پەرستراوەكان، یان ئەوانیان بەرز كردۆتەوە، بۆ ڕیزی خوا، كە ئا ئەوە كاكڵەی شیركە.

<u>بڕگەی سێیەم :</u> ﴿إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ ﴾، هوود عليه السلام بە گەلەكەی دەڵێ : ئێوە بەس هەڵبەستەرن، واتە: بەس درۆ هەڵدەبەستن، كە دەڵێن: خوا هاوبەشی هەیە، چونكە ئێوە هیچ بەڵگەیەكتان نیە، ئەوە هەر قسەیەكەو لە گیرفانی خۆتانی دەردەهێننو درۆ دەكەن، چونكە (إفتراء)، بریتیە لەوەی كەسێك درۆ بكاتو، بشزانێ كە درۆ دەكاتو، قسەكەی هیچ بنەمایەكی نەبێ.

<u>بڕگەی چوارەم :</u> ﴿ يَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا ﴾، ئەی گەلەكەم! ئەی كۆمەڵگاكەی من! من هیچ كرێو پاداشتێكتان لێ داوا ناكەم، واتە: هیچ تەماعم لە سەروەتو سامانی ئێوەدا نیەو بارگرانییم نیە بۆ سەر ئێوە.

<u>بڕگەی پێنجەم :</u> ﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، پاداشتو كرێی من تەنیا لەسەر ئەو كەسەیە كە منی هێناوەتە بوون، ئایا نافامن؟ كە خوایەك منی دروست كردبێ، دەشتوانێ بمژیەنێ؟

ئایا خوایەك كە منی بۆ لای ئێوە ناردوە، ئاگادارتان بكەمەوەو بتانترسێنمو، بەندایەتیی كردن بۆ خواتان فێر بكەم، بێنیازو بێمنەتی نەكردووم لە ئێوە؟! ئایا چاوم لە دەستی ئێوە دەبێ؟ ئایا ئەو خوایە عیززەتی نەفسێكی وای پێ نەبەخشیوم، كە چاو نەبڕمە سەروەتو سامانی ئێوە؟ ئایا نافامن؟ واتە: ئەگەر بفامن، دەبوو بزانن كە پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ، بەو شێوەیەن، هەڵبەتە دەبێ شوێنكەوتووانی پێغەمبەرانیش هەروابن، نابێ چاویان لە دەستی خەڵك بێ، وە دەبێ لە خەڵك بێمنەت بنو، بە هیچ شێوەیەك نابێ لە پەنای دیندا بۆ دابینكردنی ژین بگەڕێن.

بەڵێ ئەگەر كەسێك خۆی تەرخان بكات بۆ خزمەتی دینی خوا، لە نێو خەڵكدا كە پەیامی خوایان پێ ڕابگەیەنێ، پێویستە خەڵك لە لایەن خۆیانەوە دەستباری بگرن، مەبەستم لە مامۆستایانێكە كە خزمەت دەكەن، ئەوە جێی خۆیەتی، بەڵام مامۆستا نابێ لە بەرانبەر ئەوەدا كە خەڵك دەیژیەنێ، دینی خوایان تێبگەیەنێ، بەڵكو دەبێ كارەكەی خۆبەخشانە بكاتو، هیچ چاوەڕوانییەكی لێیان نەبێ، بۆ ئەوەی چاوبەرەژێرو منەتباریان نەبێ، دوایی بڵێن: تۆ بە نانو بەرگی ئێمەی! ئەو كاتە قسەی لێ وەرناگرن.

<u>**بڕگەی شەشەم**</u> : ﴿ وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ﴾، واتە: ئەی گەلەكەم! داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن.

(الإستغفار: طَلَبُ المغْفِرَة)، كەواتە: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن، یانی: دان بە هەڵەكانتان دابێننو، خۆتان لە هەڵەو كەموكوڕییەكان دەرباز بكەن، ئەمە پێی دەگوترێ: (التخلية) بە زاراوەی ئەهلی تەصەووف، واتە: جارێ پاكسازیی خۆتان بكەنو خۆتان پاك بكەنەوە لە هەڵەكانتان.

<u>**بڕگەی حەوتەم**</u> : ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾، ئنجا دوایی بگەڕێنەوە بۆ لای خوا. واتە: پێش ئەوەی بگەڕێیەوە بۆ لای خوا، دەبێ یەكەمجار پاكسازیی بكەی، ئنجا بەكەڵكی چاكسازیی دێی، پێشێ دەبێ خۆت بژار بكەی، ئنجا دەتوانی بڕازێیتەوە، زەوییەك پێشێ دەبێ هەڵیوێژێری، بەردو دارو دڕكی لێ لابەی، ئنجا دەتوانی

تۆوی تێدا بچێنی، یان نەمامی تێدا بنێژی، ئێوەش پێشێ پاکسازیی بکەن و خۆتان بژار بکەن، ئنجا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بە کردەوەی چاك و بە تاعەت.

**بڕگەی هەشتەم :** ﴿يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾، باران، (یان هەورتان) بۆ دەنێرێ، ئاوێکی زۆر بە خوڕزەمتان بەسەردا دەبارێنێ.

(سَماء) هەم بە مانای باران هاتوە هەم بە مانای هەور (سحاب) هاتوە، (مدرار)یش، واتە: ئاوێکی بە خوڕزەم.

**بڕگەی نۆیەم :** ﴿وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ﴾، هێزی دیکەش دەخاتە گەڵ هێزتان، خۆتان چەند بەهێزو قوەتن و، خاوەنی هەیکەلی گەورەن، زیاتریش بەهێزتان دەکات، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە بە ڕاستیی ئیمان و تاعەت، دەبێتە مایەی ساغیی مرۆڤ و دەبێتە هۆی هێزو پێزی مرۆڤ، هەروەك و چۆن گوناهو تاوان دەبێتە مایەی دەردو نەخۆشیی و بێهێزیی مرۆڤ .

**بڕگەی دەیەم :** ﴿وَلَا تَتَوَلَّوْا۟ مُجْرِمِينَ﴾، واتە: تاوانبارانە پشت مەکەنە من و ئەو بانگەوازەی خوا پێی دا ناردووم، واتە: پشتم تێ مەکەن، لە کاتێکدا خۆشتان بە تاوانباریی و خراپەکاریی کردۆتە خاوەن وەسفی تاوانباران.

**مەسەلەی دووەم :**

## بەربەرچدانەوەی ناقۆلای گەلی عادو، تۆمەتبارکردنی بە بێ بەلگەیی و، تێکچوونی عەقڵ:

خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾.

**ئەم مەسەلەیەش لە چوار برگەدا دەخەینە روو:**

**دوای ئەوەی هوود ﷺ پەیامەکانی خوای پەروەردگاری بە گەلەکەی گەیاندن، وەك لە تەفسیری ئایەتەکانی: (٥٠و ٥١و ٥٢)دا باسمان کرد، ئنجا لە ئایەتەکانی: (٥٣و ٥٤)دا، باسی وەلامی گەلی عاد دەکات بۆ هوود ﷺ، چۆن بەربەرچیان دایەوەو، چییان گوت، لە بەرانبەر ئەو هەموو دڵسۆزیی و پەرۆشیی و بە تەنگەوە بوونی هوود دا ﷺ بۆ گەلەکەی خۆی؟!:**

**برگەی یەکەم :** ﴿ قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ ﴾، **گوتیان ئەی هوود! هیچ بەڵگەو موعجیزەیەکی روون و ئاشکرات بۆ نەهێناوین.**

**کە بێگومان ئەمە تۆمەتەو تۆمەتێکی بێ بنەمایە، چونکە خوا ﷻ هەر لەم سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ :** ﴿ وَتِلۡكَ عَادٞۖ جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ ﴿٥٩﴾ ﴾، **خوای پەروەردگار وەك دوور ئاماژەیان پێ دەکات: ئا ئەوانە گەلی عاد بوون کە فەوتێنراون و فرێدراونە زبڵدانی مێژوو، چونکە نکووڵییان لە نیشانەکانی پەروەردگاریان دەکرد .**

**ئنجا (آيات) دەگونجێ مەبەست پێی رستەو برگەکانی فەرمایشتی خوا بێ، بەلام دەشگونجێ مەبەست پێی موعجیزەکانی پێغەمبەران بێ، دەشگونجێ**

مەبەست پێی ئەو دیاردەو دیمەنە سروشتییانە بن، کە ناوو سیفەتەکانی خوایان تێدا دەدرەوشێنەوەو، بێگومان ئەوانە بە هەموو جۆرە نیشانەو موعجیزەکانی خوا بێبڕوا بوونو نکووڵییان لێ کردوون.

هەروەها لە سوورەتی (الحدید)یشدا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ڕوونو ئاشکراکانەوە ناردوون ...

هەروەها پێشتریش باسمان کرد، کە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا کە بوخاریو موسلیم هێناویانە، دەفەرموێ : {ما مِنَ الأنبياءِ نَبيٌّ إلاَّ أُعْطِي ما مِثلُهُ آمَنَ عَلَيهِ البَشَرُ، وَإنَّما كانَ الَّذي أُوتيتُ وَحيا أوحَاهُ اللهُ إلَيَّ، فأرْجو أنْ أكونَ أكثَرَهُمْ تابِعا يَومَ القِيامَةِ} {رَوَاهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلم، برقم: (٣٨٣)، عَنْ أبي هُرَيرَة رضي الله عنه} .

واتە: هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) نەبووە، کە بەڵگەیەکی پێ نەدرێ، لەسەر ئەوە خەڵك ئیمانی پێ بێنن (بزانن کە ڕاست دەکات) ئەوەی بەمن دراوە لەو بوارەدا، وەحییە بۆم هاتوە، (واتە: ئەوەی کە پێم دراوە، وەك بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتییم وەحیو پەیامو بەرنامەی خوایە)، بۆیە ئومێدم وایە کە لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بن.

چونکە موعجیزەی وی دەمێنێتەوە، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەرانی دیکە (علیهم الصلاة والسلام) بە وەفاتی خۆیان کۆتایی یان پێهات، حیکمەتی ئەوەش: چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر کامێکیان بۆ قۆناغێكو هەلومەرجێكو، بۆ گەلو میللەتێکی دیاریکراو هاتوونو، موعجیزەکەیان هەر ئەوەندە پێویست بووە، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی بۆ هەموو بەشەر هاتوە بە پانایی زەمینو بە درێژایی زەمان، بۆیە موعجیزەکەشی هەموو ڕۆژگارێكو سەرلەبەری زەمینی گرتۆتەوە.

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ ﴾، واتە: ئێمە وازلێهێنەری پەرستراوەکانمان نابین بەهۆی قسەی تۆوە، (دەستیان لێ هەڵناگرین).

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: ئێمە بۆ تۆ نابینە بڕوادار.

ئەم تەعبیرە وادەگەیەنێ، کە ئەگەر بێتو ئەوان بڕوا بێنن، سوودەکەی بۆ هوود بێ سەلامی خوای لەسەر بێ! نەخێر، نە هوود ﷺ نە هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا، بەوە پاداشتیان لەلای خوا کەم نەبۆتەوە، کە خەڵکەکە بڕوای پێ نەهێناون، بۆچی؟ چونکە ئەوان ئەو ئەرکەی لەسەر شانیان بووە جێبەجێیان کردوە، کەواتە : ﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ...﴿٩٩﴾ ﴾المائدة، واتە: پێغەمبەر بەس گەیاندنی لەسەرە، ﴿ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾ النور، واتە: پێغەمبەر تەنیا گەیاندنی روونکەرەوە (یان ڕۆشن)ی لەسەرە. بۆیە هەر کات بە ڕوونیی‌و بێ پێچ‌و پەناو بە ئاشکرا، پەیامی خوایان گەیاند، ئەو کاتە بەرپرسیارێتیی دەکەوێتە سەر ئەستۆی خەڵك، ئنجا ئەگەر خەڵك وەڵامیان دایەوە، ئەوە بە سوودی خۆیانەو خۆیان قازانجیان کردوە، ئەگەر وەڵامیشیان نەدایەوە، خۆیان زیانیان کردوە، بەڵام پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ، زیانبار نەبوون، بەهۆی وەڵام نەدانەوەی ئەوانەوە، بەڵێ، پێیان خۆش بووە خەڵکەکە وەڵام بداتەوە، بەڵام کە وەڵامیشیان نەداوەتەوە، بەس خۆیان زیانبار بوون.

ئنجا دەڵێن : ﴿ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: ئێمە بەهۆی قسەی تۆوە بڕوا ناهێنین.

ئەوانە لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوون، چونکە هەمیشە بەو شێوەیە خەڵکیان دیوە، کە هەر شتێك بکەن، دەبێ سوودێکی بۆیان هەبێ، نەیانزانیوە کە پێغەمبەران ﷺ لە جۆری خەڵکی دیکەنین‌و، لەو جۆرە کەسانە نین کە چاوەڕوانییان لە خەڵکی هەبێ‌و، لەو جۆرە کەسانە نین کە بیانەوێ

لەسەر حیسابی خەڵك‌و، لەسەر حیسابی لە نەزانیی‌و نەفامیی دا هێشتنەوەی خەڵك، خۆیان قازانج بکەن، پێغەمبەران قازانجیان لەوەدا بووە کە خەڵك ئازاد بێ‌و، ئازابێ‌و، هۆشیاربێ‌و، بێداربێ، نەك وەك طاغووت‌و حوکمڕانە ستەمکارەکان کە دەیانەوێ خەڵك لە نەزانیی‌و نەفامییدا بهێڵنەوە، بۆ ئەوەی خۆیان قازانج بکەن، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سوودو قازانجی خۆیان لەوەدا دۆزیوەتەوە، کە خەڵك هۆشیارو بێداربێ‌و، ئازاو ئازاد بێ، چونکە بێگومان هەر کەسێك ئامانجی باشی هەبێ، خەمیشی بۆ لە ئامرازی باش دەخوات، بەڵام ئەگەر کەسێك ئامانجی خراپ بێ، کە بریتیە لە خۆ سەپاندن‌و قۆرخکاریی، دیارە مشووری ئامرازو هۆکارو شێوازێکیش دەخوات کە لە قەدەر ئامانجەکەی بێ، هەمیشە گوتوومە: ئامانجی باش ئامرازی باش دەخوازێ‌و، ئامانجی خراپ ئامرازو شێوازی خراپ دەخوازێ، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ)، (ڕاوچی خراپ لە ئاوی لێڵدا ڕاو دەکات).

<u>بڕگەی چوارەم</u> : ئنجا گەلی عاد هەر بەوەندەش واز ناهێنن، بەڵکو زیاتریش هوود ﷺ تۆمەتبار دەکەن‌و دەڵێن : ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖ﴾، واتە: ئێمە قسەمان هەر ئەوەیە کە دەڵێین: هەندێك لە پەرستراوەکانی ئێمە، بە خراپە دەستیان گەیاندۆتە تۆ دەستیان لە تۆ وەشاندوە.

مەبەستیان ئەوە بووە کە عەقڵیان تێکداوی!

سبحان الله! مرۆڤ کە دایە بێ عەقڵیی، لە هەموو شتێك کەودەنترو نەفامتر دەبێ، ئەوە قسەی خۆم نیە، خوای پەروەردگار وا دەفەرموێ : ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ١٧٩﴾الأعراف، ئەوانە وەك ئاژەڵن، بەڵکو لە ئاژەڵیش گومڕاترن، ئەوانەن بێ ئاگایان، چونکە ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ئاژاڵ نەبێ.

خوای بەرز لە سووڕەتی ئەعرافدا قسەیەکی دیکەش دەگێڕێتەوە، لە دەستڕۆیشتووانی گەلی عاد، کە وا پێدەچێ ئەو قسانە بەس قسەی

دەستڕۆیشتووەکانیان بن، چونکە خەڵکی ڕەش‌و ڕووت، مەگەر حوکمڕان‌و دەستڕۆیشتووە خۆسەپێنەکان، لە پێغەمبەرانیان، یان لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانیان بەردابن‌و هان دابن، ئەگەرنا بۆخۆیان هیچ دەعوایان لە دژی پێغەمبەران نەبووە.

ئنجا کە لە سوورەتی (هود)دا بە ناو گەلی عاد دەیهێنێ، لە سوورەتی (الأعراف)دا، بە ناوی (ملأ) دەیهێنێ، دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٖ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾، واتە: ئەو دەستڕۆیشتووە بێبڕوایانەی گەلەکەی گوتیان: ئێمە تۆ لە نەفامییدا دەبینین‌و، ئێمە دڵنیاین لەوەی کە تۆ لە درۆزنانی.

هەڵبەتە ئەمە گەورەترین بێئەدەبیی‌و بێنەزاکەتیی بووە بەرانبەر بە هوود ﷺ، کە دەستڕۆیشتووان‌و قسە بە دەستانی گەلی عاد کردوویانە، لە حاڵێکدا کە زانیویشیانە درۆ دەکەن، بەڵام ئەدی ئەو خەڵکە ڕەش‌و ڕووتە، چۆن لە نەفامیی‌و نەزانیی خۆیاندا بهێڵنەوە؟ دەبێ ئەو پێغەمبەرە سەلامی خوای لەسەر بێ، تۆمەتبار بکەن، بڵێن: شێتە، نەفامە، درۆ دەکات، بۆچی؟ بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە قەناعەت پێ بکەن: هەر لە پشتیانەوە بن‌و پشتیان بگرن، ئەگەرنا: گەورایەتیی بەسەر کێ دا بکەن؟ لافی پەروەردگارێتیی بەسەر کێ دا لێبدەن؟ موڵك‌و ماڵی کێ بۆخۆیان زەوت بکەن؟ خەڵك ئەگەر نەزان‌و نەفام نەبێ، چۆن کۆیلایەتیی بۆ مرۆڤێکی وەك خۆی دەکات؟ چۆن دەبێتە دەست‌و پێوەندی مرۆڤێکی وەك خۆی؟ بۆیە پێغەمبەران هەمیشە ویستوویانە عەقڵی خەڵك هۆشیار بکەن، دڵیان بێدار بکەن، بەڵام دوژمنانی پێغەمبەران: فیرعەون‌و نەمروودو طاغووت‌و قاروون‌و، ئەو خۆ بە زلگرو دەست‌و پێوەندو کاربەدەستانەی بەدەوریانەوە بوون، بە پێچەوانەوە ویستوویانە: خەڵك نەفام بێ‌و، دڵیشیان تاریك بێ، چونکە ئەگەر نەفام بوون، سوود لە نەفامیی‌و نەزانیی خەڵك دەبینن‌و، ئەگەر دڵیشیان بێدار نەبوو، سوود لە ویژدانی تاریکیان دەبینن.

**مەسـەلـەی سـێـیـەم :**

## وەڵامدانـــەوەی هـــوود ﷺ بۆ قســەو تۆمەتـــەكـانیــان :

لـەم چوار ئـایـەتەدا، کـە لـە دە (١٠) بڕگـەدا دەیـانخـەینــە ڕوو، هـــوود ﷺ، وەك سەرجەم پێغەمبەران زۆر قسەزانو لێزان بوونە، وەڵامی زۆر بەهێــزو ددان شكێنی داونەتـەوە، بەڵام بە نەزاكەتو ئەدەبــەوە :

**شـیـكـردنـەوەی ئـەو چـوار ئـایـەتـە لـە ( ١٠ ) بـڕگـەدا:**

**بـڕگــــەی یـەكــــەم :** ﴿قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ مِن دُونِهِۦ﴾، فـەرمـووی: من خـوا بە شـایـەد دەگرم، واتە: خوا چاودێرو ئـاگـادار بـێو، هـەمیشە ئـاگاداریشەو، ئێوەش ئـاگـاداربنو شـایـەد بن، كە من بەریـیـم لـەوانەی كە ئێـوە جگە لـە خـوا دەیـانكەن بە هـاوبەش بۆ خـوا، واتە: من لـێیـان بەرییم، حاشـایـان لـێدەكەم، لـێیـان بێـمنەتـم، لـێـیـان بێـباكـم، ئێوە نـاڵێن دەسـتیان لە تۆ وەشـانـدوە؟! دەی من لـێیان بێـمنـەتـمو ئێوە ڕاست نـاكەن، لـە ڕاسـتییدا مـن نـە دەستم لـێ وەشـێنـراوە نە حـاڵـیشـم تێكچووە، من زۆر لـە حـاڵـەتێكی تەندروسـتو ئـاسـایـیـدام.

ئـنجـا ئەمە مـانـایەكەی ئـاوای لـێدێتـەوە: (اللهُ يَشْـهَدُ وَأَنْتُـم اشْهَـدُوا بِبَـرَائِتِـي مِنْ أَصْنَـامِكُمْ)، خـوا شـایەدە، ئێوەش شـایەدیی بـدەن كـە مـن بەریـیــمو دوورمو حـاشـا دەكەم لـەو شـتـانەی ئێـوە دەیـانپـەرستن.

دیــارە وشـــەی (مــا) كـــە دەفەرمـــوێ : ﴿مِّمَّا تُشۡرِكُونَ مِن دُونِهِۦ﴾، (مــا مَوْصُولَـة، وَالعـائِدُ مَحْذُوفٌ) یـانی (مِمـا تُشْرِكـونَهُ) واتـە: ئـەوەی كـە ئێـوە دەیكەنە هـاوبەشی خـوا، یـانی: (التـي تجعلونهـا شركـاء)، واتـە: ئەوانـەی كـە دەیـانكەن بە هـاوبەش بۆ خـوا، من لـێیـان بەرییـمو حاشـایـان لــێ دەكەم.

**برگەی دووەم :** ﴿ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ﴾، هوود ﷺ بۆ ئەوەی زیاتر بۆیان دەربخات، کە قسەکەیان درۆیەو، لێیان بێباکەو بێمنەتە، دەڵێ: تێکراتان، هەموو پێکەوە، پیلانم لێ بگێڕن، چیتان لەدەست دێ بیکەن، هەمووتان پێکەوە نەك یەك یەك.

**برگەی سێیەم :** ﴿ ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴾، ئنجا هیچ چاوەڕوانییشم مەکەن، زوو چی لە دەستتان دێ بیکەن، دەڵێ: (إرْتَقَى إِلى رُتْبَةِ التعْجِيز والإحْتقار، فَنَهاهُمْ عَنِ التأخِير)، هوود ﷺ لە وەڵامەکەیدا پێ بە پێ هەڵدەکشێ، سەرەتا دەڵێ: من بەریم، دوایی دەڵێ: چیتان لەدەست دێ بیکەن، دوایی دەڵێ: چاوەڕوانییشم مەکەنو، هەڵدەکشێ بۆ پلەی دەستەوسان کردنو بە کەم تەماشاکردنیان، چونکە (ثم لا تنظرون)، یانی: لێیان قەدەغە دەکات کە چاوەڕوانیی بکەن.

**برگەی چوارەم :** ﴿ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم ﴾، بێگومان من پشتم بە خوا بەستوە، پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەشە. وشەی (رّب) واتە: پەروەردگار، خاوەن، گەورە، مشوورخۆر، پشتیوان، یانی: خوا پەروەردگارو خاوەنو مشوورخۆرو پشتیوانی منیشو ئێوەشەو من تەنیا پشتم بەو بەستوە.

**برگەی پێنجەم :** ﴿ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآ ﴾، هیچ بێرۆیەك نیە، هیچ ژیاندارێك نیە لەسەر زەوی، مەگەر خوا بگری پێشە سەرەکەیەتی.

(ناصیة) کە بە (نواصي) کۆ دەکرێتەوە، وەك لە سوڕەتی (الرحمن)دا، دەفەرموێ : ﴿ ... فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: تووکی پێشە سەریانو پێیەکانیان پێکەوە دەگیرێن.

(الناصِية: ما أنْسَدَلَ مِنَ شَعْـر الرَّأْسِ عَلَى الجَبْهَة)، (ناصِية) ئەو تووکی پێشە سەرەیە کە دێتە سەر نێوچەوان، ئەگەر کەسێك تووکی پێشە سەری کەسێك، یان وڵاخێك بگرێ، یانی: تەواو مەرزەمی کردوەو خستۆیەتە ژێر

ڕکیفی خۆی، واتە: پەروەردگارم هەموو شتێکی بە دەستە، پێشەسەری هەموو دروستکراوەکان بە دەست ئەوەوەیە، واتە: هەموو شتێك لە ژێر کۆنتڕۆڵی ئەودایە، من پشتم بەو بەستوە.

**برگەی شەشەم** : ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾، بێگومان پەروەردگاری من لەسەر ڕێیەکی ڕاستە، ئەمە تەعبیرێکی زۆر سەیرو جێی سەرنجە!:

بێگومان پەروەردگاری من لەسەر ڕێیەکی ڕاستە، واتە: خوای زاناو شارەزا لەسەر ڕێیەکی ڕاستەو لە ڕێیەکی ڕاستیشەوە، مامەڵە لەگەڵ بەندەکانی دا دەکات، خوا ﷻ بە پێی سیستەمو نەزمێك كە دایناوە مامەڵە لەگەڵ دروستکراوەکانیدا دەکات، ئەوەش وەڵامی ئەو قسەیە کە: بۆچی ئێستا سزایەکەمان بۆ نایەت؟ هەر کەسێك بیەوێ، هەر ئێستا سزای بۆ بێنێ، بۆی بێنێو، هەر کەس بڵێ: خوایە! لایبەرە، لایبەرێ، چۆن خوایەتیی وادەبێ؟ نەخێر، بەڵکو خوا سیستەمی داناوەو هەر شتێك لە قۆناغی خۆیدا دێ، هەر شتێك دەبێ بگاتە پلەی خۆیو کاتی خۆی، ئنجا خەمتان نەبێ، ڕۆژی سزاش دێ، پەروەردگاری من لە ڕێیەکی ڕاستەوە مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکاتو، بە پەلە پەلی ئەوان، شت پێش ناخات، هەروەك بەهۆی داوای ئەوانیشەوە، شت دواناخات.

**برگەی حەوتەم** : ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦٓ إِلَيۡكُمۡ﴾، (فَإِن تَوَلَّوۡاْ) لە ئەسڵدا (فَإِنْ تَتَوَلَّوا)ە، ئەگەر پشت هەڵبکەنو، پشتم تێبکەنو، پشت بکەنە بەرنامەی خوا، ئەوە بێگومان ئەوەی من پێی ڕەوان کرابووم، پێم ڕاگەیاندنو، من ئیشی خۆم کردو ئەرکی خۆم ئەنجامدا، ئێوەش ئەگەر ئەرکی خۆتان ئەنجام دەدەن، کە بە دەم بانگەوازەکەی منەوە بێنو بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر ئێوە ئەرکی سەرشانی خۆتان ئەنجام نەدەنو، کەمتەرخەمیی بکەن، ئەوە وەك چۆن من بەهۆی جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانمەوە پاداشتم هەیە، ئێوەش سزاتان هەیە، هەم لە دنیاو هەم لە دوارۆژیشدا، واتە: ئەوە من ئیشی خۆم تەواو کردو چی دیکە لەسەر من نیە.

**بڕگـەی هەشتـەم :** ﴿ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْمًا غَيْرَكُمْ ﴾، پەروەردگاری من کۆمەڵێك خەڵکی دیکە دێنێتە شوێنی ئێوە، جێی ئێوەیان پێ دەگرێتەوە، ئەمە یانی چی؟ یانی: خوا ئێوە لادەدات‌و خەڵکێکی دیکە دێنێتە شوێنتان، خوا پەکی لەسەر ئێوە نەکەوتوە، پێتان وا نەبێ کە خوا هەر ئێوەی هەبێ، خوا ئێوە لادەبات‌و خەڵکیکی دیکە دێنێ.

**بڕگـەی نۆیـەم :** ﴿ وَلَا تَضُرُّونَهُ شَيْئًا ﴾، ئێوە هیچ زیانێك بە خوا ناگەیەنن، یانی: خوا ئێوە لادەبات‌و، زیانیشی لێ نادەن، واتە : ناتوانن تۆڵە لە خوا بکەنەوە ناتوانن لە ڕکێف‌و دەسەڵاتی خوا ڕابکەن، وەك لە سوورەتی (محمد)دا دەفەرموێ : ﴿ ... وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُم ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە، ئەگەر ئێوە پشت هەڵبکەن، ئەوە خوا ئێوە لادەبات‌و خەڵکێکی دیکە دێنێ، وە دوایی ئەوان وەك ئێوە نابن.

**بڕگـەی دەیـەم :** ﴿ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴾، بە دڵنیاییەوە پەروەردگاری من، پارێزەرە بەسەر هەموو شتێکەوە، هەموو شتێك دەپارێزێ، ئاگای لێیەتی‌و لە ژێر کۆنترۆڵ‌و ڕکێفی وی دایە.

**مەسەلەی چوارەم‌و کۆتایی :**

### دوا قۆناغی مشت‌و مڕو مامەڵەی، هوودو گەلەکەی

خـوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَاهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ جَحَدُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا رُسُلَهُ وَاتَّبَعُوا أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ أَلَا إِنَّ عَادًا كَفَرُوا رَبَّهُمْ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾ ﴾.

لەم سێ ئایەتەدا خوا باسی دوا قۆناغی مشتو مڕو دیالۆگو وتووێژو مامەڵەی نێوان هوود ﷺو گەلەكەی عاد دەكات.

**شیكردنەوەی ئەو سێ ئایەتە لە (١١) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەكەم :** ﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾، كاتێك فەرمانی ئێمە هات، (أي لما اقْتَرَبَ مَجِيئُ أَمْرنا)، واتە: كاتێك هاتنی فەرمانی ئێمە، نیزیك بۆوە، یان: كاتێك بڕیاری ئێمە دەرچوو، یانی: فەرمانەكەی ئێمە دەرچوو بوو، هەر مابوو جێبەجێ بكرێ.

وشەی (أمرنا)، واتە: (مأمُورنا)، واتە: فەرمان پێكراوەكەی ئێمە، كە بریتیە لە بایە بەهێزو تێكشكێنەرەكە.

**بڕگەی دووەم :** ﴿ نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ﴾، هوود ﷺو ئەوانەی كە لەگەڵیدا بڕوایان هێنا بوو، ڕزگارمان كردن.

{مُتَعَلّق (نَجّيْنا) مَحْذُوف، أي مِنَ العَذَابِ}، (نَجَّيْنَا)، واتە: هوودو ئەوانەی لەگەڵیبوون لە سزاو ئازار دەربازمان كردن.

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا ﴾، (ڕزگارمان كردن) بەهۆی بەزەییەكی تایبەتەوە، لەلایەن خۆمانەوە، واتە: بەزەیی خوا بەرانبەریان، هۆكاری دەربازبوونیان بووو، ئەوانی دیكە فەوتێنرانیان بەهۆی ئەوەوە بوو، كە وایان نەكردبوو، بەزەیی خوا بیانگرێتەوە، وایان كردبوو ڕەحمەتی خوا لێیان دووربێ‌و، غەزەبی خوا بیانگرێتەوە، بۆیە فەوتان.

كەواتە هەر كەسێك وا بكات ڕەحمەتی خوا لێی نیزیك بێ، ڕزگارو قوتار دەبێ‌و، دەرووی لێ دەكرێتەوەو، تووشی خێرو خۆشییان دەبێ‌و، بە پێچەوانەوە هەر كەسێك وابكات كە خەشم‌و تووڕەیی خوا، لێی نیزیك بێ، تووشی نەهامەتیی‌و بەدبەختیی دێ، لە دنیاو لە دواڕۆژدا.

**برگەی چوارەم :** ﴿وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾، لە ئازارێکی زۆر بێڕەزا، زبر ئەستوور، مەحکەم، دەربازمان کردن.

وشەی (غَلِيظٍ) ئەو مانایانە هەموویان دەگرێتەوە، بۆیەش خوای پەروەردگار (نَجَّيْنَا)، دووبارە دەکاتەوە، چونکە بە ڕاستیی دەربازبوون و ڕزگاربوونی هوود ﷺ و براوادارانی کە لە خزمەتی دابوون، شتێکی زۆر گەورە بوو، بۆیە خوای میهرەبان دەفەرموێ : ﴿نَجَّيْنَا هُودًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾، دوایی دووبارەی دەکاتەوە ﴿وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾، واتە: ڕزگارمان کردن لە سزاو ئازارێکی پتەوو زبرو بێڕەزا!.

دەشگونجێ ئەوەی پێشێ، مەبەست پێی سزایی دنیا بێ: ﴿نَجَّيْنَا هُودًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾و، هی دووەمیان: ﴿مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾، مەبەست پێی سزای دواڕۆژ بێ، دەشگونجێ هەر مەبەستیشی پێی سزای دنیا بێ، بەڵام بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەوە کە ئەو ڕزگاربوونە، چ نیعمەتێکی گەورە بووە، خوا دووبارەی کردبێتەوە.

لە سووڕەتی (السجدة)دا خوا ﷻ باسی ئەو دوو سزایە دەکات، سزای دنیاو سزای دواڕۆژ، دەفەرموێ : ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَىٰ دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾﴾، واتە: ئەوانە بە سزای نیزیکترو کەمتر سزایان دەدەین، بەر لە سزای گەورەتر، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە.

سزای بچووکتر سزای دنیایەو، سزای گەورەتریش سزای دواڕۆژە.

{الغَلِيظُ: حَقِيقَتُهُ الخَشن، دُونَ الرَّقِيق، وَهو مُستعارٌ للشَّدِيد، وَاستعمالُ الفِعْلِ الماضِي فِي: (نَجَّيْنَاهُم) فِي مَعْنَى المستقبَل، لِتَحقُّقِ الوَعْدِ بوقُوعِهِ}، وشەی (الغليظ) بە واتای زبر دێ، (ناعم) و (غليظ) پێچەوانەی یەکدین،

(ناعم)، واتە: نەرم، (غلیظ) واتە: زبرو ڕەق و ئەستوورو بەهێز، دوایی خوازراوەتە بۆ شتێکی توند، لە کوردییدا دەڵێن: بە خوا شتێکی بێڕەزایە، واتە: بەرهەڵستیی ناکرێ، شتێکی زۆر گەورەیە، زۆر زەبەلاحە، لێرەدا کرداری ڕابردوو، بەکارهاتوە، کە دەفەرموێ: (نجیناهم) کە جارێ نەشهاتوە، ئەگەر مەبەست سزای دواڕۆژبێ، بۆ ئەوەیە کە ئەو بەڵێنەی خوا، هەر دێتە دی، چونکە بە نسبەت خوای باڵادەستەوە وەك ئەوە وایە، کە هاتبێتە دی.

**بڕگەی پێنجەم :** ﴿ وَتِلْكَ عَادٌ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ ﴾، ئا ئەوەش گەلی عاد بوون، کە نکووڵییان لە نیشانەکانی پەروەردگاریان کردو، پێیان بێبڕوا بوون.

(التأنیث: فِي اسم الإشارة بتأویل: الأُمَّة)، بۆچی خوا نەیفەرمووە: (وهذا عاد) بەڵکو بە (تلك)، هاتوە؟ لەبەر ئەوەی عاد وەك ئوممەتێك دانراون، ئوممەتیش دیارە ڕاناوی مێینەی بۆ بەکاردێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کرد: بێگومان هوود ﷺ بەرنامەی خوای پێبووە، کە ئایاتەکانی بوون و خوێنراونەوەو، موعجیزەشی پێبووە، کە نیشانەکانی خوا بوون، پاشان ئەو دیاردەو دیمەنانەش کە سیفەتەکانی خواو، ناوەکانی خوایان تێدا دەدرەوشێنەوە، ئەوانەش هەموویان نیشانەکانی خوان، کە گەلی عاد بە هەموو ئەو نیشانانە بێبڕوا بوون و نکووڵییان لێکردن.

(الجَحدُ: الإِنْكارُ الشَّدِید، والجُحود الإِنْكارُ مَعَ العِلم)، (جَحْد) هەم بە نکووڵیی لێکردنێکی زۆر توند دەگوترێ، لەگەڵ زانیاریی پێ هەبووندا، وەك خوا لە سوورەتی (النمل)دا دەربارەی فیرعەون و دارودەستەکەی دەفەرموێ :

﴿ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: نکووڵییان لێکردن و، لە دەروونی خۆشیاندا یەقینیان بوو، (کە ئەو موعجیزانەی مووسا ڕاستن)، چونکە ئەوان چاویان لە خۆ بەزلگریی و ستەم بوو، سەرنج بدە! سەرەنجامی خراپەکاران چۆن بوو.

**بڕگەی شەشەم :** ﴿ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ ﴾، سەرپێچییان لە پێغەمبەرانی خوا کرد.

دیارە گەلی عاد تەنیا سەرپێچییان لە یەك پێغەمبەر کردوە، ئەویش پێغەمبەرەکەی خۆیان بووە، کە (هود)ە، سەلامی خوای لەسەر بێ، ئەدی بۆچی لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ ﴾؟! چونکە لە ڕاستییدا پێغەمبەران هەموویان وەك چەند ئاڵقەی زنجیرێك وان، تەواوکەری یەکدین، ئەوەی پێشیان، هەواڵ دەدات بەوەی کە دوایی دێ، ئەوەی دواییش دێ، ئەوەی پێشی بە ڕاست دەزانێ، کەواتە: هەموویان تەواوکەری یەکدین، پێغەمبەر ﷺ فەرموودەیەکی هەیە دەفەرموێ : {إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلُ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ، وَيَقُولُونَ: هَلاَّ وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ، فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٦٨٥٤)، وَمُسْلِم، برقم: (٢٢٨٣)} .

واتە: بێگومان وێنەی منو وێنەی پێغەمبەرانی پێش من، وەك ئەوە وایە: پیاوێك کۆشکێکی دروست کردبێ، زۆر چاكو جوان بێ، بەڵام یەك خشت مابێ لە گۆشەیەکدا، خەڵك بە دەوریدا بێو بچنو بڵێن: چەند جوانو چەند ڕێکە، خۆزگە ئەم خشتەش دانرابایە، ئنجا من خشتی ئەو گۆشەیەمو، من کۆتایی پێغەمبەرانم.

کەواتە: پێغەمبەران بە هەموویان، ئەو حیکمەتەی کە خوا ویستوویەتی لە ژیانی مرۆڤدا بێتەدی، کە گەیشتنی پەیامو بەرنامەکانی خوایە، بە هەموویان ئەو کارەیان کردوە، بۆیە هەر کەسێك بڕوای بە یەکێك لە پێغەمبەران نەهێنابێ، وەك ئەوە وایە کە بڕوای بە هەموویان نەهێنابێ.

**بڕگەی حەوتەم :** ﴿ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ ﴾، گەلی عاد سەرپێچییان لە پێغەمبەری خوا کردو، کەوتنە شوێن فەرمانی هەر زۆردارێکی کەللەڕەق، (الإتباع: الطاعة)، واتە: فەرمانبەرییان کرد، شوێنی کەوتن، بۆی ملکەچ بوون، (الجَبارُ: الَّذِي يُجْبِرُ النَّاسَ وَيُكرِهِهِم عَلَى مَا يُرِيد ظُلماً)، (جبار) کەسێکە

خەڵك ناچار دەكات، لەسەر ئەوەی كە دەیەوێ‌و، ستەمیان لێدەكات، بە زۆر ئەو شتەیان بەسەردا دەسەپێنێ، یاخود (جبّار) كەسێكە زۆر خەڵك دەچەوسێنێتەوەو، لە هەر كەسێك تووڕەبێ دەیكوژێ، كەسێكی زۆر خوێنڕێژو خراپەكارو ستەمكارە.

(العَنِیدِ: الَّذِي: یـأبَى الحَقَّ وَیَرْفضُـهُ)، (عنید) كەسێكە كە هەق ڕەد دەكاتەوە، دانی پێداناهێنێ، هەرچەندە دەشزانێ هەقە.

<u>برگەی هەشتەم:</u> ﴿ وَأُتْبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً ﴾، وە لەم ژیانە دنیاییەش دا، نەفرینیان شوێن خرا.

گەلی عاد لە ئەنجامی ئەوەدا كە بەدوای كەسانی خۆ بەزلگری ستەمكاری خوێنڕێژی كەللەڕەق كەوتن‌و، سەرپێچییان لە پێغەمبەرانی خوا كرد، نەفرین‌و لەعنەتیان شوێن كەوت، كە ئەوە بەس بۆ گەلی عاد نیە، لەم ڕۆژگاری ئێستاشماندا، ئەوانەی بە دوای ئەو فیرعەون‌و طاغووتە خۆسەپێن‌و ستەمكارو قۆرخكارانە دەكەوێ، ئەوە مەلعوونەو خوا نەفرەتی لێ دەكات!

ئنجا تۆ تەماشا بكە! تەماشای دەست‌و پێوەندو دەوروبەرو شوێنكەوتووانی ئەو فیرعەون‌و طاغووتانە بكە، لە درێژایی‌و پانایی دنیادا، بە عالەمی ئیسلامیشەوە، ئنجا بۆت دەردەكەوێ كە ئەو خەڵكە دیارە نەفرینی خوای دادگەری كەوتۆتە سەری، بۆیە لە بەرانبەر هەقدا كەڕە، كوێرە، لاڵەو، بۆیە خۆی وا لەبەرچاو بچووك بۆتەوە، بە تۆزە دەم چەوركردنێك، بە چەپڵەو ئافەرینێك، خوا لە خۆی تووڕە دەكات‌و، بە پێچەوانەی هەقەوە ڕەفتار دەكات‌و، خۆی هەرزان فرۆش دەكات، بێگومان ئەو جۆرە كەسە لەعنەتی خوای چۆتە سەر، بۆیە خۆی ئاوا بێزراندوەو خۆی لەلا بچووك بۆتەوە.

(اللَّعْنَـةُ: الطَّـرْدُ وَالإِبْعـادُ بتَحْقِیـر وَإِهـانَة)، وشەی (لَعْنَـة) بریتیە لە دەركردن‌و دوورخستنەوە بە شێوەیەك كە جۆرێك لە بە كەمكردن‌و سووك تەماشاكردنی، تێدابێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَأُتْبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً ﴾، (قُرِنَ الدنيا باسم الإشارة بقصد التّهوين بجَنْب القِيامَةِ)، لەم ژیانی دنیاییەدا نەفرینیان لێکرا، بۆیەش (دنیا) لەگەڵ ناوی ئاماژە (إسم الإشارة)دا باسکراوە، یانی: نەفرینی ئەم ژیانە دنیاییە، هەر هیچ نیە لەچاو نەفرینی قیامەت.

وشەی ﴿ وَأُتْبِعُواْ ﴾، (اتبعه أي: تَبِعَهُ ولَحِقَه)، (تَبِعَهُ)، واتە: شوێنی کەوت، بەلام (أَتْبَعَهُ)، واتە: شوێنی کەوتو گرتیشی.

بڕگەی نۆیەم : ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، یانی: (وَأُتْبِعُوا اللَّعْنَةَ يَوْمَ القِيامَة)، واتە: لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەر نەفرینی خوایان شوێن کەوتو گرتنی.

بڕگەی دەیەم : ﴿ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُواْ رَبَّهُمْ ﴾، ئاگاداربن! ها! گەلی عاد بەرانبەر بە پەروەرگاریان بێبڕوا بوون، سپڵەو بێنمەك بوون، چونکە: (كَفَرُواْ رَبَّهُمْ)، (ضُمِّنَ معنى: عَصَوا، أو كفروا نعمة ربهم)، وشەی (كفروا) مانای سەرپێچیکردنی خراوەتە نێو، بۆیە هەر بۆخۆی تەعەددای کردوە، ئەگەرنا دەڵێ: (كفروا بربّهم)، بەلام ئێستا بۆیە تەعەددای کردوە، بەبێ پیت بۆ (مفعول) چونکە مانای (عَصَوا)، واتە: (سەرپێچییان کرد) خراوەتە نێوی، یاخود: (كفروا رَبهم)، واتە: سپڵەبوون بەرانبەر بە نیعمەتەکانی خوا، بێنمەك بوون بەرانبەر بە خوا.

بڕگەی یازدەیەم : ﴿ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴾، ئاگاداربن! وریابن! ئەها! دووریی بۆ عاد گەلی هوود، (البُعْدُ: التباعدُ مِنَ الخَيْرِ، وَالـهَلاك) (بُعْد) واتە: بریتیە لە دووریی لە خێرو چاکە، یاخود بریتیە لە فەوتان، واتە: لە ڕەحمەتی خوا دووربن گەلی عاد، کە گەلی هوود صەلاتو سەلامی خوای لەسەر بێ، بوون.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: بۆیە لێرەدا خوای زاناو توانا دەفەرموێ: (قوم هود)، چونكە (عاد)ی دیكەش هەبوون، كە ڕەنگە ئەوانە (عاد)ی یەكەم بووبن، لە هەمان كاتدا (عاد)ی دووەمیش بووبن، گرنگ ئەوەیە كە خوا ﷻ لێرەدا ئەوەی ڕوون كردۆتەوە كە ئەو (عاد)ەی فەوتاون، گەلی هوود ؑ بوونە.

لێرەشدا هاتینە كۆتایی بەسەرهاتی هوود ؑو گەلەكەی‌و، ڕوونكردنەوەی مەبەستی ئەو ئایەتانەی كە باسی بەسەرهاتەكەیان كرد.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٥٧

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەشت (٨) ئایەت پێك دێ، كە بریتین لە ئایەتەكانی: (٦١ تا ٦٨)و، باسی بەسەرهاتی صالح ﷺ گەلەكەی ثەموود دەكات، لە شەش تەوەردا:

**تەوەری یەكەم:** ڕەوانەكردنی صالحو گەیاندنی پەیامەكەی بە گەلەكەیو، داواكردنی لە گەلەكەی كە داوای لێبوردن لە خوا بكەنو، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﷻ.

**تەوەری دووەم:** وەڵامدانەوەی خراپی گەلی ثەموود بۆ صالحو، تۆمەتباركرانی صالح لەلایەن گەلەكەیەوە.

**تەوەری سێیەم:** بەرپەرچدانەوەی صالح بۆ تۆمەتەكانی گەلەكەیو، ئاگاداركردنەوەی بۆیان، كە خوای توانا حوشترێكی گەورەی لە چیایەك، لە بەردێكی گەورە، بۆ دەرهێناونو دەبێ ئەو موعجیزەیە بپارێزن، چونكە ئەوە موعجیزەی پێغەمبەر صالح بووە، كە وەك پێشتر لە سورەتی (الأعراف)دا باسمان كرد، ئەو گەلەی ثەموود هەموویان توانیویانە شیری لێ بدۆشن، واتە: بەشی هەموو خەڵكەكەی كردوە، بەڵام ئەو كانییەش كە هەیانبووە، ڕۆژێك حوشترەكەی صالح ئاوی لێ خواردۆتەوە، بە تەنیا بۆ حوشترەكە بووە، كە ئاوی لێ بخواتەوەو، ڕۆژێكیش بۆ خەڵكەكە بووە.

**تەوەری چوارەم:** پەیكردنو سەربڕینی حوشترەكە، لەلایەن گەلی ثەموودەوەو، ئاگاداركردنەوەی صالح بۆیان، كە پاش سێ ڕۆژان، سزای خوایان بۆ دێ.

**تــــەوەری پــێــنــجـــەم :** ئنجـا دوای هاتنـــی فـەرمــانی خــوا، دەربـازكــردنی صــالْحو ئـەوانەی كـە لـە خزمـەتیـدا بڕوایـان هێـنـاوە.

**تــەوەری شــەشــەم :** سـەرەنجام هاتنی چریكـەو بوومە لـەرزەیـەكی بەهـێـزو، سـەرەنجام لـەگـەڵ خـاكدا تـەخـتو وێرانـبوونی گـەلی ثـەموودو، كـۆتـایی پێهاتنیـان.

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ
أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ
﴿٦١﴾ قَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآۖ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا
وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ
مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِى
غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴿٦٣﴾ وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ
أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا۟
فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍۖ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا
نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍۗ إِنَّ
رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى
دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْۗ أَلَا بُعْدًا
لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾ ﴾.

# مانـای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

{هەروەهـا بـۆ لای (گەلـی) ثـەمـوود صالـحی برایانمـان (نـارد)، گـوتی: ئـەی گەلەکەم! جگە لـە خـوا هیچ پەرسـتـراوێکی دیکـە (ی ڕاستەقینە)تـان نیـە، ئـەو (خـوا) ئێوەی لـە زەویدا پێگەیاندوەو، ئەرکی ئاوەدانـکردنەوەیشـی پـێ سـپاردوون، ئێوەش داوای لێبوردنی لـێبکەنو، دوایی بگەڕێنەوە بـۆ لای، بێگومـان پەروەردگـارم نزیکە (لێتـان)، وەڵام دەرەوەیە (بۆ پاڕانەوەو داواتان) ﴿٦١﴾ (گەلەکەی) گوتیـان : ئەی صـاڵح! تۆ پێش ئەمـە (واتە: بـەرلەوەی باسی پێغەمبەرایەتیی بکەی) لە نێوماندا جێی ئومێـد بووی، ئـایا تـۆ ڕێگرییمـان لێدەکـەی، کـە ئـەوەی بـابو باپیـرانمـان پەرستوویانە، ئێمەش بیپەرستیـن، بەدڵنیـایی لەبارەی ئـەوەوە، کە تۆ ئێمـەی بـۆ لا بـانگ دەکەی، لـە دوو دڵییەکی نارەحەتکەر داین ﴿٦٢﴾ (صاڵح) گوتی: ئەی گەلـەکەم! پێم بڵێـن: ئەگـەر من لـەلایـەن پەروەردگارمەوە لـەسـەر بەڵگـەیـەکی ڕوونو ئـاشکرا بـم (بەرچاوم ڕوونو دڵنیابم)و، لـەلایـەن خۆیـەوە بەزەییـەکی (تـایبـەتی) پـێ دابـم ﴿(کە پلەی پێغـەمبـەرایـەتییـە)، دەگونجێ سـەرپێچیی لێبکـەم؟﴾ ئنجـا ئـایـا لـە بەرانبـەر (سـزای) خـوادا، کـێ هـەیـە پشتم بگـرێ، تـاکـو مـن بتوانـم سـەرپێچیی لێبکەم، بێگومـان ئێـوە (بەو داواو پێشـنیارەتـان) جگـە لـە زیـانبـارکـردن، چی دیکەم بۆ زیاد نـاکەن ﴿٦٣﴾ ئەی گەلـەکەم! ئەمە حوشتری خوایـە، نیشانەیە بۆ ئێوە، (و بۆ ڕاستیی من بەڵگـەیـە)، دەجا وازی لێبێنـن، بـا لـەسـەر زەوی خـوادا بلـەوەڕێو، بـە خراپە دەستی مەگـەیـەننـێ، (واتە: زیانی پـێ مەگـەیـەنن)، کـە سـەرەنجـام (سـزاو) ئازارێکی بە ئێش بتـانگـرێ ﴿٦٤﴾ کەچی پەییـان کـرتو سەریـان بڕی، (صـاڵح)یـش گوتی: بۆ مـاوەی سێ ڕۆژان لـە مـاڵەکانتـاندا بگوزەرێنن، (دوایی بەڵاتان بـۆ دێ) ئەوە بەڵێنێکە درۆ نیـە ﴿٦٥﴾ ئنجـا کـاتێـک فەرمـانی ئێمـە هـات (بە لـەبەینبـردنی گەلی

ثـەموود) صـالّحو ئەوانـەی كـە لـەگـەڵیـدا بڕوایان هـێـنـابوو، بە بەزەییـەكی (تـایبـەتی) خـۆمـان ڕزگـارمـانـكـردن (لـە سزای ئـەو ڕۆژە)و، لــە ڕیسـوایی ئـەو ڕۆژە، بــە دڵـنیـایی پەروەردگـارت هەر خـۆی بەهێـزی زاڵە ﴿٦٦﴾ ئەوانەش كە سـتەمیان كـرد بوو، چـریكـەو دەنگێكی بێـڕەزا گرتـنی، یەكسـەر لـە مـاڵەكـانیـانـدا تەخـت بوون ﴿٦٧﴾ (وایــان لـێهـات) وەك هـەر (كـاتی خـۆی) لـەو وڵاتەدا نەمـابنەوە ئەهـا! (ئـاگـاداربن!) (گـەلی) ثـەمـوود سـپڵەییان بەرانبــەر پەروەردگـاریــان كـرد، ئەهـا (وریابن!) دووریی (لـە بەزەیـی خـوا) بـۆ (گـەلی) ثــەموود ﴿٦٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَنشَأَكُم) : (النَّشأةُ وَالنَّشأ: إِحدَاثُ الشيءِ وَتَربِيَتُهُ) (نشأة ونشأ) بریتیە لە پەیداکردنی شتێکو، پێگەیاندنیو مشوور لێخواردنیو هەراشکردنی.

(وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا) : واتە: ئێوەی لەویدا داناوە، بۆ ئاوەدانکردنەوەی، ئێوەی لەسەر زەوی داناوە، تاکو ئاوەدانی بکەنەوە. (العِمارَةُ: نَقِيضُ الخَرَابِ، أَعْمَرْتُهُ الأَرْضَ وَاستَعْمَرْتُهُ: إِذَا فَوَّضْتَ إِلَيهِ العِمارَةَ)، وشەی (عِمارَة) پێچەوانەی کاولبوونو وێرانبوونە، دەگوترێ: (أَعْمَرْتُهُ الأَرْضَ وَاستَعْمَرْتُهُ)، واتە: ئاوەدانکردنەوەی زەوی، (ئەو پارچە زەوییە)م پێ سپاردوە.

(مَرْجُوًّا) : (الرَّجَاءُ: ظَنٌّ يَقْتَضِي حُصُولَ مَا فِيهِ مَسَرَّةٌ)، واتە: (رجاء) گومانێکە خوازیاری ئەومیە شتێک پەیدابێ کە جێی دڵخۆشییە.

(رجاء) لەگەڵ (أمل) یان لەگەڵ (أُمْنِيَة) جیاوازییان ئەومیە کە (رجاء) بنەمایەکی هەیە، واتە: بناغەیەکی هەیە لەسەر ئەو بناغەیە: تۆ ئەو ئومێدە (رجاء) بنیات دەنێی، بەڵام (أُمْنِيَة) کە بە کوردیی دەبێتەوە بە: خۆزگە خواستن، ئەومیە کە هیچ بنەمایەکی نەبێت.

(لَفِي شَكٍّ مُرِيبٍ) : (شَک) واتە: دوو دڵیی، (مُرِیب)یش واتە: ناڕەحەتکەر، ئنجا دەگوترێ: (أَرَابَهُ يُرِيبُهُ، أَي: أَزْعَجَهُ وَأَقْلَقَهُ) واتە: بێزاری کردو تووشی دڵەڕاوکەی کرد، (ریب) بە مانای دڵ لە دڵدانو، جۆرێك لە دوودڵیی دێ، کە ئینسان بخاتە حاڵەتی دڵەڕاوکێو بێزاری بکات.

( تَخۡسِيرٖ ): (خَسِرَ فِي البَيْعِ خُسْراً وَخُسْرَاناً، وَتَخْسِير مَصْدَرُ خَسَّرَ، إِذَا جَعَلَهُ خَاسِراً)، (خَسِرَ فِي البَيْعِ خُسْرَاً وَخُسْرَاناً) واتە: لە کڕینو فرۆشتنەکەدا زیانی کرد، (تخسیر) چاوگە بۆ وشەی (خَسَّرَ) (خَسَّرَ، يُخَسِّرُ، تَخْسِيراً) واتە: وایلێکرد کە زیان بکات، زیانباری کرد، وشەی (تخسیر) لێرەدا دەگونجێ بەمانای (إهلاك) بێ، واتە: ئێوە هەر فەوتاندن، بۆمن زیاد دەکەن، بەڵام (خَسَرَ الشيءَ، أَي: نَقَصَهُ وَأَخْسَرَهُ، أَي: نَقَصَهُ) واتە: شتەکەی کەم کردەوە، لێی کەمکردەوە، زیانی لێدا.

( فَعَقَرُوهَا ) : (عُقْرُ الشيءِ: أَصْلُهُ، وَعَقَرْتُ النَّخْلَ: قَطَعْتُهُ مِنْ أَصْلِهِ، وَعَقَرْتُ البَعِيرَ: ذَبَحْتُهُ، وانْعَقَرَ البَعِيرُ وَالفَرَسُ: ضُرِبَتْ قَوَائِمُهُ بِالسَّيْفِ)، وشەی (عُقْر) واتە: بنچینەی ئەو شتە، ڕەگی ئەو شتە، دەگوترێ: (عُقْرِ دَارِهِ) واتە : لە ئەسڵی ماڵەکەی دا، ئنجا دەگوترێ : (عَقَرْتُ النَّخْلَ) واتە : ئەو دارخورمایەم لە بنکەوە بڕی، دەگوترێ: (عَقَرْتُ البَعِيرَ) واتە : حوشترەکەم سەربڕی، (وانْعَقَرَ البَعِيرُ وَالفَرَسُ)، یانی: حوشترەکەو ئەسپەکە پەی کران، بە کوردیی دەگوترێ: پەی کردن، کە بریتیە لەوەی: چوار پەلی ببڕدرێن، یاخود پاشووەکانی ببڕدرێن، کە ئەو کاتە دەکەوێتە زەویو ئاسانتر سەردەبڕدرێ.

( غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ) : (أَي: مَكْذُوبٍ فِيهِ، أو مكذوب: كذب) واتە: درۆی تێدا نەکراوە، یاخود (مَكْذُوب مَصْدَرُ كَذِبَ) واتە: چاوگە بۆ (كَذِبَ) (كَذِبَ، يَكْذِبُ، كَذِباً، مَكْذُوباً) هەموو ئەوانە دەبن بە چاوگ، دەگوترێ: (كَذَبَ، يَكْذِبُ، كِذْباً، وَكِذَّاباً: أَخْبَرَ عَنِ الشيءِ بِخِلافِ عَلَى ما هو عَلَيْهِ فِي الوَاقِعِ)، درۆ ئەوەیە کە تۆ هەواڵێک بدەی بە شتێک، کە پێچەوانەی ئەوە بێ لە واقیعی خۆیدا هەیە.

( ٱلصَّيۡحَةُ ) : گوتراوە: (رَفْعُ الصَّوْتِ)، بەڵام من پێم وایە بە چریکەو دەنگێکی بێڕەزاو، دەنگێکی زۆر گەورە کە ئینسان کەڕ بکات، دەگوترێ.

( جَٰثِمِينَ ) : کۆی (جَاثِم)ە، (جَثَمَ الطائِرُ، إذَا قَعَدَ ولَطِئَ بالأرض، والجُثمانِ شَخْصُ الإنْسانِ قَاعِداً)، (جَاثِم) واتە: بە زەوییەوە نووسابوون و لەگەڵ زەویدا تەختو یەکسان بوو بوون، چونکە لەوەوە هاتوە دەگوترێ : (جَثَمَ الطائِرُ)، واتە: باڵندەکە نیشت، کاتێک دەنیشێتەوەو خۆی بە زەوییەوە دەنووسێنێ، مرۆڤ کاتێک کە دادەنیشێ، بە جەستەی ئینسان دەگوترێ : (جُثمان) کاتێک دانیشتوویە، چونکە بە زەوییەوە چەسپاوە.

( كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآ ): واتە: وەك هەر لەویدا نەمابنەوەو لەوێدا نەبووبن، دەڵێ: (غَنِيَ فِي مَكانِ كَذَا: طالَ مَقَامُهُ فِيهِ مُسْتَغْنِيَاً بِهِ عَنْ غَيْرِهِ بِغِنَى)، واتە : لە فلان شوێندا ئەو کەسە نیشتەجێ بووە، بەهۆی ئەو شوێنەوە بێنیاز بووە لەوەی بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

# مانــای گـشــتـی ئایـەتەكــان

دیارە ئێمە كاتی خۆی لە سوورەتی (الأعراف)یشدا باسی بەسەرهاتی پێغەمبەر صالح ﷺ و گەلەكەی: ثەموودمان كردو، خوا پشتیوان بێ ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا بەدرێژیی بەسەرهاتی صالح ﷺو ثەموود دەتوێژینەوە، وەك عادەتی خۆمان لە هەر سوورەتێكدا كە بە ناوی پێغەمبەرێكەوە ناونرابێ، بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەر ﷺ بە تێرو تەسەلیی لە قەدەر ئەم تەفسیرە دەتوێژینەوە، بۆیە لێرەدا بەسەر مانا گشتییەكەی دا بەخێرایی ڕەت دەبین.

لێرەدا خوا ﷻ هەر لە درێژەی ئەو بەسەرهاتانەدا كە دەیانگێڕێتەوە، هەم بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺو هاوەڵانی بەڕێزی لە ڕۆژگاری دابەزینی قورئانداو، هەم بۆ هەموو جیلەكانی مسوڵمانان، پێش ئێمەو، ئێمەو، دوای ئێمەش، بۆ ئەوەی پەند وەربگرین لە بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وەك خوا لە سوورەتی (یوسف) ئایەتی (١١١)دا فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، واتە: بێگومان لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەكانیاندا، پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان.

ئنجا لە درێژەی ئەو بەسەرهاتانەدا، دێتە سەر بەسەرهاتی گەلی ثەموودو، صاڵحی برایان، صالح پێغەمبەر ﷺ كە هەر لە خۆیان بووە، لە ڕووی ڕەچەڵەكو نەسەبەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ﴾، واتە: بۆ لای گەلی ثەموود صاڵحی برایانمان ڕەوانەكردو ناردمان، ئەمە دیارە (و)ەكە دەیگێڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی پێشێ، واتە: (وَأَوْحَيْنَا) یان (وَأَرْسَلْنَا إِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا)، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! وەك چۆن تۆمان ناردوە بۆ لای ئەو خەڵكەی ڕۆژگاری خۆتو

هەموو بەشەریەتیش دواتر، بە هەمان شێوە: پێشتریش ئەو پێغەمبەرانەی دیکەشمان ناردبوون، نووحمان ناردبوو بۆ لای گەلەکەی، هوودمان ناردبوو بۆ لای گەلی عادو، صالحیشمان ناردبوو بۆ لای گەلی ثەموود.

ئنجا صالح دەست بە گەیاندنی پەیامی خوا دەکات، وەك هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر بەوە دەستیان پێکردوە : ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾، واتە: گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، بێجگە لەو هیچ پەرستراوتان نین، واتە: هیچ پەرستراوێکتان نیە کە شایستەی پەرستن بێ، ئەگەرنا شتیان زۆر پەرستوەو پەرستراویان زۆر بوون، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾، واتە: (ما لَكُمْ مِنْ إلَهٍ حَقّ غَيْرُهُ)، واتە: هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە کە شایستەی پەرستن بێ، نیتانە، جگە لەو، واتە: جگە لە خوا ﷻ، دیارە ئەمە خوێنراویشەتەوە : (ما لَكُمْ مِنْ إلَهٍ غَيْرِهِ).

کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾، واتە: ئەو ئێوەی لە زەویدا وەدیهێناوەو پێی گەیاندوون، ئاوەدانکردنەوەی زەویشی بە ئێوە سپاردوە، واتە: ئێوەی لەوێدا داناوە، تاکو ئاوەدانی بکەنەوە، بە چی؟! بە بەندایەتیی بۆ خواو، بە دادگەریی لە نێوان خۆتانداو، بە خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو جوانەکان، وە بە خۆ بژارکردنو پاك ڕاگرتن لە سیفەتە نزمو خراپەکان، لە بواری هەڵسوکەوتی تاکەکەسیی، هەڵسوکەوتی خێزانییو کۆمەڵایەتییو سیاسییو ... هتد.

پاشان دەفەرموێ : ﴿فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ﴾، واتە: مادام خوا ﷻ ئێوەی لە زەویدا داناوە، بۆ ئەوە زەوی ئاوەدان بکەنەوەو، مادام بێجگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەتان نەبێ، کە شایستەی پەرستن بێ، کەواتە: داوای لێبوردنی لێ بکەن، واتە: دان بە هەڵەو کەمو کورتییەکانتان دابێننو، دەستیان لێ هەڵبگرن، واتە: پاکسازیی لە خۆتان ئەنجام بدەن، ﴿ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ﴾، واتە: ئنجا دوایی بگەڕێنەوە بۆ لای، چونکە ئینسان تاکو خۆی بژار نەکات لە سیفەتە خراپەکان، شایستەی ئەوە نابێ

کە لە خوا نیزیك بێتەوە، تۆ کاتێك شایستەی ئەوە دەبی: بگەڕێیەوە بۆ لای خواو، لە خوا نیزیك ببیەوە، کە پێشتر خۆت بژار کردبێ لە سیفەتە خراپەکان، هەر بۆیەش وشەی (توحید) پێی دەگوترێ: (كلمة النّفي والإثبات) (لا إله إلاّ الله) پێشێ دەبێ هەرچی پەرستراوی ساختەو ناڕاست هەیە، لایبەری، ئنجا دەتوانی خوا بەیەکگرتن لە دڵو دەروون و عەقڵو هۆشی خۆتدا، بەشێوەی ڕاستەقینە بچەسپێنی، ﴿إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ﴾، واتە: بێگومان پەروەردگاری من نیزیکەو، وەڵام دەرەوەیە. نیزیکە لێتان بە هاناو هاوکارییتانەوە دێ، (مُّجِيبٌ)، واتە: وەڵامدەرەوەیە بۆ داواکانتانو پاڕانەوەکانتان.

صاڵح بەو شێوەیە پەیامی خۆی پێگەیاندن، با بزانین ئەوان چی وەڵام دەدەنەوە؟

﴿قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ﴾، واتە: (گەلی ثەموود)، گوتیان: ئەی صاڵح! تۆ پێش ئەمە (یانی: پێش ئەوەی باسی پێغەمبەرایەتییو وەحی بکەیو بڵێی خوا وەحی بۆ ناردووم‌و بە سیفەتی پێغەمبەر بماندوێنی)، جێی ئومێد بووی لە نێو ئێمەداو ئێمە پێت ئومێدەوار بووین.

دیارە هەموو پێغەمبەران هەروا بوون‌و هەموویان لە لووتکەی بەرزی ڕەوشت‌و ئاکاری پەسندو ئەو سیفەتانەدا بوون، کە خەڵك باوەڕو متمانەیان پێ بکات‌و، پێیان دڵخۆش بوون، وەك پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ نازناوی (الأمين)ی هەبووە، کە (أمين) لە نێو عەرەباندا کەسێکە زۆر جێگای متمانەو باوەڕپێو، کەسێك کە جێی دڵخۆشیی بێ‌و، قسەی سەنەد بێ، ئەوانیش دەڵێن: ئەی صاڵح! تۆ پێشتر جێی ئومێد بووی، یانی: ئێستاکە صاڵح بۆتە پێغەمبەر ﵇ جێی ئومێد نەماوە!

ئنجا دەڵێن: ﴿أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا﴾، ڕوونی دەکەنەوە، بۆچی ئێستا صاڵح جێی ئومید نەماوە؟ ئایا ڕێگرییمان لێ دەکەی، ئەوانە بپەرستین، یان ئەو پەرستراوە بپەرستین، کە بابو باپیرانمان دەیانپەرست، یان دەیانپەرستن. ﴿وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾﴾، واتە: بێگومان ئێمە لە دوودڵیی داین، لەوەدا

کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، دوو دڵییەکی بێزارکەرو ناڕەحەتکەر، واتە: متمانەمان پێت نیە کە ڕاست بێ، تەنیا خوا شایستەی پەرستران بێ.

صالح ﷺ وەڵام دەداتەوە: ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ فَمَا تَزِيدُونَنِى غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴾

واتە: گوتی: ئەی گەلەکەم! هەواڵم پێبدەن، {(أَرَءَيْتُمْ)، واتە: ئایا بینیتان! یانی: ئەگەر بینوتانەو زانیوتانە، هەواڵم پێبدەن، بەڵام شارەزایانی زمان دەڵێن: (أَرَءَيْتُمْ)، واتە: (أخبروني)، واتە: هەواڵم پێبدەن، دیارە کەسێك هەواڵ دەدا کە پێشتر شتێکی بینیبێ و زانیبێو شارەزایی لێ هەبێ، ئنجا دەتوانێ هەواڵی لەبارەوە بدات} ، ئایا ئەگەر من لەلایەنی پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرابم، (کە وەحیو پەیامی خوام بۆ هاتوە)و، لەلایەن خۆشیەوە بەزەییەکی تایبەتیی پێدابم، (کە پلەی پێغەمبەرایەتییە)، ﴿فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ﴾، ئایا کێ لە بەرانبەر خوادا سەرم دەخات، ئەگەر من سەرپێچیی لێبکەم، {یانی: دوای ئەوەی کە منی خستۆتە سەر بەڵگەو پەیامێکی ڕوونو ئاشکراو، منی بەرچاو ڕوون کردوە، دوای ئەوەی بەزەیی تایبەتی خۆی بە من داوە، ئنجا من سەرپێچیی لێبکەم! کێ سەرم دەخاتو، کێ لە بەرانبەر سزادانی خوادا، دەتوانێ پشتم بگرێ؟} ﴿فَمَا تَزِيدُونَنِى غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴾، ئێوە هەر زیانبارکردنم بۆ زیاد دەکەن، یاخود هەر فەوتاندنم بۆ زیاد دەکەن، واتە: شتێك کە ئێوە بۆ منی فەراهەم بێنن، ئەگەر من بە قسەتان بکەمو، سەرپێچیی لە فەرمانی خوا بکەمو سپڵەیی بەرانبەر خوا بکەم، نەك هەر هیچ سوودێکم پێناگەیەنن، بەڵکو شتێك کە ئێوە بۆ منی فەراهەم بێننو، بۆ منی زیاد بکەن، بریتیە لە فەوتانو سەر بە فەتارەت چوونو زیانباربوون.

﴿ وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ﴾، هەمیشە پێغەمبەران (علیهم السلام) بە لەفزی شیرین، بە تەعبیری جوان، بە قسەیەك کە هەستو سۆزیان بجووڵێنێ، قسەیان لەگەڵ گەلەکانی خۆیاندا کردوە :

ئەی گەلەکەم! ئەمە حوشتری خوایە، نیشانەیە بۆ ئێوە دیارە هەموو حوشترەکان هەر هی خوان، هەموو شتێك هەر خوا دروستی کردوە، بەلام لێرەدا پسپۆرانی زمان دەڵێن: (إِضَافَةُ تَشْرِيفٍ)، لەبەر شەرەفو پێگەی بەرز، پاڵدراوەتە لای خوا، چونکە ئەو حوشترە بەتایبەت دروستکراوە، ئەگەرنا هەموو شتەکان هەر هی خوان، بەلام ئەگەر شتەکانی دیکە پەیوەندییەکی گشتییان هەیە، دروستکراو لەگەڵ دروستکەردا، وەك بەدیهێنراو لەگەڵ بەدیهێنەردا، ئەمە پەیوەندییەکی تایبەتی بە بەدیهێنەرەوە هەیە، چونکە خوا ﷻ بە شێوەی ئاسایی ئەو حوشترەی دروست نەکردوە، کە بە شێوەی زاوزێی ئاسایی بووبێ، بەڵکو لە بەردێك دەریهێناوە، وەك لە سوورەتی (الأعراف)یشدا باسمان کردوەو دواییش بە تەفصیل باسی دەکەین، گەلی ثەموود بە صالح دەڵێن: بەڵگەت چییە کە پێغەمبەری خوای؟! ئەویش دەڵێ: چیتان دەوێ؟ ئەوانیش پارچە شاخێکی گەورە لەوێ بووە، گاشە بەردێکی زەبەلاح، دەڵێن: حوشترێکمان بۆ لەم شاخە دەربێنە، ئیدی صالح دوعا دەکاتو، ئەو پارچە شاخەش ژانی دێتێو، دەلەرزێ، دوایی حوشترێکی گەورەی لێ دێتە دەرێو بەچکەیەکیشی لێ دێتە دەرێ.

بۆیەش دەڵێ: ئا ئەم حوشتری خوایە: ﴿لَكُمْ ءَايَةً﴾، نیشانەو موعجیزەیە بۆ ئێوە، واتە: موعجیزەو بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی نێررانی من بۆ لای ئێوە، ﴿فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِ﴾، واتە: لێی بگەڕێن با لەسەر زەمینی خوادا بلەوەڕێو، لە ئاوی خوا، بخواتەوەو هیچ مەسرەفو بارگرانییەکی لەسەر ئێوە نییە، ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ﴾، بە خراپە دەستی مەگەیەننێ، واتە: دەستدرێژیی مەکەنە سەرو زیانی پێ مەگەیەنن.

﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ﴾، واتە: ئەگەرنا سزایەکی نیزیك دەتانگرێ.

﴿فَعَقَرُوهَا﴾، بە (ف) (فاء التعقيب)، یانی: یەکسەر دوای ئەوەی ئەو وای پێگوتن، ئەوان سەریان بڕی.

پێشتر باسمان کرد (عَقْر) هەم بە مانای سەربڕین دێ، هەم بە مانای دەرهێنانی شتێك لە ڕەگو ڕیشەوە دێ، ئنجا بۆ حوشترو وڵاخی گەورە، بە مانای پەی کردن

دێ، واتە: هەر چوار پەلی ببڕی، یاخود بە تایبەتی پاشووەکانی، واتە: دوو لاقی پشتەوەی ببڕی، بۆ ئەوەی بکەوێ، تاکو ئاسانتر سەرببڕدرێ، ئەگەر وانەبێ سەر نابڕدرێ.

لە ڕاستییدا وشەی: ﴿ فَعَقَرُوهَا ﴾، یانی: هەم پاشووەکانیان بڕیو، هەم سەریشیان بڕی.

﴿فَقَالَ تَمَتَّعُوا فِي دَارِكُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ ﴾، صالح ﷺ بە گەلەکەی فەرموو، لە ماڵی خۆتاندا، لە جێگاو ڕێگای خۆتاندا، بۆ ماوەی سێ ڕۆژان بیگوزەرێنن، ژیان بەرنە سەر.

وشەی ﴿تَمَتَّعُوا ﴾، هەمیشە بە ژیانو گوزەرانو بەهرە وەرگرتنێکی کەم دەگوترێ، یانی: سێ ڕۆژان مۆڵەتە، ﴿ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴾، ئا ئەوە بەڵێنێکە درۆ نییەو بەڵێنێکی ناڕاست نیە، واتە: سزای خوای پەروەردگارتان بۆ دێ، لەوانەیە ئەو سێ ڕۆژ مۆڵەتە بۆیە وا دانرابێ، بەرلەوەی لەبەین بچنو خوا سزایان بدات، سزایەکی دەروونییش بچێژن، سێ ڕۆژ چاوەڕوانیی مەرگ بکەن!

هەڵبەتە من نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا حیکمەتی ئەو سێ ڕۆژە چیە؟! دەگونجێ ئەوە بێ، کە گوتمان، دەشگونجێ ئەوە مۆڵەتێك بووبێ، کە ئەگەر لەمیانی ئەو سێ شەوو ڕۆژەدا گەڕابانەوەو، پەشێمان بووبانەوەو، گوتبایان: خوایە! پەشێمانین، هەڵەمان کرد، بە تەئکید خوای پەروەردگار تۆبەی بەندەی خۆی قبووڵ دەکات، دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ لای، لەوانەیە حیکمەتەکەی ئەوە بووبێ.

﴿ فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا ﴾، کاتێك فەرمانی ئێمە هات، واتە: بڕیاری ئێمە دەرچووە بۆ لەبەینبردنیان، یاخود ﴿أَمْرُنَا ﴾، یانی: (مأمورنا)، واتە: فەرمان پێکراوی ئێمە، کە بریتی بوو لەو بەڵایەی کە بۆیان هات، ئەو چریکەو دەنگە بێزرایەی کە لە بەینیبردن، یاخود ﴿أَمْرُنَا ﴾، یانی بەڵای ئێمە کە بە فەرمانی تەکوینییو قەدەریی ئێمە نێردرا بوو، بۆیان هات، ﴿نَجَّيْنَا صَالِحًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا ﴾،

دیارە کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾، واتە: نیزیك بۆوە بێ، ئەگەرنا وەختێك کە چریکەکە لێی دەدان، صاڵح و ئەوانەش کە بڕواداربوون، لە نێویاندا بووبان، ئەوانیش دەفەوتان، بەڵام یانی: کاتێ نیزیك کەوتەوەو کەوتە سەرو حەدی هاتن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا ﴾. صاڵح ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدا بڕوایان هێنابوو، ڕزگارمان کردن بە بەزەییەکی تایبەت لەلایەن خۆمانەوە، ﴿ وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍ ﴾، هەم لەو بەڵایە کە فەوتانە، دەربازمان کردن و، هەم لە زەبوونیی و سەرشۆڕیی ئەو ڕۆژە، واتە: ئەو بەڵایە هەم ئازارێکی جەستەیی و ماددیی بووەو، هەم سەرشۆڕیی و زەبوونییەکی مەعنەویی بووەو لە هەردووکیان دەربازمان کردن، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴾، واتە: بێگومان پەروەردگارت هەر خۆی توانای زاڵە.

ئەدی ئایا ئەوان چییان لێهات ؟!

﴿ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ ﴾، ئەوانەی ستەمیان کردبوو، ئەهلی کوفرو شیرك بوون و، پێغەمبەری خوایان بەدرۆ دانا، موعجیزەی پێغەمبەریش کە حوشترەکە بوو، ئەویشیان لەبەین برد، ئەوانە چریکەیەك، دەنگێکی بێڕەزای زۆر بەقوەت گرتنی، ﴿ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴾، لە ماڵەکانی خۆیاندا لەپەڕوو کەوتن یان: لەسەر ئەژنۆ کەوتن، وەك چۆن باڵندەیەك هەڵدەنیشێ و بە زەوییەوە دەنووسێ، ﴿ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ﴾، وایان لێهات، وەك هەرگیز لەوێدا نەژیابن، یانی: چۆڵەکە کوژیان نەماو، قڕە بڕ بوون و کەسیان لێ نەما، ﴿ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ﴾، واتە: ئەها! ثەموود بێبڕوابوون بەرانبەر بە پەروەردگاریان، یاخود سپڵە بوون بەرانبەر بە پەروەردگاریان، نیعمەتەکانی پەروەردگاریان نادیدە گرت، ﴿ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴾، واتە: ئاگاداربن! دووریی بۆ گەلی ثەموود، با هەر دووربن، یاخود: دوورکەوتنەوە لە ڕەحمەت و بەزەیی خوای بەخشندە.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:**

## پەیامی صالح ﷺ بۆ گەلەکەی:

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾﴾.

کە دەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا﴾، ئەم (و) واوە، وەك پێشتر گوتمان: ئەم ڕستەیە دەگێڕێتەوەو بایەداتەوە بۆ سەر ئەوەی پێشتر، واتە: صالحی براشیانمان نارد بۆ لای گەلی ثەموود، وەك چۆن پێغەمبەرانی دیکەمان (علیهم الصلاة والسلام) بۆ لای گەلەکانیان، نارد بوون، یان وەك چۆن، ئەی موحەممەد ﷺ! تۆمان ناردوە بۆ لای ئەو خەڵكو کۆمەڵگای خۆتو، بۆ لای هەموو بەشەریەتیش، بە درێژایی زەمانو بە پانایی زەمین، بە هەمان شێوەش صالحی براشیانمان ناردبوو بۆ لای گەلی ثەموود، هەڵبەتە بۆ هەموو پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام) هەر دەفەرموێ: ﴿أَخَاهُمْ﴾، لەبەر ئەوەی برایان بوو لە نەسەبو ڕەچەڵەکدا، کەواتە: دروستە تۆ کەسێك کە لە دینیشدا پێت ناگاتەوە، پێی بڵێی: برا، یان خوشك، بابایەکی جوولەکە، نەصرانیی، ئێزیدیی، صابیئە، مولحید، عەلمانیی، عەلمانییەك کە بە ڕاستیی عەلمانیی بێتو، بڕوای بە ئیسلام نەبێ، یانی: عەلمانیەتی وەك دینو بەرنامەیەکی ژیان وەرگرتبێو، لە جێی ئیسلامیی دانابێ، دروستە بە هەموو ئەوانە بڵێی: برا، یان خوشك، بۆچی؟ چونکە براتن، یان خوشکتن لە مرۆڤایەتییدا، لە نەسەبو ڕەچەڵەکی نیزیکدا، وەك گەلو

نەتەوە، یان لە هی دووردا، وەك مرۆڤ، کە هەموومان دەچینەوە سەر ئادەمو حەووا سەلامی خوایان لەسەر بێ، بابو دایکی مرۆڤایەتیی، یەك بابو دایکن، کەواتە: هەموو مرۆڤەکان بەلای کەمەوە لەو ڕەچەڵەکە دوورەدا دەبنەوە بە خوشكو برا.

## پەیامەکەی صالح ﷺ لە حەوت بڕگەدا :

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ ﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم! ئەی گەلەکەم، واتە: منیش لە ئێوەم، ئێوەش لە منن، من بەشێکم لە ئێوەو لە نێو ئێوەدامو، قازانجی ئێوە قازانجی منیشە، زیانی ئێوە، زیانی منیشە، خۆشبەختییتان، خۆشبەختیی منە، ناڕەحەتییو گرفتارییتان ناڕەحەتییو گرفتاریی منە، کەواتە: من لە ئێوەمو، بۆ ئێوەمو، دڵسۆزم بۆ ئێوە، گوێم بۆ بگرن! ئاوا هەستیان دەجووڵێنێ، هەمیشە ئینسان دەبێ بە گفتو لفتی شیرین بە ڕووی خۆشو، پێش ڕواڵەتی چاك، کە بریتیە لە گفتو لفتی شیرینو، ڕووی خۆشو گەش: بە دڵێکی پڕ لە دڵسۆزییو بەزەییو پەرۆش، خەڵك بدوێنێ، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وابوون.

**بڕگەی دووەم :** ﴿ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴾، خوا بپەرستن! جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، واتە: جگە لەو پەرستراوێکی دیکەی ڕاستەقینە، کە شایستەی پەرستن بێ، نیتانە، ئنجا کە صالح هەروەها هوود پێشترو، شوعەیب دواترو، پێشتریش نووح، کاتێك کە هەموو ئەو پێغەمبەرانە بە گەلەکانیان دەڵێن: ﴿ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، دیارە چەمکی عیبادەتو پەرستن لەلایان زانراو بووە، نەك وەك زۆربەی مسوڵمانانی ئێستا، کە تێیدا بە هەڵەداچوونو لەلایان زۆر بچووك بۆتەوە، پێیان وایە عیبادەت تەنیا بریتیە لە درووشمەکان: نوێژو ڕۆژوو زیکرو پاڕانەوە!

لە ڕاستییدا عیبادەت، واتە: ئەوپەڕی ملکەچییو، خۆشویستنو، بە گەورەگرتنو، سامو شەرمو هەیبەت، بەرانبەر بە خواو: ئەوپەڕی پشت پێبەستن،

بۆ خوا ﷻ، ئەوە مانای بەندایەتییە بۆ خوا، ئەوە مانای: ﴿ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾، (خوا بپەرستن)ە، خوا پەرستیی (عبادة الله)، یانی: بەتەواویی مرۆڤ لە بەرانبەر خوادا تەسلیم بێ‌و، ئەو ئایین‌و بەرنامەیەی کە ناردوویەتی، بە دڵ‌و بە گیان وەریبگرێ‌و، بەپێی توانا پابەندی بێ‌و جێبەجێی بکات، لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا، نەك تەنیا لە بواری ژیانی کەسیی، یان لە بواری دروشمەکان (شعائر)دا، بەڵکو لە ژیانی سیاسیی‌و ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی دا، پێش ئەوەش: جیهانبینیی‌و بووناسیی، ئنجا ڕەوشت‌و ئاکارو هەڵسوکەوتەکاندا، لە هەموو ڕوویێکەوە، ملکەچ بێ بۆ خواو، بە دڵ‌و گیان خوا ﷻ لەلای لە هەموو شتێك‌و کەسێك خۆشەویستتر بێ‌و، گەورەتر بێ‌و، بەرزترو بەڕێزتر بێ‌و، زیاتر جێی سام‌و شەرم‌و هەیبەت‌و ڕێزو حورمەت بێ.

**برگەی سێیەم** : ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾، ئەو ئێوەی لە زەویدا دروستکردووەو پێگەیاندوە، ئەمە هۆکار هێنانەوەیە بۆ ڕستەی پێشێ، کە دەفەرموێ: خوا بپەرستن‌و جگە لە پەرستراوێکی دیکەتان نیە: بۆچی هەر ئەو بپەرستین؟! چونکە بەس ئەو ئێوەی دروستکردووەو پێگەیاندووەو مشووری لێ خواردوون.

پسپۆڕانی زمان دەڵێن: (الإِنْشَاءُ: الإِيْجَادُ وَالإِحْدَاث)، (إنشاء)، یانی: پەیدا کردن، بەڵام لە ڕاستییدا (إنشاء) تەنیا پەیداکردن‌و وەدیهێنان نیە، بەڵکو پەروەردە کردن‌و، مشوور لێخواردن‌و، بەسەر ڕاگەیشتنیش، دەگەیەنێ.

**برگەی چوارەم** : ﴿وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا﴾، ئێوەی لە زەویدا کردوە بە ئاوەدانکەرەوە، واتە: ئێوەی داناوە کە سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوە، ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾، خوا ئێوەی لە زەویدا دروستکردووەو پێگەیاندوە، ئاشکرایە ئادەم ڕاستەوخۆ لە قوڕی زەوی، کە ئاوو گڵە تێکەڵ دەبێ، دروست بووە، کە پێشتر لە سووڕەتی (الأعراف)دا بە تەفصیلێ باسمان کردوە، ئەدی وەچەی ئادەم؟ وەچەی ئادەمیش کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ١٢﴾المؤمنون، واتە: بەدڵنیایی مرۆڤمان دروستکردوە لە

پوختەیەكی وەرگیراو لە قوڕ، كەواتە: لە ڕاستیدا ئێمەش هەر دەگەڕێینەوە بۆ خاكو ئاوی زەوی، بۆچی؟ چونكە ئێمە جەستەمان لەچی دروست دەبێ؟ لەو خواردنانەی لە ڕووەكن، یان ئاژەڵن، یان پەلەوەرن، كە ئەوانەش هەموویان لە زەوی پەیدا دەبن، ئەو خواردنانە دەبن بە خوێن، دوایی دەبن بە نوتفەو مرۆڤ لەو نوتفەیە دروست دەبێ، هەروەها دواتریش جەستەی مرۆڤ هەر لەو شتانە دروست دەبێ، كە لە زەویدا پەیدا دەبن.

**بڕگەی پێنجەم** : ﴿ فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ﴾، داوای لێبوردنی لێبكەن، واتە: مادام خوا ﷻ ئێوەی دروست كردووەو پێگەیاندوە لە زەویدا، ئاوەدانكردنەوەی زەویشی بە ئێوە سپاردوە، كەواتە: داوای لێبوردنی لێبكەن، واتە: ئەو هەڵەو كەموكوڕییانەی بووتانن، دانیان پێدا بێنن‌و، بیانبینن‌و، خۆتانیان لێ دەرباز بكەن، خۆتانیان لێ بێزار بكەن.

**بڕگەی شەشەم** : ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾، ئنجا دواییش بگەڕێنەوە بۆ لای، چونكە ئینسان تاكو پاك نەبێ، چاك نابێ، ئینسان تاكو بێزار نەكرێ، لە سیفەتە خراپەكان، ناڕازێتەوە بە سیفەتە باشەكان‌و، شایستەی ئەوەش نابێ، كە لە خوا نیزیك بێتەوە.

**بڕگەی حەوتەم** : ﴿ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ ﴾، بێگومان پەروەردگاری من نیزیكەو وەڵامدەرەوەشە، ئەمە ئومێدەوار كردنیانە، واتە: ئەگەر واتانكرد، خوا نیزیكە لێتان، دەتانبوورێ‌و، تۆبەتان لێ قبووڵ دەكات.

لێرەدا: نیزیك ﴿ قَرِيبٞ ﴾، خوازراوەتەوە، چونكە ئەگەر كەسێك لە كەسێك نزیك بێ، بەزەیی پێیدادێ، هاوكاری دەبێ، چاكەی لەگەڵدا دەكات، ڕێزی دەگرێ، بەڵام ئەگەر لێی دووربوو، ئەو كاتە ناتوانێ هاوكاری بێ‌و، ناتوانێ هیچی چاكی بۆ بكات، دەگوترێ: فڵان كەس دوورە دەستم نایگاتێ، لێرەدا مەبەست ئەوەیە، ئەگەرنا خوا ﷻ لەسەر عەرشی خۆیەتی، لە دەرەوەی دروستكراوەكانی خۆی بەو شێوەیەی كە بۆ خوا شایستەیە.

کەواتە: لێرەدا وشەی: ﴿ قَرِيبٌ ﴾، یان لە شوێنێکی دیکەدا، وشەی: (بعيد) ئەو دوو وشەیەی: (قريب و بعيد)ە، خوازراونەوە بۆ بەزەیی نواندنی خوا لەگەڵ بەندەکانیدا، یاخود لێ تووڕەبوونی بۆیان‌و، چاکە نەکردنی لەگەڵیاندا.

## مەسەلەی دووەم :

## وەڵامی گەلی ثەموود بۆ صاڵح :

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ ﴾:

**ئەم ئایەتەش لە سێ بڕگەدا ڕوون دەکەینەوە:**

**بڕگەی یەکەم :** خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ ﴾، واتە: گەلی ثەموود گوتیان: ئەی صاڵح! تۆ پێش ئەمە، لە نێو ئێمەدا جێی ئومێد بووی، واتە: زۆر دڵمان پێت خۆشبوو، جێی ئومێد بووی، متمانەمان پێت هەبوو، باوەڕمان پێت هەبوو، هەندێ لە توێژەران گوتوویانە: (أي: كُنْتَ مَوْضِعَ أَمَلِنا للسِّيَادَة) شایستەی ئەوە بووی دڵمان پێت خۆش بوو، کە بتکەینە مشوورخۆرو سەرۆکی خۆمان.

بەڵام پێم وانیە مەبەستیان ئەوە بووبێ، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بووە، کە تۆ جێی ئومێد بووی‌و دڵمان پێت خۆش بوو، سیفەتی باشت هەبوون، ئەدی ئێستا چی لێهاتوە، دوای ئەوەی بۆتە پێغەمبەر؟ وەك ئێستا هەڵگەڕابێتەوە، لەوەی جێی ئومێد بێ! بێگومان قسەکەیان ئەوە دەگەیەنێ، واتە: ئێمە لێت بێ ئومێد بووین، ئێستا هیچ تەمامان پێت نەماوە، ئومێدی خێرمان پێت نەماوە.

ئنجا تەماشا بکەن !

ئینسان کە دایە نەفامیی زۆر عەجایبە! صالح ﷺ پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر، دیارە هەموو پێغەمبەران هەر وا بوون: دەست پاكو، کردەوە چاكو، ڕەفتار جوان بوون، خەڵك خۆشیویستوونو، متمانەی پێیان هەبووە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ۝١٢٤ ﴾الأنعام، واتە: خوا دەزانێ پەیامی خۆی لە کوێ دادەنێ‌و، بە کێی دەسپێرێ، هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێش ئەوەی ببنە پێغەمبەریش: مەعدەنێکی پاكو، ڕەوشتیکی بەرزو جوانو، عەقڵێکی سەلیمو، کەسایەتییەکی سەنگینو قورسو، جێی باوەڕو متمانەی خەڵکیان هەبووە، ئنجا خوا ﷻ بە شایستەی ئەوەی زانیون، دیارە پێشتر خوای کاربەجێ سازی کردوون، کەچی دوای ئەوەی صالح ﷺ بۆتە پێغەمبەری خوا، لە جیاتی ئەوەی زیاتر پێی ئومێدەواربنو، دڵی پێ خۆش بکەن، گوتوویانە: ئێستا لێت نائومێد بووین!

**برگەی دووەم :** گەلی ثەمود هەر بەردەوام دەبن لەسەر قسەکەیانو دەڵێن: ﴿ أَتَنۡهَىٰنَآ أَن نَّعۡبُدَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾، ئەو هەمزە (أ)یەی سەر (أَتَنۡهَىٰنَآ)، (هَمْزَةُ الإِسْتِفْهَام الإِنْكَارِيّ)یە، بۆ سەرزەنشت کردنو بۆ نکوولیی لێکردنە، واتە: شتیکی زۆر سەیرە، یانی: ئایا تۆ ڕێمان لێ دەگری‌و پێشگیریمان لێدەکەی، ئەو شتانە بپەرستین، کە بابو باپیرانمان دەیانپەرستن؟ یانی: زۆر جێی سەرسوڕمانە، تۆ چۆن ڕێچکەیەك کە بابو باپیرانمان لەسەری بوون، دەتەوێ ئێمە لەو ڕێچکەیە لابدەین، پەرستراوانێك کە ئەوان پەرستوویانن، دەتەوێ ئێمە دەست لەوان هەڵبگرین؟!

**برگەی سێیەم :** ئنجا دەڵێن : ﴿ وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٍ ﴾، بێگومان، بە جەختکردنەوە ئێمە لە دوودڵیی داین، لەوەدا کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، دوودڵییەکی بێزارکەرو ناڕەحەتکەر، دوودڵییەکی وا، کە ئێمەی خستۆتە دڵەڕاوکەوەو بێزاری کردووین.

شارەزایانی زمان دەڵێن: (المريب: اسْم فَاعِلٍ مِنْ أَرَاب يُرِيبُ: أَوْقَعَ فِي الرَّيب، رَابَهُ وَأَرَابَهُ: أَوْقَعَهُ فِي الشك، وَهَذَا تأكيد للشك مِثْل: إِذَا جَدَّ الجِدُّ).

واتە: (مریب)، (اسم فاعل)ە، لە وشەی (أراب، یُریب)، واتە: خستیە دوودڵیی، (رابه أرابه)، هەردووكیان بە مانای (أوقعه فِي الشك)دێن، واتە: خستیە نێو دوودڵیی، دیارە ئەوەش جەختكردنەوەو داكۆكیی كردنە، بۆ ئەو مانایەی كە لە (شك)دا هاتوە، واتە: دوودڵیی، یانی: دوودڵییەكی زۆر سەخت، عەرەب دەڵێن: (إذَا جَدَّ الجِدُّ) دوای ئەوە كارەكە زۆر بە جیددیی‌و زۆر بە چاكیی هاتە پێش.

لە سوورەتی (هود)دا ئاوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾.

بەڵام لە سوورەتی (إبراهیم)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: ئێمە لە دوودڵیی داین، لەوەدا كە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەكەی، دوودڵییەكی بێزاركەرو ناڕەحەتكەر، ئنجا (الخطيب الإسكافي) لە كتێبەكەی خۆیدا: (غُرَّة التأويل في دُرَّة التنزيل)[1]دا، دەڵێ: هی یەكەمیان {ئەوەی سوورەتی (هود)} دواندنی (ثمود)ە، بۆ صاڵح، كە صاڵح بە تەنیا بووە: ﴿ وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ ﴾، واتە: وە ئێمە لە دوودڵییەكی بێزاركەر داین لەوەدا كە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەكەی.

بەڵام ئەوەی دووەمیان {هی سوورەتی (إبراهیم)} كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: ئێمە لە دوودڵیی داین لەوەدا كە ئێوە ئێمەی بۆ بانگ دەكەن، بۆیە دەبوو هەر بەو شێوەیە بێ.

ئنجا لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ ﴾، بەڵام لە هی سوورەتی (إبراهیم)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ ﴾، چونكە ئەوان یەك گەل بوون: گەلی ثەموودو دیارە هەموویان لە دوودڵیی دا بوون بەرانبەر بەوەی كە صاڵح هێناویەتی، بەڵام ئەوانی دیكە چەند گەلێكی جۆراوجۆر بوون، بۆیە ڕەنگە هەندێكیان لە

---

١) ص، ١٥٩ و ١٦٠.

دوودڵییەکی سەختدا بوون، وە هەندێکیان گومانێکی زاڵیان بووبێ، بۆیە بەم شێوەیە تەعبیری لێکردوە: ﴿ وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ ... ﴾.

**مەسەلەی سێیەم:**

## وەڵامی صالح عليه السلام بۆ گەلەکەی:

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي مِنۡهُ رَحۡمَةٗ فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنۡ عَصَيۡتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيۡرَ تَخۡسِيرٖ ﴿٦٣﴾ وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ ﴿٦٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە نۆ (٩) برگەدا

**برگەی یەکەم:** ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ ﴾، واتە: دووبارە (صالح)، فەرمووی: ئەی گەلەکەم! وەك پێشتریش باسمان کردوە، هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کاتێك کە خەڵك و کۆمەڵگای خۆیانیان دواندوە، ویستوویانە هەست و سۆزیان بجووڵێنن و، تێیان بگەیەنن کە ئەوانیش یەکێکن لەوان، وە بۆیان دڵسۆزن و بە پەرۆشن.

**برگەی دووەم:** ﴿ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي ﴾، واتە: هەواڵم پێبدەن! ئەگەر من لەلایەن پەروەردگارمەوە، لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشنبم.

چونکە وشەی ﴿ بَيِّنَةٖ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کردوە واتە: بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا، کە بەرانبەر نەتوانێ سەرەخەریی لام و جیمی لە ڕاست دا بکات، بەڵگەیەك هێندە ڕوون و ئاشکرا بێ، کە سەلمێنەری دەعوایەکە بێ و، کە

ئەو کەسەی دەیهێنێتەوە بتوانێ دەعوایەکەی خۆی پێ ئیسپات بکات، کە بە تەئکید هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان پێبوە بۆ گەلەکانیان، کە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆیانی پێبکەن، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەو موعجیزانەی، کە بەرانبەرەکانیان دەستەوسان کردوون، ئەوە ئەگەر مەبەست لە: ﴿بَيِّنَةٍ﴾، موعجیزە بێ.

بەڵام ئەگەر مەبەست پێی ئەو پەیامو بەرنامەیە بێ، کە خوا بۆی ناردوونو، چاكو خراپو، حەڵاڵو حەرامو، ڕاستو چەوتو، هەقو ناهەقی زۆر ڕۆشن لێك جیاکردوونەوە، ئەوەش دیسان دەگونجێ، کە مەبەست لە ﴿بَيِّنَةٍ﴾، ئەو پەیامو بەرنامەو وەحییە بێ، کە خوا بۆی ناردوون، یان ئەو کتێبە بێ، کە خوای پەروەردگار پێی داون، کە مەرج نیە کتێبێك بووبێ کە لە نێوان دوو بەرگدا، بەڵام بە تەئکید هیچ کام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەبووە، کە خوا فەرمایشتی خۆی بۆ نەناردبێ، ئنجا چ خرابێتە نێوان دوو بەرگەوە، وەك قورئانو تەوڕاتو ئینجیلو زەبوورو کتێبەکانی دی، کە پاڵ دەدرێنە لای خوای پەروەردگار، ئنجا ئایا چەندیان ڕاست ماوەو، چەندیان گۆڕراوە؟ یان نەخرابێتە نێوان دوو بەرگەوە، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە صەڵات سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، کە یەکەم: بەرنامەو کتێبێکی پێنەدات، چ نووسراو، چ لەبەرکراو، پاشان: موعجیزەو بەڵگەیەکی پێ نەدات، کە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی پێبکات، کە بە هەردووکیان: هەم بە بەرنامەکەو، هەم بە موعجیزەکە، دەگوترێ: ﴿بَيِّنَةٍ﴾.

ئنجا صالح عليه السلام دەفەرموێ: هەواڵم پێبدەن، ئەگەر من لەلایەن پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرا بم.

**برگەی سێیەم :** ﴿وَءَاتَىٰنِي مِنۡهُ رَحۡمَةً﴾، ئنجا خوا لەلایەن خۆیەوە بەزەییەکی تایبەتیی پێدابم. کە لێرەدا مەبەست پێی وەحییو پێغەمبەرایەتییو

ئـەو پەیوەندییـە تایبەتییەیـە، کـە پێغەمبـەران هەیانـە لەگـەڵ خـوای پەروەردگارداو، خەڵکی دیکە نیەتی.

**بـڕگـەی چـوارەم :** ﴿فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ﴾، ئنجا ئـایا کـێ لەلایەن خواوە سەرم دەخات، ئەگەر سەرپێچییم لێکرد؟! واتە: ئەگـەر مـن سەرپێچیی لە خوا بکەم، بێگومان ئەویش سزام دەدات، ئنجا کـێ دەتوانێت سزای خوام لێ بەرپەرچ بداتەوەو بەرگرییم لێ بکات لە بەرانبەر سزای خوادا.

**بـڕگـەی پێنـجـەم :** کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيْرَ تَخْسِيرٍ﴾، واتە: ئێوە بێگومان جگە لە زیانبارکردنو سەر بەفەتارەت دان، هیچم بۆ زیاد ناکەن.

پێشتر باسمان کرد (التخْسِير: مَصْدَرُ خَسَّرَ، إِذَا جَعَلَهُ خَاسِراً، أَو غَيْرَ أَنْ أَعُدَّكُمْ خَاسِرِين)، (تَخْسِير) چاوگی (خَسَّر، يُخَسِّر، تَخْسِيراً).

واتە: کە ئێوە بمگێڕن بە زیانبار، جگە لەوە شتێکی دیکەم بۆ زیاد ناکەن، یان: ئێوە هەر ئەوەم بۆ زیاد دەکەن، کە من ئێوە بە زیانبار دابنێم، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە دەنگمەوە نایەن.

**بـڕگـەی شەشـەم :** ﴿وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً﴾، واتە: وە ئەی گەلەکەم! (دووبارەی دەکاتەوە ئەی خەڵکەکەم، کۆمەڵگایەکەم!) ئا ئەمە حوشتری خوایە، بۆ ئێوە نیشانەیە، بۆیە دەفەرموێ: حوشتری خوا، چونکە بە شێوەیەکی تایبەت، واتە: بە هێزو توانای یاسا دڕ(خارق العادة)ی خوا، هێزو توانایەك کە پێچەوانەی حاڵەتی ئاسایيو سروشتی دروستبوونی حوشترانە، ئەو حوشترە دروست بووە، کە لە چیایەك هاتۆتە دەرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿لَكُمْ ءَايَةً﴾، نیشانەیە بۆ ئێوە، واتە: نیشانەیەکە بۆ ئێوە، کە بزانن من پێغەمبەری خوامو، لەگەڵتان ڕاست دەکەمو پەیامی خوام بۆ هێناون.

**بـڕگـەی حـەوتـەم :** ﴿فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِ﴾، دەجا دەستی لێهەڵگرنو وازی لێبێننو لێیگەڕێن، با لە زەوی خوادا بخوات، واتە: با لەو لەوەڕگاو

پاوانو ئاوو کانیاوە، بخواتو بخواتەوەو بلەوەڕێ کە خوا دروستی کردوەو، هیچتان دەستتان لە وەدیهێنانیدا نیە، حوشتری خوایەو لە بژێوی خوادا دەلەوەڕێ، لێیگەڕێن با لە زەوی خوادا، لەسەر ڕزقی خوا بلەوەڕێ، هیچ ئەرکێکی لەسەر ئێوە نیەو، هیچ بارگرانیی بۆ ئێوە نیە.

**بڕگەی هەشتەم :** ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ﴾، بە خراپە دەستی مەگەیەننێ، واتە: زیانی پێ مەگەیەننو دەستی لێمەوەشێنن.

**بڕگەی نۆیەم :** ﴿فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ﴾، واتە: (ئەگەر وابکەن) سەرەنجام سزایەکی نیزیك دەتانگرێ، یانی: پەروەردگار بە تایبەت بۆ ئێوە، ئەو حوشترەی ڕەخساندوە، تاکو بزانن کە من پێغەمبەری خوام، ئنجا جگە لەوە کە موعجیزەیەکیشە، لێشی بەهرەمەندن، چونکە - وەك دواتر باسی دەکەین - لە کتێبە مێژووییەکانو سەرچاوە کۆنەکاندا هاتوە، کە ئەو حوشترە هێندەی شیر هەبووە، ئەو خەڵكو هۆزو عەشیرەتەی ثەموود، هەموویان دۆشیویانەو شیرەکە بەشی هەمووانی کردوە، کە ڕۆژێك شیریان لێ دۆشیوەو، ڕۆژێکیش ئەو ئاوی کانیاوەکەی خواردۆتەوە، وەك لە ئایەتەکانی سووڕەتی (الشعراء)دا ئاماژەی پێدەکات، دوایی لە کاتی خۆیدا لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل لەبارەیەوە دەکەین، لە سووڕەتی (الحجر)دا خوا پشتیوان بێ، ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الأعراف)دا، باسی ئەوەمان کردوە کە ئەو حوشترە چۆن پەیدابووە.

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە دەستی بگەیەننێ سزاو ئازارێکی نیزیك دەتانگرێ، یانی: ئەو سزاو ئازارەی خوا لێتان دوور نابێ، مادام ئێوە بەرانبەر بە پێغەمبەری خواو موعجیزەکەی، ئاوا بێئەدەبیی بکەن، خوای دادگەریش سزاتان دەدات.

**مەسەلەی چوارەم:**

## باسی هەڵوێستی گەلی ثەموود:

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ۖ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ ﴾.

**ئێمە لە سێ بڕگەدا ئەم ئایەتە دەتوێژینەوە:**

**بڕگەی یەکەم:** ﴿ فَعَقَرُوهَا ﴾، واتە: سەریان بڕی، یاخود چوار پەلیان بڕی، کە لە زمانی کوردییدا وەختێك ئاژەڵێك دوو لاقی پاشەوەی، کە پێیان دەگوترێ: پاشووەکان، دەبڕدرێن، یاخود ئەگەر هەر چوار پەلی ببڕدرێن، دەگوترێ: پەی کرا، پەییان کرد، واتە: هەر چوار پەلیان بڕی، چونکە ئەو ئاژەڵە گەورانەی وەك: گا، حوشتر، کەڵ، ئەگەر پێیان نەبڕدرێ‌و نەکەوێنرێن، بە ئاسانیی بەردەست نابن‌و سەرنابڕدرێن.

لە سوورەتی (الشمس) ئایەتەکانی: (١١و ١٢و ١٣)دا خوای پەروەردگار ئاوا باسی سەربڕینەکەی، یاخود باسی پەل بڕین‌و، پاشان سەربڕینی حوشترەکەی صالح دەکات: ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴿١١﴾ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا ﴿١٣﴾ ﴾.

واتە: ثەموود بەهۆی یاخی بوونیانەوە: (بێبڕوابوون‌و) پێغەمبەری خواو پەیامی خوایان بە درۆ دانا، کاتێك کە خراپترینی ئەو هۆزەی ثەموود، دەرچوو، ڕاپەڕی، (تاکو ئەو حوشترە سەربڕێ)، پێغەمبەری خوا پێی گوتن: ئەمە حوشتری خوایە، وازی لێبێنن با ئاو بخواتەوە، (بەڵام ئەوان بەقسەیان نەکردو سەریانبڕی).

ئنجا لە سوورەتی (الشمس)دا دەفەرموێ: ﴿ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا ﴾، خراپترینی خەڵکەکە بۆی دەرچوو کە سەری ببڕێ، بەڵام لە سوورەتی هوودا دەفەرموێ: ﴿ فَعَقَرُوهَا ﴾، واتە: هەموویان سەریانبڕی، چونکە ئەو یەکە کە سەری بڕیوە، ئەوانی دیکەش پشتگیریی‌و هاوکارییان کردوەو، هەموویان ڕازی بوون، ئنجا کەسێك سەرۆك‌و دەمڕاست‌و نوێنەری خەڵكێك بێ، کە شتێکی کرد، مادام خەڵکەکە هەموویان هاوکارو پشتگیری بن‌و لێی ڕازیبن، کەواتە: هەموویان هاوبەشن لەو کردەوەدا کە دەیکات، ئنجا ئەگەر چاکە بێ، هەموویان تێیدا هاوبەشن‌و لێی بەهرەمەندو، ئەگەر خراپەش بێ، هەموویان تێیدا هاوبەشن‌و لێی زەرەرمەندن.

**بڕگەی دووەم**: ﴿ فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖ ﴾، صالح عليه السلام گوتی: لە ماڵەکەی خۆتاندا سێ ڕۆژان ڕابوێرن‌و بیگوزەرێنن.

(التَمَتُّعُ: الإِنْتِفَاع بالمتاع)، (تَمَتُّع) بریتیە لە بەهرە وەرگرتن لە شتێك، کە جێی بەهرە لێوەرگرتنە، بە شێوەیەکی کاتیی.

ئنجا جێی تێبینی ئەوەیە، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فِي دَارِكُمۡ ﴾، بەڵام دوایی بۆ کاول بوون، دەفەرموێ: ﴿ فِي دِيَٰرِهِمۡ ﴾! حیکمەتەکەشیی بەم شێوەیە: ﴿ فِي دَارِكُمۡ ﴾، واتە: هەموو ماڵەکانی ئەوانی وەك یەك ماڵ داناون، چونکە هەموویان یەك هەڵوێست بوون لە بەرانبەر سەربڕینی حوشترەکەو، بە درۆدانانی پێغەمبەری خوادا عليه السلام، بۆیە خانووو ماڵەکانی هەموویانی، وەك یەك ماڵ داناوە.

بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ فِي دِيَٰرِهِمۡ ﴾، لە ماڵەکانیاندا، لەبەر ئەوەیە کە هەر کامێکیان سزای خۆی وەرگرتوە بۆیە ئەو وشەیە بەکاردێنێ، چونکە هەر کامێکیان لە ماڵی خۆیدا لەگەڵ زەویدا تەخت‌و یەکسان بووە، بۆیە خوا جل جلاله لەوێ دەفەرموێ: ﴿ فِي دِيَٰرِهِمۡ ﴾، چونکە هەر کامێکیان بەتایبەتی

لە ماڵی خۆی دا سزا دراوەو، لەگەڵ زەوی دا تەخت بووە، بەڵام لێرەدا کە هەموویان وەك خەڵکی، یەك ماڵو ئەهلی یەك خانوو بن، هەڵوێستیان وەرگرتوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فِي دَارِكُمْ﴾، واتە: لە ماڵی خۆتاندا.

**برگەی سێیەم :** ﴿ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾، واتە: ئا ئەوە بەڵێنێکە کە ناڕاست نیە، یانی: درۆی تێدا نیە.

﴿مَكْذُوبٍ﴾: (الَّذِي يُخْبِرُ بِهِ الكاذِب)، واتە: درۆ تێدا کراو، کە درۆزنێك هەواڵێك دەدا بە شتێك، هەواڵەکەی پێی دەگوترێ: ﴿مَكْذُوبٍ﴾، جا یان بە مانای (مَكْذُوب فيهِ)، واتە: درۆ تێدا کراو، یاخود چاوگە (مَكْذُوب) واتە: درۆ، وەك: (كَذَبَ، يَكْذِبُ، كِذْباً، وَكَذْباً، وكَذِباً، وَمَكْذُوباً).

**مەسەلەی پێنجەم :**

## باسی هاتنی سزای خوا عزّ وجلّ:

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ ﴾.

**ئێمە لە پێنج برگەدا ئەم ئایەتە موبارەکە شی دەکەینەوە :**

**برگەی یەکەم :** ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾، واتە: کاتێك فەرمانی ئێمە هات، واتە: ڕووداوەکە هات، یان بڕیاری ئێمە دەرچوو، کە ئەو بەڵایە بێ، کە چریکەیەکی گەورە بوو گرتنی.

واتە: ﴿أَمْرُنَا﴾، یان بە مانای دەرچوونی بڕیارەکەیە، یاخود بە مانای هاتنی بەڵایەکەیە، ئنجا ئەگەر بە مانای هاتنی بەڵایەکە بێ، واتە: کاتێك کە بەڵایەکەی ئێمە نیزیك کەوتەوە بێ، چونکە کە بەڵایەکە هاتوە، لەو کاتەدا

لەو گەرمە گەرمەدا، صالحو ئەوانەی لەگەڵی دا بڕوایان هێناوە، دەرباز نەبوون، ئەگەر بەڵایەكە هاتباو لێی دابان، ئەوان لەو كاتەدا دەرباز نەدەبوون، بەڵكو پێشتر دەربازبوون، كەواتە: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا ﴾، یانی: كاتێك بەڵاكەی ئێمە خەریك بوو بێ، یان كاتێك بڕیاری ئێمە دەرچوو بە هاتنی بەڵایەكە.

**بڕگەی دووەم** : ﴿ نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا ﴾، صالحو ئەوانەی لەگەڵیدا بڕوایان هێنابوو، بە بەزەییەكی تایبەت لەلایەن خۆمانەوە دەربازمان كردن، هەموویانمان ڕزگاركردن لە فەوتاندن.

**بڕگەی سێیەم** : ﴿ وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍ ﴾، هەروەها لە ڕیسوایی ئەو ڕۆژەش قوتارمان كردن.

﴿ يَوۡمِئِذٍ ﴾، ئەو (تنوین)ە كە لەسەر ﴿ يَوۡمِئِذٍ ﴾ە، (عِوض عَنْ المضاف إلَيْهِ)، واتە: (يَوْمَ إذْ جَاءَ أَمْرُنا)، لە زمانی عەرەبییدا جاری وایە (تنوین) (ـٍـٌ)، واتە: دوو ژێر (كسرة)، یان دوو سەر(فتحة)، یان دوو بۆر (ضمة)، لە جێی وشەیەك، بەڵكو جاری وایە لە جێی ڕستەیەك دادەنیشێ.

ئێستا ئەم دوو ژێرەی وشەی: ﴿ يَوۡمِئِذٍ ﴾، ئەو (تنوین)ە لە جێی ئەم ڕستەیەدایە: (يَوْمَ إذْ جَاءَ أَمْرُنا)، واتە: ئەو ڕۆژەی كە فەرمانی ئێمە هات، ئەو ڕۆژەی كە ئەو بەڵایەی ناردبوومان هات، ئێمە ئەوانمان، (واتە: صالحو ئەوانەی بڕوایان پێهێنابوو) لە ڕیسوایی‌و زەبوونیی ئەو ڕۆژە ڕزگار كردن.

ئەوەی پێشێ كە دەفەرموێ: ﴿ نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا ﴾، واتە: بە بەزەیی یەك لە خۆمانەوە، ڕزگارمان كردن (لە بەڵایەكە لە ڕووی ماددیی‌و جەستەییەوە)، بەڵام ئەمەیان: ﴿ وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍ ﴾، یانی: لە ڕیسوایی ئەو ڕۆژەش قوتارمان كردن، چونكە بەڵایەكە دوو ڕووی هەبوون:

أ / ڕوویەکی جەستەییو ماددیی، کە بریتی بوو لە فەوتانو لەبەینچوونو لەگەڵ زەویدا تەخت بوون.

ب/ ڕوویەکی مەعنەویی، کە بریتی بوو لە ڕیسواییو زەبوونییو شەرمەزار بوون، کە لە حەقیقەتدا سزاو ئازارە مەعنەوییەکەش کەمتر نەبووە لە سزا ماددییو جەستەییەکە.

**برگەی چوارەم :** ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْعَزِيزُ﴾، بێگومان هەر پەروەردگارت بەهێزی زاڵە، یانی: توانایىو بە هێزییو، دەستڕۆیشتوویىو باڵادەستیی خوا، ئیماندارانی بەهێز کردو پاراست، بە لایەکی دیکەشدا: ئەوانەی کە بێبڕواو خراپەکاربوون، خوا بە هێزی خۆیو بە باڵادەستییو زاڵیی خۆی، مامەڵەی لەگەڵدا کردن، بۆیە فەوتاندنی.

دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە خوا بەهێزی خۆی، بڕوادارانی سەرخست لە ڕووی ماددییەوەو، نەیارەکانی لەبەینبردن لە ڕووی ماددییەوەو، بە عیززەتی خۆی ﷻو بە سیفەتی زاڵییو باڵادەستیی خۆی، بڕوادارانی سەرخستو سەربەرزی کردن، وە بێبڕوایانو خراپەکارانیشی زەبوونو شەرمەزار کرد.

**مەسەلەی شەشەم:**

## باسی چۆنیەتی فەوتانی گەلی ثەموود:

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمْۗ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیە لە پێنج بڕگەدا:

**بڕگەی یەکەم:** ﴿وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ﴾، واتە: ئەوانەی کە ستەمیان کردبوو، دەنگێکی زل‌و چریکە گرتنی، لێرەدا خوا نەیفەرمووە: (وَأَخَذ ثَمُودَ بالصَّيْحَة)، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ﴾، واتە: ئەو (ثەمود)ەی کە ستەمیان کردبوو: ستەمیان لە خۆیان کردبوو، لە پێغەمبەرەکەیان کردبوو، لە موعجیزەکەی کردبوو، ستەمیان لە خوای پەروەردگار کردبوو، ستەمیان لە پەیامی خوا کردبوو، ستەمی جۆراوجۆر هەیە، ئەوانەی کە ستەمیان کرد بوو، بەهۆی ستەمەکەیانەوە، دەنگێکی گەورە گرتنی، ﴿ٱلصَّيْحَةُ﴾، واتە: دەنگێکی زۆر گەورەو بێپەرمزا، بە مانای بروسکەو ئاگرێك لە ئاسمانەوەش، دێ، گرتنی.

**بڕگەی دووەم:** ﴿فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ﴾، لە ماڵەکانی خۆیاندا لەپەوڕوو کەوتن، باڵندە کە هەڵدەنیشێ‌و خۆی بە زەوییەوە دەنووسێنێ، پێی دەگوترێ: (الطائِرُ الجاثِم)، ئەوانیش وەك چۆن باڵندە هەڵدەنیشێ‌و بە زەوییەوە تەخت دەبێ، ئاوا لە ماڵەکانی خۆیاندا، تەخت بوون‌و بە زەوییەوە نووسان.

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ﴾، واتە: وەك هەر لەوێدا نەبووبن.

لێرەدا خوا بۆمان وێنا دەكات كە چۆن چۆنی فەوتاون و چییان لێهاتووە؟ واتە: وەك تەنانەت ڕۆژێك ئەوان ئەو ماڵانەی خۆیان ئاوەدان نەكردبێتەوەو تێیان دا نیشتەجێ نەبووبن، چونكە دەڵێ: (غَنِيَ فِي مَكانِ كَذَا، طَالَ مَقَامُهُ فِيهِ مُسْتَغْنِياً بِهِ عَنْ غَيْرِهِ بِغِنَىً)، واتە: لە فلان شوێندا ئەو كەسە نیشتەجێ بووە، بەهۆی ئەو شوێنەوە، بێنیاز بووە لەوە كە بگوازێتەوە بۆ شوێنێكی دیكە.

**بڕگەی چوارەم :** ﴿ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ﴾، ئاگاداربن! ئەها! ثەموود بەرانبەر بە پەروەردگاریان سپڵە بوون.

وشەی: ﴿ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ﴾، شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: ﴿ رَبَّهُمْ ﴾، (منصوبٌ بنزع الخافض)، واتە: لە جیاتی بفەرموێ: (كَفَرُوا بِرَبِّهِم)

دەفەرموێ : ﴿ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ﴾، كە لە زمانی عەرەبییدا، ﴿ كَفَرُوا۟ ﴾، ئەو دوو حاڵەتەی هەن:

أ ـ بە بێ پیت تەعەددا دەكات، بۆ (مفعول بە)، كە ئەوكاتە یانی: بێبڕوابوون بەرانبەر بە پەروەردگاریان.

ب ـ یاخود: ﴿ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ﴾، واتە: سپڵە بوون لە بەرانبەر پەروەردگاریان دا، كە ئەوكاتە پێویستیی بە (ب) ناكات، چونكە (كَفَرَ رَبَّه)، واتە: بەرانبەر بە پەروەردگاری سپڵە بوو، بەڵام (كَفَرَ بِرَبِّهِ) واتە: بەرانبەر بە پەروەردگاری بێبڕوابوو، ئنجا ئەم : ﴿ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ﴾، هەم دەگونجێ بە مانای بێبڕوایی بێ، هەم دەگونجێ بە مانای سپڵەیی نواندن بێ، واتە: ئەو كوفرە دەگونجێ كوفری بێبڕوایی و عەقیدەیی بێ و، دەگونجێ كوفرانی نیعمەت و سپڵەیی و ناسوپاسیی بێ.

یانی: ئاگاداربن! گەلی ثەموود بەرانبەر بە پەروەردگاریان سپڵەو بێوەفا بوون، یاخود بێبڕوا بوون.

**برگەی پێنجەم** : ﴿أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ﴾، واتە: ئاگاداربن! ئەها! دووریی بۆ گەلی ثەموود.

یانی: (یُبْعَدُون بُعْدًا)، واتە: دووربخرێنەوە بە دوورخرانەوە، یاخود: (یُهْلکون)، لەبەین بچن بە لەبەین چوون، یاخود: (یُطْرَدُونَ طَرْدًا)، واتە: دەربکرێن بە دوورخستنەوە لە بەزەیی خواو لە سۆزو میهری خوا، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ کاربەجێیەو بەزەیی‌و میهرەبانیی خۆی تایبەت دەکات بە کەسانێك کە شایستەبن، تەنیا ئەو کەسانەش شایستەن کە وەڵامی بانگەوازی خوا بدەنەوەو، بە دەم بانگی پێغەمبەرەکەیەوە بچن‌و، گوێ بۆ پەیامەکەی بگرن.

وشەی (ثمود)یش، بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە، کە دەفەرموێ : ﴿أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمْ﴾، بەسەر (فتحة) خوێندراوەتەوە (ألا إن ثمودَ)، هەروەها بە: (ثمودا)یش، خوێندراوەتەوە بە تەنوین.

**سێ وردە سەرنج:**

١) لە سوورەتی (الشمس)دا کە پێشتریش باسمان کرد، خوا دەفەرموێ:

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: ئەوان پێغەمبەری خوایان بە درۆ دانا، و حوشترەکەیان سەربڕی، ئنجا پەروەردگاریان بەهۆی گوناهەکەیانەوە، دەنگێکی زلو هەژانێکی گەورەی بۆ ناردن، لە ئەنجامی ئەو دەنگو لەرزینەوە گەورەیەدا، تەختی کرد، (واتە: ناوچەکەیانی یەکسانو تەخت کرد لەگەڵ زەویدا، شارو ناوچەکەیانی تەخت کرد)و، لە سەرەنجامەکەشی ناترسێ.

بێگومان خوا ﷻ ناترسێ کە کەس سزای بدا.

٢) لە بەسەرهاتی (هود)دا، ڕووداوەکانی هەموویان بە (و) هێناون، دەربارەی گەلی هوود ﷺ، دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتە: کاتێك فەرمانی ئێمە هات، هوودو ئەوانەی لەگەڵیدا بڕوایان هێنا بوو، بە بەزەیی تایبەتی خۆمان ڕزگارمان کردنو، ڕزگارمان کردن لە سزایەکی زبرو سەختو بێڕەزا.

٣) بەڵام لێرەدا لە بەسەرهاتی (صالح) دا هەموویانی بە (ف) هێناوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَغْفِرُوهُ ، فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ، فَمَا تَزِيدُونَنِى، فَذَرُوهَا ، فَيَأْخُذَكُمْ، فَعَقَرُوهَا فَقَالَ ، فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ، فَأَصْبَحُوا۟ ﴾ هەموویانی بە (ف) هێناون، بۆیە ئەمیشی بە (ف) هێناوە: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ ﴾.

بەڵام ئەوەی پێشتر ڕووداوەکانی بە (و)ی بادانەوە (عطف) هێنا بوون، کە (و)ی (عطف)، تەنیا گێڕانەوەی ئەوەی دواتر بۆ سەر ئەوەی پێشتر دەگەیەنێ، بەڵام (ف) لەگەڵ بادانەوەو گێڕانەوەدا، بە دوای یەکداهاتنیش دەگەیەنێ، کە ئەوەش بە پێی سیاق، دەگۆڕێ، لە سووڕەتی (هوود)دا باسکراوە کە گەلی ثەموود پەلەیان کردوە لە سەربڕینی حوشترەکەو، لە بە درۆ دانانی پێغەمبەرەکەیاندا ﷺ، بۆیە سزایەکەشیان بە (ف) هاتوە یانی یەکسەرو بێ دواخران !.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٦٩ – ٧٦) کە تەرخان کراون، بۆ گۆشەیەك لە بەسەرهاتی ئیبراهیم ﵇و میوانە بەرێزەکانی، کە ئەویش وەك زەمینەسازییەکە بۆ بەسەرهاتی گەلی لووط و، لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئەم بەسەرهاتەی ئیبراهیم ﵇ لەگەڵ فەوتاندنی گەلی (لوط)دا بە یەکەوە، هاتوون، لەبەرئەوەی لووط برازای ئیبراهیم ﵇ بووە، پاشان خوای کاربەجێ نەیویستوە بە بێ ئاگاداری ئیبراهیم ﵇ گەلی لووط بفەوتێنێ و، وەك دوایی باسی دەکەین: ئیبراهیم ﵇ زۆر بە تەنگ ئەوەوە بووە، کە گەلی لووط ئاوا بەو شێوەیە نەفەوتێنرێن و بەرگریی لێکردوون، هەڵبەتە بەرگریی لێکردوون کە خوا زیاتر مۆڵەتیان بدات و زوو سزایان نەدات، بەڵام دیارە ئیبراهیم ئاگای لەوە نەبووە، کە خوا بڕیاری داوەو، هیچ بوارو دەرفەتی تێدا نەماوەو، دوایی خوا جۆرێ لە پۆزش بۆ ئیبراهیم دێنێتەوە، بەوە کە یەکجار نەرم و هێمن و هێدیی و بە ڕەحم و شەفەقەت بووە.

ئێمە کۆی ئەم بابەتە لە چوار تەوەردا دەخەینە ڕوو:

**تەوەری یەکەم :** هاتنی فریشتەکان، وەك نوێنەرانی خوا ﷻ، بۆ موژدە پێدانی ئیبراهیم کە ئیسحاق و یەعقووبیان پەیدادەبن و، ئیبراهیم ﵇ ئەو فریشتانەی نەناسیون.

**تەوەری دووەم :** کە فریشتەکان لە کاتی ئامادەکردنی خواردن دا، دەستیان بۆ خواردنەکە نەبردوە، ئیبراهیم ﵇ مەترسیی لێیان هەبووە، بەڵام دوایی پێی

ڕادەگەیەنن کە ئەوان بۆ لەبەینبردنی گەلی لووط نێرراون، ئنجا حاڵەتی ترس ڕێنیشتنەکەی نامێنێ.

**تەوەری سێیەم :** هاوسەری ئیبراهیم ﷺ کە ناوی (سارة) خاتوونە خوا لێی ڕازی بێ، کاتێك هەواڵی لەبەینبردنی گەلی لووط دەبیستێو، فریشتەکان موژدەی ئیسحاقو پاشان یەعقووبیشی پێدەدەن، پێدەکەنێو سەری سووڕدەمێنێ، چونکە خۆیو هاوسەری پیر بوون! بەڵام فریشتەکان دووعایان بۆ دەکەنو پێشیان دەڵێن: چۆن کاری خواتان پێ سەیرە!

**تەوەری چوارەم :** ئنجا پاش ترس ڕەوینەوەی ئیبراهیمو موژدە پێدرانی، دەستدەکات بە مشتومڕ لەسەر گەلی لووط ﷺ، بەڵام خوای کاربەجێ پێی دەفەرموێ: ئەم بابەتە بواری قسەکردنی تێدا نەماوە.

﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ ۖ فَمَا لَبِثَ
أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ
مِنْهُمْ خِيفَةً ۚ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ
فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ
وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ
مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا
ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ
لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ
ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ ﴾.

# مانـــای وشــــە بە وشـــەی ئایەتەکـــان

{ بە دڵنیایی (فریشـتە) ڕەوانەکراوەکانـمان موژدەیان بۆ ئیبـراهیم هێـنا گوتیـان: سەلامتـــان لــێ بـێ، (ئیبــراهیم) گـوتی: ئێوەش سـەلامتــان لــێ بـێ، ئیـدی هێنــدەی نەخایاند گۆلکێکی بـرژاوی هێـنا ﴿٦٩﴾ بـەڵام کاتێك دەستیانی بینیـن بۆ لای نـاچـن (دەســتی بـۆ نــابەن، نـایخـۆن) بـۆی نـامـۆ بـوون‌و، ترسـی بەرانبەریــان ڕێ نیشـت (ئەوانیش) گوتیـان: مەترسـە! ئێمە بۆ لای گەلـی لووط نێرراوین ﴿٧٠﴾ ئـافرەتەکەشـی بـە پێـوە بـوو، یـەکسـەر پێکـەنی (لـە شادمــانیی فەوتـانی گەلـی لـووط) ئێمـەش مــوژدەی (لــە دایـکبوونــی) ئیسحــاق‌و دوای ئیسحــاق یـەعقووبیشمــان پێـدا ﴿٧١﴾ (هـاوسەری ئیبـراهیـم) گوتی: ئەی هـاوار بۆ من! ئـایـا من کـە پیـرەژنـم، منداڵم دەبێ، ئەمەش هـاوسـەرمە پیـر بووە؟! بێگومـان ئەوە شتێکی سـەیرە! ﴿٧٢﴾ (فریشتەکانمان) گـوتیـان: بەزەیـی‌و پێـزی خـواتـان لـەسـەر بێ، خەڵکی ئـەم مـاڵە، ئـایا کـاری خـوات پێ سـەیرە! بە دڵنیایی خـوا سـتـایشکراوی پایە بەرزە ﴿٧٣﴾ ئنجا دوای ئەوەی ئیبـراهیم بیمی ڕەویەوەو موژدەی بۆ هات (کە ئەو کوڕەو، ئەو نەوەیـەی پەیدادەبـن) دەسـتی کـرد بە مشتومڕ لەگەڵمان دا، لەبارەی گەلـی لـووطـەوە ﴿٧٤﴾ بە ڕاستیـی ئیبـراهیم هێدیی‌و بە پەرۆش‌و لـە نـاخـەوە گـەڕاوە بـوو (بۆ لای خـوا) ﴿٧٥﴾ (گـوتمـان) ئـەی ئیبـراهیم! واز لـەم (بـاس)ە بێـنە، مسـۆگـەر فەرمـانی پەروەردگـارت (بە لـەبەینـبـردنیان) هـاتـووە، بێگومـان سزاو ئـازارێکی نەگـەڕێنـراوەیـان بـۆ دێ ﴿٧٦﴾ }.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

( بِٱلۡبُشۡرَىٰ ) : (البشارةُ وَالبُشْرَى: الخَبَرُ السارُّ، لأَنَّهُ تَنْبَسِطُ مِنْهُ بَشْرَةُ الوَجْهِ)، (بِشارَةُ) و (بُشْرَى) هەواڵی دڵخۆشکەرە چونکە لە ئەنجامی بیستنی هەواڵی دڵخۆشکەردا، ئینسان پێستی دەمو چاوی دەکرێتەوە گەش و ڕوون دەبێ.

( فَمَا لَبِثَ ) : واتە: هێندەی پێنەچوو، دەگوترێ: (لَبِثَ بالمكانِ، أي: قامَ بِهِ مُلازِماً لَهُ)، (لَبِثَ بالمكانِ) واتە: لە شوێنەکە مایەوە، هێندەی پێنەچوو، هێندەی نەخایاند.

( بِعِجۡلٍ ) : (العِجْلُ)، (ولدُ البقرة) واتە: بێچووی مانگا، بە کوردیی دەڵێین: گۆلك، دەگوترێ: (بَقَرَة مُعْجِلٌ، أي: لَها عِجْل)، (بَقَرَة مُعْجِلٌ) واتە: مانگایەکی خاوەن گۆلك.

( حَنِيذٍ ) : (مَشْويٌّ بَيْنَ حَجَرَيْنِ)، گۆشتێکە لە نێوان دوو بەردی گەرمدا ببرژێنرێ، هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: (حَنِيذ) ئەوەیە کە بە شێوەیەك ببرژێنرێ، هەر تینی ئاگرەکەی بگاتێ، بەڵام نەیسووتێنێ و ئاگرەکەی نەگاتێ.

(نَكِرَهُمۡ ) : نەیناسین، بۆی نامۆ بوون، (الإِنْكار ضِدّ العِرْفَانِ، أَنْكرتُ كَذَا وَنَكرتُ وَأَصْلُهُ أَنْ يَرِدَ عَلَى القَلْبِ ما لاَ يَتَصَوَّرُ، نَكر الشيءَ: جَهِلَهُ، وكذا أَنْكرهُ، وَنَكر وَأَنْكر حقَّهُ: جَحَدَهُ)، (إنكار) واتە: نکوولّیی لێکردن، دان پێدا نەهێنان، یاخود نەناسین، دەگوترێ: (أَنْكرتُ كَذَا وَنَكرتُ) واتە: ئەو شتەم نەناسی، بۆم نامۆ بوو، ئەسڵەکەشی ئەوەیە کە شتێك بەسەر دڵ و عەقڵی ئینساندا بێ، کە نەتوانێ وێنای بکات، دەگوترێ: (نَكِرَ الشيءَ) واتە: ئەو شتەی نەزانی، هەروەها

(أَنْكَرَهُ) واتــە: ئەو شـتەی نەزانـی، بەڵام دەگـوترێ: (نَكر وَأَنْكر حقّهُ) واتــە: دانـی بە مـافـەکـەیـدا نەهێنـا.

(وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً) : واتــە: بەهـۆی وانـەوە ترسـی ڕێنیشـت، ترسـی هـاتــە دڵ، دەگـوتـرێ: {الـوَجْسُ: الصَّـوْتُ الخَفِـي، وَالتَوَجُّس: التَسَمُّع، وَالإِيْجَـاس وُجـود ذَلِكَ فِي النَّفْسِ، وَالوَجْسُ: حَالـة النَّفْسِ بَعْدَ الهـاجِسِ، لأَنَّ الهـاجِسَ مُبْتَـدَأ التفْكير، ثُمَّ يَكونُ الوَاجِسُ (الخَاطـر)}، (وجس)، واتە: دەنگـێکی کپو پەنهـان، (تَوَجُّس)، واتە: گوێ هەڵخستن، (إِيْجَاس)یش ئەوەیە کە ئەو دەنگـە کـپە، بە شێوەیەکی ئەسـپایی بێتە نێو دڵەوە، (وَجْس) حاڵەتێکە بۆ نەفس دێتـە پێـش، لە دوای (هـاجس) چونکە (هـاجس) ئەوەیـە کە لـە سەرەتاوە شـتێکی بە دڵـدا بـێ، دوایی دەبێتـە (واجس) شـتێك پێشـێ لـە دڵیـدا بێـتو بچـێ، بـەڵام دوایی ببـێتـە جۆرێـك لە قەناعەت.

( يَـٰوَيْلَتَىٰٓ ) : واتە: ئەی هـاوار بۆ من، ئـاوا مـانـا دەکـرێ، (الـوَيْلُ: مِـثْـلُ وَيْـح، إِلاّ أَنَّهـا كَلمة عَذَابٍ)، (وَيْحَك) واتــە: بێـقـەزابـی، بـەڵام (وَيْلَـك) واتــە: سـزا بـۆ تـۆ، ئنجا مـەرج نیــە مەبەسـتیشـیان پێـی سـزا بووبـێ، (ويلـه) واتـە: هـاوار بـۆ وی، (الويلـة: الفضيحة) ئـافرەت عـادەتیان وایـە کـە شـتێك دەبـێ، دەڵێن: ئەی هـاوار بۆ مـن! چـۆن ئـەوە دەبـێ؟! شـتێکی هـاتۆتـە ڕێ، شـتێکی بەسـەرهـاتوە، کـە جێی سـەرسـووڕمـانە.

( عَجُوزٌ ) : (العَجوز: سُمّيتْ بذلك لِعَجْزِها فِي كَثِيـر مِنَ الأُمُور)، (عَـجوز) واتـە: پیـرە ژن، پیـرە پیـاو، بـەڵام لێرەدا بـە مـانـای پیـرە ژنـە، بۆیـەش واگـوتراوە، چونکە زۆر شتی بۆ ناکرێو دەستە پاچـەیـە.

( بَعۡلِي ) : (البَعْلُ: هو الذَّكر مِنَ الزَّوْجَيْنِ، الجَمْعُ بعُولة، مِثْلُ: فَحْل وفحولـة)، (بعـل) کە بە (بعـولـة) کۆدەکـرێتـەوە هـەر جووتێك نێرەکەی پێـی دەگـوترێ: (بعـل)، وەك (فَحْل) کـە بە (فحولـة) کـۆدەکـرێتــەوە، دیـارە (فحـل) بۆ ئـاژەڵـە، بە تـایبـەت بۆ نێرەی حوشـتـر، بـەڵام (بعـل) واتــە: پیـاو، مـێرد.

( شَيْخًا ) : (يُقَالُ لمنْ طَعَنَ فِي السّن: شيخ)، هەر کەسێك کە بە تەمەندا چوو، پێی دەگوترێ: (شیخ)، واتە: پیرو پەککەوتە، چونکە بە ساڵدا چووە.

( عَجِيبٌ ) : (العَجَبُ وَالعُجَابُ: الأَمْرُ الَّذِي يُتَعَجَّبُ مِنْهُ، وَلاَ يَجْمَعُ عَجَب وَلاَ عَجِيب، وقيل جمعُ عَجيب عَجَائِب)، هەردووك وشەی (عَجَب) و (عُجَاب) بەمانای شتێکە ئینسان تێیدا سەری سوور بمێنێ، (عَجَب) و (عَجِيب) هیچیان کۆناکرێنەوە، هەندێکیش گوتوویانە: (عَجِيب) بە (عَجَائِب) کۆدەکرێتەوە.

( حَمِيدٌ ) : (الحَمْدُ ضِدّ الذم، حَمِيد: يَصِحّ أَنْ يَكُونَ فِي مَعْنَى المحْمُود، أَوِ الحَامِد)، وشەی (حمید)، واتە: ستایشکراو، مەدحکراو، (الحَمْد)، ستایشکردن پێچەوانەی (الذم)ە، واتە: سەرزەنشت کردن، یاخود بە خراپە باسکردن، (حمید) دەگونجێ بەمانای (محمود) بێ، واتە: ستایشکراو، وە دەشگونجێ بەمانای (حامِدْ)بێ، واتە: ستایشکەر، خوای پەروەردگار ستایشی بەندەکانی دەکات، ئەگەر گوێڕایەڵیی بکەن، خوا ستایشکراوەو ستایشی موتڵەق تەنیا شایستەی خوایە.

( مَّجِيدٌ ) : (المجْدُ: السَّعَةُ فِي الكرمِ وَالجَلاَلِ، المجِيد: أَي يُجْرِي السَّعْةَ فِي بذل الفضل المخْتَصّ بِهِ)، واتە: (مَجْد)، واتە: خاوەن پایەی بەرز، خاوەن کەرەمی زۆر، خاوەن هەیبەتی مەزن، (مجید)، واتە: لە بەخشینی تایبەت بە خۆیدا، دەست ئاوەڵاو دەست کراوەیە.

( ٱلرَّوْعُ ) : {الرُّوعُ: الخَلَدُ: قَالَ النَّبيّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلم (إِنَّ الرُّوحَ الأَمِينَ نَفَثَ فِي رُوْعِي)[1]، والرَّوْعُ إِصَابَةُ الرُّوعِ، وَاستعْمِلَ فِيما أُلْقِيَ فِيهِ مِنَ الفَزَعِ}، وشەی (رُوْع) بەمانای (خَلَدْ) دێ، واتە: بیرو هۆشی ئینسان، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ الرُّوحَ الأَمِينَ نَفَثَ فِي رُوْعِي}، واتە: جبرائیل خستیە دڵمەوە،

---

١) اخرجه ابْنُ أَبي شيبة، برقم : (٣٤٣٣٢)، والبيهقي في شعب الإيمان، برقم : (١٠٣٧٦).

خستیە هۆشمەوە، (رَوْع)یش بریتیە لەوە کە لە هۆشی ئینسان بدرێ، بە جۆریك کە ئینسان بترسێ، سامی ڕێ بنیشی، کە لێرەدا مەبەست پێی ڕاچڵەکینو ترس ڕێ نیشتنە.

( يُجَٰدِلُنَا ) : واتە: مشتومڕمان لەگەڵدا دەکات، (الجِدَالُ: المفَاوَضَةُ عَلَى سَبِيل المنازَعَةِ وَالمغَالَبَةِ، وَأَصْلُهُ مِنْ جَدَلْتُ الحَبْلَ: أَحْكَمْتُ فَتْلَهُ)، (جدال) بریتیە لە وتوویژکردن بەشێوەی دانوستانو مشتومڕ، لە ڕیشەدا لە (جَدَلْتُ الحَبْلَ)ەوە هاتوە، (أَي: أَحْكَمْتُ فَتْلَهُ) واتە: باشم چنیو چاکم هۆنیەوە.

( لَحَلِيمٌ ) : (الحِلم: ضَبْطُ النَّفْسِ وَالطَّبْعِ عِنْدَ هَيَجَانِ الغَضَبِ)، (حِلم) بریتیە لە خۆ کۆنترۆڵ کردن، خۆ مەرزەم کردن لە کاتێکدا کە ئینسان هەڵدەچێو تووڕە دەبێ، واتە: هێدیيو مەندیيو ئارامیی.

( أَوَّٰهٌ ) : (الأَوَّاهُ: الكَثِيرُ التَأَوُّه، وَهو أَنْ يَقُولُ: أَوَّهُ، وَكُلّ كَلامٍ يدلُّ عَلَى الحُزْنِ، يُقَالُ لَهُ: التَأَوُّه، ويُعَبَّرُ بالأَوَّاهِ عمَّن يُظْهِرُ خشية الله...)، (أَوّاه) کەسێکە زۆر (تأَوُّه) بکات ئەویش ئەوەیە بڵێی (ئۆه) لە کاتێك دا کە ئینسان ئازارێکی هەبێ، یان پەرۆشی کەسێك بێ، هەر وشەیەك کە دڵتەنگیی بگەیەنێ، پێی دەگوترێ: (تأَوّه)، واتە: ئازارو خەمو نارەحەتیی دەربڕین، (بۆ خەڵکی دی نەك بۆ خۆت)، (أَوّاه) سیفەتی کەسێکە ترسی لە خوا پێشان بدات.

( مُّنِيبٌ ) : (النَّوْبُ: رُجوع الشيءِ مَرَّةً بَعْدَ أُخْرَى، وَالإِنابَةُ: الرّجوعُ إِلى اللهِ بالتَّوْبَةِ وَإِخْلاَصِ العَمَلِ)، وشەی (مُنيب) (إِسْم فَاعِل)ە لە (أَنابَ يُنِيبُ)ەوە هاتوە، (نوب) بریتیە لە گەڕانەوەی شتێك جار لە دوای جار، (إِنابَة) بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای خوا بە کردەوە، کە بە کردەوە گەڕانەوەی خۆت بۆ لای خوا، ساغ بکەیەوە.

( أَعْرِضْ ) : یانی: (تَوَلَّ)، واتە: پشتی تێبکەو ڕووی لێ وەرگێڕە (أَعْرَضَ، أَي: وَلّى مُبْدِياً عُرْضَهُ، أي ناحيتَهُ)، (أَعْرَضَ) واتە: پشتی هەڵکردو لاتەنیشتی لەو کرد، ئینسان کە پشتی لە شتێك بکات، سەرەتا تەنیشتی تێدەکات، ئنجا دەڕوات.

( غَيْرُ مَرْدُودٍ ) : (الردُّ: صَـرْفُ الشـيءِ بذَاتِـهِ أَوْ بحَـالـة مِنْ أَحوالِـهِ)، (ردّ) بریتیـە لە لادانـی شـتێك خودی خـۆی، یـان یـەكـێك لـە حاڵەكـانی لابـدەی، دەگـوترێ: (رَدَدْتُ فـارتَّـد فَهـو مَـرْدُودٌ) واتـە: گێڕامـەوە، گەڕایـەوە، ئەو گـێڕدراوەیـە، كـەواتـە: (غَيْرَ مَـرْدُود) واتە: نەگێڕدراوە، سزایـەك كـە بە كـەس نـاگێڕدرێتـەوەو، بەرپەرچ نـادرێتـەوە.

# مانـای گـشـتـی ئایـەتەکـان

بەسەرهاتی ئیبراهیم لە قورئاندا لە زۆر شوێنان، دووبارە بۆتەوە، ئیبراهیم ﷺ کۆمەڵێك هەڵوێستی بوو ون، خوا ﷻ هەڵوێستەکانی لە چەند سوورەتێکدا خستوونە ڕوو، کە ئێمە خوا پشتیوان بێ، لە سوورەتی ئیبراهیم دا، لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل لەبارەی بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺو هەڵوێستەکانیەوە دەکەین.

بەڵام ئەم گۆشەیەی ژیانی ئیبراهیم ﷺ کە لە سوورەتی (الذاريات)یشدا هاتوەو، لە سوورەتی (الحجر)یشدا هاتوە، لێرەدا خوا ﷻ ئەم بەشە لە بەسەرهاتی ئیبراهیم دەکاتە پێشەکییەكو زەمینە خۆشکردنێك بۆ چوونە نێو بەسەرهاتی لووط ﷺو گەلەکەیەوەو چۆنیەتی فەوتێنرانیان، دیارە ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە لووط لەسەر دەستی ئیبراهیم بڕوای هێناوە، وەك دوایی باسی دەکەین، پاشان بە پێی کتێبە مێژووییەکان، بەتایبەت پەیمانی کۆن، دەڵێ: لووط برازای ئیبراهیم بووە صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، دیارە خوا ﷻ وەك ڕێزگرتن لە ئیبراهیمو وەك جۆرێك لە ئاگادارکردنەوەی فەرموویەتی: ئەوە ئێمە گەلی لووط لە بەین دەبەین، فریشتەکان پێشی بە لای ئەودا دەچن، کە لە شێوەی چەند میوانێکدا دەبن، (ئیبراهیم)یش نایانناسێ، بەڵام دوایی خۆیانی پێدەناسێنن.

ئنجا ئەو بەسەرهاتە: لە سوورەتی (الذاريات)دا، ئایەتەکانی: (٢٤ تا ٣٧) چواردە ئایەتو، لێرە لە سوورەتی (هود)دا، هەشت ئایەتو، لە سوورەتی (الحجر)یش دا بە هەمان شێوە، ئەم بەشە لە بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ هاتوە.

خوای کاربەجێ دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ ﴾، بە دڵنیاییەوە نوێنەرەکانی ئێمە، ڕەوانەکراوەکانی ئێمە، موژدەیان برد بۆ ئیبراهیم، لێرەدا باس نەکراوە موژدەکە چییە؟ بەڵام دوایی بۆمان دەردەکەوێ، کە موژدەکە زیاتر ئەوە بووە کە ئیسحاقی کوڕی دەبێ، دوایی ئیسحاقیش یەعقووبی دەبێ، ئەمە

زیاتر دێتە زەینەوە، ئەگەرنا دەشگونجێ بڵێین: موژدەکە ئەوە بوو، کە فریشتەکان پێیان فەرمووە: موژدەت لێ بێ، گەلی لووط دەفەوتێنین، بەڵام کە دوایی تەماشای کۆی ئایەتەکان دەکەین، ئیبراهیم عليه السلام زۆر بە تەنگ گەلی لووطەوە بووە، کە بەو شێوەیە قەلاچۆ بکرێن، واتە: بەرگریی کردووەو داوای کردوە: مۆڵەت بدرێن‌و دەرفەتێکی دیکەیان بدرێتێ، یاخود بەرگریی کردوە لەو بڕوادارانەی کە لە نێویان دان، پێشی ڕەنگە وایزانیبێ خوا ﷻ هەموویان لەبەین دەبات.

گرنگ ئەوەیە بە پێی سیاقی ئایەتەکان‌و کەش‌و هەوای ئایەتەکان، ناگونجێ ئەم موژدەیە ئەوەبێ کە گەلی لووط لەبەین دەبات، چونکە ئیبراهیم عليه السلام هەم وەك لێرەدا دەردەکەوێ‌و، هەم لە سووڕەتی (العنكبوت)دا دەردەکەوێ، هەم لە سووڕەتی (الحجر)یشدا دەردەکەوێ، بە تەنگەوە بووە کە گەلی لووط بەم شێوەیە لەبەین نەبرێن، بەڵام دیارە خوا ﷻ لەلای خۆیەوە بڕیاری داوە، تکاو داوای ئیبراهیم عليه السلامیش دادی نەداون.

﴿قَالُوا۟ سَلَـٰمًا قَالَ سَلَـٰمٌ﴾، گوتیان: سەلامت لێ بێ، ئەویش گوتی: سەلامێکی جێگیرو بەردەوامتان لێبێ.

چونکە (سلاماً)، یانی: (نُسلِّم عَلَيكَ تَسْلِيماً)، بەڵام: (السَّلاَمُ عَلَيْكُم) شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: هەمیشە ڕستەی کرداریی (الجملة الفعلية) دەلالەت لەسەر تازەبوونەوەی شتێك دەکات، بەڵام ڕستەی ناویی (الجملة الإسمية)ی دەلالەت لەسەر چەسپاویی‌و بەردەوامیی ئەو شتە دەکات.

کەواتە: وەڵامەکەی ئیبراهیم باشتر بووە، لەو سەلامەکەی کە ئەوان کردوویانە، هەڵبەتە وا باشە ئینسان ئەگەر سەلامی لێکرا، بە باشتر وەڵامی بداتەوە.

﴿فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾، هێندەی نەخایاند، گۆلکێکی برژاوی بۆ هێنان، ئنجا ئایا ژمارەی ئەو میوانانە چەند بووە؟ هەندێك دەڵێن: سێ کەس بوون، هەندێك دەڵێن: چوار کەس بوون، گرنگ ئەوەیە گۆلکێکی بۆ هێنان، هەر ئەوەندەی پێچوو تا سەری بڕی‌و ئامادەی کرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ زوو خزمەتی میوان بکرێ.

﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ ﴾، کاتێك دەستیانی بینی، نایگاتێ، دەستی بۆ نابەنو نایخۆن، بۆی نامۆ بوون، گوتی: چۆن دەبێ میوان نانی بێتە پێشێو، لە ڕێیەکی دوورەوە هاتبێو، خانە خوێ خۆی بۆ ئەزیەت بدات، کەچی لێی نەخوات؟! بۆیە پێی نامۆو نائاسایی بوون، ﴿ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗ ﴾، ئنجا بەهۆی وانەوە: ترسی ڕێ نیشت، واتە: جۆرێك لە دڵەڕاوکەو ترسی بۆ پەیدابوو، چونکە عادەت وایە ئەگەر کەسێك نمەکی کەسێکی کرد، مانای وایە نیازی باشە، بەڵام ئەگەر نانو نمەکی نەکرد، مانای وایە نیازی خراپە بەرانبەری.

﴿ قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ﴾، (ئەوانیش) گوتیان: مەترسە! ئێمە بۆ لای گەلی لووط نێرراوین، دیارە کە فریشتەکان ئەم قسەیان کردوە، باسیان کردوە لە لای کێوە ڕەوانە کراون، بەڵام خوا ﷻ ئەم وردەکارییەی باس نەکردوە لە قورئاندا، ئەگەرنا لە میانەی ئەوەدا کە گوتوویانە: ئێمە ڕەوانەکراوین، گوتووشیانە: ئێمە فریشتەین، خوا ناردووینی، تاکو گەلی لووط بفەوتێنین، لەبەر ئەوەی تێیانپەڕاندوە لە خراپەکاریی دا.

﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ ﴾، ئافرەتەکەشی بەپێوە ڕاوەستا بوو، لەو کاتەدا (واپێدەچێ، خزمەتی کردبێو، هاوکاریی ئیبراهیم عليه السلامی کردبێ بۆ خزمەتکردنی میوانەکان)، یەکسەر پێکەنی! ئایا بە چی پێکەنی؟!

ئەوەی من تێی دەگەم لە شادمانیی فەوتاندنی گەلی لووط عليه السلام پێکەنی، چونکە زانیویەتی گەلێکی زۆر خراپەکارو بەدڕەوشتو کەللە ڕەقن، لە دڵخۆشییان پێکەنیوە، ﴿ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴾، ئێمەش مـوژدەی لەدایکبوونی ئیسحاقمان پێداو، لە دوای ئیسحاقەوە، هەواڵمان پێدا یەعقووبیشتان دەبێ، یانی: ئیسحاق ماڵو حاڵ پێکەوە دەنێو، هاوسەرگیریی دەکاتو، یەعقووبیش لە ئیسحاق دەبێ، واتە: دوو موژدە لە یەك کاتدا.

﴿ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ﴾، هاوسەری ئیبراهیم گوتی: ئەی هاوار بۆ من! (وشەی (ویل) هەندێك گوتوویانە: یانی: وای ئابڕووی خۆم، یان ئابڕوو چوونی خۆم، (وا فَضِيحتا)، بەلام من لێرەدا ئەو مانایەم پێ گونجاو نیەو، پێم وایە مەبەست لە (ویلتی) ئەوەیە وەك چۆن کوردەواریی خۆمان دەڵێن: هاوار بۆ من، یان ئای لەم شتە سەیرە!) ئایا من کە پیرەژنم منداڵم دەبێ، وە ئەمەش هاوسەرمە پیر بووە؟! مەبەستی پێی ئیبراهیم ﷺ بووە، ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴾، بەڕاستیی ئەمە شتێکی سەیرە سەرسوڕهێنەرە من و ئیبراهیم بەم تەمەنە منداڵمان ببێ، شتێکی سەرسوڕهێنەرە، واتە: شتێکی چاوەڕوان نەکراوە، هەڵبەتە نەك لەو ڕووەوە کە بڕوای پێ نەبێ ! ﴿ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴾، فریشتەکان گوتیان: ئایا کاری خوات پێ سەیرە!

ئنجا دووعایان بۆ دەکەن، دەڵێن: ﴿ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ﴾، بەزەیی و پێزی خواتان لەسەر بێ، ئەی خەڵکی ئەم ماڵە! ﴿ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴾، بێگومان خوا ستایشکراوی خاوەن پایەی بەرزە، خاوەن موڵك و دەسەڵاتی بەرزە، کەواتە: هەموو خێرێکی لێ چاوەڕوان دەکرێ.

﴿ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی ئیبراهیم ﷺ ئەو دڵەڕاوکەو مەترسیی و ترس ڕێ نیشتنەی لێ ڕەویەوەو، موژدەی ئێمەی بۆ هات، دەستی کرد بە مشتومڕ لەگەڵمان لەبارەی گەلی (لوط)ەوە. هەڵبەتە ئیبراهیم مشتومڕی لەگەڵ فریشتەکاندا کردوە، کە دوایی لە بەسەرهاتەکەی دا بە درێژیی تیشك دەخەینە سەر ئەو موناقەشەو مشتومڕەی ئیبراهیم، کە چۆن بووەو بۆچی بووە؟

﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴾، بە ڕاستیی ئیبراهیم زۆر هێدیی و بە پەرۆش بووو، زۆر لە ناخەوە گەڕاوە بوو بۆ لای خوا، دیارە کەسێك کە خاوەنی ئەم سیفەتانە بێ، لێی چاوەڕوان دەکرێ، بەرگریی بکات لە سزادانی خەڵکێك، کە

پێی وابێ، وا باشە مۆڵەتێك، دەرفەتێكی دیكەیان بدرێتێ، یان ڕەنگە ئیبراهیم وایزانیبێ: هەموویان بە یەكەوە لەبەین دەچن، تەنانەت (لووط)یش، بە پێی ئەوە كە لە سووڕەتی (العنكبوت)دا دەفەرمووێ : ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًاۚ قَالُواْ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾﴾، واتە: (ئیبراهیم)، گوتی: (لوط)یش لە نێویان دایە، (فریشتەكان)، گوتیان: ئێمە زاناترین لە تۆ بەوەی تێیدایە، (خوا زانیاریی تەواوی بەو فریشتانە داوەو، زانیویانە چەند كەس لەوێن و چەند كەس بڕوایان هێناوە)، خۆی و خێزانەكەی دەرباز دەكەین، جگە لە ژنەكەی، ئەو لە ڕۆیشتووانە.

یانی: ئەو دەبێ لەگەڵ ڕۆیشتوواندا بڕوات، لەگەڵ ئەو خراپەكارانەدا بڕوات، لەبەر ئەوەی هاوكارو دەستبارگری ئەو مێردە بەڕێزەی خۆی نەبووە.

ئنجا خوا ﷻ، یان فریشتەكان پێیان فەرموو: ﴿يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ﴾، ئەی ئیبراهیم! واز لەم بابەتە بێنە، قسە لەوبارەوە مەكە، ﴿إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾، بەدڵنیایی فەرمانی پەروەردگارت بە لەبەینبردنی گەلی لووط، هاتوە، ﴿وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ﴾، بێگومان ئەوان سزاو ئازارێكی نەگەڕێنراومیان بۆ دێ.

# چەند مەسـەلـەیەکی گرنـگ

**مەسەلەی یەکەم :**

## نێـردرانـی فریشـتەکـانی خـوا بۆ لای ئیبـراهیم ﷺ، بۆ مـوژدە پێـدانی :

خـوا عزّوجـلّ دەفـەرموێ : ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ﴿٦٩﴾ ﴾.

**ئێـمـە لـە چـوار بـڕگـەدا ئـەم ئـایـەتـە شـی دەکـەیـنـەوە:**

**بـڕگـەی یەکـەم :** ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ ﴾، واتە: بەدڵنیاییەوە نـوێنەرەکانی ئێمـە، موژدەیـان بۆ ئیبـراهیم هێـنـا.

هەڵبەتە دوایی دەردەکەوێ کە مەبەست لەو موژدەیە: لەدایکبوونی ئیسحاقە، لە ئیبـراهیمو سارا (عَلَيْهما السَّلام)، پاشان لەدایکبوونی یەعقووبە، لە ئیسحاقو هاوسەرەکەی، واتە: جووتە موژدەیەکیان بە ئیبـراهیـمو هاوسـەرەکەی داوە، خـوا ﷻ کە دەرگـای کـردەوە، بـاش دەیکـاتەوە، جـاری واش هـەیـە بۆ تـاقـیکـردنەوە، کە دەرگـا دادەخـات، بـاشـی دادەخـات.

بۆچـی دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ ﴾؟ چـونکە ئـەو (و) واوە، ئـەم بەسـەرهاتە دەگـێڕێـتەوە بۆ سەر بەسەرهاتەکانی پێشێ، واتە: وەك چۆن خـوا ﷻ فریشتەکـانی بۆ لای پێغـەمبـەران (علیهم السلام) نـاردوونو، پـەیامی وەحـی بـۆ نـاردوون، بە هەمـان شێوەش نـوێنـەرەکانی خـوا، فریشـتەکـانی خـوا بە موژدەوە، چـوون بۆ لای ئیبـراهیم ﷺ، کە بە دڵـنیاییـەوە لـە لای خـواوە، ڕەوانە کـرابوون.

**برگەی دووەم :** ﴿قَالُواْ سَلَٰمًا﴾، گوتیان: سەلامەت لێبێ، شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: (سلاماً)، (مَنْصُوبٌ بِفِعْلٍ مُقَدَّرٍ)، یانی: (سَلَّمنا عَلَيْكَ سَلاماً)، واتە: ئەوە سەلاممان لێکردی، یان (نُسَلِّم عَلَيْكَ سَلاَماً) ئێمە سڵاوت لێ دەکەین بە سڵاوکردن، دیارە وشەی (سلام)یش لە سەلامەتییەوە هاتوە، واتە: ئاشتیی، خێرو خۆشیی، بێ زیانیی، بێزەڕیی، هەڵبەتە بۆیەش ئەمە کراوە بە دروشمی بە یەکدی گەیشتن، تاکو کە ئەو لایەنەی کە لایەنی بەرانبەر، پێی دەگات، دڵنیابێ کە لەلای ئەوەوە ئاشتییو سەلامەتییو بێ زیانیی هەیە.

﴿قَالَ سَلَٰمٌ﴾، ئەویش (واتە: ئیبراهیم ﷺ)، گوتی: سەلامەتان لێبێ، پسپۆڕانی زمان دەڵێن: (سَلامٌ: خَبَرُ مُبْتَدَإٍ مَحْذُوفٍ)، یانی: (أَمْرُكُم سَلامٌ) حاڵی ئێوەش سەلامەتییە لەلای ئێمەوە یاخود (خبر)ەکەی (محذوف)ەو فڕتێنراوە، یانی (عَلَيْكُم السَّلاَم) لەسەر ئێوە بێ سەلام، هەڵبەتە وەڵامدانەوەکەی ئیبراهیم ﷺ کە بە ڕستەی ناوییە، بەهێزترە لە سڵاوەکەی ئەوان، کە بە ڕستەی کرداریییە، بۆچی؟ چونکە ڕستەی ناوییو، حاڵەتی (رفع) زیاتر دەلالەت دەکات لەسەر چەسپاوییو جێگیریی شت، لە حاڵەتی (نصب) لە ڕستەی کرداریی.

**برگەی سێیەم :** ﴿فَمَا لَبِثَ﴾، هێندەی نەخایاند، (لُبْثْ) لە شوێنێکدا، ئەوە دەخوازێ کە مرۆڤ لەو شوێنە لابچێ، (فَما لَبِثَ)، واتە: هێندەی پێنەچوو، هێندە نەمایەوە، زانایان گوتوویانە: (فَما لَبِثَ: ما نافِيَة، ما أَبْطَأ وَلاَ تَأخَّر مجيئه بالعِجْل)، یانی: سستی نەنواندو تاخیر نەبوو کە گوێلکەکەی هێنا، کە بە پێی ئەم مانایە دەبێ: (ما)ی (نافِيَة) بێ، دەشگونجێ (ما)ی (مَوصُولة) بێ، واتە: (فَالَّذِي لَبِثَ إِبْرَاهِيم، هو مجيئه بالعِجْل)، واتە: ئەوەندەی کە ئیبراهیم پێی چوو، ئەوە بوو کە گوێلکە برژێنراوەکەی هێنا.

**برگەی چوارەم :** ﴿أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ﴾، کە گوێلکێکی برژێنراوی هێنا، (العِجْلُ وَلَدُ البَقَرَةِ)، (عِجْل) بێچووی مانگایە، (حَنِيذ: المشوي مُطْلَقاً، أَوِ

المشوي بحَرِّ الحِجَارَةِ مِنْ غَيْرِ أَنْ تَمَسَّه النّار)، (حنيذ) بە برژێنراو دەگوترێ بە گشتی، یاخود جۆرێکە لە برژاندن، کە تینی گەرمایی بەردی بگاتێ، {وەك ئێستا کە شت لە فڕندا سوور دەکرێتەوە} بێئەوەی ئاگرەکەی بگاتێ.

## چەند ئەدەبێکی میوانداریی:

١/ جێی سەرنجە کە لە سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ : ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: بە پەنهانییو بە شێوەیەکی وا ڕۆیشت کە میوانەکان هەستی پێ نەکەنو گۆلکێکی قەڵەوی هێنا.

بۆیەش فەرموویەتی : ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ ﴾، بە پەنهانیی چووە لای هاوسەری، چونکە ئەگەر میوانەکان هەست پێ بکەن، دەڵێن: نابێ خۆت ئەزیەت بدەیو خواردن ئامادە بکەی! ئەگەرنا بابای خانە خوا لە دەرێ بیکاتە گاڵە گاڵو بڵێ : ئەو گۆلکەی بێنن، با سەری ببڕم، میوانمان هەیە، یان بڵێ: با ئەو قەلە، یان ئەو کەلەشێرە سەربڕین...، ئەوە دەکاتە ئیحراجکردنی میوانەکان، پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) لە لووتکەی بەرزی هەموو خووڕەوشتێکی جوان دا بوون، لە میواندارێتییاندا، لە بەرو مەجلیسیاندا، لە هەڵسانو دانیشتنیاندا، لە هەموو شتێکیاندا، لە لووتکەدا بوون، وە ئینسان ئەگەر بە وردیی سەرنجی هەڵسوکەوتو قسەو ڕەفتاری پێغەمبەران بدات، دەیانبینێ لە هەموو شتێکدا لە لووتکەدا بوو ون.

٢/ ئنجا کە لە سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ : ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ ﴿٢٦﴾ ﴾، بە پەنهانیی چوو بۆ لای، هاوسەری، گۆلکێکی قەڵەوی هێنا...

لێرە بۆمان دەردەخات، کە گۆلکەکە قەڵەو بووە، بەڵام لە سوورەتی (هود)دا بۆمان باسی ئەوە دەکات، کە بە باشترین شێوەی ئامادە کردن، ئامادەی کردوە، چونکە جاری وایە کابرا خەڵکی دەعوەت دەکات، خزمەتیان دەکات، بەڵام نانو چێشتەکەی باش ئامادە نەکردوەو وانیە، کە میوانەکان باش بیخۆن، چونکە

مەسەلە هەر ئەوەنیە کابرا باش مەسرەف بکات، بەڵکو زۆریش گرنگە، ئەو نان‌و چێشت‌و خواردنەش کە ساز دەکرێ، بە ڕێکیی‌و بە چاکیی ساز بکرێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ اللهَ يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ} {أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي (شعب الإيمان)، برقم: (٥٣١٢)، وَأَبُو يَعْلَى، برقم: (٤٣٨٦)، وَالطَّبَرَانِي فِي (الأوسط) برقم: (٨٩٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (الصحيحة)، برقم: (١١١٣)}، واتە: خوا حەز دەکات، ئەگەر یەکێك لە ئێوە کارێکی کرد، بە ڕێك‌و پێکیی‌و بە چاکیی بیکات.

٣/ هەروەها لە ڕووی مەعنەوییشەوە: کاتێك کە ئیبراهیم نانەکەیان بۆ دادەنێ‌و، لێیان نیزیك دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿أَلَا تَأۡكُلُونَ ﴿٢٧﴾﴾الذاريات، نافەرموون! زۆر بەڕێزو حورمەتەوە، خوڵقیان دەکات.

٤/ ئنجا ئەمەش کە دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ﴾، ئەوە دەگەیەنێ کە میوان دەبێ زوو خزمەت بکرێ، نەك لە چاوەڕوانییدا دابنرێ، هەتا ئاوێکی بۆ دێ، یان چایەکی بۆ دێ، چاوی خێل بێ، چ جای تاکو نان ساز دەبێ! تەماشا دەکەین: ئیبراهیم ﷺ بە خێرایی چووە: گۆلکەکەی بۆ سەربڕیون‌و برژاندوویەتی‌و، بۆی داناون، میوان دەبێ زوو خزمەت بکرێ.

**مەسەلەی دووەم:**

## ترس ڕێنیشتنی ئیبراهیم ﷺ بە هۆی دەست نەبردنی میوانەکانیەوە بۆ خواردنەکەی:

خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ﴿٧٠﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە ■ پێزەش لە چوار بڕگەدا دەخەینە ڕوو:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ ﴾، کاتێك دەستەکانیانی بینین بۆی درێژ ناکرێن و دەستی ناگەیەنێ و، دەستیان بۆ خواردنەکەی نابەن، بە نامۆو نائاسایی هاتنە بەرچاوی، دەگوترێ: (نَكِرتُهُ وَأَنْكَرتُهُ وَاستَنْكَرتُهُ: وَجَدْتُهُ عَلَى غَيْرِ ما يُعْهَد)، وشەی ■ (نَكِرتُهُ وَأَنْكَرتُهُ وَاستَنْكَرتُهُ)، هەرسێکی واتە: بە شێوەیەکی نائاسایی بینیم، بە شێوەیەکی نامۆ، ئەو شتەم هاتە بەرچاو، لە بەسەرهاتی یوسوف دا کە برایەکانی یوسوف دەچنە لای، دەفەرموێ : ﴿ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ۝٥٨ ﴾، واتە: یوسوف ئەوانی ناسی، بەڵام ئەوان یوسوفیان نەناسی، بۆ ئەوان نامۆو نەناسراوو نەزانراو بوو.

هەروەها ئەم مانایەش هاتوە: (نَكِرَهُمْ ، أَي: كَرِهَهُمْ)، واتە: ئەو ڕەفتارەیانی پێ ناخۆش بوو، چونکە ئەو بە پەلەپەل چووە، گوێلکی بۆ سەربڕیون و بۆی برژاندوون و، لە پێشی داناون، کەچی ئەوانیش دەستی بۆ درێژ ناکەن و نایخۆن، لە دڵی خۆی دا گوتوویەتی: یان لەبەر ئەوەیە کە بە دڵیان نیە، یان لەبەر ئەوەیە دەبێ نیازێکی خراپیان هەبێ.

چونکە لە عادەت و نەریتی میللەتاندا هەیە، نەك هەر لە نێو کوردو عەرەب دا، بەڵکو لە نێو زۆربەی میللەتانی دنیادا باوە، کە ئەگەر کەسێك نان و نمەکی کەسێکی کرد، دوایی بیەوێ زیانی پێ بگەیەنێ، وەك دەڵێن: نمەك گرتوو دەبێ، نمەك دەیگرێ، یانی: تووشی زیان دەبێ، بۆیە لە نێو میللەتاندا ئەوە باوە، کە ئەگەر کەسێك بچێ بۆ ماڵی کەسێك نمەکی بکات، نابێ زیانی لێ بدات، ئنجا ئیبراهیم بۆیە ئەم حاڵەتەیانی پێ نائاسایی بووە.

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ﴾، بە هۆی وانەوە ■ ترسی ڕێنیشت، ترس و دڵەڕاوکەیەکی بۆ پەیدا بوو ■ دەبێ ئەوانە نیازیان خراپ بێ، نانەکەیان بە دڵ نەبێ، دەبێ چی بێ؟ (أَوْجَسَ، أَي: أَحَسَّ فِي نَفْسِهِ، وَأَضْمَرَ فِي نَفْسه

فَزَعًا)، واتە: لە دڵی خۆیدا هەستی بە ترس کرد، یاخود لە دەروونی خۆیدا، جۆرێك لە دڵەڕاوکەو خوتخوتەی پەنهان کرد.

**برگەی سێیەم** : ﴿قَالُوا۟ لَا تَخَفْ﴾، فریشتەکان یەکسەر گوتیان: مەترسە، بۆیان ڕوون کردەوە.

**برگەی چوارەم** : ﴿إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ﴾، گوتیان: بێگومان ئێمە بۆ لای گەلی لووط ڕەوانە کراوین، یانی: بە فەرمانی پەروەردگارت هاتووین‌و، بۆیەش ناخۆین، چونکە ئێمە مرۆڤ نین، تاکو خواردن بخۆین، بەڵام ئەدی بۆچی پێیان نەگوتوە، ئەزیەت مەکێشە؟ بۆ ئەوەی ئەو ئەدەب نەجابەتی خۆی پیشان بدات، تاکو بۆ ئێمە ببێتە سەر مەشق، تۆ با میوانەکەشت نەناسی، دەبێ ئاوا خزمەتی بکەی، ئنجا ئیبراهیم ﷺ میوانەکانی نەناسیون‌و، ئاواش خزمەتی کردوون، ئەدی ئەگەر ناسیبانی، واتە: ئەگەر ناسیاو بان، چونکە لە سوورەتی (الذاریات)دا دەفەرموێ : ﴿إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا ۖ قَالَ سَلَـٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾﴾، کاتێك چوونە لای، گوتیان: سڵاوت لێ بێ، گوتی: سڵاوتان لێ بێ بە باشتر، ئێوە خەڵکیکی نەناسراون، واتە: ئێوە بۆ من نامۆن، بێگومان ئەوەش لە دڵی خۆیدا، گوتوویەتی، ئەگەرنا ڕاستەوخۆ بڵێ: ناتانناسم! خۆش ناکەوێ، ئەگەرنا دوایی کە خانە خوێ‌و میوان دەکەونە قسان، ڕێی تێدەچێ، دەپرسێ: ئەرێ ئێوە کێن؟ کەواتە: کە دەفەرموێ : ﴿قَالَ سَلَـٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ﴾، ئەوە مانایەکەیەتی، هەرچەندە هەندێك لە توێژەروان ئاوا لێی ورد نەبوونەوەو، گوتوویانە: ڕاستەوخۆ ئیبراهیم وای پێ گوتوون!

ئنجا کە گوتوویانە: ئێمە بۆ لای گەلی لووط ڕەوانە کراوین، هۆکاری نێردرانەکەشیان ڕوون کردۆتەوە، وەك لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ : ﴿لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾﴾الذاریات، واتە: بۆ ئەوەی کە قوڕێکی بە بەرد بوویان، بەسەردا ببارێنین.

لە سوورەتی (الذاریات)یش دا دەفەرموێ: ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُنْكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰ أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئایا قسەو بەسەرهاتی میوانە رێز لێگیراوەکانی ئیبراهیمت پێگەیشتوە، بۆت هاتوە؟ ﴿٢٤﴾ کاتێك لێی وەژوور کەوتن گوتیان: سەلامەت لێ بێ، گوتی ئێوە بە باشتر سەلامەتان لێ بێ، (وەك پێشتر باسم کرد، لە دڵی خۆیدا گوتی:) (ئێوە) کۆمەڵێکن نەناسراون، نامۆن، (پێتان ئاشنا نیم) ﴿٢٥﴾ ئنجا بە شێوەیەکی وا کە میوانەکان هەستی پێنەکەن، چوو بۆ لای هاوسەری، یەکسەر دوای ئەوە گۆلکێکی قەڵەوی بۆ هێنان؟ (بە چ جۆرێك بۆی هێناون؟ ئێمە بەهۆی ئایەتەکانی سوورەتی هوودەوە، دەزانین کە گۆلکێکی برژاوی بۆ هێناون، ئەگەرنا گۆلکێکی قەڵەو چی لێ بکەن، لەو مەجلیسە؟) ﴿٢٦﴾ یەکسەر خواردنەکەی لێ نیزیك خستنەوەو گوتی: نافەرموون، ناخۆن! ﴿٢٧﴾ (دیارە ئەوانیش دەستیان بۆ نەبردوە) بۆیە ترسی ڕێ نیشت بەهۆی وانەوە، گوتیان: مەترسێ، ئنجا هەواڵو موژدەیان پێدا بە منداڵێکی زانا.

لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ : تەنیا بەوە موژدەیان پێدا کە ئیسحاقیان دەبێ لە دوای ئیسحاقیش یەعقووب، بەڵام لێرەدا دەریدەخات، کە ئەو ئیسحاقە، هەر بە گچکەیی زانا بووە، واتە: خوا ﷻ وای خوڵقاندوە کاتێك کە جارێ هەر منداڵە، نەجابەتو زەکاوەتو زیرەکیی لێ دەربکەوێ.

مەسەلەی سێیەم :

## مـوژدە پێـدرانی هـاوسـەری ئیبـراهیم بە ئیسحاق و یـەعقووب و سـەرسـوورمانی و، وەڵامدانـەوەی فریشـتەکان بۆ سەر سـوورمانەکەی :

﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ٧١ قَالَتۡ
يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ٧٢ قَالُوٓاْ
أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ٧٣ ﴾.

**شـیکردنـەوەی ئـەم سـێ ئـایـەتـە بـەپـێـزە، لـە حـەوت (٧) بـڕگـەدا :**

**بـڕگـەی یـەکـەم :** ﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ ﴾، ژنەکەی، هاوسەرەکەی بەپێوە بوو، پێکەنی، ئایا بۆچی ژنەکەی بەپێوە بووە؟ هەموو تەفسیرەکان دەڵێن و بەپێی سیاقی ئایەتەکانیش دیارە، واتە: خزمەتی میوانەکانی کردوە، بۆیە بەپێوە بووە، چونکە جوان ناکەوێ ماڵێك میوان بچن و، ئافرەتیش بۆخۆی لەولا پاڵداتەوە! یانی: بەپێوە بووە خزمەتی کردوون و هاوکاریی ئیبراهیم ﷺی کردوە، چونکە ئەوان هیچ منداڵ و وەرگێڕکەیان نەبوون، هەر دەبوو ئیبراهیم ﷺ و هاوسەرەکەی خزمەتیان بکەن، باسی غولام و خزمەتکاریش، نەکراوە، کەسێك بووبێ، لە ماڵ دا خزمەتی کردبن، ڕەنگە بووبێش، بەڵام زۆرجار واباشترە ئینسان بۆخۆی خزمەتی میوانەکانی بکات، ئەوە زیاتر ڕێز لێگرتنی تێدایە.

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ فَضَحِكَتۡ ﴾، پێکەنی، دیارە پێکەنینەکەی بە هۆی ئەوەوە بووە کە هەواڵی لەبەینچوونی گەلی لووطی پێدراوە، بە بۆچوونی من، نەك وەك هەر کام لە (محمد الطاهر بن عاشور) لە (التحرير والتنوير)ەکەیداو، (الشوكاني) لە (فتح القدير)ەکەیداو، هەندێکی دیکەش لە زانایان و توێژەرەوانی

قورئان گوتوویانە: پێکەنینەکەی لە خۆشیی ئەوە بووە کە موژدەی ئیسحاقو یەعقووبی پێدراوە، چونکە جارێ باسی موژدە پێدرانی ئیسحاقو یەعقووب نەکراوە، کە ئەو پێکەنیوە، دوایی کاتێك موژدەی ئیسحاقو یەعقووبی پێدەدرێ، سەری سووڕدەمێنێو، دەڵێ: (يَٰوَيْلَتَىٰٓ)، کەواتە: ئەو پێکەنینە، بەهۆی بیستنی ئەو هەواڵەوە بووە، کە گەلی لووط لەبەین دەبەن.

**بڕگەی دووەم :** ﴿فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ﴾، ئێمە موژدەمان پێدا بەوەی کە ئیسحاقیان دەبێ، لە پشت ئیسحاقەوە، یەعقووبیشیان دەبێ، کەواتە: یەعقووب لە ئیسحاقو لە هاوسەرەکەی پەیدا دەبێ، مانای وایە ئیبراهیمو سارا دوو موژدەیان پێدراون: هەم هی کوڕ، هەم هی نەوە!

**بڕگەی سێیەم :** ﴿قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا﴾، گوتی: ئەی هاوار بۆ من! (الويلة)، دەڵێ: (الحَادِثَةُ الفَظِيعَةَ وَالفَضِيحَةَ، وَلَعَلَّهَا المرَّةُ مِنَ الوَيْلِ فِي مَقَامِ التَعَجّب)، (ويلة)، یانی: هاوار بۆ من، ئای چەند شتێکی سەیرە! ماناکەی هەر ئەوەیە، نەك وەك لە هەندێك لە تەفسیرەکان دا هاتوە: (الحَادِثَةُ الفَظِيعَةَ وَالفَضِيحَةَ)، یانی: ڕووداوێکی زۆر ناخۆشو ئابڕووبەر، من پێم وایە لێرەدا ئەم مانایە بۆ ئەو وشەیە گونجاو نیە، بەڵکو یانی: ئەی هاوار! ئەوە زۆر جێی سەرسووڕمانە، گوتی: ئەی سەرسووڕمانی من وەرە، من منداڵم دەبێ، لە حاڵێکدا کە من پیرە ژنەمو، ئەوەش پیاوەکەمە کە بە تەمەنەو بە ساڵدا چووە؟!

ئەو هەمزەی (ءَ)ی سەر (ءَأَلِدُ) پێی دەگوترێ: (هَمْزَةُ التعَجُّب) بۆ سەرسووڕمانە.

**بڕگەی چوارەم :** ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ﴾، بە ڕاستیی ئەمە شتێکی سەیرە، (العَجِيبُ: ما يدعُو إلى العَجَبِ، عَجَب وَعَجِيب للمبالَغَةِ وَهِيَ عَجِيبَة، جَمْعُهُ عَجَائِب)، (عجيب)، واتە: سەرسووڕهێنەر، شتێکە کە بەهۆیەوە سەرت سووڕ

بمێنی، (عَجَب) و (عَجِیب) واتە: زۆر سەرسووڕهێنەر، ئەگەر بۆ مێینە بێ، دەگوترێ: (وَهِيَ عَجِیبَة) زۆر سەرسووڕهێنەرە بە (عَجَائِب)یش کۆدەکرێتەوە.

(العَجَبُ: رَوْعَةُ الإِنْسانِ عِنْدَ استِعْظَامِ الشيءِ)، (عَجَب) حاڵەتێکی سەرسووڕمانو دڵخۆشییە، تووشی ئینسان دێ، لە کاتێکدا شتێکی زۆر بەلاوە گرنگو گەورە بێ، ئەو حاڵەتەی بۆ دروست دەبێ.

**بڕگەی پێنجەم :** ﴿ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ ﴾، فریشتەکان گوتیان: ئایا تۆ سەرت لە کاری خوا سووڕ دەمێنێ، کاری خوات پێ سەیرە، پێ سەیر بوونێك کە پێت دووربێ، واتە: سارا خاتوون پێی عەیب نەبووە، منداڵی ببێ، بەڵام پێی زۆر جێی سەرسووڕمان بووە، چونکە لە حاڵەتی ئاسایی دوورە: پیرەژنێكو پیرەمێردێك منداڵیان بێ، دەڵێ: (إِنْكار لِتَعَجُّبِها، لإِنَّهُ تَعَجُّبٌ مُرَادٌ بِهِ الإِستِبْعَاد)، ئەوان (فریشتەکان) نکووڵییان کردوە لە سەرسووڕمانەکەی، چونکە سەرسووڕمانەکەی، مەبەست پێی ئەوە بووە، کەشتێکی دوورو نائاسایی‌و نەگونجاوە.

کە دەفەرموێ : ﴿ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ ﴾، {المقصود بـ(أمر لله) أمْرُ تكوِينٍ}، واتە: فەرمانی بەدیهێنەرانەی خوا، یاخود مەبەستی پێی دەستەڵاتی خوایە.

**بڕگەی شەشەم :** ﴿ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ ﴾، بەزەیی خواو پێزی خوا لەسەر ئێوە بێ ئەی خەڵکی ئەم ماڵە، دیارە دووعایان بۆ دەکەن، (أهلَ البیت) لە زمانی عەرەبییدا ئەوە پێی دەگوترێ : (مَنْصُوبٌ عَلَى المدْحِ وَالإِخْتِصَاص) ئەی خەڵکی ئەم ماڵە! ئێوە بەتایبەت ڕەحمەتو بەزەیی‌و پیتو پێزی خوای پەروەردگارتان لەسەر بێ.

**بڕگەی حەوتەم :** ﴿ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴾، بێگومان خوا شایستەی ستایشەو زۆر ستایش کراوەو، زۆریش پایەبەرزو مەزنە، واتە: هەموو خێرو چاکەیەکی لێ چاوەڕوان دەکرێ، مادام ستایش کراوبێ بە ڕەهایی‌و، مادام خاوەن پایەی بەرزو پێگەی بێ وێنە بێ، کەواتە: هەموو خێرو چاکەیەکی لێ چاوەڕوان دەکرێ .

لە سوورەتی (الذاریات)دا ئاوا باسی ئەم هەڵوێستەی سارا خاتوون دەکات، خوا لێی ڕازی بێ دەفەرموێ : ﴿ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾ ﴾ واتە : ئافرەتەکەی هات بە هاوارێکەوەو دەنگی بەرز کردەوە {گوتوویەتی: (یا ویلتی)} لە دەموچاوی خۆیدا (ئافرەتان عادەتیان وایە، حاڵەتی عاطیفیی هەیە، ئافرەت هەر ئافرەتە، با خێزانی پێغەمبەریش ﷺ بێ)، گوتی: من پیرەژنێکی نەزۆکم ! گوتیان: پەروەردگارت ئاوای فەرمووەو، بێگومان ئەو کاربەجێی زانایە، یانی: ئەو دەزانێ کارەکانی چۆن دەکاتو دەستەڵاتی ڕەهاشی هەیە.

**مەسەلەی چوارەم :**

## قسەکردنی ئیبراهیم ﷺ بۆ بەرگریی کردن لە لووط و، وەڵامی خوای دادگەر، (یاخود فریشتەکانی) کە بواری قسەکردنی تێدا نەماوە:

### ئەو مەسەلەیە کە لەو سێ ئایەتەدا باسکراوە، ئێمە لە حەوت برگەدا دەیتوێژینەوە:

خوا عزّ وجلّ فەرموویەتی : ﴿ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ ﴾.

**برگەی یەکەم :** ﴿ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ ﴾: کاتێک ترسو دڵەڕاوکە لە ئیبراهیم ڕۆیشت، (الرَّوْعُ: الفَزع وَالخَوْفُ المستكِنُّ فِي الرَّوع)، (رَوْع) بریتیە لەو دڵەڕاوکەو ترس ڕێ نیشتنەی کە لە زەینو هۆشو دڵو دەروونی مرۆڤدا، جێگیر دەبێو پەنهان دەبێ .

ئنجا کاتێك ئیبراهیم ئەو حاڵەتەی لێ ڕۆیشت.

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ ﴾: موژدەشی بۆ هات، واتە: موژدەی لەدایك بوونی ئیسحاق، پاشان لە ئیسحاقیش: یەعقووب، ئەو جووت موژدەیەی بۆ هات.

(البشرى : الخَبَرُ السّارُّ الذي تَنْبسطُ به بشرة الوجه)، (بشرى) بریتیە لەو هەواڵە خۆشەی کە پێستی دەموچاوی ئینسانی پێگەش دەبێتەوەو دەکرێتەوە .

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴾: یەکسەر دوای ئەوەی ترسەکەی ڕۆیشتو موژدەی بۆ هاتو دڵخۆش بوو، دەستی کرد بە مشتومڕ لەگەڵماندا، دەربارەی گەلی لووط، دیارە مەبەست لە (يُجَٰدِلُنَا) قسەکردنی ئیبراهیمە لەگەڵ فریشتەکاندا، ئەگەرنا ئیبراهیم ﷺ ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوای بەرزدا گفتوگۆی نەکردوە، بەڵام بۆچی دەفەرموێ : (يُجَٰدِلُنَا)؟ چونکە ئەو فریشتانە کە خوا ناردوونی، نوێنەری خوان، پاشان هیچ شتێك بەبێ فەرمانی خوا ناکەن، کەواتە: مشتومڕو موناقەشەکردنی ئیبراهیم لەگەڵ فریشتەکاندا بووە، بۆیەش خوا ﷻ دەیداتە پاڵ خۆی.

ئنجا ئایا مەبەست لەو مشتو مڕو موناقەشەکردنەی ئیبراهیم لەگەڵ فریشتەکاندا، چییە؟ بێگومان مەبەست ئەوەیە کە لەگەڵ فریشتەکان دا موناقەشەی کردوە، یان داوای کردوەو پاڕاوەتەوە لە خوا، کە من ئەوەم پێ دوورە، چونکە ئەگەر وابایە دەیفەرموو: (يطلبُ مِنّا، يدعونا)، بەڵام کە دەفەرموێ : (يُجَٰدِلُنَا) ئەوە دیارە کە ئەدەبی ئیبراهیم ﷺ زۆر لەوە بەرزتر بووە کە موجادەلە لەگەڵ خوادا بکات، بەڵام لەگەڵ فریشتەکاندا ئاساییە، کە ئەوانیش دروستکراوێکی خوانو نوێنەری خوانو، خوا ناردوونی، ئەوە پێچەوانەی ئەدەب نیە، کە ئینسان موناقەشەو شەڕە قسەیان لەگەڵدا بکات.

مەبەست لەو موناقەشەو شەڕە قسەیەش، ئەوە بووە کە ئیبراهیم بەرگریی لە بڕوادارەکان کردوەو گوتوویەتی: ئاخر چۆن دەبێ، شارەکانی گەلی لووط ژێرو

زوور بكرێن، لە حاڵێكدا كە ئەوێ خەڵكی بڕواداری لێیەو لووط ﷺ لەوێیە؟!

وەك دەفەرموێ : ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًاۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ﴿٣٢﴾﴾ العنكبوت، واتە: چۆن دەیانفەوتێنن، لووط لەوێیە؟ (واتە: ماڵی لووطیش لەوێیە، با خێزانەكەشی بڕوادار نەبێ، ڕەنگە ئەو كاتە ئیبراهیم ﷺ نەشیزانیبێ كە خێزانی دەربازی نابێ‌و، خراپەو، بەس منداڵەكانی قوتار دەبن)، ئەوانیش دەڵێن: ئێمە زاناترین بەوەی كە لەوێیە، كەواتە: دەگونجێ موجادەلەو شەڕە قسەكەی ئیبراهیم ﷺ بۆ بەرگریی لێكردنی لووط و ئەو بڕوادارانە بوو بێ، كە لەگەڵ لووط دا بوون.

هەندێك دەڵێن: دەشگونجێ مەبەست لە بەرگریی كردنی ئیبراهیم لە گەلی لووط، ئەوە نەبوو بێ كە هەر نەفەوتێنرێن، بەڵكو دەرفەتی زیاتریان پێ بدرێ‌و مۆڵەتیان پێ بدرێ، بە بەڵگەی ڕستەی دوایی كە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ﴾، بێگومان ئیبراهیم هێدی‌و مەندو بە ڕەحم‌و شەفەقەت بوو، بۆ خەڵك دڵسووتاو بوو، زۆریش بۆ لای خوا دەگەڕایەوە.

شایانی باسە لە پەیمانی كۆندا[1] ئەو بەسەر هاتە بە تەفصیلێ باس دەكات، كە ئەو فریشتانە دەچن بۆ لای ئیبراهیم، دوایی كە بۆی دەردەكەوێ: فریشتەن، دەڵێ: ئایا شارێك پەنجا (٥٠) بڕواداری تێدابێ لە بەینی دەبەن؟ دەڵێن: نەخێر، ئەدی ئەگەر چل (٤٠) بن؟ نەخێر، ئەدی ئەگەر سی (٣٠) بن؟ نەخێر، ئەدی ئەگەر بیست (٢٠) بن؟ نەخێر، ئەدی ئەگەر دە(١٠) بن؟ دەڵێن: نەخێر، بەڵام دە كەسیش بڕوادار نەبوون، بەڵكو ئەوەی كە دەردەكەوێ‌و، لە پەیمانی كۆندا دەڵێ: بەس لووط و دوو كچەكەی دەرباز بوون، بەڵام دەگونجێ كەمێكیش خەڵكی بڕواداریان لەگەڵدا بووبێ، بۆیە بەرگریی كردنەكەی ئیبراهیم لە گەلی لووط بە پێی تەورات، جێی خۆی نەگرتوە، بەڵام لە قورئاندا ئەو وردەكارییە نەهاتوە، كە وەك گوتم هەردوو ئیحتیمالەكەی هەن:

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدسّ، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح : ١٨، ص ٤٩.

١) ئەگەری هەیە بەرگرییکردنەکەی ئیبراهیم ﷺ بۆ ئەوان بووبێ .

٢) دەشگونجێ بەرگریی لە کۆی خەڵکەکە کردبێ، بەو واتایە کە مۆڵەتو دەرفەتی زیاتریان پێبدرێ، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، بەڵام ئەو وردەکارییەی لە تەوراتدا هاتوە جێی پشت پێ بەستن نیەو لە چوارچێوەی ئیسرائیلیات دایە .

بڕگەی چوارەم : ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ﴾: لێرەدا خوا ﷻ مەدحو ستایشیکی گەورەی ئیبراهیم ﷺ دەکات: بێگومان ئیبراهیم زۆر بە بەزەیی‌و بە پەرۆش‌و گەڕاوە بوو، لە ناخەوە بۆ لای خوا ﷻ گەڕابۆوە.

(حلیم) لە (حِلم)ەوە هاتوە، واتە: هێدیی‌و مەند، هەڵبەتە هەندێکیان بە عاقڵ مەندییان داناوە بەڵام:

یەکەم: لێرەدا ناگونجێ .

دووەم: وەك ڕاغیبی ئەصفەهانیی باسی کردوە، دەڵێ: (الحِلم: مِنْ مُسَبِّباتِ العَقْلِ) واتە: بەهۆی عەقڵەوە ئینسان هێدیی‌و مەند دەبێ، واتە: هێدیی‌و مەندیی یەکێکە لەو سیفەتانەی کە بەهۆی عەقڵ‌و تێگەیشتنی باشەوە، لە ئینساندا پەیدادەبن.

(أَوَّٰهٌ)، (مَنْ يُكثِرُ قَوْلِ أَوَّه)، کەسێك کە زۆر دەڵێ: ئۆه، لە کوردەوارییشدا ئەوە هەر بەکاردێ، یان وشەی (ومیش).

زیاتریش کەسێك ئەم وشەیە بەکاردێنێ کە زۆر پەرۆشی خەڵکی بێ‌و، زۆر بۆیان دڵسۆز بێ، ئیبراهیم ﷺیش زۆر بە خەمی خەڵکەوە بوو، زۆر پەرۆشییان بووە.

(مُّنِيبٌ)، واتە : زۆریش دەگەڕایەوە بۆ لای خوا ﷻ.

بە تێگەیشتنی من: (چونکە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە)، ئەمە جۆرێکە لە پاساو هێنانەوەی خوا بۆ هەڵوێستەکەی ئیبراهیم، کە لەبەر زێدە سیفەت بەرزیی‌و، لەبەر ئەو ئاکارە بەرزو پەسندو جوانانەی، بەو شێوەیەی کردوە، نەك لەبەر ئەوەی جۆرێك لە هاوسۆزی لەگەڵ گەلی (لوط)دا بووبێ، بەڵکو

سیفەتە بەرزەکانی، پاڵیان پێوە ناوە، کە ئەو هەڵوێستە بنوێنێ‌و، مەعدەن‌و کەسایەتییەکەی وابووە، ئەگەرنا بەدڵنیاییی پێغەمبەران لە هەموو کەس زیاتر دژی ئەو کوفرو بەد ڕەوشتیی‌و خراپەکارییە بوون، کە گەلە کافرەکان کردوویانەتە پیشە، چ جای دۆستی هەرە نیزیکی خوا، ئیبراهیم (خلیل الله) صەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێ .

بڕگەی پێنجەم : ﴿ يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَآ ﴾: خوا ﷻ فەرمووی، یان فریشتەکان بە ناوی خواوە پێیان فەرمووە: ئەی ئیبراهیم! واز لەمە بێنە، (إنْصَرِف عَنْ هَـذَا الجِدَال، وَلاَ تَطْمَعْ فِي نَجَاتِهِم) واز لەم شەڕە قسەو مشتومڕە بێنەو، بە هیوا مەبە، کە ئەوانە ڕزگاربن.

بڕگەی شەشەم : ﴿ إِنَّهُۥ قَدۡ جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَ ﴾: بێگومان فەرمانی پەروەردگارت هات.

واتە: بڕیاری تەکوینیی‌و قەدەریی هات، بڕیارێکی هەڵبڕەو کۆتایی هاتوە.

بڕگەی حەوتەم : ﴿ وَإِنَّهُمۡ ءَاتِيهِمۡ عَذَابٌ غَيۡرُ مَرۡدُودٖ ﴾: بێگومان ئەوان سزایەکی بەرپەرچ نەدراوەو ڕەت نەکراوەیان بۆ دێ، (أي: غَيْر مَصْرُوف عَنْهُم، وَلاَ مَدْفُوع)، واتە: کە لێیان لانادرێ‌و، لێشیان بەرپەرچ نادرێتەوە.

هەڵبەتە خوا ﷻ جگە لەم ئایەتانەی سووڕەتی هوود، لە هەر کام لە سووڕەتەکانی :

(الحجر) و (العنكبوت) و (الذاريات)یش دا، باسی کۆی بەسەرهاتی ئیبراهیم عليه السلام دەکات، لەگەڵ ئەو فریشتانەدا، وە باسی قسەو بەرگرییکردنی ئیبراهیم لە گەلی لووط، دەکات، تاکو مۆڵەت‌و دەرفەتی زیاتریان پێ بدەن‌و، پەلە نەکرێ لە لەبین بردنیاندا، با سەرنج بدەین:

١/ لە سووڕەتی (الحجر)دا دەفەرموێ : ﴿ وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ۝٥١ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَقَالُواْ سَلَٰمٗا قَالَ إِنَّا مِنكُمۡ وَجِلُونَ ۝٥٢ قَالُواْ لَا تَوۡجَلۡ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ

عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا۟ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ ۙ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

واتە : {هەواڵیان پێبدە ، دەربارەی میوانەکانی ئیبراهیم ﴿٥١﴾ کە لێی وەژوور کەوتن گوتیان: سەلامەت لێ بێ، ئەویش گوتی، ئێمە لە ئێوە دەترسین (واتە: بۆ ئێمە نامۆن، بۆیە ترسمان ڕێ نیشت) ﴿٥٢﴾ گوتیان: ترس نەچێتە دڵت، لە دڵەڕاوکەدا مەبە، ئێمە موژدەت پێ دەدەین، بە (لەدایکبوونی) منداڵێکی زانا (کە هەر بە منداڵیی زانا دەبێ، ئەگەرنا منداڵی دیکەش کە گەورە بوون، دەتوانن زانا بن) ﴿٥٣﴾ گوتی: ئایا موژدەم پێ دەدەن لە کاتێکدا کە من گەیشتوومە تەمەنی پیریی‌و بە ساڵدا چووم، موژدەی چیم پێ دەدەن؟ ﴿٥٤﴾ گوتیان: بە هەق موژدەت پێ دەدەین، لە نائومێدان مەبە ﴿٥٥﴾ گوتی: ئنجا جگە لە گومڕایان، کێ لە بەزەیی پەروەردگاری نائومێد دەبێ! ﴿٥٦﴾ ئنجا ئیبراهیم، گوتی: ئەی ڕەوانەکراوەکان! کارتان چییەو بۆچی هاتوون؟ ﴿٥٧﴾ گوتیان: ئێمە ڕەوانەکراوین بۆ لای کۆمەڵێکی تاوانبار ﴿٥٨﴾ جگە لە بنەماڵەو خێزانی لووط، ئێمە ئەوان هەموویان دەرباز دەکەین ﴿٥٩﴾ جگە لە هاوسەرەکەی کە ئەندازەگیرییمان کردوە : ئەو دەبێ لە تێچووان بێ ﴿٦٠﴾}.

٢/ لە سوورەتی (العنكبوت)یش لە ئایەتەکانی : (٣١ و ٣٢)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ

أَهْلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا قَالُواْ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

واتە: کاتێك ڕەوانەکراوەکانی ئێمە هاتنە لای ئیبـراهیم بە مـوژدەوە، یاخود موژدەیان بۆ هێنا، (موژدەی لەدایکبوونی ئیسحاق، پاشان یەعقووب)، فریشتەکان گوتیان: ئێمە فەوتێنەری ئەم شارو ئاوەدانییەین، چونکە دانیشتووان و خەڵکی ئەم شارە ستەمکارن ﴿٣١﴾ (ئیبـراهیم عليه السلام) گوتی: بێگومان (لووط)یش لەم شارە دایە، گوتیان: ئێمە زاناترین بەو خەڵکەی کە تێیدایە، بێگومان لووط و خێزانەکەی دەرباز دەکەین، جگە لە ئافرەتەکەی، ئەو دەبێ لە تێچووان و فەوتێنراوان بێ.

٣/ لە سوورەتی (الذاريات)دا ئەوەی کە پەیوەندیی بەم بابەتەوە هەیە، حەوت ئایەتن، ئایەتەکانی: (٣١ تا ٣٧)، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

واتە : {(ئیبـراهیم عليه السلام دوای ئەوەی موژدەیان پێدا) گوتی : ئەی ڕەوانەکراوەکان! کارتان چییەو بۆچی هاتوون؟ ﴿٣١﴾ گوتیان: ئێمە ڕەوانەکراوین بۆ لای کۆمەڵێکی تاوانبار ﴿٣٢﴾ تاکو بەردێکی لە قوڕ دروستکراویان بەسەردا ببارێنین ﴿٣٣﴾ لەلایەن پەروەردگارتەوە نیشانەدار کراوە، بۆ زیدەڕۆییکاران و تێپەڕێنەران ﴿٣٤﴾ ئنجا ئەوەی کە لە بڕواداران لەو شارەدا هەبوون، هەموومان دەرباز کردن، ﴿٣٥﴾ بەڵام جگە لە ماڵێك لە مسوڵمانان، کەسی دیکەمان

تێدا نەبینی (کەماڵی لووط بوو) ﴿٣٦﴾ ئنجا بۆ ئەوانەی کە لە سزاو ئازاری بە ئێشی خوا دەترسێن، نیشانەیەکمان تێدا بەجێهێشت (کە مەبەست پێ شوێنەوارەکانی ئاوەدانییەکانی گەلی لووطە ﷺ) ﴿٣٧﴾ } .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەوت ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی : (٧٧ – ٨٣)، ئەم حەوت ئایەتە هەموویان تەرخان کراون، بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی لووط ﷺ و، گەلەکەی، کە ئێمە دابەشی دەکەین بۆ چوار بڕگە:

**بڕگەی یەکەم :** چوونی فریشتە نێردراوەکانی خوا ﷻ بۆ لای لووط ﷺو، سەغڵەت بوونی لووط بەهۆی مەترسیی هەبوونی بەرانبەریان، چونکە وایزانیوە کە مرۆڤن، نەوەك دووچاری ئەزیەتو ئازار ببن، لە لایەن گەلە خراپەکارەکەیەوە ؟

**بڕگەی دووەم :** ڕۆیشتنی کۆمەڵێك لە خراپەکارانی گەلەکەی، بۆ لای ماڵی لووط و، بەرگرییکردنی لووط ﷺ لە میوانەکانی، بە پێشنیارکردنی کچەکانی بۆیان، کە لێیان مارە بکات، یان بیانداتێ، سووربوونی لەسەر ئەوەی میوانەکانیان تەسلیم نەکاتو، خەفەتو ئەسەف خواردنی لووط ﷺو، خۆزگە خواستنی بە هەبوونی پاڵپشتێك بۆی، کە بەرگریی لێ بکات.

**بڕگەی سێیەم :** وە دەنگ هاتنی فریشتەکانو، خۆ ناساندنیان بە لووط ، کە ئێمە فریشتەی خواینو، ڕێنمایی کردنیان بۆی، کە خۆیو خێزانەکەی بڕۆن، جگە لە ژنەکەی، چونکە ئەو بەڵێنی فەوتێنرانی لەگەڵ گەلەکەی دا بۆ دراوە.

**بڕگەی چوارەم :** هاتنی فەرمانی قەدەریی خوای کاربەجێو، هەڵگێڕانەوەی ئاوەدانییەکانیانو بەردی ئاگرین بەسەردا بارێنرانیان.

﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ
عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ قَالَ
يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ ۖ أَلَيْسَ
مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ ﴿٧٨﴾ قَالُوا۟ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِى بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا
نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِى بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ قَالُوا۟ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ
رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓا۟ إِلَيْكَ ۖ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ
إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ ۚ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ۚ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ
﴿٨١﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن
سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ۖ وَمَا هِىَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾ ﴾.

# مانـــای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکــان

{ئنجا کاتێك فریشتە نێردراوەکانمان چوونە لای لووط، ئەویش بە هۆیانەوە ناخۆشحاڵ بووو، خۆی بە بێ چارە بینی، (کە بتوانێ بیانپارێزێ)و، لەبەر خۆیەوە)، گوتی : ئەمڕۆ ڕۆژێکی سەختو دژوارە ﴿٧٧﴾ گەلەکەی بەرەو لای ڕەتێنران (تاودران)و پێشتریش خراپەکاریی (نێربازیی)یان دەکرد، لووط گوتی: ئەی گەلەکەم! ئا ئەوە ئافرەتەکان (کچەکان)ی من، ئەوان بۆتان پاکترن، پارێز لە خوا بکەن، (و بە هۆی دەستدرێژییکردنە سەر میوانەکانمەوە) شەرمەزارم مەکەن، ئایا پیاوێکی سەر ڕاستتان تێدانیە؟! ﴿٧٨﴾ گوتیان: تۆ دەزانی هەقمان بەسەر کچەکانتەوە نیە، (یان: ئارەزوومان بۆیان نیە)و، مسۆگەر تۆ دەزانی چیمان دەوێ؟ ﴿٧٩﴾ لووط گوتی: ئەگەر توانام لە بەرانبەرتاندا ببووایە، یان هانام بردبایە بەر پەنایەکی بەهێز (بەرگرییم لە میوانەکانم دەکرد)، ﴿٨٠﴾ (فریشتەکان) گوتیان: ئەی لووط! ئێمە نێردراوانی پەروەردگارتین، مەترسە، ناتگەنێو زەفەرت پێنابەن، دەجا لە بەشێکی شەوێدا خێزانەکەت، شەوڕۆ پێبکەو، با هیچ کامێکتان ئاوڕ نەداتەوە، جگە لە ئافرەتەکەت، بە دڵنیایی ئەو بەڵایەی بەسەر گەلەکەت دێ، تووشی ویش دەبێ، بەڵێنگەیان بەرەبەیانە (بۆ لەبەینچوون) ئایا بەرەبەیان نیزیك نیە! ﴿٨١﴾ ئنجا کاتێك فەرمانمان هات بە فەوتاندنی گەلی لووط ، سەرەوبنمان کردنو، بەردێکی لە قوڕ سوورکراوەی ڕیز بەستوومان، بەسەردا باراندن ﴿٨٢﴾ کە لەلایەن پەروەردگارتەوە نیشانەدار کرا بوونو، ئەو (بەڵاو جۆرە بەرد)ە لە ستەمکارانیش دوورنیە، (کە بەسەریاندا بیبارێنین) ﴿٨٣﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(سِيٓءَ بِهِمْ ): واتە: بەهۆی ئەوانەوە، حاڵی خراپ بوو، ناخۆشحاڵ بوو.

(ساءَهُ ضِدّ سَرَّهُ)، (ساءَهُ) پێچەوانەی (سَرَّهُ)یە، (ساءَهُ)، واتە: دڵخۆشیی كرد، پێچەوانەی دڵناخۆشیی كرد، (سِيءَ بِهِم: أَي ساءَ حالُهُ بِسَبَبِهِم)، واتە: ناخۆشحاڵ بوو بەهۆیانەوە، نەك لەبەرئەوەی پێی ناخۆشبێ میوانی بێن، بەڵكو لەبەرئەوەی لە شێوەی گەنجی جواندا بوون‌و، زانیویشیەتی گەلەكەی چ ماڵێكن! بۆیە مەترسیی لێیان هەبووە.

(وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا ): واتە: خۆی بێچارە بینی، {الذِّرَاعُ: العضو المعْرُوف، وَالذِّرَاعُ: ما يُذْرَعُ بِهِ، وَأَصْلُ الذَّرْعِ: بَسْطُ اليد، ضاقَ ذَرْعُهُ أَي: لم يُطِقْهُ وَلم يَقْوَ عَلَيْهِ، فَكأنَّكَ تريد: مَدّ يدهُ فَلم يَنَلْهُ}[1]، (ذراع) ئەندامێكی زانراوو ناسراوی جەستەیە، (ذراع) ئەوەیە كە شتی پێ دەپێورێ، ئنجا وشەی (ذرع) لە ڕیشەدا بریتیە لەوە كە ئینسان دەست بكاتەوە، چونكە ئەگەر تۆ بتەوێ باوەش لە شتێك بدەی هەردوو دەستتی بۆ دەكەیەوە، ئنجا ئەگەر شتەكە لە باوەش فراوانتر بێ‌و، بڕست‌و توانای گرتنە باوەشی نەبێ، دەگوترێ : (لم يُطِقْهُ، ولم يقوَ عَلَيْهِ)، واتە: دەستی بۆ درێژ كردوەو نەیگەیوەتێ، یان وەك گوتم: دەستی بۆ كردۆتەوە، بەڵام باوەشی لێ نەگەیشتۆتەوە.

( يَوْمٌ عَصِيبٌ ): واتە: ڕۆژێكی سەخت، ڕۆژێكی توند، (يَوْمَ عَصِيب، وَعَصَبْصَبْ: شَدِيد، اعْصَوصَبُ اليَوْم) واتە: ئەمڕۆ ڕۆژەكەی زۆر سەختە، زۆر دژوارو سەغڵەتییە.

---

١) مختار الصحاح، ص ٢٢١.

( يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ ): واتە: تاو دەدران بۆ لای، (هَرِعَ وأُهْرِعَ: ساقَهُ سوقاً بعُنفٍ وَتَخْويف)، ئەوانـە کـە ئەو کارەیان ئەنجام داوە، وەك ئیرادەیان لە دەست خۆیان دا نەمابێ، هەڵپێچرابن بەهۆی ئارەزووی جینسییانەوە {الإهْرَاعُ: الإسْرَاعُ، قَالَ أَبُو عُبَيدة يُستحثُّونَ إلَيْهِ، كأَنَّهُمْ يَحُثُّ بَعْضُهُم بَعْضاً}، (إهْرَاع) بە مانای (إسْرَاع) واتە: خێرایی کردن، ئەبو عوبەیدە گوتوویەتی: (يُستحثُّونَ إلَيْهِ)، واتە: بەرەو ڕووی هاندەدران، وەك هەندێکیان هەندێکیان هان بدەن، ئاوا ئەو ئارەزوو و غەیزەیە هەڵیپێچاون.

( تُخْزُونِ ): واتـە: شـەرمەزارم مەکـەن، (خَزِيَ أَيْ: ذَلَّ وَهـانَ)، واتـە: زەبـوون بـووو، شـەرمەزار بوو، ئەگەر بگوترێ: (خَزِيَ يَخْزِي خِزَايـة)، یانـی: (استحيَا)، واتـە: شـەرمی کـرد.

( رَّشِيدٌ ): (رَشَدَ، يَرْشُدُ الرَّشادُ: ضِدُّ الغَيِّ)، وشـەی: (رشـد) و (رشـاد)، پێچەوانەی (غي)یە، دەگوترێ: (رَشَدَ يَرْشُدُ فَهو رَشِيد)، (رشيد)، واتە: سەر ڕاست، بە ئامانج گەیشتوو، خاوەنی (مختار الصحاح)[1] دەڵێ: {الغَي: الضَّلاَلُ وَالخَيْبَـةُ، خَابَ يَخِيبُ خَيْبَةً إِذَا لَم يَنَلْ مَا طَلَبهُ}.

(غـي) واتـە: گـومڕایی و پەشێمـانیی و ڕەنـج بـە خەسـاریی، ئەگـەر کەسـێك ئەوەی دەیەوێ بە دەسـتی نەکات، دەگـوتـرێ: (خَابَ يَخِيبُ خَيْبَةً) واتـە: بە مراد نەگەیشتن، بۆیـە من گوتوومـە: گومڕایی (ضَـلاَل) سـەرەنجامەکەی بریتیـە لـە بە ئاکام نەگەیشـتن (غَـي)و، ڕێنمایی (هُـدَى) سـەرەنجامەکـەی بریتیـە لـە بـە ئاکام گەیشتن و بە مراد گـەیشـتن (رشـد).

( رُكْنٍ شَدِيدٍ ): واتـــە: پایــەی بەهێــز، (رَكَنَ إلَيْـهِ رُكوناً أَي: مَـالَ إلَيْهِ وَسَكَنَ، وَرُكْن الشيء: جَانِبُهُ الأَقْوَى، رُكنٍ شَدِيـد: عِـزٌ وَمَنَعَةٍ)، (رَكَنَ إلَيْـهِ رُكونـاً)، واتـە: پاڵی وێدا، پشتی وێدا، (وَرُكْن الشيء: جَانِبُهُ الأَقْوَى)، گۆشـەی هـەموو

---

١) ص ٤٨٥.

شتێك بەهێزترە لە دیوارەكەی، بۆیە بەردی باشتر لە گۆشەدا دادەنرێ، چونكە گۆشەكان زیاتر دیوارەكان ڕادەگرن، پایەكان، (رُكْنٍ شَدِيد) واتە: پایەو هێزو پاڵپشتیكی مەحكەم.

( فَأَسْرِ ): واتە: شەوڕۆ بكە، سەفەری شەویان پێبكە، (سَرَى يَسْرِي سُرىً ومَسْرَىً وَأَسْرَى: سارَ لَيْلاً)، (أسرى) واتە: شەوڕۆیی كرد، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَا الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١﴾﴾ الإسراء، باسی شەوڕۆیی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەكات.

(بِقِطْعٍ): (القِطْعُ: ظُلْمةُ آخِرِ اللَّيْلِ)، وشەی (قِطْع)، واتە: پارچە، بەش، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی تاریكایی كۆتایی شەوە.

( وَلَا يَلْتَفِتْ ): واتە: با هیچ كام لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە، (لَفَتَ وَجْهَهُ عَنْهُ: صَرَفَهُ)، مرۆڤ ئەگەر ڕووی بەرەو شتێك وەرگێڕا، ئەوە پێی دەگوترێ: (لَفَتَ) یان (اِلْتَفَتَ) ئاوڕی دایەوە، ئەگەر بگوترێ: (لَفَتَ وَجْهَهُ)، واتە: كەسێك ڕووی بسووڕێنێ، بەڵام (اِلْتَفَتَ)، واتە: خۆی ڕووی سووڕاند، دەگوترێ: (وَلَفَتَهُ عَنْ رَأْيِهِ)، واتە: وایلێكرد بۆچوونی خۆی بگۆڕێ.

(سِجِّيلٍ ): (السِجّيل: حَجَرٌ وَطِينٌ مُخْتَلَط، قِيلَ: فَارِسِي مُعَرَّب، الطين المتحجِّر، سنگ گل/ سنج جل)، وشەی (سجیل) هەندێك لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی، كە واپێدەچێ شارەزای زمانی فارسیی نەبوو ون، ویستوویانە ئەم وشە ببەنەوە بۆ ڕیشەی زمانی عەرەبیی، كە لە ڕاستییدا عەرەبیی نیە، جا ئەوانەی كە گوتوویانە: (حَجَرٌ وَطِينٌ مُخْتَلَط)، یانی: بەردو قوڕی تێكەڵ، ئەوانە فارسییان نەزانیوە، بەڵام ئەوانەی گوتوویانە: (الطِّينُ المتَحجِّر)، واتە: قوڕێك كە بۆتە بەرد، دیارە فارسییان زانیوە، وەك: (طَبَرِي) و (فَخْرَ الدِّين الرازِي)، ئەوانە كە

فارسییان زانیوە تەماشای تەفسیرەکانم کرد، دەڵێن: (سجِّیل)، (فَارسِي مُعَرَّب)، واتە: وشەیەکی فارسییە کراوە بە عەرەبیی، هەتا لە تەفسیری (مفاتیح الغیب)ی، (فَخْرَ الدّین الرازِي)دا، دەڵێ: سنگ گل، یانی: بەردێکی قوڕین، هەندێکیش نووسیویانە: (سنج جل)، ئنجا لەبەر ئەوەی پیتی (گ) لە عەرەبییدا نیە، بۆیە لە جیاتی (گـ) پیتی(جـ)یان بەکارهێناوە، دوایی (ن) نوونەکەیان لابردووەو بووە بە (سجیل)، کە لە ڕاستییدا هەر (سەنگ گلْ)ەکەیە، یانی: بەردی قوڕ.

(مَّنضُودٍ ): (نَضَدْتُ المتاعَ بَعْضَهُ عَلَى بَعْض: أَلْقَيْتُهُ فَهو مَنْضود وَنَضِيد، وَنَضَّدَهُ تَنْضِيداً: لِلمبالَغَة فِي وَضْعِهِ مُتَرَاصِفاً)، (نَضَدْتُ المتاعَ بَعْضَهُ عَلَى بَعْض)، واتە: کەلوپەلەکەم هەندێکی خستە سەر هەندێکی و لەسەر یەکم دانان، (فَهو مَنْضود وَنَضِيد)، (وَنَضَّدَهُ تَنْضِيداً) ئەوە بۆ زیدەڕۆیی کردنە، واتە: زۆر بە ڕێکیی داینا، کە دەفەرموێ: (مَنْضود) واتە: ئەو بەردانە بە دوای یەکدا دەهاتن، بە شێوەیەکی ڕیز بەستوو.

( مُّسَوَّمَةً ): (السومَة: العَلامَةُ، وَسوَّمْتُهُ: أَعْلمتُهُ)، (مُسوَّمَة) واتە: (مُعلَّمة) واتە: نیشانەدار کراو.

# مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە پێشتر باسی ئیبراهیممان ﷺ کرد، کە ئەو فریشتانەی هاتن بۆ لای، هاتبوون هەم موژدەی ئیسحاقو یەعقووبیان بە خۆی‌و خێزانی دا، هەم هەواڵیشیان پێدا، کە دەیانەوێ گەلی لووط لەنێوبەرن‌و، ئیبراهیم ﷺ ویستی تکایان بۆ بکات، کە دوا بخرێن، یان مۆڵەتیان بدرێتێ، یان لەبەر ئەوەی لووط لەوێیە، ئەوان گوتیان: تازە بڕیاری کۆتاییان لەبارەوە دراوە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴾، کاتێک ڕەوانەکراوەکانمان چوونە لای لووط، بەهۆی وانەوە ناخۆشحاڵ بوو، خراپەی تووش بوو، (سیء بهم) بە (مجهول الفاعل) هاتوە، وشەی (ساء)، واتە: ناخۆشحاڵ بوو، بەڵام (سیء بهم)، واتە: بەهۆی وانەوە ناخۆشحاڵ بوو، بۆچی؟! چونکە وەك لە تەفسیرەکاندا باس دەکرێ، بەپێی سیاقیش دەردەکەوێ، دیارە فریشتەکان لە شێوەی پیاوی جوان‌و گەنجی جواندا چوو بوون، لووطیش زانیویەتی کە گەلەکەی چ ڕەفتارێکی خراپیان هەیە! ﴿ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا ﴾، واتە: خۆی دەستەپاچە بینی، خۆی بێچارە بینی، لە بواری بەرگریی لێکردنیاندا، توانای خۆی وا نەبینی، کە بتوانێ بەرگریی لەو میوانانەی خۆی بکات، لە بەرانبەر ئەو گەلە خراپەی خۆیدا، ﴿ وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴾، ئنجا گوتی: ئەمڕۆ ڕۆژێکی دژوارە، ڕۆژێکی سەخت‌و ناڕەحەتە، هەڵبەتە دەبێ لەبەر خۆیەوە وای گوتبێ، چونکە ئەگەر لەلای میوانەکان وا بڵێ، مانای وایە ئەو ناڕەحەت بووە بەوەی کە ئەوان چوون بۆ لای، چونکە ئەو نەیزانیوە ئەوانە فریشتەن، وایزانیوە، ئەوان نازانن ئەو گەلە چەند خراپن، هاتوون میوانی بوون، نازانن چی لە پێشیانەو، چ شتێك چاوەڕێیان دەکات؟

﴿ وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ ﴾، خەڵکەکەش هاتن زۆر بە خێرایی، یانی: هەڵپێچرابوون، تاودرابوون، پاڵیان پێوە دەنرا، ئاوا ئارەزوو و غەریزەی جینسیی هەڵیپێچا بوون، وەك بەدەست خۆیان نەبێ، تاو دەدران، ﴿ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، پێشتریش خراپەیان دەکرد، لێرەدا وشەی : کردەوە خراپەکان (ٱلسَّيِّـَٔاتِ) هەموو شتێك دەگرێتەوە، بەڵام بە پێی سیاق دەزانرێ، کە زیاتر مەبەست پێی نێربازییە، ئەگەرنا وەك باسی دەکەین گەلی لووط زۆر ڕەفتاری خراپیان هەبوون.

﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡ ﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم! ئەوانە کچەکانمن، ئەوان بۆ ئێوە پاکترن، هەڵبەتە دوایی باسی دەکەین کە دەفەرموێ: (أَطۡهَرُ لَكُمۡ) مەبەست ئەوە نیە کە ئەوی دیکەش پاکە، بەڵام ئەوانە پاکترن، بەڵکو یانی: خوا ئافرەتی دروست کردوە بۆ پیاو، بۆ تێرکردنی غەریزەی جینسیی، نەك پیاو بۆ پیاو، وە ئافرەت بۆ ئافرەت، وە توێژەرەوانی قورئان دوو سێ واتایان بۆ ئەم ڕستەیە لێکداوەتەوە، وەك دوایی ئاماژەیان پێدەکەین.

﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓۖ ﴾، پارێز لە خوا بکەن‌و شەرمەزارم مەکەن، لەبارەی میوانەکانمەوە، واتە: ڕوو زەردی میوانەکانم مەکەن، کە دەستدرێژییان بکەنە سەرێ، ﴿ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ﴾، ئەرێ پیاوێکی سەر ڕاست‌و عاقڵمەندو تێگەیشتووتان تێدانیە، کەسێکی وابێ کە بە ئامانج‌و بە مراد بگات، بەهۆی ڕێی ڕاست گرتنەوە؟!

﴿ قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ ﴾، گوتیان: تۆ دەزانی کە ئێمە هیچ مافمان بە سەر کچەکانی تۆوە نیە، یاخود هیچ ئارەزوومان بۆیان نیەو، بێگومان تۆ دەزانی ئێمە چیمان دەوێ، واتە: ئەوەمان دەوێ کە لەگەڵ ئەو میوانانەی تۆدا جووت بین‌و خراپەیان لەگەڵدا بکەین، ﴿ قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ﴾، گوتی: ئەگەر من هێزێکم ببووایە، بەرانبەر بە ئێوە، یاخود

ئەگەر خۆشم هێزم نیە بەسەرتاندا، پاڵپشتێکم هەبووایە، کە پاڵم وێدابایە، یانی: لایەنێك، کە بەرگریی لێکردبام‌و، پشتی گرتبام لە دژی ئێوە.

ئنجا لێرەدا کە لووط ئاوا بێچارەیی‌و دەستە پاچەیی خۆی دەخاتە ڕوو، فریشتەکان وە دەنگ دێن: ﴿ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَ ﴾، گوتیان: ئەی لووط! ئێمە نێردراوانی پەروەردگارتین، بە هیچ شێوەیەك‌و هەرگیز ئەوانە دەستیان ناگاتە تۆ، پێت ناگەن، زەفەرت پێنابەن، ئێمە هاتووین ئەوانە بفەوتێنین، ﴿ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ ﴾، جاری خۆت‌و خێزانەکەت لە پارچەیەك، لە بەشێك لە شەوێدا بڕۆن، سەفەر بکەن‌و، با هیچ یەکێك لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە، جگە لە ئافرەتەکەت، واتە: هەموویان لەگەڵ خۆت ببە، جگە لە ئافرەتەکەت، ئەمە واتایەکی .

یاخود: با هیچ کام لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە، جگە لە ئافرەتەکەت، ئەو ئاوڕ دەداتەوە، دیارە ژنەکەی بە قسەی لووطی نەکردوە، هەر لە سەرەتا تاکو کۆتا.

ئیدی لووط ﷺ ئەو ئاڕاستەو تەعلیماتەی فریشتەکانی بە ماڵ‌و خێزانەکەی خۆی گوتوەو گوتوویەتی: ئاوڕ مەدەنەوە، کچەکانی بە قسەیان کردوەو ئاوڕیان نەداوەتەوە، کاتێك گوێیان لەو گرمەو زرمەو هەڵگێڕانەوەی ئەو ناوچەو دەفەرە بووە، کە دوایی بۆتە دەریاچەی مردوو، بەڵام دیارە خێزانەکەی لێرەشدا بە قسەی نەکردوەو ئاوڕی داوەتەوەو، بۆتە هۆی لەبەین چوونی.

یاخود مەبەست ئەوەیە کە: هەر لە ڕێوە لەگەڵ خۆتی مەبەو، هەر لە ڕێوە لەگەڵیشی نەهاتوەو، بڕوای بە لووط ﷺ نەبووە، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (التحریم)دا دەفەرموێ : ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖۖ كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ١٠ ﴾، دیارە ژنەکەی بێبڕوا بووەو، ڕەنگە گاڵتەشی پێکردبێ‌و، گوتبێتی: سزای چی‌و ئازاری چی؟! بۆیە خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ ﴾، بێگومان ئەوەی تووشدێ كە تووشی گەلەكەت دێ، چونكە لە هەموو شتێك لەگەڵ ئەواندا بووە، بۆیە دەبێ لە سزاكەش لەگەڵیاندا بێ.

﴿ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ﴾، بەڵێنگەیان، واتە: كاتی جێبەجێكردنی ئەو سزاو بەڵایە بەسەریاندا، بەرەبەیانە.

﴿ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴾، ئایا بەرەبەیان نیزیك نیە؟

﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴾، ئنجا كاتێك فەرمانی ئێمە هات، واتە: بڕیاری كۆتایی ئێمە هات، یاخود ئەو فەرمان پێكراوەی ئێمە هات، لای سەرەوەمان كردە لای بنەوەی، واتە: هەڵمان گێڕایەوە، سەرەو بنمان كرد، ژێرەو ژوورمان كردو، بەردێك كە لە قوڕی وشككراوەی ڕیز بەستوو بوو، بەسەرماندا باراندن، واتە: بەردبارانمان كردن بە بەردێك كە لە قوڕێكی وشككراوەو سووركراوە، ڕیزی بەستبوو، ﴿ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ﴾، لەلایەن پەروەردگارتەوە نیشانەدار كرابوو، ئەو نیشانەدار كردنە دوایی باسی دەكەین چۆن بووە؟ ﴿ وَمَا هِىَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾، ئنجا ئەو جۆرە سزایەو، ئەو جۆرە بەردباران كردنە، لە ستەمكارانیش دوورنیە، واتە: ستەمكارانێك كە ستەم دەكەن، دوورنیە كە خوای دادگەر سزایان بدات، ئنجا ئەگەر ئەو جۆرە بەردەشیان بەسەردا نەباریێ، شەڕو ناخۆشییو، دەردو بەڵاو، گرفتارییو هەراو قاتو قڕییو...هتد، یان بەسەردا دێ، گرنگ ئەوەیە ستەمكارانی هیچ ڕۆژگارێك، لە سزای خوا دوورنین، واتە: دەربازو قوتار نابن، ئەگەر خوای دادگەر بیەوێ سزایان بدات، بەهۆی گوناهو تاوانو خراپەكاریی خۆیانەوە.

ئێستاش بەر لەوەی بچینە سەر خستنە ڕووی مەسەلە گرنگەكان، توێژینەوەیەك لەبارەی بەسەرهاتی لووطو گەلەكەیەوە، دەكەین:

# بەسەرهاتی لووط (علیه السلام) و گەلەکەی لە پێنج تەوەردا

ئێمە لە پێنج تەوەردا بەسەرهاتی لووط عليه السلام و گەلەکەی دەتوێژینەوە:

١/ پێناسەی لووط و گەلەکەی.

٢/ ژمارەی ناوهێنرانی لووط عليه السلام و پانتایی بەسەرهاتەکەی، لە قورئاندا.

٣/ پەیام و بەرنامەی لووط عليه السلام بۆ گەلەکەی.

٤/ گەلی لووط چۆن فەوتێنران؟

٥/ حوکمی کردەوەی گەلی لووط (نێربازیی) لە ئیسلام دا.

## تەوەری یەکەم : پێناسەی لووط و گەلەکەی :

بە سەرنجدانی قورئـان، زۆر شت بۆ ئێمە دەربارەی لووط عليه السلام و گەلەکەی، ڕوون دەبێتەوە:

١/ لووط عليه السلام لەسەر دەستی ئیبراهیم عليه السلام بڕوای هێناوە واتە: بڕوای بە ئیبراهیم عليه السلام هێناوە، وەك پێغەمبەری خوا، کە جارێ بۆخۆی نەبۆتە پێغەمبەر، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌۘ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٢٦﴾ العنكبوت، واتە: ئنجا لووط ئیمانی پێ هێناو، گوتی: من کۆچ دەکەم بۆ لای پەروەردگارم، بێگومان پەروەردگارم زاڵی کاربەجێیە.

ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە بەرلەوەی ئیبراهیم عليه السلام لە عێراقەوە، یان لە نووری کلدانییەکانەوە، کۆچ بکات بۆ شام، دوایی بۆ سەرزەمینی کەنعانییەکانو، دوایی بۆ فەلەستین کە دواتر بۆ میسرو بۆ حیجازیش کۆچی کردوە، بەڵێ پێش ئەوەی هەر لە عێراقەوە کۆچ بکات، لووط عليه السلام ئیمانی پێهێناوە، وە هەر لەگەڵ ئەویشدا کۆچی کردوە، بۆ ئەو شوێنانەی باسمان کردن.

٢/ لووط عليه السلام یەکێکە لە پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام)و، بە زۆریی لە قورئاندا بەسەرهاتی لووط، لەگەڵ هی ئیبراهیم دا هاتوە (عليهما السلام).

٣/ بە پێی تەوراتو تاراددەیەك لە ئایەتەکانیش ئەمە دەفامرێتەوە، لووط برازای ئیبراهیم بووە، بۆیەش دەڵێم: بە پێی ئایەتەکانیش ئەمە دەفامرێتەوە، چونکە هەر لە سەرەتاوە لووط عليه السلام لە هەموو قۆناغەکان لەگەڵ ئیبراهیم دا بووە، کە واپێدەچێ نیزیکایەتیی‌و خزمایەتیی لەگەڵ ئیبراهیمدا بووبێ، ئەگەرنا چۆن لە عێراقەوە لەگەڵی کۆچ دەکات بۆ حەرڕانو، دوایی بۆ سەر زەمینی کەنعانییەکانو ... هتد.

ئەمەش دەقی ئەوەیە كە لەوبارەوە لە تەوراتدا هاتوە: (وَهَذَا هو سِجِلّ مَوالِيد تارَحْ: وَلَدَ تارَحْ أَبْرَام وَناحورَ وَهارَانُ، وَوَلَدَ هارَانُ لُوْطاً، وَماتَ هارَانُ قَبْلَ تارَحْ أَبْيهِ، فِي أَرْضِ مَوْلِدِهِ في أُورِ الكلْدَانِيين...)[1].

واتە: ئەمە تۆماری ڕۆڵەكانی تارەحە، تارەح ئەبرامی بووو، ناحووری بووو، هارانیشی بوو (واتە: سێ كوڕی بوون) هارانیش لووطی لێ وەپاش كەوت، (كەواتە: هاران برای ئیبراهیم بووەو بابی لووط بووە)و، هاران پێش تارەح لەو سەرزەمینی كە تێیدا لە دایك بوو، مرد، كە سەرزەمینی ئووری كلدانییەكان بوو (كە پێشتر ئیبراهیم لەوێ نیشتەجێ بووە).

جێی باسە كە تارەح بابی ئیبراهیم، كە لە قورئاندا بە ئازەر هاتوەو، ئەبرامیش دیارە كە ناوی ئیبراهیمەو، لووط هەر بە لووط هاتوە، دیارە بابی لووطیش ناوی هاران بووە، كەواتە: بابی ئیبراهیم، سێ كوڕی بوو ون، ئەبرامو ناحوورو هاران، ئنجا هاران كوڕێكی لە پاش بووە، كە ناوی لووط بووەو، هاران پێش بابی (تارەح - ئازەر) وەفاتی كردوە لەسەر زەمینی ئووری كلدانییەكان.

٤/ وە بابی ئیبراهیم لە قورئاندا بە ئازەر ناوی هاتوە، وەك خوا لە سوورەتی (الأنعام)دا، دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: یاد بكەوە كاتێك ئیبراهیم بە ئازەری بابی گوت: ئایا بتان دەكەی بە پەرستراو؟ من خۆتو گەلەكەت لە گومڕاییەكی ئاشكرادا دەبینم[2].

ئنجا هەندێك گوتوویانە: (ئازەر) نازناوی تارەحە، بەڵام دەگونجێ لە زمانێكەوە بۆ زمانێك، ئەو پیتانە بگۆڕێن، دەشگونجێ دوو ناوی بووبن،

---

١) التفسیر التطبیقي للكتاب المقدس، العهد القدیم، سفر التكوین، الإصحاح ١١، نسب أَبْرَام، ص ٣٢.

٢) لە بەرگی (٥)ی ئەم تەفسیرەدا بە درێژی باسی ئەم وتووێژەی نێوان ئیبراهیمو بابیو خۆرپەستو ئەستێرە پەرستو مانگ پەرستانمان كردوە.

دەشگونجێ بەس ناوی ئازەربێ، کە بێگومان هەر ئەوەش تەواوە، چونکە ئێمە لە قورئان دڵنیایین کە دەستکاریی نەکراوە، بەڵام لە پەیمانی کۆن‌و نوێ دڵنیا نین، چونکە بە دەقی ئایەت‌و، هەر بە سەرنج دانی عەقڵ‌و واقیعیش دیارە، کە دەستکاریی کراون.

٥/ ئنجا شایانی باسە: لە تەوراتدا لە (سفر التكوين)دا هاتوە، کە لە ئەنجامی ئەوەدا، هەر کام لە ئیبراهیم‌و لووط سەلامی خوایان لەسەر بێ، ئاژەڵ‌و مەڕو ماڵێکی زۆریان هەبووەو، ئەو شوێنەی کە لێی بوون، کە سەرزەمینی کەنعانییەکان بووە، لێیان وەتەنگ هاتوەو جێیان نەبۆتەوەو، خەریک بووە شوان‌و گاوانەکانیان ببێتە شەڕو دەمەقاڵەیان، بۆیە ئیبراهیم پێشنیاری بۆ لووطی برازی کردوەو گوتوویەتی: {(لاَ يَكُنْ نِزَاعٌ بَيْنِي وَبَيْنَكَ، وَلا بَيْنَ رُعَاتِي وَرُعَاتِكَ، لأَنَّنا نَحْنُ أَخوان، أَلَيْست الأَرْضُ كُلُّها أَمامَكَ؟ فَاعْتَزِل عَنِّي، إنْ اتجهْتَ شِمالاً، أتجهُ أنا يَمْيناً، وَإن تَحولتَ يَميناً، وَأتَحولُ أنا شِمالاً ... فَاخْتارَ لُوطٌ لِنَفْسة حوض الأَردن كُلَّهُ وَارْتَحلَ شَرْقاً} [(١)].

واتە: ئیبراهیم بە لووطی گوت: نابێ لە نێوان من‌و تۆدا ناکۆکیی هەبێ، هەروەها لە نێوان شوانەکانی من‌و شوانەکانی تۆدا، چونکە ئێمە براین (مەبەستی ئەوە بووە کە تۆ برازامی) ئایا سەرزەمین هەمووی لەبەردەمی تۆدا نیە؟ (دیارە ئەو کاتە چۆڵ بووە)، کەواتە: کەنار بگرە، ئەگەر تۆ بۆ لای سەرێ بچی، من بەرەو لای ڕاست دەچم‌و، ئەگەر تۆ بۆ لای ڕاست بچی، من بۆ لای سەرێ دەچم، (واتە: تۆ سەر پشکبە، بۆ کام لا دەچی، بۆئەوەی بیکەیە نشینگەی خۆت‌و مەڕو ماڵاتەکەتی تێدا بەخێو بکەی)، ئنجا لووط سەرزەمینی ئوردونی بۆخۆی هەڵبژاردو، بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیی.

(ڕۆژهەڵاتی ئەو شوێنەی، کە پێشێ لووط‌و ئیبراهیمی پێکەوە لێبوو ون).

---

١) التفسيرالتطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفرالتكوين، الإصحاح : ١٣، ص٣٥ و ٣٦.

ئنجا هەر لە (سفر التكوين)دا، دەڵێ: (وسَكَنَ أَبْرَامُ فِي أَرْضِ كَنْعَانَ، وَأَقَامَ لُوطُ فِي مُدُنِ السَّهل حَيْثُ نَصَبَ خِيَامَهُ بجوار سَدُومَ، وَكَانَ أَهْلُ سَدُومَ مُتَورطِّينَ فِي الشَّرِّ وَخَاطِئِينَ لَدَى الرَّبِّ)[١].

واتە: ئەبرام لە سەرزەمینی کەنعان نیشتەجێ بوو، لووط لەو شارانەی کە لە پێ دەشتەکە بوون، خێوەتەکانی خۆی هەڵدان، لە تەنیشت سەدووم (ناوی شارێکە)و، خەڵکی سەدووم زۆر گیرۆدەی خراپەکاریی بوو بوونو، لەلای پەروەردگار زۆر بە خراپ لە قەڵەم دەدران.

مەبەستی ئەوەیە کە زۆر جۆرە گوناهو تاوانی دیکەیان هەبووە، جگە لەو جۆرە گوناهەی کە پێوەی ناسراون، کە بریتی بووە لە نێربازیی.

٦/ ئنجا ئەو دوو شارەش، واتە: سەدوومو عەمموورە، بەڵکو ناوی چەند شارێکی دیکەش هاتوە، وەك دوایی باسیان دەکەین، ئەوانە خەڵکەکەیان فەوتێنراوە، ئەو شارانە کە لووط ﷺ سەرەتا لە تەنیشتیان بووەو، دوایی لە نێویاندا بووە.

وەك لە (سفر التكوين)دا، دەڵێ : (وَما إِنْ أَشْرَقَتِ الشَّمْسُ عَلَى الأَرْضِ حَتَّى كَانَ لُوطٌ قَدْ دَخَلَ إِلَى صُوغَرَ، فَأَمْطَرَ الرَّب عَلَى سَدُومَ وَعَمُورَةَ كِبْرِيتاً وَنَاراً، مِنْ عِنْدِهِ مِنَ السَّمَاءِ، وَقَلَبَ تِلكَ المدُنَ وَالساكِنِينَ فِيهَا، وَالمسَّهْل المحِيطَ بِها، وَكُلَّ مَزْرُوعَاتِ الأَرْضِ، وَتَلَفَّتَتْ زَوْجَةُ لُوطِ السائِرَةُ خَلْفَهُ وَرَاءَهَا، فَتَحوَّلَتْ إِلَى عَمُودٍ مِنَ المِلْحِ)[٢].

واتە: کاتێك کە خۆر هەڵات لەسەر زەوی، لووط چوو بۆ شاری صوغەر، پەروەردگار بەسەر هەردوو شاری سەدوومو عەمورەدا، کبریتو ئاگری باراند لەلای خۆیەوە لە ئاسمانو، ئەو شارانەو ئەوەی کە تێیاندا نیشتەجێ بوو بوونو، ئەو دەشتو کێڵگانەی بە دەوریەوە بوون، هەموویانی هەڵگێڕایەوەو، هاوسەرەکەی لووط کە لە پشتیەوە دەڕۆیی، ئاوڕی دایەوە دواوە، ئیدی بووە کۆڵەکەیەك لە خوێ، (واتە: وشك بووەوەو بوو بە خوێ) .

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٦.

٢) هەمان سەرچاوە، الإصحاح : ١٩، ص ٥٢.

هەڵبەتە ئەوە لە تەوراتدا هاتوە، ئەگەرنا لە قورئاندا هەر دەفەرموێ: ئافرەتەکە فەوتا، بەڵام نافەرموێ: بەو شێوەیە فەوتا.

٧/ ئەو شارانەش دیارە پێنج شار بوون، وەك زۆربەی مێژوونووسەکان هێناویانە، یەکێك لەوانە: (سیرة النبیین والمرسلین)[1]، ناوی ئەو شارانە دێنێ، دەڵێ: بریتی بوون لە: (سَدُومَ وَعَمُورَةَ وَصَامُورَةَ وَصَابُورَةَ وَدُوما)، کە ئەوانە هەموویان دەکەونە نێوان هەردوو وڵاتی ئێستای ئوردنو فەلەستینو، بە وردیی دەکەونە ژێر ئەو ئاوەی کە ئێستا پێی دەگوترێ: دەریای مردوو (البحر المیت) بۆیەش وای پێدەگوترێ، چونکە هیچ زیندەوەرێکی لەنێودا ناژیو، ڕێژەی خوێی زۆر تێدا بەرزە.

## تەوەری دووەم : ژمارەی ناوهێنرانی لووط ﷺو پانتایی بەسەرهاتەکەی لە قورئاندا :

أ/ ناوی لووط ﷺ (٢٧) جار لە قورئاندا هاتوە، بەمجۆرە:

| ژمارەی سوورەت | ناوی سوورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|---|
| ٦ | الأنعام | ٨٦ |
| ٧ | الأعراف | ٨٠ |
| ١١ | هوود | ٧٠، ٧٤، ٧٧، ٨٢، ٨٩ |
| ١٥ | الحجر | ٥٧ و ٥٨ |
| ٢١ | الأنبیاء | ٧١ و ٧٤ |
| ٢٢ | الحج | ٤٣ |
| ٢٦ | الشعراء | ١٦٠، ١٦١، ١٦٧ |
| ٢٧ | النمل | ٥٤ و ٥٦ |
| ٢٩ | العنكبوت | ٢٦، ٢٨، ٣٢، ٣٣ |
| ٣٧ | الصافات | ١٣٣ |
| ٣٨ | ص | ١٣ |

---

١) ج ١ ص ٢٨١.

| | | |
|---|---|---|
| ٥٠ | ق | ١٢ |
| ٥٤ | القمر | ٣٢، ٣٤ |
| ٦٦ | التحريم | ١٠ |

ب/ پانتایی بەسەرهاتی لووط ﷺو گەلەکەی لە قورئاندا بەمجۆرەیە:

١) سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (٨٠ تا ٨٤) واتە: (٥) ئایەت.

٢) سوورەتی (الحجر) لە ئایەتی (٦١ تا ٧٧) واتە: (٧) ئایەت.

٣) سوورەتی (الأنبياء) لە ئایەتی (٧٤ تا ٧٥) واتە: (٢) ئایەت.

٤) سوورەتی (الشعراء) لە ئایەتی (١٦٠ تا ١٧٥) واتە: (١٦) ئایەت.

٥) سوورەتی (النمل) لە ئایەتی (٥٤ تا ٥٨) واتە: (٥) ئایەت.

٦) سوورەتی (العنكبوت) لە ئایەتی (٢٨ تا ٣٥) واتە: (٨) ئایەت.

٧) سوورەتی (الصافات) لە ئایەتی (١٣٣ تا ١٣٨) واتە: (٦) ئایەت.

٨) سوورەتی (القمر) لە ئایەتی (٣٣ تا ٤٠) واتە: (٨) ئایەت.

٩) سوورەتی (الحجر) ئایەتی (١٠) واتە: (١) ئایەت.

هەمووی دەکاتە (٦٥) ئایەت لە کۆی ئایەتەکانی قورئانی بەرزو بە پێز، بۆ گێڕانەوەو باسکردنی گەلی لووط ﷺو گەلە بەد ڕەوشتەکەی، تەرخان کراون.

## تەوەری سێیەم: پەیامو بەرنامەی لووط ﷺ بۆ گەلەکەی چی بوو ؟

سەرەتا دەڵێم: هیچ گومانی تێدانیە کە سەرجەم پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بەرنامەیەکی گشتگیری چاکسازییان پێبووە، واتە: گشتگیر بۆ هەموو بوارەکانو لایەنەکانی ژیان:

١ ـ سەرەتا لایەنی بوونناسیی: تێڕوانینی ئینسان بۆ خۆیو بۆ دەوروبەریو بوونەوەرو، بۆ دنیاو پێش دنیاو دوای دنیا.

٢- ئنجا بواری ئیمانو عەقیدە.

٣- ئنجا بواری عیبادەتو پەرستن.

٤- پاشان ڕەوشتو ئاکار.

٥- دوایی بواری هەڵسوکەوتی خێزانیی.

٦- دوایی هەڵسوکەوتو ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان.

٧- ئنجا لایەنی ئابووریی‌و گوزەرانی خەڵك.

٨- پاشان لایەنو بواری سیاسیی‌و حوکمڕانیی.

بەڵام دیارە هەر کام لەو پێغەمبەرانە (علیهم السلام) زیاتر جەختی لەسەر ئەو لایەنە کردۆتەوە، کە کۆمەڵگایەکەی پێویستی پێی بووە، هەر بۆیە لە قورئانی بەرزو بەپێزدا، دەبینین شوعەیب زیاتر جەخت لەسەر لایەنی ئابووریی دەکاتەوە، لووط زیاتر جەخت لەسەر لایەنی ڕەوشتو ئەخلاق دەکاتەوە، یەکێکی دی زیاتر جەخت لەسەر لایەنی سیاسیی دەکاتەوەو.... هتد، لەبەر ئەوەی کە کۆمەڵگاکەیان زیاتر گیرۆدە بوونە بەو دەردو نەخۆشییەوە، ئەگەرنا ئەوە مانای وانییە کە هەر یەك لەو زاتانە، تەنیا ئەو بەرنامەیان پێ‌بووبێ کە زیاتر جەختیان لێکردۆتەوە! ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە؟

ئەگەر تەماشای ئەو سێ ئایەتە بکەین، بە نسبەت (لوط)ەوە، زۆر جوان دیارە کە گەلی لووط تەنیا گیرۆدە نەبوون بە بواری ڕەوشت نزمییەکەیانەوە، بەڵکو ڕەوشت نزمییەکەیان، بەرهەمو دەرهاویشتەی جۆری بووننـاسیی‌و عەقیدەیان بووەو، (لوط)یش ﷺ بەرنامەکەی تەنیا ئەوە نەبووە کە لە ڕووی ڕەوشتییەوە، چاکسازیی لە نێو گەلەکەیدا بکات، خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا

كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾
قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

**واتە: لووط کاتێك بە گەلەکەی خۆی گوت: بێگومان ئێوە گوناهو تاوانێکی ناقۆلاو ناشیرین دەکەن، کە هیچ کەس لە جیهانییاندا پێش ئێوە نەکەوتۆتەوە، لە ئەنجامدانی ئەو گوناهو تاوانەدا، ئایا ئێوە دەچنە لای پیاوان (واتە: لەگەڵ پیاواندا جووت دەبن)و، ڕێگریی دەکەن، لە نادییەکەتان (واتە: لە دیوەخانو کۆڕەکانتاندا) خراپە دەکەن، وەڵامی گەلەکەشی هەر ئەوە بوو کە گوتیان: ئەگەر لە ڕاستانی: سزای خوامان بۆ بێنە، ئەویش گوتی: پەروەردگارم! بەسەر کۆمەڵی خراپەکارو تێکدەراندا سەرم بخە، پشتم بگرە.**

**ئەمە زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەردەخات، کە ئەوەی لووط لە گەلەکەی خۆی بە ڕەخنەی دەگرێ، کۆمەڵێك شتەو هەر یەك شت نیە، ئەوە بە نسبەت لووطەوە، صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ.**

**ئنجا بەنسبەت لووط و پێغەمبەرانی دیکەشەوە، صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، کە بەرنامەیەکی پاکسازیی‌و چاکسازیی گشتگیری ژیانو گوزەرانیان پێبووە، با سەرنجی ئەو ئایەتانەی سووڕەتی (الشعراء)[1] بدەین کە خوا ﷻ لەسەر زاری هەر یەك لە: نووحو هوودو صالحو لووطو شوعەیب، بە یەك شێوە چەند تەعبیرێك دووبارە دەکاتەوە، دەفەرموێ :** ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾
إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ
إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ ﴾**، واتە: کاتێك لووطی برایان پێیگوتن: ئایا پارێز ناکەن، خۆتان ناپارێزن (لە سزای خوا). من بۆ ئێوە ڕەوانەکراوێکی ئەمینم (خیانەتتان لێ ناکەم، شتتان لێ ناشارمەوە)، پارێز لە خوا بکەنو فەرمانبەریی من بکەنو، من هیچ کرێو پاداشتیکتان لە بەرانبەر گەیاندنی ئەم پەیامەدا، لێ داوا ناکەم، کرێو پاداشتی من تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانییانە.**

---

١) بڕوانە ئایەتەکانی: ١٠٦، ١١٠، ١٢٤، ١٢٧، ١٤٢، ١٤٥، ١٦١، ١٦٤، ١٧٧، ١٨٠.

ئەم تەعبیرانە هەموویان وەك یەك، خوا لە پێغەمبەرانی گێڕاونەوە، لە سووڕەتی (الشعراء)دا.

## تەوەری چوارەم : گەلی لووط ﷺ چۆن فەوتێنران ؟!

خوای دادگەری بالآدەست لە هەموو ئەو سووڕەتانەدا کە باسی فەوتاندنی گەلی ڕەوشت نزمو بێ بەندو باری خراپەکاریی لووط ﷺ دەکات، بە یەك شێوەو چۆنیەتی سزادان و فەوتاندنەکەیان باس دەکات، بەڵێ، جاری وایە وشەیەك لەگەڵ وشەیەکی دیکەدا جیاوازە، بەڵام بە هەموویان یەك تابلۆو دیمەن پێکدێنن، کە بریتیە لەوەی خوا ئەو شارو شوێنانەی کە گەلی لووطیان تێدا بووە، (کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: تەنیا سەدوومو عامورە بوون، بەڵام وەك باسمان کرد، مێژوونووسان دەڵێن: پێنج شار بوون، ئێستا شوێنەوار ناسان شوێنەواری پێنج شاریان لەو شوێنەدا دۆزیوەتەوە، کە ئێستا دەریای مردووی لێیە، کە پێشتر ناومان هێنان)، خوا ﷻ بەوە سزای داون، کە ئەوانەی هەموویان هەڵگێڕاوەتەوەو، دواییش کبریت و ئاسنی بەسەردا باراندوون، ئەوە بە تەعبیری تەورات و، بە تەعبیری قورئان بەردێك کە قوڕ بووەو بۆتە بەرد، بەسەریدا باراندوون و، دەنگێکی زۆر گەورەی لێوە هاتوە، بوومەلەرزەیەکی زۆر گەورەو، ژێرەو ژووریش بوو ون، واتە: سەرێیان چۆتە خوارێ و، خوارێشیان چۆتە سەرێ و، ئەو شارانەی کە ئەوان تێیان دا نیشتەجێ بوون، هەڵیگێڕاونەوەو سەرەوبنی کردوون.

ئنجا با بەپێی ڕیزبەندیی موصحەف، سەرنجی سزادان و فەوتاندنەکەیان بدەین:

١) لە سووڕەتی (التوبة)دا دەفەرموێ : ﴿ أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ ... ﴿٧٠﴾ ﴾، واتە : ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆیانیان پێنەگەیشتوە، کە خوا چۆن سزای داون: گەلی نووح و عادو ثەموودو گەلی ئیبراهیم و، هاوەڵانی مەدیەن و، شارە هەڵگێڕراوەکان.

٢) لە سوورەتی (الأعراف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾، واتە: بارانێکی تایبەتمان بەسەردا باراندن، سەرەنج بدە! سەرەنجامی تاوانباران چۆن بوو.

لێرەدا خوای زاناو شارەزا تەنیا باسی ئەوە دەکات کە بارانێکی تایبەتی بەسەردا باراندوون، کە بریتی بووە لەو بەردانە کە قوڕی سوور کراوەو وشك کراوە بوون،و، نیشانەدار کراویش بوون، وەك دوایی باسی دەکەین.

٣) لە سوورەتی (هود)دا، دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: کاتێك فەرمانی ئێمە هات، سەرێیمان کردە خوارێ (واتە: سەرەو بنمان کرد) بەردێکی کە لە قوڕی بە بەرد کراو بووو، بەدوای یەکدا ڕیز کرابوون، وە نیشانەداریش کرا بوون، لەلایەن پەروەردگارتەوە: بەسەرماندا باراندن،و، ئەوە (ئەو سزایە) لە ستەمکارانیش دوور نیە.

واتە: هەر کەسێکی دی کە ستەم بکات، سزای خوای لێ نیزیکە.

٤) لە سوورەتی (الحجر)دا، دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: لە بەرەبەیاندا چریکەو دەنگێکی بێپەرزاو گەورە گرتنی، دەمەو خۆرهەڵات،و، سەرەوەیمان کردە خوارێ، (واتە: ژێرەو ژوورمان کرد، کە سەرێی ببێتە خوارێ، خوارێشی دێتە سەرێ)و، بەردێکمان بەسەردا باراندن، کە لە قوڕی بە بەرد کراو بوو، واتە: قوڕێك کە سوورەوە کراو بوو، ببووە بەرد.

٥) لە سوورەتی (الفرقان)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا بَلْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾،

واتە: بە لای ئەو ئاوەدانییەش دا تێپەڕی بوون، کە بارانێکی خراپی بەسەردا بارێنرا بوو (چ باران لەوە خراپتر دەبێ، کە ئاگرو بەردێك کە نیشانەدار کرابێ‌و، قوڕی سوورەوە کراوبێ، بەسەریاندا ببارێنرێ؟) ئایا نەیاندەبینی، بەڵکو بڕوایان بە زیندووبوونەوەو بلاو بوونەوە نیە، (بۆیە بەو شێوەیە هەڵوێست لە بەرانبەر تۆدا دەنوێنن).

٦) لە سوورەتی (الشعراء)دا، خوا باسی ئەوە دەکات کە لووط و خێزانەکەی دەرباز کردوون، دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ ﴾، واتە: دوایی ئەوانی دیکەمان وێران کرد، (ماڵەکانیانمان بەسەردا کاول کردن، یاخود خۆیانمان تێکهاڕی)و، بارانێکمان بەسەردا باراندن، خراپترین باران، بارانی ئەوانە بوو کە ترسێنرابوون‌و وریا کرابوونەوە، (بەڵام گوێیان بەو ترساندن‌و وریا کردنەوانە نەدابوو).

٧) لە سوورەتی (النمل)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَـٰهَا مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتە: خۆی‌و خێزانەکەیمان دەرباز کردن، جگە لە ژنەکەی ئەومان دانابوو لە تێچووان‌و، بارانێکمان بەسەردا باراندن، خراپترین باران، بارانی ئەوانە بوو کە ترسێنرابوون‌و وریا کرابوونەوە، (بەڵام گوێیان پێنەدابوو).

٨) لە سوورەتی (العنکبوت)دا، دەفەرموێ : ﴿ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَـٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: ئێمە دابەزێنەری سزاو پیسییەکین لە سەرێوە، بەسەر خەڵکی ئەم ئاوەدانییەدا، بەهۆی ئەو خراپەکاریی‌و لادانەوە، کە دەیکەن.

٩) لە سوورەتی (الصافات)دا، دەفەرموێ : ﴿ إِذْ نَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ ﴾، واتە: یاد بکەوە (لووط) خۆی‌و

تێکرای ماڵو خێزانەکەیمان دەرباز کرد، جگە لە پیرە ژنێک لەگەڵ فەوتاوانو بەجێماواندا بوو، دوایی ئەوانی دیکەمان هاڕی، وە وڵاتەکەمان بەسەر وێران کردن.

١٠) لە سوورەتی (الذاریات)دا، دەفەرموێ: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرۡسِلَ عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: (کە ئیبراهیم ﷺ لێیان دەپرسێ: ئەی ڕەوانەکراون! ئێوە ئیشتان چییەو بۆچی هاتوون؟) دەڵێن: ئێمە نێردراوین بۆ لای کۆمەڵێک کە زۆر تاوانبارن، تاکو بەردێکی لە قوڕ دروستکراویان بەسەردا ببارێنین، کە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ زیدەڕۆیی کاران نیشانەدار کراوە.

١١) لە سوورەتی (النجم)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ ﴾، واتە: (ئاوەدانیە) هەڵگێڕاوەکانیشی بەردایەوە، (ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئەو شارانەی ئەوان، پێشی بەرزکراونەوە، دوایی لەسەرڕا بەردراونەوە)، ئەوەیان بەسەرداهات کە بەسەریان داهات، (کە بەرد بارانو ئاگر باران کران، دوایی ئەو دەریایەش لە شوێنەکەیان دروست بوو، یانی: دەریاچەی مردوو).

١٢) لە سوورەتی (القمر)دا، دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطِۭ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٖۖ نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: گەلی لووط بڕوایان بە وریاکەرەوانو ترسێنەران نەکرد، (یاخود بڕوایان بە وریاکردنەوەکانو ترساندنەکانی خوا نەکرد)، ئێمەش بەدەم باوە بەردبارانمان کردن، جگە لە بنەماڵەی (لووط)کە پێش بەرەبەیان دەربازمان کردن.

پێشتریش لەوبارەوە ئەم دەقەمان لە تەوراتەوە هێنا:

(وَمَا إِنْ أَشْرَقَتِ الشَّمْسُ عَلَى الأَرْضِ حَتَّى كَانَ لُوطٌ قَدْ دَخَلَ إِلَى صُوغَرَ، فَأَمْطَرَ الرَّب عَلَى سَدُومَ وَعَمُورَةَ كِبْرِيتاً وَنَاراً، مِنْ عِنْدِهِ مِنَ السَّمَاءِ، وَقَلَبَ تِلكَ

المدُنَ وَالساكِنِينَ فِيها، وَالسَّهلَ المحِيطَ بِها، وَكُلَّ مَزْرُوعَاتِ الأَرْضِ، وَتَلَفَّتَتْ زَوْجَةُ لُوطٍ السائِرَةُ خَلْفَهُ وَرَاءَها، فَتَحولَتْ إِلَى عَمُودٍ مِنَ الملْحِ)[1].

واتە: پێش ئەوەی کە خۆر هەڵبێ لەسەر زەوی، لووط چوو بۆ شاری صووغەرو، پەروەردگار بەسەر هەردوو شاری سەدوومو عەمورەدا، کبریتو ئاگری باراند، لەلای خۆیەوە لە ئاسمانو، ئەو شارانەو ئەوەی کە تێیاندا نیشتەجێ بوو بوونو، ئەو دەشتو کێڵگانەی بەدەوریانەوە بوون، هەموویانی هەڵگێڕانەوەو، هاوسەرەکەی لووط کە لە پشتیەوە دەڕۆیی، ئاوڕی دایە دواوە، ئیدی بووە کۆڵەگەیەك لە خوێ.

لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: کاتێك ئاوڕی داوەتەوە ئاگرو بڵێسەیەکی بینیوە، یەکسەر ئەو ئاگرو بڵێسەیە بۆتە هۆی کوێر بوونو لەبەینچوونی، بۆیەش خوای دادگەر فەرموویەتی: با هیچ کامێك لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە، دیارە جۆرە بڵێسەو تیشکێکی هەبووە کە هەر کەسێك لێیداوە کوشتوویەتی.

شایانی باسە کە خوای زاناو شارەزا، چەند جارێك دووبارەی کردۆتەوە کە شوێنی گەلی لووط وەك نیشانەیەك بەجێهێشتوون، کە مەبەست پێی دەریای مردوو (بحر الميت)ە، کە خوا پشتیوان بێ لە داهاتوودا، ئاماژە بەو ئایەتانە دەکەینو، بیرو ڕای شوێنەوار ناسانیش لەوبارەوە ڕوون دەکەینەوە، کە چۆن پشت ڕاستی ئەوە دەکەنەوە کە لە قورئاندا هاتوە، هەرچەندە قورئان پێویستی بە غەیری خۆی نیە، پشت ڕاستی بکاتەوە، بەڵام بۆ زیاتر دڵنیاییو بەرچاو ڕوونیی.

ئێستاش با ئەو ئایەتانە بێنین کە خوای دادگەرو کارزان تێیاندا باسی ئەوەی کردوە، کە شوێنەوارو نیشانەیەکی لە ئاوەدانییە کاولکراوو هەڵگێڕراوەکانی گەلی لووط جێهێشتوە، تاکو بۆ خەڵك ببێتە جێی پەندو عیبرەت، بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف، واتە: سوورەتەکانی قورئان کە لە موصحەفدا ڕیز کراون، دەیانهێنم:

**شوێنی یەکەم:** لە سوورەتی (الحجر)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾﴾، (دوای ئەوەی کە باسی فەوتاندنی گەلی لووطو، ژێرەو ژوور کردنی شارەکانیان دەکات)، دەفەرموێ: شارەکانی ئەوانو ئەو

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح : ١٩، ص ٥٢ .

سەرزەمینەی ئەوانی تێدا بوون، لەسەر ڕێیەکە، کە ڕێیەکی بەردەوامە، (واتە: شەقامە ڕێیەکە، هەمیشە خەڵك بەویدا دەڕوا)، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانە هەیە بۆ بڕواداران.

بۆچی دەفەرموێ: بۆ بڕواداران؟ چونکە هەر بڕواداران سوود دەبینن، لە دیاردەو دیمەنە سرووشتییەکان، کە نیشانەی خوانو، لە شوێنەواری پێشووانیش، کە ئەوانیش شوێن دەستی خوای پەروەردگاریان پێوە دیارە، کە چۆن سزای داون، بەڵام ئەوەی ئیمانی نەبێ، ئەو شتانە دەبینێ، بەڵام وەك نیشانەی خوا تەماشایان ناکاتو، پەیوەستیان ناکاتەوە بە خوای پەروەردگارەوە، بۆیە پەندو عیبرەتیان لێ وەرناگرێ، خەڵکی دیکەش کە بە وێدا چوون، بەڵکو هەبووە هاوچەرخ بووە لەگەڵ واندا، گوتوویەتی: کاتی خۆی پێنج شەش شار لێرە بوون، هەموویان ژێرەو ژوور کران، بەرزکرانەوەو بە زەویدا درانەوەو شوێنەکەشیان بوو بە دەریا، دیارە بەڵایەکیان بەسەرهاتووە! ئیدی وایانزانیوە ئەوە ئاگرپژێن (برکان)ێك بووە، یاخود شوێنەکەیان ڕۆچووەو بۆتە دەریا، بەڵام نەیانبەستۆتەوە بە خوای کارزانەوە، بۆیە خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾، لەوەدا نیشانە هەیە بۆ بڕواداران.

**شوێنی دووەم** : لە سوورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ ۚ أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا ۚ بَلْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی بە لای ئەو شارەدا ڕەتبوون، (و بەلایدا دێنو دەچن) کە بارانێکی خراپی بەسەردا بارێنرا، ئایا نەیاندەبینی؟ بەڵکو بە ئومێدی زیندووکرانەوەو بڵاوکرانەوە نەبوون، وایانزانی کە گۆڕ دەیانپێچێتەوەو، جارێکی دیکە بڵاوناکرێنەوە.

بۆیە پەند وەرناگرن، لەو هەموو کارەساتو لەو هەموو بەڵاو گرفتارییانەی کە خوای دادگەر بەسەر گەلە پێشووە لادەرەکانیدا هێناون.

**شوێنی سێیەم:** لە سوورەتی (العنكبوت)یشدا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٣٥ ﴾، واتە: لەو شوێنە، لەو ئاوەدانییانە، نیشانەیەکی ڕوونمان بەجێهێشتوە بۆ کۆمەڵێك کە بفامن.

بفامن کە ئەوە بە هۆی لادانیانەوە، لە فیطرەتی ساغ کە خوا لە سەری خوڵقاندوونو، لە شەریعەتی پاكو ڕاستیی خوا، کە بە (لووط)دا بۆی ناردوون، بۆیە ئاوایان بەسەر هاتوە.

**شوێنی چوارەم:** لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ : ﴿ وَإِنَّكُمۡ لَتَمُرُّونَ عَلَيۡهِم مُّصۡبِحِينَ ١٣٧ وَبِٱلَّيۡلِۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ١٣٨ ﴾،واتە: ئێوە بەیانیان بەلایاندا ڕەتدەبنو، بە شەویش، بە شەوگاریش جاری وایە بەلایاندا ڕەتدەبن، ئایا نافامن؟! چونکە دیارە شوێنەکەیان سەرە ڕێ بووە، ناوچەی شام، لە زۆر جێیان زیاتر شوێنی تێدا ژیانی بەشەر بووەو، ناوچەی فەلەستینیش ئەگەر خەڵك چووبن بۆ میسرو لە نێوان میسرو شامدا هامووشۆیان کردبێو، لە نێوان میسرو میزۆپۆتامیادا، (وڵاتی نێوان دوو ڕووبارەکان، دیجلە و فوراتدا)، هامووشۆیان کردبێ، یاخود لە نێوان شامو حیجازدا هامووشۆیان کردبێ، هەر بەوێدا ڕەت بوون، واتە: سەرە ڕێ بووە، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئایا نافامن! هەموو جارێ بەلایاندا ڕەت دەبن، بۆچی پەندیان لێ وەرناگرن؟

**شوێنی پێنجەمو کۆتایی:** هەروەها لە سوورەتی (الذاريات)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةٗ لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٣٧ ﴾، واتە: لەوێدا نیشانەیەکمان بەجێهێشت، بۆ کەسانێك کە لە سزاو ئازاری بە ئێش دەترسێن.

یانی: ئازاری بە ئێشی خوا ﷻ، هەم لە دنیاداو، هەم لە ڕۆژی دواییدا.

ئنجا ئەوە کە خوا ﷻ فەرموویەتی: هەرچەندە کاتی خۆی ئەو دەریای مردوو (بحر الميت)ە، هەر هەبووە، وەك نیشانەیەك، دوای ئەوەی خوای زاڵ گەلی (لووط)ی فەوتاندوە، شوێنەکەیان بۆتە ئەو دەریاچەیە، بۆیەش ناوی (بحر الميت) (دەریای

مردوو)ی لێنراوە، چونکە هیچ زیندەوەرێکی تێدا نیە، وە من بۆخۆم چوومە نێو ئەو دەریایەو، هیچ شتێکی تێدا نقووم نابێ، چونکە ڕێژەی خوێ تێیدا زۆر زۆرە، کە ئێستا ڕێژەکەیم لە یاد نیە، لە سەدا (٪)چەندە؟! بەڵام کە مستی لێ دادەگری ئاوەکەی، لە ئاوی دیکە، زۆر قورسترەو، زۆر خەستە، وەك خوێاوکەو بە کوردیی: خوێاوکێکی ڕووتە، بۆیە هیچ زیندەوەرێك تێیدا ناژێ، نەك زیندەوەری ژیاندار، بەڵکو زیندەوەری ڕووەکییش تێیدا ناژێ.

ئنجا ئەوەش کە خوا فەرموویەتی: ﷺ، ئێستا زانایانی شوێنەوارناسیش، هەر هەمان ڕاستییان بۆ دەرکەوتوە، هەڵبەتە ئەو زانیارییانە لە کتێبی: (سیرة النبیین والمرسلین)ەوە[1]، دێنم، کە وێنەی دەریای مردووی هێناوەو، وێنەی ئەو غەوواصەیەی کە بە فڕۆکە هێناویانە لە ئەمریکاوەو، دەڵێ: لە ساڵی (١٩٩٩)دا، لیژنەیەکی زانستیی بە مۆڵەتی هەر سێ وڵاتی: (ئوردنو فەلەستینو ئیسرائیل)، غەوواصەیەك کە جێی سێ کەسی تێدا دەبوو، خستیانە نێو (بحر المیت)ەوە، ئەم شتانەیان بینی :

یەکەم: بینییان لە نێو ئەو دەریایەدا، (واتە: لە بنەوەیدا) شاری گەورە گەورەی هەڵگێڕدراوە (مقلوب) لە تەختی دەریایەکەدا هەن، سەقفی خانووەکانیان لە خوارێیەو، بناغەکەیان هاتۆتە سەرێو هەڵگێڕدراونەوە.

دووەم: زیاتر لە (ملیۆنو نیوێك) گۆڕ (قبر)یان تێدا بینیوە، کە دیارە هی ئەو شارانە بوونو، کاتی خۆی خەڵکێکی زۆریان تێدا هەبووە، هەڵبەتە بەس خوا دەزانێ چەند سەدە ژیاون، ئنجا هەموو گۆڕەکانیشیان، بە شێوەیەکی تایبەتو بە پێی موعتەقەداتی خۆیان، دروست کردوون، بۆیەش گۆڕەکانیان هەرماون.

سێیەم: ملیۆنان بەردی گۆگرد (کبریت)ی خڕی لە قەبارەی نینۆکی پەنجەی گەورە، هەتا قەبارەی هێلکە، ملیۆنان بەردی ئاوایان بینی، کە لە ماددەی گۆگرد (کبریت)نو، حاڵەتی سووتانیان بەسەردا هاتوە، واتە: ئەو بەردانە سووتێندراون سوورکراونەتەوە بە پلەی گەرمی پێنج هەزار (٥٠٠٠) پلەی سەنتی گراد! پێنج هەزار پلە، زۆر زۆر گەرمە، وەك خوای پەنهانزان دەفەرموێ :

---

١) ج ١، ص ٢٩٤ ـ ٣٠٩.

﴿حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ۝٨٢﴾هەود، بەردێك كە لە قوڕی وشك كراوە، دروست بووە!

چوارەم: ئێسقانی سووتاوی مرۆڤ، كە تەنانەت كرۆك (نخاع)ی نێو ئێسقانەكەشی، سووتاوە، واتە: ئێسقانی مرۆڤ كە سووتاوە، نەك هەر ئێسقانەكە سووتاوە بەڵكو كرۆكی نێو ئێسقانەكەش سووتاوە! ئەوانەیان تێدا بینی.

ئنجا كە خوا دەشفەرموێ: ﴿حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ﴾، هەندێك لە زانایان لەبەر ئەوەی شارەزای زمانی فارسیی نەبوون، كە دیارە قورئانیش: وشەی ڕۆمیی تێدا هەیە، وشەی فارسیی تێدا هەیە، وشەی هەندێك لە زمانەكانی تێدا هەن، بۆ وێنە: ( سُندُسٍ )، ( وَإِسْتَبْرَقٍ )، (سِجِّيلٍ )، (وَزَرَابِيُّ)، كە ئەوانە هیچیان وشەی عەرەبیی نین لە ئەسڵدا، ئنجا ئەوان بۆ ڕیشەكەی لە زمانی عەرەبییدا، گەڕاونو، چونكە لە ئەسڵدا عەرەبیی نەبووە، نەیانپێكاوە، بەڵام ئەوانەی كە شارەزای زمانی فارسیی بوون، وەك (طبري و فخرالدين الرازي)و ئەوانی دیكەش، كە من سەرنجی تەفسیرەكانیانم داوە، ـ وەك پێشتریش باسم كرد ـ دەڵێن: (سِجِّيلٍ ) (سنگ گل)ەو، (سنط)بە فارسیی، واتە: (بەرد)و (گل)، واتە: (قوڕ ، طين)، (سنگ گل)، یانی: (الحجر الطيني)، بەردی قوڕیین، ئنجا لەبەر ئەوەی: پیتی (گ)و پیتی (ڵ) لە زمانی عەرەبییدا نین، بۆیە (سەنگ گڵ)ەكەیان كردوە بە (سنج جل)، دوایش تێكیاندا دەغم كردوەو كردوویانە بە ( سِجِّيلٍ )، واتە: بەردێك كە لە ڕیشەدا قوڕ بووەو دوایی بۆتە بەرد.

## تەوەری پێنجەمو کۆتایی: سزای کردەوە خراپەکەی گەلی (لووط) لە ئیسلامدا:

واتە: سزای نێربازیی: ئەوە کە پیاو لەگەڵ پیاودا جووتبێ و غەریزەی جینسیی خۆی تێر بکات، ئەو باسە لەژێر ناوونیشانێکی سەربەخۆدا دێنین:

# سزای نێربازی لە ئیسلام دا

سەرەتا دەڵێین: زانایانی ئیسلام لەبەر نەبوونی دەقێکی ڕوون و بێ چەندو چوون، لەبارەی چۆنیەتی سزادانی ئەنجامدەرانی نێربازییەوە کەوتوونەتە ڕاجیایی، وەك (الشنقيطي) لەوبارەوە لە کتێبەکەی خۆی دا[1]، دەڵێ: (اخْتَلَفَ الْعُلَماءُ فِي عُقُوبَةِ مَنِ ارْتَكَبَ فَاحِشَةَ قَوْمِ لُوطٍ)، زانایان ڕاجیاییان هەیە دەربارەی سزای کەسێك کە گوناهی گەلی لووط ئەنجام دەدات، واتە: نێربازیی.

ئنجا دوای ئەوە (الشنقيطي) قسەو ڕای زانایان لەوبارەوە، لە سێ ڕاو بۆچووندا کورت دەکاتەوە، منیش دەقی قسەکانی ئەو دێنم، لەگەڵ تۆزێك لە کورتکردنەوەی ئەوەی کە بە پێویستم نەزانیبێ، بیهێنم:

ڕای یەکەم : (قَالَ بَعْضُ الْعُلَماءِ: أَنْ يُقْتَلَ الْفَاعِلُ وَالمفْعُولُ بِهِ مُطْلَقاً، سواءٌ كانا مُحْصَنَيْنِ أَوْ بِكرين، أَوْ أَحَدُهُما مُحْصَنا وَالآخَرُ بِكراً، وَمِمَّنْ قَالَ بِهَذا الْقَوْلِ: مالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَأَصْحَابُهُ، وَهو أَحَدُ قَوْلَي الشافِعِيِّ، وَإِحْدَى الرِّوَايَتَيْنِ عَنْ أَحْمَدَ ... فقَالَ بَعْضُهُمْ: يُقْتَلُ بالسَّيْفِ.

وَقَالَ بَعْضُهُمْ: يُرْجَمُ بِالْحِجَارَةِ.

---

١) أضواء البيان في إيضاح القُرآنِ بالقرآن، ج ٢، ص ١٩٣، لمحمد الأمين بن محمد المختار بن عبدالقادر الجكني الشنقيطي.

وَقَالَ بَعْضُهُمْ: يُحْرَقُ بِالنَّارِ.

وَقَالَ بَعْضُهُمْ: يُرْفَعُ عَلَى أَعْلَى بِنَاءٍ فِي الْبَلَدِ فَيُرْمَى مِنْهُ مُنَكَّسًا وَيُتْبَعُ بِالْحِجَارَةِ.

{وَحُجَّةُ مَنْ قَالَ بِقَتْلِ الْفَاعِلِ وَالمفْعُولِ بِهِ فِي اللّوَاطِ مُطْلَقًا: مَا أَخْرَجَهُ الإِمَامُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَالْحَاكِمُ، وَالْبَيْهَقِيُّ، عَنْ عِكرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلم، قَالَ : (مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالمفْعُولَ بِهِ)، قَالَ ابْنُ حَجَرٍ : وَرِجَالُهُ مُوَثَّقُونَ، إِلاَّ أَنَّ فِيهِ اخْتِلافاً} .

واتە: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: حوكم لەوبارەوە، (واتە: لەبارەی نێربازییەوە) ئەوەیە، كە بكەرو پێكراو، (ئەوەی كارەكەی كردوەو ئەوەی كە لەگەڵیدا كراوە)، بە ڕەهایی هەردووكیان بكوژرێن، چ هاوسەردار بن، چ بێ هاوسەر، یاخود یەكێكیان هاوسەردار بێو، ئەوەی دیكەیان بێ هاوسەربێ، مالیكی كوڕی ئەنەسو هاوەڵەكانی ئەم ڕایەیان هەیەو، ئەوە یەكێكە لە دوو قسەكانی شافیعیو، یەكێكە لە دوو ڕیوایەتەكانی كە لە ئەحمەد گێڕراونەوە، دەربارەی چۆنیەتی كوشتنەكەش:

هەندێكیان گوتوویانە: بە شمشێر دەكوژرێ .

هەندێكیان گوتوویانە: بەرد باران دەكرێ .

هەندێكیان گوتوویانە: بە ئاگر دەسووتێنرێ.

هەندێكیان گوتوویانە: بەرز دەكرێتەوە بۆ بەرزترین خانوو، كە لەو شوێنە هەیەو، لەوێوە سەرەوبن بەردەدرێتەوەو، بەردیشی بە دوادا فڕێ دەدرێن.

بەڵگەی ئەوانە كە گوتوویانە: دەبێ بكەرو پێكراو، لە نێربازییدا، هەرچۆن بێ هەردووكیان بكوژرێن، ئەم دەقەیە كە دیارە بە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دانراوە، كە دەڵێ: {مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالمفْعُولَ بِهِ} .

واتە: هەر کەسێکتان بینی کردەوەی گەلی (لوط)ی ئەنجامدەدا، ئەوە بکەرو پێکراو بکوژن، (إبن حجر) گوتوویەتی: پیاوەکانی کە ئەم دەقەیان گێڕاوەتەوە، جێی متمانەن، بەڵام جیاوازیی تێدایەو ڕاجیایی لەبارەوە هەیە.

دەڵێم : (إبن حجر العسقلاني) کە پسپۆڕە لە بواری فەرموودەناسیی دا، ناوای گوتوە، واتە: ئەم دەقە بەو جۆرە نیە پشتی پێ بەستریٚ، هەڵبەتە ئەگەر پشتی پێ ببەسترابایە، هەموو زانایان لەسەری کۆك دەبوونو، دەیانگوت: ئەوە سزاکەیەتی .

ڕای دووەم: {الْقَوْلُ الـثَّانِي: هو أَنَّ اللّوَاطَ زِنًى، فَيُجْلَدُ مُرْتَكِبُهُ مائَـةً، إِنْ كـانَ بِكـراً وَيُغَـرَّبُ سَـنَةً، وَيُرْجَـمُ إِنْ كـانَ مُحْصَنـا، وَهَـذَا الْقَوْلُ هـو أَحَدُ قَوْلَيِ الشافِعِيِّ، وَاحْـتَجَّ أَهْـلُ هَـذَا الْقَوْلِ بِمـا رَوَاهُ الْـبَيْهَـقِيُّ، عَنْ أَبِي مُوسَى، قَالَ: قَالَ رَسـولُ اللهِ ﷺ: (إِذَا أَتَى الـرَّجُلُ الرَّجُلَ، فَهُما زَانِـيَانِ، وَإِذَا أَتَتِ الـمرْأَةُ الـمرْأَةَ، فَهُمـا زَانِيَتـانِ) وَقَالَ الشوكـانِيُّ رَحِمَـهُ اللهُ: فِي (نَيْلِ الأَوْطـارِ) فِـي هَـذَا الْحَدِيثِ : وَفِـي إِسْنـادِهِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْـدِ الرَّحْمَنِ، كَـذَّبَهُ أَبُو حَاتِمٍ. وَقَالَ الْبَيْهَـقِيُّ: لا أَعْـرِفُهُ، وَالْحَدِيثُ مُنْكَر بِهَذَا الإِسْنـادِ}.

واتە: ڕای دووەم ئەوەیە، کە نێربازیی بە زینا دادەنریٚ، بۆیە ئەو کەسەی کە دەیکات، ئەگەر بیٚ هاوسەر بیٚ، (هاوسەرگیریی نەکردبیٚ)، سەد قامچی لێدەدریٚو، ساڵێکیش دوور دەخرێتەوەو، ئەگەر هاوسەرداربیٚ، (دیارە چ بکەرو، چ پێکراو)، ئەوە بەرد باران دەکریٚ، ئەم قسەیەش یەکێکە لە دوو قسەکانی (شافیعی).

خاوەنانی ئەم قسەیە ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە کە (البيهقي) هێناویەتی لە (أبو موسى الأشعري)ەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێك پیاو چووە لای پیاو، ئەوە هەردووکیان بە زیناکەر دادەنرێنو، ئەگەر ئافرەت چووە لای ئافرەت، هەردووکیان بە زیناکەر دادەنرێن، بەڵام (الشوكاني) لە (نيل الأوطار)دا، لەبارەی ئەم دەقەوە گوتوویەتی: لە زنجیرەی گێڕانەوەکەی دا (محمد بن عبد الرحمن) هەیە کە (أبو حاتم) بە درۆزنی داناوەو، (البيهقي)یش کە

خۆی ئەم دەقەی هێناوە، گوتوویەتی: من ئەو کابرایە ناناسمو، گوتوویشیەتی: ئەم دەقە بەم زنجیرەیە، (بەم سەنەدە)، بە نەناسراوو نەزانراو، لە قەڵەم دەدرێ، (واتە: جێی پشت پێ بەستن نیە).

ڕای سێیەم: (الْقَوْلُ الثَّالِثُ: أَنَّ اللائِطَ لا يُقْتَلُ وَلا يَحُدُّ حَدَّ الزِّنَى، وَإِنَّمَا يُعَزَّرُ بِالضَّرْبِ وَالسِّجْنِ وَنَحوِ ذَلِكَ، وَهَذَا قَوْلُ أَبِي حَنِيفَةَ، وَاحْتَجَّ أَهْلُ هَذَا الْقَوْلِ:

١/ بِأَنَّ الصَّحَابَةَ اخْتَلَفُوا فِيهِ، وَاخْتِلافُهُمْ فِيهِ، يَدلُّ عَلَى أَنَّهُ لَيْسَ فِيهِ نَصٌّ صَحِيحٌ، وَأَنَّهُ مِنْ مَسَائِلِ الإجْتِهَادِ.

٢/ وَالْحُدُودُ تُدْرَأُ بِالشُّبُهَاتِ.

٣/ قَالُوا: وَلا يَتَنَاوَلُهُ اسْمُ الزِّنَى، لأَنَّ لِكُلٍّ مِنْهُمَا اسْمَاً خَاصَّاً بِهِ.

٤/ قَالُوا: وَلا يَصِحُّ إِلْحَاقُهُ بِالزِّنَى لِوُجودِ الْفَارِقِ بَيْنَهُمَا، لأَنَّ الدَّاعِيَ فِي الزِّنَى مِنَ الْجَانِبَيْنِ، بِخِلافِ اللِّوَاطِ، وَلِأَنَّ الزِّنَى يُفْضِي إِلَى الإشْتِبَاهِ فِي النَّسَبِ وَإِفْسَادِ الْفِرَاشِ، بِخِلافِ اللِّوَاطِ.

٥/ وَاسْتَدَلَّ أَهْلُ هَذَا الْقَوْلِ أَيْضاً بِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا ۖ فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ ﴾النساء، قَالُوا: الْمُرَادُ بِذَلِكَ: اللِّوَاطُ، وَالْمرَادُ بِالإِيذَاءِ: السَّبُّ أَوِ الضَّرْبُ بِالنِّعَالِ، وَقَدْ أَخْرَجَ عَبْدُ بْنُ حُمَيد، وَابْنُ جَرِيرِ، وَابْنُ الْمنْذِرِ، وَابْنُ أَبِي حَاتِمِ عَنْ مُجَاهِدِ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ ﴿١٦﴾ ﴾النساء، قَالَ: الرَّجُلانِ الْفَاعِلانِ. وَأَخْرَجَ آدَمُ، وَالْبَيْهَقِيُّ فِي سُنَنِهِ، عَنْ مُجَاهِدِ فِي قَوْلِهِ: فَآذُوهُمَا، يَعْنِي : سَبَّاً، قَالَهُ صَاحِبُ (الدُّرِّ الْمنْثُورِ)}.

واتە: ڕای سێیەم ئەوەیە، کە ئەو کەسەی نێربازیی دەکات، نە دەکوژرێو، نە سزای زیناشی بەسەردا دەچەسپێنرێ، (کە سەد قامچییە، یاخود بەرد باران کردنە، وەك زانایان گوتوویانە: ئەگەر بێ هاوسەر بێو، هاوسەرگیریی نەکردبێ، سەد قامچییەو، ئەگەر هاوسەرگیریی کردبێ، بەرد بارانکردنە،

سزاکەی ئەوە نیە)[1]، بەڵکو تەمبێ دەکرێ، بە لێدانو بە سجن کردنو، بە شێوەی ئەوانە، ئەمەش قسەی (أبو حنیفة)یە.

خاوەنانی ئەم قسەیەش، چەند شتێکیان بە بەڵگە هێناونەوە، (کە ئەو بە ژمارە نەینووسیون، بەڵام دەبنەوە بە پێنج بەڵگە):

١) دەڵێن: هاوەڵان ڕاجیاییان هەبووە دەربارەی سزای نێربازیی، ڕاجیاییەکەشیان بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەقێکی ڕاستو دروستی لەبارەوە نەهاتوەو، لەو بابەتانەیە کە جێی کۆششە، (جێی ئەوەیە کە زانایان بیری تێدا بکەنەوە)، ئەگەر دەقێکی لەسەر بووایە، (دەقێکی ڕاستی مشتومڕ هەڵنەگر)، ئەو کاتە هەموو لەسەری کۆك دەبوون.

٢/ (وَالْحُدُودُ تُدْرَأُ بِالشُّبُهَاتِ): سزا شەرعییەکان بە شوبهەکان لا دەدرێن، ئنجا ئەم پرسە مادام دەقێکی لەسەر نەبێ، واتە: شوبهەیە، جێی گومانە، سزاکانیش بە شوبهەکان لادەدرێن ﴿حەدیسی پێغەمبەرە ﷺ {ادْرَءُوا الْحُدُودَ عَنِ الْمُسْلِمِينَ مَا اسْتَطَعْتُمْ} {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ، برقم : (٨٢٤٣) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ}، واتە: بە پێی توانا هەر سزایەك کە شوبهەیەکی تێدابوو، لە مسوڵمانانی {لابدەن، هەر گوناهێك تۆمەتو گومانێکی تێدا هەبوو، سزایەکە لابدەن، واتە: سزایەکە جێبەجێ مەکەن﴾.

٣/ گوتوویانە: ناوی زیناش نایگرێتەوە، چونکە هەرکام لە نێربازیی و زینا، ناوی تایبەتیی خۆی هەیە.

٤/ گوتوویانە: دروستیش نیە کە بە زیناوە پەیوەست بکرێ، چونکە جیاوازییان لە بەیندا هەیە: هەرچی زینایە لە هەردووك لایانەوە هاندەر هەیە، پاڵنەر هەیە، (هەم لەلایەن ئافرەتەکەوە، هەم لەلایەن پیاوەکەوە)، بە پێچەوانەی نێربازیی (لواطة)وە، (کە تەنیا لەلایەن بکەر (فاعل)ەوە، پاڵنەر هەیە)، هەروەها لەبەر ئەوەی زینا دەبێتە هۆی ئەوە کە نەسەبو ڕەچەڵەك تێکچێ، (نەزانن

---

١) نێوان کەوانەکان لێرەو لە شوێنەکانی دیکەش زیادەی خۆمە، بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.

ئەو منداڵە، ئەگەر ئافرەتێك چەند پیاوێك لەگەڵی جووتبن، داخۆ هی کامیانە؟)، بەڵام (لواطة)ە وانیە، چونکە (نەسەبو وەچە پەیدا نابێ لەو ڕێیەوە).

٥/ قسەی خوای بەرزیشیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ١٦ ﴾النساء، واتە: ئەو دووانەتان، (ئەو دوو پیاوە)، کە دەیکەن، ئازاریان بدەن، ئنجا ئەگەر گەڕانەوەو چاکبوون، (چاکسازییان کرد) وازیان لێبێنن، بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگری میهرەبانە، گوتوویانە: مەبەست لێرەدا نێربازییەو، مەبەستیش لە ئازاردان، بریتیە لە قسەو جنێو پێگوتنو، لێدان بە نەعلان.

ئنجا دەڵێ : (عَبْدُ بْنُ حُمَيد، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ المنْذِرِ، وَابْنُ أَبي حَاتِمٍ) هەموویان لە (مجاهد)ەوە، {کە(مجاهد)یش قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بووە خوا لێیان ڕازی بێ} ، گێڕاویانەتەوە، لەبارەی ئەوەوە کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ ١٦ ﴾، ئەو دوو پیاوەتان کە ئەنجامی دەدەن، (فاحیشەو کاری خراپ ئەنجام دەدەن)، (قَالَ: الرِّجلانِ فَاعِلاَن)، گوتی: ئەو دوو پیاوەی کە نێربازی ئەنجام دەدەن، ئادەمو بەیهەقیی لە (سنن)ەکەی خۆیدا لە (موجاهد)ەوە هێناویانە، دەربارەی قسەی خوا کە دەفەرموێ : (فَـَٔاذُوهُمَا)، گوتوویەتی: یانی: (سَبّاً)، واتە: جنێویان پێ بڵێن، ئەمە خاوەنی: (الدّرّ المأثور)، کە (السیوطي)ە، هێناویەتی.

منیش لە کۆتاییدا دەڵێم :

ئەو ڕایەی سێیەمم پێ ڕاستەو، لە تەفسیری سوورەتی (النساء)یشدا، لە ئایەتی (١٦)دا، بە درێژی لەوبارەوە قسەم کردوە، (واتە: لە بەرگی سێیەمی ئەم تەفسیرەدا)و، لە ڕاستییدا هەر هەبوونی ڕاجیایی لە نێوان زانایاندا، بەڵگەیە لەسەر نەبوونی

سزایەکی شەرعیی دیارییکراو، هەروەك چۆن لەبارەی هەڵگەڕاوە (المرتد)یشەوە، بە هەمان شێوە، لە مەوسووعەی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)داو، لە مەوسووعەی: (ئیسلامو دەوڵەتداریی)دا، کە دوایی کراوە بە نامیلکەیەکیش، بە ناوونیشانی: (حوکمی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام)، مادام هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) ڕاجیایی هەبووە، دوایی تابیعین، دوایی پێشەواو زانایانی سەر مەزهەب، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەقێکی مشتومڕ لابەر، یان مشتومڕ هەڵنەگر، لەوبارەوە نیە، بەڵکو لە بواری دەسەڵاتی شەرعیی دایە، کە بە پێی ئەوەی بۆ خۆی بە چاکی دەزانێ، سزایەك دیاریی بکات، ئەو جۆرە سزایەش کە سزایەکی دیارییکراویی شەرعیی نیە، پێی دەگوترێ: (تعزیر)، (تعزیر)، واتە: تەمبێ کردنو گێڕانەوە لەو خراپەیە، چۆن دەگێڕدرێتەوە لەو خراپەیە، بەو شێوەیە دیاریی بکرێ.

بەڵێ مادام دەقێکی شەرعیی مشتومڕ هەڵنەگرو، ڕوونو بێ چەندو چوون نەبێ، دەچینەوە بۆ کۆششو ئیجتیهادو بیرو ڕای زانایان.

ئەوەش کە هەندێك لە زانایان ئەومیان بە بەڵگە هێناوەتەوە: مادام خوا گەلی (لوط)ی، بەم جۆرە لەبەین بردوە، ژێرەو ژووری کردوونو، بەرد بارانی کردوون، بۆیە دەبێ سزای ئەوانەش کە نێربازیی ئەنجام دەدەن، هەر ئەو سزایە بێ؟!

ئێمە دەڵێین: بە ڕاستیی ئەم بەڵگە هێنانەوەیە، ڕاست نیەو لە جێی خۆیدا نیە، هەروەك (الشنقيطي)یش ئاماژەی پێداوە، بۆچی؟ چونکە خوا ﷻ تەنیا لەسەر ئەو ڕەوشت نزمییەو لەسەر ئەو کردەوە خراپە، گەلی (لوط)ی سزا نەداوە، بەڵکو لەسەر کوفرو، لەسەر بە درۆ زانینی پێغەمبەرەکەیان ﷺو، لەسەر ڕێگرییو، لەسەر ئەو هەموو کردەوە خراپانەی کە ئەنجامیانداون، کە پێشتر باسمان کردن، بەتایبەت لە سوورەتی (العنكبوت)دا، کە ڕێگرییان کردوەو، لە نێو یانە (نادي)یەکەی خۆیاندا خراپەکارییان کردوە، ئنجا وێڕای نێربازیی، بڕوایان بە پێغەمبەرەکەی خۆیان نەکردوەو گاڵتەیان پێکردوەو، بڕوایان بە ئایینو پەیامو بەرنامەی خوا نەکردوەو، ئەهلی کوفر بوون، کە ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین، زۆر بە ڕوونیی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کە لە ڕاستییدا گوناهی گەلی (لوط)،

تەنها نێربازیی نەبووە، تاکو بڵێین: ئەو جۆرە سزایەی کە دراون، هەر لەسەر ئەوە بووە، بۆیە ئەوەش دەبێ ببێتە سزا! ئنجا ئەگەر واشبووایە، زانایان هەموویان لەسەری یەك دەنگ دەبوون، بەڵکو ئەو سزادانەیان لەسەر کوفرو، لەسەر بە درۆ زانینی پێغەمبەرەکەیانو، لەسەر ڕێگریو، لەسەر کۆمەڵێك گوناهو تاوان بووە، لە نێویاندا: ئەو ڕەوشت نزمییە، کە نێربازییە.

ئنجا با بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف پێدا بێینو لە سووڕەتی (الأعراف)ەوە دەست پێ بکەین، داخۆ خوای دادگەرو کارزان، چۆن باسی تاوانەکانی گەلی لووط دەکات ؟!:

١- لە سووڕەتی (الأعراف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾﴾، واتە: بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی زیدەڕۆیی کارن، (تێپەڕێنەرنو لە هەموو شتێکدا تێتان پەڕاندوە).

٢- هەر لە سووڕەتی (الأعراف)دا، لە ئایەتی (٨٤)دا، دەفەرموێ : ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾﴾، واتە: ئنجا سەرنج بدە! سەرەنجامی تاوانباران، چۆن بوو! (تاوانباران)، یانی: هەر گوناهێكو دوو گوناهیان نەبوون، خوای دادگەریش بە (تاوانباران) ناوزەندیان دەکات.

٣- لە سووڕەتی (الأنبیاء)، لە ئایەتی (٧٤)دا، دەفەرموێ : ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾﴾، واتە: ئەوانە کۆمەڵێکی زۆر خراپی لاڕێو لادەر بوون.

٤- لە سووڕەتی (الشعراء) ئایەتی (١٧٣)دا، دەفەرموێ : ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾﴾، واتە: خراپترین باران، بارانی ترسێنراوانو ئاگادار کراوان بوو. واتە: ئاگادار کراونەتەوەو ترسێنراون، بەڵام هەر گوێشیان پێنەداوە.

٥- لە سوورەتی (العنكبوت)، ئایەتی (٣٤)دا، دەفەرموێ : ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾﴾، واتە: بەهۆی ئەوەوە كە لاڕێ دەبوون، (لە ڕێ دەردەچوون).

٦- هەر لە سوورەتی (العنكبوت)، ئایەتی (٣٠)دا، دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾﴾، واتە: (لووط)، گوتی: پەروەردگارم! سەرم بخە بەسەر كۆمەڵی تێكدەراندا، (ئەوانەش تێكدەر بوونو خراپەكار بوون، بە مانای وشە).

٧- لە سوورەتی (القمر)، ئایەتی (٣٣)دا، دەفەرموێ : ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍۭ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾﴾ واتە: گەلی (لوط)، بێبڕوا بوون بە ترساندنەكان، یاخود بێبڕوا بوون بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام).

كەواتە: ئەوانە ئەهلی كوفر بوون، بێبڕوا بوون، ئەهلی تاوان بوون، ئەهلی فیسق بوون، خراپەكار بوون، لەسەر كۆی ئەوانە، خوای دادگەر بەو شێوەیە سزای داون.

بۆیە ئەو جۆرە سزادرانەی گەلی لووط ﷺ، ناگونجێ بكرێتە بەڵگە لەسەر چۆنیەتی سزای نێربازیی، هەرچەندە ڕەوشتێكی زۆر نزمە، زۆر خراپە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوە لە سنووری صەلاحیەتی دەستەڵاتی شەرعیی دایە، كە چۆن ئەوانە دەپرینگێنەوە: سزا بدرێن، وەك ئایەتەكەی سوورەتی (النساء)یش دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا ﴿١٦﴾﴾، كە من لە تەفسیری سوورەتی (النساء)، (لە بەرگی سێیەمی ئەم تەفسیرەدا)، زۆر بە ڕوونییو بە درێژیی قسەم لەبارەوە كردوە، كە ئایەتەكەی پێشووی دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّـٰتِى يَأْتِينَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴿١٥﴾﴾، ئەم ئایەتە،

{ئایەتی ژمارە (١٥)} دەربارەی (مساحقة)یە، یانی: (سُحاق)ە، ئافرەتان کە خۆیان لێك دەخشێنن لە ڕووی جینسییەوە، لایەنی جینسیی خۆیان لەگەڵ یەکدی دا تێر دەکەن، خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ئەوانەی کە دەیکەن، ئەو ئافرەتانەی کە فاحیشە دەکەن لە ئێوە، چوار شایەدیان لێبگرن، ئنجا ئەگەر شایەدییان دا، لە ماڵەکانیاندا زیندانییان بکەن، تاکو دەمرن، یاخود خوا دەروویان لێ دەکاتەوە، دەروو لێکرانەوەکەش ئەوەیە، کە لێیان دڵنیابن: واز لەو جۆرە گوناهو فاحیشەیە دێنن، جارێکی دیکە ناگەڕێنەوە سەری، ئنجا دوا بە دوای، ئەوە یەکسەر دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ ﴿١٦﴾﴾النساء، پێشێ باس باسی ئافرەتان دەکات، چونکە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوە باسی زینایە، ئاخر چۆن باسی زینایە؟ زینا بە دوو لایان دەکرێ، بە پیاوو بە ئافرەت، بەڵام لێرە خوا دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّـٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَـٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ ﴿١٥﴾﴾النساء، ئەوانەی لە ژنەکانتان، لە ئافرەتەکانتان، ئەو فاحیشەیە ئەنجامدەدەن، ئنجا فاحیشەیەك بێ، بەس لە نێوان ژناندا ئەنجام بدرێ، دیارە خۆلێکخشاندنی ژنانە، کە (مساحقة)ی پێدەڵێن، ئەدی ئەوەی پیاوان؟ دوای ئەوەی باسی ئەو گوناحە، ئەو لادان (إنحراف)ە، سێکسییەی ئافرەتان دەکات، کە بریتیە لەوەی غەریزەی جینسیی خۆیان پێکەوە تێر بکەنو، هیچ باسی پیاوان لە گۆڕێ دا نیە! دوایی باسی هی پیاوان دەکات: ﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ ﴿١٦﴾﴾النساء، ئەو دوو پیاوەی ئەو جۆرە فاحیشەیە دەکەن! کەواتە یەك جۆرە فاحیشەیە کە (الفاحشة المثلية)ی پێدەڵێن، واتە: ئافرەت لەگەڵ ئافرەت، پیاو لەگەڵ پیاو، ئنجا ئەو دوو پیاوانەش کە ئەوە ئەنجام دەدەن، (فَـَٔاذُوهُمَا) ئازاریان بدەن.

ئنجا ئەو ئازاردانە: جنێو پێگوتن دەگرێتەوە، سجن کردن دەگرێتەوە، قامچی لێدان دەگرێتەوە، بە نەعل لێدان دەگرێتەوە، هەموویان دەگرێتەوە.

واتە: خوای کارزان، چوار چێوەیەکی فراوانی داناوە: ئازاریان بدەن، ﴿فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآ ﴿١٦﴾﴾النساء، ئنجا ئەگەر گەڕانەوە، (چاکبوونو،

لێیان دڵنیابوون، کە جارێکی دیکە ئەوە دووبارە ناکەنەوە)، ڕوویان لێ وەربگێڕنو وازیان لێبێنن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾﴾، بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگری میهرەبانە.

بە نسبەت ئافرەتەکانیشەوە، هەتا دەمرن، یاخود خوا دەرووویان لێ دەکاتەوە، دەروو لێکردنەوەکەش ـ بەڕای من ـ ئەوەیە کە لێیان دڵنیابن، وازیان لەوە هێناوە، بە نسبەت پیاوەکانیشەوە، ئەگەر گەڕانەوەو، چاکسازییان کرد، ئەوە وازیان لێ بێننو لێیانگەڕێن، ئەوە سزایەکەیە.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :**

**باسی چوونی فریشتە نێردراوەکانی خوا بۆ لای لووط ﷺو ، سەغلەتبوونی لووط ﷺ، بە هۆی ئەوەوە کە وایزانیوە مرۆڤن و ،مەترسیی لێیان هەبووە، کە دەستدرێژییان بکرێتە سەر، لەلایەن گەلە خراپەکارو، ڕەوشت نزمەکەیەوە:**

لە ئایەتی ژمارە (٧٧)دا دایە، وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە سێ بڕگەدا :**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ ﴾، کاتێك نێردراوەکانمان چوونە لای لووط، بەهۆی وانەوە حاڵی خراپ بوو، پێی ناخۆش بوو، حاڵی تێکچوو، (سِيٓءَ بِهِمْ )، واتە: (وقع فیما ساءَهُ، وَاغتمَّ بمَجیئِهِم)، کەوتە نێو حاڵێکەوە کە بۆ وی خراپ بووو، بەهۆی ئەوەوە کە هاتن، غەمبار بوو، چونکە مەترسیی لێیان هەبوو، کە ئەوانە میواننیو دەبێ ڕێزیان لێبگیریٚو بپارێزرێن، دەشیزانی کە گەلەکەی چ ماڵێکن، چەند خراپەکارن!

ئنجا لە تەفسیرەکاندا هاتوە (ئەو فریشتانەش: ئەگەر سێ بوون، چوار بوون، هەرچەند بوون، لە پەیمانی کۆندا، دەڵێ: دووان بوون، بەڵام لە (قورئان)دا بە کۆ ناوی هێناون، بۆیە لە دووان زیاتر بوون، بە دڵنیاییەوە، ئنجا ئەگەر سێ بووبن، ئەگەر چوار یان پێنج بووبن، نازانین)، لەسەر شێوەی گەنجی زۆر

جوان بوون، زۆر سەرنج ڕاکێش بوون، بۆ تاقیکردنەوەی ئەو خەڵکە خراپە، ئنجا کاتێك کە نێردراوەکانی ئێمە چوونە لای لووط، بەهۆی وانەوە، زۆر حاڵ ناخۆش بووو، کەوتە نێو دەریایی خەمو پەژارەو دڵتەنگییەوە■

**بڕگەی دووەم** : ﴿ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا ﴾، (أي: عَجَزَ عَنْ احْتِمال ضِيَافَتِهِم)، پێشتر باسمان کرد، (ذراع) بە باسك دەگوترێ، دەگوترێ: (فتح ذراعية)، واتە: هەردووك باڵی کردنەوە، ئنجا: (ضَاقَ ذَرْعاً)، ئەوەیە کە: باڵی کە کردوویەتەوە، تەنگ بێ، ئەگەر ئینسان بە باوەش شتێکی بۆ نەگیرێ، دەڵێ: (ضَاقَ ذَرْعُه بِهِ)، واتە: باسکی لێی نەگەیشتەوە، باڵی لێی نەگەیشتەوە، مەبەست پێی ئەوەیە: توانای پێناشکی، لە تاقەتی ئەودا نیە، بۆیە لێرەدا زانایان جوانیان گوتوە: (عَجَزَ عَنْ إحْتِمال ضِيَافَتِهِم)، دەستەپاچە بوو لە بەرانبەر ئەوەدا کە میوانداریيان بکات، نەك لەبەر ئەوەی نانو پێخۆری نەبوو! بەڵکو لەبەر ئەوەی دەیزانی، چ گرفتارییەكو حاڵێکی ناخۆش چاوەڕێیان دەکات، واتە: هەستی بە دەستەپاچەیی کرد، لە بەرانبەر گەلەکەیدا، کە بەرگریی لە میوانەکانی لێبکات.

**بڕگەی سێیەم** : ﴿ وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴾، گوتی: ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر سەختە، ڕۆژێکی دژوارە.

(عَصِيب: مُشتقّ مِنَ العَصَبِ وَهو الشَدُّ: مَعْصُوب أوْ عَاصِب)، (عَصِيب)، یان بە مانای (مَعْصُوب)ە، واتە: توندکراو، یان (عَاصِب) توندکەر، واتە: ئەمڕۆ ڕۆژێکی سەختو دژوارە، هیچ گومان لەوەدا نیە، کە لووط ﷺ لەبەر خۆیەوە ئەو قسەیەی کردوە، ئەگەرنا تۆ میوانت بێو بڵێی: وەڵڵاهی ڕۆژێکی دژوارو سەختە! مانای وایە تۆ پێت ناخۆشە میوانەکانت هاتوون، کە بە تەئکید ئەوە لە نەجابەتو نەزاکەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ناوەشێتەوە، بۆیە دەبێ ئینسان لە تێگەیشتنی قورئان دا چاك سەلیقەو وردەکاریی خۆی بەکاربێنێ، هەڵبەتە من نەمدیوە لە تەفسیرەکاندا، بڵێن: لووط لەبەرخۆیەوە وایگوتوە، ڕەنگە هەشبێو نەکەوتبێتە بەرچاوم.

هەروەها ئەوەی (إبراهيم)یش ﷺ کە دەفەرمویٚ : ﴿ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾الحجر، بێگومان ئیبراهیم ﷺ لە دڵی خۆیدا گوتوویەتی: ئێوە کۆمەڵێکن، نەناسراون، نامۆن، ناتانناسم، ئەگەرنا تۆ میوانت بێن و یەکسەر بڵێی: ناتانناسم، خۆش نیە! بڵێ: بەخێر بێن، سەرچاوم: میوان عەزیزی خوایە، فەرموون لە خزمەتین، دانیشن! ئنجا دوایی پاش ئەوەی ئاوێک، چایەکی دەدەیەو، بە خێری دێنی، دەتوانی بڵێی: ئەرێ پێم خۆشبوو جەنابتان بناسم، بەڵام هەر لە رێوە بڵێی: ناتانناسم، یانی: برۆن، یاخود یانی: بۆچی هاتوون؟ کە ئەوە لەگەڵ ئەزاکەتو ئەجابەتی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)و، مسوڵمانانیش دا، کە شوێنکەوتووی پێغەمبەرانن، ناگونجێ.

**مەسەلەی دووەم :**

**بە راکردن و هەڵەداوان چوونی خراپەکارانی گەلەکەی،**
**بۆماڵی لووط، بە مەبەستی دەستدرێژییکردنە سەر میوانەکانی :**

وەك خـوا فەرموویەتی : ﴿ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ ۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ ﴿٧٨﴾ قَالُوا۟ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِى بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بە پێزە، لە یازدە (١١) برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** ﴿ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ ﴾، گەلەکەی زۆر بە خێرایی بۆ لای دەهاتن، یانی: تاو درابوون، هەڵپێچرابوون، (يُهْرَعُونَ)، (أي: جاؤه يُهَرْوِلُونَ، مُتَهَيِّجَةً أعْصَابهم كأنّ سائِقاً يَسوقوهم، هُرِعَ وأُهْرِعَ بالبناءِ للمفعُولِ فِيهِما، إذَا أُعْجِلَ عَلَى الإِسْرَاعِ، أَي: حُمِلَ عَلَى العَجَل)، واتە: خەڵکەکەی (گەلەکەی)

هاتن بۆ لای، (دیارە ژمارەیەك لە گەلەکەی هاتوون بۆ لای)، دەمارەکانیان هەڵسابوون، وەك پاڵنەرێك پاڵیان پێوە بنێ، کەسێك لێیان بخورێ و پاڵیان پێوە بنێ، دەگوترێ: (هُرِعَ وَأُهْرِعَ) بە شێوەی: (بِناءٌ للمفعُولِ)، ئەگەر کەسێك پەلەی لێ بکرێ و تاوبدرێ و، هانبدرێ لەسەر پەلەکردن و خێرایی کردن.

یانی ▪ ئەوانەش ئارەزووو غەریزەی جینسیی لادەرانەیان، لێیان بۆتە ملۆزمێك و هاندەرێك، هانیداون و تاویداون و خێرایی پێ کردوون.

برگەی دووەم : ﴿ وَمِن قَبْلُ كَانُواْ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، لەوەو پێشیش خراپەکارییان دەکرد، خوای چەند بە نەزاکەت و بە نەجیبیی کە هەر شایستەی فەرمایشتی خوایە، ئەو مەبەستە دێنێ! یانی: بۆیە وا بە پەلە هاتن، بۆ ئەوەی خراپە (نێربازیی)یان لەگەڵدا بکەن، بەڵام خوای تاك و پاك بە ئاماژە دەفەرموێ: پێشتریش خراپەیان دەکرد، واتە: ئێستاش هەر بۆ خراپە هاتوون.

وەك لە سوورەتی (العنکبوت) ئایەتی (٢٩)دا، لووط ﷺ بە گەلەکەی خۆی دەڵێ: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: ئایا ئێوە دەچنە لای پیاوان؟ واتە: لەگەڵ پیاوان جووت دەبن و، ڕێگریی دەکەن و، لەبەرو مەجلیسی خۆتاندا خراپە دەکەن، ئنجا (السَیئـات)، پێچەوانەی (الحَسَنات)ە، خراپەکانیان دەکرد، واتە: خراپەیەك و دوو خراپە نەبوو، یەك جۆرە خراپەو دوو جۆرە خراپە نەبوو، بەڵکو نوقم و نغرۆ بوون لە خراپەکارییدا.

برگەی سێیەم : ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى ﴾، هەڵبەتە لووط زانیویەتی: ئەوان پێشتر خراپەکار بوون و، ئێستاش بۆ خراپە هاتوون، بۆیە گوتی: ئەی گەلەکەم! ئەمانە کچەکانمن، دیارە زانایان لەوبارەوە کە ئایا مەبەستی لووط ﷺ چی بووە؟ زۆر مشتومڕیان بووە، ڕاجیاییان بووە:

أ/ ئایا مەبەستی ئەوە بووە، کە کچەکانی خۆی بدات بەوانە؟ ئنجا ئەگەر دوو کچ بوون، ئەگەر سێ بوون، ئەگەر زیاتر بوون؟ بەڵام دوو، سێ کچ چۆن

بەشی ئەو خەڵکە زۆرە دەکەن؟ پاشان چۆن کچەکانی خۆی دەدا بەو خەڵکە ڕەوشت نزمە ؟!

ب/ یاخود مەبەستی لە (کچەکانم)، واتە: ئافرەتانی ئەو کۆمەڵگایەی خۆی، چونکە هەر پێغەمبەرێك (علیهم الصلاة والسلام)، وەك باب وایە بۆ کۆمەڵگایەکەی خۆی، واتە: ئافرەتانی کۆمەڵگاکەی خۆتان، کچەکانی منن، لەگەڵ ئەواندا ئارەزووی جینسیی خۆتان لە ڕێی شەرعییەوە، تێر بکەن، ئایا مەبەستی ئەوە بووە ؟

ج/ یاخود مەبەستی ئەوە بووە کە نا ئومێدیان بکات، یان تەریقیان بکاتەوە، واتە: ئەگەر کچەکانی خۆمم تەسلیم کردوون، میوانەکامتان تەسلیم ناکەم، یانی: دەستدرێژیی بۆ سەر میوانەکانم، وەك دەستدرێژییە بۆ سەر کچەکانم، عەیب ناکەن!!

کە من ڕای سێیەمم بە دڵە، هەندێك لە زانایانیش ئەومیان پەسند کردوە، کە پێم وایە مەبەستی ئەوە بووە، واتە: ئەگەر من کچەکانی خۆمم تەسلیمی ئێوە کردوە، میوانەکانتان تەسلیم ناکەم! دیارە ئینسانیش قەت نامووسی خۆی و کچی خۆی تەسلیم بە کەسێك ناکات خراپەی لەگەڵدا بکات، مانای وایە من ئەو میوانانە وەك نامووسی خۆم دەپارێزم، کە ئەوە ڕایەکی زۆر بەهێزە، من ئەوەم بە دڵە، ئەگەر نا، ناچێتە عەقڵمەوە لووط ﷺ گوتبێتی: ها کچەکانم! ئنجا ئەگەر دوو کچن، ئەگەر سێ کچن، ئەوانە دەیان کەس بوون، چۆن غەریزەی جینسیی خۆیانیان لێ تێر بکەن؟ پاشان چۆن ئەو کچانەی بەبێ ئیرادەو ئیختیاری خۆیان بدات بەو خەڵکە خراپە؟ زۆر لە عەقڵ بە دووری دەزانم.

دیارە لە: (التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس، العهد القدیم، سفر التکوین، الإصحاح: ١٩)دا[١]، ئاوا باسی ئەو دیمەنو مەشهەدە دەکات، دەڵێ: (حَاصَرَ رِجَالُ مَدِینَـةِ سَدُوم مِنْ أَحْدَاث وَشیوخَ البَیْتَ نادوا لُوطاً، أَیْنَ الرَّجُلاَن اللَّذَان استضَفْتهُما اللَّیْلَة؟ أَخْرِجْهُما إِلَیْنا لنُضاجِعَهُما، فَخَرَجَ إِلَیْهِم لُوط بَعْدَ أَنْ

---

١) لاپەڕە : ٥٠ و ٥١.

أَغْلَقَ البابَ خَلفَهُ، وَقَالَ: لا تَرْتَكِبوا شَرّاً يَا إِخْوَتِي، هوذَا لِي ابْنَتانِ عَذْرَاوَانِ أُخْرِجُهُما فَافعَلوا بِهِما ما يَحْلُو لَكُمْ، أَما هَذانِ الرَّجُلانِ فَلاَ تُسِيئُوا إِلَيْهِما، لأَنَّهُما لَجَآ إِلى حِمَى مَنْزِلِي).

واتە: پیاوانی شاری سەدووم لە گەنجەکانو بە تەمەنەکان، ئابڵووقەی ماڵەکەیانداو، بانگی (لووط)یان کرد: ئەو دوو پیاوەی کە دوێنێ شەوێ میوانداریيت لێکردوون، لە کوێن؟ بیانکە دەر بۆ ئێمە، تاکو لەگەڵیان ڕاکشێین، (واتە: کاری خراپیان لەگەڵدا بکەین)، (لووط)یش، دەرگاکەی لە پشت خۆیەوە داخست، ئنجا چوو بۆ دەرێو، پێی گوتن: ئەی برایەکانم! خراپە مەکەن، ئەوەتا من دوو کچم هەن، دوو کچ کە شوویان نەکردوە، بۆتان دەنێرمە دەرێ، چیتان پێخۆشە وایان لەگەڵدا بکەن، بەڵام کاری خراپ لەگەڵ ئەو دوو پیاوەدا مەکەن، چونکە پەنایان بۆ سایەی من هێناوە.

پەیمانی کۆن ئاوای هێناوە، بەڵام بە ڕاستیی من وەك گوتم: ئەوە ناچێتە عەقڵمەوە: کە لووط ﵇ کچەکانی خۆی پێشکەش کردبن، بەڵکو وەك گوتم مەبەستی ئەوە بووە، وەك چۆن: کەسێك لە کەسێك دەدا، تۆش دەڵێی: فەرموو کاکە لەوی مەدە، وەرە لە من بدە، دەزانی لە تۆ نادات، یان واز لەوی بێنە، وەرە بۆ لای من، دەزانی، نایەت، واتە: ویستوویەتی کە بەشەرمیاندا بشکێنێتەوە.

یان مەبەستی ئەوە بووە، ـ کە ئەمەیان لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوەو بۆچوونی خۆمە ـ واتە: ئەگەر من ئەو کچانەی خۆمم تەسلیم بە ئێوە کردوون، ئەو میوانانەتان تەسلیم ناکەم، کە دیارە زانیویشیانە کچەکانییان تەسلیم ناکات، مانای وایە، با بە تەمای میوانەکان نەبن، تەسلیمیان بکاتو خراپەیان لەگەڵدا بکەن.

ئنجا کۆتایی ئەم برگەیە بەوە دێنم کە (عبدالوهاب النجار) لە (قصص الأنبياء)دا[1]، شتیکی گوتوە پێم سەیر بوو! دەڵێ: (ذُكرت قِصَةُ لُوط فِي التوراة عَلَى النحو الَّذِي وَرَدَ فِي القُرآنِ، وَلاَ تُخَالِفُه إلا فِي شيء وَاحِدٍ وهو: أَنَّها لم تَذْكر عَرْضَ بَناتِهِ عَلَى القَوْمِ).

---

١) ص ١١٦.

واتە: بەسەرهاتی لووط لە تەوراتیشدا بەو شێوەیەیە کە لە قورئاندا هاتوە لە یەك جیا نین، لە یەك شتدا نەبێ، ئەویش ئەوەیە لە تەوراتدا باسی نەکردوە، کچەکانی خۆی پێشنیار بکات بۆ گەلەکەی.

پێم سەیر بوو وایگوتوە! چونکە لە تەوراتدا هەر زۆر بە زەقیی، دەڵێ: ئەوەتا کچەکانی خۆم بۆ ئێوە دەنێرمە دەرێ، چیتان پێخۆشە وایان لێبکەن، بەڵام ئەو دوو پیاوە خراپەیان لەگەڵدا مەکەن!

هەرچەندە ئەو کتێبە چەند جارێکیش چاپکراوەتەوە، دیارە ئاگای لەوە نەبووە، کە لە (پەیمانی کۆن)دا زۆر بە ڕوونیی ئەوە هاتوە، لە (قورئان)دا بەس دەفەرموێ : ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى ﴾، ئا ئەوانە کچەکانمن! هەر ئەوەندە دەفەرموێ، بەڵام لە (تەورات)دا زۆر بە ڕوونیی دەڵێ: چیتان پێخۆشە وایان لەگەڵدا بکەن، یانی لەگەڵیاندا جووت بن.

**برگەی چوارەم** : ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، دەجا پارێز لە خوا بکەن، واتە: خۆتان بپارێزن لە سزای خوا، خۆتان بپارێزن لە لێپرسینەوەی سەختی خوا، بەهۆی خۆ دوورگرتن لە قەدەغەکراوەکانەوە.

**برگەی پێنجەم** : ﴿ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ ﴾، لە بەرانبەر میوانەکانمدا سەرشۆڕم مەکەن، شەرمەزارم مەکەن.

لێرەدا وشەی (ضَيْف): (الضَّيْفُ والضائِفُ أي النازِل فِي مَنْزِلِ أَحَدٍ، نُزُولاً غَيْرَ دَائِمٍ)، دیارە (ضَيْف)، یانی: (ضائِف)، واتە: کەسێك کە دادەبەزێ لە ماڵی یەکێکدا، بە شێوەیەکی کاتیی لەوێدا دەمێنێتەوە.

وشەی (ضَيْف)، بۆ تاكو بۆ دووانو بۆ کۆ بەکاردێ، کە گوتت: (ضَيْف)، واتە: دەگونجێ یەك میوان بێ، دەگونجێ دووان بێ، دەگونجێ کۆمەڵێك بن، بە پێی سیاقو حاڵ، ئەو کاتە دەزانرێ.

**برگەی شەشەم** : کە دەفەرموێ: ﴿ فِى ضَيْفِىٓ ﴾، لێرەدا (ضَيْف)، بە هۆی (فِي)یەکەوە، کراوەتە (ظرف)ێکی مەجازیی، دەڵێ: (جُعِلَ الضَّيْفُ كالظَّرْفِ، أَي:

لاَ تَجْعَلُونِي مَخْزِيّاً عِنْدَ ضَيْفِي إِذْ يَلْحقهم أَذَىً فِي ضِيَافَتِي، لأَنَّ الضِيافَةَ جوارٌ عِنْدَ رَبِّ المنْزِلِ، فَإِذَا لَحِقَتِ الضَّيْف إِهانَةٌ، كانَتْ عاراً عَلَى رَبّ المنْزِل)[١].

واتە: لێرەدا میوان (ضیف)، کراوە بە (ظرف)، یانی: کاتو شوێنێك کە کارێکی تێدا ئەنجام دەدرێ، واتە: من سەرشۆڕ مەکەن لەلای میوانەکانم، کە بەهۆی منەوە ئازاریان پێ بگات، چونکە میوانداریی کردنی خەڵك، (واتە: خەڵك کردنە میوانی خۆو قبووڵکردنی ئەوە کە تۆ کەسێك میوانت بێ)، ئەوە پەنادانە لەلای خاوەن ماڵ، ئنجا ئەگەر هاتو میوانەکە عەیبەیەکی بەسەر هاتو، ئازارێکی تووش بوو، ئەوە بۆ خاوەن ماڵەکە شوورەیی و شەرمەزارییە.

**بڕگەی حەوتەم** : ﴿ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ﴾، ئایا لە نێوتاندا پیاوێکی سەر ڕاست نیە، وەك کوردەواریی دەڵێن: پیاوێکی مەرد، پیاوێکی پیاوانەتان لەنێودا نیە؟ پیاوێکی سەر ڕاستتان تێدانیە؟! چونکە (رَّشِيدٞ)، یانی: خاوەن (رُشد)، (رُشد)یش، واتە: بە ئامانج گەیشتن‌و، کەسێك کە بتوانی مەبەستی خۆی بێنێتە دی، ئایا کەسێکی سەر ڕاستی بە ئامانج گەیشتوو، بە مراد گەیشتووتان تێدا نیە؟

**بڕگەی هەشتەم** : ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە : ﴿ قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ ﴾، گوتیان: تۆ زانیوتە کە ئێمە هیچ هەقێکمان لە کچەکانتدا نیە، واتە: مافمان نیە کە ئێمە ئەو کارە لەگەڵ کچەکانتدا بکەین، ئەوە واتایەکی.

یاخود: ئێمە ئارەزوومان بۆ کچەکانت ناچێ، ئنجا کچەکان (بنات) بە هەر کام لەو چەمك‌و واتایانە بێ، کە پێشتر باسمان کرد، لێرەدا واپێدەچێ ئەوان پێشنیارەکەی لووط ﷺ یان بە جیددیی وەرگرتوەو (لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوە)!!

بەڵێ مەبەست لە: (بَنَاتِي)، هەرکامێکیان بووبێ:

---

١) التحرير والتنوير: ج ١٢، ص ١٢٣.

١) مەبەستی کچەکانی خۆی بێ، کە ئەو کاتە:

أ- یان وەك شەرمەزار کردنو ئیحراج کردنیان بۆی پێشنیار کردوون، وەك پێشتر گوتم.

ب- یاخود: یانی: ئەگەر هێشتبم دەستدرێژیی بکەنە سەر کچەکانم، ناهێڵم دەستدرێژیی بکەنە سەر میوانەکانم.

٢) یاخود مەبەست پێی ئافرەتەکانی خۆیان بێ، (هاوسەرەکانی خۆیان).

٣) یان مەبەست پێی ئافرەتانی کۆمەڵگایەکەی بێ.

هەرچۆن بێ ئەوان واپێدەچێ بە جیددیی وەریانگرتبێو، هەر ئەو مانا ڕواڵەتییەیان لێوەرگرتبێ کە تەورات هێناویەتی، بۆیە دەڵێن: ئێمە مافمان نیە لە کچەکانی تۆدا، یاخود ئارەزوومان بۆیان ناچێ!

هەندێکیش لە زانایان کە نازانم لە کوێیانەوە هێناوە! چونکە هەندێکیان هەر وا لەخۆوە مانایەك هەڵدەتاشن، گوتوویانە: ئەوە کاتی خۆی کەسانێك لەو خەڵکە، هەندێك لە کچەکانی (لووط)یان داوا کردوە، بۆ ئەوەی هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکەن، ئەویش پێی نەداون، ئنجا لە نێو ئەواندا عادەتو کلتوور وابووە، کە هەر کەسێك داوای کچی کەسێکی کردو پێی نەدا، دوایی ئەگەر هەر بیشیداتێ، بۆی نیە بیهێنێو، لێی حەرامو قەدەغە دەبێ!

بەلاَم ئەوە بە بۆچوونی من، قسەیەکی بێجێیە، هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا زۆریشیان هێناویانە، چونکە ئایا خەڵکێك بڕوا بە پێغەمبەری خوا نەکەنو، بڕوا بە بەرنامەی خوا نەکەنو، ئەو ڕەوشتە نزمانەیان هەبێ: لە حەلاڵو حەرام دەپێچنەوە؟! تاکو بڵێن: کاتی خۆی نەیداوینێ، ئێستاش لێمان حەرامن!!

بە بۆچوونی من ئەو جۆرە لێکدانەوەیە، شتێکی هەم بێ بناغەو، هەم بێجێیە، بەلاَم بۆیە هێنام چونکە لە زۆر لە تەفسیرەکاندا هاتوە.

**بڕگەی نۆیەم** : ئنجا دوایی دەڵێن: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ ﴾، بێگومان تۆ دەزانی ئێمە چیمان دەوێ، واتە: دەمانەوێ ئەو پیاوانەمان تەسلیم بکەیو، ئەومیان لەگەڵدا بکەین کە خۆمان دەمانەوێ.

**بڕگەی دەیەم :** لووط ؑ لێرەدا خۆی بێچارە دەبینێ، خۆی لە هەڵوێستێکی زۆر سەغڵەت دا دەبینێ، چونکە نازانێ کە ئەوانە فریشتەن‌و، نازانێ کە ئێستا لە بەینیان دەبەن‌و بۆ ئەوە هاتوون کە گەلەکەی بفەوتێنن! تاقی کردنەوەیەکی زۆر سەخت‌و کاتێکی دژوار بووە، بۆیە زۆر بە داخ‌و خەفەتەوە دەڵێ: ﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً﴾، وشەی: (لَوْ)، واتە: (ئەگەر)، یانی: ئەگەر من توانام بەسەر ئێوەدا هەبووایە، توانایەکی زاتیی، بەڵام لێرەدا، واتە: خۆزگە توانام بەسەر ئێوەدا ببووایە، خۆزگە دەستەڵاتێکم بەسەرتاندا شکابایە، ئایا ئەو کاتە ئاوام لێ قبووڵ دەکردن؟! بێن لە ماڵی مندا بتانەوێ دەستدرێژیی لە میوانی من بکەن؟

ئنجا لێرەدا: ﴿لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً﴾، (أي: لو انَ لي عَلَيْكُم قُوَّةً)، ئەگەر توانام بەسەرتاندا شکابایە، یانی: ئەوەم لێ قبووڵ نەدەکردن، یاخود خۆزگە توانام بەسەرتاندا شکابایە.

**بڕگەی یازدەیەم :** ﴿أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٖ شَدِيدٖ﴾، واتە: یان خۆزگە پەنام بردبایە، پشتم بەستبایە بە پەنایەکی مەحکەم، بە هێزێکی مەحکەم.

زانایان ئاوایان لێك داوەتەوە: (أو أعْتَصِم بما فيهِ مَنَعَةٌ)، یان پەنا بە شتێك بەرم، پشت بە پەنایەکەوە بدەم، کە بمپارێزێ، (أي: بمكانٍ أو ذي سُلطانٍ يَمْنَعُني مِنْكُمْ)، واتە: بە شوێنێك، یاخود بە خاوەن دەستەڵاتێك کە بەرگریی لە من بکات، لە بەرانبەری ئێوەدا.

(والرّكْن: الشِّقُّ مِنَ الجَبَلِ المتَّصل بالأَرْض)، (رُكْن)، ئەو بەشەیە لە چیا، کە بە زەوییەوە چەسپاوە، واتە: نەك شوێنێکی هەڵواسراو، ئەو شوێنەی کە بە زەوییەوە داکوتراوەو بە ناخی زەویدا چۆتە خوار، پێی دەگوترێ: (رکن)، کە زۆر مەحکەم‌و پتەوە.

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {يَرْحَمُ اللهُ لُوطاً، لَقَدْ كانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيد} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٣١١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٢٦٣)، وَمُسْلم برقم: (١٥١)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (١١٠٥٠)}.

واتە: خوا بەزەیی بە (لووط)دا بێتەوە، پەنای بۆ پەنایەكی بەهێز برد بوو، (كە خوای بالادەستە).

واتە: لووط نەیدەزانی كە ئەوە لە پەنای ئەو قەلا مەحكەمە دایە، كە خوای زاڵو تواناو فریشتەكانیو ناردوونی بۆ فەوتاندنی ئەو خەڵكە بەدفەڕە.

واتە: لووط نەیزانیوە كە ئاوایە، ئەگەرنا (لووط)یش ئەگەر زانیبای وایە، بێمنەتو بێباك دەبوو، بەلام كە ئەو خۆزگانەی خواستونو، ئەو ئەسەفو ناڕەحەتییەی دەربڕیوە، لەبەرئەوە بووە كە نەیزانیوە ئەوانە فریشتەن.

**مەسەلەی سێیەم :**

**خۆ ناساندنی فریشتە نێردراوەكانو، ڕێنمایی كردنیان، بۆ لووط و خێزانەكەی، جگە لە ژنەكەی، بۆ چۆنیەتی دەرباز بوونیان لەو سزاو بەلایەی خوا، كە بۆ گەلی لووطی دەنێرێ :**

خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ﴿٨١﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە لە شەش بڕگەدا :**

**بڕگەی یەكەم :** ﴿ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ ﴾، (واتە: فریشتەكان) گوتیان: ئەی لووط! ئێمە نێردراوانی پەروەردگارتین، هەرگیز ناگەنە تۆ، (واتە: هەرگیز دەستیان بە تۆ ناگات)، چونكە: (لَنْ) بۆ جەختكردنەوەیە، واتە: ئێمە فریشتەین نێردراوین بۆ لای تۆ، لە لایەن پەروەردگارتەوەو، ئەوانە دڵنیابە هەرگیز دەستیان ناگاتە تۆ، واتە: دەستیان ناگاتە میوانەكانت.

لێرەدا کە گوتوویانە: ﴿لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ﴾، دەستیان ناگاتە تۆ، چونکە میوانی ئینسان، وەك ئینسان وایە، میوان وەك خانە خوێ وایە، ئەگەر دەستیان بگاتە میوانەکان، مانای وایە زیانیان بە لووط ﷺ گەیاندووە هەر شتێ بە سەر میوان بێ، پێش میوانەکە بەسەر خانە خوێیەکە هاتوە، هەر شتێك بەسەر کەسێك بێ، کە لە پەنای کەسێك دایە، پێشێ بەسەر پەنادەرەکەدا هاتوە، پێش ئەوەی بەسەر بابای پەنادراودا بێ.

ئنجا لێرە ڕوونی نەکردۆتەوە، کە فریشتەکان چییان لێکردن، بەڵام لە سوورەتی (القمر)دا، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ٣٧﴾، واتە: ئەوان ویستیان میوانەکانی لێ زەوت بکەن، (ویستیان بە فرتو فێڵ، یان بە زەختو زۆر، میوانەکانی لێ بستێننو، خراپەیان لەگەڵدا بکەن)، ئێمەش چاویانمان سڕیەوە، (واتە: چاویانمان کوێر کرد، کوێرو کوتر بوونو دەستیان دەکوتا چۆن بچنە دەرێ، چۆن خۆیان دەرباز بکەن؟).

**برگەی دووەم:** ﴿فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ﴾، (ئەوە هەر قسەی فریشتەکانە)، پێیان گوت: لە بەشێك لە شەوێدا ماڵو خێزانەکەت شەوڕۆ پێبکە.

(السُّرَى وَالإِسْرَاء فِي اللَّيْلِ، كالسَّيْرِ فِي النَّهار)، وشەی (سُرَى وإِسْرَاء)، لە شەودا، وەك (سَيْر)ە، لە ڕۆژگاردا (سَيْر)، بە ڕۆیشتنی ڕۆژێ دەڵێن، وە (سُرَى وَإِسْرَاء)، بە ڕۆیشتنی شەوێ دەڵێن، دەگوترێ: (سَرَى وَأَسْرَاء)، واتە: هەم بە سیانیی (ثلاثي) هاتوە، هەم بە چواریی (رباعي) هاتوە، هەردووکیان بە مانای: بە شەوێ ڕۆیشت، سەفەری شەوێی کرد.

ئنجا ئەو وشەیە بە دوو شێوەش خوێنراوەتەوە: (فَاسْرِ) و (فَأَسۡرِ)، دیارە ئەگەر (سَرَى) بێ، (سَرَى، يَسْرِي، فَاسْرِ)، بەڵام ئەگەر (أَسْرَى، يُسْرِي، فَأَسْرِ)یە.

(القِطْع: الجزء)، واتە: بەشێك، كە شارەزایانی ماناو مەبەستەكانی قورئان، دەڵێن: مەبەست پێی بەشی كۆتایی شەو بووە، واتە: پێش ئەوەی كە سپێدە (فَجْر) دابێ، وە ئەمە لە قورئانیشدا ئاماژەی پێدراوە، وەك لە سوورەتی (القمر)دا دەفەرموێ : ﴿ نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ ۝٣٤ ﴾، واتە: ئێمە پێش ئەوەی كە نوێژی بەیانی ببێ، پێش بەرەبەیان، دەربازمان كردن، (سَحَر)، یانی: بەشی كۆتایی شەو، پێش بەرەبەیان.

**برگەی سێیەم** : ئنجا ڕێنماییان دەكەن: ﴿ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ﴾، با هیچ كام لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە جگە لە ژنەكەت، یانی: لە كاتێكدا كە گرمەو زرمە دەبیستن‌و، ئەو بەڵایەیان بەسەر دێ، دیارە دوای ئەوەی كە لووطو ماڵو خێزانەكەی دوور دەكەونەوە.

ئنجا كە لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ﴾:

هەندێكیان دەڵێن: ئەمە هەڵاوێردراو(مُستثنى)ە، لە (فَأَسْرِ )، واتە: (لاَ تَسْرِ بِها)، یانی: جگە لە ژنەكەت، ئەوانی دیكە بە شەوێ دەرباز بكەو، سەفەری شەوێیان پێبكە.

خوێنراویشەتەوە: (إلاَّ امْرَأَتُكَ)، ئەو كاتە هەڵاوێردراو (مُستثنى) دەبێ، لە (أَحَد)، واتە: (وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ إلاَّ امْرَأَتُك)، كە ئەوە لێرەدا: (لاَ يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ)، نەهی دەبێ لە مانای (نَفِي)دا واتە: هیچ كام لە ئێوە ئاوڕ ناداتەوە، جگە لە ژنەكەت، واتە: بەس ژنەكەت ئاوڕ دەداتەوە، بۆ ئەوەی كە ئەو بەڵایەی خوا لەویش بدات.

ئنجا بە پێی ئەو دوو بۆچوونە:

١ ) دەگونجێ ژنەكەی لەگەڵیان چووبێ‌و، لە ڕێگا ئاوڕی دابێتەوەو، فەوتابێ لەگەڵ خەڵكەكەدا، كە وەك پێشتریش باسمان كرد، واپێدەچێ جۆرێك لە تیشكی زیانبەخش، لێی دابێت‌و لەوێ زراوی تۆقی بێ، یاخود تیشكەكە

بەو جۆرە بووبێ کە کاریگەریی لەسەر جەستەی دانابێ‌و گوشتبێتی، ئەوە ئەگەر (امْرَأتُکَ)بە (رفع) بخوێندرێتەوە.

٢) بەڵام ئەگەر (امْرَأتَکَ) بە (مَنْصُوب)یی، بخوێنرێتەوە: (وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ إلاَّ امْرَأتَكَ)، ئەو کاتە هەڵاواردن (إستثناء)ەکە، دەچێتەوە بۆ شەوڕۆ پێکردن، (فَأَسْرِ بِأهْلِكَ إلاَّ امْرَأتَكَ)، ماڵ‌و خێزانەکەت بەرە بە شەوێ، جگە لە هاوسەرەکەت، یانی: لە ژنەکەت گەڕێ‌و بەجێی بهێڵە، ژنەکەشی من وام دێتە بەرچاو، کە بۆخۆی لەگەڵیان نەچوو بێ، چونکە هەر لە سەرەتاوە تا سەرەنجام ئەو ژنە نەگریسە، بڕوای بە لووط ﷺ نەبوو کە پێغەمبەری خوایە، ئیمانی پێی نەبووەو بێبڕوا بووەو، لەگەڵ گەلە خراپەکارەکەیدا هاوکار بووە، هەتا هەندێك لە توێژەوەرانی قورئان، دەڵێن: ئافرەتەکەی ئاماژەی کردوە بۆ قەومە خراپەکەی، کە وەرن ئەوە لووط هەندێ گەنجی زۆر جوان میواننی، خراپەیان لەگەڵدا بکەن!

بە هەر حاڵ ئەوە لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەهاتوە، مەگەر لە کتێبی خاوەن کتێبەکاندا ئاماژەی پێکرابێ، گرنگ ئەوەیە ئافرەتەکە: چ لە ڕێیە فەوتا بێ، چ هەر لەوێ لەگەڵیان نەهاتبێ، فەوتاوە.

ئنجا ئەگەر مانای یەکەمیان بێ (إلاَّ امْرَأتُكَ)، ئەگەر (إستثناء) بێ لە (أحَد)، (فَلاَ يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ إلاَّ امْرَأتُكَ)، ئەو کاتە: تەعبیرەکە ئاوا دەبێ: (فَلاَ تَلْتَفِتُونَ إلاَّ امْرَأتُكَ تَلْتَفِت)، هیچ کامتان ئاوڕ نادەنەوە، جگە لە ژنەکەت، ئەو ئاوڕ دەداتەوەو، بەهۆی ئاوڕدانەکەشیەوە دەفەوتێ.

ئنجا وەك گوتم: من مانای یەکەمیانم زیاتر بە دڵە، کە هەر لەوێوە لەگەڵیان نەچووبێ، چونکە لە چەند شوێنان لە قورئان دا هاتوە، دەفەرموێ : ﴿إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾﴾الأعراف، واتە: جگە لە هاوسەرەکەی، ئەو لە فەوتاوان بوو، یان لە بەجێماوان بوو.

هەڵبەتە: (غَابِر)، بەو کەسە دەگوترێ: کە لە شوێنێك دەفەوتێ، یانی: هەر لەوێ فەوتاوە، نەك لە ڕێیە، فەوتا بێ.

بەڵام ئەگەر لە ڕێیەش فەوتابێ، وەك لە پەیمانی کۆندا هاتووەو خوێندنەوەی دووەمیش دەیگرێتەوە، لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: ئافرەتەکەی لووط ئاوڕی دایەوەو بوو بە کۆڵەکەیەك خوێ، واتە: لە شوێنی خۆی بوو بە پەیکەرێکی خوێ، کە هەڵبەتە ئەوە لە قورئاندا ئەوەندە هاتووەو، پێشتر دەقەکەی پەیمانی کۆنمان هێنا.

**بڕگەی چوارەم**: دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ ﴾، بێگومان ئەویش تووشی دێ، ئەو بەڵایەی کە تووشی گەلەکەی هاتوە، چونکە هەر لەگەڵ گەلەکەیدا بووە، لە هەموو هەڵوێستەکانیاندا، لە بێبڕواییدا، لە بە درۆ دانانی لووط دا ﷺ، لەگەڵیاندا هاوڕا بووە، هاوعەقیدو هاوفیکریان بووە، با هاو ڕەوشتیشیان نەبووبێ، چونکە هاوسەرانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەك زانایان دەڵێن: لەبەر ئەوەی کوفرو شیرك لە نێو ئەو خەڵکەدا، کە بڕوایان بە پێغەمبەر نەکردوە، شتێکی شوورەیی نەبووە، شتێکی عەیبو عار نەبووە، لەبەرئەوە عەجایب نەبووە کە خێزانی لووط و، خێزانی نووح بە دەقی ئایەت، کافر بوون، چونکە ئەوە عەیبو شوورەیی نەبووە، بەڵام شتێکی عەیبو شوورەیی بووە کە لە ڕووی ڕەوشتەوە ڕەوشتیان نزم بێ‌و، وەچەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)یش، لێڵ دەبوو، چونکە ئەوکاتە بە مسۆگەریی نەدەزانرا، کە ئەو کوڕە هی ئەو پێغەمبەرەیە، یان ئەو کچە هی ئەو پێغەمبەرەیە، یان نا؟! ئنجا جگە لە ڕووی وەچەوەو پێش ئەوەش، لە ڕووی ئابڕووو کەرامەتەوە: لەگەڵ پایەی بەرزی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)دا، ناگونجێ: هاوسەرانیان خراپەکارو داوێن پیس بن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ ﴾، یانی: (فَهِيَ تَهلِكُ مَعَ الهالِكِين)، یان (فِي الهالِكِين)، لەگەڵ فەوتاواندا ئەویش دەفەوتێ، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ

مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾، واتە: فریشتەکان گوتیان: ئێمە نێردراوین بۆ لای کۆمەڵێکی تاوانبار، جگە لە بنەماڵەی لووط ئێمە تێکرایان دەرباز دەکەین، جگە لە ژنەکەی، ئێمە وامان داناوە، وامان ئەندازەگیریی کردوە، کە ئەو لە فەوتاوان دەبێ، لە بەجێماوان دەبێ.

هەروەها لە سوورەتی (النمل)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾، خۆیو ماڵو خێزانەکەیمان دەرباز کرد، جگە لە ژنەکەی، ئەومان دانا لە فەوتاوان، بڕیارماندا کە لە: سەر بەفەتارەت چووان بێ.

هەروەها لە سوورەتی (العنكبوت)دا، دەفەرموێ : ﴿وَقَالُواْ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾، (فریشتەکان) پێیان گوت: مەترسێو دڵتەنگ مەبە، (واتە: بە لووطیان گوت) ئێمە خۆتو ماڵو خێزانەکەت دەرباز دەکەین، جگە لە ژنەکەت، جگە لە ئافرەتەکەت، ئەو لە فەوتاوانە، واتە: تازە بڕیاری بۆ دراوە، دەبێ لەگەڵ گەلە خراپەکارەکەیدا بفەوتێ.

**بڕگەی پێنجەم** : خوا ﷻ خۆی فەرموویەتی، یان لەسەر زمانی فریشتەکانو، فریشتەکان گوتوویانە : ﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ﴾، ( موعد)، دەڵێ: (وَقتُ الوَعْدِ، وَالوَعْدُ أَعَمّ مِنَ الوَعِيد)، دیارە (موعد) دەبێتەوە بە بەڵێنگە، ئەو شوێنەی کە بەڵێنی تێدا دراوە، یان ئەو کاتە کە بەڵێنەکەی تێدا دراوە، چونکە لێرەدا باسی کاتی بەرەبەیان دەکات، کەواتە: ئەو کاتەی ئەو بەڵێنەی تێدا دیاریی کراوە، کە بەرە بەیانە، وشەی (وعد)یش چەمکەکەی گشتییترە لە (وَعِید)، (وَعِید)، واتە: هەڕەشە (وَعْد)، واتە: گفتو بەڵێن، بەڵام (وعد)، هەم بە باری چاکەدا مانا دەداتو، هەم بە باری هەڕەشە لێکردندا، واتە: هەم وەك مژدە پێدانو، گفت پێدانی چاکە، هەم هەڕەشە لێکردن، (وعد)، هەردووکیان دەگرێتەوە، هەرچەندە بە زۆریی ئێستا، لە عورفو باوی زمانی عەرەبییدا،

وشەی (وعد)، زیاتر بۆ چاکە بەکاردێ، بەڵام لە ڕاستیی دا وانیە، بەڵێ: (وعید)، تەنیا بۆ هەڕەشەیە، بەڵام (وعد)، هەم بۆ چاکەو، هەم بۆ خراپە، واتە: هەم بۆ ئەوە کە تۆ بەڵێنی چاك بە کەسێك بدەیو، هەم بۆ ئەوە کە هەڕەشەیەکی خراپی لێبکەی، بۆ هەردووکیان بەکاردێ، کە لێرە بە تەئکید (موعد)، واتە: ئەو کاتەی هەڕەشەکەی بۆ ئەوان تێدا دیاریی کراوە، کە بەرەبەیانە.

**بڕگەی شەشەم** : ﴿أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾: ئایا بەیانی نیزیك نیە؟ ئەمە وەڵامی پرسیارێکە کە لە زەیندا پەیدا دەبێ: ئایا دەبێ ئەو سزایە کەنگێ بێ؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو سزایە بەرەبەیان دێ، ئایا بەرەبەیان زوو نیە؟ یانی: خەمت نەبێ سزایەکەیان زۆری پێناچێو ناوەخرێ.

**مەسەلەی چوارەمو کۆتایی :**

**هاتنە دی فەرمانی قەدەریی خواو، هەڵگێڕانەوەی ئاوەدانییەکانی گەلی لووط و، بەردی ئاگرین بەسەردا باراندنیان:**

خوا عزّوجلّ فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِىَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بەپێزە لە پێنج بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم** : ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا﴾، کاتێك کە فەرمانی ئێمە هات، (ف) بۆ گێڕانەوە (عطف)ە، بەڵام بە مانای: بەدواداهاتن (تعقیب)یش دێ، واتە: یەکسەر دوای ئەوەی کە بەڵێنگەکەیان بۆ دیاریی کرا، کە بەرەبەیانە، فەرمانی ئێمە زوو هات، لێرەدا مەبەست لە فەرمان (أمر)، ئەمری قەدەرییو کەونییە، نەك ئەمری شەرعیی، واتە: کاتێك کە بڕیاری ئێمە هاتو جێبەجێ بوو، یاخود

مەبەست لە (أَمْرُنَا)، یانی: ئەو بەڵایەی کە ئێمە هێنامانە دی‌و، دروستمان کرد، کەواتە: (أَمْرُنَا)، یانی: فەرمانپێکراو (مأمور)مان، ئەوەی ئێمە فەرمانمان پێکردبوو، کە بریتیە لەو بەڵاو لە موصیبەتە زەبەلاحە کە بەسەریان هات.

**برگەی دووەم :** ﴿ جَعَلْنَا عَلِيَهَا سَافِلَهَا ﴾، سەرێیمان کردە خوارێیی، واتە: سەرەوەی ئەو شارانەمان کردە خوارێیان، هەڵبەتە ئەگەر سەرێ بچێتە خوارێ، خوارێش دەچێتە سەرێ، بە کوردیی دەڵێن: سەرەوبنمان کردن، یان سەرەوژێرمان کردن، یان لینگەو قووچمان کردن، ئەو ئاوەدانییانە، ئەو ناوچانە، هەڵمانگێڕانەوە، ئێستا مرۆڤێك کە بە پێوە وەستاوە، ئەگەر سەرەوبنی بکەی، سەری دەکەوێتە سەر زەوی‌و، لاقی دەچنە ئاسمانێ، یان سەیارەیەك کە وەردەگەڕێ دەڵێن: سەیارەکە هەڵگەڕابووەوە، واتە: پێچکەکانی (تایەکانی)، چوو بوونە سەرێ‌و، سەقفەکەی هاتبووە خوارێ.

ئنجا وەك پێشتر باسمان کرد: ئەوەی کە خوا ﷻ لێرەدا فەرموویەتی: شوێنەوارناسەکانیش هەر ئەومیان هاتۆتە بەرچاوو شوێنەواری ئەو شارانەی لە نێو دەریای مردوو (بحر المیت)دان، بناغەکەیان لەلای سەرێیەو، سەقفەکەیان کەوتۆتە خوارێ.

هەڵبەتە جگە لێرە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ جَعَلْنَا عَلِيَهَا سَافِلَهَا ﴾، لە قورئاندا وشەی (المؤتفکة)ش هاتوە: ﴿ وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ ﴾النجم، واتە: (خوا) شارە هەڵگێڕراوەکان، ناوچە هەڵگێڕراوەکانی بەردانەوەو، ئەومیان بەسەر داهات، کە بەسەریان داهات.

کە ئێستا شوێنەکەیان بۆتە دەریایەك کە لەسەر ڕووی زەوی، ئاوی هێندە سوێر نیە، ڕێژەی خوێ تێیدا زۆر زۆر بەرزە، خێواوکێکی ڕووتە، ئەومیان بەسەر داهات، یاخود ئەو بەرد بارانەیان بەسەر داهات.

هەروەها: (المؤتفکات)یش هاتوە، واتە: شارە هەڵگێڕدراوەکان، ئنجا کە دەفەرموێ: (المؤتفکة)، بە تاك، واتە: هەموو شارەکان، کە چوار پێنجێك بوون،

وەك یەك شار هەڵگێردرانەوە وێكرا، كە دەشفەرموێ: (المؤتفكات)، بە كۆ دەیهێنێ، واتە: هەموویان هەڵگێڕراونەوە، یانی كە بە كۆ دەیهێنێ، واتە: ئاوەدانییەكان هەموویان تاك تاكیان هەڵگێڕراونەوەو، كە بە تاك دەیهێنێ، واتە: هەموویان وەك یەك شار هەڵبگێڕدرێتەوە، ئاوچەكەیان لێكراو وێكرا هەڵگێڕراوەتەوە.

**بڕگەی سێیەم**: ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴾، بەسەرماندا باراندن بەردێك كە لە قوڕی سووركراوەی ڕیز بەستوو بوو.

( مَّنضُودٍ )، واتە: ڕیز بەستوو.

پێشتر باسمان كرد، كە (سِجِّيلٍ)، وشەیەكی لە ئەسڵدا فارسییە، (سنگ گل)، دیارە (سنگ)، لە كوردییشدا بەكاردەهێنرێ، وە (گل) لە فارسیی دا، واتە: (قوڕ) بە كوردیی دەڵێین: (قوڕ)، دیارە زمانی فارسیی‌و كوردیی لە ڕیشەدا دەبنەوە بە یەك‌و، هیچ سەیر نیە كە فارسیی لە كوردییەوە وەرگیرابێ، كورد كاتی خۆی دەوڵەتیان هەبووە، فارس ئەوكاتە دەستەڵات‌و دەوڵەتیان نەبووە، بەڵام دوایی بە هەر حاڵ دەستەڵاتەكە كەوتۆتە دەست فارس‌و، كوردیش ئاوا بێ دەوڵەت‌و قەوارە كەوتوونە گۆڕێ، كە ئێستاش لەگەڵ دابێ جێی خۆیان نەگرتۆتەوە، بەڵام لەلای خوای پەروەردگار ئاسانە، ئاوڕێك لەو میللەتە كەساس‌و بێكەس‌و بێ قەوارەیە بداتەوەو، ئەویش وەك میللەتانی دنیا ببێتە خاوەن قەوارەو دەوڵەتی خۆی‌و، مافی چارەنووسی خۆی بەدەست خۆی بێ، لە هەموو بەشەكانی كوردستاندا.

بەڵێ: ( سِجِّيلٍ )، ئەسڵی خۆی (سنگ گل)بووە، بە عەرەبیی گوتوویانە (سنج جل)، دوایی تێكیاندا دەغم كردوەو بۆتە: ( سِجِّيلٍ )، ئەمە هەم (طبري) هێناویەتی، هەم (فخرالدين الرازي)یش‌و، هەموو تەفسیرەكان ئاماژەیان پێكردوە، بەڵام بەتایبەتی ئەوانە كە فارسییان زانیوە، وەك (طبري) كە فارس بووە، خەڵكی طبرستان بووە، (رازي) كە خەڵكی (ڕەی) بووە، كە شارێكە لە ئێران، چونكە ئەو ئێرانەی ئێستا هەمووی بۆتە شیعەستان، كاتی خۆی هەمووی ئەهلی سوننەت

بووە، ئیدی دوایی کە صەفەوییەکان هاتوون، ئەو گۆڕانکارییەیان بەسەر ئێراندا کردوە، سوننەیان نەهێشتوە، یاخود هەمووی چوونەتە چواردەوری ئێران، یاخود دەریان کردوون، یان کوشتوویانن، دوای صەفەوییەکان، ئەو گۆڕانەکارییە بەسەر ئێراندا هاتوە.

لە پەیمانی کۆندا (سِجِّيلِ)ی، ئاوا لێك داوەتەوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴾، دەڵێ: (كِبْرِتاً وَنَاراً)، گۆگردو ئاگر.

زانایان وایان لێك داوەتەوە، دەڵێن: (حَجَراً مَخْلُوطاً بطِينٍ)، بەردێکی تێکەڵکراو بە قوڕ، بەڵام لە ڕاستیدا وا ڕاستترە بڵێین: (طِينٍ مُتَحَجِّر)، واتە: قوڕێکی بوو بە بەرد، هەڵبەتە کاتێك قوڕیش دەبێتە بەرد، کە سوور بکرێتەوە، وەك خشتی سوور، کە ئەو کاتە جاری وایە لە بەردیش پتەوتر دەبێ، ئەو خانووە دێرینانەی کە لە خشتی سوور، دروستکراون، ئەگەر لە خانووە بەردینەکان خۆ ڕاگرترو بە دەوامتر نەبن، بێ دەوامتر نین.

(مَّنضُودٍ)یش، دەڵێ: (مُتَرَاكِب بَعْضُها فِي أثَرِ بَعْض)، هەندێکی بە دوای یەکدا، واتە: بە ڕیز، یاخود (مُتَرَاصِف)، یانی: بە ڕیز هاتوون.

**بڕگەی چوارەم** : ﴿ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ﴾، نیشانەدار کرابوون لەلایەن پەروەردگارتەوە، (المسومَةُ: الّتي لَها سِيما وَهِيَ العَلامَة)، (مُسومَة)، واتە: خاوەن نیشانە، نیشانەدار کرابوون. ئنجا هەندێك لە توێژەوەرانی قورئان دەڵێن: هەر بەردە ناوی کەسەکەی لەسەر نووسراوە، کە پێی دەفەوتێ! کە لە ڕاستییدا ئەوە پێویستی بە وەحی دەکات، تاکو بزانین ئایا ئەوە وایە؟ چونکە لە ڕێیەکی مسۆگەرو جێی دڵنیاییەوە نەبێ، ئەو وردەکارییە بە عەقڵو لەگۆترە دانانرێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو بەردانە نیشانەدار کراون، ڕەنگە نیشانە دارەکردنەکەیان ئەوەبێ کە پێشتر باسمان کردو ئێستاش شوێنەوارناسەکان دەڵێن: ئەو بەردانە هەیانە بەقەدەر نینۆکی پەنجەی گەورەیە و، هەیانە بەقەدەر هێلکەو، هەموویان جۆرێك سووتانیان بەسەردا هاتوە، تاکو پێنج هەزار (٥٠٠٠) پلەی گەرمیی دراونە بەر گەرمی، کە گەرمییەکی لە ڕادە بەدەر بووەو لەو گەرمییەدا سوورکراونەوە.

بڕگەی پێنجەم : ﴿ وَمَا هِىَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾، وە ئەو بەردانە، یاخود ئەو جۆرە سزاو بەڵایە، لە ستەمکارانیشەوە دوور نیە.

ستەمکارانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و، ستەمکارانی دوای ئەوو، هی ئێستاو، دوای ئێستاش، ئەمەش هەڕەشەیەکە واتە: خوا ﷻ کە بەو شێوە گەلی (لووط)ی سزادا، لەسەر کوفرو بە درۆ دانانی پێغەمبەرەکەیانو، ڕێگریی کردنیانو، ڕەوشت نزمییانو، خراپەکارییان.

ئەی گەلانی دنیا!

بزانن کە ئەو خوا باڵادەستە، کاربەجێیە، زاڵو بە توانایە، ئەو سزایەی دوور نیە لە ستەمکارانی ڕۆژگاری ئێوەشەوە، بۆیە با بترسێن کە هەمان بەڵایان بەسەربێ، مەرج نیە بەو شێوەیە، بە جۆرێکی دیکە کە هەرچەندە ئێستاش هێندێ شوێن ئاگر پڕێن (برکان)یان لێ ڕوودەداتو، هێندێکیان ڕۆ دەچنو، لافاو دەیانگرێ، ئێستاش کەمو زۆر لەو جۆرە بەڵایانە لە دنیادا هەر هەن.

ئنجا هەندێ لە زانایان گوتوویانە: چۆن دەبێ بفەرموێ : (وَمَا هِىَ )، دوایی بفەرموێ: ﴿ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾؟ دەبوو فەرمووبای: (وَمَا هِىَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدَةٍ)، دوور نیە لە ستەم کارانەوە، بەڵام زانایان دەڵێن: ئەو وەسفانەی لەسەر ئەو شێوەیەن، دەگونجێ بفەرموێ: (ببعیدة)، ئەگەر سیاقەکە بخوازێو، دەشگونجێ بفەرموێ: ( بِبَعِيدٍ )، وەك زەمەخشەریی دەڵێ: واتە: هەردوو لای تێدا دروستن، زانایانی زمان هەندێ وردەکارییان باسکردوون، کە ڕەنگە بۆ خەڵکی کورد زوبان زۆرجێی بەهرە نەبن، ئەگەرنا باسمان دەکردن.

لە سوورەتی (الذاریات)دا، خوا ﷻ ئاوا باسی چۆنیەتی دەربازکردنی ماڵی لووط دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: ئەو بڕوادارانەی کە لەوێدا هەبوون، (لەو

شارانەدا هەبوون، لەو ناوچەیەدا) دەربازمان کردن، بەڵام تەنیا ماڵێك لە مسوڵمانانمان لەوێدا بینی.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە جگە لە ماڵو خێزانەکەی خۆی، کەسی دیکە بڕوای بە لووط ﷺ نەهێناوە، چونکە دەفەرموێ: تەنیا یەك ماڵی مسوڵمانمان لەوێدا بینی، کە ئەویش ماڵی (لووط)بوو، دیارە باسی (کوڕان) ناکرێ بۆ لووط، بەڵام بێگومان کچی هەبوون، هەرچەندە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: لووط دوو کچی بوون، بەڵام بەتەئکید دووان زیاتر بوون، چونکە بە کۆ (جمع) باسکراون (بَنَاتِي)، دەگونجێ کوڕیشی بووبن، بەڵام لە قورئاندا باس نەکراوە، بەس بۆ پێشنیار کردنەکە کە دەڵێ: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي ﴾، باسی کچەکانی دەکات، کە ئەوەش شتێکی ئاساییەو تێکگیرانی نیە، لەگەڵ ئەوەدا کە لووط کوڕیشی بووبن، بەڵام دیارە ناڵێ: ئەوە کوڕەکانم! چونکە ئەگەر وا بڵێ لەگەڵ میوانەکاندا جیاوازییان چییە؟!

ئنجا لێرەدا پرسیارێك دەکرێ:

خوا لە شوێنێك دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾الحجر.

لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ : ﴿ وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم مَّطَرٗا ﴿٨٤﴾ ﴾الأعراف.

لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ : ﴿ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ﴿٥٣﴾ ﴾النجم.

لە شوێنی دی دا دەفەرموێ : ﴿ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ ﴾الحاقة.

ئایا ئەمە چۆنە؟

ماناو ڕای ڕاست ئەوەیە کە خوا ﷻ ـ وەك جاری دیکەش باسمان کردوە ـ بەم وشانە تەعبیر دەکات، لە کۆی ئەو بەڵایەی کە بەسەریان هاتوە، بۆ وێنە:

سووڕەتی (الحجر)دا ئاوا دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ

﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾﴾، واتـــە: لەگـــەڵ ڕۆژهەڵاتدا چریکەو دەنگێکی زەبەلاحو گەورە گرتنی، سەریانمان کرد خواریی، واتە: (هەڵمانگێڕایەوەو سەرەو بنمان کرد)و، بەردێکی لە قوڕی وشککراوەمان بەسەردا باراندن، لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کەسانێك کە عەقڵی خۆیان بەکاربێنن و، لە شت وردببنەوەو، ئەو شوێنە کە ئەو بەڵایەی بەسەر هات، لەسەر ڕێیەکە، کە ڕێیەکی بەردەوام هامووشۆی پێدایە، {کە پێشتر باسمان کرد، کە لە ئوردونە، شامەو، ئێستاش شوێنەکەی دەریای مردوویە}، لەو شوێنەوارەدا نیشانە هەیە بۆ بڕواداران.

یانی: لە کۆی بەڵایەکەیاندا، نیشانەی زۆر هەن، بۆ کەسانێك کە ورد ببنەوەو ڕابمێنن، لە کۆی ئەو بەڵایەی کە بەسەریان هاتوە، بەڵام لە خودی شوێنەوارەکەدا، نیشانە هەیە، یەك نیشانە هەیە بۆ بڕواداران.

کەواتە: مانایەکەیو کۆی ڕووداوەکە ئاوای لێدێتەوە : (صیحة) کە ئەو ژێرەوژوور بوونە، دەنگێکی گەورەی لێهاتوە، جا چ ئاگر پرژێنێك بووبێ، چ خوا ﷻ بە شێوەیەکی یاسادڕ (خارق العادة)، ئاوچەکانیانی بەرز کردبێتەوە، چونکە سووڕەتی (النجم) ئاماژە بەوە دەکات : ﴿وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾﴾، (مُؤْتَفِكَة)، واتە: ئەو شارانەی کە هەڵگێڕدرابوونەوە، بەریدانەوە، (أَهْوَىٰ)، یانی: (أَسْقَطَ)، خوای پەروەردگار بەریدانەوە، کەواتە: دەبێ بەرز کرابنەوە لە ئاستی زەوی، ئنجا دوایی بەردرابنەوە، بە سەرەوژێریش.

ئنجا لە ئەنجامی ئەو بەردرانەوەیەدا، بە تەئکید دەنگێکی گەورە پەیدا دەبێ و، هەڵگێڕانەوەکەش، هەر لەو کاتەدا بووە.

پاشان هەر بەردیشی بەسەردا باراندوون، کە دوور نیە هەر ئەو شوێنەی خۆیان کە خوای باڵادەست بە جۆرێك ئاگرێکی تێبەردابێ و، وە ئاگر پرژێنێکی لێ پەیدا بووبێ، ئاگر پرژێنەکان دەبینین، ئێستاش لەسەر ڕووی زەوی کە پەیدا دەبن، کە ئاگرو ئاسن و بەردی تواوە، هەڵدەدەن بۆ سەرێ، وە دوایی وەك باران دەبارێتەوە، کە ئەوە زۆر دیمەنێکی بەرچاوە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا، زۆر بەڕوونیی دیارە.

وشەی (تَوَسُّم)، کە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾الحجر، دەڵێ: (التَوَسُّمُ: التَفَرّس والفِراسة، تَفَرَّست فِيهِ خَيْراً وَهو يَتَفرّس أي: يَتَثَبَّتُ وَيَنْظُرُ، وَرَجُلٌ فَارِسُ النَّظَرِ وَفِي الحَدِيث: اتَّقُوا فِرَاسة المؤْمِنَ)[1]، واتە: (توسّم)، واتە: (تَفَرّس)، (تَفَرّس)یش، ئەوەیە تۆ تەماشای شتێك بكەیو بە نیشانەكانی لێی تێبگەی، (تَفَرَّست فِيهِ خَيْرَاً)، واتە: كە تەماشام كرد، خێرم تێدابینی، دەگوترێ: (يَتَفَرّس)، واتە: چاوی چاك لەسەر دەچەسپێنێو تەماشای دەكات، (وَرَجُلٌ فَارِسُ النَّظَرِ)، پیاوێك زۆر چاك لە شت ورد دەبێتەوەو تێی دەگاتو، لە فەرموودەدا هاتوە: {اتَّقُوا فِرَاسة المؤْمِنِ}[2]، واتە: خۆتان لە ڕوانینی وردو تیژی بڕوادار بپارێزن، كە مەرج نیە تەنیا ڕواڵەتەكەتان ببینێ، جاری وایە خوای پەروەردگار هەندێ شتی دیكەش كە لە پەنهانی ئینساندا هەیە، پێشانی دەدات.

---

١) مختار الصحاح، ص ٥٧١.

٢) رُوِيَ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ، وَأَبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ، وَأَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ وَثَوْبَانَ. هَذَا حَدِيث لا يَصِحُّ عَنْ رَسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلم كَمَا قَالَ إِبْنُ الجوزي. أَمَا حَدِيثُ ابْنُ عُمَر فَفِيهِ الْفُرَاتُ بْنُ السائِبِ. فُرَاتُ بْنُ السائِبِ ضَعَّفَهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَابْنُ مَعِينٍ، وَابْنُ حِبانَ، وَالدَّارَقُطْنِيُّ، وَغَيْرُهُمْ، وَقَالَ الْبُخَارِيُّ: مُنْكر الْحَدِيثِ، وَقَالَ أَبُو حَاتِمٍ الرازِي: كَانَ كَذَّابا. أَما حَدِيثُ أَبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ فَإِنَّهُ تَفَرَّدَ بِهِ مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ قَيْسٍ. ضَعَّفَهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَقَالَ خَرَقْنَا حَدِيثَه، وَقَالَ عَلِي بْن المدِينِي: كَتَبْنَا عَنْهُ عَجَائِب وَخَطَطت عَلَى حَدِيثِهِ وَضَعَّفَهُ جِداً، وَقَالَ الْبُخَارِيُّ: مُنْكر الْحَدِيثِ، وَأَما حَدِيثُ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ فَفِيهِ عَبْدُ اللّه بْنُ صَالِحٍ وَهُوَ كَاتِبُ اللَّيْثِ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: لَيْسَ هُوَ بِشيءٍ، وَقَالَ ابْنُ حِبانَ: يَرْوِي عَنِ الثِّقَاتِ مَا لَيْسَ مِنْ حَدِيث الإِثْبَاتِ. وَأَما حَدِيث أَبِي هُرَيرَة فَإِنَّ أَبا مُعَاذ هُوَ سُلَيْمان بْن أَرْقَم. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ وَإِبْنُ مَعِينٍ: لَيْسَ بِشيءٍ. وَقَالَ البُخَارِيُّ وَأَبُو دَاوُدَ وَالنَّسَائِيُّ وَالدَّارَقُطْنِي: مَتْرُوكٌ. وَقَالَ ابْنُ حِبانَ: يَرْوِي عَنِ الثِّقَاتِ الموْضُوعَاتِ، وَأَما حَدِيث ثَوْبان، فِيهِ سُلَيْمان بْنُ سَلْمة مُنْكر الْحَدِيثِ.

## پووچەڵکردنەوەی چەند بۆچوونێك لەبارەی فەوتانی گەلی لووطەوە

چەند شتێك باسکراون، دەربارەی چۆنیەتی فەوتێنرانی گەلی لووط، کە یان جێی گومانن، یاخود هەڵەو ناڕاستن:

١) یەکێك لەوانە دەڵێن: شارەکانی گەلی لووط بەرز کرانەوە بۆ ئاسمان و، جیبریل باڵێکی لەبن ناوچەکەیان ڕاکرد، پاشان بەرزی کردنەوە بۆ ئاسمان، تاکو ئەهلی ئاسمان گوێیان لە زەڕەی کەرو، بارەی بزن و، مەڕو، بۆڕەی مانگاو، وەڕەی سەگو ... هتد بوو، بەڵام موحەممەد ڕەشید ڕەزا لەوبارەوە قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: ئێستا دەرکەوتوە ئەگەر بێت و خەڵك زۆر بەرەو سەرێ بچێ، لە سەرێ هەوای لێ نیە، ئۆکسجین نیە، تاکو بژین، کەواتە: ئەو خەڵك و ژیاندارو ئاژەڵانە چۆن ژیاون؟ بۆیە ئەوە قسەیەکە، پشت ئەستوور نیە بە هیچ بەڵگەیەك، بەڵێ بێگومان بەرز کراونەوە، بەڵام چەند بەرز کراونەوە؟ چۆن بەرز کراونەوە؟ جیبریل باڵی لە بن ڕاکردوون، یاخود خوا ﷻ بەرزی کردوونەوە بە شێوەیەك لە شێوەکان؟ ئێمە نازانین چۆن بەرزی کردوونەوە، بەڵام بە تەئکید بەرز کردنەوەکەیان، پاشان بەردرانەوەیان، ئایەتەکان زۆر بە ڕوونیی دەیگەیەنن .

٢) یەکێکی دیکە: لە پەیمانی کۆندا هاتوە، کە ئەویش زۆر عەقڵ نایگرێ، دەڵێ : ژمارەی ئەو خەڵکە چوار هەزار هەزار (٤٠٠٠,٠٠٠) کەس بوون، واتە: چوار ملیۆن کەس، کە بێگومان چوار ملیۆن کەس، بۆ ناوچەیەکی بچووکی، وەك ئەو چوار پێنج شارە، زۆر زۆرە، ئەوەش زیدەڕۆیی خاوەن کتێبەکانە.

٣) شتێکی دیکە کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، دەربارەی گوناهی دوو کچەکەی لووط، جارێ وەك گوتمان: ئەسڵەن دووان نەبوون، سێ، یاخود زیاتر بوون، بە پێی ئایەتەکان، ئنجا ئەوەش شتێکی زۆر بێجێیە، پاڵی دەداتە لای ئەو دوو کچانەی (لوط)و لووط ﷺیش کە دەڵێ :

(فَلَجأَ هو وابْنَتاهُ إلى كَهْفٍ هُناكَ، فَقَالَتِ الإبْنَةُ الكُبْرَى إبْنَةُ البِكر لأُخْتِهِ الصَّغِيرَة: إنَّ أَبانا قَدْ شاخَ، ولَيْسَ فِي الأَرْضِ حولَنا رَجُلٌ يَتَزَوَّجُنا، كَعَادَةِ كُلِّ النَاس، فَتَعَالِي نَسْقِيهِ خَمْراً وَنضْطَجِعُ مَعَهُ، فَلاَ تَنْقَطِعُ ذُرِيةُ أَبِيْنا)[1].

واتە: لووط ﷺ خۆیو دوو كچەكەی دوور لەو شوێنە پەنایان بردە بەر ئەشكەوتێك، ئنجا كچە گەورەكە، كچە یەكەمەكە بە خوشكە گچكەكەی گوت: بابمان كەوتۆتە تەمەنەوەو، لەسەر زەویشدا، (واتە: لەو سەرزەمینەی ئەوان)، پیاوێك نیە ئێمە بێنێو هاوسەرگیریمان لەگەڵدا بكات، وەرە با شەراب بدەین بە بابمانو، لەگەڵی بنووین، (یانی: لەگەڵی جووت بین)، بۆ ئەوەی وەچەی بابمان نەبڕێتەوە!

ئنجا دیارە لە درێژەی قسەكانی پەیمانی كۆندا، كە هەمووم نەهێنا، دەڵێ: پێشێ خوشكە گەورەكەی لەگەڵی دەخەوێ، دوای ئەوەی شەراب دەداتە بابی، بەبێئەوەی كە بابی پێی بزانێ، دوایش دوای ماوەیەكی دیكە {كە دەبێ ئەویان منداڵی بووبێ}، ئنجا خوشكە گچكەكەشی لەگەڵی دەخەوێ، دوای ئەوەی كە بابیان سەرخۆش دەكەن، دوایش بابیان دەڵێ: ئەوە چۆن ئەوەتان كردوە؟ لێیان تووڕە دەبێ، بەڵام دەڵێن: بۆیە وامانكرد، بۆئەوەی وەچەی تۆ نەبڕێتەوە.

دوایش لە پەیمانی كۆندا لە تەوراتدا باس دەكات، ناوی دوو گەل (قوم) دێنی، دەڵێ: ئێستا ئەو دوو گەل (قوم)ە لە وەچەی ئەو دوو كچەن!!

كە ئەوە شتێكی زۆر زۆر بێجێیەو، بە ڕاستیی شتی وا لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ناوەشێتەوەو، لە كچانی پێغەمبەرانیش ناوەشێتەوە، ئیدی تەورات لەو شتە پڕو پووچانەی زۆر تێ ئاخنراون، كە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ پاكییو بەرزیی پێغەمبەرانو، ماڵو خێزانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)دا ناگونجێن.

سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح : ١٩، ص ٥٢، ٥٣.

# دەرسی هەشتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا دوازدە (١٢) ئایەت کە ئایەتەکانی (٨٤ ـ ٩٥)ن، تەفسیر دەکەین، کە تێیاندا بەسەرهاتی پێغەمبەر شوعەیب ﷺ و گەلەکەی (مەدیەن)، باسکراوەو، ئەو بەسەرهاتە، ئێمە سەرجەم دابەشی دەکەین، بۆ شەش بڕگەدا:

**بڕگەی یەکەم** : باسی ناردنی شوعەیب ﷺ بۆ گەلی مەدیەنو، فەرمانکردنی پێیان، بە خواپەرستییو، خۆ پاراستن لە ناپاکیی، لە پێوانو کێشانداو، تەرازوو بازییو فرتو فێڵ لە پێوانو لە کێشاندا، واتە: خۆپاراستن لە ناپاکیی لە مامەڵەی بازرگانیی دا.

ئنجا فەرمانکردنی بەوە کە بە دادگەرانە پێوانو کێشان ئەنجام بدەنو، شتی خەڵك بە کەم نەگرنو، خراپەکاریی نەکەنو، قەناعەت بکەن بەو کەمو پوختە حەڵاڵەی، کە خوای پەروەردگار لە ئەنجامی کارو کەسابەتی سەر ڕاستانەو حەڵاڵو زەڵاڵدا بۆیان دەهێڵێتەوەو، دێتە دەستیان، ئەمە لە ئایەتەکانی: (٨٤ و ٨٥ و ٨٦)دا خراوەتە ڕوو.

**بڕگەی دووەم** : بەرپەرچدانەوەی گەلەکەی بە گاڵتە پێکردنەوە، کە چۆن ڕێی بت پەرستییو، بە کەیفی خۆ تەصەڕوف کردن، لەماڵو سامانیاندا، لێدەگرێو، بە توانجو بە تەوسەوەو، بە هێدییو عاقڵمەندو سەر ڕاست وەسف کردنی شوعەیب، کە مەبەستیان پێی پێچەوانەکەی بووە، ئەمەش لە ئایەتی : (٨٧)دا هاتوە.

**بڕگەی سێیەم** : وەڵامدانەوەی شوعەیب ﷺ، واتە: وەڵامی گەلەکەی دەداتەوە، کە لە لایەن پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگەیە، بەرچاو ڕوونەو، خوای پەروەردگار

بژیوو، رزق‌و رۆزییەکی باشیشی پێداوەو، چاوی لە ماڵی ئەوان نیەو، نابێتە بارگرانیی بۆیان‌و، ناشیەوێ پێچەوانەی قسەکانی رەفتار بکات، واتە: شتێکیان پێ ناڵێ، بڵێ: مەیکەن، دوای خۆی بیکات، تەنیا چاکسازییەکی گشتگیرو ریشەیی مەبەستە، پشتیشی تەنیا بە خوا بەستوەو، کار ئاسانیی تەنیا لە خوا داوا دەکات، ئنجا ئامۆژگاریی کردنی بۆیان کە بە هۆی سەرپێچیی کردنی ئەوەوە، خۆیان بە مەرەدی گەلانی (نووح‌و هوودو صالح‌و لووط) نەبەن، واتە: ئەو بەلایانەی کە بەسەر ئەوان هاتوون، ئەوانیش ئەو بەلایانە بەسەر خۆیان نەهێنن‌و، داوای لێبوردن لە خوا بکەن‌و، وە بۆ لای خوا بگەرێنەوە، بێگومان خوا ﷻ خاوەن بەزەیی بێسنوورەو، بەندە پابەندەکانی، بەندە بۆ لا گەراوەکانی خۆی، خۆشدەوێن، ئەمەش لە ئایەتەکانی: (٨٨ و ٨٩ و ٩٠) دا خراوەتەروو.

**برگەی چوارەم :** وەڵامدانەوەی گەلەکەی، کە گوایە لە زۆرێك لە قسەکانی تێناگەن‌و، ئەگەر لەبەر خزمەکانی نەبووایە، بەردبارانیشیان دەکردو، لە پێش چاوی ئەوان پیاوێکی بێدەسەلاتەو، هیچ تواناو دەسەلاتێکی پێوە شك نابەن، بەلام لەبەر خاتری خزمەکانی کە لەگەڵ خۆیاندا هاوراو هاو عەقیدەن، بۆیە دەستی بۆ نابەن، ئەمەش لە ئایەتی: (٩١) داهاتوە.

**برگەی پێنجەم :** توورەبوونی شوعەیب عليه السلام لەسەر خواو، بێمنەتیی دەربرینی بەرانبەریان‌و، ئاگادار کردنەوەی بۆیان، کە با لە چاوەروانیی سزای خوا دابن، ئەویش چاوەرێییە، ئەوەش لە ئایەتەکانی: (٩٢ و ٩٣)دا هاتوە.

**برگەی شەشەم :** هاتنی سزای خوا ﷻ کە چریکەو دەنگو نەعرەتەیەکی زۆر گەورەو بێرەزا بووەو، رزگاربوونی شوعەیب عليه السلام و شوێنکەوتووانی، خوا لێیان رازی بێ‌و، دەربازبوونیان لەو بەلایەو، لەگەڵ زەویدا یەکسانبوونی گەلە بێبروایەکەی، وەك چۆن باڵندە هەڵدەنیشن، ئاوا ئەوانیش بە زەوییەوە نووساون‌و، لەگەڵ زەویدا تەخت‌و یەکسان بوون، ئەوەش لە ئایەتەکانی: (٩٤ و ٩٥)دا هاتوە.

﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ
وَلَا تَنقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ ۚ إِنِّي أَرَاكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ
عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَا قَوْمِ أَوْفُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ ۖ وَلَا
تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ اللَّهِ
خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَا أَنَا عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾ قَالُوا يَا شُعَيْبُ
أَصَلَاتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ ۖ
إِنَّكَ لَأَنتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي
وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ
إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ وَيَا قَوْمِ
لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِي أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَا أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَالِحٍ ۚ
وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ ﴿٨٩﴾ وَاسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّي
رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴿٩٠﴾ قَالُوا يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ
وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ ۖ وَمَا أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ قَالَ يَا قَوْمِ أَرَهْطِي أَعَزُّ عَلَيْكُم
مِّنَ اللَّهِ وَاتَّخَذْتُمُوهُ وَرَاءَكُمْ ظِهْرِيًّا ۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٩٢﴾ وَيَا قَوْمِ
اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ ۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ
وَمَنْ هُوَ كَاذِبٌ ۖ وَارْتَقِبُوا إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا
شُعَيْبًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي
دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَا ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾﴾.

# مانــای وشـــه به وشــەی ئایەتەکــان

{ بۆ لای (گەلی) مەدیەن، شوعەیبی برایانمان (نارد)، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، (شیاوی پەرستران بێ)و، لە پێوانو کێشاندا کەمکاریی مەکەن، من (لە ڕووی گوزەرانەوە) بە باشتان دەبینم، (پێویستییتان بە دزیی و فزیی نیە)و، من ترسی سزاو ئازاری ڕۆژێکی دەورەدەرم لێتان هەیە (سزایەك کە ئابڵووقەتان بدا) ﴿٨٤﴾ ئەی گەلەکەم! با پێوانو کێشانتان تێرو تەواوو دادگەرانە بێ‌و، لە شتەکانی خەڵك کەم مەکەن‌و، خراپەکارانە تێکدان لە زەمیندا مەکەن ﴿٨٥﴾ ئەگەر بڕوادار بن، کەم‌و پوختی خوا (سامانی حەڵاڵ کە لە مامەڵەی دروست پێتان دەبڕێ)، باشترە (لە حەرامی زۆرو بۆر)و منیش پارێزەر نیم بەسەرتانەوە ﴿٨٦﴾ (گەلەکەی) گوتیان: ئەی شوعەیب! ئایا نوێژو خوا پەرستییەکەت فەرمانت پێ دەکات، کە ئەوەی باب‌و باپیرانمان دەیانپەرست، وازی لێبێنین، یان (واز لەوە بێنین) کە چۆنمان دەوێ لە بواری مامەڵە لەگەڵ سامانەکانماندا، وا بکەین؟ بە دڵنیایی تۆ زۆر ژیرو هێدیی‌و سەر ڕاستی! ﴿٨٧﴾ (شوعەیب) گوتی: ئەی گەلەکەم! هەواڵم پێبدەن، ئایا ئەگەر من لە لایەن پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشن بم‌و، لە لایەن خۆیەوە بژیوێکی باشی پێدابم، (چاوم لە دەستی ئێوە نەبێ)و، ناشمەوێ ئەوەی پێشگیریی ئێوەی لێ دەکەم، خۆم بیکەم، (چۆن عەقڵ‌و ویژدانتان ڕێتان پێدەدا کە بە قسەم نەکەن)، بەس مەبەستم چاکسازییە هەتا بتوانم‌و، کار بۆ ئاسانبوونم بەس بە خوایە، پشتم بەس بەو بەستووە، تەنیا بۆ لای ویش لە ناخەوە دەگەڕێمەوە ﴿٨٨﴾ ئەی گەلەکەم! با ناکۆکییتان لەگەڵم، (وە سەرپێچییتان بۆم)، واتان لێنەکات، هەمان بەڵاتان بەسەربێ، کە بەسەر گەلی نووح، یان گەلی هوود، یان گەلی صالح هات‌و، گەلی لووطیش، لێتانەوە دوور نین، (لە ڕووی کات‌و شوێن‌و ڕەچەڵەکەوە)

﴿٨٩﴾ داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، ئنجا بگەڕێنەوە بۆ لای، بە دڵنیایی پەروەردگارم میهرەبانی خۆشویستەرە (بۆ بەندە فەرمانبەرەکانی) ﴿٩٠﴾ (گەلەکەی) گوتیان: ئەی شوعەیب! لە زۆرێك لەوەی دەیڵێی، حاڵی نابین‌و، مسۆگەر ئێمە لە نێو خۆماندا، بە بێهێزت دەزانین‌و، ئەگەر کۆمەڵە (خزمە)کەت نەبووایە، بەردبارانمان دەکردی‌و، تۆ لە لامان باڵادەست نی ﴿٩١﴾ (شوعەیب) گوتی: ئەی گەلەکەم! ئایا کۆمەڵە (خزمە)کەم لە لاتان لە خوا باڵا دەستترن؟ کە پشتیشتان تێکردوە! بێگومان پەروەردگارم دەورەدەری کردەوەکانتانە، (ئابڵووقەی خۆتان‌و کردەوەکانتانی داوە) ﴿٩٢﴾ ئەی گەلەکەم! هەرچی لە دەستتان دێ بیکەن، منیش بکەرم (بۆئەوەی کە فەرمانم پێکراوە)، لەمەولا دەزانن، (بۆتان دەردەکەوێ) کێ سزایەکی بۆ دێ، زەبوونی دەکات‌و، دەزانن کێ درۆکەرەو، چاوەڕێ بکەن، منیش لەگەڵتاندا چاودێرم (وچاوەڕێم) ﴿٩٣﴾ ئنجا کاتێك فەرمانمان هات، (بە بنبڕکردنی گەلی مەدیەن)، شوعەیب‌و ئەوانەی لەگەڵیدا بڕوایان هێنا بوو، بە بەزەییەك (ی تایبەت) لە لایەن خۆمانەوە ڕزگارمان کردن‌و، ئەوانەی ستەمیان کرد بوو، چریکە (دەنگێکی بێڕەزا) گرتنی‌و لە ماڵەکانی خۆیاندا تەخت بوون‌و، لەپەوڕوو کەوتن ﴿٩٤﴾ (وا قڕەبڕ بوون)، وەك هەرگیز لەو شوێنەدا نەمابنەوەو، نەژیابن ئەها (ئاگادار بن!) دووریی (لە ڕەحمەتی خوا) بۆ (گەلی) مەدیەن، وەك چۆن گەلی (ثەموود) دوورخرانەوە (لە بەزەیی خوا) ﴿٩٥﴾ }.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( وَلَا تَنقُصُوا ): (النَّقْصُ: الخُسْرَانُ فِي الحَظِّ، وَالنُّقْصَانُ: المصْدَرُ، وَنَقَصْتُهُ فَهو مَنْقُوص)، (نَقْص): بریتییە لەوەی پشكو بەشی كەسێك كەم بكرێتەوەو، (نُقْصَان)، چاوگە، دەگوترێ: (نَقَصْتُهُ فَهو مَنْقُوص)، ئەوە ناوە، یانی: كەمو كورتە، (نُقْصَان)یش، واتە: كەم، لێ كەم كردنەوە.

( ٱلْمِكْيَالَ ): واتە: ئەو شتەی پێی دەپێورێ، (ما يُكَالُ بِهِ، الجَمْعُ مَكَاييل، كِلْتُ لَهُ الطَّعَامَ وَكِلْتُهُ الطَّعَامَ، والكيلُ ما يُكَالُ بِهِ)، (مِكيال): ئەو شتەیە كە شتی پێ دەپێورێ، (وەك: ڕبە، تەنەكە، تەغار)، كۆیەكەی (مَكَاييل)ە، دەگوترێ: (كِلْتُ لَهُ الطَّعَامَ، وَكِلْتُهُ الطَّعَامَ)، هەردووكیان، واتە: خواردنەكەم بۆ پێوا، (كیل)یش، وەك (مِكيال): هەر ئامرازی شت پێ پێوانە.

( وَٱلْمِيزَانَ ): واتە: تەرازوو، (الوَزْنُ: مَعْرِفَةُ قَدْرِ الشيءِ، وَزَنْتُهُ، وَزْنا)، (الميزَانُ الآلَة تُوْزَنُ بهِ الأَشياء وَالسَّنْجة)، (وَزْن): واتە: زانینی كێشی شتێك، یاخود بە ئەندازەی شتێك، دەگوترێ: (وَزَنْتُهُ، وَزْنا)، واتە: ئەو شتەم كێشا، (مِيزَان)یش، ئەو ئامرازەیە، كە شتی پێ دەپێورێ، هەروەها بە سەنگ دەگوترێ، {ئەگەر كیلۆیە، ئەگەر نیو كیلۆیە، ئەگەر هۆقەیە، واتە: چوار كیلۆ، (سنجة)، لە سەنگی فارسییەوە هاتوە، (سەنگ)}، ئەوەی كە دەخرێتە تای تەرازوویەكەوە، دواییش ئەو شتەی كە دەویسترێ بكێشرێ، دەخرێتە تا تەرازووەكەی دیكەوە، ئنجا ئەگەر كیلۆیەكە دەگوترێ: كیلۆیەك برنجەو، ئەگەر دوو كیلۆیە، ئەگەر هۆقەیەكە واتە: چوار كیلۆ، ئەگەر زیاترە، سەنگەكە دەخرێتە لایەكەوە، شتەكەش كە دەویسترێ بكێشرێ، دەخرێتە لایەكی دیكەوە، كە ئێستا چەندان جۆرە تەرازووی

پەرەسەندوو پەیدا بوون، كە پێویستیی بەوە نیە دوو تای تەرازوو بێ، بەڵكو شتەكەی لەسەر دادەنرێ‌و، بە پلە دیاریی دەكات كە چەندە.

( بِٱلْقِسْطِ ): (القِسْطُ: النَّصِيبُ بالعَدْلِ، كالنَّصَفِ وَالنَّصَفَةِ)، وشەی (قِسْط)، بریتیە لە پشكێك كە بە دادگەرانە دانرابێ، وەك: (نَصَف) و (نَصَفَة)، واتە: دادگەرانە.

( وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ): واتە: شتی خەڵك بە كەم مەگرن، بە كەم تەماشای مەكەن، لێی كەم مەكەنەوە، لێی دامەشكێنن، لەبەر چاوی مەخەن، (البَخْسُ: نَقْصُ الشيءِ عَلَى سَبِيلِ الظُّلم)، (بَخْس): بریتیە لەوەی لە شتێك كەم بكەیەوە، بە شێوەیەكی ستەمكارانە، (والبَخْسُ وَالباخِسُ: الشيءُ الطَّفِيف الناقِص، وَقِيلَ: بَخْس أي: مَبْخُوس وَمَنْقُوص)، (بَخْس) و (باخِس)، واتە: شتێكی كەمی ناتەواو، دەگوترێ: (بَخْس)، بە مانای (مَبْخُوس)، واتە: شتێك كە لێی كەم بكرێتەوە.

( وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ): واتە: خراپەكارانە لە زەوییدا تێكدان مەكەن، (العَيْثُ: وَالعَثِيّ يَتَقَارَبانِ نَحو جَذَب وَجَبَذ، العَيْثُ: حِسّاً وَالعَثِي: حُكْماً، عَثِيَ يَعْثَى عِثِيّاً، وَعَثَى يَعْثُو عُثُوّاً)، وشەی (عَيْث) و (عَثِي)، مانایەكەیان لە یەك نیزیكە، وەك (جَذْب) و (جَبذ)، هەردووكیان بە مانای ڕاكێشان دێن، وشەی (عَيْث)، بریتیە لە خراپەكارییەك كە بەرهەستو بەرچاو بێ‌و، (عَثِي)، بریتیە لە خراپەكارییەكی حوكمیی‌و مەعنەویی، دەگوترێ: (عَثِي): واتە خراپە كردن، دەگوترێ: (عَثَى يَعْثُو عُثوّاً)، یانی: خراپەی كرد، خراپە دەكات، خراپە كردن.

( بَقِيَّتُ ٱللَّهِ ): (بَقِية): واتە: شتێك كە ماوەتەوە، عادەت وایە خەڵك شتی باش دەهێڵێتەوەو هەڵیدەگرێ، شتی دیكە بەڕێ دەكات، كەواتە: ( بَقِيَّتُ ٱللَّهِ ): واتە: شتی پوختو ڕێك، شتی باش، (بَقِية الله: الإِضافَةِ للتَشْرِيفِ، مِثْل: بَيْت الله،

وَناقَـةُ الله)، ئەوە کـە پاڵ دراوەتە لای خوا بۆ شـەرەفو رێـزە، وەك مـاڵـی خـوا، حوشـتـری خـوا، ئەگـەرنـا هەمـوو شـتەکان هەر هـی خوان، ئنجا (بَقِي مِنَ الشـيءِ بَقِيـة)، دەگـوترێ لـەو شـتە هـەندێکی لـێ مـاوەتەوە، وەك گـوتم خـەڵك عـادەتیان وابـووە، شتی باشیان هـەڵگرتوە، بۆیە لێرە دەڵێ: (ما ادُّخِرَ عِنْدَ الله مِنَ الثَّوَاب)، ئەوەی کـە لـە لای خـوا هـەڵگیـراوە لـە پاداشت، هـەندێکیان وایـان لـێکـداوەتەوە، بەڵام پێشتـر باسـم کـرد مەبەست پێی ئەو رزقـە کەمو پوختـەیە، کە لـە ئەنجامی کارو کـەسابـەتی حـەڵاڵو سـەر راسـتـانەدا، دەست مرۆڤ دەکـەوێ، ئـا ئـەو کـەمو پوختو چاکە، باشـتـرە لـە حـەرامی زۆرو بـۆر.

(ٱلْحَلِيمُ ): (الحِلم: ضَبْطُ النَّفْسِ وَالطَّبْعِ عِنْد هَيَجانِ الغَضَبِ، جَمْعُهُ أَحْلاَم وَالحِلم لَيْسَ هو العَقْلُ، وَلَكِنّهُ مِنْ مُسَبَّبَاتِهِ)، (حَلِيم): بریتیە لە خۆ کۆنتـرۆڵ کـردنو خـۆ گرتنـەوە لـە کـاتی هـەڵچوونی توڕەییـدا، کـۆی (حِلـم)، (أَحْلاَم)ە، (حِلـم)، بـە مـانای عەقڵ نیە، هـەرچـەندە وا لـێکدراوەتەوە، بـەڵکو لە بەرەنجامو دەرهاویشتەکانی عەقڵە، ئینسانی عاقڵ، هێدییو مەندە، (حِلم)، واتە: هێدییو مەندیی، بـەڵام دیارە خـوازراویشـەتەوە بۆ خـاوەن عـەقـڵ، (حليم)، واتـە: خـاوەن عـەقـڵ، (حِلـم)، واتـە: عەقـڵو تێگەیشـتنو فـامیـدەیی، وەك لـە فەرمـایشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـوە: {لِيَلِيَنِي مِنْكُمْ أُولُوا الأَحْلامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شيبة، برقم: (٣٥٢٧)، وَأَحْمَد، برقم: (١٧١٤٣)، وَمُسْلِم، برقم: (٤٣٢)، وَابْنُ حِبانَ، برقم: (٢١٧٢) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ}.

واتـە: با ئەوانەتـان کـە خـاوەنی عەقڵو تێگەیشتنی زیاترن (لە ڕیزی نوێژدا) لە منەوە نیزیکتـربن، دوایـی ئەوانەی دوای وان، دوایی ئەوانەی دوای وان.

(ٱلرَّشِيدُ ): (الرُّشْدُ: خِلاَفُ الغَيِّ، وَهـو نَتِيجـة الـهُدَى، كَمـا أَنَّ الغَـيَّ نَتِيجـة الضَّلاَل)، زۆر لـە مانـا لێکدەرەوانی وشـەکانی قـورئـانو زمـانی عەرەبیی، وشـەی (رُشْد)، لـەگەڵ (هُدَى)و (ضَلاَل)، لـەگـەڵ (غَيّ)، تێکـەڵ دەکـەن، کـە لـە ڕاستییدا وانیەو، ئەگەر ئینسان باش ورد بێتەوە: تێدەگات کە (رُشد)، پێچەوانەی (غَيّ)یـە، (رُشْـد)، واتە: سـەر ڕاستییو بـە ئـامانج گـەیشتنو بـە مراد گـەیشتن، بەڵام (غَيّ)،

واتە: ڕێ پێ نەزانینو سەرگەردان بوونو بێئاکامییو بێمرادیی، جا لە ئەنجامی (هُدی)دا، (رُشْد) پەیدا دەبێ، ئینسان ئەگەر بە ڕێی زانی، دیارە دەگاتە ئامانجو، لە ئەنجامی (ضَلال)دا، گومڕاییو لە ڕێ ون بوون دا، (غَيّ)و (غِوَايَة) پەیدا دەبێ، واتە: سەرگەردانو بێمراد دەبێ، بە ئامانج ناگات.

(أُخَالِفَكُمْ ): (خَالَفَهُ فِي الأَمْرِ: قَصَدَهُ بَعْدَمَا نَهَاهُ عَنْهُ)، (خَالَفَهُ فِي الأَمْرِ)، ئەومیە کە تۆ بە کەسێك بڵێی: شتێك مەکە، دوایی بۆخۆت بیکەی، واتە: ڕووی تێکرد، دوای ئەوەی کە لێی قەدەغە کرد بوو، دەگوترێ: (خَالَفَ عَنِ الأَمْرِ، أَي: خَرَجَ)، واتە: لەو فەرمانە دەرچوو.

(وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِ): واتە: کار ئاسانییم تەنیا بە خوایە، (التَّوْفِيقُ مِنَ اللهِ: سَدّ طَرِيقِ الشَّرِّ وَتَسهِيل طَرِيق الخَيْر)، (تَوْفِيق): بریتیە لەوە کە بەربەست لەبەردەم خراپەدا دابنرێو، ئاسانکاریی بۆ چاکە بکرێ، ئنجا ئینسان ئەگەر خراپەی تووش نەبووو، چاکەشی بۆ ئاسان بوو، کەواتە: ئەوە (توفیق)ی خوایە، واتە: بەپێی ئەوەی کە تۆ دەتەوێ، کارەکانت ئاوا بۆ ئەنجام بدرێن، کە ئەوە تەنیا بە خوا دەکرێ.

( لَا يَجْرِمَنَّكُمْ ): واتە: با واتان لێ نەکات، (لا يَكْسِبَنَّكُم)، یان (لا يَحْمِلَنَّكُم)، با واتان لێ نەکات، (جَرَمَ يَجْرِمُ جُرْمَا: أَذْنَبَ، وَجَرَمَ الرَّجُلَ: أَكْسَبَهُ جُرْمَاً)، (جَرَمَ يَجْرِمُ جُرْمَاً)، واتە: گوناهی کرد، تاوانی کردو، (جَرَمَ الرَّجُلَ: أَكْسَبَهُ جُرْما)، واتە: وایکرد کە گوناح بکات، کەواتە: ( لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِيٓ )، واتە: با ناکۆکییتان لەگەڵ من، سەرپێچییتان بۆ من، واتان لێ نەکات: ئەو بەڵایەتان بەسەر بێ، کە بەسەر گەلە پێشووەکان هاتوە.

( شِقَاقِيٓ )، (شاقَّهُ: خَالَفَهُ وَعَادَاهُ، الشِّقَاق وَالمشاقَّةُ: الخِلافُ وَالعَدَاوَةُ)، (شاقَّهُ)، واتە: پێچەوانەی ئەوی کردو، دژایەتیی کرد، (الشِّقَاق وَالمشاقَّةُ)، بریتیە لە ناکۆکییو دژایەتیی کردن.

(وَدُودٌ ): (الودُّ: مَحَبة الشيءِ وَتَمَنِّي كونِهِ، الوَدُودُ: المحِبّ)، وشەی (ود) بریتیە لە خۆشویستنی شتێكو، خۆزگە پێ خواستنی، (خۆزگە بخوازی، بۆت پەیدا ببێ)، (وَدُودٌ )یش، (المحِبّ)، واتە: خۆشویستەر.

(مَانَفْقَهُ ): واتە: تێناگەین، (الفِقْهُ: هو التوَصُّلُ بعْلم شاهِدٍ إلى عِلم غائِبٍ، فَهو أخَصّ مِنَ العِلم: أوْ فَهْمُ مُرَادِ المتَكَلم)، (فِقْه)، بریتیە لەوە كە بەهۆی زانیارییەك كە دەیزانی، بگەیە زانیارییەك كە نایزانی، كەواتە: لە زانیاریی تایبەتتر، هەروەها گوتراوە: (الفِقْهُ: فَهْمُ مُرَادِ المتَكَلِّم)، (فِقْه) ئەوەیە كە تۆ لە مەبەستی قسەكەر لە قسەكەیدا تێبگەی، بەڵام دەشگونجێ بڵێین: (فِقْه): بریتیە لە ورد تێگەیشتن، (فَهْم)، واتە: تێگەیشتن، بەڵام (فقه)، ئەوەیە كە تۆ قووڵو ورد تێبگەی.

( رَهْطُكَ ): (الرّهْطُ: العِصَابة دُونَ العشرَة)، (رَهْط): بریتیە لە كۆمەڵە خەڵكێك كە لە دەیان كەمتر بن.

( ظِهْرِيًّا ): (الظّهرِيّ: ما تَجْعَلُهُ بظَهْرِك فَتَنْساهُ)، (ظِهْرِي): ئەوەیە كە تۆ لە پشت خۆتەوە دایدەنێیو ئیهمالی دەكەیو، پشت گوێی دەخەی.

(مَكَانَتِكُمْ ): (المكانُ: الموْضِعُ الحَاوِي للشيءِ، مَكان وَمَكانَة: تَمْكنُكم)، دیارە (مَكان) بریتیە لەو شوێنەی كە شتێك دەگرێتە خۆیو، (مَكان ومَكانَة)، بە مانای (تَمَكّن)، واتە: ئەوەی لە تواناتاندا هەیە، ئەوەندەی برستان دەڕوات، چی پێتان دەكرێ، بیكەن.

(رَقِيبٌ ): (الرّقِيبُ: الحَافِظ، وَتَرَقّبَ: إحْتَرَز رَاقِباً)، (رَقِیب)، واتە: پارێزەر، چاودێر، كەسێك چاودێریی شتێك بكات، دەیپارێزێ، (وَتَرَقّبَ إحْتَرَز رَاقِباً)، واتە: خۆی لە شتەكە پاراست، بەهۆی ئەوەوە كە چاودێریی دەكرد.

(ٱلصَّيْحَةُ): (الصَّيْحـة: رَفْعُ الصَّوْت)، دەنـگ بـەرز کـردنەوە، بـەڵام بـە پێی سیاق دەزانرێ، کە (صیحـة) لێـرەدا: دەنـگو چریکـەو نەعرەتەیـەکی زۆر گـەورە کـە گوێی بیسەران کەڕ بکات، دەنگێکـی زۆر بێـڕەزا.

(جَٰثِمِينَ): واتـە: لـەپەو ڕوو کـەوتنو تەخـت بـوونو بـە زەوییـەوە نیشـتن، دەگـوترێ: (جَـثَمَ الطـائِرُ إِذَا قَعَـدَ وَلَطِـيءَ بـالأَرْضِ)، باڵـنـدە کە دەنیشـێو خـۆی بـە زەوییـەوە دەنـووسێنـێو خـۆی تەخـت دەکات، پێی دەگـوترێ: (جَـثَمَ الطـائِرِ)، باڵندەکە نیشت، ئەوانیش بـەو شێوەیـە بـە زەوییـەوە تەخـت بووبوون.

(كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآ): واتە: وەك تێیـدا نەمـابنەوە، دەگـوترێ: (غَنِـيَ بـالـمكانِ، أَيْ: أَقَامَ)، واتە: لـەو شـوێنەدا مـایـەوە (كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآ): واتە: وەك ڕۆژێك لـە ڕۆژان لـەو شـوێنـەدا نەژیـابـن.

## مانـای گـشـتـی ئایـەتەکـان

دیارە ئێمە بە خێرایی بەسەریدا ڕەت دەبین، چونکە دوایی باسێکی سەربەخۆ لەبارەی گەلی (مەدیەن) و (شوعەیب) پێغەمبەرەوە ﷺ دەکەین، لە چوار بڕگەی سەرەکییدا، بۆیە ئێستا مانای ئەم دوازدە ئایەتە بە خێرایی‌و پوختیی، دەخەینە ڕوو.

خوا ﷻ لە درێژەی گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەراندا صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، لەگەڵ گەلەکانیاندا، بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ و، بۆ هاوەڵانی بەڕێزی‌و، دوای ئەوانیش بۆ هەموو وەچەکان‌و، هەموو جیل‌و پشتەکانی بڕواداران، تا ئێستاو، دوای ئێستاو، تا دنیا بە کۆتا دێ، دێتە سەر باسی بەسەرهاتی گەلی مەدیەن، کە شوعەیبی برایانی بۆ لا ڕەوان کردوون، واتە: (شوعەیب)یش لە ڕووی ڕەچەڵەک‌و نەسەبەوە لە گەلی مەدیەن بووە، ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾، ئەم (و) واوە دیارە ئەم بەسەرهاتە (عطف) دەکات‌و دەگێڕێتەوە {(عطف)، واتە: بادانەوەو گێڕانەوە}، بۆ پێشێ، واتە: وەك چۆن پەیام‌و وەحییمان بۆ تۆ ناردوە، ئەی موحەممەد ﷺ! پاشان بۆ نووح‌و هوودو صاڵح‌و لووط‌و ئیبراهیم، بە هەمان شێوە پەیام‌و سروشیشمان نارد بۆ لای گەلی مەدیەن، لە ڕێی (شوعەیب)ی برایانەوە، چی پێگوتن؟ ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نییە، واتە: پەرستراوێکی دیکەتان نیە کە شایستەی پەرستن بێ، چونکە یان وەك خۆتانە کە مرۆڤە، یان لە خوار خۆتانەوەیە، کە شتەکانی دیکەن، هەر خوا شایستەی ئەوەیە کە بپەرسترێ، واتە: ئەوپەڕی ملکەچیی، ئەوپەڕی خۆشویستن، ئەوپەڕی پشت پێ بەستن، ئەوپەڕی بە گەورە گرتن، ئەوپەڕی سام‌و هەیبەت بەرانبەر نواندن، ئەوپەڕی شەرم لێکردن، تەنیا شایستەی خوای پەروەردگارە، ﴿وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ﴾، وە پێوان‌و کێشان کەم مەکەن، کەموکوڕییان تێدا مەکەن، واتە: ئەو

شتانەی کە بۆ خەڵکیان دەپێون، وە ئەو شتانەی بۆ خەڵکیان دەکێشن، کەموکوڕییان تێدا مەکەن، فرتو فێڵ لە پێوانو کێشان دا مەکەن، ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ﴾، من ئێوە بە باش دەبینم، واتە: حاڵو باڵتان باشە، لە ڕووی گوزەرانو سەروەتو سامانەوە وەزعتان خراپ نیە، پێویستییتان بە دزییو فزیی نیە، جاری وا هەیە کابرا بە ناچاریی دزیی دەکات، بە ناچاریی بیر لە حەرام خواردن دەکاتەوە، بەڵام ئێوە حاڵو وەزعتان باشە، ئەو کەسەش کە حاڵو وەزعی داراییو گوزەرانی باش بێ، دیارە خیانەت کردنو ناپاکیی کردن لە مامەڵەدا، لەوی ناشیرینترە، ئەگەرنا ناپاکیی لە هەموو کەس هەر ناشیرینە.

﴿وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ﴾، من مەترسیی سزاو ئازاری ڕۆژێکی دەورە دەرو ئابڵووقە دەرم لە ئێوە هەیە، (ئەگەر بێتو لەسەر ئەو حاڵەی خۆتان کە بریتیە لە بێبڕوایییو ناڕاستییو ناساغیی لە مامەڵەدا، لەگەڵ خەڵکدا بەردەوام بن) ﴿وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾، پێشی دەفەرموێ: ناپاکیی مەکەن لە پێوانو کێشاندا، بەڵام بێگومان کاریان هەر بەوەندە تەواو نابێ، بۆیە دوایی دەفەرموێ: وە ئەی گەلەکەم! پێوانو کێشان بە دادگەرانە، بە تێرو تەواویی ئەنجام بدەن، ﴿وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ﴾، شتەکانی خەڵك بە کەم مەگرن، یاخود لێیان کەم مەکەنەوەو دامەشکێنن، جا چ لە ڕووی مادددییەوە لێیان کەم بکەنەوە، چ لە ڕووی مەعنەوییەوە لەبەر چاویان ببێزرێنن، ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾، خراپەکارانەو تێکدەرانە لە زەمین دا مامەڵە مەکەن، خراپەو تێکدان مەکەن لە زەویدا، ﴿بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾، ئەو هێڵراوەیەی خوا، ئەو کەمو پوختەی کە خوا، بۆتانی دەهێڵێتەوە لە ئەنجامی مامەڵەی ڕاستو دروستدا، بۆ ئێوە باشترە، ئەگەر بڕوادار بن.

ئەگەر ئێوە بڕواداربن، حەڵاڵێکی کەمو پوخت باشترە، لە حەرامێکی زۆرو بۆر، ﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ﴾، من بەسەر ئێوەوەش پارێزەر نیم، کە نەهێڵم غەیری خوا بپەرستن، نەهێڵم تەرازوو بازیی بکەنو، نەهێڵم خراپەکاریی بکەنو شتی

خەڵك بە کەم بگرن، من پارێـزەر نـیم بەسـەر ئێوەوە، مـن بـەس پـەیامی خواتـان پـێ ڕادەگـەیەنم.

ئنجا گەلـەکەی وە دەنگ دێن، وەڵام دەدەنەوە: ﴿ قَالُواْ يَـٰشُعَيْبُ ﴾، گەلـەکەی گوتیان: ئەی شـوعەیب! ﴿أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَـٰٓؤُاْ ﴾، ئـایا نـوێژەکەت فەرمـانت پـێ دەکـات، کـە واز لـەوە بێنیـن کە پێشینـانمـان بـابو بـاپیـرانمان پەرستوویانـە؟ یان نـوێژەکەت فەرمانت پێ دەکات، کە واز لـەوە بێنیـن کـە دەیکـەین، بـە کـەیفـی خـۆمـان ڕەفتـار دەکـەین بـە مـاڵو سامـانەکانمان، واتە: واز لـەو دەسـتکراوەییـە بێـنیـن، کە چۆنـمان پێخۆشـە، وا مـامەڵـە دەکەین لـە مـاڵو سـامـانمـاندا؟ ئـایا نـوێـژەکـەت پێت دەڵێ: دەسـت لـەوەش هـەڵبگـرین؟ ﴿إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴾، بێگومـانو بـە جـەخت کردنەوە، تۆ زۆر هێـدیی‌و مەندیـی، زۆریـش سـەر ڕاسـتیی.

کە بـە تەئکیـد بـە توانجو پلارەوە پێیان گوتـوە، واتـە: تـۆ پێچەوانـەی (حلیم) و (رشیـد)ی، (حلیم)، واتـە: هێـدیی‌و مەنـدو ئـارام، (حِـلم) بریتیـە لـە ئەوە کـە ئینسـان پەلـە نەکات، پێچـەوانەی تـاڵووکەو پەلـەکردن (عجلة)یـە، (رشیـد)، واتە: سـەر ڕاسـت، کە پێچـەوانەی (غوي)یـە، چونکە (غي)، ئەوەیـە کـە ئینسـان بـە شـێوەیـەك مـامەڵـە بکات، بـە ئـامـانج نەگـات، سـەر ڕاسـتـانە بـە ڕێـدا نەڕوات، بـەڵام (رشیـد)، واتـە: سـەر ڕاستو بـە ئـامـانج گـەیشتوو.

کـە ئـەوان دیـارە پێچـەوانەی ئـەوەیان مەبـەسـت بـووە، واتـە: تـۆ پێچـەوانـەی (حِـلم)ت هەیـە، کە هێدییی‌و مەندییەو، پێچەوانەی (رُشْد)یشت هەیـە، کە بریتیـە لـە سـەر ڕاستیی، واتە: تـۆ سـەرگـەردانو سـەرلـێشیواوی‌و، بـابـایـەکی تـووڕەو تونـدی، یاخـود نـاهێـدیی‌و مەندیـی.

ئنجا پێغـەمبـەر شـوعەیب ﷺ وەڵامیان دەداتەوە: ﴿ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى ﴾، شـوعەیـب ﷺ گـوتی: ئەی گـەلـەکەم! هـەواڵـم پـێـبـدەن، ئەگـەر من لـە لایـەن پەروەردگـارمەوە لـەسـەر بـەڵگـەیـەکـی ڕۆشـن بـم، بـەرچـاو ڕوون بـم،

﴿وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا﴾، لەلایەن خۆشیەوە بژیوێکی باشی پێدابم‌و بۆ دابین کردبم، ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ﴾، ناشمەوێ کە ئەوەی ئێوەی لێ قەدەغە دەکەم، خۆم پێچەوانەکەی بکەم، (بچم ئەو شتە بکەم)، واتە: ئایا منێك کە ئاوام، ماقووڵە بە قسەم نەکەن، دەگونجێ بە قسەم نەکەن، شتێکی زۆر بێجێ نیە کە ئێوە لە قسەم دەربچن؟ ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ﴾، من تەنیا چاکسازییم دەوێ، ئەوەندەی بتوانم، ﴿وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾، وە کار ئاسانییم‌و کار بۆ مەیسەر بوونم، تەنیا بە خوایە، ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾، تەنیا پشتم بەو بەستووە، تەنیا بۆ لای ئەویش لە ئاخەوە دەگەڕێمەوە.

ئنجا شوعەیب ﷺ هەر بەردەوام دەبێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، بە خۆڕایی نیە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کاتێك باسی شوعەیب ﷺ کراوە، فەرموویەتی: {ذَاكَ خَطِيبُ الأَنْبِيَاءِ}[١]، واتە: ئەوە وتاربێژو دواندەری پێغەمبەران بووە (علیهم الصلاة والسلام)، دەفەرموێ: ﴿وَيَٰقَوْمِ لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَآ أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَٰلِحٍ﴾، وە گەلەکەم! با ناکۆکییتان‌و دووبەرەکییتان لەگەڵ من، واتان لێ نەکات: هەمان شت کە تووشی گەلی نووح، یان گەلی هوود، یان گەلی صالح بووە، تووشی ئێوەش ببێ، واتە: خۆتان بە مەرەدی ئەوان مەبەن، بەهۆی ناکۆکییتانەوە لەگەڵ من، بەهۆی سەرپێچییتانەوە لە من، ﴿وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ ﴿٨٩﴾﴾، گەلی (لووط)یش لێتانەوە دوور نین، چ لە رووی شوێنەوە، گەلی مەدیەن لە شام بوون‌و، گەلی (لووط)یش دیارە شوێنەکەیان لەژێر دەریاچەی مردوویەو هەر لە یەك دەفەر

---

١) عن محمد بن إسحاق قال وشعيب بن ميكائيل النبي ﷺ بعثه الله نبياً، فكان من خبره وخبر قومه ما ذكر الله في القرآن وكان رسول الله ﷺ إذا ذكره، قال: ذاك خطيب الأنبياء لمراجعته قومه. المستدرك على الصحيحين: ج ٢/ ص ٦٢٠، ح ٤٠٧١، تعليق الذهبي في التلخيص: سكت عنه الذهبي في التلخيص.

بوون، ئنجا لە ڕووی کاتیشەوە، دیارە گەلی شوعەیب لە دوای گەلی لووط هاتوون، هەروەها لە ڕووی ڕەچەڵەکیشەوە دیسان دەگونجێ هەموویان بچنەوە سەر ڕەچەڵەکێكو بەرەبابێك.

ئنجا دووبارە پێیان دەفەرموێ: ﴿ وَٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ ﴾، داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، واتە: هەڵەو کەموکورتییەکانی خۆتان ببینن، دانیان پێدا بێننو، داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ ﴾، دوایی بگەڕێنەوە بۆ لای، چونکە ئینسان تاکو خۆی پاك نەکاتەوە، خۆی پاکسازیی نەکات، چاکسازیی بۆ ناکرێ، زەوییەك کە بتەوێ تۆیەکی تێدا بچێنی، نەمامی تێدا بنێژی، دەبێ پێشێ هەڵیوێژێریو بیکێڵیو ئامادەی بکەی، لە ڕاستییدا هەمیشە چاکسازیی لە دوای پاکسازیی دێ، یانی: پێشێ هەڵەو کەموکوڕییەکانی خۆتان ببیننو دانیان پێدا بێنن، داوای لێبوردن لە خوا بکەن، خۆتان بژار بکەن لە کەموکوڕییەکان، دوایی بگەڕێنەوە بۆ خزمەت خوا، چونکە ئەو کاتە شایستەی ئەوە دەبن کە لە خوا نیزیك بنو، بۆ لای بگەڕێنەوەو خۆتان بە ئیمانو تەوحیدو کردەوەی چاكو ڕەوشتی بەرزو جوانو تاعەت برازێننەوە، پێشێ دەبێ خۆتان ڕزگار بکەن لە شیركو کوفرو لە بت پەرستیی، دڵو مێشکی خۆتان لەوانە پاك بکەنەوەو، ڕەوشتو کردەوە خراپەکان، پەرستنی بتەکان، وە ئاکارە دزێوەکان لە خۆتان دابڕنو خۆتانیان لێ بژار بکەن، ئنجا دوایی خۆتان برازێننەوە بە ئیمانو تەوحیدو تاعەت بۆ خواو، بە بەندایەتیی بۆ خواو، بەو ڕەوشتو ئاکارە بەرزو پەسندانەی کە لە ئیمانو خوا بە یەك گرتنەوە، پەیدا دەبن، ﴿ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴾، بێگومان پەروەردگاری من زۆر بە بەزەییە، زۆریش خۆشویستەرە، کێی خۆشدەوێ؟ ئەو بەندانەی کە بۆ لای دەگەڕێنەوەو، ئامادەن کە بەندایەتیی بۆ ئەنجام بدەنو بیپەرستن.

دووبارە گەلەکەی وەدەنگ دێنەوە، بەڵام ئەمجارە توندتر: ﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ ﴾، گەلەکەی گوتیان: ئەی شوعەیب! زۆرێك لەوەی دەیڵێی،

چاك تێی ناگەین، یانی: هەر وا ڕووکەشێك دەزانین دەڵێی چی، بەلام لە مەبەستەکەت تێ ناگەین.

ئنجا وەك دوایی باسی دەکەین، عەجایب نیە کە تێ نەگەیبن، چونکە بە زۆریی وایە، کە ئینسان لە چ جەویێکدا بژی، هەر لەو شتانە تێ دەگات، بابایەکی ماددیی، بابایەکی دنیا پەرستی ئارەزوو ویست، هەر لەو تەعبیرو موفرەدەو وشانە تێ دەگات، کە لە دەوری ئامانجەکەی وی‌و مەبەستەکانی ئەودا دەخولێنەوە، بەلام شوعەیب ﷺ پەیامێکی مەعنەویی بەرزی خوایی بۆ هێناون‌و، ویستوویەتی بیانباتە ئاستێکی بەرزی مرۆڤایەتیی‌و بۆ خوا صوڵحان، ئنجا ئەوان لەو ئاستە بەرزەو لەو وشەو تەعبیرە بە نەزاکەت‌و پاك‌و چاکانە، هەر دیارە چاك تێ نەگەیشتوون!

﴿وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا﴾، بێگومان ئێمە تۆ لە نێو خۆماندا بە بێهێز دەبینین، ﴿وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَٰكَ﴾، وە ئەگەر کۆمەڵەکەت نەبوونایە، بەردبارانمان دەکردی، کە بە تەئکید مەبەستیان پێی خزمەکانی بووە، نەك شوێنکەوتووەکانی، چونکە شوێنکەوتووەکانیشی هەر چەوساوە بوون، کەواتە مەبەست پێی خزمەکانی بووە، پاشان ئەوان ڕەچاوی شوێنکەوتووەکانیان نەکردوەو خاتری ئەوانیان نەگرتوە، بەڵکو خاتری خزمە کافرەکانی (شوعەیب)یان گرتوە کە لەگەڵ خۆیان لەسەر یەك ڕێبازو بەرنامە بوون، دەڵێن: ئەگەر لەبەر کۆمەڵەکەت نەبووایە، یانی: خزمە نیزیکەکانت، بەردبارانمان دەکردی، ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ﴾، ئنجا تۆ لە لای ئێمە بالادەست‌و دەستڕۆیشتوو نی.

ئنجا (شوعەیب)یش توندتر دێتە قسەو وەلامدەداتەوە: ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَهْطِىٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾، دەڵێ: ئەی گەلەکەم! ئایا کۆمەڵەکەی منتان لەلا بالادەستترو خاوەن دەسەلاتترە، لە خوا، کە لەبەر وان (لەبەر خزمەکانم) دەستدرێژییم ناکەنە سەرو، لەبەر وان بەردبارانم ناکەن، نەك لەبەر خوا؟!

﴿وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّا﴾، لە حاڵێکدا کە ئێوە خواتان ﷻ لە پشت خۆتان داناوە؟! واتە: پشتگوێتان خستوە، وەك چۆن شتێك فڕێدەدەیە دوای خۆتەوەو

هەڵیدەدەیە پشتەوە، مانای وایە ئیهمالت کردوە، ئاوا خواتان پشتگوێ خستوە، ﴿إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾، بێگومان پەروەردگارم ئابڵۆقەدەری کردەوەکانی ئێوەیە، واتە: ئێوە لە خوا دەرباز نابن، ﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞ﴾، (شوعەیب) ﷺ وردە وردە ئاوازی قسەکەی، شێوازەکەی توند دەکات، بە پێی توندی هەڵوێستەکەی ئەوان، دەڵێ: ئەی گەلەکەم! ئێوە چیتان لەدەستدێ بیکەن، منیش ئەنجامدەرم، واتە: ئەنجامدەرم، بۆ ئەوەی کە ئەرکی سەرشانمە، ﴿سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ﴾، لەمەودوا دەزانن، بۆتان دەردەکەوێ، کێ سزاو ئازارێکی بۆ دێ، ڕیسواو زەبوونو شەرمەزاری دەکات، ﴿وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ﴾، بۆشتان دەردەکەوێ: کێ درۆ دەکات، ﴿وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ﴾، چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵ ئێوە لە چاودێرو چاوەڕوانانم.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا﴾، کاتێك فەرمانی ئێمە هات، واتە: بڕیاری ئێمە هات بە لەبەینبردنی گەلی مەدیەن، یاخود فەرمان پێکراوی ئێمە هات، کە بەڵایەکەیە، شوعەیبو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بڕوایان هێنابوو، بە بەزەییەکی تایبەت لەلایەن خۆمانەوە، دەربازمان کردن، ﴿وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ﴾، ئەوانەش ستەمیان کرد بوو، چریکەیەکی زۆر گەورە، دەنگێكو هاڕەیەکی زۆر گەورە گرتنی، ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾، سەرەنجام لە ماڵەکانی خۆیاندا لەپەوڕوو کەوتن، تەخت بوون، وەك چۆن باڵندە هەڵدەنیشێ، ﴿كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآ﴾، وەك هەر هیچ لەوێدا نەمابنەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو ماڵو حاڵانەیان ئاوەدان نەکرابێتەوە، تێیدا نەهاتبنو نەچووبن، ﴿أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ﴾، ئەها، وریا بنەوە! دووریی بۆ گەلی مەدیەن، وەك چۆن گەلی ثەموود دوورخرانەوە، (لە ڕەحمەتو بەزەییو میهری خوای پەروەردگار).

# پوختەی بەسەرهاتی
# شوعەیب (علیه السلام) و گەلی مەدیەن
# لە چوار تەوەردا

ئێمە لە چوار تەوەردا بەسەرهاتی شوعەیب ﷺو گەلەکەی دەخەینە ڕوو:

١/ پێناسەی شوعەیب ﷺو گەلی مەدیەن (أصحاب الأیكة).

٢/ ژمارەی ناوهێنرانی شوعەیب ﷺ لە قورئانداو، پانتایی بەسەرهاتی خۆیو گەلەکەی.

٣/ پەیامو بەرنامەی شوعەیب ﷺ بۆ گەلەکەی چی بوو ؟

٤/ گەلی مەدیەن (أصحاب الأیكة) چۆن سزادرانو فەوتێنران؟

## تەوەری یەكەم: پێناسەی شوعەیب ﷺ و گەلی مەدیەن و (أصحاب الأیكة) خاوەنانی درەختەكە:

زۆربەی مێژووزانان رایان وایە، كە شوعەیب ﷺ بە رەچەڵەك دەچێتەوە سەر ئیبراهیم (خلیل الله) ﷺ هەرچەندە لە چۆنیەتی ریزكردنی ئەو رەچەڵەكەدا، را جیاییان هەیە:

هەندێكیان دەڵێن: (شوعەیب) كوڕی (صەنعون كوڕی عیفا كوڕی ثابیت كوڕی مەدیەن كوڕی ئیبراهیم)ە.

هەندێكیش دەڵێن: (شوعەیب كوڕی طەیفور كوڕی عیفا كوڕی ثابیت كوڕی مەدیەن كوڕی ئیبراهیم)ە.

هەروەها سێ چوار رای دیكەش هەن، لە چۆنیەتی ریزكردنی ئەو رەچەڵەكەدا.

خاوەنی (سیرة النبیین والمرسلین)[1] باسی بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ دەكاتو، لە میانی گێڕانەوەی بەسەرهاتەكەیدا دەڵێ: (كانَ أَهْلُ مَدْيَن قَوْماً عَرَباً، وَقِيْلَ كانوا بَعْدَ قَوْمِ لُوطٍ بِمُدَّةٍ قَرِيبة، لِإنَّ إبْرَاهِيمَ بَعْدَ أَنْ ماتَتْ زَوْجَتُهُ سارَة، تَزَوَّجَ فَتاتاً كَنْعَانِية مِنَ العَمالِقَة، أَو الجَرَاهِمة الَّذِينَ سَكَنوا حولَ الكَعْبة، وَأَنْجَبَ مِنْهُم أَوْلاداً مِنْهُمْ مَدْيَن).

واتە: خەڵكی مەدیەن خەڵكێكی عەرەب بوون، گوتراوە: لە دوای گەلی (لووط) بە ماوەیەكی كەم لێیانەوە نیزیك بوون لە رووی ماوەی كاتەوە، چونكە ئیبراهیم ﷺ دوای ئەوەی سارەی هاوسەری خوا لێی رازی بێ دەمرێ، كچێكی كەنعانیی لە عەمالیقە، یاخود لە جەراهیمە، ئەوانەی كە لە دەوری كەعبە بوون، دێنێو، چەند منداڵێكی دەبن لەو ئافرەتە، كە یەكێكیان مەدیەنە.

بەڵام لە پەیمانی كۆن، لە تەوراتدا دەڵێ: (مەدیان)، كەواتە: مەدیەن ناوی گەلێكە كە لە مەدیەن، یان مەدیانی كوڕی ئیبراهیم پەیدا بوون، دەشگونجێ مەدیەن

---

١) ج ١، ص: (٤٠٣ و ٤٠٦ و ٤٠٧) لمحمد عید عبدالله یعقوب الحسیني.

ناوی شارو دەڤەرەکەیان بێ‌و، جاری وایە ناوی باپیرە گەورەیانەوە ناو دەنرێ‌و، جاری وایە ناوی ئەو باپیرە گەورەیە دەچێتە سەر شارو، دەچێتە سەر دەڤەرەکەش.

دەربارەی شوێنی جوگرافییان، دکتۆر (شوقي أبو خليل) لە (أطلس القرآن الكريم)دا[1]، دەڵێ: (مساكن مدين بلادُ الحِجازِ مِما يَلِي الشام شَرْق خَلِيج العَقَبة)، واتە: شوێنی گەلی مەدیەن وڵاتی حیجاز بووە، لەو لایەوە کە لە شامەوە نیزیکە، لە ڕۆژهەڵاتی کەنداوی عەقەبە.

هەروەها (محمد عيد عبدالله يعقوب الحسيني) دەڵێ: (مَدْيَن: هِيَ قَرْيَة مِنْ أَرْضِ مَعَان مِنْ أَطْرَافِ الشام مِما يَلِي ناحِية الحِجاز قَرِيباً مِنْ بُحَيْرَة لُوط، ولاَ زَالَت إِلى الآن تُزَار وآثَار الجُدْرَانِ مَوْجودَةٌ)[2]، واتە: مەدیەن ئاوەدانیی‌و شارێکی گەورەیە لە سەرزەمینی مەعان لە لای شام، (واتە: لە نێوەڕاستی شام دا نیە لە قەراغەکانیەتی) لەو شوێنەوە کە لە حیجازەوە نزیکەو، لە نزیك دەریاچەی (لوط)ەوە، (کە دیارە ئەو وای پێگوتوە، ئەگەرنا خۆی زیاتر بە دەریای مردوو ناودارە)، هەتا ئێستاش ئەو جێیە سەردانی دەکرێ‌و، شوێنەواری خانوو بیناکانی ئێستاش هەر هەن.

دەربارەی کەسایەتی شوعەیب ﷺ ئەم شوێنەوارە گێڕدراوەتەوە: ﴿وَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ شُعَيْب؟ فَقَالَ ذَاكَ خَطِيب الأَنْبِيَاءِ﴾[3].

واتە: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی شوعەیب؟ فەرمووی: ئەوە وتاربێژو دواندەری پێغەمبەران بووە، (لەبەر ئەوەی زۆر ڕەوانبێژو قسەزان‌و لێزان بووە، لە دواندنی گەلەکەیدا).

---

١) ص ٧١.

٢) سيرة النبيين والمرسلين، ج١، ص ٤٠٣.

٣) عن محمد بن إسحاق قال وشعيب بن ميكائيل النبيّ ﷺ بعثه الله نبياً، فكان من خبره وخبر قومه ما ذكر الله في القرآن، وكان رسول الله ﷺ إذا ذكره، قال: ذاك خطيب الأنبياء لمراجعته قومه. المستدرك على الصحيحين: ج ٢/ ص ٦٢٠، ح ٤٠٧١، تعليق الذهبي في التلخيص: سكت عنه الذهبي في التلخيص، رَوَاهُ الطَّبَرَانِي فِي (التفسير الكبير)، ج ٣، ص ٤٥٣، وَالطَّبَرِي فِي (جامع البيان)، برقم: (١٤٧٢١)

لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)[1] لە ژێر ناوونیشانی (زَوَاجُ إبراهيم مِنْ قَطورَةَ)دا، ئەمە هاتوە:

دەڵێ: (وَعَادَ إِبْرَاهِيمُ فَاتَّخَذَ لِنَفْسِهِ زَوْجَةً تُدْعَى قَطورَةَ، فَأَنْجَبَتْ لَهُ زِمْرَان وَمَقِيشَان وَمَدَان وَمِدْيَان وَيشْبَاق وَشوحًا).

واتە: ئیبراهیم ئەو ژنەی کە هێناویەتی بە ناوی (قَطورَة)، ئەو مندالآنەی لێبوون، زیمرانو مەقیشانو مەدانو میدیان (مەدیەن)و یشباقو شووحا.

بە هەر حاڵ پەیمانی کۆن ئاوای دێنێ، چەند وایە چەند وانیە؟ وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: ئەگەر خاوەن کتێبەکان قسەیان بۆ کردن، نە بڵێن ڕاست دەکەن، نە بڵێن درۆ دەکەن، مەگەر شتێك کە دیار بێ لەگەڵ قورئاندا تێکدەگیرێ، یان لەگەڵ عەقڵو واقیعدا تێکدەگیرێ، ئەوکاتە دەڵێین: ڕاست نیە، بەلآم ئەو زانیارییەی کە دەیهێنن‌و، نە ڕاستیی سەلمێنراوەو، نە درۆ بوونی سەلمێنراوە، دەگونجێ ئێمە وەك بەرچاو ڕوونیی بۆ هەندێك وردەکاریی سوودی لێ ببینین، بەلآم لێی دڵنیا نین کە وایە، یان وا نیە.

---

١) العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٢٥، الصفحة: (١٦٦).

## تەوەری دووەم : ژمارەی ناوهێنرانی شوعەیب ﷺ و، پاانتایی بەسەرهاتی خۆی و گەلەکەی لە قورئاندا:

### أ/ ژمارەی ناوهێنرانی شوعەیب ﷺ:

یازدە جار ناوی (شعیب) لە قورئاندا هاتوە بەم جۆرەی خوارێ:

١) هەر بە ناوی شوعەیب ﷺ لە سوورەتی (الأعراف) کە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا ژمارە حەوتە، پێنج جاران ناوی هاتوە، ئایەتەکانی: (٨٥، ٨٨، ٩٠، ٩٢)و، دووبارە ئایەتی (٩٢).

٢) لە سوورەتی (هود)دا کە لە ڕیزبەندیی موصحەف دا، ژمارە یازدە (١١)یە، چوار جاران ناوی هاتوە، ئایەتەکانی: (٨٤ و ٨٧ و ٩١ و ٩٤).

٣) لە سوورەتی (الشعراء)دا، کە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا بیستو شەش (٢٦)ە، یەك جار ناوی هاتوە، لە ئایەتی ژمارە: (١٧٧)دا.

٤) لە سوورەتی (العنکبوت)دا، کە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا ژمارە بیستو نۆ (٢٩)یە، یەك جار ناوی هاتوە ئایەتی ژمارە: (٣٦)، کۆی ئەوانە دەکاتە یازدە (١١).

### ب/ پانتایی بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ و گەلەکەی لە قورئاندا:

جارێ پێش ئەوەی بێینە سەر دەرخستنی پانتایی بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ و مەدیەن (أصحاب الأیکة) خاوەنانی باخەکە، یان خاوەنانی درەختەکە، دەڵێین:

ئەو پرسیارەکە: ئایا مەدیەنو (أصحاب الأیکة) هەر یەك گەلن، یان دوو گەلن؟ وەك لە سوورەتی (الأعراف)یشدا باسمان کردوە، لەوبارەوە زانایان ڕا جیاییان هەیە:

هەندێکیان گوتوویانە: تاکە پێغەمبەرێك کە بۆ دوو گەلان، بۆ دوو کۆمەڵە خەڵك ڕەوانە کرابێ (شوعەیب ﷺ)ە، کە هەم بۆ مەدیەن، هەم بۆ (أصحاب الأیکة)ش ڕەوانە کراوە.

بەڵام هەندێکی دیکەیان، بەڵکو زۆربەیان، دەڵێن: گەلی مەدیەن لەگەڵ (أصحاب الأیکة) هەر یەکن، کە دیارە هەر کام لە (طبري) و (إبن کثیر)ە، زۆرێکی دیکە لە لێکۆڵەرەوانی قورئان‌و، مانا لێکدەرەوانی قورئان، ئەو ڕایەیان هەیەو، منیش ئەو ڕایەم بە دڵە، وەك دواییش قسە لە بەڵگەی هەر کام لەو دوو ڕایە دەکەین.

بێینە سەر دەرخستنی پانتایی بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ و گەلەکەی لە قورئاندا:

١- سوورەتی (الأعراف)، کە یەکەم سوورەتە تێیدا باسی بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ و گەلی مەدیەن کرابێ، لە ئایەتی ژمارە (٨٥) تاکو (٩٣)، واتە: (٩) ئایەت تەرخانکراون بۆ ئەو بەسەرهاتە.

٢- لە سوورەتی (هود)دا، لە ئایەتی (٨٤) تاکو (٩٥) واتە: (١٢) ئایەت.

٣- لە سوورەتی (الحجر)دا، ئایەتەکانی: (٧٨ و ٧٩)، واتە: (٢) ئایەت.

٤- لە سوورەتی (الشعراء)دا، لە ئایەتی (١٧٦) تاکو (١٩١)، واتە: (١٦) ئایەت.

٥- لە سوورەتی (العنکبوت)دا، ئایەتەکانی: (٣٦ و ٣٧)، واتە: (٢) ئایەت.

کۆی ئەو ئایەتانەی کە لە قورئاندا بۆ بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ و گەلی مەدیەن تەرخان کراون، (٤١) ئایەتن.

ئنجا ئەوانەی کە گوتوویانە: مەدیەن‌و (أصحاب الأیکة) دوو کۆمەڵگا بوون، وە شوعەیب ﷺ بۆ هەردووکیان نێردراوە، سێ شتیان بە بەڵگە هێناونەوە، ئەوەندەی من سەرنجی قسەکانیانم داوە:

یەکەم: گوتوویانە: خوا ﷻ هەم وشەی مەدیەنی بەکارهێناوە، هەم (أصحاب الأیکة)شی بەکارهێناوە، دیارە (أصحاب) واتە: خاوەنان، کە کۆی (صاحب)ە، (صاحب) هەم بە مانای خاوەن‌و، هەم بە مانای هاوەڵ دێ.

(الأَيْـكُ: الشَّجَرُ الكَثِيـرُ الـمُلْتَفُّ، الوَاحِـدَةُ أَيْكة)[١].

واتـە: وشـەی (أَيْـك)، واتـە: درەختی کـە زۆر چڕو پـڕ بێ، تـاکـەکـەی بریتیـە لـە (أيـكة) کـەواتـە: (أَصْحاب الأيكة)، واتـە: هـاوەڵانـی، یاخود خـاوەنـانـی بـاخێکـی چڕو پڕ، یاخـود درەختـێکی گـەورەی زۆر چـڕو پـڕ.

گـوتـوویـانـە: ئـەمـە بـەڵگـەیـە لـەسـەر ئـەوەی بـۆ دوو گـەلان نێـردراوە، چونکـە هـەم بـە (أصـحاب الأیـکة) نـاوی هێنـاون، هـەم بـە مـەدیـەن.

دووەم : ئنجا بەڵگەیەکی دیکەیان ئەوەیە، دەڵێن: لە سوورەتی (الشعراء)دا، خـوا ﷻ ئـاوا دەفـەرموێ : ﴿ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾، واتـە: هـاوەڵانی درەختەکـە پێغـەمبـەرانیان بـە درۆ دانـا، کـاتێـك کـە شـوعـەیب ﷺ پێـی گـوتن: ئـایـا پـارێـز نـاکـەن لـە خـوا؟

دیـارە لە هـەموو بەسەرهـاتەکانی دیکەی نـووح ﷺ لەگەڵ گەلـەکەی، هـوود ﷺ لـەگـەڵ عـادو، صـالح ﷺ لـەگـەڵ گـەلـەکـەی ثـەمـوودو، لـووط ﷺ لـەگـەڵ گـەلـەکەی خۆی دا، هەموویان وشـەی (أخ)یان بۆ بەکارهـاتوە لـەگەڵ گـەلـەکانیان :

﴿ ...قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ ... ﴿١٠٦﴾ ﴾الشعـراء.

﴿ ...قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ ... ﴿١٢٤﴾ ﴾الشـعراء.

﴿ ...قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ ... ﴿١٤٢﴾ ﴾ الشـعراء.

﴿ ...قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ ... ﴿١٦١﴾ ﴾ الشـعراء.

بـەڵام بـۆ شـوعـەیـب ﷺ دەفـەرموێ : ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ ﴾، ئەوەشـیان بـە بەڵگە هێنـاوەتەوە، کە مـادام بـاسی برایەتی نەکـردوە، کەواتـە: دیـارە لـەوان نیـە، یانی: (شوعـەیب) واتە: لـە گەلی مەدیەن بووە، بەڵام لـە (أصحاب الأیکة) نەبووە.

---

١) مختار الصحاح، ص٣٦.

سێیەم : دەڵێن: چۆنیەتی فەوتانیان جیایە، بە نسبەت مەدیەنەوە خوای کارزان دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ ٧٣ ﴾الحجر، بەڵام بە نسبەت (أصحاب الأيكة)ەوە، دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِ ١٨٩ ﴾الشعراء، واتە: سزای ڕۆژی سێبەرەکە، هەورەکە گرتنی.

بەڵام لایەنگرانی ڕایەکەی دیکە، کە دەڵێن: ئەو دووانە هەر یەك گەلن‌و، دوو ناویان بۆ بەکار هاتوون، یانی: گەلێك بووە بە ناوی گەلی مەدیەن‌و، باخی زۆر چڕو پڕیان هەبووە، یاخود درەختێکی زۆر گەورەو چڕو پڕیان هەبووە، ئەگەر (أیکة) وەك ناو بێنین بۆ درەختێك، دەشگونجێ (أیکة)، هەر ناوی تاك بێ‌و، بەڵام ئەو باخەی کە هەیان بووە هەمووی وەك یەك درەخت، درەختی چڕو پڕ، کە لق‌و پۆپەکانی تێك چڕژاون، ناوی هاتبێ، جا ئەوانە یەك گەل بوون، بەڵام باخێکی وایان هەبووە، یاخود درەختێکی وایان هەبووە.

بە نسبەت ئەوەوە کە نەیفەرموە: (أَخُوهُمۡ)، زانایان دەڵێن: هۆیەکەی ئەوەیە کە (أصحاب الأیکة) لەبەر ئەوەی ئەو درەختەیان پەرستوە، بۆیەش خوا فەرموویەتی: (أصحاب الأیکة) خاوەنانی درەختەکە، یاخود هاوەڵانی درەختەکە، لەبەرئەوەی ئەو درەختەیان پەرستوە، ئەوان پەرستەری ئەو درەختە بوون، خوا ﷻ بە گونجاوی نەزانیوە بفەرموێ: (برایان)، چونکە بە تەئکید ئەو لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە برایان بووە، کە گەلی مەدیەنن، بەڵام بۆ دووریی گرتن لەوە کە ئەو لە پەرستنی ئەو درەختەدا بەشداریان نەبووە، وشەی برایانی بۆ بەکارنەهێناون.

لە وەڵامی بەڵگەی سێیەمیان دا کە دەڵێن: سزایەکەیان لێك جیا بووە، ئەوانەی ڕای زۆرینەیان هەیە دەڵێن: خوای پەروەردگار کە باسی سزای ئەو گەلانە دەکات، هەر هی ئەمان وا نیە، بۆ نموونە هی گەلی (لووط)یش، بە باران باراندن‌و، بە هەڵگێڕانەوەو، بە چریکە، باسی دەکات، بۆ وێنە، دەفەرموێ:

﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ٧٣ ﴾الحجر.

﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ ﴾الشعراء.

﴿ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا ﴿٣٤﴾ ﴾القمر.

﴿ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا ﴿٧٤﴾ ﴾الحجر.

کەواتە: ئەو تەعبیرە جۆراو جۆرانە کە هەر جارەو گۆشەیەك لەو سزایە خوای تۆڵەستێن باسی دەکات، بە هەموو ئەو گۆشانە، دیمەنی ڕاستەقینەی ئەو جۆرە سزایە، ئەو سزادانە بخرێتە ڕوو.

لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ﴿١٨٩﴾ ﴾الشعراء، ئەو چریکەو دەنگە گەورەیە کە گرتوونی، کە بە (الرجفة)ش هاتوە، ئەو لەرزینەوەیەی کە گرتوونی، لەرزینەوەکە دەنگێکی گەورەی لێ پەیدابووە، وە دوایی لەرزینەوەکە کە وەك ئاگرپژێنێكو بومەلەرزەیەك بووە، دوایی سەری بۆتە چرە دووکەڵ، یاخود پێشێ هەورێکی چڕو پڕیان بۆ هاتوە، لە دواییدا کە زۆر گەرم بووە، ئەوجار بۆتە لەرزینەوەو دەنگو چریکەیەکی گەورە.

کەواتە: ئەوانە هیچیان نەبوونە بەڵگە.

پاشان بەڵگە لەسەر یەك بوونیان ئەوەیە، کە شوعەیب عليه السلام بە یەك جۆر دواندوونی، وەك دوایی باسی دەکەین، واتە: هەم لە سووڕەتی (الشعراء)دا، کە لەویدا، ناوی (أصحاب الأيكة) هاتوە، هەم لەوێدا لەبارەیانەوە کە پەیامی خۆی ڕاگەیاندوەو، هەم لە سووڕەتی (الأعراف)و هەم لە سووڕەتی (هود)دا، بە یەك شێوە دواندوونی، کە باسی تەرازوو بازیی‌و، باسی چاکسازیی ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئەمنیی دەکات.

## تەوەری سێیەم: پەیامو بەرنامەی شوعەیب ﷺ بۆ گەلەکەی چی بوو؟

ئەگەر تەماشای كۆی ئەو ئایەتانە بكەین، كە لە سوورەتەكانی قورئاندا دەربارەی بەرنامەی شوعەیب ﷺ بۆ گەلەكەی، هاتوون، دەگونجێ بە زۆر شێوە بەرنامەكەی دابەش بكەین، بۆ زۆر بوار، بەڵام من پێم وایە بەرنامەكەی لە شەش بواری سەرەكییدا، بەرجەستە دەبێ:

**بواری یەكەم:** كە لە هەموویان گرنگترەو، بناغەی بوارەكانی دیكەیە، بریتیە لە خوا بە یەككرتن، واتە: تەنیا خوا پەرستن (توحید الله)، وەك لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٨٤)داو، لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٨٥)دا، بەیەك شێوە خوا ﷻ لێی نەقڵ دەكات: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ ﴾، واتە: فەرمووی: ئەی گەلەكەم! خوا بپەرستن، بێجگە لەو هیچ پەرستراوی دیكەتان نیە، ئەمە لە سوورەتی (هود)یشدا هاتوەو، لە سوورەتی (الأعراف)یشدا.

ئنجا وەك پێشتریش گوتوومانە كە: ﴿ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ ﴾، خوێنراویشەتەوە بە: (ما لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرِهِ)، هەر دوو قیرائەتەكەش یەك واتایان هەیەو، لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٧٧ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ١٧٨ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٧٩ ﴾، واتە: كاتێك كە شوعەیب ﷺ پێی گوتن: ئایا پارێز ناكەن؟ من بۆ ئێوە پێغەمبەرێكی ئەمیندارم، ئنجا پارێز لە خوا بكەنو فەرمانبەریی من بكەن، (پارێز لە خوا بكەن، واتە: جگە لە خوا مەپەرستن).

**بواری دووەم:** بوارێكی دیكەی بەرنامە چاكسازییەكەی شوعەیب ﷺ بۆ گەلەكەی بریتی بووە لە چاكسازیی ئابووری:

١) لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٨٥)دا، فەرموویەتی: ﴿ فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ ﴾، واتە: پێوانو كێشان بە تەواویی ئەنجام بدەن.

٢) لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٨٤)دا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ﴾، پێوانو كێشان كەم مەكەن، كەمو كورتیی تێدا مەكەن.

٣) هەروەها لە سوورەتی (هود)، ئایەتی (٨٥)دا دەفەرمووێ: ﴿ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ﴾، واتە: پێوانو كێشان دادگەرانەو تەواو ئەنجام بدەن.

٤) لە سوورەتی (الشعراء)دا، لە هەردوو ئایەتی (١٨١ و ١٨٢)دا، وەك پێشتر باسمان كرد، كە لە سوورەتی (الشعراء)دا، باسی (أصحاب الأيكة) كراوە، بەڵام هەر هەمان بەرنامەیە، چونكە لەبارەی تەوحیدەوە پێی فەرموون: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ ﴾الشعراء، لەبارەی چاكسازیی ئابوورییشەوە فەرموویەتی: ﴿ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ ﴾الشعراء، واتە: پێوان بە تەواویی ئەنجام بدەنو، لەو كەسانە مەبن كە زیانگەیەنەرن، واتە: (زیانگەیەنەران)، بەوانەی كە بۆیان دەپێونو، كێشانیش بە تەرازوویەكی ڕێكو ڕاست ئەنجام بدەن بۆ خەڵك، (كاتێك شتیان بۆ دەكێشن).

<u>بواری سێیەم:</u> چاكسازیی كۆمەڵایەتیی:

١ـ لە سوورەتی (الأعراف)، ئایەتی (٨٥)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ﴿٨٥﴾ ﴾الأعراف، شتی خەڵك بێبایەخ مەكەن، لە شتی خەڵك دامەشكێنن، چ لە ڕووی مادییەوە لێی دابشكێننو، لێی كەم بكەنەوە، چ لە ڕووی مەعنەوییەوە شتەكانیان بێبایەخ بكەن، لەبەرچاوی خەڵكی، یان كڕیارەكانی ببێزرێننو، دوای ئەوەی كە خوای بەرز سەرزەمینی بە باشی دروست كردووەو، پڕی كردوە لە خێرو بێر، خراپە كاریی تێدا مەكەن.

٢ـ لە سوورەتی (هود)دا، دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾﴾، شتی خەڵك لە پێش چاو مەخەن، یاخود لێی دامەشكێنن، لێی كەم مەكەنەوەو، لەسەر زەمیندا تێكدەرانە، خراپەكاریی مەكەن.

٣ـ لە سوورەتی (الشعراء)دا، هەر هەمان تەعبیری ئایەتی (٨٥)ی سوورەتی (هود) دووبارە بۆتەوە: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾﴾، شتی خەڵكی بە كەم مەگرن، یاخود كەمو كورتیی تێدا مەكەن، چ لە ڕووی ماددییەوە لێیان دابشكێنن، چ لە ڕووی مەعنەوییەوە كارو شتەكانیان لەبەرچاو ببێزرێنن، لە نرخو بایەخیان بێننە خوار.

هەروەك ڕوونكردنەوەی چەمكو مەبەستی ئەو ئایەتە، ڕووداوێك لە یادو بیرەوەرییەكانم، دەگێڕمەوە: ئەو كاتە من لە پۆلی دووی سەرەتایی بووم، ساڵێكماڵمان لە گوندی (گردی تلێ) بوو، ئەو دێیەی ئێستا لە چوار چێوەی ناحیەی سەروچاوە دایە، جارێكیان بابم لەگەڵ یەكێك لە دراوسێكانی خۆماندا، ـ تەمەنم حەوت هەشت ساڵان بوو ـ ناردمی بۆ تەماتە فرۆشتن، بارێك تەماتەی بۆ لە گوێدرێژێك، نامو لەگەڵ دراوسێكەماندا چووم، لە یادمە هاتین بۆ ڕانیە، هەڵبەتە چەند جارێك ئاوا تەماتەم دەفرۆشت، هەرچەندە بچووكیش بووم، لەبەرئەوەی لە ماڵیدا من وەرگێڕكەیان بووم، كوڕی گەورەترمان نەبوو، دراوسێكەمان ئێستاش لە یادمە ناوی كاك (خدر) بوو، خوا لێی خۆشبێ، كە هاتینە بازاڕی ڕانیە، دیارە من یەكەم جار بوو، ڕانیە ببینم، كابرا خۆشی بارە تەماتەیەكی پێبوو، بە حیساب منیشیان لەگەڵ ناردوە، كە هەم تەماتەكانی ئێمەش بفرۆشێ‌و هەم هی خۆشی، ئنجا هەر كڕیارێك بە لای بارە تەماتەكەی منەوە هاتبایە، دەیگوت: تەماشای تەماتەكانی من بكەن، ئایا ئەو تەماتانە لە چاو تەماتەكانی من تەماتەن؟ تەماشا بكەن! ئەوانەی من چەند جوانن! منیش زۆر لەسەر دڵم قورس بوو، بەڵام گچكە بووم، خەڵكێكیش كە دەهاتن تەماشای منیان دەكردو، دەیانگوت: كاكە تەماتەكانی ئەو منداڵەش جوانن، تۆ بۆچی وا دەڵێی؟

ئنجا مەبەستی ئەم ئایەتە، ئەو بابەتانە دەگرێتەوە: ﴿ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ﴾، شتی خەڵك بە کەم مەگرن، بێبایەخی مەکەن، یاخود بە کردەوە لێیان کەم مەکەنەوە، دیارە کاك خدر دراوسێیەتییەکەو ڕەفاقەتەکەی لەگەڵ مندا تەواو نەبوو، چونکە هەرچەندە دوایی تەماتەکان هەموویان هەر فرۆشران، بەڵام پێموابێ ئەوەی ئێمە بە نرخێکی کەمتر فرۆشران، چونکە پێش هەموو کەس کاك خدر لێی دادەشکاندن!!

**بواری چوارەم:** لە بەرنامەی شوعەیب ﷺ و ڕێبازە چاکسازییەکەی، بریتی بوو لە چاکسازیی ئاساییش، (الإصلاح الأمني).

وەك لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٨٦)دا، کە هەر لێرەدا بەو شێوەیە هاتوە، فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ وَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾.

(بە گەلەکەی خۆی دەفەرموێ:) لەسەر هەموو ڕێیان دامەنیشن، خەڵك بترسێنن، واتە: ڕێگریی مەکەن، ترساندنو تۆقاندن بڵاو مەکەنەوە، خەڵك لە ڕێی خوا لابدەن، ئەوانەی کە ئیمانی پێدێننو، بتانەوێ ڕێبازی خوا خوارو خێچو لارو ناڕێك بخەنە بەرچاوو، یاد بکەنەوە، کاتێك: کە ئێوە کەم بوون دوایی خوا زۆری کردن، وە تەماشا بکەن، سەرەنجامی تێکدەران چۆن بووە! واتە: پەند لەوان وەربگرن.

**بواری پێنجەم:** لە بەرنامە چاکسازییەکەی شوعەیب ﷺ ئەوە بوو، کە داوای تەبایی‌و پێکەوە ژیانی کردوە لە گەلەکەی.

وەك لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٨٧)دا، کە ئەمەش دیارە تەنیا لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوە، کە بە گەلەکەی دەڵێ: ﴿ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ

ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٨٧﴾ الأعراف، واتە: ئەگەر کۆمەڵێك لە ئێوە بڕوایان هێنا بەوەی کە من پێی ڕەوانکراوم‌و، کۆمەڵێکیشتان بڕوایان نەهێنا، خۆڕاگربن، یەکدی تەحەممول بکەن، بە تەبایی پێکەوە بژین، تاکو خوا دادوەرییمان لە نێواندا دەکات‌و، ئەو باشترینی دادوەران‌و باشترینی حوکمڕانانە.

ئنجا چ لە دنیادا دادوەرییمان لە نێواندا بکات، کە سەرەنجام خەڵك بەلای کێدا دەشکێنەوە؟ بەلای ئەوانەدا کە ئیمانیان هێناوە؟ یان بەلای ئەوانەدا کە ئیمانیان نەهێناوە؟! یاخود لە دوا ڕۆژدا خوا دادوەرییمان لە نێواندا دەکات،

دەبێ یەکدی تەحەممول بکەین‌و، ئازادیی بیروڕا لە یەکدی زەوت نەکەین، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوە پەیام‌و بەرنامەیان بووە، بە خەڵکەکەی خۆیان گوتوە: یەکدی تەحەممول بکەن، با جیاوازیی بیروڕاتان هەبێ، بەڵام بە جیاوازییەکانەوە یەکدی تەحەممول بکەن، چونکە دەبێ خەڵك ئازاد بێ، خوا مرۆڤی لەم سەرزەوییە داناوە تاقی بکاتەوە، بە بێ ئەو ئازادییەش ئەو جێنشینایەتیی خوا کردن‌و، ئەو تاقی کردنەوەیەوەو، ئەو هەڵگرتنی ئەمانەتی خوایە، کە بە ئاسمانەکان‌و زەوی‌و چیاکان هەڵنەگیراوە، نایەتە دی.

<u>بواری شەشەم‌و کۆتایی</u>: بەرنامە چاکسازییەکەی شوعەیب ﷺ بە بۆچوونی من، بریتی بووە لە ترساندنیان لە سزای دنیایی‌و، دواڕۆژیی خوای دادگەر:

وەك لە ئایەتی (٨٦) سووڕەتی (الأعراف)دا، باسی سزای دنیایی دەکات، دەفەرمووێ: ﴿وَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾، سەرنج بدەن، تەماشا بکەن، ڕابمێنن سەرەنجامی تێکدەران‌و خراپەکاران چۆن بووە! واتە: لە دنیادا تەماشا بکەن، چونکە جارێ قیامەت نەهاتوە، تاکو بفەرمووێ: تەماشا بکەن.

بە نسبەت سزای دوا ڕۆژ، لە ئایەتی (٨٤)ی سووڕەتی (هود)دا، باسی سزای دواڕۆژ دەکات، دەفەرمووێ: ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ﴾، وە من مەترسیی سزای ڕۆژێکی دەورە دەرو ئابڵووقە دەرم لە ئێوە هەیە.

کە دیارە ئەمە مەبەست پێی سزای ڕۆژی دوایی یە، ئەمە بەرنامە گشتگیرییە چاکسازییەکەی شوعەیب ﷺ بووە، بۆ گەلەکەی مەدیەن، وە (أصحاب الأيكة)، کە خاوەنی باخێکی چڕو پڕو، یاخود درەختێکی گەورە بوون.

**تەوەری چوارەمو کۆتایی: گەلی مەدیەن ( أصحاب الأیكة )، چۆن سزا دران و فەوتێنران؟**

١/ خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا ئاوا باسی چۆنیەتی سزا دانەکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩١﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾ ﴾، واتە: لەرزینەوە بومەلەرزەیەکی گەورە گرتنیو، لەماڵەکەی خۆیاندا لەپەڕوو کەوتن، بە زەوییەوە نووسانو تەخت بوون، ئەوانەی (شوعەیب)یان بە درۆ دانا، وەك هەر لەوێدا نەمابنەوە، وەك هەر ڕۆژێك لەو ماڵو حاڵانەدا هاتوچۆیان نەکردبیٚو نەمابنەوە، ئەوانەی کە (شوعەیب)یان بە درۆ دانا، هەر ئەوان زیانبار بوون.

٢/ لە سوورەتی (هود)دا دەربارەی سزادانیان دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ ﴾، واتە: کاتێك فەرمانی ئێمە هات، (واتە: بەڵایەکەمان هات: فەرمان پێکراوەکەمان، یاخود بڕیاری ئێمە دەرچوو) شوعەیبو ئەوانەی لەگەڵیدا بڕوایان هێنا بوو، بە بەزەیییەکی تایبەت بە خۆمان، ڕزگارمان کردنو قوتارمان کردنو، ئەوانەی کە ستەمیان کردبوو، {خوای کارزان وشەی (ظلم)ی بۆ کوفر بەکارهێناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾البقرة، بۆ شیرکیشی بەکارهێناوە وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان، بۆ هەموو جۆرە سنوورشکێنییو سنووربەزاندنو بۆ هەموو جۆرە گوناهو تاوانێکی بەکارهێناوە}: چریکەیەکی گەورەگرتنیو، لە ماڵەکانی خۆیاندا لەپەڕوو کەوتن، تەخت

بوون بە زەوییەوە، لەگەڵ زەوی دا یەکسان بوون، هەروەك كاتی خۆی ڕۆژێك لەویدا نەمابنەوە، ئاگاداربن! ئەها دووریی بۆ گەلی مەدیەن، هەر وەك چۆن گەلی ثەموود دوورخرانەوە لە ڕەحمەتی خوا، {فرێدرانە زبڵدانی مێژووەوە}.

٣/ لە سوورەتی (الحجر)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾ ﴾الحجر، دەفەرموێ: بێگومان هاوەڵانی باخەکە، یان درەختەکە ستەمكار بوون، ئێمەش تۆڵەمان لێکردنەوەو، ئەوان لەسەر ڕێیەکی ڕوونو ئاشکران، (إمام) بریتیە: لە شەقامە ڕێ، یانی: لەسەر شەقامە ڕێیەکن کە هەموو کەس شوێنەکەیان دەبینێ، کەلاوەو شوێنەوارەکەیان دەبینێ.

٤/ لە سوورەتی (الشعراء)دا، خوای دادگەر ئاوا باسی چۆنیەتی سزا دانەکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ ﴾الشعراء، واتە: گەلی مەدیەن (أصحاب الأيكة)، (شوعەیب)یان بە درۆ دانا، یەکسەر سزای ڕۆژی سێبەرەکە، (ڕۆژی هەورەکە، ڕۆژی تەمومژەکە) گرتنی، کە بێگومان ئەو سزاو ئازارە، سزای ڕۆژێکی مەزن بوو.

شتێك خوا پێی بفەرموێ مەزن، دیارە زۆر زۆر مەزن بووە.

٥/ هەروەها لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾، بە درۆیان دانا، یەکسەر لەرزینەوەیەکی گەورە گرتنیو، لە ماڵەکەی خۆیاندا لەپەو ڕوو کەوتنو بە زەوییەوەو تەخت بوون.

دیارە پێشتریش باسمان کردوە، هۆکارو حیکمەتی جیاوازیی تەعبیرکردن لە سزایەکە، کە جارێك دەفەرموێ: ﴿ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ﴿١٨٩﴾ ﴾الشعراء، جارێك

دەفەرموێ: ﴿ٱلرَّجۡفَةُ﴾، جارێك دەفەرموێ: (صیحة) هۆكارەكەی ئەومیە، كە هەرجارەو گۆشەیەك لە دیمەنی سزایەكە دەخاتە ڕوو.

هەروەها بە پێی سیاقی ئایەتەكانیش، سزایەكەیان جۆراوجۆر دەخرێنە ڕوو، بۆ وێنە:

<u>یەك</u>: لە سووڕەتی (الأعراف)دا، گەلی مەدیەن هەڕەشە لە شوعەیبو لەوانە دەكەن، كە لەگەڵیدان كە دەریان بكەن، وەك پێشتر باسمان كرد، ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾﴾، كە لەوێ هەڕەشەی لێدەكەن، یان شار بەدەرتان دەكەین خۆتو ئەوانەی لەگەڵت دان، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینو ڕێبازەكەی ئێمە، بۆیە لە سووڕەتی (الأعراف)دا، خوای كارزان باسی لەرزینەوە (ٱلرَّجۡفَةُ) دەكات، مادام ئەوان هەڕەشەی دەركردنیان لێكردوون، خواش بە بوومەلەرزە، سزای داون هەڵبەتە ئەو سزایەی كە بۆیان هاتوە، دەنگێكی گەورەش بووەو بوومەلەرزەش بووەو، سێبەرو چڕە دووكەڵێكیش بووەو، هەموویان وێكڕاو پێكەوە بوو، بەڵام لێرەدا ئەم وشەیە گونجاوە.

<u>دوو</u>: لە سووڕەتی (هود)دا، باسی قسە پێكوتنو گاڵتە پێكردنو هەڕەشەی بەردباران كردنەو، پێی دەڵێن: ﴿وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ ﴿٩١﴾﴾، بۆیە لێرەدا چونكە ئەوان دەنگیان لەسەر بەرز كردۆتەوەو هەڕەشەیان لێكردوە، خواش باسی چریكە (صیحة)، دەكاتو بە چریكەو دەنگی گەورە تەعبیر لە سزاكەیان كراوە، كە لەگەڵ ئەو هەڕەشەو گوڕەشەو دەنگ بەسەردا هەڵێنانو گاڵتە پێكردنانەی ئەواندا، گونجاوە.

<u>سێ</u>: لە سووڕەتی (الشعراء)دا، باسی داوا كردنو پەلەكردنی گەلی مەدیەن دەكات، بۆ ئەوەی سزایەكەیان بۆ بێ، دەڵێن: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ

﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾﴾، واتە: گوتیان: بێگومان تۆ لە جادوولێکراوانی، (واتە: تۆ شێت بووی‌و جادووت لێکراوە)و، تۆ تەنیا بەشەرێکی وەك ئێمەی‌و، ئێمە پێمان وایە تۆ لە درۆزنانی، ئەگەر ڕاست دەکەی لە ڕاستانی، با پارچەیەك لە ئاسمانمان بەسەردا ببارێ.

لەوێش ئاوا تەعبیر لە سزایەکەی ئەوان کراوە: ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾﴾الشعراء، واتە: بە درۆیان دانا، ئنجا سزای ڕۆژی سێبەرە گەورەکە، هەورو چڕە دووکەڵە گەورەکە، گرتنی.

لێرەشدا چونکە ئەوان داوایان کردوە لە ئاسمانەوە پارچەیەك لە ئاسمانیان بەسەردا ببارێ، خوای کاربەجێ، فەرمووی: دە فەرموون، ئەوە پارچە ئاسمانیش نیە، بەڵکو چڕە دووکەڵ‌و سێبەرو هەورێکە، کە سزایەکی زۆر سەختی تێدایە، ئەوەمان بۆ ناردن.

هەڵبەتە ئەمە ژمارەیەك لە توێژەرەوەانی قورئان ئاماژەیان پێداوە، بەتایبەتی (إبن كثیر) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، کەواتە: ئەوە حیکمەتی دەربڕین‌و تەعبیری جۆراو جۆرە لەو سزایەی کە خوای دادگەر بۆ ئەو گەل‌و کۆمەڵگایانەی ناردوە، کە پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە درۆ داناوە، هەر جارە خوا ﷻ بە وشەیەك، بە تەعبیرێك باسی ئەو سزایەی کردوە، کە لەگەڵ ئەو سیاقەداو، لەگەڵ ئەو کەش‌و جەوەدا کە بەسەرهاتەکەی تێدا گێڕدراوەتەوە، بگونجێ.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:**

**باسی ناردنی شوعەیب ﷺ بۆ لای گەلەکەی مەدیەن و، فەرمانکردنی پێیان بە خواپەرستیی و، خۆ دوورگرتن لە ناپاکیی لە پێوان و کێشان و مامەڵەی بازرگانی داو، بە تەواویی ماف بە خەڵك دان لە پێوان و کێشانداو، شتی خەڵك بە کەم نەگرتن و، قەناعەت کردن بە حەڵاڵێکی کەم و پوختەو، چاو نەبڕینە حەرامێکی زۆرو بۆر:**

خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ وَلَا تَنقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ ۚ إِنِّي أَرَاكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَا قَوْمِ أَوْفُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ اللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَا أَنَا عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە بەپێزە لە یازدە (١١) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم:** ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾، واتە: بۆ لای مەدیەن شوعەیبی برایانمان نارد، وەك پێشتر باسمان کرد، ئەم (و) واوە، واوی (عطف)ە، واتە: واوی گێڕانەوەو بادانەوەیە بۆ سەر شتێك، کە پێشتر باسکراوە، واتە: وەك

چۆن ئەی پێغەمبەر ﷺ! تۆمان ناردوە بۆ لای ئەم خەڵکە، بۆ لای گەلی مەدیەنیش شوعەیبی برایانمان پێشتر ڕەوانە کردووەو ناردوە.

باسمان کرد کە هەر کام لە مەدیەنو، (أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ) هەر یەکنو، لەو ڕووەوە پێیان گوتراوە : گەلی مەدیەن کە لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە چوونەتەوە سەر مەدیەنی کوڕی ئیبراهیم ؑ، یان مەدیانو، لەو ڕووەشەوە پێیان گوتراوە : (أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ)، خاوەنانی درەختە چڕو پڕەکە، یاخود باخە چڕو پڕەکە کە خاوەنی باخێکی چڕو پڕ بوون.

ئنجا بۆچی لە سووڕەتی (الشعراء)دا، نەگوتراوە: ﴿قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ شُعَيْبٌ﴾، وەك بۆ هەموو پێغەمبەرانی دی گوتراوە؟ وەڵام: بە پێویست نەزانراوە، مادام پێشتر باسکراوە، کە ان بووە، ئیدی لێرەدا بە پێویست نەزانراوە، دووبارە بکرێتەوە: ﴿كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾الشعراء، یان وەك پێشتر باسمان کرد لەبەر ئەوە بووە کە گەلی مەدیەن، بۆیە پێیان گوتراوە : (أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ) هاوەڵانی یاخود خاوەنانی درەختەکە، یان باخەکە، چونکە ئەو درەختو باخەیان پەرستوە، کە دیارە ئێستاش لە نێو هەندێك گەلو نەتەوانەدا، پەرستنی جۆرێك لە دارو درەخت هەیە.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەوان ئەو درەختەیان پەرستوە، خوای تاكو پاك ﷻ بە گونجاوی نەزانیوە بفەرموێ: برایەکەیان شوعەیب، (برای پەرستەرانی درەختەکە: شوعەیب)، یان لەبەر ئەوەی کە پێشتر باسکراوە، ئەگەرنا هەر یەك گەل بوون، بە ڕای زۆربەی زانایان، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد: بەرنامەکەی کە شوعەیب دەیخاتە ڕوو لە سووڕەتی (هود)داو، لە سووڕەتی (الأعراف)دا بۆ گەلی مەدیەن، هەر هەمان بەرنامەیە کە خستوویەتە ڕوو بۆ : (أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ) بگرە لە هەندێکی دا تەعبیرو وشەکانیشیان وەك یەکە، لە ڕووی نێوەڕۆکیشەوە هەر یەك شتە.

پێشتریش باسی ئەو شتانەمان کرد کە ئەوان {ئەوانەی دەڵێن (مَدْيَنَ)و (أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ) دوو کۆمەڵگابوون} بە بەڵگەیان هێناونەوە کە یەکییان ئەوەبوو کە خوا ناوی جیاجیای بۆ سزای ئەو دووانە بەکارهێناون، ئێمەش گوتمان :

ئەوە هەر تەنیا بۆ گەلی مەدیەن نەبووە، کە بە تەعبیری جۆراو جۆر سزایەکە باسکراوە، بۆ گەلی (لوط)یش هەر وا باسکراوەو، بۆ گەلی عادیش کە سزا دراون، هەر وا باسکراوە، ئەمەش جۆرێك بووە لە هونەری دەربڕین، کە هەر جارە گۆشەیەكو لایەنێك لەو سزایە باس بکرێ.

کەواتە: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾، واتە: بۆ لای گەلی مەدیەن شوعەیبی برایانمان نارد، ئنجا (هەر ئەو گەلی مەدیەنەش بوون، کە خاوەنی ئەو درەختە بوون، یاخود خاوەنی ئەو باخە چڕو پڕە بوون.

بڕگەی دووەم : کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾، ئەم تەعبیرە هەم لە سوورەتی (هود)دا، لە ئایەتی (٨٤)دا هاتووە، هەم لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (٨٥)دا، هاتوە، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، واتە: پەرستراوێکی دیکە کە شایستەی پەرستن بێ، پێشتریش باسمان کردوە هەمیشە کێشەی مرۆڤ لەم سەرزەوییە، ئەوە نەبووە کە خواو خاوەنی خۆی نەناسێ، خواناس بوون، خوایان ناسیوە، زانیویانە کە خوا تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی بوونە، هی ئەوانو بوونەوەرو دەوروبەریان، ئەدی کێشەکەیان لە چی دا بووە؟

لە شێوەی مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا، کە هاوبەشیان بۆ داناوەو هەندێك لە دروستکراوەکانیان هێناونە ئاستی خوا، یان خوایان دابەزاند بوو بۆ ئاستی هەندێك لە دروستکراوەکانو، هەندێك لە سیفەتەکانی خوایان بەکارهێناون بۆ دروستکراوەکان، یاخود هەندێك لە سیفەتەکانی خوایان پاڵداونە لای دروستکراوەکان، هەردەم کێشەی مرۆڤ لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ خوادا بووە، نەك لە نەناسینی خوادا، ئەوە لە قورئاندا لە زۆر شوێناندا هاتوە:

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾الزخرف، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ﴾الزخرف.

کەواتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کێشەیان لەگەڵ ناسینی خوادا نەبووە، بەڵکو کێشەیان لەگەڵ پەرستنی خواداو، تەنیا پەرستنی خواو، تەنیا بەندایەتیی کردن بۆ خوادا، بووە، ئا لێرەدا کێشە هاتۆتە پێش، هۆی تێکگیرانی پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) لەگەڵ گەلەکانیاندا، لەسەر تەنیا نە پەرستنی خوا بووە نەك نە ناسینی خوا، چونکە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە بەڵگە بۆ خەڵك بێنێتەوە، بڵێ: خەڵکینە! خوایەك هەیە، خاوەنی ئەو کەون و کائیناتەیەو ئێوەی دروست کردوە! هەمیشە پێغەمبەران لەوەوە دەستیان پێکردوە: (يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ )، ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، چونکە دیارە خوایان ناسیوە، بۆیە هەوڵیان نەداوە خوایان پێ بناسێنن، بەڵام تەنیا خوایان نەپەرستوە، بۆیە پێیان گوتوون: کە تەنیا خوا بپەرستن: ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴾، ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، بێجگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە.

ئنجا لە سوورەتی (الشعراء)دا، وەك پێشتر باسمان کرد، بە شێوەیەکی دی تەعبیر لەم تەنیا خواپەرستییە خوا بە یەکگرتنە کراوە، دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ ﴾الشعراء، واتە: پارێز لە خوا بکەن، پارێزی لێبکەن کە هاوبەشی بۆ دابنێن، ﴿ وَأَطِيعُونِ ﴾، فەرمانبەریی من بکەن، تاکو ڕێی تەوحیدو خوا بەیەکگرتنتان پێشان بدەم.

هەروەها لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ

مُفۡسِدِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: بۆ لای گەلی مەدیەن شوعەیبی برایانمان نارد، پێی گوتن: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن‌و، بە ئومێدی ڕۆژی دوایی بن‌و، لە زەوی دا خراپەکارانە مەیەن‌و مەچوون‌و، خراپەکاریی مەکەن.

**برگەی سێیەم** : ﴿ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ ﴾، لە پێوان‌و کێشاندا کەمیی مەکەن، واتە: ئەو شتانەی کە دەیانپێون‌و دەیانکێشن، کەموکورتییان تێدا مەکەن، کەموکوڕییان تێدا مەکەن‌و، مافی خەڵك زایە مەکەن‌و دامەشکێنن.

**برگەی چوارەم** : ﴿ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ ﴾، من ئێوە بە باش دەبینم، واتە: حاڵ‌و باری گوزەران‌و ژیان‌و باری ئابووریتان باشە، واتە: بیانووو پاساوی خیانەت‌و دزیی‌و فزیتان نیە، چونکە جاری وا هەیە ئاتاجیی‌و هەژاریی‌و نەداریی پاڵ بە کەسێکەوە دەنێ، دەستی بچێتە حەرامەوەو، دەستی بچێتە کارێکی ناشایستەوە، بەڵام ئێوە مادام حاڵ‌و باڵتان باشە، ئەو بیانووەشتان نیە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ ﴾، (الطبري) دەڵێ: (خَيْرَاتُ الدُّنِيَا عَامَّة)[1]، واتە: مەبەست پێی خێرو خۆشی‌و نازو نیعمەتی دنیایە بە گشتی، واتە: لە هەموو ڕوویەکەوە حاڵتان باشە.

**برگەی پێنجەم** : ﴿ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ﴾، من مەترسیی سزای ڕۆژێکی ئابلووقەدەرم لێتان هەیە، واتە: ڕۆژێك دێ کە سزایەکەی ئابلووقەتان دەدات‌و، ڕێی دەرباز بوون‌و هەڵاتن‌و قوتاربوونتان نابێ.

لە سوورەتی (الشعراء)دا بەم تەعبیرە دەیهێنێ، دەفەرموێ: ﴿ أَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُخۡسِرِينَ ﴿١٨١﴾ ﴾، پێوان تەواو بکەن‌و، لە زیانگەیەنەران مەبن.

---

١) جامع البیان، ج ١٢، ص ١٠٥ رقم: (١٨٣٠٧).

(أَخْسَرَهُ) (يُخْسِرُهُ)، واتە: مرۆڤ وایکرد، بەرانبەرەکەی زەرەر بکاتو زیانی لێ بدات، ﴿ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ ﴾الشعراء، بە تەرازوویەکی ڕێكو ڕاست شت بۆ خەڵك بکێشن.

بڕگەی شەشەم: ﴿ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ﴾، دووبارەی دەکاتەوە: ئەی گەلەکەم! (منیش یەکێکم لە ئێوە، هەستو سۆزی نەتەوایەتییان دەجووڵێنێ)، پێوانو کێشان بە تەواویی‌و بە دادگەرانە ئەنجام بدەن.

بڕگەی حەوتەم: ﴿ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ﴾، شتەکانی خەڵك بە کەم مەگرن، (البَخْسُ: نَقْصٌ عَلَى سَبِيلِ الظُّلْم)، (بَخْس)، بریتیە لەوە کە بەهۆی ستەم‌و دەستدرێژییەوە، شتی کەسێك کەم بکەیەوە، ئنجا ئەو کەم کردنەوەیە، کەم کردنەوەی ماددیی‌و بەرهەست دەگەیەنێ، وە کەم کردنەوەی مەعنەوییش دەگەیەنێ، (أي: عَيْناً أَوْ حُكْماً)، (عَيْناً)، واتە: کەسێك لە جیاتی ئەوەی چوار کیلۆی بۆ بکێشی، بۆ وێنە: سێ کیلۆو نیوی بۆ بکێشی‌و فێڵی لێبکەی، ئەوە لە ڕووی ماددیی‌و بەرهەستەوە، لێت کەم کردەوە. (حُكْماً)، ئەوەیە کە شتەکەی لە پێش چاو بێزڕێنی‌و شتەکەی بێبایەخ بخەیە بەرچاو، وابکەی کە کڕیار باش نەیکڕێ، یاخود شتەکەی لێی بێ ڕەواج بکەی‌و لە ڕووی مەعنەوییەوە لێی دابشکێنی.

بڕگەی هەشتەم: ﴿ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾، پێشتر باسمان کرد لە شیکردنەوەی وشەکاندا، کە وشەی: ﴿ تَعْثَوْا۟ ﴾، واتە: (لاَ تُفْسِدُوا فِي الأَرْض مُفْسِدِين) لە زەوییدا بە خراپەکارانە خراپە مەکەن، تێکدەرانە مەیەن‌و مەچن، لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: کێشان‌و پێوان‌و تەواو بکەن‌و، شتی خەڵك بە کەم مەگرن،

لێیان دامەشکێنن‌و، دوای ئەوەی خوا زەوی باش دروست کردوە، تێکدانی تێدا مەکەن‌و، خراپەکاریی تێدا مەکەن.

وشەی: ﴿ تَعْثَوْا ﴾، پێشتر باسمان کرد: دەگونجێ لە: (عَثِيَ، عِثيّاً) هاتبێ، یاخود لە (عَثَى، يَعْثَى، عثواً)ەوە، هەردووکیان بە مانای تێکدان‌و خراپەکاریین.

ئنجا دیارە (إفساد)یش، هەر بە مانای خراپەکارییە، زانایان دەڵێن: ئەمە بۆ زیاتر تۆخ کردنەوەی ماناو مەبەستەکەیەتی، وەك عەرەب دەڵێن: (لیل أليل)، واتە: شەوێکی شەو، هەر لە کوردەوارییش دا ئەوە بەکاردێ، دەڵێن: شەوێك بوو، بەڵام شەو!! یان سەرمایەکی سارد، دیارە ئەمجۆرە تەعبیرانە لە هەموو زمانەکاندا هەن.

لە سوورەتی (الشعراء)دا کە دەفەرموێ: ﴿ أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ ﴾، واتە: پێوان بە چاکیی بکەن‌و، لە زیانگەیەنەران مەبن، بەوانەی کە بۆیان دەپێون‌و، بە تەرازوویەکی ڕێك‌و ڕاست شتیان بۆ بکێشن‌و، لێیان کەم مەکەنەوە.

**برگەی نۆیەم**: ﴿ بَقِيَّتُ اللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾، واتە: بەجێهێڵراوی خوا، بۆ ئێوە باشترە، ﴿ بَقِيَّتُ اللَّهِ ﴾، دەڵێ: ئەو (بقية) کە پاڵی داوەتە لای خوا، بۆ تەشریفە، واتە: ئەو کەم‌و پوختەی کە دەمێنێتەوە بۆتان، لە ئەنجامی مامەڵەی ڕاست‌و دروستدا، ئەو حەڵاڵە، ئەو قازانجە کەم‌و پوختەی کە دەمێنێتەوە، باشترە بۆ ئێوە لە حەرامێکی زۆرو بۆر، ئەدی بۆچی پاڵی داوەتە لای خوا؟

چونکە بۆ تەشریفە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ نَاقَةُ اللَّهِ ﴾، حوشترەکەی خوا، دیارە هەموو حوشترەکان هەر هی خوان، بەڵام خوا ئەو حوشترەی بە تایبەت دروست کردوە، وە هەموو ڕزقێکیش هەر هی خوایە، بەڵام ئەو ڕزقە بۆیە پاڵدراوەتە لای خوا، لەبەرئەوەی ڕێزو حورمەتێکی تایبەتیی هەیە، چونکە بە حەڵاڵیی وەدەست هاتوە، ئاوایان لێکداوەتەوە: (ما أَبْقَاهُ اللهُ لَكُمْ،

بَعْدَ أَنْ تُوفوا الناسَ حُقوقَهُم بالمكيالِ وَالميزَانِ بالقِسْطِ، فَأَحلَّهُ لكُمْ، خَيْرٌ لَكُمْ مِنَ الَّذِي يَبْقَى لَكُمْ بِبَخْسِكُمُ الناسَ مِنْ حقوقِهِم)[1].

واتە: ئەوەی کە خوا بۆی هێشتوونەوە، دوای ئەوەی کە مافی خەڵك بەتەواویی دەدەن، بە پێوانو کێشانی دادگەرانەو، خوا بۆی حەڵاڵ کردوون، ئەوەندە قازانجە کەمو پوختەی کە دەمێنێتەوە، باشترە بۆ ئێوە لەوەی کە بەهۆی کەمکردنەوەی مافی خەڵکو، بەهۆی لێ داشکاندنیانەوە، وەدەستی دێنن، لە دەستکەوتی حەرام.

برگەی دەیەم: ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾، (الطبَري) دەڵێ: (إنْ كُنْتُم مُصَدِّقِينَ بوَعْدِ اللهِ وَوَعِيدِهِ، وَحَلالِهِ وَحَرَامِهِ).

واتە: ئەگەر ئێوە بەڵێنی خواو، هەڕەشەی خواو، حەڵاڵی خواو حەرامی خوا، بەڕاست دەزانن، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، چاوتان لە کەمو پوختێکی حەڵاڵ بێ، نەك زۆرو بۆرێکی حەرام.

برگەی یازدەیەم: ﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ﴾، واتە: من بەسەر ئێوەوە پارێزەر نیم، من جەبرتان لێ ناکەم بتانپارێزمو نەهێڵم خراپە بکەن، من تەنیا پێتان ڕادەگەیەنم، دینداریی بە زۆریی ناکرێ، خواپەرستیی بە زۆریی ناکرێ، وەك خوا بۆ خۆی فەرموویەتی: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴿٢٥٦﴾﴾البقرة، لە هەموو بوارەکاندا هەر وایە، دەبێ خەڵك خۆیان قەناعەتیان بەو ئایینو بەرنامەیە هەبێ، هەڵبەتە دوای ئەوەی دەڵێن: ئێمە قەناعەتمان بەو ئایینو بەرنامەیە هەیە، ئنجا دەستەڵاتی شەرعیی بە تایبەت لەو بوارانەدا کە پەیوەندییان بە مافەکانی خەڵکەوە هەیە، پابەندیان دەکات بەو یاسایانەوەو نابێ مافی خەڵك زایە بکەن، بەڵام لە سەرەتاوە ئازادن، ئایا بڕوایان بەو ئایینو بەرنامەیە هەیە، یان نا؟ بەڵام دوای ئەوەی کە ئیعلانی بڕوا پێبوونی دەکەن، دەبێ پابەند بن بە یاساکانیەوەو بە سنوورەکانیەوە، بەتایبەت ئەوەی کە پەیوەندیی بە مافەکانی خەڵکەوە هەیەو، واش نەبێ، کۆمەڵگا بەڕێوە ناچێ.

---

١) جامع البيان، ج ١٢، ص ١٠٦.

**مەسەلەی دووەم:**

## بەرپەرچدانەوەی گەلی مەدیەن بۆ شوعەیب ﷺ و، توانج تێگرتنیو، تۆمەتبارکردنی بە نەفامو بێمرادو بێ ئاگام:

خوا فەرموویەتی: ﴿ قَالُوا يَا شُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ ۖ إِنَّكَ لَأَنتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە چوار (٤) برگەدا:

**برگەی یەکەم** : ﴿ قَالُوا يَا شُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ ﴾، واتە: گوتیان: ئەی شوعەیب! ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکات؟ دوایی لە درێژەی ئایەتەکەدا، دەڵێن: ﴿ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ ﴾، کە ئەوەی بابو باپیرانمان پەرستوویانە، ئێمە وازی لێ بێنین، هەروەها واز لەوە بێنین کە بە کەیفی خۆمان لەماڵو سامانی خۆماندا تەصەڕوف بکەینو دەست کراوە بین؟

ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە زانیویانە نوێژی شوعەیب ﷺ مایەی هەڵسانیەتی بە پاکسازییو چاکسازیی کردن لە کۆمەڵگادا.

زانیویانە ئەو نوێژەی کە شوعەیب دەیکات، وای لێ دەکات لە کۆمەڵگاکەیەوە ڕانەمێنێ: تەرازوو بازیی بکەن، فرتو فێڵ بکەن، غەشو خیانەت بکەن لە یەکدی، شتی خەڵک بە کەم بگرن، خراپەکاریی بکەن، ئەویش تێیانەوە ڕابمێنێ، نوێژی خۆی لە ماڵی خۆی بکاتو، دەست بە کڵاوی خۆی بگرێ، با نەیبات، وەك زۆر لە مسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە، چ خەڵکی مسوڵمان بە گشتی، خەڵکی عەوام، یان کەسێك کە ناوی سەلەفیی لە خۆی دەنێ، یان ناوی ئەهلی تەریقەتو تەسەووف لە خۆی دەنێ، یان ناوێکی دیکە لە خۆی دەنێ، وە لە خراپەو تاوانو لادانی کۆمەڵگاکەیەوە ڕادەمێنێو، خۆی بە بەرپرسیار

نازانی، پێغەمبەران وا نەبوون! ئەوەتا گەلی مەدیەن بە شوعەیب ﷺ دەڵێن: ﴿أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ﴾، ئایا نوێژەکەتە فەرمانت پێ دەکات؟ زانیویانە نوێژ ئەگەر نوێژ بێ، فەرمان دەکات بە چاکەو، خاوەنەکەی ناچار دەکات کە لەگەڵ چاکەدا بێو، دژی خراپە بێو، پاکسازیی بکاتو چاکسازیی بکات لە کۆمەڵگاکەیدا، خوا لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ ٤٥﴾، واتە: بێگومان نوێژ خاوەنەکەی لە ناقۆڵاییو خراپە قەدەغە دەکات، چ لە خاوەنەکەیدا، چ لە دەوروبەری دا، نوێژێك نوێژ بێ، خاوەنەکەی وا لێدەکات کە دەست لە خراپە هەڵگرێ، چونکە (ٱلۡفَحۡشَآءِ) هەر قسەیەکی ناڕێكو نالەبارو ناقۆڵایەو، (ٱلۡمُنكَرِ)یش هەر کردەوەیەکی خراپو ناڕێکە، واتە: نوێژ خاوەنەکەی پاك دەکاتەوە لە هەرچی خراپەیە، چ بە زمان بگوترێ، چ بە ئەندامەکان ئەنجام بدرێو، خاوەنەکەشی وا لێدەکات کە دەوروبەری خۆی پاکسازییو چاکسازیی بکات.

**بڕگەی دووەم**: کە دەڵێن: ﴿أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ﴾، بۆیە عەقیدەو پەرستنیان پێش خستوە، چونکە هەر کام لە پێغەمبەران کە هاتوون، وەك هەر لەم ئایەتانەشدا دیارەو، لە هەموو شوێنەکانی دیکەدا دیارە، پێشێ لە چاکسازیی عەقیدەیی فیکرییەوە دەستیان پێکردوە، پێش لە ڕاستکردنەوەی مامەڵەی مرۆڤەکان لەگەڵ خوادا، دەستیان پێکردوە، کە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، تەنیا خوا بەندایەتیی بۆ بکرێ، بۆیەش خەڵکەکە دەڵێن: ئایا نوێژەکەت وات لێدەکات، فەرمانت پێ دەکات کە ئێمە وازبێنین لەوەی پێشینانمان بابو باپیرانمان دەیانپەرست؟!

**بڕگەی سێیەم**: ﴿أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْ﴾، یان ئایا نوێژەکەت وات لێدەکات، کە ئێمە وازبێنین لەوەی کە لە سامانەکانماندا، چی

دەمانەوێ، ئەوە بکەین؟ ﴿أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْ﴾، ئایا نوێژەکەت وات پێ دەڵێ، دەڵێ: (أَيْ: أَنْ نَفْعَلَ مـا تـأمُرُنـا: بِفِعْلِهِ، وَنَتْرُكَ مـا تـامُرُنـا بتَرْكِهِ)؟.

واتە: ئایا نوێژەکەت وات لێ دەکات کە ئەوە بکەین، کە تۆ فەرمانمان پێدەکەی بیکەین‌و، واز لەوە بێنین کە تۆ فەرمانمان پێدەکەی، وازی لێبێنین؟

لێرە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە شوعەیب ﷺ نەهاتوە تەنیا ئیمان‌و عەقیدەیان ڕاست بکاتەوەو، نەهاتوە تەنیا شیرك‌و بێبڕوایییان لێ قەدەغە بکات، بەڵکو هاتوە تەرازوو بازیی‌و تەصەڕڕوف کردنیان لە ماڵ‌و سامانی خۆیاندا، بێئەوەی گوێ بدەنە بەرژەوەندیی گشتی، لێیان قەدەغە بکات، وەك چۆن سیستمی کاپیتالیزم، ئێستا لە هەموو دنیادا باوەو گڵۆبالیزەیشن (عولمة ـ جیهانگیریی)، ڕەواجی پێ دەدا، کە دەوڵەمەندەکان بۆیان هەیە چۆن سەروەت‌و سامانیان زیاتر پەزمەندە بکەن‌و کۆی بکەنەوە، بێئەوەی گوێ بدەنە ئەوە داخۆ خەڵك‌و کۆمەڵگا زەرەر دەکات، یان قازانج دەکات؟ بەرژەوەندیی گشتی تێکدەچێ، یان نا؟ یاخود بێئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی: ئایا ژینگە تێکدەچێ، یان نا؟ لە ئاسمان چینی ئۆزۆن کونی تێدەبێ‌و، تیشکی زیانبەخش دێنە نێو مەجالی زەوییەوەو، سەرەنجام ئەو گۆڕانکارییە گەورانە دەبن لە ژینگەدا، کە هەموویان بە زیانی بەشەرو ئاژەڵ‌و پەلەوەرو هەموو شتێك تەواو دەبن! دیارە ئەمە بیرکردنەوەیەکی لەمێژینەیە لە نێو بەشەردا، کە پێیان خۆش بووە چۆن خۆیان پێیان خۆشە وا ڕەفتار بکەن، بێئەوەی گوێ بدەنە بەرژەوەندیی گشتی، بەڵام پێغەمبەران (علیهم السلام) هاتوون خەڵك پەیوەست بکەن بە بەرنامەیەکەوە، کە هەموویان قازانج بکەن، نەك کۆمەڵێکی کەمیان قازانج بکەن، لەسەر حیسابی زەرەر کردنی خەڵکێکی زۆر.

ئەوانە وادیارە بە پێی سیستمی کاپیتالیزمیی (سیستمی سەرمایەداریی) بەڕێوەچوون، هەڵبەتە سیستمی ئابووریی لە ئیسلامدا، لە نێوان سیستمی سۆشیالیزم‌و کاپیتالیزم دایە، (سەرمایەداریی‌و هاوبەشێتیی)، ئیسلام دەڵێ: نە سەرمایەداریی (کاپیتالیزمی) بێ بەندو بار، نە سۆشیالیزمی (هاوبەشیەتیی)

ناچارکەرو بە فشار، بەڵکو دەبێ هەم بەرژەوەندیی تاك بپارێزێ، هەم بەرژەوەندیی کۆمەڵ، ئێمە لە کتێبی یازدەیەمی مەوسووعەی: (الإسلام کما یتجلی في کتاب الله)دا، بە درێژیی باسی هێڵە گشتییەکانی ئابووریی ئیسلامییمان کردوە، کە ئێستا دەرفەت نیە، باسی بکەین،و لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی،و عەلمانیی)دا، شتێکمان لێ باس کردوە، هەروەها لە کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) بە تایبەتی لە چاپی شەشەمدا، لەوبارەوە هەندێك شتمان باسکردوە.

**بڕگەی چوارەم :** بە شووعەیب ﷺ دەڵێن: ﴿إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴾، (بە جەخت کردنەوە دەڵێن:) تۆ زۆر هێدیی،و مەندیی،و، زۆر سەرڕاستی.

(الحِلم: ضَبْطُ النَّفْسِ عِنْدَ الهَيَجان، فَهو لَيْسَ العَقْل بَلْ مِنْ مُسَبَّبات العَقْلِ وَنَتائِجِهِ)، (حلم): بریتیە لە خۆ کۆنترۆڵ کردن لە کاتی هەڵچوون،و تووڕەیی داو، (حلم) بریتی نیە لە عەقڵ، بەڵکو لە دەرهاویشتەکان،و لە بەرەنجامەکانی عەقڵە.

(رُشد)یش: دەڵێ: (الرُشد خِلافُ الغَيِّ)، (غَيّ) واتە: بێمراد بوون،و بە ئاکام نەگەیشتن، بەڵام (رُشد)، واتە: سەرڕاستیی،و بە ئامانج گەیشتن، وەك پێشتریش باسمان کردوە : زۆر کەس (ضلال)و (غِوَاية)، لە لایەك،و (هِدَاية)و (رُشْد) لە لایەکی دیکەوە تێکەڵ دەکەن، بەڵام لە ڕاستییدا (غَي) بەرئەنجامی (ضلال)ە، ئینسان کە گومڕا بووو بە ڕێی نەزانی، سەرگەردان دەبێ،و بە ئامانج ناگات، بێمراد دەبێ، بەڵام ئینسان ئەگەر بەرچاوی ڕوون بوو، بەرپێی خۆی بینی،و بە ڕێی زانی،و هیدایەتی هەبوو، ئەو کاتە سەرڕاستیش دەبێ،و بە ئامانجیش دەگات.

مەسەلەی سێیەم: دیارە شوعەیب عليه السلام لە بەرانبەر ئەو قسانەی وانداو، لە بەرانبەر ئەو تۆمەتانەی ئەواندا، بێدەنگ نابێ، بەلاَم دیارە بە شێوازی بەرزی پێغەمبەرانەی خۆی، وەلاَم دەداتەوە.

**وەلاَمدانەوەی شوعەیب عليه السلام کە لەلایەن پەروەردگارییەوە، لەسەر بەڵگەیەو، چاوی لە ماڵی ئەوان نیەو، ئامۆژگاریی کردنی بۆیان:**

خوا فەرموویەتی : ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ ﴾.

لەم سێ ئایەتەدا، شوعەیب عليه السلام وەلاَمی ئەو قسەو ئەو تۆمەتانەی ئەوان دەداتەوەو، زیاتر تیشك دەخاتە سەر بەرنامە چاکسازییە گشتگیرو هەمە لایەنەکەی خۆی .

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە بەپێزە لە چواردە (١٤) برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ ﴾: فەرمووی: ئەی گەلەکەم! وەك پێشتریش باسمان کردوە، هەمیشە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) هەوڵیان داوە، هەستو سۆزی نەتەوایەتیی ئەو خەڵکانەی کە دواندوویانن، بجووڵێنن، هەستی خزمایەتییان بجووڵێنن، تاکو دڵنیابن کە ئەو پێغەمبەرە عليه السلام چاکەو بەرژەوەندیی ئەوانی دەوێ، ئەویش یەکێکە لەوان، هەر قازانجو

خۆشییەك بۆ ئەوان بێتە پێش، ئەویش لێی بەهرەمەندە، وە هەر زەرەرو زیانێك ڕوو لەوان بكات، ئەویش لێی زەرەرمەندە.

برگەی دووەم: ﴿أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي﴾، هەواڵم پێ بدەن! ئەگەر من لەلایەن پەروەردگارمەوە، لەسەر بەڵگەیەكی ڕوون و ڕۆشنبم، واتە: بەرچاو ڕوون بم و، من زۆر چاك بەرپێی خۆم دەبینم و، زۆر چاك دەزانم چی دەكەم و، خوای پەروەردگار چ بەرنامەیەكی بۆ ناردووم.

برگەی سێیەم: ﴿وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا﴾، خوا لەلایەن خۆیەوە بژیوێكی باشیشی پێدابم، واتە: بژیوێكی وای پێداوم، كە منی بێنیاز كردوە، لەوەی چاوم لە دەستی ئێوە بێ.

خاوەنی (التحرير والتنوير)، گوتوویەتی: لێرەدا بژیوی باش مەبەست پێی پێغەمبەرایەتییە، ئنجا لەبەر ئەوەی من زۆر جار لە بۆچوونەكانی (التحرير والتنوير)ی (محمد الطاهر بن عاشور) سوود دەبینم و، لە هی تەفسیرەكانی دیكەش، بۆیە ئەگەر شتێك بە دڵم نەبێ و نەیپێكا بێ، جار جارێك، هەڵبەتە ئەوەی كە بە پێویستی بزانم، ئاماژەی پێ دەكەم، كە لێرەدا پێم وایە نەیپێكاوە، بە بۆچوونی من، چونكە: ﴿رِزْقًا حَسَنًا﴾، ڕزق بە ناوی پێغەمبەرایەتیی هەر نایەت و، بەپێی سیاقی ئایەتەكانیش دەردەكەوێ كە مەبەست پێی ئەوە بووە: من بێنیازم و دەوڵەمەندم و، چاوم لە سەروەت و سامانی ئێوە نیە، چونكە هەمیشە دوژمنان و ناحەزانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) پێغەمبەرانیان بەوە تۆمەتبار كردوە، كە دەیانەوێ خۆیانیان بەسەردا فەرز بكەن و، تەماعیان لە ماڵ و سامانی ئەواندا هەیە و، دەیانەوێ بەرژەوەندییەكانیان تێكبدەن، بۆیە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) ئەو تۆمەتانەیان ڕەت كردۆتەوە.

برگەی چوارەم: ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ﴾، ناشمەوێ پێچەوانەی ئەوە بكەم، كە ئێوەی لێ قەدەغە دەكەم.

(يَعْني: لم أَكُنْ لأَنْهاكُمْ عَنْ أَمْرٍ، ثُمَّ أَرْكَبَهُ وَآتِيَهُ) واتە: من شتێکتان لێ قەدەغە ناکەم، دوایی خۆم ئەو شتەیە بکەم، یاخود بە تەعبیرێکی دی: (أَي: أَنْ أَفْعَل خِلاَفَ الأَفْعَال التِي نَهَيْتُكُمْ عَنْها، بأَنْ أَصْرِفَكُمْ عَنْها، وَأَنا أَسير إِلَيْها) واتە: من پێچەوانەی ئەو کردەوانەی کە ئێومیان لێ قەدەغە دەکەم ڕەفتار ناکەم، کە ئێوە لەو کردەوانە لابدەم، دوایی خۆم ئەو کردەوانەی کە ئێومیان لێ قەدەغە دەکەم، ئەنجامیان بدەم، لە زمانی عەرەبی دا دەڵێ: (خَالَفَني إِلى الماءِ، أي: ذَهَبَ إِلَيْهِ وَارِداً، وَأَنا صَادِرٌ)، (خَالَفَنِي إِلى الماء) واتە: ئەو چوو بۆ سەرچاوەکە منیش دەهاتمەوە، لێرەدا شوعەیب ﷺ مەبەستی ئەوەیە بفەرموێ:

یەکەم : من پێچەوانەی قسەکانی خۆم ڕەفتار ناکەم.

دووەم : بەس ئەوە نیە کە بمەوێ لەگەڵ ئێوەدا تێکبگیرێم‌و ناکۆکیی‌و مشتومڕم هەبێ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە خۆم‌و ئێوەش، ئەو کردەوە خراپانە هیچیان نەکەین.

کە دەفەرموێ: ﴿أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ﴾، هەواڵم پێبدەن! ئەگەر من لەسەر بەڵگەیەکی ڕوون‌و ئاشکرا بم لە پەروەردگارمەوە ڕزق‌و بژیوێکی باشیشی پێدابم‌و بێنیازی کردبم لە ئێوەو، نەشمەوێ کە من پێچەوانەی ئەوەی کە ئێوەی لێ قەدەغە دەکەم، مامەڵە بکەم، وەڵامەکەی دیار نیە، بەڵام وەڵامەکەی زانراوە، واتە: ئایا بابایەکی وەك من، دەبێ ئاوا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ؟ یاخود ئایا دڵسۆزێکی وەك من، نابێ بە قسەم بکەن‌و گوێم بۆ بگرن؟! لێرەدا بە پێویستی دەزانم فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ بێنین، لەوبارەوە کە ئینسان کە شتێکی گوت، دەبێ خۆی پێش خەڵك ئیشی پێ کردبێ، یان ئیشی پێ بکات، ئەگەرنا سزایەکی زۆر سەختی هەیە، جارێ خوای پەروەردگار لە سەرەتای سووڕەتی (الصف)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ

ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بۆچی شتێك دەڵێن: كردەوەی پێ ناكەن، لەلای خوا گەورەترین گوناهەو مایەی تووڕەبوونی خوایە، كە شتێك بڵێن، كردەوەی پێ نەكەن.

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: {يُجاءُ بالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُلْقى فِي النارِ، فَتَنْدَلِقُ أَقْتابُهُ فِي النارِ، فيدورُ كما يدورُ الْحِمارُ بِرَحَاهُ، فَيَجْتَمِعُ أَهْلُ النّارِ عَلَيْهِ، فَيَقُولُونَ: أَيْ فُلانُ ما شأنُكَ؟ أَلَيْسَ كُنْتَ تأمُرُنا بالمعْرُوفِ، وَتَنْهانا عَنِ المنْكرِ! قالَ: كُنْتُ آمُرُكُمْ بالمعْرُوفِ ولا آتِيهِ، وَأَنْهاكُمْ عَنِ المنْكرِ وآتِيهِ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢١٨٤٨)، وَالحُمَيدي، برقم: (٥٤٧)، وَالبُخارِيّ، برقم: (٣٠٩٤)، وَمُسْلِم، برقم : (٢٩٨٩)}.

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوێك دەهێنرێ فڕێ دەدرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوەو، بە ڕیخۆڵەكانی وەك چۆن كەر لە دەوری ناعوور دەسووڕێ، ئەویش ئاوا لە شتێك گیر دەبن، ئەویش بە دەوری خۆی دا دەسووڕێ، خەڵكی ئاگری دۆزخ لێی كۆدەبنەوە، دەڵێن: ئەرێ هۆی فلان كەس! ئەدی تۆ نەبووی فەرمانت پێ دەكردین بە شتی پەسندو، ڕێگریت لێ دەكردین لە شتی ناپەسندو خراپ، دەڵێ: بەڵێ فەرمانم بە شتی پەسند پێ دەكردن، بەلام نەمدەكردو، ڕێگریم لە شتی نا پەسند لێ دەكردن، بەلام خۆم دەمكرد.

**بڕگەی پێنجەم** : شوعەیب ﷺ بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ : ﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُ﴾، من تەنیا چاكسازییم دەوێ، ئەوەندەی بتوانم، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (ما: مَصْدَرِيةٌ أَو خَبَرِيةٌ، أي المقْدارَ الذي استطَعت، أَوْ إِصْلاحَ ما استطَعْت)، واتە: من تەنیا چاكسازییم دەوێ، ئەو چاكسازییەی كە بیتوانم، یاخود ئەو ئەندازەیەی كە بیتوانم لە چاكسازیی، یاخود ئەوەی كە بۆم باش بكرێ لە چاككردن، (ما استطعت)، ئەگەر (مصدرية) بێ، واتە: ئەو ئەندازەیە لە چاكسازیی كە دەیتوانم، بەلام ئەگەر (خبرية) بێ، یانی: چاكسازیی ئەو شتەی كە من بۆم دەكرێ.

**بڕگەی شەشەم:** ﴿وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾، کار ئاسانییشم، کار لەبەر ڕۆیشتنیشم‌و، سەرکەوتنم لە کارەکەشمدا، تەنیا بە خوایە.

(التَّوْفِيقُ ضِدّ الخُذْلان، وَهو الفَوْزُ والنجاح)، (توفيق) دیارە پێچەوانەی (خُذلان)ە، واتە: بێئاکام بوون، (توفيق)، واتە: کار بۆ ئاسان بوون‌و بە ئامانج گەیشتن.

**بڕگەی حەوتەم:** ﴿عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ﴾، واتە: تەنیا پشتم بە خوا بەستوە، ئەم شێوازە کە (الجار والمجرور) پێش (فعل و فاعل) دەکەوێ، کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، واتە: بەس پشتم بە خوا بەستوە.

**بڕگەی هەشتەم:** ﴿وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾، ئەمیش دیسان بە هەمان شێوە (الجار والمجرور) پێشکەوتوە، واتە: تەنیا بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە، بۆ لای ئەویش دەچمەوەو تەنیا چاوەڕوانییم لەو هەیە.

**بڕگەی نۆیەم:** ﴿وَيَٰقَوۡمِ﴾، دووبارە جارێکی کە لێیان دووبارە دەکاتەوە، ئەی گەلەکەم! ئەی خەڵکەکەم! کۆمەڵگایەکەم!

**بڕگەی دەیەم:** ﴿لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم﴾، ﴿لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ﴾، (جَرَمَهُ وَأَجْرَمَهُ: كَسَبَهُ وَأَكْسَبَهُ)، واتە: با واتان لێنەکات، چی وایان لێنەکات؟ ﴿شِقَاقِيٓ﴾، ناکۆکییم، (الشّقَاق شِدّة الخِلافِ، لأَنَّ كُلاً مِنْهُما يَكونُ فِي شِقٍ)، ﴿شِقَاقِيٓ﴾، بریتیە لە زۆر ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی، چونکە هەر کامێکیان لە لایەك دەبێ، واتە: با ناکۆکییتان بۆ من‌و دووبەرکییتان لەگەڵ من، واتان لێنەکات، کە تووشتان بێ، چییان تووش بێ؟ لە بڕگەی یازدیەمدا باس دەکات.

**بڕگەی یازدەیەم :** ﴿ مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ ﴾، وێنەی ئەوەی کە تووشی گەلی نووح، یان تووشی گەلی هوود، یان تووشی گەلی صالّح بوو، با هەمان بەڵای کە بەسەر ئەو سێ گەلانە هاتوون بەسەر ئێوەش نەیەت، بەهۆی ناکۆکییتان لەگەڵ منو دووبەرەکییتان لە دژی منەوە.

**بڕگەی دوازدەیەم :** ﴿ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ﴾، ئنجا باسی گەلی چوارەم دەکات:

گەلی (لووط)یش لێتانەوە دوور نین، واتە: لە ڕووی کاتەوە، لێتان دوور نەبوونو، بە دوای ئەوان دا هاتوون، لە ڕووی شوێنی جوگرافیاشەوە، لێتان نیزیك بوونو، لە ڕووی ڕەچەڵەکیشەوە، لە هەموو ڕوویێکەوە گەلی لووط لێتان دوور نەبوون، پەند وەربگرن لەو گەلە پێشووانە، بە تایبەتی لە گەلی لووط، کە لێتان دوور نین، ئەگەر گەلی نووح چەندان سەدە لە پێش ئێوەوە بوونە، چەندان هەزار ساڵ، ئەگەر گەلی عاد کە هوود پێغەمبەریان بۆ چووە، زۆر لە پێش ئێوە بوونو، گەلی ثەموود کە صالّح پێغەمبەریان بۆ چووە، لە پێش ئێوەوە بوون، گەلی (لووط) لێتانەوە دوور نین.

(الزمخشري)، دەڵێ: وشەی (بَعِید)و (قَرِیب) و (قَلِیل)و (كَثِیر)، (نێرینە)و (مێینە) تێیاندا یەکسان دەبن، دەڵێ: (يَجوزُ أنْ يَستوِي فِي بعِيد وقريب، وقليل وكثير، المذكر أو المؤنث لِوردوها على وَزْنِ المصَادِر، كالصَّهيل والشهيق)، واتە: وشەکانی (بعِید وقریب، وقلیل وکثیر)، لەبەرئەوەی کە لەسەر کێشی چاوگەکان دێن، وەك (صهیل) و (شهیق)، (صَهیل)، واتە: حیلکاندن، (شهیق)، واتە: هەناسە هەڵمژین، بۆیە نێرینەو مێینە (مذکر، مؤنث) تێیان دا بە یەك شێوە دێن.

کورتەکەی ئاوای لێدێتەوە: (أَي: لا تَحْمِلَنَّكُمْ وَلاَ تَكْسِبَنَّكُمْ مَشاقَّتُكُمْ وَعَدَاوَتُكُمْ لِي أنْ تُفْضِيَ بالإِصْرَارِ عَلَيْها: إِصَابتِكُم بمِثْلِ ما أَصَابَ مُكَذِّبِي الرسُل قَبْلَكُمْ).

واتە: با دژایەتییتان بۆ منو، ناکۆکییتان لەگەڵ من، واتان لێ نەکات کە سەرەنجام بەهۆی بەردەوامییتان لەسەر دژایەتییو ناکۆکییتان بۆ من، ئەوەتان تووش بێ کە تووشی بە درۆ دانەرانی پێغەمبەرانی پێشوو بووە، صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەران.

**برگەی سێزدەیەم**: ﴿ وَٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ ﴾، داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای.

چەند جارێك باسمان کردوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: پێشێ داوای لێبوردنی لێبکەن، واتە: پێشێ دان بە هەڵەکانی خۆتاندا بێننو کەموکوڕییەکانتان ببینن‌و، خۆتان پاك بکەن‌و لە کەموکوڕییەکان خۆتان بژار بکەن، ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ ﴾، ﴿ ثُمَّ ﴾، ئامرازی ڕیزکردن‌و بەدواداهاتن (الترتیب والتراخي)یە، یانی: دوای ئەوەی خۆتان پاکسازیی کرد، ئنجا دەتوانن چاکسازیی لە خۆتاندا بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئینسان تاکو شیرك‌و کوفرو نیفاق‌و ئەو سیفەتە خراپانە لە خۆی دانەڕنێ‌و خۆی لێیان بژار نەکات، خۆی لێیان پاك نەکاتەوە، شایستەی ئەوە نابێ بچێتەوە بۆ لای خواو، بگەڕێتەوە بۆ لای‌و لێی نیزیك بێتەوەو، خۆی بە ئیمان‌و تەوحیدو تاعەت‌و ڕەوشت‌و ئاکارە جوان‌و پەسندەکان برازێنێتەوە.

**برگەی چواردەیەم**: ﴿ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴾، واتە: بێگومان پەروەردگاری من زۆر میهرەبان‌و بە بەزەییەو، زۆریش خۆشویستەرە.

(الوَدُودُ: المحِبّ)، خاوەنی (مختار الصحاح) دەڵێ: (وَدِدتُ لَو فَعَلْتُ كَذَا: تَمَنَّيْتُ، وَدِدْتُ الرَّجُلَ: أَحْبَبْتُهُ)، وشەی (ودود)، واتە: خۆشویست، (محبوب)، واتە: خۆشویستراو، بەڵام (مُحِب) واتە: خۆشویستەر، ئنجا (ودود) بە مانای خۆشویستەر دێ، واتە: پەروەردگاری من زۆر بە بەزەیی‌و میهرەبانە، بەخشندەیە لەگەڵ بەندەکانی داو، زۆریش خۆشی دەوێن، هەڵبەتە خوا ﷻ ئەو بەندانەی خۆش دەوێن کە بۆ خوا صوڵحاوو چاکن، ئەو بەندانەی کە خۆیان بژار دەکەن لە سیفەتە خراپەکان، بەر لە هەموو شتێك: شیرك‌و کوفر، هەروەها خۆیان

دەڕازێننەوە بە سیفەتە چاکەکان، بەر لە هەموویان: ئیمانو خوا بە یەکگرتن، خوا لە گۆترە نە ڕقی لە کەس هەڵدەستێ، نە کەسیشی خۆشدەوێ، خوا کار بەجێیە، ئنجا دەڵێ: (وَدِدْتُ لو فَعَلْتُ كَذَا)، واتە: خۆزگەم خواست ئەو شتەم کردبایە، (وَدِدْتُ الرَّجُلَ: أَحْبَبْتُهُ)، واتە: پیاوەکەم خۆشویست.

(الطبري) دەڵێ[1]: (وَدُود: ذُو مَحَبَّةٍ لِمَنْ استغْفَرَ وَتَابَ إِلَيْهِ، يَوَدُّه وَيُحِبُّهُ)، (ودود)، واتە: خاوەن خۆشەویستییە بۆ کەسێك داوای لێبوردن لە خوا بکاتو بگەڕێتەوە بۆ لای، خۆشیدەوێو بە تەنگیەوەیەتی.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەهۆی خۆ بژار کردنمان لە سیفەتە پەستەکانو خۆڕازاندنەوەمانەوە بە چاکسازییو پاکسازیی لە خۆماندا، دەبنە خۆشەویستی خوا.

## مەسەلەی چوارەم:

**وەڵامدانەوەی زبرو بێنەزاکەتی گەلی مەدیەن بۆ پێغەمبەر شوعەیب ﷺ و، هەڕەشە لێکردنی بە بەردباران کردنیو، ناوو ناتۆرەی ناخۆش لێهەڵدانی، وەك: بێهێزو، ئەوە کە خاوەنی عیززەتو باڵادەستیی نیە :**

خوا فەرموویەتی : ﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًاۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ٩١ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار (٤) برگەدا:**

**برگەی یەکەم** : ﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ ﴾، واتە: گەلی مەدیەن، گوتیان: ئەی شوعەیب! زۆر لەوەی کە دەیڵێی باش تێی ناگەین، بە وردیی تێی ناگەین.

---

١) جامع البيان، ج ١٢، ص ١١١.

## شیکردنەوەی چەمك و واتای (فقە)

وشەی (فِقْه)، دەڵێ: (الفِقْهُ: الفَهْمُ الدَّقِيق العَمِيق المؤَثّرُ فِي النَّفْس الباعِثُ عَلَى العَمَلِ)، واتە: (فِقْه) یانی: تێگەیشتنی ووردو قووڵو کاریگەر لەسەر دەروونو، هاندەر بۆ کردەوە، (فِقْه) بە چەند جۆرێك پێناسە کراوە:

١/ هەندێکیان گوتوویانە: (الفِقْهُ: الفَهْمُ)، (فِقْه) واتە: تێگەیشتن، (فهم) تێگەیشتنە، واتە: (فقە) و (فهم)یان، بە دوو وشەی هاوواتا (مترادف) لێکداونەوە.

کە ئەمە وانیەو، من ڕای ئەو زاناو پسپۆڕانەی شارەزای زمانی عەرەبییم پێ پەسندە، کە دەڵێن: وشەی هاو واتا (مترادف) لە زمانی عەرەبیی دا نیە، ئەگەر لە زمانی عەرەبییشدا هەبێ، لە بەکارهێنانی قورئاندا، لە فەرموودەی خوا دا، وشەی هاوواتا بەکارنەهاتوون، هەر وشەیەك کە بەکارهاتوە، با بە ڕواڵەت هەمان مانای وشەکەی دیکەشی هەبێ، بەڵام جیاوازییەکی هەر هەیە.

٢/ هەندێکیان وشەی (فقە)یان ئاوا لێکداوەتەوە: تێگەیشتنێکی وردی قووڵی کاریگەر لە دەروونی ئینساندا، کە وای لێبکات ئەو ئینسانە بەو کارە هەڵسێ.

٣/ هەندێکیان گوتوویانە: (الفِقْهُ: فَهْمُ مُرَاد المتَكَلِّم مِنْ كَلاَمِهِ)، (فقە)، تێگەیشتنە لە مەبەستی قسەکەر لە قسەکەیدا.

٤/ هەندێکیان گوتوویانە: (الفِقْهُ: أَخَصُّ مِنَ العِلم، وَهو التوصّلُ بِعِلم شاهِدٍ إلى عِلمٍ غَائِب)، واتە: (فقە) تایبەتترە لە زانیاریی، کە بریتیە لە گەیشتن بە زانیاریی دەربارەی شتێکی نادیار، بەهۆی زانیارییەکی دیارەوە، یانی: بەهۆی شتێکی دیارەوە گەیشتن بە شتێکی نادیار.

لێرەدا گەلی مەدیەن کە گوتوویانە: ﴿مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ﴾، واتە: دیوی پەنهانو شێردراوەو قووڵی قسەکانت بۆ ئێمە فامکراو نیە، ئێمە لێی

تێناگەین، لە مەبەستەکەت تێ ناگەین، هەڵبەتە لێرەدا دەبێ ئەوە بزانین کە هەر کەسێك لە چ ژینگەیەکدا ژیا بێ، لە چ هەلومەرجێکداو، سەروکاری لەگەڵ چ جۆرە موفرەدەو وشەو تەعبیرێك، یاخود چ جۆرە ئامانجو مەبەستێك دا بێ، لە ژیانیدا زیاتر سەروکاری لەگەڵ چیدا بێ، زیاتر لەوە تێدەگات، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (ئەگەر لە بابایەکی برسی بپرسیی : دوو کۆ دوو دەکاتە چەند؟ دەڵێ: دەکاتە: چوار کولێرە، چوار نان)، چونکە هەر بیر لەوە دەکاتەوە کە خۆی پێویستی پێیەتی، ئنجا ئەوانەش خەڵکێکی ماددیی بوون، وەك زۆربەی کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوای ئەم ڕۆژگارە، بەڵکو زۆرێك لە کۆمەڵگا مسوڵمانەکانیش هەر چوونە سەر مەشرەبی ئەوان، بەڵێ مرۆڤە ماددییەکان زیاتر بیر لە پشتێن بەرەو ژێریان دەکەنەوە: گەدەو داوێنو گیرفانیان، بۆیە سەیر نیە کە گەلی مەدیەن لە قسەکانی شوعەیب ﷺ حاڵی نەبوو بن، کە بۆی باسی کۆمەڵێك مەبەستو چەمك کردوون، کە لە سەرووی ژیانی ماددییەوە بوونو، دیوی پەنهانی ژیانیان گرتۆتەوە، لایەنە بەرزەکەی مرۆڤیان گرتۆتەوە، لە پشتێن بەرەو ژووری: باسی تێگەیشتنی ڕاستو دروستو، بوونناسییو جیهان بینییو باسی هەستو سۆزی موبارەکی دڵسۆزییو پەرۆشیی بۆ خەڵكو، ترسان لە ڕۆژی دواییو، بەرپرسیارێتیی بەرانبەر بە خواو بەرانبەر بە خەڵك، بەرانبەر بە مێژوو، بەڵێ سەیر نیە کە گەلی مەدیەن کە لەو قسە بەرزانەو لەو مەبەستە گەورانە تێنەگەیشتبن، چونکە ئەوان لە ئاستێکی نزمی ژیانی ئاژەڵانەو ماددییانەدا ژیاون.

**برگەی دووەم** : ﴿وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا﴾، بێگومان ئێمە تۆ لە نێو خۆماندا بێهێز دەبینین، واتە: چۆن تۆ دەڵێی: ﴿وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ۝٨٤﴾، واتە: من مەترسیی ڕۆژێکی ئابڵووقەدەرم لە ئێوە هەیە، خۆ تۆ بێهێزی! وایانزانیوە کە مەبەستی ئەوە بووە خۆی سزایەکەیان بۆ دێنێ! بۆیە گوتوویانە: تۆ کە لە ئێمە بێهێزتریو، لە بەرانبەر خۆماندا بێهێزو دەستە پاچەت دەبینین، چۆن بە سزایەکی ئابڵووقەدەرو دەورە دەر

دەمانترسێنی؟! لە هەمبانەی خۆیانەوە گوێزیان ژماردوونو، وایانزانیوە کە شوعەیبیش لەلایەن خۆیەوە هەڕەشەیان لێدەکات.

بڕگەی سێیەم: ﴿وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ﴾، ئەگەر کۆمەڵەکەت نەبوونایە، بەردبارانمان دەکردی.

(رَهْطُكَ: أي عَشيرتُكَ الأَقْرَبُون، رَهْطُ الرجُلِ: قَوْمُهُ وَقَبِيْلَتُهُ، الرَّهْطُ: جَماعَةٌ مِنْ ثَلاثَةٍ إلى تِسْعَةٍ، جَمْعُهُ : أَرهُط وأَرْهاط، وَجَمْعُ جَمْعِها أَرَاهِط وَأَرَاهِيط)، مەبەستیان لە (رهط، رهطُك) واتە: خزمە نیزیکەکانت، عەشیرەتە نیزیکەکەت، (رهطُ الرَّجُلِ)، واتە: خەڵکەکەیو خزمە نیزیکەکانی تیرەو هۆزەکەی، وشەی (رهط) لە سێ کەس تاکو نۆ کەس، دەگرێتەوەو، کۆی (رهط) (أرهُط، أرهاط)ە، کۆی کۆیەکەی: (أَرَاهِط، أَرَاهِيط).

ئنجا کە دەڵێن: ئەگەر خزمەکانت نەبوونایە، کۆمەڵە نیزیکەکەت نەبووایە، بەردبارانمان دەکردی، واتە: بەهۆی ئەوانەوە ئێمە دەستت لێ نادەین، ئەگەرنا تۆ لە بەرانبەر ئێمەدا بێ دەستەڵاتی.

هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: (رهطُكَ)، واتە: ئەو کۆمەڵە بڕوادارەی کە شوێنت کەوتوون، بەڵام بێگومان مەبەست ئەوە نیە، بۆچی؟ چونکە کۆمەڵگای کافری مەدیەن، ڕێزی شوعەیبیان نەگرتوە، کە گوتوویەتی: من پێغەمبەری خوام ﷺ و، پێغەمبەران لە لووتکەی هەموو ڕەوشتیکی بەرزو جوانو ئاکار پەسندیی دا بوون، دیارە خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی لەنێو کەسانێکی خاوەن ڕەچەڵەك بەرزیشدا هێناون، بۆئەوەی وا نەبن کەسێك بتوانێ تانە لە نەسەبو ڕەچەڵەکیان بداتو، بە کەم تەماشایان بکات.

ئنجا ئەوان کە ڕێزی شوعەیبیان لەلا نەبوو بێ، کۆمەڵە بڕوادارێکی ڕەشو ڕووت کە بە دوای شوعەیب کەوتوون، بە تەئکید حیسابیان بۆ نەکردوون، کەواتە: مەبەست لە (رهط) خزمەکانی بوون، کە هاو فیکرو هاو مەشرەبی خۆیان بوون، وەك خۆیان کافرو بێبڕوا بوون، وەك چۆن پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ قورەیشییەکان لەبەر ئەبو طالیبی مامی کە هەر لەسەر شیرك مابۆوە،

هەروەها لەبەر بەنو هاشیم کە زۆربەیان هەر لەسەر شیركو کوفر بوون، لەبەر ئەوان دەستیان لە زۆر شت دەپاراست لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە هەمان شێوە خزمەکانی شوعەیبیش، هەر ئەهلی کوفرو شیرك بوون، ئنجا گەلی مەدیەن لەبەر خزمە نیزیکەکانی، دەستیان لێ پاراستوە.

بڕگەی چوارەم : ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ﴾، تۆ لەسەر ئێمە بالادەست نی، واتە: ئێمە بە بالادەستت نابینین لە نێو خۆماندا، دەستت بەسەر ئێمەدا ناڕوات، واتە: ئەگەر لەبەر خزمەکانت نەبووایە، لەبەر نیزیکەکانت نەبووایە، تۆ لە بەرانبەر ئێمەدا بێهێزیو، بالادەست نیو، ئەگەر لەبەر ئەوان نەبووایە دەمانکوشتیو بەردبارانمان دەکردی، دیارە بەردبارانکردنیش خراپترینو پیسترین جۆری کوشتنە، واتە: بە خراپترین شێوە دەمانکوشتی.

**مەسەلەی پێنجەم :**

**بێباکیی دەربڕینی شوعەیب ﷺ و، هەڕەشە لێکردنیان بە هاتنی سزای دنیایی لەلایەن خواوە ﷻ، یانی: هاتنی سزای ڕۆژی دوایی :**

خوا فەرموویەتی : ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٩٢﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞۖ سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞۖ وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ ﴿٩٣﴾ ﴾.

**توێژینەوەی ئەم دوو ئایەتە لە هەشت (٨) بڕگەدا:**

بڕگەی یەکەم : ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ ﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم! وەك زۆرجار گوتوومانە: هەمیشە پێغەمبەران دڵسۆز بوون بۆ خەڵکەکەیانو، بۆیان بە پەرۆش بوون، بەزەییان پێداهاتوونو، بە تەنگیانەوە بوونو، لەگەڵ خەڵکەکەی

خۆیان ڕاستیان کردوە، هەرچەندە کافریش بوون، بەڵام بۆیان دڵسۆزو بە پەرۆش بوونو بەزەییان پێیاندا هاتۆتەوەو زانیویانە چ ڕۆژێکی ڕەش چاوەڕێیان دەکات، ئەگەر بێتو لەسەر شیركو بێبڕوایی خۆیان بمێننەوە بۆیە خۆیان چۆن بوون، ئاواش گەلەکەی خۆیانیان دواندوە، ئەی گەلەکەم! واتە: منیش یەکێکم لە ئێوە، ئێوە گەلی خۆمن، کۆمەڵگاو، نیزیکی خۆمن.

**برگەی دووەم** : ﴿أَرَهْطِيٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾، ئایا کۆمەڵەکەمتان لە خوا لەلا باڵادەست ترە ؟ (العَزِيزُ: هو مَمْنوع الجانِب)، (عَزِيز) کەسێکە کە زەفەری پێ نەبردرێ، گوتراوە: (العَزِيزُ مَنْ لاَ يُغْلَب)، کەسێکە کە کەس دەستی بەسەردا نەڕوات، توانای بەسەریدا نەشکێ.

ئنجا (أعزّ) صیغەی (تفضیل)ی (عزیز)ە، واتە: زۆر باڵادەستو زۆر زەفەر پێ نەبراو، دەفەرموێ: ئایا ئێوە کۆمەڵە نیزیکەکەی من، خزمەکانی منتان لەلا باڵادەستترە، دەستڕۆیشتووترە لە خوا ﷻ کە لەبەر خزمەکانم دەستدرێژیی ناکەنە سەرم؟! نەك لەبەر خوا، کە من نوێنەری خوام، یانی: لێرەدا شوعەیب لەسەر خوا، وە دەنگ هاتوە، لەسەر خوا تووڕە بووە ﷻ کە ئەوانە ڕێزی خوایان نەگرتوەو، حیسابیان بۆ خوا نەکردوە.

**برگەی سێیەم** : ﴿وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّا﴾، ئێوە خواتان ﷻ خستۆتە دوای پشتی خۆتانەوە.

دەگوترێ: (جَعَلَهُ ظِهْرِيّاً، أي: جَعَلَهُ بظَهْرِ)، واتە: هەڵیداوە دوای پشتی خۆی، واتە: نادیدەی گرتوەو حیسابی بۆ ناکات بە هەندی ناگرێ.

چونکە ئینسان ئەگەر شتێك بە لایەوە گرنگ بێت، دەیهێنێتە پێش خۆی، بەڵام ئەگەر شتێك بیەوێ پشت گوێی بخات، هەر پشت گوێ خستن بۆخۆی ئەوەیە کە هەڵیدەداتە دوای پشتی خۆی، ئیدی مەرجیش نیە شتەکە هەڵداتە پاش پشتی، بەڵام ئەو تەعبیرە بەکارهێنراوە، بۆ ئیهمال کردنو بەهەند نەگرتنی شتێك.

**بڕگەی چوارەم** : ﴿إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾، بێگومان پەروەردگاری من، خاوەنی من ئابڵووقەدەری ئەوەیە کە ئێوە دەیکەن، هەرچی ئێوە دەیکەن خوا ﷻ دەوری داوە، واتە: زانیاریی خواو، دەستەڵاتی خوا، دەورە دەرە بۆ ئێوەو بۆ کردەوەکانتانو بۆ جموجۆڵەکانتانو، بۆ پیلانو نەخشەکانتان، وە لە چنگی خوا دەرباز نابن.

**بڕگەی پێنجەم** : ﴿وَيَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ﴾، ئەی گەلەکەم! هەرچی لە دەستتان دێ، بیکەن، ئەوەی کە لە تواناتاندا هەیەو چەند دەستتان دەڕوات، درێغیی مەکەن، دەگوترێ: (مَكُنَ مَكاناً مِثْلُ ضَخُمَ ضَخَامَةً)، (مَكُنَ مَكاناً)، واتە: بوو بە خاوەن توانا، وەك (ضَخُمَ ضَخامة)، واتە: بووبە قەبارە گەورە.

یانی: لە شوێنی خۆتانەوە، یاخود ئەوەندەی کە دەستتان دەڕوات، هەتا دەستتان دەڕوا، درێغیی مەکەن، چیتان لەدەست دێ، بیکەن، وەك لە زمانی کوردییدا دەگوترێ: چیت پێ دەکرێ، بیکە، یاخود چیت نەکردوە، بیکە، هەرچی لەدەستت دێ، بیکە.

**بڕگەی شەشەم** : ﴿إِنِّي عَٰمِلٌ﴾، بێگومان منیش کاری خۆم دەکەم، نەیفەرموە فڵان کارە دەکەمو، هەڕەشەی نەکردوە، هیچ پێغەمبەرێکم نەبینیوە ﷺ لە بەرانبەر هەڕەشەی کافرەکاندا، هەڕەشەیان لێ بکاتەوە، کە دەفەرموێ :

﴿إِنِّي عَٰمِلٌ﴾، واتە: منیش ئەرکی خۆم جێبەجێ دەکەم، ئێوە چیتان پێ دەکرێ بیکەن، منیش لەسەر جێبەجێکردنی ئەرکی خۆم، کە بریتییە: لە گەیاندنی پەیامی خوا، بەردەوامم.

ئنجا دوایی هەڕەشەیان لێ دەکات، بەڵام نەك هەڕەشەی خۆی، هەڕەشەی هاتنە دی یاساکانی خوا بە سەریاندا، ئەم بوونەوەرە سیستەمێکی بۆ دانراوە لەلایەن خوای پەروەردگارەوەو بە سیستەم (نظام) بەڕێوەدەچێ، پاشاگەردانیی نییە، هەر کەسێك وا بکات، یاسایەکی خوا بەسەریدا پچەسپێ،

یاساکە بەسەریدا دەچەسپێ، هیچ کەس مافی ڤیتۆی نیە لە بەرانبەر یاسا قەدەریی‌و گەردوونییەکانی خوادا، کە لە ژیانی بەشەردا داینـاون، بۆیە لە بڕگەی حەوتەم دا دەفەرموێ:

**بڕگەی حەوتەم**: ﴿سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ﴾، لەمەودوا دەزانن کێ ئازارێکی بۆ دێ، سزایەکی بۆ دێ، ڕیسواو زەبوونی دەکات، دەشزانن‌و بۆشتان دەردەکەوێ کێ درۆکەرە، لە زمانی کوردیی دا بە (کاذب)، دەڵێن: درۆزن، بەڵام من پێم وایە وشەی درۆزن، بۆ کەسێکە زۆر درۆیان بکات، واتە: درۆکردنی کردبێتە پیشەی خۆی، ئەو وشەیە لەو شوێنەدا بەکاردێ، دەگوترێ: پیاوێکی درۆزنە، واتە: زۆر درۆیان دەکات، درۆکردنی کردۆتە پیشەی خۆی، بەڵام ﴿وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ﴾، واتە: کەسێك کە درۆ دەکات، کێ درۆکەرە.

**بڕگەی هەشتەم**: ﴿وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ﴾، ئنجا چاوەڕوان بن چاودێر بن، منیش لەگەڵ ئێوەدا چاودێرو چاوەڕوانم.

(طبري) دەڵێ: (أَي ذُو رِقْبَة لِذَلِكَ العَذَاب مَعَكُم وَنَاظِرٌ إِلَيْهِ بِمَنْ هو نَازِلٌ مِنَّا وَمِنْكُمْ)، واتە: خاوەن چاودێریی بۆ ئەو ئازارو سزایە، منیش لەگەڵ ئێوەدا خاوەن چاودێرییم‌و، تەماشای دەکەین، چاوەڕێی دەکەین، ئایا ئەو سزاو ئازارە دادەبەزێتە سەر ئێمە یان ئێوە؟!

یانی: سزایەك بەڕێوەیە، ئازارێك بەڕێوەیە، با بزانین داخۆ دادەبەزێتە سەر کێ؟ بێگومان شوعەیب ﷺ دڵنیا بووە کە دادەبەزێتە سەر وان، ﴿مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ﴾، لە داهاتوودا بۆتان دەردەکەوێ کێ سزاو ئازارێکی بۆ دێ، کە شەرمەزاری بکات‌و ڕیسواو زەبوونی بکات، بۆشتان دەردەکەوێ کێ درۆ کەرە! نەیفەرمووە ئێوە سزای ڕیسواکەرتان بۆ دێ‌و درۆکەرن، چونکە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) زۆر بە نەزاکەت بوون‌و، زۆر بە نەجابەت قسەیان کردووە، یەکسەر بە بابای درۆزنیان نەگوتوە:

درۆزن، بە بابای تاوانباریان نەگوتوە: تۆ تاوانباری، لێرەدا تەنانەت بۆ سزادانەکەش دەڵێ: بۆتان دەردەکەوێ: کێ سزایەکی بۆ دێ، ڕیسواو زەبوونی دەکات، بۆتان دەردەکەوێ کێ درۆکەرە! لەوانەیە گوتبێتیان: ئنجا ئەی شوعەیب! ئەگەر بەلاش بێ، بەلایەکە بۆ تۆ دێو، بۆ شوێنکەوتووەکانت دێو، تۆ درۆ دەکەیو، شوێنکەوتووەکانت درۆ دەکەن، بەلام پێغەمبەران هەرگیز وشەیەکی ناڕێکیان بەکارنەهێناوە، کاتێ گەلەکانیان پێیان گوتوون: ئێوە بێعەقڵو درۆزنن، ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾﴾الأعراف، کە ئەمە کە گەلی عاد بە هوودیان گوتوە هوود ناڵێ: بەڵکو ئێوە نەفامن، وە ئێوە درۆزنن، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ﴾الأعراف، ئەی گەلەکەم! هیچ جۆرە نەفامییەك لە مندا نیە، نەك هەر نەفام نیم، هەر هیچ جۆرە نەفامییەك پەیوەندیی بە منەوە نیە، هەرچەندە دەشزانێو دڵنیاشە کە ئەوان نەفامن، ئنجا دەبێ کێ لەو کەسە نەفامتر بێ، کە ئامادە نەبێ بەندایەتیی بۆ پەروەردگارو خاوەنی خۆی بکاتو، بڕوا بە نوێنەرو پێغەمبەری خوا نەکات، کە موعجیزەی دەستەوسانکەرو ئیقناعکەریشی پێیەو، پەیامێکی پێیە کە مایەی بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دواڕۆژیەتی؟! بێگومان هیچ کەس لەو کەسانە نەفامتر نیە، کەچی پێغەمبەران ﷺ نەشیانگوتوە ئێوە نەفامن، چونکە شێوازی پێغەمبەران لەقەدەر ئاستی بەرزی بەرنامە بەرزەکەیان دا بووەو، دیارە کەسێکیش خۆی بە شوێنکەوتووی پێغەمبەران بزانێ، دەبێ هەوڵبدات بچێتە ئەو ئاستە بەرزەوە، لە شێوازی بانگەوازی، لە هەڵسوکەوتی، لە ڕەوشتی، لە هەموو ئەو سیفەتە بەرزو پەسندانەدا، کە دەبێ ئینسانی ئیماندار خۆیانی پێ برازێنێتەوە.

**مەسەلەی شەشەم کۆتایی:**

**هاتنی سزای خواو، ڕزگارکردنی شوعەیبو بڕوادارانی شوێنکەوتووی و، لەگەڵ زەویدا تەخت بوونی کەلە کافرەکەی:**

خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بەپێزە لە هەشت (٨) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم:** ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا﴾، وەك جاری دیکەش گوتوومانە: مانا ڕووالەتییەکەی ناوایە: کاتێك فەرمانی ئێمە هات، واتە: کاتێك بڕیاری ئێمە هات، بڕیارەکە جێبەجێ بوو، (أَمْر)، بە مانای دەرچوونی بڕیارەکەیە، یاخود (أَمْرُنا أي: عَذَابُنا)، واتە: (مأمُورُنا) فەرمانپێکراوی ئێمە هات، چونکە (أمر) هەم بە مانای چاوگ (مصدر) دێ، هەم حاڵەتی (مفعول) وەردەگرێ، (مأمُورُنا) واتە: ئەوەی کە ئێمە فەرمانمان پێکردوە، فەرمان پێکراوەکەمان کە بەڵایەکەیە، هات.

**بڕگەی دووەم:** ﴿نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: واتە: (وَلما اقْتَرَبَ مَجِيئُ أمْرِنا)، کاتی هاتنی فەرمانمان نیزیك بۆوە، مەبەستیان ئەوە بووە: کاتی کە خوا ﷻ بەڵایەکەی ناردوە، پێشتر ئەو پێغەمبەرەو شوێنکەوتووە بڕوادارەکانی دەرباز کردوون، ئنجا بەڵایەکە هاتوە، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا﴾، کاتێك فەرمانی ئێمە هات، جا چ بڕیارەکە بێ، چ فەرمانپێکراوەکە بێ، کە بەڵاو سزایەکەیە، ئەوانمان دەرباز کرد، واتە: کاتێك کە نیزیك بۆوە بێ، ئەگەرنا لە کاتێکدا بەڵایەکە هاتوە، کەس دەرباز نەبووە، واتە: دیارە پێش ئەوەی بەڵایەکە بێ، بە تەئکید

ئەوانی دەرباز کردوە، بۆیە دەفەرمویَ: ﴿ نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ ﴾، شوعەیبو ئەوانەی لەگەڵیدا بڕوایان هێنابوو، ئەوانمان ڕزگار کرد، قوتارمان کردن، ئنجا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە شوعەیب ﷺ یەکێك بووە لەو پێغەمبەرانەی کە شوێنکەوتووانێکی بوون، کەسانێك بوون لەگەڵیدا بڕوایان هێناوەو، خوا ﷻ خۆیو شوێنکەوتووەکانی، لە پیاوانو ئافرەتانو لەو وەچەو منداڵانەی کە لەگەڵیاندا بوون، خوای بە بەزەیی هەموویانی دەرباز کردوون، دیارە دەبێ پێشتر فەرمووبێتی: بچن بۆ فلان شوێن، یان لێیان جیاببنەوە، بۆئەوەی کە ئەو بەلایە هات بۆ ئەو شوێنە، ئەوان بەرنەکەون.

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا ﴾، واتە: بە بەزەییەکی تایبەت لەلایەن ئێمەوە، بەرانبەر بە ئەوان، ڕەحمەتی خوا ﷻ خوا گشتگیرە بەلام لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا ﴾، بە بەزەییەکی تایبەت لە ئێمەوە، واتە: بەزەییەکی تایبەت بەرانبەر بە شوعەیبو، ئەو بڕوادارانەی کە لە خزمەتیدا بوون، هەر ئەوانی گرتۆتەوە، ئەوانی دیکە شایستەی ڕەحمەتو بەزەیی خوای پەروەردگار نەبوون.

**بڕگەی چوارەم :** ﴿ وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ ﴾، ئەوانەی کە ستەمیان کردبوو، چریکە گرتنی، ﴿ ٱلصَّيۡحَةُ ﴾ لە زمانی عەرەبیی دا، واتە: دەنگێکی زۆر زەبەلاحو گەورە، کە ئەمە لە کوردیدا دەگونجێ بڵێین: چریکە، دەگونجێ بڵێین: هاڕە، دەگونجێ بڵێین: نەعرەتە، دەنگێکی زۆرزۆر گەورە، بە شێوەیەك بێ کە بوومەلەرزە بخاتە ولاتەوە، ئنجا ئەو دەنگە دەنگی کێ بووە؟ هەندێك دەڵێن: جبریل بەسەریدا هاوار کردوون، هەندێك دەڵێن: فریشتەیەکی دیکەو، دەگونجێ هەر ئەو بەلایەی کە لێی داونو بۆتە بوومەلەرزە، بوومەلەرزەکە یەکسەر دەنگەکەشی لێ بەرز بووبێتەوە، بە هەر حاڵ، خوای پەروەردگار لێرەدا بە ﴿ ٱلصَّيۡحَةُ ﴾ دەیهێنێ، لە شوێنی دیکە بە لەرزینەوە (ٱلرَّجۡفَةُ) دەیهێنێ، لەرزینەوەیەکی گەورە، وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوانەی ستەمیان کردبوو، ئەو چریکەو دەنگە گەورە گرتنی، لە شوێنی دیکە دەفەرموێ : ﴿ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ

﴿وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ﴾ هود، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ﴾ هود، کە دەفەرموێ: (أَخَذَ)، لەبەرئەوەی: (صَيحة)، (مُؤَنَّث)ی (مجازي)یە، هەردووك لای تێدا دروستن‌و، ئەو کاتە (صَيحة) مانای (صِياح)ی، لێوەرگیراوە، واتە: هاوارکردن، بۆیەش (فعل)ی ﴿وَأَخَذَ﴾ی، بە نێرینە (مُذكّر) هێنراوە.

**برگەی پێنجەم**: ﴿فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَـٰرِهِمْ جَـٰثِمِينَ﴾، لە ماڵەکانی خۆیاندا تەخت بوون.

(بارِكِينَ عَلَى رُكَبِهِم مُكِبِّين عَلَى وجوهِهِم فِي ديارِهِم)، واتە: لەسەر ئەژنۆیان کەوتبوون، یان لەپەورووو کەوتبوون، پێشتر باسمان کرد ئەسڵی وشەی، (جَثَم الطائِرُ أي: لَصِقَ بالأَرْضِ أو لَطِئَ بالأَرْضِ)، باڵندە کە دەنیشێ، خۆی بە زەوییەوە دەنووسێنێ، پێی دەگوترێ: حاڵەتی (جثوم)، واتە: نیشتن، هەڵنیشتن، خۆ بە زەوییەوە نووساندن، ئەوان ئاوا وەك چۆن باڵندەیەك دەنیشێ‌و بە زەوییەوە تەخت دەبێ، ئەوانیش ئاوا بە زەوییەوە تەخت بوو بوون.

کە دەفەرموێ: ﴿فِى دِيَـٰرِهِمْ جَـٰثِمِينَ﴾، لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿فِى دَارِهِمْ جَـٰثِمِينَ ۝٧٨﴾ الأعراف، کە دەفەرموێ: ﴿فِى دِيَـٰرِهِمْ﴾، لە ماڵەکانی خۆیاندا، واتە: هەر کەسە لە ماڵی خۆیدا تەخت بوو بوو، بەڵام کە دەفەموێ: ﴿فِى دَارِهِمْ﴾، واتە: هەر کەسە لە ماڵی خۆیدا، بەڵام وەك هەموویان لە یەك ماڵدا تەخت بووبن، لێکڕاو لە یەك کاتداو بە یەك شێوە، واتە: هەموو ماڵەکانی، وەك یەك ماڵ وێنا کردوون.

**برگەی شەشەم**: ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ﴾، وەك هەر لە وێدا نەما بنەوە، واتە: وەك هەرگیز لەو ماڵانەی خۆیاندا هاموشۆیان نەکرد بێ‌و، هەڵسوکەوتیان نەکرد بێ، جووڵەی تێدا نەماوە.

**برگەی حەوتەم**: ﴿أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ﴾، ئاگادار بن! ئەها! دووریی بۆ مەدیەن، واتە: بفەوتێن، یاخود دووریی لە بەزەیی خوا بۆیان.

**بڕگەی هەشتەم :** ﴿ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴾، وەك چۆن گەلی ئەموود، پێشتر دوور خرانەوە، یاخود لە بەین چوون.

ئنجا شایانی باسە کە لێرەدا بۆ لە بەینبردنی گەلی شوعەیب، لە ئایەتی (٩٤) سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾، هەروەها دەربارەی لەبەینچوونی گەلی عادیش، کە پێغەمبەرەکەیان هوود بووە، لە ئایەتی (٥٨)دا هەر دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾.

بەڵام بۆ گەلی صالح کە (ثمود)ە، لە ئایەتی (٦٦)دا دەفەرموێ:﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾، هەروەها بۆ گەلی (لووط)یش کە پێغەمبەرەکەیان ناوی لووط بووە، لە ئایەتی (٨٢)دا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾، ئەویش لەبەرئەوەی بۆ هەر کام لە گەلی لووطو صالح، هەڕەشە هەبووە، بە هاتنی سزا، هەم لووط ﷺ هەڕەشەی لە گەلەکەی کردوە، کە ئەگەر بێتو بەردەوام بن، خوا سزاتان دەدات، هەم (صالح)یش هەڕەشەی لە گەلی ثەموود کردوە، ئەگەر بێتو لەسەر ئەو حاڵەی خۆتان بەردەوام بن، خوا سزاتان دەدات، فەرموویەتی: ﴿ وَٱرْتَقِبُوٓاْ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴾، چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵتان چاوەڕێم، یان فەرموویەتی: ﴿ ثَلَـٰثَةَ أَيَّامٍ ﴾، سێ ڕۆژ چاوەڕێ بن، بەڵام بەنسبەت گەلی شوعەیبو گەلی هوودەوە، واتە: عادو مەدیەن، کاتێکی دیارییکراویان نەبووە، بۆیە بە (و) واو (عطف)ی کردۆتەوە، نەك بە (ف) فاء، چونکە گێڕانەوە (عطف) بە (ف)، واتە: یەکسەر بە دوایدا هاتو، دوای هەڕەشەو بەڵێنگە (موعد) دانرانەکە، سزایەکەیان بۆ هات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوار (٤) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی : (٩٦ – ٩٩)، لەم چوار ئایەتەدا زۆر بە کورتیی‌و گوشراویی‌و ئاماژە ئاسا، باسی بەسەرهاتی مووسا ﷺ، وە فیرعەون‌و دارودەستەکەی کراوە، کە سەرەنجام گەلی فیرعەون بەهۆی شوێنکەوتنی فیرعەونەوە، گیرۆدەی سەر بە فەتارەت چوونی دنیاو، چوونە نێو ئاگری دۆزەخی دواڕۆژو، نەفرین لێکرانی دنیاو دواڕۆژ بوون.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ
فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَآ أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴿٩٧﴾ يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ
فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُواْ فِى هَـٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ
ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾ ﴾.

# مـانـای وشـە بە وشـەی ئـایـەتەکـان

{هەروەها بە دڵنیایی مووسامان بە نیشانەکانمانو بەڵگەیەکی ئاشکراوە، بۆ لای فیرعەونو دەمڕاستەکانی نارد ﴿٩٦﴾ کەچی (خەڵکەکە) شوێن فەرمانی فیرعەون کەوتنو، فەرمانی فیرعەونیش سەر ڕاستانەو ئاکام خێر نەبوو ﴿٩٧﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا (بەرەو ئاگری دۆزەخ فیرعەون) پێش کۆمەڵەکەی دەکەوێو خستنیە نێو ئاگرەوەو، خراپترین پێش کەوتن (ئەو پێش کەوتنەی فیرعەون) بوو، (ئەو شوێنەش کە بۆ لای بردن) خراپترین شوێنی خەڵك بۆ لا براو بوو ﴿٩٨﴾ لەم ژیانەش دا نەفرینیان دواخراو، ڕۆژی قیامەتیش (بە هەمان شێوە)، نەفرینیش خراپترین بەخششێکە کە پێیان دەبەخشرێ (کە دۆزەخە) ﴿٩٩﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ): واتە: بەڵگەیەكی ڕوونو ئاشكرا، (السَّلَاطة: التَمَكُّنُ مِنَ القَهْرِ، وَسَلَّطتُهُ فَتَسَلَّطَ، وَسُمّي الحُجّةُ سُلْطاناً لِتَسَلُّطِهِ عَلَى العُقُول)، وشەی (سُلْطان)، بریتیە لە دەست ڕۆیشتوویەتی بە شێوەی ملكەچ كردن بە بەرانبەر، دەگوترێ: (سَلَّطتهُ فَتَسَلَّطَ)، ئەوم سەرخست ئەو سەركەوتو، ئەو زاڵ بوو، بەڵگەش بۆیە پێی گوتراوە: (سُلْطان)، چونكە دەسەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵەكانداو عەقڵەكان دەخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە.

( وَمَآ أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ): واتە: كاری فیرعەون سەر ڕاستانە نەبوو، دەڵێ: (الرَّشَدُ والرُّشْدُ خِلافُ الغَيِّ)، (رَشَد) و (رُشْد)، پێچەوانەی (غيّ)یە، ئنجا هەم وشەی (راشد)، هەم وشەی (رشید)، دەگوترێ: فلان كەس (راشد)ە، یان (رشید)ە، لە كاروباری دنیاو دوارۆژدا بۆ هەردووكیان بەكاردێ، (رشید) بۆ مرۆڤ بەكاردێو سیفەتە، بەڵام لێرەدا بۆ زێدە جەختكردنەوەیەو كارو كردەوەكەی فیرعەون وەك شەخسێك تەماشا كراوە، كە بێئاكام بووەو، سەر ڕاستانە نەبووەو سەرەنجامی خێری نەبووە.

( يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ ): واتە: پێش گەلەكەی دەكەوێ، دەگوترێ: (قَدَمْتُ فُلانا أقدُمُهُ: إذا تَقَدَّمَ)، دەگوترێ: (قَدَمْتُ فُلاناً أَقْدُمُهُ)، واتە: پێشیكەوتنم، لە پێشیەوە ڕۆیشتم كاتێ تۆ لە پێشیەوە بڕۆی، ئەو وشەیە بەكاردێ.

( فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ): واتە: خستنیە نێو ئاگرەوە، (الوُرُودُ: أَصْلُهُ قَصْدُ الماءِ، وَرَدْتُ الماءَ أَرِدُ وُرداً فَأَنَاوَارِد، وَالماءُ: المَوْرُودُ، أَوْرَدْتُ الإِبْلِ الماءَ، الوِرْدُ خِلافُ الصَّدْرَ، الوَارِدُ: الَّذِي يَتَقَدَّمُ القَوْمَ فَيَسْقِي لَهُمْ)، لە ڕیشەدا وشەی (وَرَدَ)، ئەوەیە كە ئینسان ڕوو لە ئاو بكات، ئاوو سەرچاوەیەك هەبێ، بەرەو ڕووی

بچێ، پێی دەگوترێ: (وَرَدَ الماءَ)، وەك لە سوورەتی (القصص)دا هاتوە، ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: كاتێك بەرەو ئاوی مەدیەن چوو، ئاوو سەرچاوەیەكیان هەبووە، دەگوترێ: (وَرَدْتُ الماءَ أَرِدُ وُرداً فَأَنَاوَارِد) چوومە سەر ئاوەكە دەچمە سەری، ڕووی تێدەكەم، (وُرداً) ڕوو تێكردنو چوونە لا، (فَأَنا وَارِد)، واتە: من چوومەتە لای ئاوەكە، ئنجا ئاودكە پێی دەگوترێ: (مَورُود)، واتە: ئەو شوێنەی كە خەڵك ڕووی تێ دەكات بۆ ئاو لێهێنان، دەگوترێ: (أوردْتُ الإبل الماءَ)، وشترەكانم بردنە سەر ئاو، واتە: بۆ ئاودان، (الوِردُ خِلافُ الصَّدْرَ)، (وِردُ) بریتیە لەوە كە خەڵك بەرەو ئاوو سەرچاوەكە بچێ، بەڵام (صَدْر)، ئەوەیە كە لە ئاوو سەرچاوەكە بێنەوە لەو لاڕا بێنەوە (وارِد)، بە كەسێك دەگوترێ: كە پێش گەلەكەی خۆی دەكەوێ دەڵێ: وەرن ئاوو سەرچاوەیەك لێرەیە، با پێشتان بكەوم، پێی دەزانمو، بچێ بۆ ئەوەی ئاویان بۆ بێنێ.

( وَبِئْسَ ): (بِئْسَ: كَلِمةٌ تُستعْمَلُ فِي جَمِيعِ المذَامِّ عَكْس نِعْمَ فِي جَمِيعِ الممادِحِ، وَأَصْلُهُ مِنْ بَئِسَ وَهو مِنَ البُؤْسِ)، (بِئْس): (فعل)ێكە بەكاردەهێنرێ بۆ هەموو زەمكردنەكان، پێچەوانەی (نِعْمَ)ە، ئەگەر بگوترێ (نِعم الرّجل)، واتە: فلان كەس پیاوێكی زۆر چاكە، بەڵام (بِئْسَ)، واتە: زۆر خراپە، ئنجا چ بۆ شت بێ، یان بۆ شەخسو، لە ئەسڵدا وشەی (بِئْسَ) لە (بَئِسَ)ەوە هاتوە، (بِئْسَ)ش لە (بؤس)ەوە هاتوە، واتە: حاڵ خراپیی، (بَئِسَ) واتە: حاڵی خراپ بوو.

( ٱلرِّفْدُ ): (الرِّفْدُ: المعُونَةُ وَالعَطِيةُ، والرَّفْدُ: مَصْدَر، وَالمرْفَدُ: ما جُعِلَ فِيهِ مِنَ الطَّعَامِ، رَفَدْتُهُ: أَنَلْتُهُ بالرِّفْدِ، وَأَرْفَدْتُهُ: جَعَلْتُ لَهُ رِفْداً يَتَناولُهُ شيئاً فَشيئاً، الرِّفَادَةُ: مُعَاوَنَةٌ للحَاجِّ كَانَتْ مِنْ قُرَيْش بشيءٍ كانوا يُخْرِجونَهُ لفُقَرَاءِ الحَاجِ)، وشەی (رِفْد): بریتیە لە هاوكاریو بەخشین، (رَفد)یش چاوگەكەیەتی، واتە: بەخشین یان هاوكاریی كردن، (مِرفَد) ئەوەیە كە خواردنو خۆراكیان تێكردوە، تێلەگە، هەگبە، دەگوترێ: (رفدتهُ)، واتە: هاوكارییم كرد بە شتێك لە

هاوكاریی كردن، (أرفَدتُهُ)، واتە: هاوكارییم بۆ دانا، كە وردە وردە دەستی بگەیەنێتیۆ لێی بەهرەمەند بێ، (رِفَادَة)، بریتی بووە لە هاوكاریی كردنی ئەو حاجییانەی كە زادو زەخیرەو پێخۆریان پێ نەبووە كە قورەیشییەكان هەندێكیان سەرپەرشتیی ئەوەیان كردوە، هۆزێك لە قورەیش تەرخان بوو بەوە كە یارمەتی ئەو حاجییانە بدات كە لە دەرەوە دێنو خواردنو خۆراكیان پێ نیە.

( بِئۡسَ ٱلرِّفۡدُ ٱلۡمَرۡفُودُ )، یانی: (بِئسَ العَطاءُ والمعْطَى: النار)، خراپترین بەخششی بەخشراو، چییە؟ ئەو ئاگرەیە، یاخود ئەو نەفرینەیە كە لێیان كراوە.

# مانـای گـشــتـی ئایـەتەکــان

دیارە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، لە ئایەتەکانی (١٠٣ تاکو ١٧١)، واتە: (٦٨) ئایەت، بە درێژیی بەسەرهاتی مووسا و هاروونی برای ﷺ لەلایەك، فیرعەونو داردەستەکەی لەلایەکی دیکەومان، باسکردوە، هەروەها لە سوورەتی (یونس)یشدا، لە ئایەتی (٧٥ تاکو ٩٣)، واتە: لە (١٩) ئایەتدا، دیسان لەوبارەوە دواوین، لێرەش خوا ﷻ بەس ئاماژەیەکی خێرای پێکردوەو، ئێمەش لە قەدەر ئاماژە کردنەکەی خوا ﷻ بە کورتیی مانای ئەو چوار ئایەتە دەکەین:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴾، بێگومان ئێمە مووسامان بە نیشانەکانی خۆمانەوەو، بە بەڵگەیەکی روونو ئاشکراوە رەوانە کرد، خوای زاناو توانا لە سوورەتی (الإسراء)دا باسی نۆ نیشانەو نۆ موعجیزەی کردوە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ آيَاتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء، هەروەها لە سوورەتی (النمل)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ فِي تِسْعِ آيَاتٍ ﴿١٢﴾ ﴾، بە نۆ نیشانەو موعجیزەی روونو ئاشکراوە.

﴿ وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴾، بەڵگەیەکی ئاشکرا ئەو بەرنامەیە بووە کە مووسا هێناویەتیی، یان ئەو قسەو وتوێژە بووە کە مووسا ﷺ لەگەڵ فیرعەوندا کردوویەتی، کە بەڵگەی زۆر روونو ئاشکراو مشتومڕ هەڵنەگر بوون، یاخود ﴿ وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴾، واتە: ئەو نۆ موعجیزەو نیشانەیە، بەڵگەیەکی روونو ئاشکرا بوون، یان مەبەست پێی گۆچانەکەیەتی کە هەر لە نێو نۆ ئایەتەکاندایە، بەڵام ئەوە لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (ذِكر الخَاصِ بَعْدَ العَامِ)، باسکردنی شتێکی تایبەتە، دوای ئەوەی کە بە شێوەیەکی گشتی باسکراوە.

ئنجا ئایا خوا مووسا عليه السلام ی بە نیشانەکانو بە بەڵگەی ڕوونو ئاشکراوە بۆ کوێ نارد؟! ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾، بۆ لای فیرعەونو داروودەستەکەی.

﴿ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَآ أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴾، شوێن فەرمانی فیرعەون کەوتنو، فەرمانی فیرعەونیش سەرەنجام خێر نەبوو، سەر ڕاستانە نەبوو.

﴿ يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، لە دنیادا بە ڕێی شیرکو کوفردا پێشیان کەوت، خۆی لێ کردبوونە پەرستراوو پەروەردگار، بۆیە سەرەنجامی دواڕۆژیشیان، وەك هی دنیایان دەبێ، چونکە ئینسان لە دنیادا چ بچێنێ، لە قیامەتدا ئەوە دەدروێتەوە، ﴿ يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، لە ڕۆژی قیامەتدا پێش گەلەکەی دەکەوێو لە پێشیانەوە دەڕوات، بەڵام بەرەو کوێ؟ دەفەرموێ: ﴿ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ﴾، بردنیە نێو ئاگری دۆزەخ، ﴿ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴾، ئەوەش خراپترین چوونە نێوەو، خراپترین شوێنە کە خەڵکی بچێتە نێو، واتە: ئەو دۆزەخە، ئەو ئاگرە ﴿ وَأُتْبِعُواْ فِى هَٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، لەم ژیانە دنیاییەش دا نەفرینیان شوێن خراو، لە دواڕۆژیشدا هەر نەفرینیان شوێن دەخرێ، ﴿ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴾، ئەو نەفرینەش خراپترین هاوکاریی کردنو، خراپترین بەخششێکە کە پێیان دەبەخشرێ.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :**

**خوا ﷻ باسی ڕەوانەکردنی مووسا ﷺ بە نیشانەکانیەوە بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراوە بۆ لای فیرعەون و دارودەستەکەی دەکات:**

خوا دەفەرمووێ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴿٩٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە دوو (٢) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا ﴾، هەروەها بە دڵنیاییەوە مووسامان نارد بە نیشانەکانمانەوە، بۆچی دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ ﴾، (و) واوەکە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە بۆ سەر شتێك کە پێشتر باسکراوە، کە بریتیە لەوەی خوا پێغەمبەری خاتەم، موحەممەد ﷺی ناردوە بۆ لای هۆزی قوڕەیش لە مەککە، پاشان گەلی عەرەب بە گشتی، پاشان مرۆڤایەتیی بە گشتییتر، تاکو دنیا بە کۆتا دێ، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! وەك چۆن تۆمان ڕەوانە کردوە، لە پێش تۆشدا ئەو پێغەمبەرانەی دیکەمان ڕەوانە کردوون، کە باسی نووحی کردو، باسی هوودی کردو، باسی صالحی کردو، باسی ئیبراهیمی کردو، باسی لووطی کردو، باسی شوعەیبی کرد، ئنجا بە هەمان شێوە مووسا ﷺ شمان ڕەوان کرد بە نیشانەکانمانەوە، نیشانەکان هەم لە سووڕەتی (الإسراء)، لە ئایەتی (١٠١)دا باسکراون کە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ

تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۢ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: ئێمە نۆ نیشانە، نۆ موعجیزەی ئاشكراو ڕوونمان بە مووسا دابوون، پرسیار لە بەنی ئیسرائیل بكە، كاتێ كە مووسا چوو بۆ لایان، فیرعەون پێی گوت: ئەی مووسا! من بە جادوولێكراوت دەزانم، پێم وایە جادووت لێكراوە! مووساش ﷺ وەڵامێكی ددان شكێنی دەداتەوە، گرنگ ئەوەیە لە سوورەتی (الإسراء)دا باسی ئەو نۆ نیشانەیە بە گشتی كراوەو، لە سوورەتی (النمل)یشدا دەفەرموێ: ﴿ فِى تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: بە نۆ نیشانەوە بچۆ بۆ لای فیرعەونو دارودەستەكەی، (ملأ) وەك زۆرجار گوتوومانە: ئەوانەن كە عەقڵو چاوی خەڵك پڕ دەكەن لە سامو هەیبەت، بە هۆی زرقو برقو ڕواڵەتی جوانو سەروەتو سامانو دەستەڵاتەوە، كە بە كوردیی: دەستڕۆیشتووان، قسە بە دەستان، دەمڕاستان، بەكاردێ.

ئنجا ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا بە تەفصیل باسی ئەو نۆ نیشانانەمان كردوە، ئەو نۆ موعجیزەیەی كە خوا بە مووسای داون كە دووانیان گۆچانەكەو دەستی بوونو، حەوتیشیان ئەوانە بوون، كە لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوون، كە دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ ﴾.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ ﴿١٣٣﴾ ﴾.

كەواتە: نۆ (٩) موعجیزەو نیشانەكانی مووسا ئەوانە بوون: گۆچانو دەستی، ئەوە دوو، ﴿ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، قاتو قڕیو گرانییو، كەمی بەروبووم، ئەوە سێو چوار، پێنجەكەی دیكەش: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ﴾، لافاوو كوللەو ئەسپێو بۆقەكانو خوێن،

ئەوەش پێنج، لەگەڵ چوارەکەدا، ئەوە نۆ، بەڵام لە تەوراتدا زیاتر لە نۆ دانە باس دەکاتو، لە هەندێك لە شتەکانیش لەگەڵ ئەوەی کە لە قورئاندا هاتوون، جیاوازن، کە بە تەئکید ئەوەی لە قورئاندا، کتێبی پارێزراوو دەستکاریی نەکراوی خوادا، کە لەلایەن خۆیەوە پاراستوویەتی، هاتوون، هەر ئەوە ڕاستە، ئەوەی کە لە پەیمانی کۆندا هەیە، کەمو زۆر دەستکاریی کراوەو گۆڕدراوە.

**بڕگەی دووەم** : دەفەرموێ : ﴿وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ﴾، بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرا، یاخود ﴿مُّبِينٍ﴾، یانی: ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر، چونکە وشەی (مُبِين) هەر دەبێ لە (أَبانَ، يُبِينُ)ەوە هاتبێ، ئنجا ئەگەر لە (أَبانَ)ی (لازِم)ەوە بێ، وەك: (أَبانَ القَمَرُ) مانگەکە ئاشکرا بوو، دەرکەوت، ئەوە (مُبِين)، یانی: ڕۆشنو ئاشکرا.

بەڵام ئەگەر (مُبِين) لە (أَبانَ)ی (مُتَعدِّي)یەوە بێ، وەك: (أَبانَ المدرِّسُ الدَرسَ) مامۆستایەکە وانەکەی ڕوونکردەوە، ئەو کاتە (مُبِين)، یانی: ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر.

### ئایا مەبەست لە : ﴿وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ﴾، چییە؟

١) هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی، ئەو نۆ نیشانەن، کە بۆ مووسا نیشانەو موعجیزە بوون، وە دەسەڵاتێكو بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرا، یاخود ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەریش بوون.

٢) هەندێکیش دەڵێن: ﴿وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ﴾، مەبەست پێی گۆچانەکەی بووە وەك : (ذِكر الخَاصِ بَعْدَ العَام)، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ : ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ﴾، چونکە: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ﴾، دیارە لە نێو فریشتەکاندا: (جِبْرِيلَ وَمِيكالَ)یش هەن، بەڵام بە شێوەی تایبەتییش

باسی كردوون، هەرچەندە وشە گشتییەكەش دەیانگرێتەوە لەبەر زێدە بایەخ پێ دان.

٣) هەندێكیش دەڵێن : مەبەست لە : ﴿وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾، ئەو قسەو وتوێژانەی مووسا ﷺ بوون كە زۆر بە جوانیی پەیامی خوای، بەرنامەی خوای، بۆ فیرعەون و دارودەستەكەی ڕۆشن كردۆتەوەو، باش باشی لێ حاڵی كردوون و، بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكرای بۆ هێناون.

ئنجا من وەك لە مانا گشتییەكەش دا باسمكرد، مانای سێیەمیانم زیاتر بەدڵە، كە وێڕای ئەوەی مووسا ﷺ نۆ موعجیزەو نیشانەی پێبوون، لە هەمان كاتیشدا بەڵگەی ڕوون و ئاشكراشی پێبووە، بۆ فیرعەون و بۆ دەستەو دایەرەكەی، كە بریتی بووە لە پەیام و بەرنامەكەی، بریتی بووە لەو ئامانجە بەرزانەی هاتوە بیانهێنێتە دی، كە لە قازانج و خێرو خۆشیی دنیاو دواڕۆژی هەموو لایەك دان.

**برگەی سێیەم** : كە دەفەرموێ : ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ﴾، واتە: مووسامان ﷺ بە نیشانەكانمانەوەو بە بەڵگەی ڕوون و ئاشكراوە بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەكەی، نارد.

وشەی: ﴿وَمَلَإِيْهِۦ﴾، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، دەگوترێ: (مَلأَ الشيءَ: وَضَعَ فِيهِ مِنَ الماءِ وَغَيْرِهِ قَدْرَ ما يَسَعُ، وَمالأَهُ عَلَى الأَمْرِ: ساعَدَهُ وَشايَعَهُ، وَالمَلأُ: الجَماعَةُ، وَأَشْرافُ القَوْمِ وَسَراتُهُم جَمْعُهُ أَمْلاء، ويُقَالُ ما كانَ هَذا الأَمْرُ عَن مَلأٍ مِنّا أَي: عَنْ مُشاوَرَه)، دەگوترێ: (مَلأَ الشيءَ)، واتە: ئەو شتەی پڕ كرد، ئەگەر پڕی كرد لە ئاو، یان هەر شتێكی دیكەی كە تێكردبێ، مادام پڕ بێ، پێی دەگوترێ: (مَلأَ)، دەگوترێ: (مالأَهُ عَلَى الأَمْرِ)، واتە: یارمەتیی داو لەگەڵی دا ڕۆیی و پەیڕەویی لێكرد، (ملأ)یش، بە كۆمەڵە خەڵكێك دەگوترێ، بە دەم ڕاستان و كاربەدەستان و بڕیار بەدەستانی خەڵك دەگوترێ، (ملأ) بە (أملاء) كۆدەكرێتەوە، ئنجا دەگوترێ: (ما كانَ هَذا الأَمْرُ عَن مَلأٍ مِنّا)، واتە: ئەم كارە بە ڕاوێژی ئێمە نەبوو، ئێمە ئاگامان لێی نەبوو.

گوتمان: (مەلأ)، کەسانێکن کە عەقڵ و دڵی خەڵك پڕ دەکەن لە سام و هەیبەت، دیارە بەهۆی ڕواڵەتی سەرنجڕاکێش و دەستەڵات و سەروەت و سامان و، خۆ پێ ڕانواندنیانەوە، خەڵك دەخەنە ژێر کاریگەرییەوە، چونکە وەك گوتراوە: خەڵك عەقڵی لە چاوی دایە، بەڵکو من ئەوەشی بۆ زیاد دەکەم: زۆر کەس عەقڵی لە گوێی دایە، چ ببیستێ، زۆرجاران بڕوا دەکات و، چ ببینێ وا دەزانێ هەر ئەوەیە، هەروەها لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: (ئەوەی لە بەرچاوانە لەبەر دڵانە)، هەڵبەتە ئەوە بۆ خەڵکێك کە ئەو دیوی شتەکان نەبینن، دیوی پەنهانیان نەبینن، تەنیا ڕواڵەت و ڕووکەشەکەیان ببینن، دەکەونە ژێر کاریگەریی ڕواڵەت و زرق و برق و خۆ بادان و خۆڕانواندنی خاوەن دەستەڵاتە سەروەت و سامان بۆ خۆ قۆرخکەرەکان، ئەگەرنا ئەوانەی کە دیوی پەنهانی شتەکان دەبینن، پێیان هیچ نیە، چونکە ئەو دیویان دەبینن و، دەزانن کە هەر بەینێکە کابرا دێت و دەچێ و خۆی ڕادەنوێنێ و خۆی بادەدا، بەڵام دوایی هەر دەچێتە ژێر ئەو خاکە، دەشزانن کە زۆر کەسی دیکەش پێش وان، خۆیان ڕانواندوە و خۆیان باداوە و خۆیان هێناوە و بردوە، بەڵام هەر وا ماوەیەکی کەم بووە، دوایی لەگەڵ زەویدا تەخت بوون.

**بڕگەی چوارەم** : ﴿ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ فِرۡعَوۡنَ ﴾، ئنجا بە دوای فەرمانی فیرعەون کەوتن، ئایا ئەوانەی بە دوای فەرمانی فیرعەون کەوتن، کاربەدەست و دەم ڕاستەکانی، یاخود خەڵك و گەلەکەیەتی؟ بەڵێ مووسا ﷺ بە پلەی یەکەم ڕووی لە فیرعەون و لە دارو دەستەکەی کردوە، بەڵام لە ڕاستیی دا مەبەستی پێ خەڵکەکە بووە، دەشتوانین بڵێین: هەم خەڵکەکەش کەوتنە شوێن فیرعەون، هەم دارودەستەکەشی کەوتنە شوێن فیرعەون.

﴿ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ فِرۡعَوۡنَ ﴾، مادام بە (ف)ی (تعقیب) هێناویەتی، واتە: یەکسەرو بێ وەخران، شوێن فەرمانی فیرعەون کەوتن و بە قسەیان کرد، بەبێ ئەوەی تێوەی ڕامێنن و سەرنجی قسەکانی مووسا بدەن، قەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوەیان هەبوو، کە بەداخەوە ئێستاش هەروایە.

زۆر کەس کە گیرۆدەی داوی حیزبێك یان ڕژێمێکی خۆسەپێن دەبێ، بە تۆزە دەم چەورکردنو زار شیرینکردنێكو، بە چەپڵەو ئافەرینێك، دەستو پێی خۆی ون دەکات، ئەگەر کەسێکی دیکە بێ، پەیامێکی پێ بگەیەنێ، هۆشیاری بکاتەوە، هەر گوێی ناداتێ، تازە ئەوەی چۆتە عەقڵو دڵی، هەر ئەوەیە، دەستی لە شتێك گیر بووەو وادەزانێ دنیا هەر ئەوەندەیە، یەکسەر تەسلیمی دەبێو، تازە گوێ بۆ هیچی دیکە ناگرێو، عەقڵو دڵی خۆی دادەخات، بەرانبەر بە هەر شتێکی دیکە!!

من جاری وا هەبووە، لەگەڵ هەندێك خەڵك لەو جۆرە کەسانە قسەم کردوە، لە کۆڕو مەجلیسدا، پەنجەکانی خستۆتە گوێی خۆی، گوتوومە: بۆچی وا دەکەی؟ گوتوویەتی: پێم خۆش نیە گوێم لە قسەکانت بێ، گوتوومە: تۆ پەنجەکانت لە گوێت دەربێنەو، گوێ هەڵخە بە لە باریی، ئەوەی عەقڵت گرتی، وەریبگرەو، ئەوەی عەقڵت نەیگرت، وەریمەگرە، کابرا گوتوویەتی: ئاخر دەترسم بچێتە نێو عەقڵمەوەو قەناعەت بێنم، پێم گوتوە: ئنجا مادام بچێتە نێو عەقڵتەوە، تۆش تەسلیمی عەقڵت بە، ئینسان بە عەقڵ لە ئاژەڵ جیا دەبێتەوە، گوتوویەتی: نا، حەز ناکەم ئەو قەناعەتانەی هەمە، لێم هەڵبوەشێتەوە، مرۆڤی واش هەیە!!.

**برگەی پێنجەم** : ﴿وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ﴾، فەرمانی فیرعەونو کاروباری فیرعەون، سەر ڕاستانە نەبوو.

(أَمْـر)، لێرەدا دەڵێ: (أَمَرَهُ بكَذا: والجَمْـعُ: الأوَامِـر)، فەرمانی بەو شتە پێکرد، کۆی (أمر)، (أوَامِر)ە، فەرمانەکان، دەگوترێ: (أَمْرُهُ مُستَقِيمٌ)، (أَمْر)، واتە: حاڵ، ئنجا لێرەدا ئەگەر (أَمْر) بە مانای کاروبارو حاڵ بێ، بە (أُمُور) کۆ دەبێتەوە، بەڵام (أَمْر) ئەگەر بە مانای فەرمان بێ، بە (أوَامِر) کۆ دەبێتەوە، کە لێرە هەردووکیان دەگونجێن، دەگونجێ بڵێی: فەرمانەکەی فیرعەون سەر ڕاستانە نەبوو، یاخود حاڵو باڵی فیرعەون، حاڵو باڵێکی سەر ڕاستانەو بە ئامانج گەیەنەر نەبوو، وەك خوا ﷻ دەربارەی ئەوە کە (أَمْر) بە مانای (الحَالُ وَالشأن) دێ، دەفەرموێ : ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ ١٢٨﴾آل عمران،

بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرمویّ لە حالّو بالّدا، هیچ شتێك بە دەست تۆ نیە ئەی موحەممەد ﷺ!.

(رَشید)، (فعیلٌ مِن رَشدَ ورشُدَ ورَشَدَ: إذا اتَّصَفَ بإصَابَةِ الصَّوَابِ وأُجْرِيَ وَصْفُ رَشيد عَلَى الأَمْرِ مَجَازَاً عَقْلِياً، وَإِنَّما الرَّشيد: الآمِرُ، مُبالَغَةً فِي اشتمالِ الأَمْرِ عَلَى ما يَقْتَضِي انْتِفَاءَ الرّشدِ، فَكأَنَّ الأَمْرَ هو الموصُوفَ بعَدَمِ الرّشدِ)[1]، وشەی (رَشید)، (فَعِیل)ە، لە (رَشِیدَ)، یان (رَشُدَ)، یان (رَشَد)، (رَشِدَ، یَرْشُدُ، رُشْدَاً)، ئەگەر مرۆڤ ڕازایەوە بەوە کە لە ئامانج بدات، ئامانج بپێکێ، لێرەدا سیفەتی (رَشید) کە دەفەرمویّ : ﴿وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ﴾، {(امر) چ بە مانای فەرمان بێ، چ بە مانای حالّو سیفەت بێ، حالّو بالّ بێ} ، ئەوە بە مەجازێکی عەقلّیی، ئەمرەکەی فیرعەون بە ڕەشید وەسف کراوە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا (رَشید) ئەو کەسەیە کە فەرمانەکە دەکات، یاخود حالّو سیفەتەکەی هەیە، ئەمەش زیدەڕۆیی کردنە لەوەدا، کە ئەمرەکەی فیرعەون زۆر دوور بووە لەسەر ڕاستییو بە ئامانج گەیشتن، یانی: ئەمرەکە خۆی بریتی بووە لەوە کە بە ئامانج نەگاتو بێ ئاکام بێ .

---

١) التحرير والتنوير، ج١٢، ص١٥٥.

**مەسەلەی دووەم :**

## باسی پێشکەوتنی فیرعەون بۆ گەلەکەی

## لە ڕۆژی قیامەت دا، بەرەو دۆزەخ:

خوا دەفەرموێ : ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە سێ (٣) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾، واتە: پێش گەلەکەی دەکەوێ لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، لە ڕۆژی زیندووکرانەوەدا.

(قَدَمَ، يَقْدُمُ: أي تَقَدَّمُ)، (قَدَمَ، يَقْدُمُ)، واتە: پێشکەوت، پێش دەکەوێ، ئەمە دیارە کە لەو حاڵەتەدا (مُتَعَدّي) دەبێ، واتە: پێویستیی بە (مفعول) دەکات، دەگوترێ: (قَدَمَ فرعَونُ قَومَهُ)و (يَقدُمَ فرعونُ قَومَهُ)، واتە: فیرعەون پێش گەلەکەی کەوت، فیرعەون پێش گەلەکەی دەکەوێ.

دەشگونجێ: (قَدَمَ) بە (لازِم) بێ، (قَدَمَ فِرعونُ)، واتە: پێش کەوت، واتە: ئەمە لێرەدا بە (لازِم) دێ، بەڵام لێرەدا مادام دەفەرموێ: (يَقْدُمُ قَومَهُ)و، (مَفعُول بِهِ) خواستوە کەواتە: لێرەدا (قَدَمَ)، (مُتَعَدّي)یەو پێویستیی بە (مَفعول بِهِ) کردوە، یانی: فیرعەون پێش گەلەکەی دەکەوێ لە ڕۆژی قیامەتدا.

**بڕگەی دووەم** : بۆ کوێ پێشیان دەکەوێ؟ یان بۆ کوێ: خەڵکەکە فیرعەونیان پێش خۆیانیان داوە؟ یان فیرعەون بۆ کوێ خەڵکەکەی وە دواخۆی داوەو

کەوتۆتە پێشیانەوە؟ دەفەرموێ: ﴿ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ﴾، واتە: بردنیە نێو ئاگرا ئاگری دۆزەخ.

(الإِيرَادُ: جَعْلُ الشيء وَارِداً)، (إِيرَاد)، بریتیە لەوەی کە شتێك بخەیە نێو شتێکەوە، (الوارد)، (أي: قَاصِدُ الماءِ)، (وارِد) لە ئەسڵی زماندا بە کەسێك دەگوترێ: کە بچێتە سەر کانیو سەرچاوەیەك، یان ڕوو لە کانیو سەرچاوەیەك بکات، بۆ ئەوەی ئاوی لێ هەڵبهێنجێ، (وَالَّذِي يُوردهُم هو الفَارِط، وَيُقَالُ لَهُ: الفَرَطُ)، ئەو کەسەی کە پێش خەڵکێك دەکەوێ بەرەو کانیو سەرچاوەیەك، بۆ ئەوەی ئاوی لێ بخۆنەوەو ئاوی لێ هەڵبێنجن، پێی دەگوترێ: (فارِط)و، پێشی دەگوترێ: (فَرَط)، لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: {أَنا فَرَطُكُمْ عَلَى الحوضِ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٨٨٣٠)، وَالبُخَارِيّ، برقم: (٦٢١٧)، وَمُسْلم، برقم: (٢٢٨٩)، وَابْنُ حِبانَ، برقم: (٦٤٤٥)}، واتە: من پێش ئێوە دەکەوم بەرەو حەوزی کەوسەر.

لێرەدا زانایان دەڵێن: خوای کاربەجێ وەك گاڵتە پێکردنو بە توانج تێگرتن لە فیرعەون، وایفەرمووە، یانی: سەرکردەو دەم ڕاستی کۆمەڵگایەکان، پێش خەڵکەکەی خۆیان دەکەون بەرەو کانیو سەرچاوەیەك کە لەوێوە بەختەوەرییو سەرفرازیی لێ هەڵبهێنجن، بەڵام فیرعەون پێش خەڵکەکەی دەکەوێ بەرەو ئاگری دۆزەخ، چ سەرکردایەتییەك!! لە ڕاستییدا هەموو فیرعەونو طاغووتو حوکمڕانە خۆ بە زلگرو خۆسەپێنەکان هەروان، پێش خەڵك دەکەون بە ڕێی کوفرو بێبڕوایی دا، لە دنیاداو، لە دواڕۆژیشدا : خوای دادگەر دەفەرموێ: وەك چۆن لە دنیادا بە ڕێی کوفرو بێبڕوایی داو، بەرەو دوور لە خوایی، پێش خەڵکەکە کەوتوون، فەرموون لێرەش بکەونە پێشیان، بەڵام بەرەو کوێ؟ بەرەو دۆزەخ! یانی لەوێ ئەگەر کانیو سەرچاوەیەك هەبێ ئەو سەرکردەو دەمڕاستانە لە ڕۆژی دوایی دا پێش کۆمەڵگاکانی خۆیان بکەون بەرەو لای بریتیە لە ئاگری دۆزەخ!

**برگەی سێیەم** : ﴿ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴾، خراپترین کانیو ئاوێك کە خەڵکی بۆ دەبردرێ، یان خراپترین ئامانجو مەبەستێك کە ڕووی تێدەکرێ،

(ئاگری دۆزەخە) (الوِرْدُ: الماءُ المورودُ)، ئاوێك كە خەڵك ڕووی تێ دەكاتو دەچێتە سەری، بۆ ئەوەی ئاوی لێ هەڵبهێنجێ، (فِعْلُ بمعنى مَفعول)، لێرەدا (وِرْد)، (فِعْل)ی بە مانای (مفعول)ە، وەك (ذِبْح) بە مانای (مذبوح)، كە خوا دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێ : ﴿ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴾[1] أي: بمَذْبُوحٍ عَظِيم)، واتە: بەرانێك كە سەردەبڕدرێ، سەربڕاوێكی مەزن، (وَهِيَ استعَارَةٌ تَهَكُمِيةٌ، لإِنَّ الإِيْرَاد يَكونُ مِنْ أَجْلِ الإِنْتِفَاع بالسَّقِي)، ئەمیش خواستنەوەیەكی گاڵتە پێكەرانەیە، چونكە ئەم وشەیە بەكاردەهێنرێ بۆ ئەوەی خەڵك لەو كانیو سەرچاوەیە ئاو هەڵبهێنجنو لێی بەهرەمەندبن، (الوِرْدُ: ضِدُّ الصَّدْرِ)، (صدر) ئەوەیە كە كەسێك چووبێتە سەر كانیو سەرچاوەیەكو، بێتەوە، بەلاّم (ورد) ئەوەیە كە بەرەو ڕووی بچێ، (مورود)یش (المورود المكان الذي وردوهُ)، ئەو شوێنەی كە بۆی دەچن، واتە: شوێنێكی ڕوو تێكراو، بۆ ئەوەی ئاوی لێ هەڵبهێنجن، دەفەرموێ : ﴿ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴾: (المدخَل المدخُول فيهِ)، شوێنێك كە خەڵك چۆتە نێوی، واتە: ئاگری دۆزەخ خراپترین سەرچاوەیەكی ئاو لێ خواردنەوەیە، كە بۆی دەچن.

هەڵبەتە وەك گوتم ئەو وشانە خوازراونەوەو، قورئان لە لووتكەی هەرە بەرزی ڕەوانبێژیی دایە، ئێمەش لەبەر ئەوەی بۆ خەڵكی كورد زمان تەفسیری دەكەین، ئنجا هەندێك زاراوەو وشەی پەیوەست بە ڕەوانبێژییەوە، هەن، كە تەنیا خەڵكی پسپۆڕو شارەزا لەو زاراوانە تێیان دەگەنو، ئێمەش دەمانەوێ زیاتر مەبەستە كە بگەیەنین بە خەڵكێك، كە بە زمانی كوردی گوێ بیستی ئەو تەفسیركردنەی ئێمە دەبێ، یاخود دەیخوێنێتەوە.

---

١) الصافات: آية: ١٠٧.

**مەسەلەی سێیەم کۆتایی :**

**باسی نەفرین شوێن کەلی فیرعەون خران، لە دنیاو دوارۆژدا :**

خوا فەرموویەتی : ﴿ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ  ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە سێ (٣) برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** ﴿ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِۦ لَعْنَةً ﴾، ئنجا لەم ژیانەدا (گەلی فیرعەون) نەفرینیان شوێن خرا.

(في هذِهِ، أي في هذِهِ الدنيا)، لەمەدا ، یانی لەم ژیانەی دنیادا، بە چی دەزانین؟ چونکە لە ئایەتی ژمارە (٦٠)ی سوورەتی (هود)دا هاتوە، خوا دەفەرموێ :

﴿ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، واتە: لەم ژیانی دنیایەدا، نەفرینیان شوێن خرا (مەبەست لەوێ گەلی عادە)و، لە ڕۆژی قیامەتیشدا.

لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، چونکە لە سوورەتی (هود) لە بەسەرهاتی (عاد)دا، کە پێش ئەم ئایەتانەیە، لە ئایەتی ژمارە (٦٠)دا وشەی (هذه) بە (الدنيا) ڕوونکراوەتەوە، لێرەدا خوا ﷻ بە پێویستی نەزانیوە دووبارە بفەرموێ : ﴿ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا ﴾، (هَٰذِهِۦ)، یانی: ئەم ژیانی دنیایە، چونکە لە قورئاندا نەك وشەیەك، بەڵکو پیتێکی زیادیش نیە، کەواتە: ئەگەر لە شوێنێکدا وشەیەك دووبارە بۆوە، بە دڵنیایی حیکمەتێك، یان چەند حیکمەتێکی لە ژێر دایە، ڕازو نهێنییەکی لە ژێر دایە.

واتە: هەم لەم ژیانە دنیاییەدا، هەم لە دوارۆژیشدا، گەلی فیرعەون نەفرینیان شوێن دەخرێ، لە زمانی عەرەبییدا ئەگەر بگوترێ: (تَبعَهُ) بە نسبەت

ئێــرە (تَبِعَـتْهُ اللَّعْنَـةُ)، واتــە: نــەفرین شــوێنی کــەوت، بــەڵام ئایــا لــەعنــەتەکــە دەیگرێ، یان نــایگرێ؟ ئەوە دیار نیـە، بەڵام کە گوتـرا: (أَتْبَـعَ) یـان (أُتْبِع)، واتە: شوێنی کەوتو گرتیشـی، (أَي: تَبِعَـهُ وَلَحِقَـهُ)، ئەگەر بـە (أَتـبَعَ)، یـاخود (أُتـبِع) بـێ، واتە: بە تەئكيد ئەو نەفرینـەی خوا گرتوونـیو پێیـان گەیشـتوە.

وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا کە پێشـتـر باسمان کرد، دەفەرموێ : ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ١٧٥ ﴾، ﴿ فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ﴾، واتە: شـەیتـان شوێنی کەوتو پێشی گەیشت، ئەگەر فەرمووبـای: (فَتَبِعَـهُ الشيطـان)، واتـە: شـوێنی کـەوت، نـازانـێ دەیگرێ، یان نایگرێ، بەڵام ﴿ فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ﴾، ئەگەر بە (رُباعي) بـێ، واتـە: شـوێنی کـەوتو گرتیشی.

**بـڕگــەی دووەم :** ﴿ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، دیــارە ئەمـە پەیوەسـتـە بـە (أُتبِعُـوا)وە، (أي: وَيَومَ القِيَـامَةِ أُتبِعُوا اللعـنَةَ)، لـە ڕۆژی هـەڵسـانـەوەشــدا نەفرینیـان شوێن خـرا، یانی: لێرەدا وشـەی (لَعنَة)، دووبـارە نەکـراوەتەوە: ﴿ وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِۦ لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، (أَي: وَيَـومَ القِيَامَـةِ أُتبِعُـوا لَعـنَةً)، لێـرەدا دیسـان کـە زانـراوە پێویستی نەکـردوە وشـەی (لَعنَةً)، دووبـارە بکـاتـەوەو، (أُتبِعُـوا فـي هَذِهِ لَعْـنَـةً)، یانی: (أُلْحِق اللعنة بهم): نەفرینیان دواخراو پێشیان گەیشت، وەك خـوای دادگەر لـە جێیـەکی دیکـە فـەرموویـەتی: ﴿ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ٤٢ ﴾القـصص، واتــە: لـەم ژیــانە دنیاییـەدا نەفرینمـان شـوێن خستنو پێگەیاندنو، لە ڕۆژی دواییشـدا ئەوان لە کـەسانێکی نـاقۆڵاکراوو ناشیـرین کراون (بەهۆی ئەوەوە، کە خـوا نەفرینـی لێکردوون).

**بـڕگــەی سێـیــەم :** ﴿ بِئۡسَ ٱلرِّفۡدُ ٱلۡمَرۡفُودُ ﴾، ﴿ بِئۡسَ ﴾ پێشـتـر بـاسمـان کـرد کە (مِنْ أَفْعَالِ الذَّمّ)، هـەروەك (نِعـمَ)، (مِنْ أَفْعَالِ المدْح)، (بِئْس) ئەگەر بچێتـە

سەر شتێك، واتە: ئەو شتە خراپترین شتە.

﴿ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴾، واتە: (بِئْسَ العَطاءُ المعْطَى)، خراپترین هاوكاریی‌و بەخششی بەخشراوە، یان (بِئسَ العَوْنُ المعَان)، خراپترین هاوكاریی‌و یارمەتیی هاوكاریی پێكراو.

(رِفْد) یانی: شتێك كە دەدرێت بە ئینسان‌و هاوكاریی مرۆڤی پێ دەكرێ، وەك پێشتر باسمان كرد: وشەی (رِفادة)، ئەو خواردن‌و پێداویستییانە بوون كە هۆزی قورەیش دەیاندان بەو حاجییانەی كە لە دەرەوەی مەككەوە دێن‌و، زادو زەخیرەیان پێ نەبوو، هاوكارییانیان پێ دەكردن.

خاوەنی (التحرير والتوير)[1] دەڵێ: (وَالمرْفُودُ: حَقِيقَتهُ المعْطَى شيئاً، وَوُصِفَ الرفدُ بالمرْفُودِ، لأَنَّ كِلْتا اللَّعْنَتَيْنِ مَعْضُودَةٌ بالأُخْرَى، فَشُبِّهت كُلُّ وَاحِدَةٌ بمَن أُعْطِيَ عَطاءً، فَهِيَ مَرْفُودَةٌ، وَإِنَّما أُجْرِيَ المرْفُودِ عَلَى التذكير باعْتِبار أَنَّهُ أُطْلِقَ عَلَيْهِ رِفْد).

واتە: وشەی (مَرفُود)، بریتیە لە كەسێك كە شتێكی پێدراوە، ئنجا وشەی (رِفد)، یانی: هاوكاریی، بۆیە بە(مَرفُود)، وەسف كراوە: هاوكارییەكی هاوكاریكراو؟ چونكە ئەو دوو نەفرینە: نەفرینێك لە دنیاداو، نەفرینێك لە دواڕۆژدا، هەركامێكیان هاوكارییە بۆ ئەوی دیكە، بۆیە هەر كامێكیان بەوە وەسف كراوە، كە ئەو هاوكارییە، هاوكاریی كراوە، چونكە نەفرینەكەی دنیا، هی دواڕۆژی بە دوا دادێ، یانی: نەفرینەكەی دنیا، هاوكاریی‌و پشتگیریی كراوە، بە نەفرینەكەی قیامەت، ئنجا نەفرینەكەی قیامەتیش هاوكاریی كراوە بە نەفرینەكەی دنیا، هەر كامێكیان بەوی دیكە هاوكاریی‌و پشتگیریی كراوە، بۆیەش وشەی (مَرفُود)، بە (مُذَكَّر) هاتوە، لەو ڕووەوە كە بە (رِفْد) باسكراوە، (رِفد)یش (مُذَكَّر)ە.

لە سوورەتی (محمد) ئایەتی (١٥)دا، خوای دادگەر ئاوا ئەو هاوكاریی كردنەی ئەهلی دۆزەخ باس دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَسُقُوا مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴾، لە

١) ج ١٢، ص ١٥٧.

ئاوێكی داغو كوڵاو پێیان درا، ڕیخۆڵەكانی پچڕاندن، واتە: ئەوە ئەو هاوكارییەیە كە خوای كارزان دەیانكات، لە نێو دۆزەخ دا، دیارە كەسێك خوا لەعنەتی لێ بكات، ئەوە سزای مەعنەوییەو، بە تەئكید سزایە مەعنەوییەكە، سزای ماددیی‌و جەستەیی‌و بەرهەستیشی بە دوادا دێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ بِئۡسَ ٱلرِّفۡدُ ٱلۡمَرۡفُودُ ﴾، (بِئسَ) (فعل)ەكەیە، (وِرد) (فاعل)ەكەیە، (مورد)ەكەش (مخصوصٌ بالذم)ە، یاخود (مورد) سیفەتی (وِردَ)ەو، (مخصوص بالذم) ئەوەی تایبەت كراوە بە (ذم)ەكە، بریتیە لە ئاگری دۆزەخ، واتە: خراپترین چوونە نێو، یاخود شوێنێ كە خەڵك بچێتە نێوی، بریتیە لە ئاگری دۆزەخ.

هەروەها ﴿ بِئۡسَ ٱلرِّفۡدُ ٱلۡمَرۡفُودُ ﴾، بە هەمان شێوە: (بِئسَ) دەبێتە (فعل)ەكەو، (رِفد) دەبێتە (فاعل)ەكە، ئەویش یان سیفەتی (رِفد)ە، یاخود تایبەت كراوە بە (ذم)، ئەگەر سیفەتی (رِفد) بێ، واتە: (بِئْسَ الرِفْدُ المرْفُود: اللعْنَة، أَو نارُ جَهَنَّم)، یانی: خراپترین هاوكاریی بەخشراو، نەفرینە، یان ئاگری دۆزەخە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆ (٩) ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتەکانی (١٠٠ تاکو ١٠٨)، خوای زاناو توانا چەند ڕاستییەك ڕادەگەیەنێ، لە دوای گێڕانەوەی ئەو حەوت بەسەرهاتە: بەسەرهاتی نووحو گەلەکەی‌و، هوودو گەلی عادو، صالحو گەلی ثەموودو، گۆشەیەك لە بەسەرهاتی ئیبراهیم‌و، لووطو گەلەکەی‌و، شوعەیب‌و گەلی مەدیەن‌و، مووسا لەگەڵ فیرعەون‌و گەلەکەی دا، صەلاتو سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ، دوای ئەو حەوت بەسەرهاتە، خوا ﷻ چەند ڕاستییەکی گەورەو گرنگ وەك هەڵهێنجان لە بەسەرهاتو سەرگوزشتەی ئەو پێغەمبەرانەو کۆمەڵگاکانیان، دەخاتە ڕوو، کە دابەشمان کردوون بۆ شەش برگە:

**برگەی یەکەم :** ئامارە بە مانەوەی شوێنەواری هەندێك لە کۆمەڵگاو ئاوەدانییەکان‌و، بەسەریەکدا ڕمان‌و لەبەینچوونی هەندێکیان.

**برگەی دووەم :** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا ستەمی نەکردوە لەو کۆمەڵگایانەی کە فەوتاون بە سزاو بەلای خوا، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردوەو، پەرستراوە ساختەکانیشیان هیچ سوودیان پێ نەگەیاندوون‌و دادیان نەداون، کاتێ کە لێیان قەوماوەو سزاو بەلای خوا ڕووی تێکردوون.

**برگەی سێیەم :** ئامارە بەوە کە سزادنی خوا بۆ کۆمەڵگایەکان، لە کاتی ستەم‌و خراپەیاندا یاسایەکی گەردوونیی خوایەو، نیشان‌و عیبرەتیشە بۆ هەر کەسێك کە لە ڕۆژی دوایی بترسێ، ئەو ڕۆژەی کە خەڵکی تێدا کۆدەکرێتەوە، بۆ کاتێکی دیارییکراو، بۆ کاتێکی ژمێردراوو دیارییکراو لە لای خوا، دواخراوە.

**بڕگەی چوارەم** : باسی یەكێك لە دیمەنە سامناكەكانی ڕۆژی دوایی دەكات، كە هیچ كەس بەبێ مۆڵەتی، خوا ورتەی لە زار نایەتو، خەڵك دابەش دەبن بۆ دوو كۆمەڵی سەرەكیی، بۆ بێمرادو چارەڕەشو، بۆ بەختەوەرو خاوەن پشكو بەشی باش.

**بڕگەی پێنجەم** : باسی سەرەنجامی شوومی شپرزە حاڵانی بێمراد دەكات، كە بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوەو، هەناسە هەڵكێشانو، هەناسە دانەوەیەكی قورسو بەزەحمەتیان هەیە.

**بڕگەی یەكەم** : باسی سەرەنجامی بەختەوەرانی بە مراد گەیشتووی خۆشحاڵ دەكات، كە بە هەمیشەیی لە بە هەشتدا دەبنو، لە بەخششی خوا، بەهرەمەند دەبن، وە ئەو بەخششەی خوایان لێ نابڕێ.

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا
ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ
إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ
عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ
إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ
وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ
فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ وَأَمَّا
ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ
عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾ ﴾.

# مانـای وشـــە بە وشـەی ئایەتەكـان

{ئەوە كە ( باسكرا) لە بەسەرهاتی ئاوەدانییەكانە بۆتی دەگێڕینەوە، هەیانە (شوێنەوارەكانی) بە پێوە ماوەو، هەشیانە بەسەریەكدا ڕماوە (١٠٠) ئێمە ستەممان لێ نەكردن كە فەوتاندمانن، بەڵكو ئەوان ستەمیان لە خۆیان كرد، ئنجا كاتێك فەرمانی پەروەردگارت هات (بۆ سزادانیان) ئەو پەرستراوانەی كە لە خوار خواوە لێیان دەپاڕانەوە، هیچ برە سوودێكیان پێ نەگەیاندنو، تەنیا زیانبارییان بۆ زیاد كردن (١٠١) گرتنی پەروەردگاریشت بەو شێوەیە، كاتێك ئاوەدانییە ستەمكارەكان دەگرێ (وسزایان دەدات) مسۆگەر گرتنەكەی خوا بە ئێشو توندە (١٠٢) بە دڵنیایی لەوەش دا نیشانە هەیە، بۆ كەسێك لە ئازاری دواڕۆژ بترسێ، ئەو كاتە ڕۆژێكە تێكڕای خەڵكی بۆ كۆ دەكرێتەوەو، ئەو كاتە ڕۆژێكی بینراوو خەڵك بۆ ئامادە كراوە (١٠٣) بۆ كاتێكی دیارییكراوی ژمێرراو (كەم) نەبێ، دوای ناخەین (١٠٤) ئەو ڕۆژەی كە دێ، هیچ كەس بێ مۆڵەتی وی (خوا) قسە ناكات، هەیانە بێمرادەو، هەشیانە بەختەوەرە (١٠٥) ئنجا ئەوانەی بێمرادو حاڵ خراپ بوون، ئەوە لە ئاگری دۆزەخ دان، لەوێ دا هەناسەدانەوەو هەناسە هەڵمژین (ێكی تایبەتی قورسو زەحمەت)یان هەیە (١٠٦) هەتا ئاسمانەكانو زەوی بەردەوام بن، تێیدا دەمێننەوە، مەگەر ئەوەی پەروەردگارت ویستبی (بێتە دی) بە دڵنیایی: پەروەردگارت زۆرباش ئەنجامدەری ئەوەیە كە بیەوێ (١٠٧) ئەوانەی كە بەختەوەر بوون، ئەوە لە بەهەشت دان، بە هەمیشەیی هەتا ئاسمانەكانو زەوی بەردەوام بن، مەگەر ئەوەی پەروەرگارت ویستبی (بێتە دی) ئەوەش بەخششێكی نەبڕاوەیە (١٠٨)} .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

( أَنۢبَآءِ ) : (أَنبـاء : جَمْـعُ نَبـأ وهـو خَبَـرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلم أو غَلَبَـةُ ظَنٍ)، (أَنْبـاء) کۆی (نَبـأ)ە، کـە بـە هەواڵـێکی سوودبەخشـی مـەزن دەگوتـرێ، واتە: سـوودێکی مـەزن ببەخشـێ، کـە بەهـۆی ئـەو هـەواڵـەوە، زانیـاریی، یاخـود گومـانێکـی زاڵ بـەرهـەم بـێ.

( ٱلْقُرَىٰ ) : (القُرَى : جَمْعُ قَرِيـة، اسْم الموْضِـعِ الّذِي يَجتَمِعُ فِيهِ النـاسُ وَلِلنـاسِ جَمِيعَـاً، وَيُقَالُ لِكُلّ وَاحِدٍ مِنْهُما قَرِيـة)، (قُـرَى)، کۆی (قَرْيـة)یە، (قَرْيـة) نـاوی ئەو شـوێنەیە کە خـەڵکی لـێ کۆدەبنەوە، هەروەها بە خەڵکێکیش دەگوترێ کە لـە شـوێنێك کۆدەبنـەوەو، بە هـەردووکیشیان دەگـوترێ: هـەم بـە خەڵکەکـەو هـەم بـە شـوێنەکـەش وێـکـرا، وشـەی (قَرِيـة)، وەك چەنـد جـارێکی دیکـەش باسمان کـردوە، واتـە: ئـاوەدانییـەکی گـەورە، شـارێکی فەرمبـاڵـغ، نـەك چـەمکـە بـاوەکەی ئێستـای کـە (قَرِيـة) لـە بەرانبەر (مدينـة)دايە، واتە: (قَرِيـة)، يانی: لادێ، گوند، ئـاوەدانییـەکی کـەم، لـە بەرانبـەر شاردا کـە ئـاوەدانییـەکی گـەورەیـە.

( نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ) : واتـە : بەسـەرتی دا دەخوێنـینـەوە، بـۆت دەگـێڕینـەوە، (القَصُّ: تَتَبُّعُ الأَثَرِ، وَالقَصَصُ الأَثَرُ : (فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِما قَصَصَاً)، وَالقَصَصُ الأَخْبـارُ المتَتَبعَّـة، قَصَّ عَلَيْـهِ القَصَصَ، والقِصَصُ جمعِ قصَّـة)، وشــەی (قَصّ)، یـانی: بە دوای شـوێنـەوار کـەوتن، بە دوای شـوێنی شتێکدا بڕۆیو بیپشکنی، (قَصص)، واتە: شـوێنەوار (فَارْتَدّا عَلَى آثَارِهِما قَصَصَا)، واتە: بە شـوێن پێیەکانی خۆیاندا گـەڕانەوەو، (قَصَص)، بـە هـەواڵـە یـەك بـە دوای یەکدا هـاتووەکـان، دەگـوترێ، دەگوتـرێ: (قَصَّ عَلَيْهِ القَصَصَ)، واتـە: ئەو هـەواڵانەی بۆ بـاسکـردنو، (قِصَصْ)، کۆی (قِصَّة)یـە، واتە: چیـرۆكو بەسـەرهـاتەکـان.

( قَآبِمٌ ) : واتە : ڕاوەستاو، (قَامَ، يَقُومُ، قِيَاماً، فَهو قَائِمٌ، وَجَمعُهُ قِيَام)، مەبەست پێی ئەو شوێنەوارانەیە کە بە پێوە ماونەوە وەك هەرەمەکانی میسرو باقی ئەو شوێنەوارانەی دیکە، کە وەك چوار دیوارێك ماون.

( وَحَصِيدٌ ) : واتە: کەوتوو، ڕووخاو، دارماو، (أَصْلُ الحَصْدِ قَطْعُ الزَّرْعِ)، واتە: (حَصْد)، لە ئەسڵدا بە برینی، یاخود دروێنەکردنی کشتوکاڵێك دەگوترێ، دەگوترێ: (زَرْعٌ قَائِمٌ عَلَى سَاقِهِ، وَزَرْعٌ مَحْصُودٌ)، کشتوکاڵێك ڕووەکێك کە لەسەر قەدو بنکەکەی خۆی مابێتەوە، بەرانبەرەکەشی ئەوەیە کە درەوکرابێ.

( فَمَآ أَغْنَتْ ) : واتە : (فَما أَجزَأَت عَنْهُم)، سوودی پێ نەگەیاندن، ﴿ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ﴾، واتە: پەرستراوەکانیان هیچ سوودێکیان پێ نەگەیاندن، هیچ بەرگرییەکیان لێ نەکردن، هیچ کەڵکێکیان بۆیان نەبوو، دەگوترێ: (ما يُغْنِي عَنْكَ أَي: ما يُجْزِيءُ عَنْكَ وَلاَيَنْفَعُكَ)، واتە: سوودت پێناگەیەنێ، هیچ کەلێنانت بۆ ناگرێ.

( تَتْبِيبٍ ) : (التَّبابُ: الخُسْرَانُ وَالهَلاَكُ، تَبَّت يداهُ، وَتَبا لَهُ: أَلْزَمَهُ اللهُ هَلاَكا، والتَّتبِيبُ مَصْدَرُ تَبَّبَهُ، إِذَا أَوْقَعَهُ فِي التَّبابِ، وَهو الخَسارَة)، (تَباب)، بە مانای زیانمەندییو لەبەینچوون دێ، دەگوترێ: (تَبَّت يداهُ)، واتە: لەبەینچێ، دوو دەستەکانی لەبەینبچن، بەڵام مەبەست پێی خۆیەتی، (تَباً لَهُ)، واتە: (هَلاَكاً لَهُ)، (تَبَّهُ الله)، واتە: خوا بیفەوتێنێ، (تَتبِيب) چاوگی (تَبَّبَ)یە، (تَبَّبَهُ)، (إِذَا أَوْقَعَهُ فِي التَّبابِ وَهو الخَسارَة)، (تَبَّبَهُ)، واتە: خستیە نێو (تَباب)ەوە، کە بریتیە لە زیانمەندیی، چاوگەکەی بریتیە لە (تَتبِيب)، (تَبَّبَهُ، يُتَبِّبُهُ، تَتْبِيباً)، (تَتبِيب)، واتە: خستیە نێو زیانمەندیی، یان خستنە نێو سەر بەفەتارەت چوون.

( مَّشْهُودٌ ) : واتە : لە لا ئامادە بوو، یاخود شایەدیی بۆ دراو، یاخود بینراو، (أَي: مُحَقَّق مَشْهودٌ بِوُقُوعِهِ)، واتە: شایەدیی دەدرێ لەسەر ئەوەی ئەو شتە ڕوویداوە، دەگوترێ: (حَقٌّ مَشْهود، أَي عَلَيْهِ شُهودٌ)، واتە: ئەو هەقە شایەدی

لەسەرن، دەگوترێ: (مَجلِسٌ مَشهود أي: كَثيرٌ شاهِدوه)، واتە: کۆڕێکەو مەجلیسێکە خەڵکێکی زۆری تێدایە خەڵکیکی زۆری تێدا ئامادەیە، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمٌ مَّشۡهُودٌ ﴾، واتە: ڕۆژێکە بە دڵنیایی دێتە دی، شایەدو بەڵگەی لەسەرن، یاخود ڕۆژێکە کە خەڵکێکی زۆری تێدا ئامادە دەبێ.

( لِأَجَلٍ مَّعۡدُودٍ ) : (الأَجَلُ : المدَّةُ المضْرُوبَةُ لِشيءٍ، المدَّةُ المنْظورَةُ إليْها فِي الأمْرِ، نِهايةُ المدَّةِ المضْرُوبَةِ)، (الأجَل)، بە کاتێکی دیاریکراو بۆ شتێك دەگوترێ‌و، کاتێك کە چاوەڕێ دەکرێ بۆ شتێك بێتە دی‌و، بە کۆتایی کاتێکی دانراو بۆ شتێك دەگوترێ.

( مَّعۡدُودٍ ) : واتە : ژمێردراو، کە لێرەدا مەبەست پێی کەمە، یاخود دیاریکراو.

( شَقِيٌّ ) : (شَقي)، لە کوردییدا یانی: بەدبەخت، بێئاکام، بێمراد، بێئامانج، (الشَّقِيُ والشَّقاوَةُ: خِلافُ السَّعادَةِ، شَقِيَ: تَعِسَ وساءَ حَالُهُ: تَعِبَ)، (شَقيَ) واتە: بەدبەخت بوو، حاڵی خراپ بوو، وە ماندوو بوو، تووشی ڕەنجەڕۆیی بوو، (سَعيد: نَقيضُ شَقيّ)، دیارە (سَعيد)، واتە: بەختەوەر، بە مراد گەیشتوو، بە ئاوات گەیشتوو، پێچەوانەی (شَقيٌ)، (السَّعادَةُ: مَعاوَنَةُ اللهِ الإنْسانِ عَلى نَيلِ الخَيْرِ)، (سَعادَة)، بریتیە لەوەی خوا یارمەتی ئینسان بدات، دەستی بگاتە چاکەو خێرو خۆشیی.

( زَفِيرٌ ) : (زَفَرَ زَفْراً وَزَفِيراً: أَخْرَجَ نَفَسَهُ بَعْدَ مَدِّهِ إيَّاهُ)، دیارە (زَفِير)، واتە: هەناسەدانەوە، دوای ئەوەی کە ئینسان هەناسەی خۆی ماوەیەك دەگرێ، جا دوایی هەناسە دەداتەوە، پێی دەگوترێ: (زَفِير) هەناسەدانەوە.

( وَشَهِيقٌ ) : دیارە پێچەوانەی (زَفِير)ە، دەڵێ: (جَذْبُ الهواءِ إلى صَدْرِهِ)، بریتیە لە هەناسە هەڵمژین، هەوا خستنە نێو سییەکانەوە، (زَفِير): بریتیە لە هەوا دەرکردن لە سییەکان، هەروەها (شَهِيق)، بە دەنگی بەهێزیش دەگوترێ‌و، هەر کام لە (شَهِيق) و (زَفِير)، بە دەنگێکی بەهێز دەگوترێ‌و، هەندێکیان

دەڵێن: (زَفِیر)، دەنگی كەرە كە دەزەرِێو دەنگی یەكەمیەتیو، (شَهِیق)یش دەنگە كۆتاییەكەیەتی، كە لەگەڵیشی دا هەناسە هەڵدەمژێ.

( غَيْرَ مَجْذُوذٍ ) : دەگوترێ : (جَذَّهُ يَجُذُّهُ جَذّاً : كَسَرَهُ أَوْ قَطَعَهُ، فَهو جَذِذٌ وَمَجْذُوذ) (جَذَّهُ، يَجُذَّهُ، جَذّاً)، واتە: بڕی، دەیبڕێ، بڕین، یان شكاندی، دەگوترێ: (جَذِذٌ ومَجْذُوذ)، هەردووكیان بەكاردەهێندرێن، واتە: هەم لەسەر كێشی (فَعِلْ)، هەم لەسەر كێشی (مَفعول)، هەر بە مانای بڕدراو، یاخود شكێنراو، دێ.

# مانای گشتی ئایەتەکان

وەك پێشتریش باسمان کرد، لە پێناسەی ئەم دەرسەدا، ئەم نۆ ئایەتە، وەك ئەنجام گیرییەکی گشتی وان، لەو بەسەرهاتانەی کە لەم سوورەتە موبارەکەدا رابردن، کە سەرجەم بەسەرهاتی حەوت لە پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بەسەرهاتی نووحو گەلەکەیو، هوودو گەلەکەی، کە (عاد)ن، صالحو گەلەکەی کە گەلی ثەموود بوون، پاشان گۆشەیەك لە بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ ئەو فریشتانەی هاتبوون، تاکو سزای گەلی لووط بدەن، بە فەرمانی خواو، بەسەرهاتی لووط ﷺو گەلەکەی، کە هەر بە گەلی لووط ناودارنو، بەسەرهاتی شوعەیبو گەلی مەدیەن، کە بە (أصحاب الأيكة)ش ناسراونو، بەسەرهاتی مووسا ﷺو فیرعەونو دەستەو دایەرەکەی .

ئنجا ئەم نۆ ئایەتە وەك ئەنجامگیریی ئەو حەوت بەسەرهاتە وان، کە خوای پەروەردگار داوامان لێ دەکات، لە میانی ئەم ئایەتانەدا سەرنجی سەرەنجامی ئەو گەلە رابردووانە بدەین، چ ئەو حەوت پێغەمبەرە ﷺ لەگەڵ گەلەکانیان، چ پێغەمبەرانی دیکە، لەگەڵ گەلەکانی دیکەیان.

دەفەرمووێ : ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ﴾، واتە: ئەوە لە هەواڵەکانی ئاوەدانییەکانە کە بەسەرتی دا دەخوێنینەوە. ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، واتە: ئا ئەو بەسەرهاتە بۆیەش بە ئاماژەی دوورە، یانی: ئا ئەو هەواڵە دوورانە، کە لە قووڵایی مێژووداندا، چونکە (هَذَا) یانی: ئەمە، (ذَاكَ) یانی: ئەوە، بەڵام (ذَلِكَ) یانی: هۆ ئەوە، چونکە ئەوانە هەموویان بەسەرهاتی پێغەمبەرانێکن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کە رەگو ریشەی بەسەرهاتەکانیان بە قووڵایی مێژوودا چۆتە خوارەوە، هەندێکیان هی پێش نووسرانەوەی مێژووشن، دەفەرمووێ: ئا ئەوە لە بەسەرهاتی

ئەو کۆمەڵگاو ئاوەدانییانەیە کە بەسەر تۆیدا دەخوێنین‌و بۆتی دەگێڕینەوە، ﴿مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ﴾، هەیانە بەپێوە ماوەتەوە (شوێنەوارەکانیان)و، هەشیانە کە وەك چۆن کشتوکاڵ‌و دەغڵێك درەو دەکرێ، پەرێزێکی ڕووت دەمێنێتەوە، هەشیانە بەو شێوەیەی لێهاتوە ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَـٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾، ئێمە ستەممان لێ نەکردن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، کە خۆیان بەو دەردە برد، خۆیان وا لێکرد کە شایستەی ئەوە بن، خوا سزایان بداتو بەلای ناگەهانیان بۆ بنێرێ.

﴿فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾، ئەو پەرستراوانەی کە لە خوار خواوە، لە جیاتی خوا، جگە لە خوا، لێیان دەپاڕانەوە، کاتێك فەرمانی پەروەردگارت هات، هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن، دەربازو قوتاریان نەکردن، چونکە لە ڕاستییدا هیچ نەبوون‌و بەس لە خەیاڵ‌و گومان‌و وەهمی ئەواندا پەرستراو بوون، ئەگەرنا فریان بەسەر پەرستراوێتییەوە نەبوو، ﴿وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾، جگە لە زیانباریی‌و، جگە لە سەر بەفەتارەت چوونیش، هیچی دیکەیان بۆ زیاد نەکردن، چونکە پەرستراو دەبێ بۆ ئەو کەسەی دەیپەرستێ، زیانی لێ دوور بخاتەوەو سوودو کەڵکی پێ بگەیەنێ‌و بەختەوەری بکات، بەڵام ئەوانە هەر زیانیان بۆ زیاد کردن، چونکە تاکو زیاتر دەیانپەرستن، زیاتر بە گومڕایی دا ڕۆدەچوون‌و، زیاتر لە خوا دوور دەکەوتنەوەو زیاتر شایستەی سزادران دەبوون.

﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَـٰلِمَةٌ﴾، هەر بەو شێوەیەشە گرتنی پەروەردگارت، یانی: سزادانی، کاتێك کە ئاوەدانییەکان، کۆمەڵگایەکان کە ستەمکارن، سزایان دەدات، ئا بەو شێوەیە سزایان دەدات، واتە: ئەمە یاسایەکی گشتی خوایە، نەك ئەوانە تەنیا هەر بەسەرهاتانێك بن، بگێڕدرێنەوەو هیچی دی، بەڵکو ئەو یاسایەی خوا ﷻ کە بەسەر ئەو گەلە پێشووانەدا چەسپاوە، کە لە ئەنجامی ستەم‌و خراپەو لادانیاندا خوا سزای داون، ئا ئەوە یاسایەکی گشتی خوایە،

﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، ئا بەو شێوەیـەیە گرتنی پەروەردگارتو سزادانی بۆ کۆمەڵگا لادەرو لارێیـەکان، ﴿ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴾، بێگومـان گرتنـی ئـەو، (واتـە: گرتنـی خـوا، کە مەبەست پێی سزادانە) زۆر بە ئێشەو زۆریـش تونــدە، زۆر بـە ئێشـە لـە ڕووی چەندێتییـەوە، زۆریش تونـدە لـە ڕووی چۆنیـەتییـەوە، یاخـود بـە ئێشـە لـە ڕووی چۆنیـەتییەوە، زۆریش سەختو تونـدە، لە ڕووی چەندێتییـەوە، واتە: هەم لـە ڕووی چۆنییەتی (كيفية)و هـەم لە ڕووی چەندێتـیی (كمية)یەوە، سـزای خـوا هەتـا بڵێـی سەختو بێـرەزایە، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّمَنۡ خَافَ عَذَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، بێگومـان لەوەدا نیشانە هـەیە بۆ کەسێك کە لـە سزاو ئازاری ڕۆژی دوای بتـرسێ، واتە: کەسێك کە ترسی ڕۆژی دواییو، لێپرسـینەوەی ڕۆژی دواییو، سزای ڕۆژی دوایی هـەبێ، کـە بەهـۆی خراپەکانی خۆیـەوە یـەخەی دەگرێ، هەر کەسێك ترسی ئـەو ڕۆژەو سـزای ئەو ڕۆژەی هەبێ، ئەو بەڵایـانەی بەسـەر ئـەو گەلانــەدا هـاتوون، وەك نیشانەیـەکی خـوا تەمـاشایان دەکات.

بەرێـزان !

هـەمیشـە ئینسـان، چ دیاردە سروشـتییـەکـان، چ ڕستەکـانی فەرمایشـتی خـوا، چ موعجیزەی پێغـەمبـەران، چ ئـەو بەڵاو گرفتـارییانەی کـە بەسـەر گـەلانو میللـەتـان هـاتوونو دێــن، ئەگەر وەك نیشانەی خوا تەمـاشـایان بکاتو پەیوەسـتیان بکاتەوە بە ئیرادەی خواو، بە حیکمـەتی خواو، بەو سیستمەی کە خـوا بۆ بـوون داینـاوە، کـە دنیـا شاری بـێ خاوەن نیـە، ئەوە بۆی دەبێ بە بەڵگەو بەرچاو ڕوونیی، بەڵام ئەگەر ئینسان ئەو شتـانەی هـەموو لـە خـوا دوورخستنەوەو، وەك نیشـانەی خـوا تەمـاشـای نەکـردن، ئـەو کـاتە وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (یونـس)دا دەفـەرمـوێ: ﴿ وَمَا تُغۡنِي ٱلۡأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ١٠١ ﴾، واتـە: ئـایـا نیشانەکـانو، ترساندنەکـان، یاخـود ترسێنەرەکان (کە پێغەمبـەرانو غەیری پێغەمبـەرانیشـن)، چ سـوودێك بـە کەسانێك دەگەیـەنن کە ئیمان نـاهێنن، ئینسان ئەگەر ئیمانی نەبـێو پەیوەندیـی بـە خــواوە نــەبێ، وەك دەفـەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا

يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ ﴾یونس، واتە: بێگومان ئەوانەی کە بڕیاریان، ئەگەر هەرچی موعجیزەیەو هەرچی بەڵگەو نیشانەیە بۆیان بێ، هەر بڕوا ناهێنن، چونکە پەکیان لەسەر نیشانەو بەڵگەو موعجیزە نەکەوتوە، بەڵکو هەر بڕیاریان وایە ئیمان نەهێنن، خوای دادگەریش ئەو توانایەی داوە بە مرۆڤان، بۆ ئەوەی بتوانن و بگونجێ تاقی بکرێنەوە، دەتوانن نکوولیی لە نیشانەکان بکەن، مرۆڤ دەتوانێ بڵێ: ئا ئەو ماستە ڕەشە، دەتوانێ بڵێ: ئەم قیرە زۆر زۆر سپییە، بەڵێ مرۆڤ دەتوانێ نکوولیی لە هەق بکات، دەتوانێ دانی پێدانەهێنا، یا لە ناخی نەفسی خۆیدا بشزانێ هەقە، هەروەها دەتوانێ ناهەق بە هەق بخاتە بەرچاو، یا لە دڵی خۆشی دا بزانێ ناهەقە، چونکە ئەگەر وا نەبێ، مرۆڤ نەدەگونجا تاقی بکرێتەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ﴾، ئەو ڕۆژە، (ڕۆژی دوایی) ڕۆژێکە خەڵکی بۆ کۆدەکرێتەوە، واتە: خەڵکی تێدا کۆدەکرێتەوە، ﴿وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ﴾، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە بە دڵنیایی دێتە دی، شایەدیی لەسەر دراوە کە دێتە دی، یاخود ڕۆژێکە کە زۆر دەبینرێ، یانی: خەڵکێکی زۆر تێیدا کۆدەبێتەوە، یان خەڵکێکی زۆری تێدا ئامادە دەبێ، ﴿وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ﴾، دواشی ناخەین، مەگەر بۆ کاتێکی ژمێردراو، دیارە هەمیشە شتی کەم دەژمێردرێ، دیارە ئەوە بە پێوەری خوای زاناو توانا، ئێمە نازانین چەندە؟ بۆیە کە دەفەرموێ: ژمێردراو (مَعدُود) مانای وا نیە کە ئێمە دەیزانین، بەڵکو نەك ئێمە، هیچ پێغەمبەرێکیش ﷺ و تەنانەت جبرائیلیش نەیزانیوە، بەڵام لەلای خوای شارەزا ژمێردراوو دیارییکراووە زانراوەو، کەمیشە، چونکە بە پێی عورفو باوی میللەتان، شتێك کە کەم بێ، دەڵێن: (مَحدُود)، واتە: سنووردار، (مَعدُودَ)، واتە: ژمێردراو، بەڵام شتێك کە زۆر بێ، دەڵێن: نازمێردرێ، وەك خوای پەروەردگاریش ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾ الزمر، واتە: بێگومان خۆڕاگران، پاداشتیان دەدرێتەوە بە بێ ژماردن، هەڵبەتە لەلای خوای زانا پاداشتی

خۆڕاگرانیش هەر ژمێردراوە، بەڵام یانی: بۆ ئێوەی مرۆڤ ناتوانن بیژمێرن، هێندە زۆرە، مەبەست پێی زۆریەکەیەتی.

دوایی دەفەرموێ : ﴿ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾، (لاَ تَكَلَّم)، لە ئەسڵدا بریتیە لە: (لاَ تَتَكَلَّم)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە دێ، هیچ کەسێك قسە ناکات مەگەر بە مۆڵەتی خوا، واتە: ورتەی لە دەم نایەت، ﴿ فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴾، ئنجا ئەو خەڵکە، هەیانە بێمرادو بێئاکامەو ژین تاڵو ڕۆژ ڕەشە، ﴿ وَسَعِيدٌ ﴾، هەشیانە بەختەوەرو بە مراد گەیشتوو و بە ئاکام گەیشتووو سەرفرازە .

ئنجا خوا ﷻ باسی هەر کامێکیان دەکات: ئەو بەدبەختو چارەڕەشانەو، ئەو بەختەوەرو سەرفرازانە : ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ ﴾، ئنجا ئەوانەی بەدبەخت بوون، خۆیان ڕۆژ ڕەشو بێئاکامو بێمراد کردوە، ﴿ فَفِى ٱلنَّارِ ﴾، ئەوانە لە ئاگردان، واتە: لە ئاگری دۆزەخ دان، ﴿ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴾، لە نێو ئەوێدا، (لە نێو ئەو ئاگرەدا) هەناسەدانەوەیەکی زۆر بە زەحمەتیان هەیە، ﴿ وَشَهِيقٌ ﴾، هەروەها هەناسە هەڵمژینێکی زۆر قورس.

چونکە مرۆڤ لە نێو ئاگردا بەهۆی سووتانو چڕە دووکەڵەوە، بە تەئکید پشووی سوار دەبێ، هەناسەی قورس دەبێ، بۆیە کە هەناسە دەداتەوە، خوا خوایەتی ئەو گەرمییەی لە دەروونی دا هەیە، زوو دەری باوێ، کە ئەوە (زَفِير)ە، پاشان پێویستی بە هەناسە هەڵمژین (شَهِيق)دەکات، بەڵام دیسان کە هەناسە هەڵدەمژێ، زۆر قورسە، چونکە هەمووی چڕە دووکەڵو گەرمییە، واتە: ئەوانە ژیانێکی زۆر قورسیان لێ دەگوزەرێ، تۆ تەماشا بکە! لەگەڵ هەر هەناسەدانێكو هەناسە هەڵکیشانێکدا، ئینسان عەزابو مەینەتیی بکێشێ، مانای وایە هەموو ژیانیان بریتیە لە مەینەتییو ئازارو ناسۆر.

﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾، ئەوە چۆنیەتی ژیانەکەیان لەوێدا بەو شێوەیە، ئنجا با بزانین ماوەکەی چەندە، کە لەو ئاگرو سزاو

جـەزرەبەو نـاڕەحەتییـەدا دەمێننـەوە؟ ﴿ مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾، هەتـا ئاسمانەکانو زەوی بەردەوام بن، ئەوانیش دەمێننەوە، ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ﴾، مەگـەر ئەوەی پەروەردگارت بیەوێ، لێی کەم بکات، یان لـێی زیاد بکات، کە دیارە ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

بـەڵام زانـایانی شـارەزای زمـانی عەرەبـیی دەڵـێن: شـێوازی دەربڕینـی عـەرەبو میللەتانی دیکەش هەروایە، دەگوترێ: (هەتا دنیا دنیایە)، (هەتا ئاسمانو زەوی هەن)، واتە: مەبەسـتی پـێ هەمیشەییـە، یان دەگوتـرێ: (هەتـا شەوگـارو ڕۆژگـار بەدوای یەکدا بێن) مەبەسـتی پێی هەمیشەییـە، ئەگـەرنـا دەزانـین کـە کاتێـك دێ، ئاسمـانو زەوی نـامێـنن، کاتێك دێ شەوگارو ڕۆژگاری بەو چەمكو واتـایـەی ئێستـا، کە لە ئەنجامی خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆی دا، لە بەرانبـەر خۆردا پەیـدا دەبن، نـامێـنن، وەك خوا ﷻ لـە سـووڕەتی (إبراهیم)دا دەفـەرموێ : ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژەی کـە زەویو ئـاسمـانەکان، دەبن بە زەویو ئـاسمـانی دیکە، جگە ئەوەی ئێستـا هـەن، واتـە: دەگۆڕێـن، گۆڕان بەسـەر ئەم سیستەمو بوونە دادێو، بۆ خـوای تـاکی دەسـەڵاتدارو مـل پـێ کـەچکـەر، دەکـەونە گۆڕێ، کـە دیارە ئەوە مەبەست پێی ڕۆژی دواییـە.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾، بێگومـان پەروەدگـارت ئەنجامـدەری هـەر شـتێکـە کە بیـەوێ، چی بیـەوێ ئەنجامی دەدات.

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ﴾، ئنجا ئەوانەی کە بەختەوەر کراون، بە مراد گەیـەنراون، خۆشحاڵ کـراون، ﴿ فَفِى ٱلْجَنَّةِ ﴾، ئەوانـە لـە بەهەشـت دان، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوە، ﴿ مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾، هەتـا ئـاسمانەکـانو زەوی بـەردەوام بـن، وەك گوتمـان : تـا هەتایـە، ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ﴾، مەگـەر ئـەوەی پەروەردگـارت

بیەوێ، لێی کەم بکات، یان لێی زیاد بکات، کە هەمیشە خوا ﷻ لە قورئاندا شتەکان دەبەستێتەوە بە ویستی ڕەهاو بێسنووری خۆیەوە، چونکە خوا ئەو سیستمەی بۆ ئەو بوونە داناوەو، هەر کاتێك خوا ﷻ بیەوێ، شتێك بگۆڕێ، دەیگۆڕێ، واتە: ئەوە نیە بڵێی لە دەستی دەرچوو بێ، وەك هەندێك لە فەیلەسووفەکانی یۆنانو غەیری یۆنانیش گوتوویانە: خوا ﷻ ئەم بوونەوەرەی بە شێوەیەك داناوە، کە دوایی دەستکاری ناکات! نەخێر وانیە:

١/ خوا ﷻ ئاگری داناوە بسووتێنێ، بەڵام ئیبراهیمیان خستە نێو ئاگرو خوا فەرمووی : ﴿يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾﴾ الأنبياء، واتە: ئەی ئاگر! ساردو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم، ئاگر بە سروشت دەسووتێنێ، بەڵام خوا فەرمووی : نابێ بسووتێنی .

٢/ ئاو خەڵك بە سروشت دەخنکێنێ، بەڵام خوای باڵادەست ئاوی بۆ مووساو بۆ گەلەکەی شەق کرد، دەریای سووری بۆ شەق کردن، بەڵام فیرعەونو داروودەستەکەی تێیدا خنکاندن .

٣/ خەڵك بە بێ هەواو با نازی، بەڵام خوای بەرزو مەزن گەلی عادی بە با لەنێو بردوە .

٤/ ئێمە بە بێ دەنگ ناتوانین پێکەوە مامەڵە بکەینو، لە قسەی یەکدی حاڵی بین، بەڵام خوا بە دەنگێکی گەورە گەلی ثەموودو گەلی عادی لە بەین بردوون، هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە نیعمەتنو، ئێمە پێویستییمان پێیانە، کاتێ خوا ﷻ ئیرادە بکات بۆمان دەبن بە نیقمەتو بەڵاو، جاری واش هەیە ئەوەی کە خەڵك دەفەوتێنێ، ئەگەر خوا ﷻ مۆڵەت نەدا، ئەو شتە نافەوتێنێ .

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ویستی خوا ڕەهایەو، نەبەستراوەتەوە بە هیچ شتێکەوە، بەڵام بە تەئکید خوا ﷻ ویستەکەی بەستراوەتەوە بە زانیاری بێسنووریو، بە حیکمەتی بێسنووریو، بە بەزەییو بە هەموو سیفەتەکانی دیکەیەوە، واتە: کە دەڵێین: ویستی خوای پەروەردگار ڕەهایە، بۆ ئەوەیە کە بزانرێ: خوای زاڵی توانادار، دەستە پاچە نیە لە بەرانبەر دروستکراوەکانیداو،

لە بەرانبەر ئەو سیستەمەدا كە بۆ دروستكراوەكانی داینـاوە بەڵام خـۆشی پێی فـەرمووین: یاسـای خـواو (سـنة الله) نـاگـۆڕێ، ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلًاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ﴿٤٣﴾﴾فـاطر، بەڵام دەبـێ بزانیـن كـە خـوای دادگـەر دەست كـراوەیـەو دەست ئـاوەڵایـەو، هیچ كۆتو بەندێك لـەسـەر دەسـەڵاتی خـواو لـەسـەر ویستی خـوا نـیـە.

دوایی خـوا دەفـەرموێ : ﴿عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ﴾، ئـەوە بەخشـشـێكی نەبڕاوەیـە، واتە: ئەو بەخششەی كە بۆ بەختـەوەران هـەیـە، لـە بەهەشتەكـانی خـوادا، كـە بـە هـەمیشـەیی تێیـاندا دەمێننـەوە بەخششێكی نەبـڕاوەیـەو بـێ كۆتـاییـە.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :**

## ئاماژە کردن بە مانەوەی شوێنەواری هەندێك لە ئاوەدانییەکانو، بەسەریەك دارمانی هەندێکیان:

خــوا فەرموویــەتی : ﴿ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيۡكَۖ مِنۡهَا قَآئِمٞ وَحَصِيدٞ ١٠٠ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە سێ (٣) برگەدا:

**برگەی یەکەم :** ﴿ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡقُرَىٰ ﴾، پێشتر ئاماژەمان پێدا ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، ناوی ئاماژەیە (إسمِ إشارة)یە بۆ زۆر دوور، هۆ ئەوە، یانی: ئەو هەواڵە دوورانە کە لە قووڵایی مێژوودان، ﴿مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡقُرَىٰ ﴾، لە هەواڵی ئاوەدانییەکانن، کۆمەڵگا پێشووەکانن، (النَّبأ: خَبَرٌ ذُو فائِدَةٍ عَظيمَةٍ يُحْصَلُ بهِ عِلم أو غَلَبَة ظَنٍ)، واتە: (نَبأ)، بریتییە لە هەواڵێك کە سوودێکی مەزنی تێدا بێ، بەهۆی ئەو هەواڵەوە زانیارییەکی جێی دڵنیایی یاخود گومانێکی زاڵ، بۆ مرۆڤ پەیدا ببێ.

**برگەی دووەم :** ﴿نَقُصُّهُۥ عَلَيۡكَ ﴾، دەگوترێ: (قَصَّهُ عَلَيْهِ أي: تَلاهُ وَحَكاهُ)، بەسەریدا خوێندەوە، بۆی گێڕایەوە، (قَصّ)، بریتییە لە هەواڵ گێڕانەوەیەك کە شتەکە چۆن ڕووی داوە، ئاوا بگێڕدرێتەوەو بخرێتە ڕوو، بە بێ کەمو زیاد.

**بڕگەی سێیەم :** ﴿مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ﴾، واتە: لەو شارو لەو ئاوەدانییانە، کە خەڵکەکەیان فەوتاوە، هەیانە شوێنەوارەکانی بە پێوە ماونەوە دەرو دیوارو قەڵاو شوێنەوارەکانیان بە پێوە ماون، ﴿وَحَصِيدٌ﴾، هەشیانە کە وەك چۆن دەغڵو دانێك، ڕووەکێك دەدروێتەوە، یاخود دارو درەختەکانی باخێك کە بایەکی بەهێز لێیدەدا، لە ڕەگەوە ڕایدەقەنێننو پاڵ دەکەوێ، هەشیانە بەو شێوەی لێهاتوە.

زانایان دەڵێن: ئەمە وێچواندنی شوێنەواری شارەکانو، کۆمەڵگا فەوتاوەکانە، بە کشتوکاڵێك کە هەندێکی لەسەر قەدو بنکەکەی خۆی ماوەتەوەو بەپێوەیەو، هەندێکیشی دراوەتەوە، وێنەی ئەوانەی کە ماون: هەرەمەکانی میسرو، شوێنەوارەکانی گەلی ثەموود کە صالحیان بۆ ڕەوانە کرا بوو، لە ناوچەی (حجر)و، شوێنەوارەکانی گەلی عاد، کە هوودیان بۆ ڕەوانەکرا بوو، لە نیوە دورگەی عەرەبییو، شوێنەواری ئەو کۆمەڵگایانەی لە نێوان دوو ڕووبارەکەدا (میزۆپۆتامیا) ژیاون.

هەندێکیشیان شوێنەوارەکانیان بەپێوە نەماون، وەك شوێنەواری گەلی لووط، کە کەوتوونە ژێر دەریاچەی مردوو (البحر الميت)ەوەو، شوێنەواری ئووری کلدانییەکانو، هی زۆر لە گەلانی دیکە، کە فەوتاون، بەڵام بەهۆی ئەو نووسینانە (رُقَيمات)و، ئەو کەلوپەلو پارەو دراوانەوە کە دۆزراونەوە، دەزانرێ کە ئەو شوێنە شار بووە، کە ئێستا زانایانی شوێنەوارناسو لێکۆڵەرەوە زۆر جۆرە زانیاری دەربارەی گەلە فەوتاوەکان، بەهۆی ئەو نووسینانەوە کە لەسەر کەلوپەلەکانیانن، وەك: پارەو دراوو چەكو چۆڵو کەلوپەلی دیکەی ژیانی ڕۆژانەیان، وەدەست دێنن، لەوبارەوە کە ئایا: ئەو گەلە، چ گەلێك بووە؟ چەند ساڵ لەمەو پێش ژیاوە؟! چی کردووەو... هتد؟!

**مەسەلەی دووەم :**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا ستەمی لەو کۆمەڵگا کاول کراوانە نەکردووەو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووەو، پەرستراوە ساختەکانیشیان هیچ دادیان نەداون، کاتێ کە بەڵای خوا هاتووەو، نەیانتوانیوە چە پاڵەیان بدەنو، بیانپارێزن:**

خوا فەرموویەتی : ﴿ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە چوار (٤) برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** ﴿ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ ﴾، واتە: ئێمە ستەممان لە خەڵکی ئەو ئاوەدانییانە نەکردوە، دەڵێ: (ضَمِيرُ الغَيْبَةِ فِي ظَلَمناهُم، عَائِدٌ إلى القُرَى باعْتِبارِ أهْلِها)، یانی: ئەگەر خوا ﷻ ڕاناوەکەی بردبایەوە بۆ لای (القُرَى)، دەیفەرموو: (وَما ظَلَمناها)، واتە: ئێمە ستەممان لەو ئاوەدانییانە نەکرد، بەڵام لێرەدا ڕاناوی نادیار لە ﴿ ظَلَمْنَاهُمْ ﴾دا دەگەڕێتەوە بۆ دێیەکان، بە ئیعتیباری خەڵکەکەیان، واتە: ئێمە ستەممان لە خەڵکی ئەو ئاوەدانییانە نەکرد .

**برگەی دووەم :** ﴿ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد .

ئنجا کە دەفەرموێ: ستەمیان لە خۆیان کرد، واتە: بە هەموو شێوەکانی ستەم: لە ڕووی بووناسییەوە، لە ڕووی ئیمانو عەقیدەوە، لە ڕووی

پەرستنەوە، لە ڕووی سیاسییەوە، لە ڕووی ئابووریی، لە ڕووی كۆمەڵایەتیی، لە ڕووی خێزانیی، لە ڕووی ڕەوشتیی، لە هەموو ڕوویێكەوە، لایانداو تووشی لادانو خلیسكان بوونو، ستەمیان لە خۆیان كرد.

**بڕگەی سێیەم** : ﴿ فَمَآ أَغۡنَتۡ عَنۡهُمۡ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِي يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ لَّمَّا جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَ ﴾، ئەو پەرستراوانەی كە لە خوار خواوە، لێیان دەپاڕانەوە، لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕانەوەو دەیانپەرستن، كاتێك فەرمانی پەروەردگارت هات، هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن.

وەك جاری دیكەش گوتوومانە : ﴿ أَمۡرُ رَبِّكَ ﴾:

١) یان مەبەست پێی دەرچوونی بڕیاری پەروەردگارە، بە لەبەینچوونی دانیشتووانی ئەو شارو وڵاتانە .

٢) یان وشەی (أمر)، واتە: (مأمُور)، واتە: فەرمان پێكراوی خوا، كە بریتیە لەو بەڵای ناگەهانە، لەو سزایە كە خوای دادگەر ناردوویەتی .

**بڕگەی چوارەم** : ﴿ وَمَا زَادُوهُمۡ غَيۡرَ تَتۡبِيبٖ ﴾، ئەو پەرستراوانە هیچیان زیاد نەكرد، بۆ ئەوانەی دەیانپەرستن، بۆ پەرستارەكانی خۆیان، جگە لە زیانباریی جگە لە سەر بە فەتارەت دان.

وشەی: ﴿ تَتۡبِيبٖ ﴾، پێشتریش باسمان كرد: (مَصْدَرُ تَبَّبَهُ، إذَا أَوْقَعَهُ فِي التَّبَابِ، وَهُو الخَسَارَةُ)، (تتبیب)؛ چاوگە بۆ وشەی (تَبَّبَهُ)، واتە: خستیە نێو (تَباب)ەوە، (تَبابِ)یش، واتە: زیانباریی، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (غافِر)دا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ إِلَّا فِي تَبَابٖ ٣٧ ﴾، واتە: فێڵو پیلانی فیرعەون، سەرەنجامەكەی هەر زیانباریی بوو، سەر بە فەتارەت چوونو بێ ئەنجامیی بوو.

ئنجا ئایا چۆن پەرستراوەکانیان هەر زیانبارییان بۆ زیاد کردن، لە کاتێکدا کە سزاو ئازاری خوا هات؟ چونکە ئەوانە پشتیان بە پەرستراوەکانی خۆیان دەبەست، کە دەربازیان بکەن‌و چەپاڵەیان بدەن، هیچیشیان بۆ نەکردن، مانای وایە دەستیان لە بنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەرچووو، تووشی ڕەنج بە خەسارییو خاکەسارییی بوون، لەوبارەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە کە خوای کارزان ڕست لە دوایی ستەمکاران درێژ دەکات‌و مۆڵەتیان دەدات، بەڵام پشتگوێیان ناخات، ئەمە دەقەکەیەتی:

{عَنْ أَبِي مُوَسى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ : قَالَ رَسولُ الله ﷺ : (إِنَّ الله لَيُمْلِي للظَّالم، حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لم يُفْلِتْهُ) قَالَ : قَرَأَ : ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ١٠٢﴾ هـود} {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٤٠٩)، وَمُسْلم، برقم: (٢٥٨٣)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣١١٠)، وَابْنُ ماجَهْ، برقم: (٤٠١٨)} .

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا مۆڵەت دەداتە ستەمکار (مۆڵەتی دەداتێ بگەڕێتەوە، یان: مۆڵەتی دەداتێ بۆ ئەوەی زیاتر بە ستەم‌و خراپەدا بچێتە خوار، تاکو زیاتر شایستەی سزادان بێ) هەتا کاتێک کە گرتی، دەربازی ناکات، (وەك گوتراوە: بە بست جەبی نادات‌و قوتاری ناکات، ناهێڵێ بەسەریەوە بچێ) دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: هەر بەو شێوەیە گرتنی پەروەردگارت، کاتێك کە ئاوەدانییەکان دەگرێ، واتە: خەڵکی ئاوەدانییەکان دەگرێ، لە کاتێکدا کە ستەمیان کردوە.

**مەسەلەی سێیەم :**

## سزادانی خوا بۆ ستەمکاران، یاسایەکی بنەڕەتیی خوایەو، نیشانەو عیبرەتیشە بۆ لە دواڕۆژ ترساوان:

خوا فەرموویەتی : ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە لە شەش (٦) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم** : ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ﴾، واتە: هەر بەو شێوەیە گرتنی پەروەردگارت کاتێک کە ئاوەدانییەکان دەگرێ، لە کاتێکدا کە ستەمیان کردوە، یانی: ئەمە یاسایەکی خوایە، کە بەهۆی ستەمەوە سزای کۆمەڵگایەکان دەدات، ئنجا ستەم :

١ـ دەگونجێ مەبەست پێی شیرک بێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾لقمان .

٢ـ دەگونجێ مەبەست پێی کوفر بێ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾﴾البقرة .

٣ـ دەگونجێ مەبەست پێی دەستدرێژیی کردنە سەر مافەکانی خەڵك بێ، یاخود لادانو گوناهو تاوانی مرۆڤ بێ لە خودی خۆی دا، هەموو ئەوانە لە قورئان دا لە ژێر ناوونیشانی ستەم (ظُلم)دا، هاتوون.

ئەم دەقەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە (شرك)، وشەی (ظُلم)ی بۆ بەکارهاتوە: {عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: لما نَزَلَتِ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾، شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسولِ اللهِ ﷺ، وَقَالُوا: أَيُّنا لاَ يَظْلِم نَفْسه؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: (لَيْسَ هو كَما تَظُنُونَ، إنَّما هو كَما قَالَ لُقْمانُ لابْنِهِ: ﴿يَـٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان)}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو ئیمانەکەیان لەگەڵ ستەم دا تێکەڵ نەکردوە، ئەوانە دڵنیان، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، ناڕەحەت بوون، گوتیان: کام لە ئێمە ستەمی نەکردوە (واتە: گوناهی نەکردوە)؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەبەست پێی ئەوە نیە، کە ئێوە گومان دەبەن، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە وەك لوقمان بە کوڕەکەی خۆی گوت: ﴿يَـٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان، واتە: ئەی ڕۆڵە! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، هاوبەش بۆ خوادانان ستەمێکی مەزنە.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو ئیمانەکەی خۆیان لەگەڵ ستەمدا تێکەڵ نەکردوە، یانی: دوای ئەوەی کە ئیمانیان هێناوە، هاوبەشیان بۆ خوا دانەناوە، ئا ئەوانە دڵنیان، مەبەست لە (ظُلم) لێرەدا گوناح نیە، بەڵکو مەبەست لە ستەم، شیرکە.

کەواتە بەلای کەمەوە وشەی ستەم (ظُلم)، چوار واتای هەن، لە بەکارهێنانی قورئاندا :

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٤٩٨)، وَمُسْلم، برقم: (٣٤٢)، وَأَحْمَد، برقم: (٤٢٤٠)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

أ/ بە مانای شیرك دێ : ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾لقمان.

ب/ بە مانای كوفر دێ : ﴿وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾﴾البقرة.

ج/ بە مانای دەستدرێژیی كردنە سەر مافەكانی خەڵك دێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ...﴿٤٢﴾﴾الشورى .

د/ هەروەها بە مانای گوناهكردنو تاوانو لادانی مرۆڤ دێ لە خودی خۆشی دا:

﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾﴾النساء.

ئنجا كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ ﴾، واتە: ئەمە یاسای خوایە، نەك تەنیا بۆ گەلە پێشووەكان، بەڵكو بۆ ئێستاشو بۆ دوای ئێستاش كاتێ كە مرۆڤەكان ستەم دەكەن، بە هەر چوار چەمكو واتایەكەی، یان بە مانا ئەسڵییەكەی: (الظُّلم: وَضْعُ الشيء فِي غَيْرِ مَوضِعِهِ أو تَجَاوُزُ الحُدود)، (ظُلم)، ستەم: بریتیە لەوەی شتێك لە شوێنی خۆیدا دانەنێی، یاخود سنوورەكان ببەزێنی، هەر كاتێك مرۆڤەكان ستەمیان كرد، خوا بەو شێوەیە سزایان دەدات .

**برگەی دووەم** : ﴿إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴾، بێگومان گرتنی وی (یانی: خوا) بە ئێشەو توندو سەختە، بە ئێشە، لە ڕووی چۆنیەتییەوە زۆر بە ئێشو ژانەو، زۆر بە سووتو سوێیەو، لە ڕووی چەندێتییەوە زۆر سەختو بێڕەزایە.

**برگەی سێیەم** : ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ ﴾، بێگومان لەوەدا، (واتە: لە سزادانی خوا بۆ گەلە ستەمكارەكان، بۆ كۆمەڵگا لادەرەكاندا) نیشانە هەیە بۆ كەسێك كە لە ئازاری دوارۆژ بترسێ، بەڵام ئەوەی ئیمانی نەبێ، دیارە وەك ئایەت تەماشای ناكات، بۆیە هیچ دەرسو پەندێكی لێ وەرناگرێو، بۆی نابێتە نیشانە.

**برگەی چوارەم :** ﴿ذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّجۡمُوعٞ لَّهُ ٱلنَّاسُ﴾، ئەو ڕۆژە، {بۆچی بە ئامـاژەی دوور، باسی دەکات؟ چونکە بە نسبەت ئێمەوە کە لـە دنیـاین، جارێ ئـەو ڕۆژە دوورە بە پێوەری ئێمە} : ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە، کە خەڵکی بۆ کۆدەکرێتەوە، واتە: خەڵك لەبەر وی کۆدەکرێتەوە.

**برگەی پێنجەم :** ﴿وَذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّشۡهُودٞ﴾، ئـەو ڕۆژە ڕۆژێکـە، شایـەدان شایەدیی تێدا دەدەن، یاخود ڕۆژێکە کە بە دڵنیایی دێتە دی، وەك چۆن شایەدیی لەسەر دراوە، یاخـود ڕۆژێکـە خەڵکـێکی زۆری تێـدا ئامـادە دەبـێ و، ڕۆژێکـە خەڵکێکی زۆر دەیبینێ.

**برگەی شەشەم :** ﴿وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٖ مَّعۡدُودٖ﴾، دواشی ناخەیـن، مەگەر بۆ کاتێکی ژمێردراو، (أَجَل)، بریتیە لە کاتی دیارییکراو بۆ هەر شتێك، یاخود کۆتایی ئەو کاتەی کە دیاریی کراوە، کـە لـێرەدا ئـەوە مەبەستە، واتە: ئێمە ئەم ڕۆژی دواییە، دواناخەین، مەگەر بۆ کاتێك کـە ژمێردراوەو کەمە، دیارە ئەوە بە نسبەت خوای پەنهانزانەوە.

(المعدُودُ: المحْسُوبُ)، شتێك کـە ژمێـردراو بـێ، حیساب کـراوە بـە شێوەیەك کە نە پێش بکەوێ، نە دوا بکەوێ، یاخود مەبەست پێی نیزیکیەتی، یان کاتەکەی کەمە.

**مەسەلەی چوارەم :**

**خوای بالادەست باسی یەکێك لە دیمەنە سامناکەکانی ڕۆژی دوایی دەکات، کە هیچ کەس ورتەی لە زاری نایەتەدەر بەبێ مۆڵەتی خوا، هیچ کەس لێو لەسەر لێو هەڵناگریّو لەفزی لە زاری ناگەڕێ بەبێ مۆڵەتی خوا:**

خوای زاناو توانا فەرموویەتی : ﴿ يَوۡمَ يَأۡتِ لَا تَكَلَّمُ نَفۡسٌ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ فَمِنۡهُمۡ شَقِيّٞ وَسَعِيدٞ ﴿١٠٥﴾ ﴾ .

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە دوو (٢) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ يَوۡمَ يَأۡتِ لَا تَكَلَّمُ نَفۡسٌ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ ﴾: (یوم) بە واتای (کات) دێ، ئنجا (یأتي) هەم بە فڕتاندن (حذف)ی (ی)ایەکەی خوێندراوەتەوە، واتە: بە (یأتِ)، هەم بە (یأتي) واتە: بە چەسپاندنی (ی)ایەکەی.

یانی: ئەو کاتەی ڕۆژەی دوایی دێ، هیچ کەسێك قسە ناکات، مەگەر بە مۆڵەتی وی، بە مۆڵەتی خوا ﷻ.

وشەی ﴿ لَا تَكَلَّمُ ﴾یش، بە دوو شێوە خوێندراوەتەوە:

١) ﴿ لَا تَكَلَّمُ ﴾، واتە: تایەکی فڕتێندراوە .

٢) (لاَ تَتَكَلَّم) بەم شێوەیش خوێندراوەتەوە، هەردووکیان بە واتای ئەوە دێن کە: هیچ کەسێك قسە ناکات، بەبێ مۆڵەتی خوا، بۆچی؟ چونکە لە دنیادا خەڵك ئازادو سەرپشکەو، دەست ئاوەڵایە، قسەی بەجێ دەکات، یان قسەی بێجێ دەکات، چاکە دەکات، یان خراپە دەکات، ڕاست دەڕوات، یان چەوت دەڕوات، بەڵام لەوێ وانیە، لەوێ هەموو شتەکان لە ژێر ڕکێفو کۆنتڕۆڵی خوا ﷻو فریشتەکانی دان، وەك دنیا جێی پاشا گەردانیی نیە، بەهەشتو قیامەت شوێنی تاقیکرانەوە نیە، تاقیکردنەوە لە دنیادایەو بەسەرچووە.

**بڕگـــەی دووەم : ئـــایا خەڵـــك چییـــان لـێـدێ؟ زۆر بـە كورتیــی فەرموویــەتی:**

**﴿فَمِنۡهُمۡ شَقِيّٞ وَسَعِيدٞ ﴾، ﴿فَمِنۡهُمۡ شَقِيّٞ ﴾: هــەیانە بەدبەختــە، هەیــانە ژین تاڵە، هەیانە بارودۆخ ناخۆشـە، ماندوویـە، سەغڵەتە، شپرزەیە، وشـەی (شقي) هەموو ئەمانە دەگرێتەوە.**

**(وَسَعِيدٞ ) هەشـــیانە خۆشحاڵـــە، بەختـــەوەرە، دڵخۆشـــە، شادمـــانە، كامەرانە، بە ئامانج گەیشتوە.**

**{الشَّـقِيُّ: فَعِيل صِفَة مُشَبَّهَة مِنْ (شَقِي) إِذَا تَلَبَّسَ بِالشَّـقَاء وَالشَّـقَاوَة، أي: سـوءُ الحَالـةِ وَشَرُّهـا وَمـا يُنـافِرُ طَبْعَ الـمتَّصِفِ بِهـا} ، وشـەی (شقي) (فعيل)ە (صـفة مُشَبَّهـة)یـەو، لـە وشـەی (شَقِيَ)ەوە هاتوە، واتە: بەدبەخت، كەسێك كە شەقوەت دەبێتــە سیفەتی، یانی: حـاڵ خراپیـو ڕۆژ ڕەشیـو حاڵەتێـك كـە پێچەوانەی سروشتی مرۆڤە، مرۆڤ پێی خۆشە بێ دەرد بێو خۆشبەخـت بێو بێ ئـازار بێ، بەڵام ئەو: بە دەردە، بە ئازارە، بە خەفەتـە، ناڕەحەتە، گرفتارە.**

**(والسَّعِيـد: هـو الـمتَلَـبِّس بِالسَّـعَادَةِ الَّـتِي هِـيَ الأَحـوال الحَسَـنَة الخَيِّـرة الـملاَئِمَة للمتَّصِفِ بِها)، واتە: (سعيد)یش بریتیـە لـە كەسێك كە تێكەڵ بووە لەگەڵ سەعادەتداو سەعادەت بۆی بۆتـە سیفەت، كـە ئـەویش بریتیـە لـە حـاڵ چاكییو حاڵ خۆشییو حاڵ گونجاویی بۆ كەسێ: كـە ئـەو سـیفەتەی تێـدا دێتــە دی.**

**خـاوەنی (التحرير والتنوير)، مـاناكـەی كـورت دەكـاتەوە دەڵـێ: (وَالمعْـنَى: فَمِنْهُم يَوْمَئِـذٍ مَنْ هـو فِي عَـذَابٍ وَشِـدَّةٍ، وَمِنْهُمْ مَنْ هـو فِي نِعْـمَةٍ وَرَخَـاءٍ)[1]، واتـە: لـە ڕۆژی دوایـی دا، لـە مرۆڤەكان هـەیـە، لـە ئـازارو سەختییو ناڕەحەتیی دایەو، هەشیانە لـە خێرو خۆشییو ئاسوودەیی دایـە.**

**واتـە: خەڵك بە گشتی بۆ ئەم دوو جینــە، دابەشو پۆلێن دەكرێن.**

---

١) ج ٢، ص ١٦٤.

**مەسەلەی پێنجەم :**

**خوا ﷻ دێتە سەر ڕوون کردنەوەی پۆلی یەکەمیان کە بێ بەختو ڕۆژ ڕەش و گرفتارو نارەحەتەکانن:**

**خوا ﷻ فەرموویەتی :** ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بەپێزە لە پێنج (٥) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ ﴾، بەڵام ئەوانەی کە نارەحەت بوون، بەدبەخت بوون، (کردارەکە پاڵ دەداتە لای خۆیان)، یانی: ئەوانە خۆیان وایان لە خۆیان کردوە .

**بڕگەی دووەم :** ﴿ فَفِي ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ﴾، یانی: ئەوانە لە ئاگردان، واتە: لە ئاگری دۆزەخدان، لەوێدا حاڵیان چۆنە؟ لەوێدا: هەناسەدانەوەیەکی نائاساییو، هەناسە هەڵمژینێکی نائاساییان هەیە، (زَفِيرٌ) واتە: هەناسە دانەوە، (وَشَهِيقٌ ) واتە: هەناسە هەڵمژین، بەڵام کە خوا ﷻ لێرەدا باسی هەناسەدانو، هەناسە هەڵمژینیان دەکات، واتە: هەناسەدانو هەناسە هەڵمژینێکی نائاسایی، ئنجا کەسێك لە نێو ئاگرو چرە دووکەڵی دۆزەخ دابێ، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ : ﴿ فِي سَمُومٖ وَحَمِيمٖ ﴿٤٢﴾ ﴾الواقعة، واتە: لەنێو گرەباو ئاوی کوڵاودا، ئایا دەبێ هەناسە هەڵمژینو هەناسەدانەوەی چۆن بێ؟!

(الزفِير: إخْـراجُ الأَنْفَاس بـدَفْع وَشِـدَّة، بسَـبَب ضَـغْـط النَّفْـس، وَالشَّـهِيق عَكْسة، وَهـو اجْتلاب الـهواء إلـى الصَّدْر بشِدّة، لـقُوة الإحْتِياج إلـى الـتنفُّس).

واتە: (زفیر) بریتیە لە دەرهاویشتنی هەوا، زۆر بە هێزو بە سەختیی، بەهۆی ئەو فشارە دروونییو جەستەییەی کە لەسەر مرۆڤە، (لە نێو ئەو هەموو ئاگرو چرە دووکەڵو ئازارو ئەشکەنجەدا، دیارە مرۆڤ بە زەحمەت هەناسەی بۆ دەدرێ).

(شهیق) بریتیە لە هەناسە هەڵمژینو، هێنانی هەوا بۆ سینە، زۆر بە زەحمەت، لەبەر ئەوەی زۆر پێویستیی بە هەواو هەناسەیە، پشووی پێی تەنگ بووەو پشووی پێی سوار بووە، بۆیە هەم هەناسەدانەوەی زۆر قورسە، هەم هەناسە هەڵمژینی.

ئنجا هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا باس نەکراوە، بەڵام وای تێدەگەم کە ئەمە ئاماژەیە بەوە کە ئەوانەی لە دۆزەخ دان، هەر هەناسەدانەوەیەکیان ئازارو ناڕەحەتییو ئەشکەنجەیەکەو، هەر هەناسە هەڵمژینێکیشیان بە هەمان شێوەیە.

ئنجا ئایا کەسێك لە هەر هەناسە هەڵمژینێکیداو، لە هەر هەناسەدانەوەیەکیدا تووشی ئازارو ناڕەحەتیی بێ، دەبێ چ حاڵێکی هەبێ! خوا پەنامان بدات بە لووتفو کەرەمی خۆی.

ئەوە بە نسبەت شوێنیان کە ئاگرە، حاڵیان بەو شێوەیە، هەر هەناسەدانو هەناسە هەڵمژینیان بەم شێوەیە، ئەدی ئایا مانەوەیان چۆنە؟

**برگەی سێیەم** : ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ ﴾، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، هەتا ئاسمانەکانو زەوی بەردەوام بن.

(الطبري) دەڵێ: (هَـذَا أُسلُوبٌ مِنْ أَسالِيب العَرَبِ فِي التعبير لِلتأبيد) ئەمە شێوازێکە لە شێوازەکانی دەربڕینی عەرەبان، بۆ شتێك کە بیانەوێ بڵێن: هەتا هەتایە، ئەم تەعبیرە بەکاردێنن.

هەموو تەفسیرەکانیش هەر ئاماژە بەوە دەکەن، بۆ وێنە (القرطبي)یش لە تەفسیرەکەی خۆی[1] داو، (محمد الطاهر بن عاشور) لە (التحرير

١) الجامع لأحكام القرآن، ج ٩، ص ٨٢.

والتنویر)داو، (الشوكاني) لە (فتح القدیر)داو، (فخر الدین الرازي) لە (التفسیر الكبیر)داو، (إبن كثیر) لە (تفسیر القرآن العظیم)ەكەیدا، تەماشای زۆربەیانم كردوە، هەموویان دەڵێن: ئەمە شێوازێكە لە شێوازەكانی دەربڕین، كە مەبەست پێی هەتا هەتایەیە.

دەڵێن: (كَقَوْلِهِم: لاَ آتِيكَ ما جَنَّ لَيْلٌ، أَوْ سالَ سَيْلٌ ، وَما اخْتَلَفَ اللَّيْلُ وَالنَّهارُ، وَما ناحَ الحَمامُ، وَما دَامَتِ السَّماوَاتُ وَالأَرْضُ، يُرِيدونَ بِهِ طولاً مِنْ غَيْرِ نِهايَة) واتە: وەك كە دەڵێن: سەردانت ناكەمو نایەم بۆ لات، تاكو شەوگار شت دابپۆشێ، (كە تاكو شەو هەبێ، شت هەر دادەپۆشێ)و، هەتا لافاو هەڵسن (كە تاكو ژیان لەسەر زەوی بەردەوام بێو باران ببارێ، لافاو هەر هەڵدەستن)و هەتا شەوو ڕۆژ بە دوای یەكدا بێن، هەتا كۆتر بگمێنێ (كە ناڵەی دێ)و، هەتا ئاسمانەكانو زەوی بەردەوام بن.

مەبەستیان پێ ئەوەیە كە ماوەیەكی زۆری بێ كۆتایی، ئەوە مانایەكی.

مانایەكی دیكەی كە كەمێك لە زانایان وایانگوتوە، ئاوایە: (أَي خَالِدِينَ فِيها: مِقْدارُ دَوَام السَّماوَاتِ وَالأَرْض، وَذَلِكَ مُدَّةُ العَالم، وَلِلسَّماءِ وَالأَرْض وَقْتٌ يَتَغَيَّرَانِ فِيهِ) واتە: بە ئەندازەی بەردەوامیی ئاسمانو زەوی، ئەویش بریتیە لە ئەندازەی بەردەوامبوونی ئەم بوونە، كە وەك پێشتر لە تەفسیری سوورەتی یوسف دا باسمان كرد، بە مەزەندەی زانایان دەڵێن: بۆ وێنە خۆر كە یەكێكە لەو نۆ خڕۆكەیەی كە بە هەموویان كۆمەڵەی خۆ پێكدێنن، دەڵێن: خۆر نیزیكەی پێنج ملیار ساڵە خوا دایگیرساندوەو، دەڵێن: ئەگەر هیچی بەسەر نەیەت، پێنج ملیار ساڵی دیكەش بەردەوام دەبێ.

ئەمەش ڕایەكە، بەڵام بە تەئكید ڕای زۆربەی زانایان ڕاستترە، هەڵبەتە كاتێك دێ كە ئەم بوونە نامێنێ، پێشتریش باسمان كرد، كە لە لای گەردوون ناسان ئەم دنیا نەمانە، بۆتە شتێكی ئەلیفو بێی زانیارییەكەیان، چونكە بە پێی یاسای دووەمی دینامیكای گەرمیی (القانون الثاني للدیناميكا الحرارية) دەڵێن: كاتێك دێ كە خۆر تیشكەكەی نامێنێ، خوای زاناو شارەزاش ئاماژە بەوە دەكات، كە دەفەرموێ: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ١﴾ التكویر، واتە: كاتێك ڕۆژ پێچرایەوە..

بە هەر حاڵ ئێمە ناڵێین: ئەم کۆمەڵەی خۆرو، ئەم بوونە بەردەوام دەبێ، تاکو تیشکەکەی دەبڕێ، بەڵام بێگومان ئەگەر گریمان بەردەوام بێ، کاتێك دێ، کە تیشکەکەی دەبڕێ.

لە سووڕەتی (إبراهیم)یش دا خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی ئامـاژەی پێدەکات، دەفەرمـوێ : ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی کە ئەم زەوییە وەك خۆی نامێنێو ئەم ئاسمانانەش وەك خۆیان نامێنن، (واتە: خوا ﷻ بە شێوەیەکی دیکە پێکهاتەی ئەم بوونە ڕێك دەخاتەوە، کە نازانین چۆنە)و هەموویان بۆ خوای تاکی مل پێ کەچکەر دێنە گۆڕێ، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییو لێپرسینەوەیە.

**بڕگەی چوارەم** : لەم بڕگەیەدا دەفەرموێ : ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ﴾، واتە: مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بیەوێ، واتە: هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێننەوە، مەگەر ئەوەی کە پەروەردگارت بیەوێ، ئەم هەڵاواردن (إستثناء)ە، لێرەدا زانایان زۆر کێشەو مشتومڕیان لەبارەیەوە بووە، بەڵام دەشڵێین: مەرج نیە شتێك کە هەڵداوێردرێو، پەیوەست دەکرێ بە ویستی خواوە، ویستی خوا بێتەدیو ئەو شتەش بێتەدی، بەڵکو ئەمە هەر ئەوە دەخوازێ کە ئەگەر ویستی خوا پەیوەست بوو بەو شتەوە، کە بریتیە لە دەرهێنانیان لە دۆزەخ، یان دەرهێنانی بەهەشتییان لە بەهەشت (چونکە ئایەتەکەی دوایی باسی بەهەشتییان دەکات) ئەوە ئەو کاتە ئەو هەڵاوێردراوە، کە بریتیە لە دەرهێنانیان لە دۆزەخ، یان لە بەهەشت، دێتەدی، بەڵام بەپێی بەڵێنەکانی خوا، کە لە چەندان ئایەتدا هاتوون، بێبڕواو کافرەکان لە دۆزەخدا دەمێننەوە بە هەمیشەییو، بڕواداران لە بەهەشتدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی، بەڵێنەکانی خواو، دەقەکانی سوننەت، زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن کە خوا نایەوێ، نە دۆزەخییان لە دۆزەخ بێنێتە دەرێو، نە بەهەشتییان لە بەهەشت بێنێتە دەرێ .

**بڕگەی پێنجەم** : ﴿ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾: بێگومان پەروەردگارت ئەنجامدەرو بکەری هەر شتێکە کە بیەوێ .

چونکە خوای تواناو زانا دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾﴾ البقرة، هەروەك بە هەموو شتێك زانایە، ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٨٢﴾﴾ البقرة ، ئنجا هەر شتێکیش خوا لەسەری توانای هەبێ‌و پێشی زانابێ، هەر کاتێك بیەوێ‌و چۆنی بیەوێ، ئەنجامی دەدات، ئەمە بریتیە لە پەیوەست کردنەوەو گێڕانەوەی هەموو شتێك بۆ ویستی ڕەهاو بێسنووری خوا ﷻ، چونکە واقیعیش هەر وایە.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم هەڵاواردنە: مەگەر پەروەردگارت بیەوێ، لە دۆزەخ بێنە دەرێ، دەڵێن: مەبەست پێی بڕوادارانێکە کە گوناهی گەورە گەورەیان هەن‌و، نە بە سزای سەرەمەرگو، نە بە سزای گۆڕو، نە بە ناڕەحەتییەکانی قیامەت، پاك نەبوونەتەوە، بۆیە دەچنە دۆزەخەوەو بە ئەندازەی گوناهەکانیان دەسووتێنرێن‌و پاك دەبنەوە، ئنجا دێنە دەرێ، کە لەوبارەشەوە، فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر زۆرن، ئەمەش یەکێك لەم فەرمایشتانەیە:

{يدخُلُ ناسٌ جهَنَّم، حَتَّى إذَا صَارُوا حُمَماً أُخْرِجوا مِنْها، ويدخُلونَ الْجَنَّةَ، فَيُقَالُ : هَؤُلَاءِ الْجهَنَّمِيُّون} {أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبي شيبَة، برقم: (٣٩٦)، وَأَحْمَد، برقم: (١٢٢٨٠)، وَابْنُ المبارَك، برقم: (١٢٦٧)، وَالطَّبَرَانِي، فِي (الأوسط) برقم: (١١٥٥)} .

واتە: کەسانێك دەچنە نێو دۆزەخەوە، هەتا کاتێك کە ڕەش هەڵگەڕان، سووتان، (بوونە ڕەژوو) لێی دەردەهێنرێن‌و، دەچنە بەهەشتەوە، پێیان دەگوترێ: ئا ئەوانە دۆزەخییەکانن، (واتە: ڕۆژانێکی زۆر بە پێی ئەندازەی گوناهەکانیان، تێیدا ماوەنەوە).

(حَمَّمَهُ تَحْمِيماً: سَخَّمَ وَجْهَهُ بالفَحْمِ، والحُمَمُ: الرَّمادُ وَالفَحْمُ وَكُلُّ ما احْتَرَقَ مِنَ النَّارِ، الوَاحِدَةُ: حُمَمَةٌ)[1]، واتە: دەم‌و چاوی بە خەڵووز ڕەش کردو، (حُمَم) بە خۆڵەمێش‌و ڕەژوو، دەگوترێ‌و، هەر شتێك کە بە ئاگر بسووتێ‌و

---

١) مختار الصحاح، ص ١٦٧.

ببێتە خۆڵەمێش، وای پێ دەگوترێ، (حُمَم) تاکەکەی بریتیە لە (حَمَمَة). دەڵێ: (سَخَّمَ وَجْهَهُ)، (السُّخْمَةُ: السَّوادُ، والأَسْخَمُ: الأَسودُ، وَالسُّخَامُ: سوادُ القِدْرِ، وَسَخَّمَ اللهُ وَجْهَهُ تَسْخِيماً أَي: سَوَّدَهُ)[1]، واتە: (سُخْمَة) بریتیە لە ڕەشییو، (أَسْخَمْ) بریتیە لە ڕەشو، (سُخام) بریتیە لە ڕەشییو تەنووی مەنجەڵ کە لەسەر ئاگر دادەنرێ، دەگوترێ: (سَخَّمَ اللهُ وَجْهَهُ تَسْخِيماً)، واتە: خوا ڕووی ڕەش بکات، کەسێك کە لە کەسێك تووڕە دەبێو دوعای خراپی لێدەکات، ئەم قسەیە دەکات.

## مەسەلەی شەشەمو کۆتایی :

### بەختەوەرانی بە مراد گەیشتوو بە هەمیشەیی لە بەهەشت دان، بەبێ بڕانەوەو هەتا هەتایە :

خوا فەرموویەتی : ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ ﴿١٠٨﴾﴾ .

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار (٤) بڕگەدا:

**بڕگەی یەکەم** : ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ﴾: وە ئەوانەی کە بەختەوەر کراون، بە مراد گەیەنراون، لە بەهەشتێ دان، لێرەدا بە بکەر نەزانراو (معلوم الفاعل) هێناویەتی، بەڵام دەربارەی بەدبەختان بە بکەر نەزانراو (مجهول الفاعل) هێنای، فەرمووی: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ﴾، هۆکارەکەیان: چونکە کافرەکان خۆیان خۆیانیان بەدبەخت کردوە، بەڵام بڕواداران لەلایەن خواوە بەختەوەر کراون، جارێ هەر ئەوە کە خوا ڕێی پێشان داون: ڕێی پێغەمبەرانو، عەقڵو هەستەوەرەکانی پێداون، پاشان دڵی وەرچەرخاندوون بۆ ئەنجامدانی کاری

---

١) مختار الصحاح، ص ٢٩٠.

چاكو، كاری چاكی بۆ ئاسان كردوون، ئنجا لە دوارۆژیشدا ئەو بەهەشتەی كە دەیچنە نێوی، لە بەرانبەر كردەوەكانیاندا نیە، بەڵكو زۆر لە كردەوەكانیان گەورەترە، بۆیە خوای پەروەردگار بەم صیغەیە هێناویەتی، چونكە هەم ئیمان هێنانو، كاری چاك بۆ ئاسان بوونیان، دەگێڕدرێتەوە بۆ خوای بەخشەر، هەم ئەو بەهەشتەش كە دەخرێنە نێوی، لە قەدەر كردەوەكانیان نیە، بەڵكو كردەوەكانیان لە چاو بەهەشت، شتێكی زۆر بچووكو كەمن، بۆیە بە بكەر نەزانراو هێناویەتی.

وشەی: ﴿سُعِدُواْ﴾، خوێنراویشەتەوە: (سَعِدُوا)، واتە: بەختەوەر بوون، كە ئەوكاتە پاڵی دەداتە لای خۆیان، دەگوترێ: {سَعِدَ: فِعْلٌ قَاصِرٌ لاَ مَفْعُولَ لَهُ، لَكِنَّهُ عَلَى مُعَامَلَة القَاصِر مُعَامَلَة المتَعَدِّي فِي مَعْنَى: فُعِلَ بِهِ مَا صَيَّرَهُ: صَاحِبَ ذَلِكَ الفِعْل، كَقَوْلِهِم: جُنَّ فُلاَنٌ، إِذَا فُعِلَ بِهِ مَا صَارَ بِهِ ذَا جُنُونٍ، فـ(سُعِدُوا) بِمَعْنَى (أُسْعِدُوا) وقيل: سَعِدَ متعدٍّ فِي لغة هذيل وتميم ، يقولون: سَعِدَهُ اللهُ بِمَعْنَى: أَسْعَدَهُ).

واتە: لە ئەسڵدا (سَعِد)، (فعل لازم)ەو (مفعول بە) ناوێ، بەڵام لێرەدا مامەڵەی (فعل)ێكی (متعدِّي) لەگەڵ كراوە، واتە: بەو شێوەیەی لێكراوە، بەختەوەر كراوە، وایلێكراوە كە ببێتە خاوەنی ئەو كردەوەیە، وەك دەگوترێ: {جُنَّ فُلاَنٌ، إِذَا فُعِلَ بِهِ مَا صَارَ بِهِ ذَا جُنُونٍ، فـ (سُعِدُوا) بِمَعْنَى (أُسْعِدُوا)}، دەگوترێ: (جُنَّ فُلانٌ) واتە: فلان كەس شێت بوو، بەڵام بۆچی بە بكەر نەزانراو دەهێنرێ؟ چونكە وای پێكراوەو بۆ خۆی شێت نەكردوە، {شەیتانەكان شێتیان كردوە، یان بەهۆی خەلەلێكی مێشكەوە وایلێهاتوە، یاخود دەرمانێكی دراوەتێ، گرنگ ئەوەیە شێتییەكە دەگێڕدرێتەوە بۆ سەرچاوەیەكی نەزانراو}، واتە: كارێكی پێكراوە كە ببێتە خاوەنی شێتیی، ئنجا (سُعِدُوا)ش، یانی: (أُسْعِدُوا) بەختەوەر كراون، هەندێكیش گوتوویانە: وشەی (سَعِدَ)، واتە: بەختەوەر بوو، لە زاری هەردووك هۆزی هوزەیلو تەمیمدا تەنیا (لازم) نیە، بەڵكو بە (متعدِّي)ش دێ، دەگوترێ: (سَعِدَهُ اللهُ) واتە: خوا بەختەوەری كرد.

هەر چۆن بێ، ئایا ئەوانەی کە بەختەوەر بوون‌و، بەختەوەر کراون‌و، مراد گەیەنراون، حاڵیان چۆنە ؟!

**بڕگەی دووەم** : ﴿فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَـٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾: لە بەهەشتدان بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، تاکو ئاسمانەکان‌و زەوی بەردەوام بن، پێشتر ئەوەمان شیکردەوە، واتە: تا هەتا هەتایە.

**بڕگەی سێیەم** : ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾، مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بیەوێ، بیهێنێتە دی، یانی: ئەگەر پەروەردگارت بیەوێ بیانهێنێتە دەرێ، دەتوانێ‌و، دەست بەستراوو دەستە پاچە نیە، لە بەرانبەر سیستمێکدا کە خۆی دایناوە، دەتوانێ بیگۆڕێ، بەڵام ئایا دەیگۆڕێ؟ خوا ﷻ بۆخۆی فەرموویەتی: نایگۆڕم، دەفەرموێ : ﴿وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ﴿٣٤﴾﴾الأنعام، واتە: بڕیارەکانی خوا گۆڕانیان بەسەردا نایەت، نە خۆی دەیگۆڕێ وەك فەرموویەتی‌و، نە کەسیش دەتوانێ دەستکاریی بکات.

**بڕگەی چوارەم** : ﴿عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾: بەخششیکی نەبڕاوەیە، ئەوە بۆ دڵنیاکردنەوەی ئیمەمانانە، چونکە هەندێك لە زانایان هەر لەخۆوەو لەگۆترە گوتوویانە: کاتێك دێ، دەرگاکانی بەهەشتێ، با دەیانهێنێ‌و دەیانبا، کەسی تێدا نامێنێ !

هەروەها گوتوویانە: کاتێك دێ خوا ﷻ نە بەهەشت‌و نە ئەهلی بەهەشت‌و، نە دۆزەخ‌و نە ئەهلی دۆزەخ، کەس ناهێڵێ !!

بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە قسەیەکەو لەگۆترە دەکرێ، وەك گوتم: ئەو شێوازە لە دەربڕین، شێوازی دەربڕینی هەموو گەلانە .

﴿غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾یش، یانی: (غیر مقطوع)، واتە: دەگوترێ: (جَذَّهُ: كَسَرَهُ وَقَطَعَهُ) واتە: شکاندی، یاخود بڕی .

لەوبارەوە ئەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین :

أ/ {عَنْ عَلِي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ فِي جَنَازَةٍ، فَأَخَذَ عُوداً فَجَعَلَ يَنْكُتُ فِي الأَرْضِ، فَقَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ، أَوْ مِنَ الْجَنَّةِ، قَالُوا: أَلا نَتَّكِلُ؟ قَالَ: اعْمَلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾﴾ الليل} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٠٦٧)، وَالبُخَارِي، برقم: (٤٦٦٥)، وَمُسْلِم، برقم: (٢٦٤٧)، وَأَبُو دَاوُد، برقم: (٤٦٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٣٤٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ}.

واتە: عەلی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لە کاتێکدا کە جەنازەیەك، تەرمی مردوویەکیان بە خاك سپاردوە، پێغەمبەر ﷺ دارووچکەیەکی بەدەستەوە گرتوەو زەوی پێ کوڵیوە (خۆی خافڵاندوەو سەرقاڵ بووە) ئنجا لەو کاتەدا فەرمووی: هیچ کامێك لە ئێوە نیە، مەگەر نشینگەکەی لە ئاگری دۆزەخدا دیاریی کراوە، ئەوانیش گوتیان: ئایا پشت بەوە نەبەستین، کە خوا دیاریی کردوەو تۆماری کردوە؟ فەرمووی: نەخێر، کار بکەن هەرکامێك لە ئێوە ئاسان دەکرێ بۆ ئەوەی کە بۆی نووسراوە، {واتە: تۆ بە پێی کردەوەکەی خۆت، دەزانی نشینگەت کوێیە؟ ئەگەر ئەهلی کردەوەی چاك بی، کردەوەکەت ئاوێنەیەکە سەرەنجامی خۆتی تێدا دەبینیو، ئەگەر کردەوەی خراپیش بکەی، لە ئاوێنەی کردەوە خراپەکانتدا سەرەنجامە شوومەکەی خۆت دەبینی، کە دۆزەخە) دوایی ئەم ئایەتانەی خوێندنەوە: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾﴾ الليل. واتە: بەڵام کەسێك کە ببەخشێو، پارێز بکاتو، بڕوا بە باشترین وشە بێنێ، (کە وشەی خوا بە یەکگرتنە) ئەوە ئێمە ئاسانی دەکەین بەرەو ڕێبازو بەرنامەیەکی ئاسان، بەڵام ئەوەی کە ڕژدییو چرووکیی بکات لە ماڵو سامان بەخشینداو، بێنیازیی پێشان بدات، بەرانبەر بە خواو، بەرانبەر بە باشترین وشەش

{کە وشەی تەوحیدو ئیمانو خوا بە یەکگرتنە} . بێبڕوابێ، ئەوە ئاسانی دەکەینو ڕووی پێ وەردەچەرخێنین، بەرەو ژیانێکی زەحمەتو قورس، {بەرەو لاڕێیو سەرگەردانیی، کە پێچەوانەی عەقڵو سروشتەو، ژیانێکی سەختو پڕ لە تاڵی بۆ بەرهەم دێنێ} .

ب/ {عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ لما نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾﴾، سألْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ يَا نَبِيَّ اللهِ! فَعَلَى ما نَعْمَلُ؟ عَلَى شيءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، أَوْ عَلَى شيءٍ لم يُفْرَغْ مِنْهُ، قَالَ: بَلْ عَلَى شيءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، وَجَرَتْ بِهِ الأَقْلامُ، يَا عُمَرُ! وَلَكِنْ كُلٌّ مُيَسَّرٌ لما خُلِقَ لَهُ} {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ، برقم: (٣١١١)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضا أَحْمَد، برقم: (١٩٨٤٧)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٧١١٢)، وَمُسْلم، برقم: (٢٦٤٩)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٤٧٠٩) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ} .

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾﴾، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی کاربکەین، ئایا بۆ سەرەنجامێك کار بکەین، کە کۆتایی پێهاتوە، یاخود بەرەو سەرەنجامێك دەچین، کە جارێ کۆتایی پێ نەهاتوەو بڕیار نەدراوە؟ فەرمووی: بەڵکو سەرەنجامێك کە لێبۆتەوە، (یانی: کۆتایی هاتوەو بڕیار دراوە)و، قەڵەمەکان لێی بوونەوە، بەڵام هەر کامێك لە مرۆڤەکان ئاسان دەکرێ بۆ ئەو سەرەنجامەی کە بۆی نووسراوە .

یانی: ئاسان کردنو ڕوو پێ وەرچەرخاندنەکەی تۆ، لە خواوەیە، بەڵام هۆکارەکەی لەخۆتەوەیە.

لە کتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) لە باسی قەزاو قەدەردا، بە درێژیی باسی ئەو مەسەلەیەم کردوە.

کە لە ڕاستییدا ئێمە لەم ژیانە دنیاییەدا بە نسبەت نەخشەو بەرنامەی خواوە، وەك کەسێك واین کە کورسییەکی کارەبایی هەبێ، پلاکەکەی بە

دەست کەسێکەوە بێ، بڵێ: سواری ئەم کورسییە بە، دەچیە مەیخانە، بۆ ئەوەی کاری خراپە بکەی، یان دەچیە مزگەوتو کاری چاکە دەکەی؟ سووکانەکەی بە دەست خۆتە، بۆ کوێ دەچی، بەڵام من پلاکەکەت بۆ پێدەکەم، من هەر ئەوەم لەسەرە کە کورسییەکەت بۆ بخەمە گەڕ !

لە ڕاستییدا ئێمەش لە دەست خۆمانە بۆ کوێ دەچین، ئنجا هەر بۆیەش ئەگەر کاری چاك بکەین، پاداشت دەدرێینەوەو، ئەگەر کاری خراپ بکەین، خوا سزامان دەدات، ئەگەرنا ئەگەر هیچ شتێك بەدەست خۆمان نەبووایە، وەك جەبرییەکان دەڵێن: مرۆڤ وەك پەڕە مریشکێك وایە، با بەملاولادا دەیجوولێنێ! ئەگەر وابووایە، خوا ﷻ سەرزەنشتی کەسی نەدەکردو، کەسی سزا نەدەدا، پاشان کەسیش شایانی پاداشت درانەوە نەدەبوو! بەڵام نەخێر ئێمە بە ویستی ئازادانەی خۆمان، چاکە دەکەینو، بە ویستی ئازادانەی خۆمان، خراپە دەکەین، بۆیە شایستەی پاداشت درانەوەین، لەسەر چاکەو، شایانی سزادرانین، لەسەر خراپە.

لێرەدا دەردەکەوێ کە حیکمەتی ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە ئێمە بزانین خوا ﷻ هەموو شتێك دەزانێ، هەڵبەتە ئەندازیارێك کە نەخشەی باڵەخانەیەك دادەڕێژێ، دەڵێ: ئەم باڵەخانەیە، دەتوانێ تاکو سەد ساڵ دەوام بکات، کەسێك کە کاتژمێرێك دروست دەکات، کەسێك کە ئامێرێك دروست دەکات، کەتەلۆکی ڕەگەڵ دەخات، دەڵێ: تەمەنی ئەوەندەیە، ئەگەر باش مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، گرەنتی بیست ساڵی هەیە، ماددەو کەرستەی ئەم باڵەخانەیە دەگونجێ ماوەی سەد ساڵ بخایەنێ، ئنجا ئایا خوا کە خاوەنی ئەم بوونەیە، نازانێ ئێمە چی دەکەینو چۆن دەکەین؟ با، بەڵام دەزانێ کە ئێمە بە ویستی ئازادانەی خۆمان، چاکە دەکەین، یان خراپە دەکەین، ئنجا کە دەفەرموێ: ئاسانی دەکەین، وەك دەبینین خوا کردەوەکانی ئینسانی پێش خستوون:

﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦ ﴾الليل ، بەخشین، پارێزکردنو، بڕوا بە باشترین قسەکردن، ئنجا: ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ۝٧ ﴾الليل، ئاسانی

دەکەین بەرەو گرتنی رێیەکی ئاسان، لە دینداریی، کە لەگەڵ سروشتو عەقڵی ئینساندا گونجاوە .

ئەوی دیکەش بە پێچەوانەوە : ﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ۝٩ ﴾ اللیل، چرووکییو رژدیی نواندن، کردەوەی ئینسانەو، بێمنەتییو بێنیازیی، کردەوەی ئینسانەو، بێبڕوا بوون بە باشترین وشە، کردەوەی ئینسانە، ئنجا لە ئەنجامی ئەو کردەوانەدا: ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ۝١٠ ﴾، ئێمە بەرەو ژیانێکی تاڵ، رووی پێ وەردەچەرخێنین، واتە: ئەوەی کە خوای پەروەردگار دەیکات، دەرهاویشتەی کردەوەکەی خۆمانە، بەرهەمی کردەوەکەی خۆمانە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : {كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٠٦٧)، وَالبُخَارِي، برقم: (٤٦٦٥)، وَمُسْلِم، برقم: (٢٦٤٧)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٤٦٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٣٤٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ} ، واتە: هەر کام لە ئێوە ئاسان دەکرێو وەردەچەرخێنرێ، بۆ ئەوەی کە بۆی دروست کراوە، ئەو سەرەنجامە خوا لە ئەزلەوە لەبەرچاوی بووە، دەچێ بۆ کوێ، بەڵام مرۆڤ بە ویستی ئازادانەی خۆی، ئەو کردەوانە ئەنجام دەدات، بۆیە دەچێتە بەهەشت، یان بە ویستی ئازادانەی خۆی، ئەو کردەوە خراپانە ئەنجام دەدات، بۆیە دەچێتە دۆزەخ.

بۆیەش ئەوەم بەم شێوەیە روون کردەوە، چونکە هەندێ کەس هەر بە سادەیی دەڵێن: ئێمە بۆچی خۆمان ماندوو بکەین، هیچ پێویست ناکات، چونکە خوا هەمووی نووسیوە لەسەرمان.

ئنجا سبحان اللە، جێی سەرنج ئەوەیە مرۆڤی بێبڕوا کە شەیتان ئەو فێڵەی لێ دەکات، تەنیا بۆ ئەو شتانەیە کە پەیوەندییان بە نێوان خۆیو خواوە هەیە، بەڵام ئەو شتانەی دیکە نا، بۆ وێنە: ناڵێ: ئەگەر خوا نووسیبێتی تێربم، ئەگەر خۆراکیش نەخۆم، هەر تێر دەبم، پێویست ناکات خۆراك بخۆم، یان کە نەخۆش دەبێ، ناڵێ: ئەگەر خوا نووسیبیەتی، چاك بمەوە، نەشچمە لای دکتۆر، هەر چاك دەبمەوە، دەرمانیش بەکارنەهێنم هەر چاك دەبمەوە !

یان نالێ: ئەگەر خوا نووسیبی: دەوڵەمەند دەبم، ئەگەر کارو کەسابەتیش نەکەم، هەر دەوڵەمەند دەبم، وا نالێ! بەڵکو دەڵێ: چۆن دەبێ نان نەخۆی! دەڵێ: خوا دەردی داوە دەرمانیشی داوە! کەچی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خواو لەگەڵ ئەو سەرەنجامەدا کە چاوەڕێی دەکات، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو فێڵو خوتخوتە خراپانەی شەیتان!

خوا بە لووتفو کەرەمی خۆی لە وەسوەسەو خوتخوتەو خراپی شەیتان بمانپارێزێو، خوا یارمەتیمان بدات، بووناسییەکی ڕاستو دروستمان هەبێ، وە ئیمانو عەقیدەیەکی ڕاستو دروستو تێرو تەواومان هەبێ، خوایە! وامان لێبکە ڕەوشتو ئاکارێکی بەرزو پەسندمان هەبێو، هەڵسوکەوتێکی ڕاستو دروست شەرعییانەمان هەبێ، بۆئەوەی لە ئاوێنەی ئەو بووناسییو ئیمانو عەقیدەو خواپەرستییو طاعەتو کارە چاکانەدا، سەرەنجامی ڕوونی خۆمانو، سەرەنجامی بەختەوەرانەی خۆمان ببینین، خوا ﷻ شادمانمان بکات بەو ڕێیە ڕاستەی کە گرتوومانە، هەم لە دنیادا هەست بە ئۆخژنو دڵئارامیی بکەینو، هەم لە دوارۆژیشدا خوای پەروەردگار لە بەختەوەرانێکمان بگێڕێ، کە لە بەهەشتەکانیدا، بە هەمیشەیی دەمێننەوەو، خوا بمانپارێزێ لە بیرکردنەوەی خراپ، لە بیروبۆچوونی ناتەواو، لەو هەڵسوکەتانەی کە دەبنە ئاوێنەیەك، کە سەرەنجامێکی شوومو خراپی خۆمانی تێدا بەدی دەکەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (١٠٩ – ١١٥) دەگرێتە خۆی، واتە: حەوت ئایەت، لەم حەوت ئایەتەدا خوای زاناو شارەزا، ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بڕوادارانی شوێنکەوتووی دەکات، یاخود ڕوو لە هەر کەسێك دەکات کە قورئان دەیدوێنێ‌و، لە چوار بڕگەدا، هەندێك ئامۆژگاریی‌و ڕێنمایی گرنگ دەفەرموێ :

**بڕگەی یەکەم :** هیچ دوو دڵیی نەبێ لەبارەی پووچیی پەرستنی بتپەرستەکان‌و، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانەوە، چونکە لەسەر هەمان ڕچەی پێشینانیان دەڕۆن، واتە: هەمان شت کە ئەوان پەرستوویانە، کە دروستکراوەکانی خوان، ئەوانیش هەر ئەوە دەپەرستن‌و، بێگومان سزای خۆشیان وەردەگرن .

**بڕگەی دووەم :** ڕایدەگەیەنێ کە خوا کتێبی بە مووساش دابوو پێشتر‌و، پەیڕەوانی مووسا ـ کە جوولەکەکانن ـ لە کتێبەکەی مووسادا کەوتبوونە ڕاجیاییەوە، واتە: هەندێکیان بڕوایان پێی هەبوو، هەندێکیان بڕوایان پێی نەبوو، یاخود: کەوتبوونە ڕاجیاییەوە دەربارەی چەمك‌و واتایەکانی‌و، ئەوانیش خوا سزاو پاداشتی تەواوی کردوەکانیان پێدەدات.

**بڕگەی سێیەم :** خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ‌و شوێنکەوتووانی دەکات، یان ڕوو لە هەر کەسێك دەکات کە قورئان ڕووی دواندنی تێدەکات‌و دەیدوێنێ، کە ڕاوەستاوو نەلەخشاو بن، واتە: پابەند بن بە شەریعەتەوەو، سەرکێشیی نەکەن، واتە: نە کورتی بێنن لە شەریعەت، نە لێی تێپەڕێنن، نە لە دین بەجێبمێنن، نە لێی تێپەڕێنن‌و، پشت بە ستەمکاران نەبەستن، ئەگەرنا ئاگریان تووش

دەبیٚ‌و، هیچ هاوکارو یارمەتییدەرێکیشیان چنگ ناکەویٚ، لە بەرانبەر سزاو تۆڵەی خوای تۆڵەستێندا، چ لە دنیا، چ لە دوارۆژدا.

**بڕگەی چوارەم :** فەرمانیان پیٚ دەکات کە لە ئەمسەرو ئەوسەری ڕۆژگارو، چەند بەشێك لە شەوگاردا، نوێژ بەرپا بکەن‌و، بەندایەتیی بکەن، تاکو چاکەکانیان خراپەکانیان بسڕنەوەو، فەرمانیان پێدەکات کە خۆڕاگر بن، چونکە خوا پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە کە یەکێك لە سیفەتی چاکەکاران بریتیە لە سیفەتی خۆڕاگریی .

﴿فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُۚ
وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ
فِيهِۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾
وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ
أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا
تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ
ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾﴾.

# مانــای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکــان

{دەجا لە هیچ دوودڵییـەکدا مەبـە، لەبـارەی (پووچەڵـیی) پەرسـتنی ئەوانـەوە، هەر ئەوە پەرستنیانە کە بابو باپیرانیان لەوەو پێش بوویانەو، بە دڵنیایی ئێمە پشكو بەشی خۆیانیـان (لە سزا) بە تـەواویی‌و بـێ کەموکوڕیی پێ دەدەیـن ﴿١٠٩﴾ بە مسۆگەریی (لەمەو پێش) کتێبمان بە مووسادا، کەچـی ڕاجیـایی‌و مشـتومڕی تێدا کراو، ئەگەر وشە (بڕیار)ێك لە پەروەردگارتـەوە پێش نەکەوتبایـە (کە سزاو پاداشـت هـەڵدەگـرێ بـۆ قیـامەت)، بڕیـاریان لـەبـارەوە دەدراو، بێگومـان ئـەوان (جوولەکەکان) لە بارەی (تـەورات)ەوە لـە دوودڵییـەکی سەختو خەست دا بوون ﴿١١٠﴾ مسۆگەر پەروەردگارت سزاو پاداشتی تەواوو پڕ بە پێستی هەر کامێکیان دەداتـەوە، بێگومـان (خـوا) شارەزای ئەوەیە کـە دەیکـەن ﴿١١١﴾ دەجـا وەك فەرمـانت پێکـراوە: خۆتو ئەوانـەی لـەگەڵتدا گـەڕاونەوە (بۆ لای خـوا) لـەسـەر ڕاسـتە ڕێ بـەردەوامو نەلەخەشـاوبەو، سنوورشـکێنیـی مەکـەنو تێمـەپەڕێـنن، بـە دڵنیـایی ئـەو (خــوا) بینەری ئەوەیە کە دەیکەن ﴿١١٢﴾ پـاڵ بەوانــەوە مەدەنو پشـتیان پێ مەبەسـتن کـە ستەمیـان کـردوە، ئەگـەرنـا ئـاگـرتـان تـووش دەبـێ‌و، لـە خـوار خـواوە هـیچ دۆسـتو پشتیوانتـان نـابن، دواییش سەرنـاخرێـن ﴿١١٣﴾ لە هـەردووك لای ڕۆژێـداو، لـە چـەند بەشـێکی شـەوگـاردا، نـوێـژ بەرپـا بکـەن، بێگومـان چاکەکـان خراپەکـان لادەبـەن (دەیانسڕنەوە)، ئـا ئەوە بیـرهێنـانەوەیە بۆ یـاد (ی خـوا) کـاران ﴿١١٤﴾ خـۆڕاگـریش بـە، بێگومـان خـوا پاداشـتی چاکـەکاران زایـە نـاکـات ﴿١١٥﴾} .

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( مِرۡيَةٖ ) : (المرْيـة: التَرَدُّدُ فِي الأَمْرِ وَهو أَخَصٌّ مِنَ الشَّكِّ، إذ هو شكٌّ فِي غَيْرِ مَوْضِعِه): (مِريـة) واتـە: دوودڵـیی لـە شتێکـدا، لـە ئەگـەرێ نەگـەر دابـی، (شـک)یش واتـە: دوودڵیی، بەڵام (مریـة) لـە (شـک) تایبەتـترە، (مریـة) واتـە: دوودڵیی لە شوێنێکدا کە جێی دوودڵیی نەبێ‌و، هیچ پاساوێکی نەبێ.

( لَمُوَفُّوهُمۡ ) : واتە: بە تەواویی پێیان دەدەین، (الوَافِي الَّذِي بَلَغَ التَّمام، وَتَوْفِيـة الشيء: بَذْلُـهُ وَافِياً، وفَّى يُوَفِّي)، (وَافِي) شتێکـە کـە گەیبێتـە ڕاددەی تـەواوی خـۆی، (وَتَوْفِيـة الشـيء، بَذْلُـهُ وَافِيـاً)، ئەوەیـە کـە بـە تـەواویی شـتێک بـدرێ، (وَفَّى، يُـوَفِّي، تَوْفِيـة)، واتە: وە ئەو شتەی بە تەواویی پێدراو، بە تـەواوی پێدان .

( نَصِيبَهُمۡ ) : (النَّصيبُ: الحَظُّ المُعَيَّنُ) واتە: پشـک‌و بەشێکی دیارییکراو.

( مُرِيبٖ ) : واتـە: دوودڵیی، دەگـوترێ: (رَابَنِي الشـيءُ يَرِيبُنـي إذَا جَعَلَك شاكـاً)، هەر شـتێك بتخـاتە دوودڵییـەوە، دەڵـێی: ئـەو شـتـە (مریب)ە بۆ مـن، (رَابنِي يَرِيبُنـي فهو مُرِيب، وَأَرَابَ فلانٌ إرَابَةً فَهو مُرِيبٌ) ئـەوەش دەگـوترێ: (رَاب يَرِيـبُ ريباً)، واتـە: خستیە دوودڵییەوە، دڕدۆنـگی کـرد.

( فَٱسۡتَقِمۡ ): واتە: ڕێـك بوەستە، (الإستقَامَةُ: يُقَالُ فِي الطَّرِيقِ الَّذِي يَكونُ عَلَى خَطٍّ مُستوٍ، وَبِهِ شُبِّه طَرِيقُ المحِقِّ، وَاستقَامَةُ الإِنْسـانِ: لُزُومـهُ المنْهَجِ المستقِيم)، (اِستقَامَة) بە ڕێیـەك دەگوترێ کە بە هێڵێکی ڕێك دەڕوات، ڕێـی بابـای هـەق گـرتوو، چووێنـراوە بە کەسێك کە بەڕێیـەکی ڕێکدا دەڕوات، بەبـێ لادان‌و خوارو خێچیی، (اِستقَامَة)ی مرۆڤ بریتیـە لـەوە کە ڕێـی ڕاستی گـرتبێ .

( وَلَا تَطْغَوْاْ ) : (الطُّغيَانُ : تَجَاوزُ الحَدّ فِي العِصْيَان، أَطْغَاهُ كَذَا: حَمَلَهُ عَلَى الطُّغيَان)، وشەی (طُغيَان) بریتیە لە سنووربەزاندن لە سەرپێچییدا دەگوترێ: (أَطْغَاهُ كَذَا)، واتە: وایلێکرد کە سنووور ببەزێنێو سەرکێشیی بکات .

( وَلَا تَرْكَنُوٓاْ ) : واتە: پشت مەبەستن، (رُكْنُ الشيء: جَانِبُهُ الذِي يُسْكَنُ إِلَيْهِ وَيُستعَارُ لِلقُوَّة، وَرَكِنْتُ إِلى شيء: اعْتَمَدْتُ عَلَيْهِ، رَكِنَ يَرْكَنُ، وَرَكَنَ يَرْكَنُ، رُكْنُ الشيءِ جَانِبُهُ)، ڕوکنی هەر شتێك بریتیە لەو لایەنەی کە پاڵی وێبدرێو پشتی پێ ببەسترێو، خوازراوەتەوە بۆ هێز، وەك لە سووڕەتی (الذاريات)دا هاتوە ﴿ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ ﴿٣٩﴾ ﴾، دەگوترێ: (رَكِنْتُ إِلى شيء اعْتَمَدْتُ عَلَيْهِ) واتە: پشتم پێ بەستو پشتم پێدا، (رَكِنَ يَرْكَنُ، وَرَكَنَ يَرْكَنُ)، هەردووکیان واتە: پشتی پێ بەستو پشتی پێدا، خۆی خستە سەری، (رُكْنُ الشيءِ جَانِبُهُ)، لای هەر شتێك گۆشەکەی پێی دەگوترێ (رکن)، کۆی (رُكن)یش بریتیە لە (أركان)، (أَرْكَانُ الإِيْمَان) واتە: لایەکانی ئیمان، پایەکانی ئیمان، (أَرْكَانُ الإِسْلَام) واتە: پایەکانی ئیسلام.

( طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ ) : واتە: ئەملاولای ڕۆژگار، (الطَّرَفُ: الناحِيَة والجَمْع أَطْرَاف)، (طرَف) بریتیە لە ئەملای شتێك، ئەوسەری شتێك، کە بە (أَطْرَاف) کۆدەکرێتەوە، واتە: هەر چوار دەوری ئەو شتە، (الطَّرِيفُ: المَالُ المستحدثُ عَكسُ التَّليد)، لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (فَجَاءَ بالطَّرِيف وَالتَّلِيد)، واتە: ئەو ماڵەی کە تازە پەیدای کردوەو، ئەو ماڵەی کە پێشتریش هەیبووە، هێنای.

( وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ) : وشەی (زُلَف)، کۆی (زُلْفَة)یە، (الزلْفَة والزلْفَى: القُرْبَة، أَزْلَفَهُ: قَرَّبَهُ، الزُّلْفَةُ: الطائِفَةُ مِنْ أَوَّلِ الليْل)، وشەی (زُلْفَة)، کە بە (زُلَف)، کۆدەکرێتەوە، (زُلْفَى)ش هاتوە کە هەر بە (زُلَف) کۆدەکرێتەوە، بریتیە لە نیزیکیی، دەگوترێ: (أَزْلَفَهُ أي : قَرَّبَهُ) واتە: نیزیکی خست.

ئنجا لـێرە کـە دەفەرمـوێ: (وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ)، واتـە: چـەند بەشـێك لـە شـەوگار، یان کـە دەفەرموێ: (الطـائِفَةُ مِنْ أَوَّلِ اللّـيْـل)، واتـە: بەشـی سـەرەتـای شـەوگار.

( ذِكۡرَىٰ ) : (الذِّكر وَالذِّكرى وَالذُّكرةُ: ضِدُّ النِّسْيَانِ)، وشـەکانی: (ذِکـر ذُکـری، ذکرة) هـەرسێکیان بە مـانای پێچـەوانەی لەبیـرچوونەوەن، یانی: لـەبیـربوون‌و لـە مێشـك‌و زەینـدا ئـامـادە بـوون .

# مانـای گـشــتـی ئایـەتەکــان

خوای پەروەردگار ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات‌و، لە پشت ئەوەوە ڕوو لە سەرجەم مسوڵمان‌و بڕواداران دەکات، ئەوە ئەگەرێك، ئەگەرێکی دیکە ئەوەیە کە خوا ﷻ ڕوو لە هەر کەسێك دەکات کە قورئان دەخوێنێ‌و، قورئان ڕووی تێدەکات، ئایا قورئان ڕوو لە کێ دەکات؟ قورئان ڕوو لە هەموو بەشەر دەکات، وەك دەفەرموێ :﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰؤُلَاءِ ﴾، لە دوودڵییدا مەبە لەبارەی ئەوەوە کە ئەوانە دەیپەرستن، یان لەبارەی پەرستنی ئەوانەوە، لە دوودڵییدا مەبە، کە ناهەقە، ﴿ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ آبَاؤُهُم مِّن قَبْلُ ﴾، پەرستنەکەیان هەروەك پەرستنی باب‌و باپیرانیانە لەمەو پێش، یاخود هەر ئەو شتانە دەپەرستن، کە باب‌و باپیرانیان دەیانپەرستن، ﴿ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴾، بێگومان ئێمە پشك‌و بەشی خۆیانیان بەبێ کەمکردنەوەو بەبێ کەموکوڕیی تێدا کران، پێدەدەین، پشك‌و بەشی چییان پێدەدات؟ واتە: ئەو سزایەی کە پڕ بە پێستیانە، سزایەکی پڕ بە پێستیان دەدەین، لەسەر ئەوە کە جگە لە خوا دەپەرستن.

ئنجا خوا ﷻ بۆ ئەوەی ئیمانداران بەرچاو ڕوون بن، کە ئەوە هەر لەبارەی قورئان‌و پێغەمبەری خاتەم‌و ئیسلامەوە، خەڵك نەکەوتۆتە ڕاجیایی، بەڵکو کاتی خۆی دەربارەی کتێبەکەی مووساش، نەك هەر خەڵك، بەڵکو جوولەکەکانیش کەوتنە ڕاجیایی، دەفەرموێ ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ فَاخْتُلِفَ فِيهِ ﴾، بێگومان کتێبمان بە مووسادا، بەڵام ڕاجیایی تێدا کرا، دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە جوولەکەکان بڕوایان پێهێنا، بەڵام ئەوانی دیکە بڕوایان پێنەهێنا،

دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە جوولەکەکان، لە نێو بازنەی خۆشیاندا، ڕاجیاییان تێکەوت لەبارەی تەوراتەوە: هەندێکیان بە ڕاستیان دەزانیو هەندێکیان لێی دوو دڵ بوون، هەندێکیان بە جۆرێك تێیدەگەیشتن، هەندێکی دی بە جۆرێکی دی، لەو شتانەدا کە نابێ ڕاجیاییان تێدا هەبێ، چونکە بە پێی مەقامو سیاق دەزانین کە لێرەدا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ڕاجیایی تێدا کرا، یانی: ڕاجیاییەکی خراپو نەویستراو، ئەگەرنا جاری وا هەیە دەربارەی ئایەتێك، دەربارەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی یاسایەکی شەرعیی، زانایان ڕاجیاییان دەبێ، بەڵام ڕاجیایی ڕەوا، هەرکامێکیان بەڵگەی خۆی بەدەستەوەیە، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاق دەزانین کە ئەوە ناکۆکییو دووبەرەکییەکی خراپە، واتە: بەبێ پاساو، ڕاجیایی ناڕەوا، ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾، ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە وشەیەك لە پەروەردگارتەوە ڕابردوە، مەبەست پێی بڕیاری خوایە، چونکە وەك چۆن ئێمەی مرۆڤ، کە بڕیارێك دەردەکەین، بە وشە دەریدەگەین، یاخود بە تەعبیرێك، بە قسەیەك بە نووسینێك، خوای کارزان بۆ ئەوەی ئێمە حاڵی بکات، دەفەرموێ: بڕیارێك پێشتر دراوە لەلایەن پەروەردگارەوە، کە بێگومان لێرەدا مەبەست پێی بڕیاری ئەمریی‌و شەرعیی نییە، بەڵکو بڕیاری قەدەریی‌و گەردوونیی‌و تەکوینییە، مەبەست پێی بڕیارەکانی خۆیەتی، کە لە سەرەتاوە خوا وای بڕیارداوەو سیستمی ئەم دنیاو دوارۆژەی وادائاوە، کە خەڵك لە دنیادا دەست ئاوەڵاو دەست کراوەبن، خوا ڕێیان لێ نەگرێ، چ بە باری خێردا بجووڵێن، چ بە باری شەڕدا، دەفەرموێ: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە وشەیەك لە پەروەرگارتەوە تێپەڕیوە، واتە: بڕیارو یاسایەك، دادوەرییان لەنێواندا دەکرا، یاخود بڕیاریان لە نێواندا دەدرا، کە کێ لەسەر هەقەو، کێ لەسەر هەق نیە؟ کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە: سزا دەدران، بەڵام بۆیە دەفەرموێ : ﴿لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾، چونکە خوا دادگەرە، خوا ئەوپەڕی دادگەریی هەیە، کەسێك سزا نادات کە بڕیاری لە دژ نەدرابێ، کەسێك کە باری بەلادا لار نەبووبێ‌و، لە دادگایەکی دادگەرانەدا، دادگایی نەکرێ، خوا بڕیاری لەبارەوە نادات.

ئنجا خواش وایداناوە کە ئەم ژیانە دنیاییە جێی تەصفیە حیساب نەبێ، جێی دادوەریی کردن نەبێ، جێی سزاو پاداشت سەپاندن نەبێ، بەڵکو جێی ئەوەبێ کە خەڵکەکە تاقی بکرێنەوە، بۆیە خوای پەروەردگار لێرەدا، لەسەر ئەو ڕاجیاییە، بڕیاریان لەبارەوە نادات و سزایان نادات، ﴿ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾، بێگومان ئەوان لە دوو دڵییەکی وادان کە بێزارو نارەحەتیان دەکات، چونکە هەندێك لە زانایان وایان لێکداوەتەوە (مریب) واتە: بێزارکەرو نیگەرانو نارەحەتکەر، ﴿ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ ﴾، هەر کامێکیان حەتمەن پەروەردگارت کردەوەکانی خۆیان بە تەواویی دەداتێ، واتە: سزای کردەوەکانیان، یان پاداشتی کردەوەکانیان بە تەواویی پێدەدات .

ئایا مەبەستی کێیە کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا ﴾؟! ئایا مەبەست پێی: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، یان مەبەست پێی خاوەن کتێبەکانە؟ یان مسوڵمانەکانە؟ دەڵێین: ئەمانە هەموویان دەگرێتەوە، هەموویان خوا سزای پڕ بە پێستی کردەوەکانیان، دەدات، ئەگەر ئەهلی کوفرو زوڵمو خراپە بووبن، یاخود بە تەواویی پاداشتیان دەداتەوە، ئەگەر ئەهلی ئیمانو چاکەو تاعەت بووبن، ﴿ إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾، بێگومان ئەو (خوا) بەوەی دەیکەن شارەزایە، دەزانێ چی دەکەنو ؟ چۆنی دەکەن ؟

ئنجا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ، یان بە هەر کەسێك کە بە ڕێی پێغەمبەری خاتەم ﷺدا دەڕوات، دەفەرموێ : ﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا ﴾، وەك فەرمانت پێکراوە خۆتو ئەوانەی لەگەڵت گەڕاونەوە (بۆ لای خوا)، ڕاست ڕاوەستاوبە، نەلەخشاوبەو، پابەندبە بە شەریعەتی خواو سنوورشکێنیی و سەرکێشیی مەکەن، کە دەفەرموێ: ﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ

﴿وَمَن تَابَ مَعَكَ﴾، واتە: وەك فەرمانت پێكراوە، ڕێك ڕاوەستەو، پابەندبە شەریعەتەوەو، لێی بەجێمەمێنە، كورتی مەهێنە، كە دەشفەرموێ: ﴿وَلَا تَطْغَوْا﴾، واتە: تێشمەپەڕێنە، زیدەڕۆیشیی تێدا مەكە، نە لە ئیسلام كورتی بێنە، لە ئیسلام تێپەڕێنە، بەڵكو ئیسلام خۆی چۆن دەڵێ، بەو شێوەیە پێیەوە پابەند بە، ﴿إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾، بێگومان خوا بینەری ئەوەیە كە دەیكەن .

دوایی دەفەرموێ : ﴿وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ﴾، ئارەزووتان بۆ ئەوانە نەچێ‌و پشتیان پێ مەبەستن كە ستەم دەكەن، چونكە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان وەك دوایی باسی دەكەین ( وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ )یان بە (ولاَ تَمِيلُوا) تەفسیر كردوە، واتە: مەیلتان بەلایاندا نەچێ، بەڵام لە ڕاستییدا: (رَكَنَ إلَيْهِ و رَكِنَ إلَيْهِ، وَارْتَكَنَ، ارْتَكَنَهُ)، یانی: (إعْتَمَدَ عَلَيْهِ) واتە: پشتی پێ بەست‌و سەنگی دایە سەری، واتە: پشت بەوانە مەبەستن، كە ستەمیان كردوەو، مەیانكەنە پشت پێ بەستراوی خۆتان، بەڵام بۆچی (إلی)ی هێناوە، (علی)ی نەهێناوەو، نەیفەرمووە: (ولاَ تَرْكَنُوا عَلَى الذِين ظلموا)؟ چونكە (رَكَنَ إلَيْهِ) ئەمە (تَضْمِين)ی مانای (مەیل)یش كراوە، واتە: ئارەزوومەندانە، مەیلكەرانە پشت مەبەستن، بەوانەی كە ستەمیان كردوە، ﴿فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ﴾، ئەگەرنا ئاگرتان تووش دەبێ، بەڵكو لە دنیاشدا، ئەوانەی پشت بە ستەمكاران دەبەستن‌و، لەژێر ركێفی ستەمكاران دان، لە دنیاشدا هەر بە ئاگری ستەمكارەكان دەسووتێن، نابینن ئەو فیرعەون‌و تاغووتانەی كە خەڵك لێیان ڕادەپەڕن، ئەوانەش كە لە دەوریانن، دەست‌و پێوەندەكانیان ئەوانیش بە ئاگری وانەوە دەسووتێن‌و، خەڵك وەك یەك سزایان دەدات!! ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾، لە خوار خواوەو جگە لە خواش، هیچ هاوكارو سەرپەرشتیارو دۆست‌و دڵسۆزێكتان چنگ ناكەوێ‌و، دوایی سەرناخرێن‌و، هاوكاریی ناكرێن .

ئنجا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، هەر كەسێك كە قورئان دەخوێنێتەوەو لە ڕێی پێغەمبەری خاتەمەوە دەڕوات، دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ ﴾، نوێژ بەرپا بكە لەملاولای ڕۆژگاردا، واتە: ئێواران‌و بەیانیان، ﴿ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ ﴾، هەروەها لە چەند بەشێك لە شەودا، ﴿ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾، بێگومان چاكەكان، خراپەكان لادەبەن، ئا ئەوە ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییەیەو بیرخەرەوەیە بۆ كەسانێك كە زۆر یادی خوا بكەن، چونكە ئەوانەی كە یادی خوا دەكەن ڕاستییەكانیان دێتەوە یاد، ئەوانە عەقڵ‌و دڵیان بیدارو هۆشیار دەبێ‌و، بەهرەمەند دەبن لە قسەی خێرو ئامۆژگاریی خێر .

لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، خۆڕاگربە بێگومان خوا پاداشتی چاكەكاران زایە ناكات، كە بێگومان یەكێك لە چاكە هەرە چاكەكان، بریتیە لە خۆڕاگریی، خۆڕاگریی لەسەر تاعەت كە ئەنجامی بدەی‌و، خۆڕاگریی لەسەر گوناح‌و تاوان كە لێی دووربی‌و، خۆڕاگریی لەسەر قەدەرو موصیبەت كە لە بەرانبەریدا خۆڕاگرو نەلەخشاو بی‌و، كارێك نەكەی كە مایەی نارەزایی خوای پەروەردگار بێ .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:**

**پێویستە بڕواداران دڵنیاو بەرچاو ڕوون بن، کە پەرستنی هاوبەش دانەرەکان، جگە لە لاسایی کردنەوەی پێشینانیان هیچ بنەمایەکی دیکە نیە، ئەوانیش لە هەمان ڕچەی هەڵەو پەڵەی ئەوانەوە دەڕۆن:**

خوا فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە چوار (٤) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم:** ﴿فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ﴾: **بە هیچ جۆرێك لە هیچ دوودڵییەکدا مەبە.**

بۆچی نەیفەرمووە: (فلا تكُن) خۆی لە ئەسڵدا (فَلاَ تكُن)ە، بەڵام (ن)ەکە (جُـزِمَ بالنَّهي وحذفت النون لكثرة الإستعْمال)، دیارە (فلا تـك)، (لا)ی (ناهية)، (فعل المضارع)جەزم دەکات، ئنجا دەڵێ: بۆیە (ن)ەکە فرتێنراوە، چونکە زۆر بەکارهاتوە، (فَلاَ تَـك)، واتە: وا مەبە.

(فِي مِرْيَةٍ) واتە: لە دوو دڵییدا مەبە، وەك گوتمان: دەگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێ، یان هەر بڕوادارێك کە بە ڕێی ئەودا دەڕوات، یاخود هەر کەسێك بێ، بڕوادار بێ یان بێبڕوا، بێگومان ئەگەر ڕووی دواندن لە

پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێ، خوا بۆخۆی زانیویەتی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە هیچ دوودڵییەکدا نەبووە، کەواتە: هەرچەندە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خوایە، بەڵام مەبەست پێی بڕوادارانن، یاخود هەر لە ئەسڵدا مەبەست پێ پێغەمبەری خوا نیە، بەڵکو مەبەست پێی هەر کەسێکە کە قورئان دەخوێنێ‌و، قورئان دەیدوێنێ .

پێشتر باسمان کرد (شك) واتە: دوودڵیی‌و، (مریة)ش دوودڵییەکی تایبەتە، دوودڵییە لە شوێنێکدا کە پاساوی نەبێ، (ظن) واتە: گومان، ئەوەیە کە شتێك مرۆڤ پێی وایە، وایە، لەگەڵ ئەگەری وانەبوونیشیدا، بەڵام ئەگەری وابوونی بەهێزتر بێ، یاخود بە پێچەوانەوە: (ظن)ی وابێ کە ئەو شتە وانیە، ئەگەریش دابنێ کە وایە، بەڵام ئەگەری وانەبوونی زیاتر بێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (ظن)، یانی: (ظن)، بریتیە لە گومانێکی زاڵ (الظنُّ الراجح)، واتە: ئەگەرێکی زاڵ بە باری بووندا، یان بە باری نەبووندا، بەڵام هەڵبەتە ئەوە دەبێ بە پێی سیاقەکان بڕیار بدرێ، کە ئایا ئەمە بە مانای گومانی زاڵە، یاخود بە مانای دڵنیایی‌و زانیاریی یەکلایکەرەوەیە، چونکە جاری واشە (ظن) بە مانای زانیاریی‌و دڵنیایی (یقین) دێ.

**برگەی دووەم :** ﴿ مِّمَّا يَعۡبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾: واتە : لە بارەی ئەو شتانەوە کە ئەوان دەیانپەرستن، یاخود یانی : (مِنْ عِبادَة هَٰٓؤُلَآءِ )، چونکە دەگونجێ (ما) (مَصْدرية) بێ‌و، دەشگونجێ (ما) (موصولة) بێ، ئەگەر ﴿ مِّمَّا يَعۡبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾: (مِنَ الَّذِي يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ ) بێ، واتە: ئەوانەی کە ئەوان دەیانپەرستن لە بت‌و صەنەمەکانیان، لە دوودڵییدا مەبە، کە ئەوان ناهەقن‌و پووچن، بەڵام ئەگەر (ما) (مَصْدرية) بێ، یانی: (مِنْ عِبادَة هَٰٓؤُلَآءِ )، لە بارەی پەرستنی ئەوانەوە، لە دوودڵییدا مەبە، کە پەرستنێکی ناهەقەو لەجێی خۆیدا نیە .

هەڵبەتە مەبەستی پێ بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم ﷺ بووەو، بۆ ئێمەش‌و بۆ دوای ئێمەشە، بۆ کافرو بێبڕواکانی ڕۆژگارە جیاوازەکان.

**بڕگـــەی ســـێیـــەم :** ﴿مَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبۡلُ﴾: ئەوانە هەر ئەوە دەپەرستن، کە بابو باپیرانیان لەمەو پێش پەرستوویانە، (الآباءُ أَي: الأَسْلاَفُ وَالسابِقُون)، واتە: پێشینەکانو ئەوانەی کە پێشکەوتوو ون، یانی: (عِبادَتُهُم كَعِبادَتِهِم، مَبْنِيٌّ عَلَى الجَهْلِ وَالتَّقْلِيد)، پەرستنی کافرەکانی ڕۆژگاری ئێوەش، هەروەك پەرستنی پێشینەکانیانە، کە بناغەی ئەوانیش هەر لەسەر نەزانینو لاساییکردنەوەی کوێرانە بنیاتنراوەو، هی ڕۆژگاری ئێوەش بەهەمان شێوە، لەبەر ئەوە هیچ دوودڵییەکتان لەوەدا نەبێ، کە ئەوانە بە ڕێیەکی هەڵەدا دەڕۆن .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿مَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا كَمَا﴾: (كَما) (الكاف تَشْبيه نائِبَةٌ عَنْ مَصْدَرٍ مَحْذُوفٍ، التَّقْدِير: إلاَّ عِبادَةً كَما يَعْبُد آباؤهُمْ)، واتە: ئەوانە هەر ئەوە دەپەرستن کە بابو باپیرانیان پەرستوویانە .

**بڕگـــەی چـــوارەم :** ﴿وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمۡ نَصِيبَهُمۡ غَيۡرَ مَنقُوصٖ﴾: (وَإِنَّا) بە (ن)ی تەئکید، (لَمُوَفُّوهُمۡ) بە لامی سوێند خواردنو جەخت کردنەوە، (وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمۡ) بێگومان ئێمە پێیان دەدەین، چییان پێدەدەین؟ (نَصِيبَهُمۡ) پشكو بەشی خۆیان پێدەدەن، (غیر منقوص) بەبێئەوەی هیچی لێ کەمکرابێتەوە، ئەمە تەعبیرێکی داکۆکییکەرەوەو جەختکەرەوەیە، بۆ ئەوە کە ئەو ماف پێدانە، بەتەواوییە .

ئنجا ئایا مەبەست لە (نصیب) چییە ؟

بێگومان (نصیب) مەبەست پێی پشكو بەشە، بەڵام چ پشكو بەشێك ؟

١) هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (رزقهم) واتە: بژیوو ڕزقو ڕۆزیی تەواویان پێ دەدەین .

٢) هەندێکیان گوتوویانە: (عذابهم)، سزای تەواو پڕ بەپێستیان پێدەدەین.

٣) هەندێکیشیان گوتوویانە: (مایُصیبهم من خیرٍ، أو شرّ)، ئەوەی کە تووشیان دێ، لە چاکەو لە خراپە .

بەڵام بەپێی سیاق دیارە، کە لێرەدا مەبەست پێی سزای پڕ بە پێستو تەواوە، چونکە سیاقەکە وادەخوازێ، ئەگەرنا وشەی (نصیب) بە مانای پشكو بەش دێ، پشكو بەش لە خێردا، یان لە شەڕدا، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاق دەزانین کە مەبەست پشكو بەشە لە سزاو جەزرەبەدا، چونکە کەسانێك لە دوودڵییدا بووبن، لە بەرانبەر ئایینی خوای پەروەردگاردا، لە ڕاڕاییدا بووبن، چ لە کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر، یان لە ڕۆژگاری پێشتر، ئەوە بێگومان دەبێ چاوەڕێی پشكو بەشیان بکەن لە سزا، نەك لە ڕزقو ڕۆزیی، کە هیچ گونجاو نیە لەگەڵ ئێرەدا، یاخود پشکیان لە خێرو خۆشییدا کە تووشیان دێ، ئەویش هیچ گونجاو نیە .

هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان کە ئایەتەکان شی دەکەنەوە تەماشا دەکەن: ئەو وشەیە، یان ئەو ڕستەیە، لە ڕووی زمانەوانییەوە، چ مەبەستێك هەڵبگرێ، هەموو واتاکان دادەنێن، بێئەوەی سەرنج بدەن: داخۆ لەو سیاقەدا، ئەو ماناو مەبەستە لەگەڵ ئەو وشەیە، یان ئەو ڕستەیەدا، دەگونجێ یان ناگونجێ؟

بەڵێ ڕەنگە لە ڕووی زمانەوانییەوە بگونجێ ئەو واتایانەیان هەبن، بەڵام کە تەماشای سیاقو کەشو هەوای ئەو مەبەستانە دەکەی، کە ئایەتەکانی بۆ هاتوونو لێیان ورد دەبیەوە، دەبینی تەنیا یەکێك لەو واتایانە ڕێی تێدەچێو گونجاوە، کە لێرەدا هیچ باسی ڕزقو ڕۆزیی نیەو، هیچ باسی خێرو شەڕیش نیە، کەواتە مەبەست پێی سزای تێرو تەواوو پڕ بە پێستە.

**مەسەلەی دووەم :**

**دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران، کە ئەو کتێبەی بە مووساش درابوو، ڕاجیایی و ناکۆکیی خەڵکی تێدابووەو لە دوودڵییدابوونە دەربارەی و، هەرکامێکیشیان سزاو پاداشتی کردەوەکانیان بە تەواویی پێ دەدرێتەوە:**

خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بەپێزە لە شەش (٦) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾: بە دڵنیاییەوە ئێمە کتێبمان بە مووسادا، واتە: ئێوە گومانتان نەبێ لەوەی کە مووسا تەوراتی پێدراوە، (قد) بۆ دڵنیاکردنەوە (تحقیق)ەو (ل) بۆ سوێند خواردنو جەختکردنەوەیە، یانی چی؟ یانی: ئێوە گومانتان نەبێ: ئەو کتێبەی کە مووسا پێی بوو، ئێمە پێماندا ناردبوو، وەك پەیامی خۆمان، بۆمان سروش کرد بوو .

**بڕگەی دووەم :** ﴿فَٱخْتُلِفَ فِيهِ﴾: ڕاجیاییو ناکۆکیی تێدا پەیدابوو، دیارە لێرەدا (إختلاف) بکەر (فاعل)ەکەی نەزانراو (مجهول)ەو دیار نیە کێ ڕاجیایی تێدا پەیداکردوە ؟ چونکە لێرەدا ئەوەی مەبەستە چەسپاندنی ڕاجیاییەکەیە، نەك کێن ئەوانەی کە ڕاجیا بوونو ناکۆك بوونو، مەدحکردنیان، یاخود زەمکردنیان، ئەگەرنا پێش هەموو کەس مەبەست پێی جوولەکەکانە، یاخود بەشێك لە جوولەکەکانو، ئەوانەی ئامادە نەبوون پەیڕەویی لە مووسا ﷺ بکەن، واتە: ئەو خەڵکەی کە لە ڕۆژگاری مووسادا ﷺ هەبوو، لە تەوراتدا

کەوتنە ڕاجیایی، هەندێکیان بڕوایان پێهێنا، ئەگەر مەبەست پێی جوولەکەکان بێ بەگشتیو، خەڵکێکی دی بڕوایان پێ نەهێنا، کە فیرعەونییەکان بوون، یاخود ئەگەر مەبەست پێی بازنەی جوولەکەکان بێ: جوولەکەکان لەبارەی تەوراتەوە کەوتنە ڕاجیاییو ناکۆکیی، هەندێکیان بەڕاستی تێیگەیشتنو، هەندێکیشیان بە چەوتییو، بەڕێی هەڵەدا ڕۆیشتن .

واتە: جوولەکەکان کە خاوەن کتێبیش بوون، کەوتنە ڕاجیایی، چ جای کافرەکانو هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، ئەی پێغەمبەری خوا ! یان ئەی مسوڵمانان! کەواتە: خەمبار مەبە، ئەوە عادەتی لەمێژینەی مرۆڤە، کە لە بەرانبەر ئایینی خواو پەیامی خوادا، دەکەونە ڕاجیاییو مشتومڕەوە .

**بڕگەی سێیەم** : ﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ ﴾: ئەگەر وشەیەك لەلایەن پەروەردگارتەوە تێنەپەڕیبایە، بڕیارێك زووتر نەدرابایە، کە لێرەدا بێگومان مەبەست پێی یاساو دەستووری خوایە لە ژیانی مرۆڤدا، کە بریتیە لەوەی لە قیامەتدا، سزاو پاداشت دەچەسپێ .

**بڕگەی چوارەم** : ﴿ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾: واتە: کێشەکەیان هەڵدەبڕاو کۆتایی پێدەهات، چونکە وشەی (قَضَى) دوو مانای هەن :

١ـ (الحُكْمُ بَيْنَ النَاسِ فِيما اخْتَلَفُوا فِيهِ)، دادوەریی لە نێوان خەڵکیداکردن، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیایی، بڵێی: تۆ هەقتەو، تۆ ناهەقتە، یان تۆ ئەوەندەت هەقە، تۆش ئەوەندەت ناهەقە .

٢ـ (القضاءُ : الحُكْمُ عَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مُنْفَرِداً)، بۆ هەر کامێکیان بەتایبەت بڕیاری لەبارەوە بدرێ، لێرەدا زیاتر واپێدەچێ مانای دووەم گونجاو بێ، ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە خوا بڕیاری داوە، دنیا جێی تەصفیە حیسابو جێی سزاو پاداشت درانەوە نیە، بۆ هەرکامێکیان بڕیاری تایبەت دەدرا، دەربارەی ئەوانە کە کەوتوونەتە ڕاجیاییەوە.

﴿ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾: بێگومان ئەوانە لەبارەی تەوراتەوە لە دوودڵییەکی بێزارکەر دان، یان لە دوودڵییەکی خەستو سەخت دان، وەك دەگوترێ: (لیلٌ ألیل)، واتە: شەوێکی شەو، وەك لە کوردەواریشدا هەیە: فلان کەس شیعرێکی گوت، شیعر ئەمما شیعر، هەروەها لە قورئانیش دا هاتوە:

أ/ ﴿ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾ ﴾الفرقان، واتە: پەردەیەك کە کراوەتە پەردە.

ب/ ﴿ ظِلًّا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ﴾النساء، واتە: سێبەرێك کە زۆر خەستە.

ج/ ﴿ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: پەردەیەکی داپۆشراو .

کە هەمووی بۆ زیاتر جەخت کردنەوەی مانای وشەکانە.

یانی: کورتەی مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە، کە موشریکەکان لە رۆژی دواییدا دوودڵن، لەبارەی قورئانەوە، یاخود خاوەن کتێبەکان، جوولەکەکان لەبارەی کتێبەکەیانەوە دوودڵ بوون، هەردوو مانایان هەڵدەگرێ .

**برگەی پێنجەم :** ﴿ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾، بێگومان پەروەردگات سزاو پاداشتی هەر کامێکیان بە تەواویی دەداتەوە، هەڵبەتە ئەمە خوێنراویشتەوە: (وَإِنْ كُلاً لما) وەك چۆن خوێنراوەتەوە: ﴿ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا ﴾، واتە: بێگومان هەر کامێکیان، خوای پەروەردگار سزاو پاداشتی کردەوەکانیان بە تەواویی دەداتەوە .

بەڵام بە پێی خوێندنەوەی: (وَإِنْ كُلاً لما)، (إِنْ) لێرەدا بە مانای لابەر (نافیة) دێت، یانی: (ما كُلاً) هیچ کامێکیان نیە، کە خوای پەروەردگار سزای پڕ بە پێستی کردەوەکانیان نەداتەوە .

**برگەی شەشەم :** ﴿ إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾، بێگومان ئەو بەوەی کە دەیکەن شارەزایە، واتە: شارەزایەو هیچی لێ ون نابێ .

زانایان گوتوویانە: تەنوینی سەر ﴿ كُلًّا ﴾، واتە: ئەو دوو فەتحەیە، ئەو دوو سەرە، قەرەبووی ڕستەیەك دەكاتەوە (عِوَضٌ عَن جملة: كُلّ المذْكورين آنِفاً مِنْ أَهْلِ القُرَى والمشْرِكين وَأَهْلِ الكِتاب وَالمخْتَلِفِين فِي الكِتاب)، ئەم تەنوینە بە تەنیا قەرەبووی ئەو ڕستەیە دەكاتەوە، واتە: هەموو ئەوانەی كە باسكران لەمەوپێش: لە خەڵكی ئاوەدانییەكان، كە پێشتر فەوتێنراون و هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان و، خاوەن كتێبەكان و، كە لەبارەی كتێبەكەیانەوە كەوتوونەتە ناكۆكییەوە .

(فخرالدین الرازي) لە تەفسیرەكەی خۆی (مفاتیح الغیب)دا[1]، دەڵێ: ئەم ئایەتە حەوت جۆرە ئامرازی تەئكیدكردنەوەی تێدان :

یەك : وشەی (إنَّ) كە بێگومان بۆ جەختكردنەوەیە .

دوو : (كُلاًّ) ئەویش هەر بۆ تەئكیدە .

سێ : (ل) لامەكە كە چۆتە سەر (خبر)ەكە، (كُلاًّ لما) كە بۆ سوێندەو جەختكردنەوەیە .

چوار : پیتی (ما) ئەگەر بە پێی قسەی (الفرَّاء)، (ما)یەكە (موصولة) بێ و، (لَمَا) بێ .

پێنج : ئەو سوێند خواردنە شێردراوەیە، چونكە ڕستەكە ئاوای لێدێتەوە: هەموویان سوێند بە خوا، پەروەردگارت بە تەواویی سزاو پاداشتی كردەوەكانیان دەداتەوە .

شەش : (اللام الثانية الداّخلة عَلَى جوابِ القَسَم)، لامی دووەم كە چۆتە سەر وەڵامی سوێندەكە، كە دەفەرموێ : ﴿ لَيُوَفِّيَنَّهُمْ ﴾.

---

١) ج ١٨، ص ٥٦.

حەوت : (ن)ی جەختکردنەوە (مؤَكّدة)یە، کە دەفەرموێ: ﴿ لَيُوَفِّيَنَّهُمْ ﴾.

لێرەدا حەوت جۆرە ئامرازی جەختکردنەوەو داکۆکیکردن هەن، لەسەر ئەوە کە هیچ کامێکیان نیە، مەگەر خوای دادگەر پاداشتو سزای بە هەقو پڕ بە پێستیان دەداتەوە .

کەواتە: هیچ لە دوودڵییو دڵەڕاوکێدا مەبە، بێگومان خوا پاداشتو سزای هەرکامێك لە مرۆڤەکان دەداتەوە .

## مەسەلەی سێیەم :

**فەرمانکردن بە پێغەمبەر ﷺو، شوێنکەووتوانی کە لەسەر ڕاستە ڕێ چەسپاوبنو، سەرکێشیی نەکەنو تێنە پەڕێنن، پشت بە ستەمکاران نەبەستن، ئەگەرنا ئاگری دۆزەخیان تووش دەبێ :**

خوا تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم چوار ئایەتە بەپێزە لە هەشت (٨) برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ﴾، ڕاست وەستاوبە وەك فەرمانت پێکراوە، دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ و، لە پشت ئەویشەوە ڕووی دواندن لە هەموو بڕوادارێکە، کە بەدوای پێغەمبەری خاتەمدا ڕۆیشتوون .

ئنجا ئایا (إستقامة) یانی چی ؟

(الإِستقَامَةُ : طَلَبُ القِيَام وَاستقَامَةُ الإِنْسانِ لُزُوم الطريق المستقِيم)، (إستقامة) بریتیە لە داواكردنی ڕاوەستان، (فاستقیموا)، واتە: زۆر لە خۆتان بكەن كە ڕێك بوەستن، ئنجا كە دەفەرموێ: (إِستقَامَ فُلاَنٌ)، واتە: فلاَن كەس ڕێی ڕاستی گرتووەو لێی لانەداوەو بە ملاولادا نەچووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەكدا فەرموویەتی: {استقِيمُوا وَلَنْ تُحْصُوا}[1]، واتە: ڕێك وەستاو بن، ناشتوانن سەرژمێر بكەن، واتە ئەگەر بێتو وەستاو بن لەسەر جادەی شەریعەت، ئەو پاداشتەی كە بەهۆی ئەو كردەوانەوە كە بە ڕێكو ڕاستی بەپێی شەریعەت ئەنجامیان دەدەن، پاداشتەكانیانتان بۆ ناژمێردرێ.

ئنجا ئێمە دیارە لە سەرەتای سوورەتی (هود)یشەوە لەبارەی ئەم سوورەتەوە، چەند فەرموودەیەكمان هێنان، یەكێكیان ئەمە بوو :

{عَنِ ابْنِ عَبَاسٍ رضي الله عنهما : قَالَ : قَالَ أَبُو بَكر يَا رَسولَ الله ! قَدْ شِبْتَ؟ قَالَ: شيبَّتْني هودٌ، وَالوَاقِعَةُ، وَالمرْسَلاَتُ، وَعَمَّ يَتَساءَلُون، وَإِذَا الشَّمْسُ كُورَتْ} {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبي شيبَة، برقم: (٣٠٢٦٨)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم (٣٢٩٧)، وَالحَاكِمُ، برقم: (٣٧٧٧) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِيِّ وَوَافقَهُ الذهبي، وَالبَزَّار، برقم: (٩٢) وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الترمذي) ج (٣) ص (١١٣)} .

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوای لێ ڕازی بێ، دەڵێ : ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! پیر بووی، (واتە: مووت سپی بوون)؟، ئەویش فەرمووی: سوورەتەكانی : (هود، وَالوَاقِعَة، والمرْسَلاتُ، وَعَمَّ يَتَساءَلُون، وَإِذَا الشَّمْسُ كُورَتْ) سەرو ڕیشیان سپی كردم، یاخود، منیان پیر كرد.

١) أَخْرَجَهُ الطيالسي، برقم: (٩٩٦)، وَأَحمَد، برقم: (٢٢٤٣٢)، وَابْنُ ماجَهْ، برقم: (٢٧٧)، وَالدَّارمِيّ، برقم: (٦٥٥)، قَالَ البوصيري : هَذَا الحَدِيث رِجَالُهُ ثِقَات اثبات، إلاَّ أَنَّهُ مُنْقَطِعٌ بَيْنَ سالم وَثوبان، فإنه لم يسمع منه بلا خلاف، لكن له طرق أخرى متصلة، وَأَيْضاً أَخْرَجَهُ ابْنُ حبان، برقم: (١٠٣٧)، وَالحَاكِم، برقم: (٤٤٧)، وَصَحَّحَهُ كُل مِن الألباني وشُعيب الأرنؤوط وحُسين سليم أسد.

هەر لەوبارەوە ئەم شوێنەوارەش هەیە، بیگێڕینەوە باشە: {رُوِيَ عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا عَلِيِّ السرّي يَقُولُ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي المنامِ، فَقُلْتُ : يَا رَسُولَ اللهِ ! رُوِيَ عَنْكَ أَنَّكَ قُلْتَ : (شَيَّبَتْنِي هُودٌ)؟ فَقَالَ: (نَعَمْ)، فَقُلْتُ لَهُ : مَا الَّذِي شَيَّبَكَ مِنْهَا ! قَصَصُ الأَنْبِيَاءِ، وَهَلاَكُ الأُمَمِ! فَقَالَ: (لاَ وَلَكِنْ قَوْلُهُ: ﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ ﴾)}[1] .

واتە: لە ئەبی عەبدوڕڕەحمانی سوللەمیەوە گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو عەلی سیڕڕی بووە، کە دەیگوت: پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەوندا بینی، پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ! لێت گێڕدراوەتەوە کە فەرمووتە: سوورەتی هوود سەری منی سپی کردوە؟ فەرمووی: بەڵێ، (واتە: بەڵێ وامگوتوە)، پێمگوت: چ شتێك لە سوورەتی هوود، سەری تۆی سپی کرد ؟ مووەکانی تۆی سپی کردن؟ بەسەرهاتی پێغەمبەرانو، لەبەینچوونی کۆمەڵگاکان؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ ﴾، وەك فەرمانت پێکراوە ڕێك وەستاوبە .

چونکە ئەمە وایکردوە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە خۆی وریا بێ، نەك بە سانتیمەتر، بەڵکو بە میللیمەتریش نە سەر بکات، نە کورت بکات، نە بە چەپدا، نە بە ڕاستدا، بە هیچ لایەکدا لانەدات.

ئنجا لە ڕاستییدا ڕاست وەستان لەسەر جادەی شەریعەت، ئاسان نیە، هەر بۆیە (أبو علي الجوزجانیی) کە یەکێکە لە عاریفەکان، لە خواناسەکان، وەك من لە کتێبی: (ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خواچوون)دا هێناومە، دەڵێ: (الكرامَةُ: هِيَ الإِستِقَامَةُ عَلَى الشَّرِيعَةِ)، کەرامەت، واتە: ئەوە کە خوا ڕێز لە بەندەی خۆی بنێ، ئەوەیە کە بەندە لەسەر جادەی شەریعەت بێ، لانەدات بە ملاولادا، ڕێكو پێك پێوەی پابەند بێ، ئەوە گەورەترین ڕێزلێنانی خوایە بۆ بەندەکەی، ئەگەرنا جاری وایە یاسادڕ (خَارِقُ العَادَة) لەسەر دەستی مرۆڤی صاڵحو، مرۆڤی خراپ (طالح)یش، بەڵکو لەسەر دەستی مرۆڤی بێبڕواش

١) الجامع لأحكام القرآن: ج ٩، ص ٨٧، برقم : ٣٦١٧، وَأَخْرجَهُ البَيْهَقِيَ، برقم : (٢٤٣٩).

ڕوودەدات، وەك هیندۆسییەکان شتی زۆر سەیرو سەرسووڕهێنەر دەکەن، ئەوە بەڵگە نیە بۆ کەرامەت، بەڵکو بەڵگەی ڕێزلێگرتنی خوا بۆ بەندەکەی، کە پێی دەگوترێ: کەرامەت، ئەوەیە کە کەسەکە لەسەر جادەی شەریعەت بێ، کە بەڕاستیی پێناسەیەکی زۆر جوانە.

**بڕگەی دووەم :** ﴿وَمَن تَابَ مَعَكَ﴾، هەروەها ئەوانەش کە لەگەڵت گەڕاونەوە بۆ لای خوا، واتە: با ئەوانیش ڕێك وەستاو بن، کە بێگومان بەهۆی ڕێك وەستانەوە لەسەر جادەی شەریعەت، لە خوارو خێچیی دەپارێزرێن، کە بەهۆی خوارو خێچییو لادانیشەوە، تووشی ناکۆکییو دووبەرەکییو مشتومڕی بێجێو، ڕاجیایی بێجێ دەبن .

کەواتە: ئەگەر دەیانەوێ لە دووبەرەکییو ناکۆکییو ڕاجیایی بێجێ، پارێزراو بن، با چاك پابەندبن بە شەریعەتەوە، باشی لێ تێبگەنو، باشی پێوە پابەندبن، ئەو کاتە لە خوارییو لاریی دوور دەبن، ئنجا کە لە خوارییو لاریش دوور بوون، ئەو کاتە لە ناکۆکییو دووبەرەکییش دەپارێزرێن.

**بڕگەی سێیەم :** ﴿وَلَا تَطْغَوْاْ﴾، واتە : سەرکێشیی مەکەن .

پێشتر باسمان کرد: (الطُّغْيَانُ: مُجَاوَزَةُ الحَدّ)، (طغيان) بریتیە لە سنووربەزێنیی، لە سنوور تێپەڕاندن، کەواتە: ﴿وَلَا تَطْغَوْاْ﴾، واتە: تێمەپەڕێنن، یانی: بەهۆی ئیستیقامەتەوە ڕێك بە شەریعەتەوە پابەند بنو کورتی مەهێننو، لە شەریعەت بەجێمەمێننو، بەهۆی خۆپاراستنیش لە طوغیانو سەرکێشییەوە، لە دین تێمەپەڕێنن، بەو شێوەیە کە شەریعەت گوتوویەتی: ئاوا پێوەی پابەندبن، نە لێی کەم بکەن، نە لێی زیاد بکەن، نە لێی داشکێنن، نە زیادەی بخەنە سەر .

با لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بێنین، پێغەمبەر ﷺ لە مەقامێکدا ئامۆژگاریی کەسانێکی کردوە، کە دیارە ویستوویانە تێبپەڕێننو سەرکێشیی بکەن، فەرموویەتی : {أَمَا وَاللهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ للهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ،

لكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ؛ فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي} {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البخاري، برقم: (٥٠٦٣)، ومسلم، برقم: (١٤٠١)}، واتە: ئاگاداربن! سوێند بە خوا من لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسمو، لە هەمووشتان زیاتر پارێزی لێدەکەم، بەڵام بەڕۆژووش دەبمو، جاری وایە بە ڕۆژووش نابم، (واتە: ڕۆژووی سوننەت)، شەونوێژیش دەکەمو دەشخەوم، ئافرەتانیش دێنم، (واتە: هاوسەرگیرییش دەکەم لەگەڵ ئافرەتاندا)، ئنجا هەر کەسێك لە ڕێبازی من لابدات، لە من نیە .

شایانی باسە من لە کتێبی: (نقض فكرة التطرف)[1]دا، کە لە کوردیی دا بە سێ نامیلکە بڵاوبۆوە، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا هەموومان لە یەك کتێبدا چاپ کردوون، (هەڵوەشانەوەی بیرۆکەی پەڕگیریی) بە تەفصیل باسی ئەو حاڵەتی تێپەڕاندنو سەرکێشییەم کردوە، کە چ زەرەرو زیانێکی هەیەو، چ ناشیرینیو ناجوانییەكو، بێزراوییەك دێنێتە سەر ئایینو بەرنامەی تێرو تەواوی خوای پەروەردگار، لە بیست خاڵدا باسی دەرهاویشتەکانی پەڕگیریو تێپەڕاندن لە شەریعەتم کردوە .

**برگەی چوارەم** : ﴿إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾، بێگومان خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، بینەری کردەوەکانتانە، هی دڵتان، هی زمانتان، هی ئەندامەکانی جەستەتان، چونکە وشەی (عمل)، ﴿تَعۡمَلُونَ﴾، هەم نیازو مەبەستەکانی دڵ، هەم خولیایەکانی بیرو مێشك، هەم دەربڕینەکانی زمانو، کردەوەی ئەندامەکان، هەموویان دەگرێتەوە .

**برگەی پێنجەم** : ﴿وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾، بە ئارەزووکردنو مەیلکردنەوەو پشت بەوانە مەبەستن کە ستەمیان کردوە، دەگوترێ: (رَكِنَ يَرْكَنُ، وَرَكَنَ يَرْكَنُ، أي: اعْتَمَدَ واسْتَنَدَ)، پشتی پێ بەستو خۆی پێ

---

١) تەرجەمەکەی دووجاران چاپکراوە، یەکەمیان لە لەندەن (دار الحكمة)، دووەمیان لە قاهیرە (مرکز الدراسات الكردية) هەروەها تەرجەمەی فارسیش کراوە.

سپاردو، سەنگی خۆی دایە سەری .

شایانی باسە: (محمد رشید رضا) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆیدا (تفسیر القرآن الحكيم)[1]، باسێکی دوورو درێژی لەوبارەوە کردوەو، ڕەخنەی گرتوە لە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان کە وشەی (ركون)یان بە (مَيْل) لێکداوەتەوە، کە هەڵبەتە وشەی (ركون) مەیلکردنیش دەگرێتەوە، بەڵام ئەسڵی مانایەکەی لە ڕاستییدا بریتیە لە سەنگی خۆدانەسەرو پشت پێ بەستن.

هەروەها (محمد حسين طباطبائي) ئەویش یەکێکە لە زانایانی شیعە مەزهەب، لە تەفسیرەکەی خۆیدا (تفسير الميزان)[2]، قسەی زۆری لەسەر کردوە، ئەویش ڕەخنە دەگرێ لە (محمد رشید رضا) لە هەندێك لە قسەکانیدا.

بەڵام کورتەی قسەکان ئەوەیە کە وەك پێشتریش گوتم : ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾، واتە: پشت بەوانەی ستەمیان کردوە، مەبەستن، بە ئارەزوو لێبوونو بە مەیل بەلادا چوونەوە، کورتەی مانایەکەی ئەوەیە، ئنجا ئەگەر وا بکەن، چیتان لێدێ ؟

بڕگەی شەشەم ﴿ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾، ئاگرتان تووش دێ، دیارە زانایانو توێژەرەوان، هەر باسی ئاگری دۆزەخو ئاگری دوارۆژ دەکەن.

بەڵام من پێم وایە: هەر لە دنیاشدا، ئەوەی کە لەگەڵ ستەمکاران بێ‌و پشتیان پێ ببەستێ‌و خۆییان پێ بسپێرێ، سەری خۆی تەسلیمی وان بکات، ڕێشمەی کاروباری خۆی بەدەست ئەوانەوە بدات، هەر لە دنیاشدا بە ئاگری وانەوە دەسووتێ‌و، لەگەڵ ئەواندا تووشی عەیبداریی دێ‌و، تووشی بێزراویی لای خەڵك دەبێ، کاتێك لێیان ڕادەپەڕن، یاخود بە لای کەمەوە: تووشی نەفرینلێکرانی مێژوو دێ، یانی: پێش قیامەت، هەر لە دنیادا باجی لەگەڵ ستەمکاراندا ڕۆیشتن‌و، پشت بە ستەمکاران بەستن، دەدات.

١) ج ١٢، ص ١٣٨ –١٥٢.

٢) ج ١١، ص ٥٠ –٥٨ .

**برگەی حەوتەم** : ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ﴾، لە خوار خواوەو جگە لە خوا، هیچ دۆستو یاوەرو هاوکارتان چنگ ناکەون، کە لە بەرانبەر سزای خوادا بەرگرییتان لێبکەن، واتە: هیچ کەسێك سوودتان پێناگەیەنێ .

**برگەی هەشتەم** : ﴿ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾، دواییش سەرناخرێنو هاوکاریی ناکرێن، ئەگەر کەس نەبوو دۆستت بێو پشتیوانت بێ، ئەو کاتە مانای وایە سەرناکەویو سەرناخرێیو، تووشی سزاو جەزرەبە دەبی، لێرەدا پێویستە ئەم فەرمودەیەش بێنین: {عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ خَطَبنا أبو بكر الصِّدِّيق، فَقَالَ: أَيُّهَا الناسُ! إنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيةَ وَتَتَأَوَّلُونَهَا عَلَى غَيْرِ تأوِيلِهَا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ... ﴿١٠٥﴾﴾ المائدة، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (إنَّ الناسَ إذَا رَأَوْا الظَّالِم فَلم يأْخُذُوا عَلَى يدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللهُ سُبْحَانَهُ بعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ) {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، برقم: (٤٣٣٨)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢١٦٨) وَقَالَ : صَحِيح، وَابْنُ ماجَهْ، برقم: (٤٠٠٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة)، برقم: (١٥٦٤)}.

واتە: قەیس (یەکێکە لە هاوەڵان خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بیستم ئەبو بەکری صیددیق خوا لێی ڕازی بێ (ئەو کاتەی خەلیفەی مسوڵمانان بوو) وتاری بۆ داین، گوتی: ئەی خەڵکینە! ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو، ماناکەی بە هەڵە لێکدەدەنەوە، (بۆیە دەڵێ): {وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (إنَّ الناسَ إذَا رَأَوْا الظَّالِم فَلم يأْخُذُوا عَلَى يدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللهُ سُبْحَانَهُ بعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ)}.

واتە: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، دەیفەرموو: هەرکاتێك خەڵك ستەمکاریان بینی، دەستیان نەگرت بیگێڕنەوە لەو ستەمە، ئەوە زۆر نیزیکە خوا لەلایەن خۆیەوە، سزایەك بنێرێ بۆ هەموویان .

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی :**

**نوێژکردنی بەردەوام لە هەردووك لاو ئەمسەرو ئەوسەری ڕۆژگارو، چەند بەشێکی شەوگارداو خۆڕاگریی و نە لەخشاویی و، بەردەوامیی لەسەر جادەی شەریعەت:**

خوای بەرزی مەزن فەرموویەتی : ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە لە چوار (٤) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** خوای بەرزی مەزن بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، بە هەر کەسێك کە لە ڕێی ئەوەوە دەڕوات، دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ ﴾، لەملاولای ڕۆژگاردا نوێژ بەرپا بکە، لە ئەمسەرو ئەوسەری ڕۆژگاردا .

(طَرَفُ الشيء: مُنْتَهاهُ مِنْ أَوّلِهِ وَآخِرِهِ)، کە دەفەرموێ: ﴿ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ ﴾، (طَرَف) بریتیە لە کۆتایی شتێك، لە سەرەتا بێ، یان لە کۆتایی، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی هەردوو سەرەکەیەتی، ئەمسەرو ئەوسەری، ئنجا ﴿ ٱلنَّهَارِ ﴾، (النَّهارُ: ما بَيْنَ الفَجْرِ إلى غُرُوبِ الشَّمْسِ، وَسُمّيَ نَهاراً لأَنّ الضوء يَنْهرِفِيه أي: يَبْرُزُ)، (نَهار) ئەو کاتەیە، ئەو ماوەیە کاتێ کە شەبەقی بەیانی دەدات، تاکو خۆرئاوا دەبێ، بۆیەش بە ڕۆژگار گوتراوە: (نهار)، چونکە تیشکەکەی دەردەکەوێ، وەك چۆن ڕووبار کە دێ، دیارە تیشکی ڕۆژگاریش ئاوا دیارە .

**بڕگەی دووەم** : ﴿وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ﴾، لە چەند کاتێك لە شەوگاریشدا، واتە: نوێژ بکە لەم سەرو ئەوسەری ڕۆژگارداو، لە چەند کاتێکی شەوگاردا .

(زُلَفْ) کۆی (زلفة)یە، وەك (غُرَفْ) کۆی (غرفة)یە، واتە: ژوورەکان، ژوور، واتە: چەند کاتێکی شەوگار کە لە یەك نیزیکن، هەندێك لە زانایان دەڵێن: ﴿طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ﴾، مەبەستی پێ نیوەڕۆو عەسرە، وە ﴿وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ﴾، کە بە کۆ هێناویەتی، یانی: ئەو نوێژانەی کە لە شەودا دەکرێن، کە نوێژی شێوانەو، نوێژی خەوتنانەو، نوێژی بەیانیشیان خستۆتە پاڵ، دەڵێن: ئەوە ئاماژەیە بە پێنج نوێژەکان.

**بڕگەی سێیەم** : ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾، بێگومان چاکەکان خراپەکان لادەدەن، واتە: دەیانسڕنەوە، چاکەکان چۆن خراپەکان لادەبەن؟ ئەمە دوو واتای هەن :

أ/ یان چاکەکان، دوای ئەوەی خراپەکان کراون، دەیانسڕنەوەو لایان دەبەن، مرۆڤ گوناهێکی کردوە، تۆبە دەکاتو دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، خوا گوناهەکەی لە کۆڵ دەکاتەوەو دەیسڕێتەوە .

ب/ یان چاکەکان وا لە خاوەنەکەیان دەکەن، کە توخنی خراپەکان نەکەوێو، خراپەکانی لە کۆڵ ببنەوەو هەر بەلایاندا نەچێ، هەردووك واتاکەی ڕاستن.

**بڕگەی چوارەم** : ﴿ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ﴾، ئا ئەوە بیرخستنەوەیە بۆ کەسانێك کە یاد بکەن، بێگومان مەبەست پێی ئەوەیە کە یادی خوا بکەن، چونکە کەسێك کە دڵەکەی بیدار نەبێ، عەقڵەکەی هەرچەند هۆشیاربێ، هەرچەند پڕ بێ لە زانیاریی، بەهرەمەند نابێ، لەڕاستییدا بەهۆی دڵی بێدارەوە، عەقڵی هۆشیار خاوەنەکەی ڕێنمایی دەکاتو لێی بەهرەمەند دەبێ، ئەگەرنا زۆرن ئەوانەی کە کەللەیان پڕە، وەك کاك ئەحمەدی موفتی زادە دەڵێ:

(کەللەیان بۆتە هەمبانەی مەعلوومات)، عەقڵیان پڕە لە زانیاریی، بەڵام لە زانیارییەکەی خۆیان بەهرەمەند نابن و کاری پێناکەن، زانینەکەیان ناگۆڕێ بۆ توانین، حاڵی بوونەکەیان تێدا نابێ بە حاڵ و، سەرەنجام لەجیاتی ئەوەی لە زانیارییەکەیان بەهرەمەند بن، زەرەرمەندن، چونکە بۆ قیامەت لەسەریان دەبێتە بەڵگە .

**برگەی پێنجەم :** ﴿وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، خۆڕاگربە، بێگومان خوا پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات، بێگومان گرنگترین سیفەتی چاکەکاران، بریتیە لە خۆڕاگریی، واتە: ئەگەر خۆڕاگربی، بە چەمك و واتای فراوانی خۆڕاگریی، ئەوە لە چاکەکارانی و خوا پاداشتت زایە ناکات.

زانایان دەڵێن: خۆڕاگریی دەبێتەوە سێ بەشی سەرەکیی :

أ/ الصَّبْرَ عَلَى الطاعَةِ .

ب/ الصَّبْرَ عَنِ المعَاصِي.

ج/ الصَّبْرَ عَلَى المصِيبَةِ.

١) خۆڕاگریی لەسەر تاعەت و فەرمانبەریی، خۆت ڕابگری و ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە، جێبەجێی بکەی .

٢) خۆڕاگریی لەسەر گوناهو تاوان، خۆت ڕابگری و سەرپێچیی و تاوان نەکەی.

٣) خۆڕاگریی لەسەر بەڵاو موصیبەت، لەو ڕووەوە کە ئەو بەڵایە لە خواوە تەقدیر کراوەو لە خواوە هاتوە، سکاڵا نەکەی، بەڵێ شتی خۆشت پێ خۆشەو، شتی ناخۆشت پێ ناخۆشە، بەڵام گلەیی نەکەی، سکاڵا نەکەی لە خوا، هیچ گلەییەکت بەرانبەر بە خوا لە دڵدا بۆ پەیدا نەبێ، چونکە بێگومان خوا لەگەڵ هیچ شتێکی خراپدا نیە، بەڵام سروشتی ئەم ژیانە دنیاییە ئاوایە: ژیانی تێدایە، مردنی تێدایە، خۆشیی تێدایە، ناخۆشیی تێدایە، هەورازی تێدایە، نشێوی تێدایە، ئنجا ئەگەر مرۆڤ ئیمانی هەبێ، لە هەورازو نشێو، لە خۆشیی و ناخۆشیی و، لە هەموو شتەکاندا هەر

براوەو بەهرەمەندە، وەك خـوا دەفەرمـوێ : ﴿... وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ٣٥﴾الأنبـياء، تاقيتـان دەكەينـەوە بـە شـتێك كـە پێتـان نـاخۆشـەو، بە شتێك كە پێتان خۆشـە، یاخود بە بەرژەوەندییـ بە زیان تـاقیتـان دەكەینەوە، دواییش دەگەڕێنـرێنـەوە بۆ لای ئێمـە .

**چـەنـد فـەرمـوودەیـەك لـەبـارەی چـەمـكـو واتـای ئـەم ئـایـەتـەوە:**

ئێستـاش چەند فەرموودەیەك دێنـین لێرەدا، كە پەیوەسـتن بەم دوو ئـایـەتـە موبـارەكـەوە :

فەرمایشتی یەكـەم : پێغـەمبـەر ﷺ دەربـارەی نـوێـژ فەرموویـەتی: {صَلُّوا كَمَـا رَأَيْتُمُـونِي أُصَلِّي} {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد، بـرقم: (١٥٦٣٦)، وَالبُخَـارِيُّ، بـرقم: (٧٨٥)، وَمُسْلِـم، بـرقم: (٦٧٤)، وَالنَّسَـائِيُّ، بـرقم: (٦٣٥)، وَابْـنُ حِبـانَ، بـرقم: (١٦٥٨) عَـنْ مـالِـكِ بْن الحوَيْـرِثِ رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ} .

واتـە: وەك چـۆن منتـان بینـی نـوێـژم كـرد، ئـاوا نـوێـژ بكـەن.

جـا بە تەئكیـد تەنیـا مەبەستی ئەوە نەبووە كە ڕواڵەتی نـوێـژی پێغـەمبـەر ﷺ ڕەچـاو بكـەین، بەڵكو دەبـێ وردبیـنـەوەو نێوەڕۆكی نـوێـژی پێغـەمبـەر ﷺ لـە نـوێـژی خـۆمـانـدا بێـنینـە دی، واتـە، هـەم چـەندێـتییەكـەی، هـەم چـۆنیـەتییەكـەی، هـەم ڕواڵـەتەكـەی ڕەچـاو بكـەین، هـەم نێـوەڕۆكـەكـەی، هـەوڵبدەیـن وەك پێغـەمبـەر ﷺ نـوێـژەكـانمـان بكـەیـن .

فەرمایشتی دووەم : دەربـارەی ئـەم ڕستەیـەی قـورئـان، كـە خـوا دەفـەرموێ :

﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ﴾، ئەم دەقە گـێـڕراوەتـەوە :

{عَـنْ ابْـنِ مَسْعُودٍ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ أَنَّ رَجُـلاً أَصَـابَ مِـنْ امْـرَأَةٍ قُبْلَـة، فَـأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلم فَذَكَـرَ ذَلِكَ لَهُ، كَأَنَّهُ يَسأَلُه عَنْ كَفَّارَتِهَا، فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ

يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾هــود، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسولَ اللهِ! أَلِيَ هَذِهِ؟ قَالَ: هِيَ لِمَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي} {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٤١٠)، وَمُسْلِم، برقم: (٧١٧٧)، وَالتِّرمِذِيّ، برقم: (٣١١٤)} [١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك ماچێکی لە ئافرەتێك کردبوو، (دیارە لە ڕێگە پێی گەیشتوەو بە حەرامیی ماچێکی لێ کردوە)، هاتە لای پێغەمبەر ئەوەی بۆ باسکرد، وەك لێی بپرسێ کە چۆن ئەو گوناهە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، سزانەوەکەی بەچی دەبێ؟ ئنجا ئەم ئایەتە دابەزیە سەر پێغەمبەر ﷺ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾، ئەو پیاوەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە بەتایبەت بۆ منە؟ فەرمووی: بەڵکو بۆ هەر کەسێکە لە ئوممەتی من کە کاری پێ بکات.

یانی: هەر یەکێك لە ئوممەتی من گوناهێکی گچکە بکات، بەڵام دوایی نوێژ بکات، خواپەرستیی‌و تاعەت بکاتو بگەڕێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، ئەوە خوا ئەو گوناهە گچکانەی لێ دەسڕێتەوە .

وەك لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ : ﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ ...﴿٣١﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیاییی ئەگەر خۆتان لەو گوناهە گەورانەی کە لێتان قەدەغە کراون، بپارێزن، خراپەکانتان لێ دەسڕینەوە، (واتە: گوناهە گچکەکانتان لێ دەسڕینەوە).

گوناهی گەورەو گچکەش بە تەفصیلێ باسمان کردوە، لە باسی تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوادا، باسێکی تایبەتمان کردوە، لە سوورەتی (النساء)دا، لەوێدا ڕوونمان کردۆتەوە کە باشترین پێناسە بۆ گوناهی گەورە، بە ڕای

---

١) وَفِي رِوايـةِ أَبُو دَاوُد: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَلَهُ خَاصَّةً أَمْ لِلنَّاسِ كَافَّةً؟ فَقَالَ: لِلنَّاسِ كَافَّةً .

من، کە زۆر لە زانایان لەسەری یەك دەنگن ئەوەیە کە: (گوناهی گەورە هەر گوناهێکە کە سزایەکی دنیایی، یان هەڕەشەیەکی قیامەتیی لەسەر بێ‌و، گوناهی گچکە غەیری ئەوانەیە).

ڕوانینی حەرام گوناهی گچکەیە .

تۆقەکردن گوناهی گچکەیە .

ئەو ماچکردنە گوناهی گچکەیە، بۆچی؟ چونکە سزایەکی دنیایی بۆ باس نەکراوەو، هەڕەشەیەکی قیامەتییشی بۆ باس نەکراوە.

بەڵام کە گوناهی گچکەیە، مانای ئەوە نیە کە مرۆڤ ئەو جۆرە گوناهانە بکات، چونکە بەردەوام بوون لەسەر گوناهی گچکە، مرۆڤ پەلکێش دەکات بۆ هی گەورەش، بەتایبەتی لە مەسەلەی مامەڵە لەگەڵ ئافرەتداو لێ نیزیککەوتنەوەی، بۆیە خوا ﷻ لەو بوارەدا لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ : ﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ﴿١٨٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانە سنوورەکانی خوان، توخنیان مەکەون، لە بواری مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ ماڵ‌و خێزانی خۆی، لە مانگی ڕەمەزاندا، خوا لەو سیاقەدا دەفەرموێ: ئەوانە سنوورەکانی خوان، توخنیان مەکەون، چونکە هەندێ گوناح کە نزیکی کەوتی، ڕەنگە بچیە نێوی، بەڵام لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ﴿٢٢٩﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەوانە سنوورەکانی خوان، مەیانبەزێنن، هەندێك سنوور دەبێ نەبەزێنرێ، بەڵام هەندێك سنوور واباشە هەر توخنی نەکەوی‌و، لێی نیزیك نەکەویەوە، چونکە ڕەنگە کە لێی نیزیك کەوتیەوە، هێزی کێشندەکەی ڕاتبکێشی‌و لە هی بچووکەوە بەرەو هی گەورە بڕۆی، خوا پەنامان بدات .

<u>فەرمایشتی سێیەم</u>: هەر لەوبارەوە دەربارەی گرنگیی نوێژ، کە لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، لە سیاقی ڕاست ڕاوەستاویی لەسەر جادەی شەریعەت‌و، پشت نەبەستن بە ستەمکاران‌و، دینداریی ڕاست‌و ڕێك

کردن بۆ خوادا، ئەم فەرموودەیە هاتوە: {عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ صَلَّى} {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، برقم: (١٣١٩)، وَحَسَّنَهُ الألباني، فِي سُنَنِ أبي داود)}، واتە: (حُذَيْفَة) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئیشێك نارەحەتی بکردبا، نوێژی دەکرد.

ئنجا لێرەدا ڕستەی: (نوێژی دەکرد) دەگونجێ بە مانای نوێژی زانراوبێ، ئەو خوا پەرستییە تایبەتییەی دەیزانین، دەشگونجێ مەبەست دوعاو پاڕانەوەبێ، کە ئەویش بەشی بنەڕەتییو بنچینەی نوێژە.

<u>فەرمایشتی چوارەم</u>: پێغەمبەر ﷺ لەبارەی کاریگەریی پێنج نوێژە فەرزەکانەوە لە بواری پاککردنەوەو سڕینەوەی مرۆڤ، لە گوناهو تاوانەکانی، واتە: لە گوناهو تاوانە گچکەکان، ڕۆژێك بۆ هاوەڵانی بەڕێزی باسی دەکرد، فەرمووی : {(أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهْرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ، هَلْ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيءٌ؟)، قَالُوا: لاَ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيءٌ ، قَالَ: (فَذَلِكَ مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللهُ بِهِنَّ الخَطَايَا)} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٨٩١١)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٥٠٥)، وَمُسْلِم، برقم: (٦٦٧)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٨٦٨)، وَالنَّسَائِيُّ، برقم: (٤٦٢)، وَالدَّارِمِيُّ، برقم: (١١٨٣)، وَابْنُ حِبانَ، برقم: (١٧٢٦)}.

واتە: ئایا هەواڵم پێبدەن! ئەگەر ڕووبارێك بە پێش دەرگای یەكێكتاندا بێ، شەوو ڕۆژان پێنج جاران خۆی تێدا بشوات، هیچ چڵکی پێوە دەمێنێ؟ گوتیان: لە چڵکەکەی هیچی پێوە نامێنێو خاوێن دەبێتەوە، فەرمووی: ئەوە وێنەی پێنج نوێژە فەرزەکانە، کە خوا گوناهەکانیان پێ دەسڕێتەوەو، خاوەنەکانیان بەو نوێژانە لەو گوناهانە پاك دەکاتەوە.

بە دڵنیایی ئەگەر ئینسان خۆی لە گوناهە گەورەکان بپارێزێ، بچووکەکان بە ئاوی دەست نوێژو بە نوێژو تاعەت دەڕۆن، بەڵام گوناهی گەورە، یان دەبێ سزای شەرعیی دنیایی بەسەردا بچەسپێ، یان دەبێ بە سزای قیامەت پاك بێتەوە، ئەگەر تۆبەیەکی ڕێكو ڕاستو ساغی لێ نەکردبێ، ئەگەرنا تۆبەی ساغو ڕاست، بێگومان هەموو گوناهەکان دەسڕێتەوە.

دیارە پێشتریش باسمکرد کە ئێمە لە سوورەتی (النساء)دا باسێکی تێرو تەسەلمان دەربارەی تۆبە کردوە، تێرو تەسەل لە قەدەر ئەم تەفسیرە، بەڵام لە کتێبی: (گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا، کە تا ئێستا پێنج جاران چاپ کراوەتەوە، لەوێدا باسێکی هەمەلایەنەو گشتگیرمان دەربارەی گەڕانەوە بۆ لای خواو، چۆنیەتی گەڕانەوە بۆ لای خواو، مەرجەکانی گەڕانەوەو، ئەو گوناهانەی کە تۆبەیان لێدەکرێ، گوناهی گەورە چییە؟ گوناهی گچکە چییە؟ بە تەفصیلێ باسمان کردوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەشت (٨) ئایەت پێكدێ، لە ئایەتی: (١١٦ تاكو ١٢٣)، ئەم هەشت ئایەتە دیارە كە هەشت ئایەتی كۆتایی سوورەتی هوودن‌و، پێنج مەبەستی گەورەو گرنگیان تێدان‌و، كراون بە میسكی كۆتایی (مسك الختام)ی ئەم سوورەتە موبارەكە، ئێمەش ئەم پێنج مەبەستە گەورەو گرنگە، لە پێنج بڕگەدا باس دەكەین :

**بڕگەی یەكەم :** خوای كارزان ڕایدەگەیەنێ كە دەبوایە لە نێو گەلانی پێشوودا كەسانێكی خاوەن عەقڵ‌و فەزڵ‌و خێرخواز هەبوونایە، كە ڕێگریان لە خراپەكاریی لە زەمیندا كردبایە، كە هیچ كەسی وا نەبوو لە نێو كۆمەڵگاو گەلە پێشووەكاندا، جگە لە كەمێك لە كەسانی دەرباز بوو، بەڵام ستەمكارەكان لە خۆشگوزەرانیی خۆیاندا، تاوانبارانە بەردەوام بوون لەسەر خراپەو تێكدان، تاكو سەریان بەفەتارەت چوو .

پاشان خوای كاربەجێ ڕایدەگەیەنێ، كە: ناگونجێ كۆمەڵگایە چاكسازیی كارەكان بەهۆی ستەمی هەندێكیان بفەوتێنێ، یاخود ستەمیان لێبكات‌و بیانفەوتێنێ، مادام ئەوان چاكسازیی لە نێوان خۆیاندا بكەن، ئەم بڕگەیە لە ئایەتەكانی: (١١٦ و ١١٧)دا هاتووە.

**بڕگەی دووەم :** ئەگەر پەروەردگارت ویستبای خەڵكی دەكردە یەك كۆمەڵی یەكگرتوو، لەسەر خواپەرستیی‌و چاكەكاریی، بەڵام ویستوویەتی بەهۆی ئیرادەی ئازادانەی خۆیانەوە، جیاوازو جۆراوجۆر بن‌و، سەرەنجام بڕیاری ئەزەلیی خوا، بە پڕكردنی دۆزەخ لە جندو مرۆڤ، واتە: جندو مرۆڤی لادەر لە ڕێی خواو، ناحەز بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)، ئەو هەڕەشەیەی خوا بە

پڕکردنی دۆزەخ لە جندو مرۆڤ بێتەدی، ئەمەش لە ئایەتەکانی : (١١٨ و ١١٩)دا هاتوە.

**بڕگەی سێیەم** : خوای کارزان ﷻ بە پێغەمبەری خاتەمی خۆی موحەممەد ﷺ ڕادەگەیەنێ، کە بەهۆی بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەرانەوە، عەقڵ‌و هۆش‌و دڵ‌و دەروونی دامەزراو دەکات‌و، هەق‌و ئامۆژگاریی بۆ بڕواداران ناردوە، لەم سوورەتە موبارەکەدا، ئەمەش لە ئایەتی (١٢٠)دا هاتوە.

**بڕگەی چوارەم** : پاشان خوا بە پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: بێبڕوایەکان بێمنەت بکە، چیيان لەدەستدێ، با بیکەن‌و، پێیان ڕابگەیەنێ کە: ئەویش لەسەر ئەرکی خۆی بەردەوامەو، با چاوەڕێ بن، ئەویش چاوەڕێیەو، دڵنیاشە کە بەڵێنەکانی خوا دێنەدی بە سەرخستنی پێغەمبەری خاتەم‌و پەیڕەوان‌و بڕوادارانی، کە لە خزمەتی دان‌و لەگەڵیدان‌و، بە لەبەینچوون‌و ڕیسوابوونی ناحەزەکانی، ئەمەش لە ئایەتەکانی: (١٢١ و ١٢٢)دا هاتوە .

**بڕگەی پێنجەم** : خوا ﷻ دوو ڕاستیی هەرە مەزن ڕادەگەیەنێ، کە دەفەرموێ: نادیار لە ئاسمانەکان‌و لە زەویدا، تەنیا خوا دەیزانێ، کاروباریش تەنیا بۆ لای خوا دەگێڕدرێتەوە، پاشان دوو فەرمان بە پێغەمبەری کۆتایی دەکات:

أ/ تەنیا خوا بپەرستە.

ب/ تەنیا پشت بەو ببەستە.

پاشان هەموو لایەك ئاگادار دەکاتەوە، کە خوا بێئاگانیە لەوەی کە دەیکەن، لە چاکەو لە خراپە، هەمووی لەبەرچاوە، هەمووی تۆمار دەکرێ‌و بە هەمووی ئاگادارە، ئەمەش لە ئایەتی (١٢٣)دا هاتوە .

﴿ فَلَوۡلَا كَانَ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِن قَبۡلِكُمۡ أُوْلُواْ بَقِيَّةٖ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡفَسَادِ فِي ٱلۡأَرۡضِ
إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّنۡ أَنجَيۡنَا مِنۡهُمۡۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ
مُجۡرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ
﴿١١٧﴾ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ
رَبُّكَۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمۡۗ وَتَمَّتۡ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ
أَجۡمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلّٗا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ وَجَآءَكَ فِي
هَٰذِهِ ٱلۡحَقُّ وَمَوۡعِظَةٞ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ
مَكَانَتِكُمۡ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُ ٱلۡأَمۡرُ كُلُّهُۥ فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ
﴿١٢٣﴾ ﴾ .

# مانـای وشــە بە وشـەی ئایەتــەکـان

{دەبووایــە لــە سـەدەکانــی (کۆمەڵگایەکـانی) ڕابردووتـانــدا، کەسـانێکی خـاوەن چاکە هـەبوونـایە، کە ڕێگرییـان لە زەویـدا لـە خراپـە کـردبـایە، جگـە لـە کـەمێـك لەوانـەی کە ڕزگارمان کـردن (کـەس نەبـوو)، ئەوانـەی سـتەمیان کـرد، شـوێن ئـەوە کـەوتن کـە تێیـدا خۆشگـوزەران کـرابوون، (هــەر سەرگـەرمــی ڕابـواردن بــوون)و، تـاوانبـار بوون ﴿١١٦﴾ نـاگونجێ پـەروەردگـارت ئـاوەدانییـەکان بە سـتـەم بفـەوتێنێ، لـە حـاڵێکدا خـەڵکـەکەیان چاکسازیـی کـارن ﴿١١٧﴾ ئەگـەر پەروەردگـارت ویسـتبـای هـەموو خـەڵکی دەکردە یـەك کـۆمەڵ، (لەسـەر خواپـەرسـتیی کـۆی دەکـردنەوە)و، بـەردەوام ناکـۆكو جیـاواز دەبـن ﴿١١٨﴾ مەگــەر ئەوانــەی پەروەردگــارت بەزەیــی پێیانــدا هـاتبێتـەوە، (لەســەر هـەق کـۆكو تەبـا بـن)، هـەر بۆ ئـەوەش دروسـتی کـردوون، وشـەو بڕیاری پەروەردگـارت تـەواو بـووە (یەکلایی بۆتـەوەو چەسـپاوە) بە دڵنیـایی دۆزەخ لە جنـدو مرۆڤ تێکـڕایان پـڕ دەکــەم ﴿١١٩﴾ هەرچـی بـۆتی دەگێڕینـەوە لـە بەسەرهاتەکانی پێغەمبەران، عەقـڵو دڵـتی پێ دەچەسپێنیـنو، لـەم (سـووڕەت)ەدا هەقو ئامۆژگارییو بیـرخـەرەوەت بۆ هـاتوە بۆ بڕواداران ﴿١٢٠﴾ بـەوانەی بڕواناهێنـن بڵـێ: چیتـان لەدەسـت دێـت، بیکـەن، ئێمـەش ئەنجامـدەرین (بۆ ئەرکی سـەرشـانمان) ﴿١٢١﴾ چـاوەڕێ بن، ئێمـەش چـاوەڕوانیـن، (بۆ هـاتنــەدی گفـتو بەڵێنەکانی خوا، بە قازانجی ئێمـەو بە زیـانی ئێـوە) ﴿١٢٢﴾ نهێنیـی ئـاسمانەکانو زەوی بەس هی خوایـەو، کاروبـار هـەمووی تەنیـا بۆ لای وی دەگێڕدرێتـەوە، دەجا هـەر ئەو بپەرستـەو پشـتی پـێ ببەسـتەو، پـەروەردگـارت لـەوەی دەیکەن، بێئـاگا نیە ﴿١٢٣﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( فَلَوْلَا ): (لَوْلاَ: أَي: هَلاَّ حَرْفُ تَحْضِيضٍ)، (لَوْلاَ) بە مانای (هلاَّ)یە، كە بۆ هاندان بەكاردەهێنرێ.

( ٱلْقُرُونِ ): كۆی (قَرْن)ە، (جَمْعُ قَرْن : أَهْلُ زَمَانٍ وَاحِدٍ، لأَنَّهُمْ يُقْتَرَنُونَ)، (قَرْن) واتە، خەڵكی ڕۆژگارێك، چونكە هەموویان لەو ڕۆژگارەدا پێكەوە دەبن.

( أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ ): (أُولُوا فَضْلٍ وَعَقْلٍ وَبَصَرٍ، لأَنَّ مِنْ عَادَةِ النَّاسِ أَنَّهُمْ يَسْتَبقُونَ الشيءَ النَّفِيس، وَلاَ يُفَرِّطُونَ فِيهِ)، (أُولُوا) واتە: خاوەن، (بَقِيَّة) واتە: چاكە، جا لێرە یانی: خاوەن عەقڵو بینین، چونكە عادەتی خەڵك وایە، شتی باشو بە نرخ دەهێڵنەوەو، كەمتەرخەمیی لە پاراستنیدا ناكەن، كەواتە: (بَقِيَّةُ النَّاس: سَادَاتُهُمْ وَأَهْلُ الفَضْلِ فِيهم)، واتە: سەرانی خەڵكو، خاوەن چاكەكان لە نێو خەڵكانداو، مشوورخۆرانو دڵسۆزانی خەڵك.

( ٱلْفَسَادِ ) : (فَسَدَ الشيءُ يَفْسُدُ فَساداً، فَهو فَاسِدٌ، وَفَسَدهُ وَأَفْسَدَهُ، فَفَسَدَ، وَالمَفْسَدَةُ ضِدُّ المَصْلَحَة)، (فَسَدَ الشيءُ يَفْسُدُ فَساداً)، واتە: شتەكە خراپ بوو، بەسەرچوو، بەكەڵك نەهات، (فَسَدهُ وَأَفْسَدَهُ) بە (متعدِّي)یش هاتوون، واتە: تێكیدا، تێكدان (مَفْسَدَة) پێچەوانەی (مَصْلَحَة)ە، واتە: بەرژەوەندیی.

( أُتْرِفُواْ فِيهِ ): واتە: تێیدا خۆشگوزەران كرابوون، (إِتْرَاف) واتە: خۆشگوزەرانیی، ڕابواردن، عەیشو نۆش، دەگوترێ: (التَّرَفُ: التَوَسُّعُ فِي النِّعْمَة، يُقَالُ: أُتْرِف فَهو مُتْرَف)، واتە: (أَتْرَفَتْهُ النِّعْمَةُ) واتە: نیعمەتو خۆشیی، یاخیی كرد، (تَرَف) بریتییە لە فراوانیی لە نازو نیعمەتدا، دەگوترێ: (أُتْرِف فُلاَنٌ فَهو مُتْرَف)، ئەو خۆشگوزەران كرابوو، خۆشگوزەرانە .

( مُخْتَلِفِينَ ) : دەگونجێ بە مانای (مُتَنوعِين) یان (مُتَعَدِّدِين)بێ، بەلام لێرەدا بەمانای (مُتَنَازِعِين) دێ، (تَخَالَفُوا وَاخْتَلَفُوا: إِذَا ذَهَبَ كُلُّ إِلى خِلافِ مَا ذَهَبَ إِلَيْهِ الأَخَرُ وَهو ضِدُّ الإِتِّفَاقِ) بە پێی سیاق دەزانین کە لێرەدا (مُخْتَلِفِين)، واتە: پێکەوە ناکۆك، دەگوترێ: (تَخَالَفُوا وَاخْتَلَفُوا) ئەگەر هەر کامێکیان پێچەوانەی ڕای ئەوی دیکەی گرت، هەروەك (شِقَاق) ئەوەیە، هەر کامێکیان لایەك (شق)ی جیا لە (شق)ی ئەوی دیکە بگرێ .

(وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ ): وشەی پەروەردگارت تەواو بووە، دەگوترێ: (تَمَّ الشيء يتِمُّ: تَكَمَّلَتْ أَجْزَاؤُهُ، وَأَتْمَمْتُهُ، وَتَمَّمْتُهُ، وَالإِسْمُ: التَّمَامُ)، (تَمَّ الشيء يَتِمُّ)، واتە: ئەو شتە تەواو بوو، واتە: هەموو پێکهاتەکانی تەواو بوون، (أَتْمَمْتُهُ، وَتَمَّمْتُهُ) هەردووکیان یانی: شتەکەم تەواو کرد، (الإِسْمُ: التَّمَامُ)، واتە: بە تێرو تەواویی و بە چاکیی .

( نَقُصُّ) : (قَصَصْتُ الخَبَرَ: حَدَّثْتُ بِهِ عَلَى وَجْهِهِ، وَالإِسْمُ: قَصَصٌ وَالقِصَّةُ: الشَّأْنُ وَالأَمْرُ: مَا قِصَّتُك؟)، (قَصَصْتُ الخَبَرَ)، واتە: هەواڵەکەم گێڕایەوە، وەك ڕوویدا بوو ئاوا، ناوەکەشی بریتیە لە: (قَصَص)، واتە: گێڕدرانەوە، بەلام (قِصَّة)، بریتیە لە حاڵ، یان بەسەرهاتو چیرۆك، دەگوترێ: (مَا قِصَّتُك) واتە: حاڵت چییە ؟ وەزعت چییە ؟

( فُؤَادَكَ ) : (الفُؤَادُ: أُطْلِقَ عَلَى الإِدْرَاكِ)، لێرەدا (فُؤَاد) مەبەست پێی عەقڵ و هۆشە، دەشگونجێ مەبەست پێی دڵ و دەروون بێ، یاخود هەردووکیانە، چونکە لە ڕاستییدا عەقڵ و هۆشی مرۆڤ، لەگەڵ دڵ و دەروونی، زۆر پێکەوە پەیوەستن .

( مَكَانَتِكُمْ ): واتە: چی پێتان دەکرێ، چی لە دەستتان دێ، (مَكُنَ مَكَانَةً وِزَانُ: ضَخُمَ ضَخَامَةً، عَظُمَ عِنْدَهُ وَارْتَفَعَ، فَهُو مَكِينٌ، وَمَكَّنْتُهُ مِنَ الشيءِ تَمْكِيناً: جَعَلْتُ لَهُ عَلَيْهِ سُلْطَاناً وَقُدْرَةً)، (مَكُنَ مَكَانَةً) لەسەر کێشی (ضَخُمَ ضَخَامَةً)ە، واتە: بە قەلافەت بوو، قەبە بوو، واتە: لەلای مەزن بوو، ئنجا (مَكُنَ مَكَانَةً)،

واتە: لە لای مەزن بوو، یاخود لەلای بەرز بۆوە، لە لای بوو بە خاوەن پێگە، (مَكَّنْتُهُ مِنَ الشيءِ تَمْكِيناً)، واتە: دەسـتەڵاتم بەسەریدا شکاند، وام لێکرد بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە .

## مانـای گـشـتـی ئایـەتەکـان

لەم هەشت ئایەتەی کۆتایی سووڕەتی (هود)دا، خوای پەروەردگار کۆمەڵێک ڕێنمایی بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ شوێنکەوتووانیو، کۆمەڵێک یاسای خوای لە ژیانی بەشەردا دەخاتە ڕوو، سەرەتا دەفەرموێ : ﴿ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ﴾ زانایان دەڵێن: وشەی (لولا)، لێرەدا بە مانای (هَلا)یە، بۆ هاندان، واتە: دەبوایە لە سەدە پێشووەکاندا، لەو سەدانەی کە لە پێشووتاندا بوو ون، کە مەبەست پێی کۆمەڵگایەکانە، کە پێکەوە هاوکاتو هاوزەمان بوون، هاوچەرخ بوون، دەبوایە خاوەن چاکانێک ببوونایە، کەسانێک کە خاوەن عەقڵو دینو چاکەو سیفەتی بەرزو پەسندو سیفەتی هەست کردن بە بەرپرسیارێتیین، ببوونایە، ڕێگرییان کردبایە لە ئاڵۆزییو خراپەکارییو تێکچوون لە زەویدا .

وشەی: ﴿ ٱلْفَسَادِ ﴾، وەك دوایی باسی دەکەین، واتە: تێکچوونی حاڵو بارودۆخی خەڵك، ئنجا چ لە ڕووی فیکرییەوە، چ لە ڕووی عەقیدەییەوە، چ لە ڕووی ئابوورییی، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییو، چ لە ڕووی ئەخلاقییەوە، هەمووی دەگرێتەوە، دەبوایە لە کۆمەڵگا پێشووەکانی ئێوەدا، لە سەدەکانی پێش ئێوەدا، کەسانێك ببوونایە کە خاوەنی عەقڵو دینو چاکە بوونایەو، ڕێگرییان کردبایە لە خراپەکاریی لە زەویدا، ﴿ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ﴾، هیچ کەس نەبووە، جگە لە کەمێك لەوانەی کە ئێمە دەربازمان کردن لەوان، واتە: لەو سەدە پێشووانە، لەو کۆمەڵگایانەی پێش ئێوە، تەنیا کەمێك هەبوون، کە ئەو ئەرکەیان ئەنجامدا، ئەویش ئەوانە بوون کە ئێمە دەربازمان کردن، ئەدی زۆربەی خەڵکەکە چییان لێهات؟ ﴿ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ

ظَلَمُوا۟ مَآ أُتْرِفُوا۟ فِيهِ ﴾، بەڵام ئەوانەی ستەمیان دەکرد، هەر کەوتنە شوێن ئەوەی کە تێیدا خۆشگوزەران کرابوون، واتە: هەر خەریکی عەیش‌و نۆش‌و ڕابواردن بوون، ﴿ وَكَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴾، پێشتریش تاوانبار بوون، بەهۆی ئەو تاوانبار بوونەیانەوە، لەسەر ستەم، لەسەر خۆشگوزەرانیی، خۆشگوزەرانییەك کە بە ماڵی حەڕام، بە سەروەت‌و سامانی حەڕام، بە گەندەڵیی‌و ستەم‌و خراپە، خڕیان کردبۆوە، هەر بەردەوام بوون، وەك کرمە گڵ خۆرکە، سەریان لە عەرزێ نابووو ئاگایان لە خواو خەڵك نەبوو، هەر لەسەر وەزعی خۆیان بەردەوام بوون، تاکو سەرەنجام سەریان بەفەتارەت چووا

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴾، پەروەردگارت ناگونجێ ئاوەدانییەکان بە ستەم لەبەین ببات، واتە: ستەمیان لێبکات‌و بە ستەم لە نێویان بەرێ، لە کاتێکدا خەڵکەکەیان سەرگەرمی چاکسازیی کردنن، یاخود پەروەردگارت بەهۆی ستەمی هەندێك لە خەڵکی ئاوەدانییەکانەوە، لە بەینیان نابات، ئەگەر زۆربەیان خەریکی چاکسازیی بن، بەڵکو دەرفەت‌و بواریان پێدەدات، داخۆ ئایا چاکسازییکارەکان چی دەکەن؟ دەتوانن چاکسازیی‌و پاکسازیی بکەن لە کۆمەڵگاکەیاندا، تاکو هەموویان دەربازبن، یاخود سەرەنجام لابارو لای ستەمکاران‌و خۆشگوزەرانان زاڵ دەبێ‌و، خوا ﷻ بڕیاری کۆتایی دەربارەی ئەو ئاوەدانییە دەدات، کە بەکەڵکی ژیان نەماون‌و دەبێ لەبەین بچن؟!

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، ئەگەر پەروەردگارت ویستبای خەڵکی هەموو دەکردە یەك کۆمەڵ، واتە: یەك کۆمەڵ لەسەر هەق، لەسەر خوا بەیەکگرتن، لەسەر ئیمان‌و تەقوا کۆدەبوونەوە، بەڵام نەیویستوە واتە: نەیویستوە: زۆریان لێبکات، بەڵکو ویستوویەتی ئازادیان بکات، ئنجا کە ئازدیشی کردوون: هەندێکیان ڕوویان لە خوا کردوەو، زۆربەشیان پشتیان لە خوا کردوە، ﴿ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴾، بەردەوامیش بە ناکۆکیی‌و بە ڕاجیایی

دەمێننەوە مادام سەرپشك كرابن، مادام خاوەن ویستێكی ئازاد بن، دیارە هەركامێكیان بە ویستی خۆی ئەو ڕێیە دەگرێتەبەر، كە خۆی پێی خۆشە، بۆیە سەرەنجام ناكۆك دەبنو ڕاجیا دەبن .

لێرەدا (مختَلفِين)، واتە: (مُتَنَازِعِين)، پێكەوە ناكۆك، پێكەوە نەگونجاوو، جیاواز دەبن، نەك بە واتا ئیجابییەكەی، چونكە جاری وا هەیە، جیاوازیی لە بیروڕادا، لە چوارچێوەی ڕەوایەتییدا، شتێكی پەسندە بۆ كۆمەڵگا، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی سەرزەنشت كردنە، ﴿ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ﴾، ئەوانە بەردەوام دووبەرەكیو ناكۆكییان دەبێ، جگە لە كەسانێك كە پەروەردگارت بەزەیی پێیاندا بێ، ئەوانە خوا دەیانپارێزێ لە ناكۆكییو دووبەرەكیی بێجێو، دەیانكاتە ئەهلی ئیمانو تەقواو لەسەر خوا بەیەكگرتن كۆیان دەكاتەوە، ﴿ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ﴾، هەر بۆ ئەوەش دروستی كردوون، كە بەو شێوەیە ئازاد بن، جیاوازبن، ڕای جیا جیایان هەبێو، لە توانایاندا هەبێ ڕاست برۆن، چەوت برۆن، لابدەن، ڕێك بن، خوا بۆ ئەوە دروستی كردوون .

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (أي: وَللرَحْمَةِ خَلَقَهُم)، خوا بۆ ڕەحم پێكرانیان دروستی كردوون، بەڵام ئەگەر وابووایە، خوا مرۆڤەكانی بۆ ئەوە خوڵقاندبان، كە بە زۆر وایان لێبكات، هەر شایستەی بەزەیی خوابن، دیارە ئەوكاتە كەس لای نەدەدا، بەڵام ئەوەی كە ئێستا ئێمە لە واقیعی ژیانی بەشەردا دەیبینین، بریتیە لە ناكۆكییو دووبەرەكییو ڕاجیایی، ڕێی ڕاستو چەوت گرتن، ئا ئەوە بەرجەستە بووە، لە ژیانی مرۆڤدا، كەواتە: ئەوەی كە هاتۆتەدی، ئەوە ئەو ئامانجەیە، كە خوا مرۆڤی بۆ خوڵقاندوەو، هەر ئەوەش هاتۆتەدی .

دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾، وشەی پەروەردگارت تەواو بووە، واتە: بڕیاری یەكجارەكی داوە، كە فەرموویەتی: دۆزەخ لە جندو لە مرۆڤ لە تێكڕایان پڕ دەكەم، كەواتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ! یان ئەو كەسەی كە بە ڕێگای پێغەمبەردا دەڕوات! یان ئەی ئیماندارینە! كە دەبینن كەسانێك هەرچەندە بەڵگەیان بۆ دەهێنرێتەوەو

بەرچاویان روون دەکرێتەوە، بەڵام هەر رێی راست ناگرن، ئەوە بزانن کە بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپیوە بە پێی یاسای خوا، دەبێ ئەوانە بچنە دۆزەخ، ئنجا ئایا یاسای خوا دەفەرموێ چی؟ یاسای خوا دەفەرموێ: هەر کەسێك هیدایەتی خوا رەت بکاتەوەو، بە ویستی ئازادانەی خۆی رێی چەوت بگرێو، رێی خراپەکارییو تاوانباریی بگرێتەبەر، سەرەنجام، بەرەو دۆزەخ دەچێ، ئەوە بەپێی سیستەمێكو یاسایەك كە خوا لە ژیانی مرۆڤدا دایناوە، کە یاسایەکی زۆر دادگەرانەیە، فەرموو مرۆڤ ! ئەوە رێی راست، رێی راست بگرە! نەخێر هەر رێی چەوت دەگرم، دەی باشە تۆ بۆ تاقیکردنەوە دروستکراوی، رێی چەوت دەگری، بڕۆ، بەڵام خوا پێی ناخۆشەو، سەرەنجام دەچیە دۆزەخ! نەخێر، بچمە هەر شوێنێك، هەر ئەو رێیە دەگرمو رێی هیدایەت ناگرم .

ئنجا بەپێی بڕیاری خوا: هەر کەسێك هیدایەتی خوا رەت بکاتەوەو، دان بە هەقدا نەهێنێو نکووڵیی لێ بکاتو، رێی چەوت بگرێ، سەرەنجامەکەی بەرەو دۆزەخە.

دوایی خوا روو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، پێی دەفەرموێ: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ﴾، هەر کامێك لە بەسەرهاتی پێغەمبەرانو هەواڵی پێغەمبەران کە بەسەر تۆیدا دەخوێنینەوە، عەقڵو دڵی تۆی پێ دەچەسپێنین، واتە: لە نێو عەقڵی تۆدا دەیچەسپێنینو، دڵی تۆی پێ چەسپاو دامەزراو دەکەین، چونکە لەم سوورەتەدا، وەك پێشتر باسمان کرد، بەسەرهاتی حەوت (٧) لە پێغەمبەران گێڕدراوەتەوە، کە بریتین لە: (نووحو هوودو صاڵحو ئیبراهیمو لووطو شوعەیبو مووسا) سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، لەگەڵ گەلەکانیاندا، یان لەگەڵ نەیارەکانیاندا، ئنجا وەك باسمان کرد: لە بەسەرهاتی هەرکام لەو پێغەمبەرانە لەگەڵ گەلەکانیاندا، پەندو دەرسو عیبرەت هەیەو، مایەی دامەزراوییو نەلەخشاویی هەیە، بۆیە دەفەرموێ : ﴿ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، لەم سوورەتەدا هەق بۆ تۆ هاتووە، ئامۆژگارییو، بیرخستنەوە بۆ بڕواداران.

ئنجا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴾، بەوانەی بڕوا ناهێنن، بڵێ: ئێوە چیتان لەدەست دێ بیکەن، درێغیی مەکەن، چی پێتان دەکرێ، بیکەن، ئێمەش ئەنجامدەرو بکەری ئەوەین، کە پێویستە ئەنجامی بدەین، کە ئەرکی شەرعیی سەرشانی خۆمانە، بەرانبەر بە ئێوە، کە بریتیە لە خۆڕاگریی لە بەرانبەرتانداو، لە گەیاندنی پەیانی خوا بە ئێوە، بەردەوام بوون لەسەر ئەرکی شەرعیی خۆمان، ﴿ وَٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴾، ئێوە چاوەڕێ بن، ئێمەش چاوەڕێین .

کە ئەمە دەکاتە ئەوپەڕی لە خۆ دڵنیا بەخۆبوونو، پشت ئەستوور بوون بە بەرنامەو پەیامی خۆت، کە بە بەرچاوڕوونییەوە دەڕۆیو سەرەنجامی خۆت لێ دیارەو، سەرەنجامی نەیارەکانیشت لێ دیارە، ئێوە چاوەڕێ بن، ئێمەش چاوەڕێین، ئنجا با بزانین سەرەنجاممان چۆن دەبێ ؟!

کە لە ڕاستییدا سەرەنجامیش هەر بەو شێوەیە بوو، کە خوا فەرموویەتیو، پێغەمبەر ﷺ بە بێبڕوایەکانی گوتوە: ئەگەر بێتو لەسەر ئەوەی کە لەسەری دەڕۆن، بەردەوام بن، سەرەنجامێکی شوومو خراپتان دەبێ، هەم لە دنیادا، هەم لە دواڕۆژدا، وە بۆ ئیماندارانیش سەرەنجامێکی باش چاوەڕێیە، هەم لە دنیادا کە سەرکەوتنو زاڵ بوونەو، هەم لە دواڕۆژیشدا، کە سەرفرازییو ڕوو سوورییە، لە بەرانبەر خواو خەڵکدا .

لە کۆتاییی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ ﴾، نهێنیی ئاسمانەکانو زەوی هەر هی خوایە، هەر خوا نهێنیی دەزانێ، هەر خوا نهێنییەکانو پەنهان دەزانێو، هەموو کاروبارێك هەر بۆ لای وی دەگێڕدرێتەوە، ﴿ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ﴾، ئنجا هەر ئەو بپەرستەو پشت هەر بەو ببەستە، ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، بێگومان پەروەردگارت لەوەی کە ئێوە دەیکەن، بێئاگا نیە، یاخود (عَمَّا يَعْمَلُونَ)، چونکە بەو شێوەیەش

خوێنراوەتەوە، خوا لەوەی کە بێبڕوایەکان و نەیارەکانتان دەیکەن، بێئاگا نیە، بەڵکو هەموو شتێکی لێ دیارەو، هەموو شتێکی بۆ زانراوەو پێی ئاگادارە، وردو درشتی، پەنهان و ئاشکرای هەموو شتەکان، بۆ خوای پەنهانزان زانراوەو ئاشکرایە .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :**

## جگە لە کەمێکی خاوەن چاکە، هیچ کەس لە نێو کۆمەڵگا پێشووەکاندا نەبوو، ڕێگریی لە خراپە بکات:

خوا فەرموویەتی : ﴿ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ وَكَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ ﴾ .

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە حەوت (٧) برگەدا:**

**برگەی یەکەم** : ﴿ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ ﴾: دەبووایە لەو سەدانەی کە لە پێش ئێوەدان، ببووایە، (لَوْلاَ: حَرْفُ تَحْضِيضٍ)، وەك پێشتریش باسمان کرد، لێرەدا (لَوْلاَ) بۆ هاندان بەکاردێ، هەڵبەتە لە شوێنی دیکەدا (لَوْلاَ) مانای دیکەی هەیە، بە مانای (حَرْفُ امْتِنَاعٍ لوجود) وەك دەگوترێ: (لَوْلاَ زَيْد، لَهَلَكَ عَمْرو) واتە: ئەگەر زەید نەبووایە، عەمرٍ دەفەوتا، کەواتە: عەمرٍ نەفەوتاوە، لەبەرئەوەی زەید هەبووە .

ئنجا لێرەدا ﴿ الْقُرُونِ ﴾، کۆی (قَرْن)ە، (قَرْن) کە بە ماوەیەك لە کات دەگوترێو، بە کۆمەڵگایەکیش دەگوترێ: کە پێکەوە هاوچەرخن، چونکە هەموویان لە یەك کاتدا پێکەوەن .

کەواتە لێرەدا ﴿ٱلْقُرُونِ﴾، واتە: (المُجْتَمَعَات)، ئاوەدانییەکان، کۆمەڵگایەکان، دەبووایە لە نێو کۆمەڵگایەکانی پێش ئێوەدا ببووایە، چی ببووایە ؟

**برگەی دووەم :** ﴿أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ﴾: خاوەنی ماوە، خاوەنی شتێکی جێهێڵراو، شتێك کە پاشەکەوت کراوە، شتێك کە دەستی پێوە گیراوە، دەڵێ: (البَقِيَّةُ: الفَضْلُ والخَيْرُ وَأُطْلِقَ عَلَى الفَضْلِ وَالخَيْرِ: البَقِيَّة، كِنَايَةً، فَسَارَت مَسْرَى الأَمْثَالِ، لأَنَّ الشيءَ النَّفِيسَ لاَ يُفَرِّط فِيهِ صَاحِبُهُ، وَمِنْ عَادَةِ النَّاسِ أَنَّهُمْ يَسْتَبْقُونَ مِنَ الأَشْيَاءِ مَا يُحِبُّونَهُ، وَمِنَ الأَمْثَال: فِي الزوايا خَبَايَا، وَفِي الرِّجَالِ بقَايَا)، وشەی (بَقِيَّة)، واتە: شتێك کە ماوەتەوە، هەڵگیراوە پاشەکەوت کراوە لێرەدا دەڵێ: وشەی: ﴿بَقِيَّةٍ﴾، بە شتی چاك و پەسند، لێکدراوەتەوە کەواتە: ﴿أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ﴾، واتە، خاوەن چاکەو پەسندیی، بۆیەش بە چاکەو پەسندیی، گوتراوە وەك کینایە، کە دوایی وەك مەسەلی لێهاتوە، لەبەرچی وای پێگوتراوە؟ چونکە شتی بە نرخ و باش، خاوەنەکەی کەمتەرخەمیی تێدا ناکات و، دەستی پێوە دەگرێ و، خەڵك عادەتیان وایە شتە باشەکان خۆشیان دەوێن و دەیانهێڵنەوە، لەدەست خۆیان نادەن و، لە پەندیدا هاتوە: (فِي الزَّوَايَا خَبَايَا)، واتە: لە گۆشەو کەنارانیدا، شتی شێردراوەی چاك هەیە، (وَفِي الرِّجَال بَقَايَا)و، لە نێو پیاوانیشدا کەسانێك هەن، کە ماون، واتە: کەسانی چاك .

بە بۆچوونی هەندێك لە زانایان: ﴿أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ﴾، واتە: (أَصْحَاب فَضْلٍ وَدِينٍ وَعِلْم بالشَّرِيعَة)، یانی: ئەوانەی کە خاوەن چاکەو دینن و خاوەن زانیاریین بە شەریعەت.

بەڵام لە ڕاستییدا چەمکەکەی زۆر لەوە فراوانترە، ﴿أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ﴾، یانی: خاوەنی چاکە، خاوەنی سیفەتی بەرز، خاوەنی هەستکردن بە بەرپرسیارێتیی بەرانبەر بە کۆمەڵگا، بەرانبەر بە خوا ﷻ.

**بڕگەی سێیەم :** ئنجا ئەگەر لە نێو کۆمەڵگا پێشووەکانتاندا، کەسانێکی خاوەن چاکە ببوونایە، چییان کردبایە؟ ﴿يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ﴾: ڕێگرییان کردبایە لە خراپەکاریی لە زەوی دا.

﴿ٱلْفَسَادِ﴾، دەڵێ: (الفَسادُ: المَعَاصِي وَالإنْحِرَافَات وَاختِلاَل أحوَال النَّاس)، (فَساد)، یانی: گوناهو لادانو تێکچوونی کاروباری خەڵكو پشێویی و ئاڵۆزیی و لادان، ئنجا کە دەفەرموێ: دەبووایە ڕێگرییان کردبایە، لە (فَساد)، یانی: ڕێگرییان کردبایە لە تێکچوونی حاڵو باڵی خەڵك، لە ڕووی عەقیدەیی و فیکرییەوە، لە ڕووی پەرستنەکانیانەوە، لە ڕووی ڕەوشتو ئاکاریانەوە، لە ڕووی باری کۆمەڵایەتییەوە، لە ڕووی بارودۆخی ئابوورییەوە، کە قڕیی و پڕویی چینایەتیی نەبێ، لە ڕووی سیاسییەوە کە قۆرخکاریی و خۆ فەرز کردن نەبێ، هەروەها لە هەموو ڕووەکانەوە، دەبووایە ڕێگریی بکەن، بۆ تێکنەچوونی کۆمەڵگا، لە هەموو بوارەکاندا .

**بڕگەی چوارەم :** ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾: واتە: هیچ کەس نەبوو لە کۆمەڵگا پێشووەکاندا کە بەو ئەرکە هەڵسێ، بە ئەرکی پاکسازیی و ڕێگرتن لە تێکچوونی ژیانی کۆمەڵگا لە زەویدا، مەگەر کەمێك لەوانەی ئێمە دەربازمان کردن.

زانایانی شارەزای زمانی عەرەبیی دەڵێن: (الإستثناءُ: إسْتِثناءٌ مُنْقَطِع)، چونکە ئەو کەمەی کە ڕێگرییان کردوە لە خراپەکاریی، جیابوون لەو زۆرەی کە بێ هەڵوێست بوون، کە مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە: (لكن قَلِيلاً مِنَ المُجْتَمِعَات الَّتِي أَنْجِيناهُمْ، قامُوا بالنَّهِي عَنِ الفَسادِ، فَكانَ هَذا سَبَباً فِي نجاة مجتمعاتهم مِنَ الهَلاَك)، واتە: بەڵام کەمێك لەو کۆمەڵگایانەی کە ئێمە دەربازمان کردن، هەڵسان لە نێو خۆیاندا بە ئەرکی ڕێگریی کردن لە خراپەکاریی، ئنجا لەبەر ئەوەی کە بەو جۆرە ئەرکە هەڵساون، ئەو جۆرە کۆمەڵگایانە، دەرباز بوونو ڕزگار بوون .

وەك چۆن خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (یونس)دا، باسی یونس دەكات، دەفەرمـــــوێ : ﴿فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ۝٩٨﴾، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا باسمان كرد.

كەواتە: كەمێك لەو كۆمەڵگایانەی كە لە نێو خۆیاندا، بە ئەركی پاكسازیی‌و ڕێگریی لە فەسادو خراپە هەڵساون، ئەو كۆمەڵگایانە ڕزگار بوون، ئەمە واتایەكی.

واتایەكی دی: ئەو كەمەی كە لە نێو كۆمەڵگایەكاندا، بەو ئەركە هەڵساون، ئەو كەمە دەرباز بوون.

كەواتە :

١) دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ كە ئەو كۆمەڵگا كەمانەی، لە نێو خۆیاندا هەڵسان بە ئەركی ڕێگریی لە فەسادو خراپە، ئەو كۆمەڵگایانە دەرباز بوون .

٢) واتایەكی دی ئەوەیە: كە كەمێك لەو خەڵكەی هەڵسان بە ئەركی پاكسازیی‌و چاكسازیی‌و ڕێگریی كردن لە تێكچوون‌و فەساد، ئەو كەمە كە بەو ئەركە هەڵسان، هەم لە دنیادا، هەم لە دوارۆژدا، دەربازو سەرفراز بوون، بەڵام ئەوانی دیكە، واتە: باقی كۆمەڵگایەكە، كە هەر لەسەر خراپە بەردوام بوون، ئەوان چارەنووسێكی ڕەش‌و خراپیان هەبوو .

**بڕگەی پێنجەم** : ﴿وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ﴾: ئەوانەی كە ستەمیان كردبوو، كەوتنە شوێن، ئەوەی تێیدا خۆشگوزەران كرابوون، واتە: زۆربەیان كە نە ڕێگرییان كردو، نە دەستیشیان لە خراپەكاریی هەڵگرت، سەرەنجام ئەوە بوو كە كەوتنە شوێن، خۆشگوزەرانیی .

**بڕگەی شەشەم** : ﴿مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ﴾، ئەوانە كەوتنە شوێن ئەوەی تێیدا خۆشگوزەران بوون، (التَّرَفُ: التَوَسُّعُ فِي النِّعْمة، أُتْرِف فَهو مُتْرَف)، (مُتْرَفْ)،

واتە: خۆشگوزەران کراو، کەسێك کە هەر خەریکی ڕابواردنو عەیشو نۆش بێ، مانای ئەمە ئاوای لێدێ: (أي: إنقطعوا إلى التنعّم والتلذّذ الحرام)، واتە: خۆیان دابڕی هەر سەرگەرمی خۆشگوزەرانیی حەڕام بوون .

بڕگەی حەوتەم : ﴿وَكَانُواْ مُجْرِمِينَ﴾، پێشتریش تاوانبار بوون، کەواتە: بەهۆی تاوانبارییانەوە، شوێن عەیشو نۆشو ڕابواردنی حەڕام کەوتنو، بەدوای دینی خواو پێغەمبەران صەلاّتو سەلامی خوایان لەسەربێ، نەکەوتن.

لێرەدا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە: هەر کەسێك، هەر حیزبێك، هەر ڕژێمێك، هەر هۆزو بنەماڵەیەك، هەر لایەنێك، بوونی خۆی، بوونی دەوروبەری خۆی، لەسەر ستەمو ناشەرعییو تاوانو خراپە، بنیات نابێو هەڵچنیبێ، دەست لەو تاوانو ستەمەو خراپەیە هەڵناگرێ، بۆچی؟ زۆرجاران گوتوومە: (هَؤلاء إذَا أصْلَحُوا سَقَطوا)، ئەوانە ئەگەر چاکسازیی بکەن، دەڕووخێن، چونکە لایەنێك بوونەکەی لەسەر ستەم بنیات نرابێ، چۆن دەتوانێ دەست لە ستەم هەڵبگرێ؟ دەست لە گەندەڵییو فۆڕخکاریی هەڵبگرێ؟ ئەو خەڵکەی بە زەبری دەستەڵاتو پارەو تەماع، زار چەور کردنو، بە زەبری ڕاگەیاندنی چەواشەکارانە، بە دەوری خۆیەوە کۆکردۆتەوە، کەواتە: ئەگەر دەست لەو سەروەتو سامانە حەرامە، لەو دەسەڵاتە فۆڕخکراوە، لەو ڕاگەیاندنە چەواشەکەرە، هەڵبگرێ، دەڕووخێ، کەواتە: زۆر کەس کە باسی مافی مرۆڤو دادگەرییو چیو چی دەکات، بێگومان بە ڕاستی نیە، چونکە بە پێچەوانەوە: دەزانێ ئەگەر مرۆڤەکان وەك مرۆڤ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێو، خەڵك هەمووی ئازادو سەربەست بێو، زەختو فشاری لێ نەکرێو، هەوڵنەدرێ بگەوجێنرێ، نەفام بکرێو، هەوڵنەدرێ ئیرادەی لێ زەوت بکرێ، خەڵك ئەگەر ئازادو سەربەست بێو، هەست بە ڕێزو ئیرادەو کەرامەتی خۆی بکات، ناچێتە ژێر نیری ئەوانەوەو کۆڵو باری وان ناخاتە سەر شانی خۆیو، هەست بە ئیرادەو ڕێزی خۆی دەکات، وە دەڵێ: تۆ چیو من چیم؟ هەمووومان بەندەی خواین!

ئنجا هەر بۆیە ستەمکارەکانو خۆ فەرزکارەکانو خۆسەپێنەکان، کەیفیان بەو جۆرە خەڵکە نایەت، بۆیە لە ڕێگای زەختو زۆری سیاسییو،

لە ڕێی چەوسانەوەی ئابووریی‌و، لە ڕێی چەواشەکاریی ڕاگەیاندن‌و ئیعلامییەوە، دەیانەوێ خەڵك لەو واقیعە ناشەرعییەدا بمێننەوە، بۆ ئەوەی کە ئەو بەزم‌و بازاڕەی کە لەسەر بناغە ستەمکاریی پێکیانەوە ناوە، بەردەوام بێ .

هەروەها ئەم ئایەتە بە پێزە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە هەمیشە چاکسازییکاران، کەمینەن‌و، ناحەزانیشیان، زۆرینەن، ناحەزانیشیان خوای زاناو شارەزا ئەم وشانەی بۆ بەکارهێناون: (ظلم، فساد، إتراف، إجرام)، ستەم، تێکدان، خۆشگوزەرانیی، تاوانباریی، یانی: ئەم وشانە ئاوێنەیەکن، هەر کەسێك دەتوانێ دەوروبەری خۆی لە ئاوێنەی ئەم وشانەدا زۆر چاك ببینێ‌و، ئەو کەسانە بناسێ کە دەیانەوێ کۆمەڵگا بە تێکدراویی‌و گەندەڵیی‌و خراپەو ستەمەوە بمێنێتەوە .

لە سووڕەتی (الإسراء)یشدا، خوای پەروەردگار ئاماژەی بەو ڕاستییە کردوە، دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ ﴾، هەر کاتێك ویستمان ئاوەدانییەك بفەوتێنین، فەرمان دەکەین بە خۆشگوزانەکانیان، (واتە: فەرمانیان پێ دەکەین بە چاکە) ئەوانیش لادانی تێدا دەکەن، خراپەی تێدا دەکەن، ئیدی بڕیاری (خوای) لەسەر دێتەدی‌و سەرەنجام کاولی دەکەین .

لە سووڕەتی (القصص)یشدا، لەوبارەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ۖ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتە: زۆرمان ئاوەدانیی وا لەبەین بردن، کە لە ژیانیاندا تووشی یاخیی بوون‌و لە خۆبایی بوون‌و ستەم‌و خراپە بوو بوون، ئەوە ماڵ‌و خانووەکانیانن، لە دوای وان کەمێك نەبێ، کەس تێیاندا نیشتەجێ نەبووو، هەر ئێمە بووینە میراتگری ئەوان .

وشەی (بَطِرَتْ): (البَطَرُ: الأشَر، وَهو شِدَّةُ المَرَحِ، وَبابُهُ طَرِبَ، وَأبْطَرَهُ المالُ، يُقَالُ: بَطِرْتَ عَيْشَكَ، كَما قالُوا: رَشِدْتَ أمْرَكَ)، (بَطَرْ) واتە: لە خۆبایی بوون، یاخود زۆر دڵخۆش بوون، وەك (طرب) هاتوە، (أبْطَرَهُ المالُ) ماڵو سامانەکەی یاخی کرد، لە کەوڵی خۆی دەریچوواند، دەگوترێ: (بَطِرْتَ عَيْشَكَ)، واتە: تۆ ژیانەکەت وا لێکرد، هەروەك چۆن دەڵێن: (رَشِدْتَ أمْرَكَ)، واتە: تۆ کاروباری خۆت سەرڕاست کردوە، کە لە ڕاستییدا کاروبارەکەت تۆ سەرڕاست دەکاتو، ژیانەکە ئەو یاخی دەکات، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا ئەو تەعبیرە بەو شێوەیەش بەکاردێ .

**مەسەلەی دووەم :**

## ناگونجێ خوای دادگەر بە ستەم، ئاوەدانییەکان بفەوتێنێ لە حاڵێکدا بە چاکسازیی هەڵدەستن:

خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾ ﴾.

(الإهْلاَكُ: الهَلاك العَاجِلُ الحَالّ بِهِم فِي غَيْرِ وَقْت حُلُول أمْثَالِهِ، دُونَ الإهْلاَكِ المَكْتُوبِ عَلَى جَمِيعِ الأُمَم، وَهو فَنَاءُ أمة وَقِيام أُخرى فِي مُدَد مَعْلُومَة، حَسَب سُنَن مَعْلُومَة)(١)، واتە: لێرەدا مەبەست لە (إهلاك) واتە: لەبەینبردنی بە پەلەی کە بەسەریاندێ، جیا لەوەی کە بەسەر هاووێنەکانیان دێ، کە سەرەنجام هەموو کۆمەڵگاکان دەفەوتێنو، هەموو ئاوەدانییەکان لەبەین دەچن، کۆمەڵگایەك لەبەین دەچێ، کۆمەڵگایەکی دیکە دەچێتە شوێنی، ئەوە یاسای خوایە بەگشتی لە ژیانی بەشەردا، ئەوە هەر دەبێ، بەڵکو مەبەست لەو لەبەینچوونە، ئەوەیە کە بەڵای ناگەهانیان بۆ دێ، لە کاتێکی چاوەڕوان نەکراودا، نەك بە شێوەی سروشتیی خۆیان، لەبەین بچن .

---

١) التحرير والتنور، ج ١٢، ص ١٧٨.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴾، یانی: هەر لە بنەڕەتدا شتی وا گونجاو نیە، وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، واتە: ئەسڵەن ئەوە هەرناگونجێ شتی وا ببێ، ناگونجێ خوا کۆمەڵگایەك بفەوتێنێو لەبەینبەرێ، لە حاڵێکدا کە هەڵدەستن بە چاکسازیی.

بەگشتی زانایان زۆریان قسەیان لەوبارەوە کردوە، کە ئایا مەبەست لەوە چییە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ ﴾، ئایا وشەی: ﴿ بِظُلْمٍ ﴾، مەبەست پێی چییە؟ سێ واتای بۆ لێکدراونەوە:

یەك: واتە: ستەمیان لێناکات، کە بیانفەوتێنێ، مادام چاکسازیی کاربن، ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ ﴾، واتە: پەروەردگارت ستەم ناکات لە ئاوەدانییەکان بیانفەوتێنێ، لە کاتێکدا کە ئەوان چاکسازیی کارن.

دوو: واتە: خوا بەهۆی کوفرو شیرکەوە، کۆمەڵگایەکان نافەوتێنێ، مادام لەنێو خۆیاندا دادگەریی‌و چاکسازیی بەرپا بکەن، کە لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە گێڕدراوەتەوە، {عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه، أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ تَفسيرِ هَذِهِ الآيَةِ فَقَالَ : وَأَهْلُهَا يُنْصِفُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً} {أَخرجَهُ الطبَرَانِيُّ فِي معجمه الكبير، برقم: (٢٢٨١)، وَأَبو الشيخ وَابْنُ مَرْدَوِيه، وَالدَّيْلَمِيُّ}.

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی مانای ئەم ئایەتەوە پرسیاری لێکرا، ئەویش فەرمووی: لە کاتێك دا کە خەڵکی ئەو ئاوەدانیی‌و کۆمەڵگایانە، هەندێکیان هەقی هەندێکیان دەدەن‌و، لەگەڵ یەکداو لەنێو خۆیاندا دادگەر دەبن.

واتە: با بەینیشیان لەگەڵ خوا تەواو نەبووبێ، بەهۆی شیرك‌و کوفرەوە، ئەگەر لە بەینی خۆیاندا باش بووبن، خوا نەیفەوتاندوون، ئەمەش واقیعی مێژووی بەشەر پێشانی دەدات، کە خوای دادگەر کۆمەڵگایەکان

بەهۆی زوڵمەوە، دەفەوتێنێ، نەك بەهۆی کوفرو شیرکەوە، ئێستاش لە سەرتاسەری دنیادا، دەوڵەتانی کافرو دەوڵەتانی بتپەرست دەبینین، ژیانیان زۆر چاك بەڕێوە دەچێ، بۆچی؟ چونکە خۆیان دوور گرتوە لە زوڵم لە یەکدی کردن، هەڵبەتە زوڵم کەمو زۆر هەیە، بەڵام جۆرێك لە دادگەریی یان لەنێو خۆیاندا بەرقرار کردوەو، بەهۆی ئەوەوە ژیانیان بەردەوامە، چونکە خوای کاربەجێ سوننەتی وایە، یاسای وایە لە ژیانی بەشەردا، کە سزای کوفرو شیرك هەڵدەگرێ بۆ دواڕۆژ، بەڵام زوڵم بە زۆریی وایە، خوای تۆڵەستێن هەر لە دنیادا سزای ستەمکاران دەدات، لەبەرئەوەی بەهۆی ستەمەوە کۆمەڵگایەکان تێکدەچن، بەڵام بەهۆی کوفرو شیرکەوە، مرۆڤەکان دەتوانن بەیەکەوە بژین، بە کوفرو ئیمانەوە، بە شیرك‌و تەوحیدەوە پێکەوە دەژین، بەڵام کە هەندێك بوونە ستەمکار، ئەوانی دیکە دەبن بە ستەملێکراو، شیرازەی کۆمەڵگا تێکدەچێ، هاوسەنگیی کۆمەڵگا تێکدەچێ‌و، بە پێی یاسای خوا، سزای خوایان بۆ دێ‌و ئەو کۆمەڵگایە دەفەوتێ .

سێ: واتە: بەهۆی ستەمێکی کەم لە بەشێکیانەوە، لە حاڵێکدا کە زۆربەیان چاکسازییکارن، یانی: خوا کۆمەڵگایەکان نافەوتێنێ، کە هەندێکیان ستەم دەکەن، بەڵام زۆربەیان چاکسازییکارن، خوا ئەو جۆرە کۆمەڵگایانە نافەوتێنێ، دەشگونجێ لە یەك کاتدا، هەر کام لەم سێ واتایە، مەبەست بن.

**مەسەلەی سێیەم :**

**ئەگەر پەروەردگار ویستبای خەڵکی دەکردە یەك کۆمەڵ، بەلام نەیویستوە، زۆریان لێبکاتو، سەرەنجام بەهۆی ئازادکرانیانەوە، جیاوازو ناکۆك بوون:**

خوا دەفەرموێ : ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە لە شەش (٦) برگەدا:**

**برگەی یەکەم :** ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾، ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، خەڵکی دەکردە یەك کۆمەڵ.

(الأُمـة: كُلُّ مَجْمُوعَـةٍ مُجْتَمِعَةٍ عَلَى شَيءٍ)، هەر کۆمەڵە خەڵکێکە لەسەر شتێك کۆببێتەوە .

لێرەدا ئەگەر بەپێی ئەو پێناسەیە بێ، ئایا ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ، ئێستا بە ئوممەت لە قەڵەم دەدرێ؟ مەگەر لەبەرئەوەی کە ئینتمایان بۆ قورئانو سوننەت بەگشتیو، ئینتمایان بۆ ئیسلام هەیە بەگشتی، ئەگەرنا لە ڕاستییدا هەر یەکە سیاسەتێك دەکات، هەر یەکە بۆچوونێك وەردەگرێ، هەر یەکە دروشمێکی بەرز کردۆتەوە، ئێستا تەنیا وەك یەك ئوممەت ناچن، ئەگەرنا وەك هەموو شتێك دەچن، بەداخەوە ... !

کەواتە : ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، خەڵکی دەکردە یەك کۆمەڵ، واتە: وەك فریشتانی

لێدەکردن، کە هەموویان بەس خوا دەپەرستن و، هیچیان سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناکەن.

یاخود وەك پەلەوەرو زیندەوەرو ئاژەڵانی لێدەکردن، کە بە حوکمی غەریزە جووڵابانەوە نەك بە حوکمی عەقڵ و ئیرادەی سەربەست و ئازادانەی خۆیان، کە هەریەکەی بە ڕێیەکدا بڕوات، بەڵام خوا نەیویستوە خەڵك یەك جۆر بکات، نە وەك فریشتانیان لێبکات، نەوەك پەلەوەرو، نەوەك ئاژەڵ و زیندەوەران، وەك هەنگ و مێروولە، کە هەموویان بە یەك شێوە دەژین، بەڵکو خوا ویستی وابووە، مرۆڤێك دروست بکات کە جیاوازو ناوازە بێ، لە دروستکراوەکانی دی، لە چیدا؟ لەوەدا کە بە ئیرادەی ئازادانەی خۆی، بە ویستی خۆی بە ڕێدا بڕوات، نەك بە شێوەیەك کە خوای پەروەردگار بۆی داناوەو، نەتوانێ لێی لابدات، چونکە خوا مرۆڤی داناوە تاقی بکاتەوە لەسەر ئەم زەوییەو، ئەمانەتی خوا هەڵبگرێ و، بیکاتە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، ئەمەش بەبێ ئیرادەو ویستی ئازاد مەیسەر نابێ .

بڕگەی دووەم : ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾، بەردەوام ئیختیلافیان دەبێ، ﴿مُخْتَلِفِينَ﴾، دەڵێ: (متنازعين)، ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾، واتە: ئێوە بەردەوام ناکۆك دەبن، پێکەوە ناتەبا دەبن، دەگوترێ: (تَخَالَفُوا وَاخْتَلَفُوا: إِذَا ذَهَبَ كُلٌّ إِلَى خِلَافِ مَا ذَهَبَ إِلَيْهِ الآخَر، وَهُو ضِدُّ الإِتِّفَاقِ)، (تَخَالَفُوا وَاخْتَلَفُوا)، واتە: هەرکامێکیان ڕێیەکی گرت، بە پێچەوانەی ئەوەی دیکە، کە (إختلاف)، دژی (إتِّفَاق)ە، (إختلاف) واتە: ناکۆك و ناتەباو، (إتفاق)، واتە: کۆك و تەبا .

ئنجا بۆچی وایان لێهاتوە؟ دیارە بە حوکم ویستی ئازادو سەربەخۆیان جیاوازو جۆراو جۆرو ناکۆك دەبن، خۆ ئەگەر هەموویان بە حوکمی غەریزە بەڕێوەچووبان، وەك ئاژەڵ و دڕندەو پەلەوەرو زیندەوەران، یان بە حوکی ئەوە کە خوا وای خوڵقاندوونەو، ئەو سروشتە پاکەیان هەیە، وەك فریشتان، ئەو کاتە وەك یەك کۆمەڵ دەبوون، بەڵام ئێستا خوا ویستوویەتی:

وەك چۆن كە فریشتە هەن، سەرپێچیی خوا ناكەن، شەیتانەكان هەن، كە بە هیچ جۆرێك فەرمانبەریی خوا ناكەن، زیندەوەرو پەلەوەرو ئاژەڵ هەن، كە بە حوكمی غەریزە بەڕێوە دەچن، مرۆڤێكیش بخوڵقێنێ، كە بە ئیرادەی ئازادانەی ویستی خۆی، بە عەقڵو هۆشی خۆی بەڕێدا بڕوات .

**بڕگەی سێیەم :** ﴿ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ﴾، واتە: جگە لەوانەی كە پەروەردگارت بەزەیی پێیاندا دێ .

(محمد رشید رضا) لە تەفسیرەكەی خۆی دا، ئاوای لێكداوەتەوەو جوانی هێناوە: ﴿ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ﴾، دەڵێ: (إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ مِنْهُمْ، فَاتَّفَقُوا عَلَى حُكْمِ كِتَابِ اللهِ فِيهِمْ، وَهُو الْقَطْعِيُّ الدَّلالَة مِنْهُ الَّذِي لا مَجَالَ لِلاخْتِلافِ فِيهِ، وَعَلَيْهِ مَدَارُ جَمْعِ الْكَلِمَة وَوَحْدَةِ الأُمة، إِذِ الظَّنِّيُّ لا يُكَلَّفُونَ الإِتِّفَاقَ عَلَى مَعْنَاهُ، لأَنَّهُ مَوْكُولٌ إِلَى الإِجْتِهَادِ الَّذِي لا يَجِبُ الْعَمَلُ بِهِ إِلاَّ عَلَى مَنْ ثَبَتَ عِنْدَهُ رُجْحَانُهُ)[1]، واتە: جگە لەوەی پەروەردگارت بەزەیی پێیاندا دێو، لوتفیان لەگەڵ دەكات، ئەوانە لەسەر ئەوەی پێویستە لەسەری كۆك بن، كۆك دەبن، ئەویش بریتیە لەو شتانەی كە هەڵبراوەكانی دینن، شتە بنەڕەتییەكانی دینن، كە قورئانو سوننەت زۆر بە ڕۆشنیی دەیانگەیەنن‌و، بواری ڕاجیاییان تێدا نیەو، یەكریزیی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺیش، كۆبوونەوەی لەسەر یەك بڕیار، هەر بەهۆی ئەوەوە دەبێ، (یانی: بەهۆی ئەو لایەنەوە لە ئیسلامدا دەبێ كە قورئانو سوننەت بە ڕۆشنی دەیگەیەنن‌و، بواری ڕاجیایی تێدا نیە)، چونكە ئەوەی كە مانایەكی جێی دڵنیایی ناگەیەنێو گومانی زاڵ دەگەیەنێ، لەسەر ئوممەت پێویست نیە كە لەسەری كۆببنەوە، چونكە ئەوە حەواڵەی ئیجتیهاد كراوە، ئیجتیهادو بۆچوونیش تەنیا لەسەر ئەو كەسە پێویستە، كە پێی وایە ئەوە مانایەكەیەتی، {بەڵام یەكێكی دیكە بڵێ: من بە جۆرێكی دیكە لێی تێدەگەم، ئەوە ئەو ئیجتیهادە، پابەندكەر (مُلْزِم) نیە بۆ ئەوەی كە ڕایەكی دیكەی هەیە} .

---

١) تفسير القرآن الحكيم، ج ١٢، ص ١٥٩.

(طبري)، بە جۆرێکی دیکە تەفسیری دەکات[١]، دەڵێ: {وَأَوْلَى الأَقْوَال فِي تَأْوِيل ذَلِكَ، بِالصَّوَابِ، قَوْلُ مَنْ قَالَ: مَعْنَى ذَلِكَ: (وَلاَ يَزَالُ النَاسُ مُخْتَلِفِينَ فِي أَدْيَانِهِم وَأَهوائِهِم عَلَى أَدْيَان وَمِلَلٍ وَأَهْوَاءٍ شتى، إِلاَّ مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ، فَآمَنَ بِاللهِ وَصَدَّقَ رُسُلَهُ، فَإِنَّهُمْ لاَ يَخْتَلِفُونَ فِي تَوْحِيدِ الله، وَتَصْدِيقِ رُسُلِهِ، وَمَا جَاءَهُمْ مِنْ عِنْدِ الله) .

واتە: نیزیکترین قسە لە ڕاستییەوە، لە مانای ئەم ئایەتەدا، قسەی کەسێکە، کە دەڵێ: مانای ئاوایە: بەردەوام خەڵك لە دینەکانیانداو، لە ئارەزووو بۆچوونەکانیاندا، لەسەر ئایینو ڕێبازو بۆچوونو ئارەزووی جیاواز دەبن، جگە لەوانەی کە پەروەردگارت بەزەیی پێیاندا دێ، کە بڕوا دێنن بە خواو، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەڕاست دەزانن، ئا ئەوانە لە خوا بە یەکگرتنداو، لە بەڕاست دانانی پێغەمبەرانی خوادا، ناکۆك نابنو، لەوەدا کە لە خواوە بۆیان هاتووە، ناکۆك نابن، {واتە: لە ئەسڵی بڕوا پێهێنانیدا، نەك لە جۆری تێگەیشتنیدا، بە تایبەت لەو شتانەدا کە زیاتر لە ڕایەك هەڵدەگرن} .

بێگومان بۆچوونەکەشی زۆر جوانە .

**بڕگەی چوارەم** : ﴿ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ﴾، واتە: بۆ ئەو مانایەی کە قسەیەی پێشوو گەیاندی، دروستی کردوون، یانی: ئامادەییان هەبێ بۆ ناکۆکییو ڕاجیایىو جیا جیایی لە زانیارییاندا، لە زانستەکانیاندا، لە بۆچوونەکانیاندا، لە هەستو نەستیاندا، خوا بۆ ئەوە خوڵقاندوونی کە جۆراو جۆر بنو، ڕای جیا جیایان هەبن، ئنجا سەرەنجامیش ڕاجیاییان ئەگەر لەسەر بنەڕەتی ئایین بێ، دیارە ئەو کاتە دابەش دەبن بۆ ئەهلی کوفرو ئەهلی ئیمان، بەڵام ئەگەر لە لقو پۆپەکانی دیندابێ، ئەو کاتە دابەش دەبن بۆ مەزهەبو بیروڕای جۆراوجۆر، لەنێو بازنەی ئیسلامدا، کە ئەومیان شتێکی ڕەوایەو شتێکی دروستە، بەڵام ئەگەر لە ئەسڵی دیندا

---

١) جامع البيان، ج ١٢، ص ١٥٠.

بكەونە ڕاجیاییەوە: هەندێكیان بڕوایان پێی بێ و، هەندێكیان بڕوایان پێی نەبێ، بێگومان ئەو كاتە تووشی دووبەرەكیی و ناكۆكیی و جیاوازییەك دەبن، كە ئەو جیاوازییە، بە هیچ جۆرێك ڕەوانیە .

ئنجا كە دەفەرموێ : ﴿وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾:

١/ حەسەنی بەسریی و عەطاء گوتوویانە: بۆ ڕاجیایی دروستی كردوون.

٢/ موجاهیدو عیكرمە گوتوویانە: بۆ ڕەحمەت و بەزەیی دروستی كردوون.

٣/ عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس گوتوویەتی: خوا بۆ ئەوە دروستی كردوون، كە ببنە دوو كۆمەڵ، كۆمەڵێك كە خوا بەزەیی پێیاندا دێ و ناكۆك نابن، واتە: لە ئەسڵی دینداو، كۆمەڵێكیش كە خوا بەزەیی پێیاندا نایەت، ناكۆك دەبن .

دەڵێم: لە ڕاستییدا كۆمەڵێك كە ناكۆك دەبن، خوا ڕەحمیان پێناكات و، كۆمەڵێك ناكۆك نابن، كە خوا بەزەییان لەگەڵدا بەكاردێنێ، واتە: بەهۆی ناكۆكییەكەیانەوە لە ئەسڵی دیندا، خوا بەزەییان لەگەڵدا بەكارناهێنێ، بەهۆی تەبایی و گونجاوییان لە ئەسڵی دیندا، خوا بەزەیی پێیاندا دێ .

(طبري) لە تەفسیرەكەی خۆی[1]دا دەڵێ: (وَأَوْلَى القَوْلَيْنِ فِي ذَلِكَ بِالصَّوَابِ، قَوْلُ مَنْ قَالَ: وَلِلإِخْتِلَافِ بِالشَّقَاءِ وَالسَّعَادَةِ خَلَقَهُمْ) .

واتە: نیزیكترینی ئەو دوو قسانە لە ڕاستییەوە، قسەی كەسێكە كە دەڵێ: بۆ ئەوەی جیابن، لە ڕۆژ ڕەشیی و بەختەوەرییدا، خوا دروستی كردوون .

واتە: بۆ ئەوەی كە سەرەنجام ئاوا بن، سەرەنجام هەندێكیان شایستەی ئەوەبن كە خوا بەزەیی پێیاندا بێ و، بیانخاتە بەهەشت، هەندێكیشیان بەهۆی كردەوە خراپەكانی خۆیانەوە، شایستەی ئەوەبن، كە خوا سزایان بدات .

---

١) جامع البیان، ج ١٢، ص ١٥١.

**بڕگەی پێنجەم :** ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ ﴾: وشەی پەروەردگارت تەواو بوو.

مەبەست لە وشەی پەروەردگارت ئەوەیە کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ ﴾السجدة، واتە: ئەگەر ویستبامان هەموو کەسێکمان هیدایەت دەداو، دەمانخستنە سەر ڕێی ڕاست، بەڵام خوا نەیویستوە زۆر لە خەڵکی بکات، بە زۆر ئیمانیان پێبێنێ، (بۆیە دەفەرموێ :) بەڵام فەرمووده لە منەوە چەسپاوە کە: ﴿ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾، دۆزەخ پڕ دەکەم لە تێکڕای جن و مرۆڤ، بەهۆی ئەوەوە کە خۆیان وا لێدەکەن، شایستەی چوونە دۆزەخ بن .

کە دەفەرموێ : ﴿ وَتَمَّتْ ﴾: (أي: ثَبَتَت وَكَمُلَتْ، فَلاَ مَجَال للتَغَيّر)، واتە: چەسپاوەو تەواو بووە، وە بواری گۆڕانکاریی تێدانیە .

﴿ كَلِمَةُ رَبِّكَ ﴾: (تَقْدِيرهُ وَإِرَادَتُهُ وَنِظَامُهُ الَّذِي وَضَعَهُ للوُجُود)، واتە: ئەندازەگیریی و نەخشەو ویستی خواو، ئەو سیستەمەی خوا بۆ بوون داینا، لە لای خوا تەواو بووەو، کاتی خۆی بۆی دانراوە .

**بڕگەی شەشەم :** ﴿ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾، واتە: بەپێی ئەو سیستەم و بەرنامەیەی کە خوا داینـاوە، دۆزەخ پڕ دەکرێ لە بێبڕوایان، هەروەك بەهەشتیش پڕ دەکرێ لە بڕواداران.

ئەمە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ بڕواداران و مسوڵمانانیش، کاتێك کە دەبینن خەڵکێك هەقی دەکەوێتە پێش چاو بەبێ زۆرو چەندو چۆن، بەڵام بڕوای پێ ناهێنن، با بزانن: ئەوە فەرمانی خواو یاسای خوایان بەسەردا چەسپیوە، کە بە ویستی ئازادانەی خۆیان کوفرو سەرپێچیی و شیرکیان هەڵبژاردووە، سەرەنجام ئەوانە دەبێ بچنە دۆزەخ، ئەوانە بڕیاری

خوایان بەسەردا چەسپیوە، بەڵام نەك خوا ستەمیان لێبكات، بەڵكو ئەوان خۆیان ئەو ڕێگایەیان هەڵبژاردوە .

كەواتە: لە بارەی هەقی خۆتانەوە، مەكەونە گومانو دوودڵییەوە، كە دەبینن كەسانێك هەن بڕوای پێناهێنن، بڵێن: دەبێ ناهەق بێ؟ نەخێر، بەڵكو ئەوە سیستەمو بڕیاری خوایە بەسەریاندا دەچەسپێ.

**مەسەلەی چوارەم :**

## گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و گەلەكانیان مایەی بەرچاو ڕوونییو دڵ دامەزراویی پێغەمبەرو موسوڵمانانی شوێنكەوتوویەتی:

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ .

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە چوار (٤) بڕگەدا:

**بڕگەی یەكەم :** ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ﴾، واتە: هەر كام لەوەی كە ئێمە لە بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆتی دەگێڕینەوەو بەسەرتیدا دەخوێنینەوە، عەقڵو دڵتی پێ دەچەسپێنینو دامەزراو دەكەین، شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: ئەم تەنووینەی سەر ﴿ وَكُلًّا ﴾، كە دوو سەرە، دوو فەتحەیە، (عِوَضٌ عَنِ المُضافِ إليهِ المَحذوفِ المُبَيَّنِ بقولهِ : (مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ )، فَالتقديرُ: وَكُلَّ نَبإٍ عَنِ الرُّسُلِ نَقُصُّ عَلَيْكَ نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ)، واتە: ئەو تەنووینە جێگرەوەو قەرەبووی ئەو پاڵوێدراوە فڕتێندراوەیە، كە بە فەرموودەی خوا ڕوون

کراوەتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ﴾، ئەوەی کە قرتێندراوە لەبەر ئەوەی کە ڕستەکە دەلالەتی لەسەر دەکات، بۆیە خوا ﷻ باسی نەکردوە، ئنجا ئەو تەنووینە لەجیاتی ئەم ڕستەیە: هەر هەواڵێك لەبارەی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) کە بۆتی دەگێڕینەوەو بەسەرتیدا دەخوێنینەوە، عەقڵو دڵتی پێ دامەزراو دەکەین .

کە دەفەرموێ : ﴿نَّقُصُّ عَلَيۡكَ﴾، وەك پێشتریش باسمان کردوە: (القَصُّ: يُقَالُ قَصَصتُ الخَبَرَ حَدَّثتُ بِهِ علی وَجهِه)، لە زمانی عەرەبیی دا وشەی (قَصّ) کە دەگوترێ: (قَصَصت الخَبَر)، (قَصَصاً)، واتە: هەواڵەکەو بەسەرهاتەکەم وەك خۆی گێڕایەوە، دیارە (قَصَص)، چاوگە (قَصَصت الخَبَر قَصَصاً)و، (قِصَص)، کۆی (قِصَّة)یە، (قِصَّة)، واتە: بەسەرهاتەکە، واتە: (مَقصُوص)، ئەوەی کە گێڕدراوەتەوە، کە (قِصَص)، کۆیەکەیەتی .

وشەی: ﴿نُثَبِّتُ﴾، (التَثبِيتُ: التَّسْكِينُ فِي المَكَانِ بِحَيْثُ يَنْتَفِي مِنه الإِضْطِرَاب وَالتَّزَلزُل)، (تَثبيت)، بریتیە لەوە کە شتێك لە شوێنی خۆی دا سەقامگیر بکەی، بە شێوەیەك کە جوولە جووڵو هاتنو چوونی نەمێنێ .

وشەی: ﴿فُؤَادَكَ﴾، (الفُؤَاد)، پێشتریش باسمان کرد، دەڵێ: (أُطلِقَ عَلَى الإدراكِ)، بەکارهێنراوە بۆ زانین، یان بۆ ئەوەی ئینسان شتی پێ دەزانێ، جا دیارە لە فەرهەنگەکانی زماندا، هەر دەڵێن : (الفُؤَادُ : القلبُ).

بەڵام من پێم وایە کە (فؤاد) زیاتر بە مانای عەقڵە، نەك دڵ، هەرچەندە جار جاریش بە مانای دڵ دێ، کە لێرەدا وایە، لێرەدا زیاتر دەگونجێ بە مانای دڵ بێ، چونکە : ﴿نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ﴾، واتە: دڵتی پێ دابمەزرێنین، وە من لە مەوسوعەی: (الإسلامُ كما يَتجَلى فِي الكِتَابِ الله)دا، باسم کردوە، کە وشەی (فُؤاد)، بە زۆریی لە قورئاندا، بە مانای عەقڵ بەکارهاتوە، نەك دڵ، واتە: بە مانای ئەو لایەنە کە ئینسان شتی پێ دەرك دەکاو شتی پێ دەزانێ، نەك ئەو لایەنە کە ئینسان شتی پێ وەردەگرێو قبووڵ دەکات،

یان ڕەفز دەکات، واتە: زیاتر بە مانای چەقی ئیدراكو تێگەیشتن هاتوە، نەك چەقی ئیرادەو ویستنو نەویستنو قبووڵ کردنو ڕەفزکردن، ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتانەش بکەین، ئەوە زۆر بە ڕوونیی دیارە :

١/ خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٧٨ ﴾النحل، واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە، هیچ شتێك نازانن، بەڵام دوایی بیستنو دیتنەکانو، فوئادەکانی بۆ ئێوە گێڕاون، بۆئەوەی سوپاسگوزاربن .

یانی: لە ڕێی بیستنەوە، ئینسان دەنگەکان وەردەگریّو، لە ڕێی دیتنەوە ئینسان وێنەکان وەردەگریّو، لە ڕێی (فُؤَاد)ەوە، کە من پێم وایەو زۆر دڵنیاشم کە لێرەدا (الأفئدة) کە کۆی (فُؤَادَ)ە، واتە: عەقڵ، چونکە هەمیشە خوا ﷻ لە قورئاندا باسی ئەو سێیەی پێکەوە کردوە، کە سێ هۆکارن بۆ ئەوەی ئینسان شتیان پێ بزانێ: بیستن، دیتن، دەرککردنو زانین، کە دیارە ئینسان بە عەقڵ شتەکان دەزانێ، بەڵام بە دڵ قبووڵیان دەکات، یان ڕەفزیان دەکات .

٢/ وە لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦ ﴾، واتە: بێگومان بیستنو دیتنو (فُؤَادَ)، (واتە: عەقڵ) هەر کامێك لەوانە لێی دەپرسرێتەوە، واتە: لەبارەی ئەوانەوە پرسیار لە مرۆڤ دەکرێ، کە هێزی بیستنەکەیو، هێزی دیتنەکەیو، هێزی دەرککردنو زانینەکەی، چۆن بەکارهێناوە ؟!

٣/ وە ئایەتێکی دیکە کە بەڵگەیە لەوبارەوە، ئەوەیە کە خوا لە سووڕەتی (القصص)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَأَصۡبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًاۖ إِن كَادَتۡ لَتُبۡدِي بِهِۦ لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا عَلَىٰ قَلۡبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠ ﴾، ئەمە هەر بەڵگەیەکی زۆر ڕوونو ئاشکرایە کە (فُؤَادَ)، لێرە ناگونجێ بە

مانای دڵ بێ‌و، بە مانای عەقڵە، چونکە خوا دەفەرموێ: (فُؤَادَ)ی دایکی مووسا بەتاڵ بوو، واتە: هیچی تێدا نەما، خەریك بوو هەواڵی مووسا ﷺ ئاشکرا بکات‌و بڵێ: ئەو منداڵەی خۆم بە مەلۆتکەیی خستۆتە صندوق‌و تابووتێکەوەو بە ڕووبارم دا داوە، ﴿لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا﴾، ئەگەر ئەوە نەبووایە کە ئێمە دڵیمان بەهێز کرد {دڵی وەك توورەکەیەك ببەستی‌و نەهێڵی هەواڵەکەی لێ بێتە دەرێ، خەریك بوو هەواڵەکە بڵاوبکاتەوە} بۆیەش وامان لێکرد کە لە بڕواداران بێ.

لێرەدا خوا ﷻ هەم باسی (فُؤَادَ)ی کردوە، هەم باسی (قَلب)ی کردوە، باسی (فُؤَادَ)ی کردوە کە دەفەرموێ: (فُؤَادَ)ی دایکی مووسا بەتاڵ بوو، (واتە: هۆشی) وەك کوردەواریی خۆشمان هەر بەکاری دێنن، دەڵێن: هۆشی لەلا نەما، هیچ شتێك لە هۆشی دا نەما، هیچ شتێك لە زەینی دا نەما، هەموو فیکرو بیرکردنەوەی چووبووە سەر مووسا ﷺ داخۆ چی لێدێ؟ هیچ شتێکی دیکەی لە بیر نەمابوو، یانی: مێشکی خاڵی بووەوە لە هەر زانیارییەکی دیکە .

لێرەدا بە تەئکید (فُؤَادَ)، بە مانای عەقڵە، چونکە دوایش وشەی دڵ (قَلب)ی هێناوە، کە دەفەرموێ: ﴿لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا﴾، خوا دەفەرموێ: دڵیمان بەست، دڵیمان گرێ دا، بۆئەوەی کە ئیرادەی بەهێز بێ، کەواتە: لێرەدا (قَلب)، واتە: چەقی ئیرادەو خۆ کۆنترۆڵ کردن، (فُؤَاد)یش، واتە: چەقی زانین‌و زانیاریی‌و هۆش‌و گۆش .

٤/ ئنجا لە قورئاندا خوای پەروەردگار سەرزەنشتی (قَلب)ی کردوە، کە ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەوبارەوە :

أ) وەك دەفەرموێ: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ⁽٧⁾﴾ البقرة.

ب) دەفەرموێ : ﴿أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ⁽٢٤⁾﴾ محمد، وەك دەبینین: دڵ

زەمکـراوە، بـەڵام (فُؤَادَ)، نـە زەمکـراوە، نـە مـەدح، هـەروەك (سَـمعُ)و، (بَصَـر)یش نـە زەمکراون، نـە مـەدح، بۆچـی؟ چونکـە بیسـتـنو دیتـنو عەقڵو هۆش، ئامرازی شت پێ زانینن.

کەواتـە: لـە خودی خۆیاندا، بێلایـەنن، دەگونجێ چاکیان پـێ بزانیـنو، دەگونجێ خـراپیان پێ بزانیـن، بـەڵام دڵ بێلایـەن نیـە، دڵ دەگونجێ پـڕ بێ لـە ئیمـان، وەك خـوا لـە ئایـەتی (٢٢)ی سـوورەتی (المجادلـة) دەفەرمـوێ:

﴿ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ ﴾، هـەروەها دەگونجـێ دڵ وا لـە مرۆڤ بكات ڕوو لـە خێـرو چاكە بكاتو، دەشگونجـێ دڵ وا لـە مرۆڤ بكات، ڕوو لـە شەڕو خراپە بكات، بۆیـە دڵ ئـەگـەر ڕوو لـە خوا بـێ: ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد، بـەڵام ئـەگەر پشت لە خوا بێ: ﴿ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾محمد، ئـایـا دڵـەکانیان قوفڵیان لێدراون؟ لـە چەندان شـوێنی دیکەدا وا دەفـەرمـوێ، بۆ وێنـە :

١) ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴿٧﴾ ﴾البقرة .

٢) ﴿ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴿١٠٨﴾ ﴾النحل .

٣) ﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾المطففين.

وەك دەبینیـن خـوای پەروەردگـار بـاسی (قفل)و (ختم)و (طبع)، وە بـاسـی ژەنگ دەکات بۆ دڵـەکان، بەڵام بۆ (فُؤَادَ)و (سَمعُ) و (بَصَر)، ئەوانە باس نەکراون، کـەواتە: بێگومـان وشـەی (فُؤَادَ)، کـە بـە (أفئِدَة)، کۆدەکرێتەوە، زیاتر بە مـانـای عەقڵ دێ، بـە مـانـای ئـەو هۆکارە دێ، کـە ئینسـان شتی پێ دەزانـێو پـێ دەرك دەکات، بەڵام جاری واش هـەیە بـە مـانـای دڵ دێ، زانسـتی پزیشکیی گـەریی (علم الطّب) ئێستـاش ئەوەی بۆ دەرکـەوتوە کـە ئیدراكو زانیـن، وێـڕای ئـەوەی کـە

پەیوەندیی بە دەماغەوە هەیە، كە دیارە مێشك ئامرازێكە بۆ ئەوەی كە ئینسان شتی پێ بزانێ‌و، مەعلوومات هەمووی لە مێشك دا كۆدەبێتەوە، بە هەمان شێوە، جۆرێك پەیوەندییشی بە دڵەوە هەیە، واتە: ئەو دڵە گۆشتینەی كە خوێن دابەش دەكات بەسەر جەستەدا، بەلام وردەكارییەكەی تا ئێستا باش نەزانراوە .

ئنجا ئەوەی كە لەم ئایەتە موبارەكە وەردەگیرێ، ئەوەیە كە بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) مایەی بەرچاورووونیی‌و، دڵ چەسپانی پێغەمبەر ﷺ و، هی بڕوادارانە، لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی وەك گوتراوە: (التأريخُ يُعيدُ نَفْسَهُ)، مێژوو خۆی دووبارە دەكاتەوەو، لەبەرئەوەی خوا ﷻ كۆمەڵێك یاسای لە ژیانی بەشەردا داناون، ئەو یاسایانە بەردەوامن‌و هەر دەچەسپێن، كەواتە: ئەگەر گەلی نووح، یان گەلی هوود، یان گەلی صالح، یان گەلی شوعەیب‌و، گەلەكانی دی، تاوان‌و لادانیان كردووەو دوایی تووشی سزا بوون، بە هەمان شێوە كۆمەڵگاكانی دیكەی بەشەریش، ئەگەر وەك ئەو گەلە پێشووانە بكەن، تاوان‌و لادان بكەن، تووشی هەمان جۆرە سزا دەبن، هەر كەسە بە پێی خۆی‌و، هەر كەسە بە شێوەی خۆی .

كەواتە: ئەوە دەبێتە هۆی بەرچاو ڕوونیی، كە ئێوە وەك ئەوان مەكەن، بۆئەوەی وەك وانتان بەسەر نەیەت، بەڵكو پێچەوانەی ئەوان بكەن، بۆئەوەی پێچەوانەی ئەوەی كە بەسەر ئەوان هاتوە، بۆ ئێوە بێتە پێش، كە بریتیە لەوەی خوا لێتان خۆش بێ‌و، بەرەكەتتان بەسەردا برێژێ‌و، بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دوارۆژ بن .

**بڕگەی دووەم :** ﴿ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَقُّ ﴾، لەمەدا هەقت بۆ هاتوە، (فِي هَٰذِهِ) دیارە ئاماژەیە بۆ ئەم سوورەتی (هود)، واتە: لەم سوورەتەدا هەقت بۆ هاتوە، هەڵبەتە هەموو سوورەتەكانی قورئان، هەقیان تێدا هاتوە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، بۆ شوێنكەوتووانی، بەلام كە لێرەدا بە تایبەت ئاوا ئاماژە دەكات، ئەمە گرنگیی‌و گەورەیی ئەم سوورەتە دەردەخات .

**بڕگەی سێیەم** : ﴿ وَمَوۡعِظَةٌ ﴾، هەروەها ئامۆژگارییت بۆ هاتوە .

(مَوعِظَة)، (اسْمُ مَصْدَرِ وَعْظٍ، وَهو تَذَكُّر بما يَصُدُّ المَرْءَ عَنِ العَمَلِ المُضِرِّ)، (مَوعِظَة)، ناوی چاوگە، چاوگی (وَعْظ)، (وَعِظَ، يَعِظُ، وَعْظاً)، (مَوعِظَةً)ش ناوە، بۆ ئەوە كە ئینسان شتێكی بیر بخرێتەوە، بە جۆرێك ئامۆژگاریی بكرێ، كە لە شتێك بی پرینگێنێتەوە بیسڵەمێنێتەوە كە زیان بەخشە .

**بڕگەی چوارەم** : ﴿ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، هەروەها بیرخەرەوەیە بۆ بڕواداران، كەواتە: لێرەدا خوا ﷻ سێ وشەی بەكارهێناون: ﴿ ٱلۡحَقُّ ﴾، ﴿ مَوۡعِظَةٌ ﴾، ﴿ ذِكۡرَىٰ ﴾، دوایی كە دەفەرموێ: ﴿ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، دەگونجێ تەنیا تایبەت بێ بە ﴿ وَذِكۡرَىٰ ﴾ەوە، واتە: بیرخەرەوەیە بۆ بڕواداران، بڕواداران لەبەرئەوەی فیطرەتیان تێكنەچووە، لەبەرئەوەی سروشتی خۆیان پاراستوە، ئەو ڕاستییانە لە فیطرەتو سروشتو خوارسكیاندا، هەر پارێزراونو بەس بیرخستنەوەیان دەوێ، بەڵام ئەوانی دی، پێویستە دووبارە ئەو هەقە وەربگرنو لە دڵو عەقڵی خۆیاندا بیچەسپێننو، ئەو ئامۆژگاریی خوا وەربگرنو، دەست لە خراپە هەڵبگرنو، ڕوو لە چاكە بكەن.

دەشگونجێ هەر كام لە: ﴿ ٱلۡحَقُّ ﴾و ﴿ مَوۡعِظَةٌ ﴾و ﴿ ذِكۡرَىٰ ﴾، بۆ بڕواداران بنو، دەشگونجێ ﴿ وَذِكۡرَىٰ ﴾، تایبەت بێ بە بڕوادارانەوە،﴿ ٱلۡحَقُّ ﴾و ﴿ وَمَوۡعِظَةٌ ﴾، گشتی بن، بۆ بڕواداران‌و بۆ غەیری بڕواداران، وەك لە سوورەتی (یونس)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧ ﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! بە دڵنیاییەوە لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگاریتان بۆ هاتوەو،

شیفاو چارەسەر، بۆ ئەوەی کە لە سینەکاندایەو، ڕێنمایی و بەزەیی بۆ بڕواداران، کە لەوێشدا دەگونجێ ئەو دووانەی کۆتایی، تایبەت بن بە بڕوادارانەوە وەك وامان تەفسیر کرد، دووەکانی دیکەش، واتە: ئامۆژگاریی و شیفایەکە، بۆ مرۆڤەکان بن بەگشتی، لە نێویشیان دا بڕواداران، دەشگونجێ هەر چواریان پەیوەست بن بە بڕوادارانەوە بەڵام یەکەمیان بەهێزترە چونکە خوا هەموو مرۆڤایەتی دەدوێنێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾﴾.

کەواتە: بۆ خەڵکی بۆ مرۆڤایەتی بە گشتی، قورئان ئامۆژگارییە، هەروەها شیفایە بۆئەوەی کە لە سینەکانیان دا هەیە، کە لای بەرێ‌و، دڵ‌و سینەیان پاك بکاتەوە لە شیرك‌و کوفرو نیفاق‌و لە سیفەتە نزم‌و پەستەکان‌و، دڵ‌و دەروونیان برازێنێتەوە بە سیفەتە بەرزو جوانەکان، کە لەپێش هەموویانەوە: خوا بەیەکگرتن‌و ئیمانەو، دوایی سیفەتەکانی دیکەش .

**مەسەلەی پێنجەم :**

## بێ باکیی لە بێبڕوایان، هەڕەشە و گوڕەشەکانیان و،

## لە پیلانەکانیان و، بێمنەت کردنیان؛

خوا فەرموویەتی : ﴿ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە لە پێنج (٥) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾: بەوانە بڵێ: کە بڕوا ناهێنن، زانایان دەڵێن: خوا ﷻ بۆیە بە (فعلِ المُضارِع) دەیهێنێ، وەك ئێستا ئەم کارە ئەنجام بدرێ، هەرچەندە پێشتر بڕوایان نەهێناوە، نەیفەرمووە: (وَقُل لِلَّذینَ لَمْ یُؤْمِنوا)، هەرچەندە پێشتر ئیمانیان نەهێناوە، نەك ئێستا ئیمان نەهێنن، تاکو وێنای بکاو بیخاتە بەرچاومان: ئا ئەوەتا لەبەر چاوتانە، ئەو هەموو نیشانانە دەبینن، ئەو هەموو موعجیزانە دەبینن، ئەو هەموو ئایەتانە دەبینن، کەچی بڕواشیان پێ ناهێنن، بەوانە بڵێ: کە بڕوا ناهێنن، لێرەدا نەیفەرمووە: ئیمان بە چی ناهێنن! چونکە لە شوێنەکانی دی روون کراوەتەوە، واتە: ئیمان بە هەموو ئەو شتانە ناهێنن کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ: ئیمان بە خوا ﷻ ناهێنن و، ئیمان بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەران، بە رۆژی دوایی و، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەران لە لایان خواوە هەواڵیان پێداوە، ئیمانیان پێ ناهێنن، پێیان بڵێ چی ؟!

**برگەی دووەم** : ﴿ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ﴾: واتە: چی لە دەستتان دێ، بیکەن، چونکە (مَكانَكم : أي تَمَكُّنِكُمْ)، یانی: چی پێتان دەكرێ، چی لە دەستتان دێ، بیكەن؟ واتە: بە هەموو تواناتانەوە لە دژم بوەستن، كە ئەوەش دەكاتە ئەوپەڕی لەخۆڕا دیتنو، خۆ بە پشت ئەستوور زانینو، بێمنەتكردنی بەرانبەرەكان، واتە: چی پێتان دەكرێ، بیكەن .

**برگەی سێیەم** : ﴿إِنَّا عَٰمِلُونَ﴾: ئێمەش ئەنجامدەرین، واتە: ئێمەش بە ئەركی خۆمان هەڵدەستین، هەڵبەتە ئەمە لێرەدا هەڕەشە نیە، واتە: ئێوە چی پێتان دەكرێو، چی پێتان چاكە بیكەن، مادام هەر بە قسەم ناكەن، پەیامی خوا وەرناگرن، ئێمەش ئەوەی كە پێمان چاكە، دەیكەینو، ئەوەی كە وەك ئەركێك پێمان سپێردراوە، ئەنجامی دەدەین .

**برگەی چوارەم** : ﴿وَٱنتَظِرُوٓاْ﴾: ئێوە چاوەڕێ بن، كە ئەمە دڵنیاییە لە داهاتووی خۆیو، بێمنەتییە لەوان، واتە: ئێوە چاوەڕێ بن، پێتان وانیە كە : قورئان خوا بۆ پێغەمبەر (موحەممەد) ﷺی نەناردوەو، خۆی هەڵیبەستوە، ناڵێن: ئەوە هەمووی خەونو خەیاڵە، ناڵێن: هەمووی درۆو دەلەسەیە؟! باشە چاوەڕێ بن.

**برگەی پێنجەم** : ﴿إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾: ئێمەش لە چاوەڕوانانین، واتە: دوایی دەیبینن، ئەمە وەك گوتم: ئەوپەڕی دڵنیاییو بەرچاوڕوونییو، پشت ئەستووریی و دەگەیەنێ، كە دیارە لە چەند شوێنانیش لە قورئاندا ئەوە دووبارە بۆتەوە: لە سوورەتی (الأنعام)داو، لە سوورەتی (الزمر)دا، كە ئێوە مادام بڕوا ناهێنن، ئێوە چاوەڕێ بن، ئێمەش چاوەڕێین، بزانین داخۆ سەرەنجام چۆن دەبێ ؟ ئنجا تۆ كاتێك ئەوە دەڵێی، كە خۆت دڵنیایو، ئەوپەڕەكەی دەبینی، دەزانی سەرەنجامەكەی چۆنە؟ كە بۆ تۆ بە خێر دەگەڕێ، بۆ ئەوانیش بە شەڕ دەگەڕێ .

**مەسەلەی شەشەمو کۆتایی :**

**پەنهانی ئاسمانەکانو زەوی، تەنیا خوا دەیزانیو، هەموو کارێك بەدەست خوایەو، بۆ لای خوا دەگەڕێتەوەو دەگێڕدرێتەوە، بۆیە بەندایەتییو پشت پێ بەستن، دەبێ تەنیا بۆ وی بێ:**

خوا فەرموویەتی : ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە پێنج (٥) بڕگەدا:**

**بڕگەی یەکەم :** سەرەتا دەفەرمویّ : ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾:

نهێنیی ئاسمانەکانو زەوی بەس هی خوایە، پێشتریش گوتوومانە: کە ئەگەر (الجار والمجرور) پێش کەوتن، کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، واتە: نهێنییو پەنهانی نێو ئاسمانەکانو زەوی، بەس خوا دەیزانێو، تایبەتە بە خواو، موڵکی خوایەو، لە ژێر کۆنترۆڵی خوا دایە، بە تەنیا، ئنجا پێمباشە ئەمە تۆزێك شی بکەینەوە .

# كورتە باسێك دەربارەی پەنهان (غیب)

دەربارەی وشەی (غیب) جارێ با سەرنجی : (مُفْرَدات ألفاظ القرآن)[1]ی (راغب الأصفهاني) بدەین، شیكردنەوەیەكی جوان دەكات بۆ وشەی غەیب، دەڵێ: (الغَيْبُ: مَصدَرُ غابَتِ الشَّمْسُ وَغَيْرُهَا، إذَا اسْتَتَرَت عَنِ العَيْنِ، يُقَالُ غابَ عَنِّي كَذا: ﴿أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ٢٠﴾ النمل، واسْتُعْمِلَ لِكُلِّ غائِبٍ عَنِ الحاسة، وَعَما يَغِيبُ عَنِ عِلْمِ الإنسانِ بمعنى الغائب، قَالَ تَعَالى: ﴿وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ٧٥﴾ النمل، وَيُقَالُ: لِلشيءِ: غَيبٌ وَغَائِبٌ باعْتِبارِهِ بالناس، لاَ باللهِ تَعَالى، فإنَّهُ لا يَغِيبُ عَنْهُ شَيء، كَما قَالَ تَعالى : ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ٦١﴾ يونس، وَقَولُهُ تَعالى : ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٧٣﴾ الأنعام، أي: ما يَغِيبُ عَنكُمْ وَما تَشْهَدُونَهُ، وَالغَيْبُ فِي قَوْلِهِ تَعالى: ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ ٣﴾ البَقَرة، ما لاَ يَقَعُ تَحْتَ الحَواسِّ ولا تَقتَضيهِ بَدائِهُ العُقُولِ، وَإنَّما يُعْلَمُ بخَبَرِ الأَنْبياء وَبِدَفعِهِ يَقَعُ على الإنسانِ اسْمُ الإلحادِ) :

{واتە : وشەی (غَیب) چاوگەو لە (غَاب)ەوە هاتوە، دەگوترێ : (غَابَتِ الشَّمْسُ)، واتە: خۆرەكە ئاوا بوو، جگە لە خۆریش هەر بۆی بەكاردێ، (غَابَ

---

١) ص (٦١٦ و ٦١٧).

النَّجْمُ، غَابَ القَمَرُ)، واتە: پەنهان بوو، ئەگەر وا شێردرایەوە، وا پەنهان بوو، کە چاو نەیبینێ، دەگوترێ: (غَابَ عَنِّي كَذَا)، واتە: ئەو شتەم لێ ونبوو، یان ئەو شتەم لێ پۆشرا، وەك لە سووڕەتی (النمل)دا هاتوە: سولەیمان کاتێ ﷺ لە هودهود دەپێچێتەوە، لە کوێیە؟ دەفەرموێ : ﴿أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ۝٢٠﴾ ئایا لەوانەیە کە لێرە نیەو خۆی پەنهان کردوە.

دوایی وشەی (غَیب) بۆ هەر شتێك بەکاردێ کە هەستەکان هەستی پێناکەنو، بۆ هەر شتێکیش بەکاردێ کە ئینسان نایزانێ، یاخود بە هەستەوەرەکان هەستی پێ نەکات، مانای وایە، ئەوە نادیارە بۆی، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (النمل)دا دەفەرموێ : ﴿وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ۝٧٥﴾، واتە: هیچ پەنهانێك نیە لە ئاسمانو زەویدا، مەگەر لە کتێبێکی ڕوونو ئاشکرا، {یاخود ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر} دایە، (واتە: لە زانیاری بێسنووری خوادا هەیە)، هەر شتێك کە بۆ ئێمە پەنهانو نادیارە، بێگومان بۆ خوا دیارەو تۆمار کراوە لە زانیاریی بێسنووری دا .

هەر شتێك کە پێی دەگوترێ: (غَیب) و (غائِب)، لەو ڕووەوەیە کە پەیوەندیی بە خەڵکەوە هەیە، نەك بە خوای بەرزەوە، چونکە هیچ شتێك لە خوای بەرز پەنهان نابێ، وەك دەفەرموێ : ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ۝٦١﴾ یونس، واتە: هێندەی گرانیی، یان بە ئەندازەی گەردێك لە ئاسمانەکانو زەوی دا، لە خوا ون نابێ، ئنجا خوا کە دەفەرموێ : ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾، زانای پەنهانو ئاشکرایە، واتە: ئەوەی کە لێتان پەنهانەو داپۆشراوە، ئەوەی کە دەیبینن (بەنسبەت ئێمەوە)، ئەگەرنا بەنسبەت خوای پەروەردگارەوە هەموو شتێك زانراوەو ئاشکرایە، هەروەها کە خوا دەفەرموێ: ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ﴾،

واتە: بڕوادێنن بە نادیار (غیب)، بریتیە لەوەی کە هەستەکان هەستی پێناکەنو لە مەدای هەستەوەرەکاندا نیە، (واتە: دیتنو بیستنو دەست لێدانو تامکردنو بۆنکردن)، (ولا تَقتَضیهِ بَدائِهُ العُقُولِ)، بە ئاشکراش عەقڵەکان نایزانن، بەڵکو بە هەواڵ پێدانی پێغەمبەران دەیزاننو، هەر کەسێك ئەو غەیبەی کە بە هەواڵ پێدانی پێغەمبەران دەزانرێ، ڕەتی بکاتەوە، ئەوە ناوی بێبڕوایی (إلحاد)، دەچێتە سەر.

ئنجا لە قورئان دا لە چەند شوێنێکدا باسی ئەوە کراوە بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (النمل)دا خوا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٦٥﴾﴾، واتە: بڵێ: ئەوانەی کە لە ئاسمانەکانو زەوی دان، هیچیان نادیار نازانن، جگە لە خواو، هەست ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە.

یانی: نە پەنهانەکانی دیکە دەزاننو، نە ئەو کارەساتە زۆر مەزنەش دەزانن، کە خوا ﷻ جگە لە خۆی هیچ کەسی لێ ئاگادار نەکردۆتەوە، کە هاتنی ئاخیر زەمان (ساعة)ە، پاشان قیامەتو زیندووکرانەوەو لێپرسرانەوەیان.

٢- لە سوورەتی (الجن)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ﴿٢٧﴾﴾، واتە: خوا ﷻ زانای پەنهانە، هیچ کەسێك لە پەنهانی خۆی ئاگادار ناکاتەوەو شارەزا ناکات، مەگەر نوێنەرێك کە خۆی پەسندی بکاتو هەڵیبژێرێ ((کە دەگونجێ مەبەست پێی فریشتەکان بێ، کە دەیاننێرێ وا زیاتر پێدەچێ، دەشگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەران بێ، کە خوا لە هەندێ شتی نادیارو پەنهان، ئاگاداریان دەکاتەوە ئەوەی کە حیکمەتی خوا بە پێویستی بزانێ، ئەگەرنا ئەوانیش غەیبیان نەزانیوەو، فریشتەکانیش

غەیب نازانن، جگە لەوەی کە خوا پێیان دەفەرموێ، هەروەك لە فەرموودەی جیبریلدا، کە هەر بە (حدیث جبریل) ناسراوە، هاتوە، کە جبریل لە پێغەمبەر ﷺ دەپرسێ : {مَتَی السَاعَةُ}، واتە: ئاخر زەمان کەی دێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَائِلِ} {أَخرجَهُ أَحْمَد، برقم: (٩٤٩٧)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٥٠)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٠)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٤٠٤٤)}، واتە: پرسیارلێکراو لە پرسیارکەر پێی زاناتر نیە، واتە: منیش لە تۆ زیاتری لێ نازانم، کەواتە: نە جبریل ؑ زانیویەتی، نە پێغەمبەر ﷺ)).

ئنجا خوا کە دەفەرموێ: هەر کام لە نوێنەرانی خۆی، کە پەسندیان دەکات، ئاگاداریان دەکاتەوە لە بەشێك لە نادیار، دەفەرموێ : ﴿ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ﴿٢٧﴾ ﴾، ئەوە لای پێشیەوەو لای دوایەوە چاودێران دادەنێ، واتە: فریشتەکان ئاگایان لێدەبێ، بۆ ئەوەی شەیتانەکان دەست نەخەنە نێو ئەو غەیبەوە، کە بەو فریشتەیە، یاخود ئەو پێغەمبەرە ؑ لێی ئاگادار کراوەتەوە .

ئێمە بە سەرنج دانی مەسەلەی غەیب کە لە قورئاندا باسکراوەو، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺداو، لە دنیای واقیعدا هەیە، بۆمان دەردەکەوێ کە پەنهان (غیب)، دوو بەشە، هەڵبەتە دەگونجێ بۆ زۆر جۆر دابەش بکرێ، بەلام بە شێوەی گشتی دوو بەشە :

<u>یەکەم</u> : (الغَیْبُ المُطلق)، واتە: نادیارێکی رەها، ئەوەیە کە جگە لە خوا ﷻ هیچ کەس نایزانێ، بەتایبەت هاتنی (ساعة)، واتە: هاتنی ئاخر زەمان، ئەوە نە جبریلو نە پێغەمبەری خاتەم ﷺو، نە هیچ کەس نەیزانیوەو نایزانێ، تەنیا تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە، وەك خوا ﷻ لە کۆتایی سووڕەتی (لقمان)دا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي

نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾﴾، واتە: خوا زانیاریی ئاخر زەمانی لەلایەو، دەزانێ چ لە منداڵدانەکاندا هەیەو، بارانێك کە دەفریای خەڵك دێ، دەیبارێنێو، هیچ کەس نازانێ، بەیانی چی دەکاتو، هیچ کەس نازانێ لە کوێ دەمرێ، کە وەك گوتم ئەوانە دەگونجێ هەندێکیان لە پەنهانی ڕەها بن، کە گرنگترینیان (ساعة)یە.

**دووەم**: پەنهانی ڕێژەیی (الغَيبِ النسبي)، واتە: بەنسبەت هەندێك کەسەوە، نەزانراوەو، بەنسبەت هەندێك کەسەوە، زانراوە، بۆ وێنە: کەشناسەکان کە باسی ئەوە دەکەن، بۆ بەیانی پلەی گەرمی ئەوەندە بەرز دەبێتەوە، یاخود سەرما پلەکەی ئەوەندە دەبێ، یاخود دوورتر بڕۆین: مانگ لە فلان کاتەدا دەگیرێ، خۆر لە فلان کاتەدا دەگیرێ، یاخود فلان خڕۆکەیە لە فلان کاتەدا دوای ئەوەندە ساڵەی دیکە، ئەوەندە نیزیك دەبێتەوە، یان خۆر ئەگەر خوا ئەم دنیایە بەردەوام بکات، دوای پێنج ملیار ساڵی دیکە کۆتایی پێدێ، ئەو زانیاریانە کە گەردوونناسەکان دەیڵێنو کەشناسەکان دەیڵێن، ئەوە پێی دەگوترێ پەنهانی ڕێژەیی، بەنسبەت کەسانێکەوە کە نایزاننو، ئامرازەکانی زانینی ئەو زانیاریانە لەلا نیە، پەنهانە، بەڵام بەنسبەت کەسانێکەوە کە هۆکارو ئامرازی پەی پێبردنی ئەو زانراوەیان لەلایە، بەنسبەت ئەوانەوە، غەیب نیە، بەڵام بە مەرجێك ئامرازی ڕاستو دروستو جەربێنراو، بن، نەك هەر لەگۆترە .

ئنجا دیارە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە چەند فەرموودەیەك دا نەهی کردوە لەوە کە لە ڕێیە ناسروشتییەکانەوە، ئینسان هەوڵبدات داهاتوو بزانێ، هەوڵبدات نادیار بزانێ، هەر بۆیە نەهی کردوە، لەوە کە خەڵك پشت ببەستن بە عەرڕافو کاهینو فاڵچییو فاڵگرەوەکانو، ئەوەی کە بە حیساب لەپەدەست دەخوێنێتەوەو، ئەوەی کە قاوە دەگرێتەوەو، ئەوەی کە لەخۆڕاو لەگۆترە هەندێك شت دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە هەر کەسێك کە پرسیار لەوانە بکاتو، بڕوایان پێ بکات، بەڵکو ئەوە بە جۆرێك لە شیرك دانراوە، وە لەوبارەشەوە، پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کراوە،

کە گوتوویانە: جاری وایە هەندێك قسە دەڵێن، ڕاست دەردەچێ، ئەمە چۆنە؟!

ئەویش فەرموویەتی: ئەوە ئەو شەیتانە دەچی هەندێك زانیاریی لە فریشتەکان دەدزێ، بەلام یەك زانیاریی ڕاستە، ئەوەدو نۆ درۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکات، ئنجا بەهۆی ئەو زانیارییە ڕاستەوە، خەڵکەکە بەرانبەر ئەو ئەوەدو نۆیەش چەواشە دەبێ‌و وادەزانێ کە ئەوەدو نۆیەکەش ڕاستە، وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە.

**بڕگەی دووەم** : ﴿وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُ ٱلۡأَمۡرُ كُلُّهُۥ﴾: هەموو کاروبارەکە بۆ لای وی دەگێڕدرێتەوە، خوێنراویشتەوە: (وَإِلَيهِ يَرْجِعُ الأَمْرُ كُلُّهُ)، ئەگەر بفەرموێ: (يَرْجِعُ)، واتە: دەگەڕێتەوە، ئەو کاتە (أمر) دەبێتە بکەر (فاعِل)ی، بەلام (يُرۡجَعُ)، واتە: دەگێڕدرێتەوە، واتە: ئەو کاتە بکەر (فاعِل)ەکەی نەزانراو (مَجهول) دەبێ، کێ دەیگێڕێتەوە؟ بێگومان هەر خوا ﷻ‌و بە ویستی خوا دەگێڕدرێتەوەو، هەموو کاروبارەکان لە ژێر کۆنترۆڵ‌و ویستی ڕەهاو بێسنووری ئەو دان .

کە دەفەرموێ : (يُرۡجَعُ ٱلۡأَمۡرُ)، ئەو ئەلیف‌و لامەی (ال)، سەر (أمر) ئەلیف‌و لامی (تَعريفِ)ەو بۆ (جِنس)ە، واتە: هەرچی کاروبارە، هەموو بۆ لای خوا ﷻ دەگێڕدرێتەوە، یان دەگەڕێتەوە، بە هەردوو قیرائەتەکەی.

واتە: مادام خوا ﷻ هەموو پەنهانەکانی ئاسمان‌و زەوی، هەر لە ژێر کۆنترۆڵ‌و لە ژێر چاودێریی ئەو دایەو، هەموو کاروبارەکانیش بۆ لای وی دەگەڕێنەوەو دەگێڕدرێنەوە، کەواتە: هەر بۆخۆی شایستەی بەندایەتیی بۆ کرانەو، نابێ جگە لەو بپەرسترێ، چونکە پەرستراوی ڕاستەقینەو پەرستراوی شایستە، ئەو زاتەیە کە هەموو شتێك دەزانێ‌و، هەموو کاروبارەکان لە ژێر ڕکێفی ئیرادەی وی دان .

**بڕگەی سێیەم** : ﴿فَٱعۡبُدۡهُ﴾: هەر ئەو بپەرستە، واتە: تەنیا بەندایەتیی بۆ وی بکە، دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ‌و، لە هەر کەسێکیشە

کە بەرێی پێغەمبەری خاتەمدا دەڕواتو، لە هەر کەسێکیشە کە پەیڕەویی لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، واتە: تەنیا خوا بپەرستە .

**برگەی چوارەم :** ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾: پشتیش هەر بەو ببەستە .

**برگەی پێنجەم :** ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾: پەروەردگارت بێئاگا نیە، لەوەی کە دەیکەن، دیارە خوێنراویشەتەوە: (عَما یَعْمَلُونَ)، لەوەی کە ئەوان دەیکەن، واتە: نەیارەکانتان، یاخود ئەوەی کە ئێوە دەیکەن، ئەی پێغەمبەر ﷺ ! و ئەی بڕوادارانی شوێنکەوتووی !

کە دیارە بە پێی خوێندنەوەی یەکەم : (عَمَّا تَعْمَلُونَ )، ئەوە ئاگادارکردنەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ و، شوێنکەوتووانی کە خوا ئاگادارە.

بە پێی هی دووەم : (عَما یَعْمَلُونَ)، ئەوە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ، واتە: ئەوەی کە ئەوان دەیکەن، خوای پەروەردگار لێی بێئاگا نیە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن : (بۆیان لەنێو دوو نانی گەرمدا هەڵدەگرێ)و، تۆمار دەگرێ لەسەریان، واتە: خوا ﷻ کۆتایی ئەم سووڕەتە بەم پێنج ڕاستییە گرنگە دێنێ :

**یەکەم :** زانینی پەنهانو نادیار کورت هەڵێنراوە لە خوادا، واتە: بەس خوا ﷻ دەیزانێ .

**دووەم :** کاروبار هەمووی لە دەستی خوا دایەو، لە ژێر ڕکێفو کۆنترۆڵی خوای باڵادەست دایە ﷻ.

**سێیەم :** بەندایەتیو پەرستن، تەنیا شایستەی خوایە ﷻ و، شایستەی کەسی دیکەو هیچ شتێکی دیکە نیە .

**چوارەم :** دەبێ تەنیا پشت بە خوا ﷻ ببەسترێ، تەنیا دەبێ خوا ڕووی نیازو مەبەستەکانی تێبکرێو، پشت ئەستووریی تەنیا بە خوا ببێ .

پێنجەم : خوا ﷻ لەوەی كە ئێوە دەیكەن، ئەی بڕواداڕینە! ئەنجامی دەدەن لە هەڵسوكەوتتان، چ پەیوەندیی بە دڵو دەروونتانەوە هەبێ، نیازو مەبەستەكان، چ پەیوەندیی بە وشەو دەربڕینەكانتانەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە كردەوەی ئەندامەكانتانەوە هەبێ، پەنهانتانو ئاشكراتان خوا هەمووی لەبەرچاوەو دەیزانێ.

ئەگەر خوێندنەوەی دووەمیشیان بێ: (عَمَا يَعْمَلُونَ)، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ! ئەی بڕواداران! ئەوەی كە نەیارەكانتانو دوژمنو ناحەزەكانتان دەیكەن، لە پیلانو فێڵو لە نەخشەی گڵاو، لەلای خوای پەروەردگار پەنهان نیەو، خوا بێئاگا نیە لێی، بەڵكو ئاگادارە، كەواتە: دڵنیابن، ئێوە خاوەنێكتان هەیەو سەرپەرشتیارێكتان هەیە، كە لە پیلانو فێڵو نەخشەی دوژمنەكانتان، بێئاگا نیەو، پشتی ئێوە دەگرێو، پیلانو نەخشەكانی ئەوانیش دەكاتە بڵقی سەر ئاو .

خوا بە لوتفو كەرەمی خۆی لەو كەسانەمان بگێڕێ كە تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا دەكەنو، تەنیا پشت بە خوا دەبەستنو، وامان لێبكات شایستەی ئەوە بین، مشوورمان لێ بخوات، سەرپەرشتیی كاروبارمان بكاتو لەگەڵماندا بێو، ئەوانەی كە دژایەتییمان دەكەنو ناحەزمانن بە ناهەق، خوا بە دادگەریی خۆی مامەڵەیان لەگەڵدا بكات، هەروەها بە بەخششو چاكەی خۆی لەگەڵ ئێمەدا مامەڵە بكات، ئامین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# سەرچاوەکان


١) تفسير الطَّبَرِي المُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن ، لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَرِي، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْرِي سعيد، المكتبة التوفيقية، ٢٠٠٤ القاهرة.

٢) المِصبَاحُ المُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإِمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداء إِسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقي ، إِعداد جماعَة مِنَ العُلَمَاء ، بإِشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م).

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإِمام فَخْرالدِّين محمد بن عُمَر بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي ، حَقَّقَهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية .

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن احمد الأنصاري القُرطُبي، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عِماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحكَام القُرآن ، لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م).

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف : الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني ، تحقيق : عبدالرزاق المَهدي ، دار الكتاب العربي ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

٧) زاد المسير في علم التفسير : لابن الجوزي .

٨) روح المعاني : للآلوسي .

٩) تفسير القاسمي المُسمى محاسن التأويل ، تأليف : علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي ، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م).

١٠) تفسير المراغي ، تأليف أحمد مصطفى المراغي ، دار الفكر ، بيروت .

١١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام الْمَنان ، تأليف : العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي ، تحقيق : عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٢) تفسير الجواهر للطنطاوي، (دار الكتب العلمية – بيروت ، ١٤٣٧ هـ - ٢٠١٦م).

١٣) صفوة البيان لِمَعَاني القُرآن ، تأليف : الشيخ حسين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١٤) صفوة التفاسير ، تأليف : العلامة محمد بن علي الصابوني ، مكتبة الهداية ، أربيل/ العراق ، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٥) تفسير القُرآن الحكيم الشهير بـ (تفسير المنار) تأليف : محمد رشيد رضا ، دار المعرفة، الطبعة الثالثة.

١٦) الأساس في التفسير ، تأليف : سعيد حوى ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٧) في ظِلال القُرآن، تأليف: سيد قطب دار الشروق، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٨) التفسير الْمُنير في العَقِيدة والشَّرِيعَة والْمَنْهَج ، تأليف : الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي ، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٩) التحرير والتنوير ، محمد الطاهر بن عاشور .

٢٠) تفسير النابلسي، د . مجد راتب النابلسي.

٢١) الميزان ، محمد حسين الطباطبائي .

٢٢) تفسير الشعراوي ، محمد متولِّي الشعراوي .

٢٣) تفسير نمونه ، ناصر مكارم شيرازي .

٢٤) الكاشف ، محمد جواد مغنية .

٢٥) التفسير التوحيدي ، د. حسن الترابي .

٢٦) مُفرَدات ألفاظ القُرآن ، تأليف : العلامة الراغب الأصفهاني ، تحقيق : صفوان عدنان داوودي ، دار القلم ، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

٢٧) الإستيعاب في بيان الأسباب .

٢٨) أسباب النزول ، للنيسابوري .

٢٩) لُباب النقول في أسباب النزول، للإمام الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي خَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق المَهْدِي ، دار الكتاب العربي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م) ، (أسباب النزول) للنيسابوري .

٣٠) مختار الصِّحاح ، للرازي .

٣١) المعجم الوسيط ، دار الدعوة ، الطبعة الثانية.

٣٢) المُوطأ للإمام مالك بن أنس برواية يحيى بن يحيى الليثي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسباب النزول) للواحدي .

٣٣) المُسنَد للإمام أحمد بن محمد بن حنبل ، الناشر مؤسسة قرطبة ، القاهرة ، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها .

٣٤) صَحِيح البُخَارِي للإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البُخَارِي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٣٥) صَحِيح مسلم للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النَّيسابوري ، حقوق أصولهُ و خَرَّجَ أَحاديثهُ على الكتب الستة : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٦) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٧) سُنَن التِّرمِذِي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٨) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨م).

٣٩) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ (ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة المعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨ م).

٤٠) سُنَن الدار قُطني، للإمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني ، تحقيق : مجدي بن مَنصور بن سي الشورى ، دار الكتب العلمية ، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م).

٤١) الْمُستَدرَك على الصحيحين للإمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري ، تحقيق : صالح اللحَّام ، دار ابن حزم ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٢) صَحِيح ابْنُ حِبَّان للإمام أبي حَاتِم محمد بن حِبَّان الخُراساني ، تحقيق : حقوق أصولهُ وخَرَّجَ أَحاديثه : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المْعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٤٣) الْمُعجم الكبير للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَراني ، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي ، مكتبة الأصالة والتُّراث ، الطبعة الأولى (١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٤٤) سُنَن الدَّارمي للإمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي ، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ ألفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلَّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارِسَهُ : الأستاذ الدكتور مصطفي ديب البغا ، دار المصطفى ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٥) مشكاة المصابيح، تأليف : محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، المكتب الإسلامي ، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٦) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل ، تأليف : محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٧) السراج الْمُنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير ، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ : عصام موسى هادي، دار الصديق، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٤٨) السنن الكبرى تصنيف : الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق : دكتور عبدالغفار سليمان البنداري، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٤٩) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة الأولى.

# نێوەڕۆک